پێناسی کتێب

ناوی کتێب: ژیان و نهێنییەکانی نەوشیروان مستەفا

بابەت : توێژینەوەو ڕەخنە

نوسینی: لیژنەیەك لە رۆژنامە نوسان

سالی چاپ: چاپی یەکەم ـــ سلێمانی

تیراژ:5000

نرخ: 10000

چاپ و بلاوکردنەوە

کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر

ناونیشان : بازاڕی حەمە سوور – پشت بازاڕی جەوازەکە

## رونكردنەوەیەكی پێویست

نەوشیروان مستەفا كەبەتەنیا حزبێكی سیاسییە، یەكێكە لەو سەركردانەی كە پێگەیەكی پتەوی هەیە لەسەر ئاستی عێراق بە گشتی و كوردستان بەتایبەتی، كەسایەتییەكی دیار و یەكێكە لەوانەی لەدوای دروست بونی شۆرشی نوێوە دەورێكی بالآی هەبووە، ئەگەر نەوشیروان مستەفا لە مێژوو شۆرشی نوێ ! دەربهێنین ئەوا بەدڵنیاییەوە مێژوویەكی قەمورە، ئەوەی لەم كتێبەدا كۆكراوەتەوە بەری رەنجی ماندوبونی ئەو رۆژنامە نوسانەیە كەتوانیویانە زۆر بە ئازایانە و بەراشكاوانە باسی بكەن و دیدار و گفتوگۆی لەگەڵدا بكەن، هەموو كەسێك شایستەی رەخنە لێگرتن و ئافەرینە. پێمان وانییە نەوشیروان مستەفا لێوان لێوبێت لە ئیجابیات ! بەلآم وەك هەر كەسێكی تریش بەدەر نییە لە سلبیات ! ئێمە بۆئەوەی سەر لە خوێنەر چەواشە نەكەین، بەتەنها باسی گوڵمان بۆ نەكردووە، ئەم گوڵەی ئێمە پێچەوانەی گوڵەكانی ترە و دڕكیشی هەیە، ئەم كتێبە نە پەیوەندی بەهەوادارانی گۆڕانەوە هەیە و نە پەیوەندیشی بە نەیارەكانی گۆڕانەوەهەیە، تەنها مەبەستمان ئەوە بووە چەندین بیر و بۆچونی ناكۆك و ناتەبا و دژبەیەك لە كتێبێكدا كۆبكەینەوە. بەو هیوایەی ئەو كەسەی كە:

دڕكی دی

گوڵیش ببینی

## ژیان و نهێنی یەکانی نەوشیروان مستەفا

بەدوادا چوون / نیاز محمد

نەوشیروان مستەفا لەساڵی ١٩٤٤ لەگەڕەکی سەرشەقام(بەرخانەقا)ی شاری سلێمانی لە بنەماڵەیەکی ناسراو و رۆشنبیری ئەو شارە لەدایك بووە.

نەوشیروان مستەفا وەك هاورێ نزیکەکانی دەگێرنەوە شەستەکانی سەدەی رابردوو دەستی بەکار و چالاکی کردووە، یەکەم وێستگەی ژیانی سیاسیشی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووە.

قوتابخانەی سەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لەشاری سلێمانی تەواو کردووە، پاشان لە ساڵی ١٩٦٧ کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی لە زانکۆی بەغداد تەواو کردووە لە سەرەتای ساڵانی شەستەکانی سەدەی رابردووە وە لەریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان چالاکانە کاری کردووە لەساڵی ١٩٦٣ و ١٩٦٤ بۆتە ئەندامی سکرتارییەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان . هەر لەوماوەیەدا بۆتە ئەندام لە پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی ١٩٦٧ دا بۆتە ئەندامی لقی سلێمانی پارتی دیموکراتی کوردستان.

نەوشیروان مستەفا کە ئێستا خاوەنی کۆمپانیای وشەیە و پێشتر جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو. لە ساڵی ١٩٨١ خێزانی پێکهێناوە خێزانەکەی خوشکەزای رەفعەتی مەلای هاورێی شاخ و شارییەتی، نەوشیروان خاوەنی دوو کور و کچێکە بەناوەکانی(نما ، چیا ، چرا) نما کۆلێژی کارگێری و ئابووری لە لەندەن تەواو کردووە و ئێستا گەڕاوەتەوە کوردستان لە کۆمپانیاکەی باوکی سەرقاڵی کارکردنە. چیا، پاش تەواوکردنی کۆلێژ لە لەندەن ڕوی کردۆتە امریکا بۆ خوێندنی ماجستێر. چیای کچیشی لە لەندەن دەخوێنێ و ئەمساڵ دوا ساڵی خوێندنییەتی بۆ تەواوکردنی کۆلێژی پزیشکی لە بەریتانیا. محمد عبدالرحمن کە ناسراوە بە رەفعەتی مەلا یەکێکە لە هاورێی دێرین و

نزیکەکانی نەوسیروان مستەفا بەم جۆرە چیرۆکی ناسینی ئەو دەگێڕێتەوە کە ئێمە خەڵکی یەك گەرەکی شاری سلێمانین و دراوسێ بووین جگە لەکاری سیاسی، بەڵام وەك کارکردن لە شەستەکانەوە ناسیومە لە ساڵی ١٩٦٤ کاك نەوشیروانم ئەوکاتە ناسی کە ئەو وەختە پارتی دەیویست لەگەڵ حوکومەتی عێراقیدا ئاشتییەك دروست بکات باڵی مەکتەبی سیاسی دژی بوون بەیانێکیان لەوبارەیەوە دەرکرد کەئەو بەیانەی مەکتەبی سیاسی توند بوو ئەمەش بەبروای ئێمە وەکو کۆمەڵێ گەنجی ئەوسەردەمەی ناو پارتی پێمان وابوو ناکۆکییەك لەگەڵ خوالێخۆش بوو مستەفا بارزانیدا دروست دەکات لەبەرئەوە پێمان باش نەبوو ئەو بەیانە بەو توندوو تیژە دەربچێت. بەڵام بەداخەوە ئەوە دەرچوو کەئەوەش هەنگاوی یەکەم بوو بۆ پارچە پارچە بوون و ئینشقاق لەناو بزوتنەوەی کوردیدا ".

بەپێی قسەی رەفعەتی مەلا کە هاورێیەکی نزیکی نەوشیروان مستەفایە و ماوەی زیاتر لە ٤٠ ساڵە دەیناسێت " بنەماڵەی نەوشیروان مستەفا بنەماڵەیەکی ناسراوی شاری سلێمان بوون باوکی پیاوێکی روشنبیری بووە خاوەنی کتێبخانەیەکی گەورە بووە لە ماڵەکەیدا ".

بەبروای ئەو هاورێ دێرین و نزیکەی نەوشیروان مستەفا هەرئەمەش کاریگەری لەسەر ژیانی نەوشیروان مستەفا داناوە بەتایبەت لەروی رۆشنبیری و سیاسییەوە رەفعەتی مەلا دەڵێت " بۆیە کاك نەوشیروان هەر لە منداڵییەوە سودی لەو کتێبخانەیەی باوکی وەرگرتووە ئەمەش کاریگەری هەبووە لەسەر ڕۆشنبیری ئەو ".

ئەو گەنجانەی ناو پارتی دیموکراتی کوردستان لەشاری سلێمانی کە دیارترینیان بریتی بوون لە( نەوشیروان مستەفا ، رەفعەتی مەلا ، شازاد سائب ، سمکۆ فەتحولا ) وەك چەند گەنجێکی چالاك و هەڵسوراو لە شەستەکاندا زیاتر سۆزیان بۆ باڵی مەکتەبی سیاسی هەبووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رەخنەی خۆیان لەو باڵەوە هەبووە. ئەم گەنجانە بە بروای یەکێك لە هاورێ نزیکەکانی نەوشیروان مستەفا ، سەرکردە دیارەکەیان نەوشیروان مستەفا بووە.

رەفعەتی مەلا لەم بارەیەوە دەڵێت " لە کۆنگرەی کەلاری ساڵی ١٩٦٧ ، ئێمە پێکەوە کۆمەڵێك گەنج بووین کە دەمانویست لەو کاتەدا لەوکۆنگرەیەدا وابکەین کە ریفۆرم لە باڵی مەکتەبی سیاسیدا بکەین کەبریتی بوو لە( نەوشیروان مستەفا ، رەفعەتی مەلا ، شازاد سائب ، سمکۆ فەتحولا ) کۆمەڵێك گەنج بووین کەداوامان دەکرد کە باڵی مەکتەبی سیاسی ریفۆرمی تێدا بکرێت و هەندێ لەسەرکردەکانی دوربخرێتەوە لە سەرکردایەتی چونکە ئێمە بەشایستەمان نەدەزانین " هەروەها دەشڵێت " یەکێك لەمەبەستەکانمان ئەوە بوو

کەبەراستی باڵی سیاسی دوربخەینەوە لە هاوکاریکردنی حوکومەتی عێراقی و وابکەین کە ریزەکانی میللەتەکەمان بپارێزین و پارچە پارچە نەبێت بەڵام دیارە سەرکەوتوو نەبوین لەمەدا لەو کۆنگرەیەدا ".

رەفعەت لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێ " تا ساڵی ١٩٧١ کە دواین کۆنگرەی باڵی مەکتەبی سیاسی لە بەغدا گیرا ئێمە کارمان بۆئەوە دەکرد کە ئەو باڵە حەل بکەین، ئەوە بوو بەیانی ١١ ی ئازار هاتبووە پێشەوە، کاك نەوشیروان یەکێك بوو کە چالاکانە بۆ ئەو مەبەستە کاری دەکرد چونکە، پێمان وابوو حەل کردنی ئەو باڵە رێگە خۆشدەکات بۆ رێکخستنێکی تازە کە ئیشمان بۆ دەکرد، ئەویش کۆمەڵەی رەنجدەران بوو، فعلەن لەو کۆنگرەیەدا توانیمان باڵی مەکتەبی سیاسی حەل بکەین ئەوە بوو چون تێکەل بوونەوە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستاندا. "

چیرۆکی دروست بوونی کۆمەڵەی رەنجدەران بەبروای رەفعەتی مەلا رەگ و ریشەکانی دەگەرێنەوە بۆ ناو گۆڤاری رزگای کەلەساڵی ١٩٦٩ دا دەرچووە نەوشیروان مستەفا خاوەنی ئیمتیازی ئەو گۆڤارە مانگانەیە بووە.

لە بارەی ئەم گۆڤارەوە کە ١٣ ژمارەی لەماوەی زیاتر لە ساڵێکدا لێدەر چوو رەفعەتی مەلا دەڵێ " دیارە ئەو گۆڤارە تازەترین گۆڤار بوو کە دەرگا و پەنجەرەی کردەوە بۆ رۆشنبیران و نوسەران بۆ ئەوەی رەخنە لە وەزعی ئەو کاتە بگرن، لەگەڵ ئەوەی ئەو گۆڤارەی کاك نەوشیروان گۆڤارێکی رەخنەگرانە بوو لە رەوشە سیاسییەکەی ئەو سەردەمە بەڵام بابەتی هەمەرەنگ و جۆراوجۆریشی تێدا بڵاو دەکرایەوە زۆربەی نوسەران و رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە لەو گۆڤارەدا دەیاننوسی، بەداخەوە پاش بەیانی ئازار دایانخست ".

بەپێی وتەی هەندێ هاورێی نەوشیروان مستەفا گۆڤارەکە بەگۆڤاری ماوییەکان ناسرابوو ، رەفعەتی مەلا ئاماژە بەوەدەدات کە لەبەرئەوە بووە زۆر بەی ئەوانەی لەوێ نوسیوویانە کاریگەرییان لەسەر بووە لەلایەن تەیاری ماوییەوە کە تەیارێکی شۆرشگێری ناسراو بووە لە دنیادا. لەمبارەیەوە دەڵێ " ئێمە ئەو گەنجانەی ئەو سەردەمە هەمووومان خۆمان بەماوی دەزانی کتێبەکانی ماویمان دەخوێندەوە و دیراسەمان دەکرد ". ئەو دەڵێ " بەڵام گۆڤارێکی ماوی نەبوو وەك گۆڤار بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گۆڤارێکی شۆرشگێرانە و پێشکەوتنخواز بوو کۆمەڵێك نوسەر و خوێندکاری پێشکەوتنخواز تیایاندا دەنوسی ".

بە پێی وتەی ڕەفعەتی مەلا گۆڤارەکە لە ١٩٦٩ تاوەکو ساڵی ١٩٧٠ کاتی بەیانی ١١ ی ئازار دەردەچێت ئیتر دادەخرێت لەبەرئەوەی ئەمان باڵی مەکتەبی سیاسی بوون بەدەرچوونی ئەو بەیانە گۆڤارەکەیان لەلایەن باڵی مەلامستەفاوە دادەخرێت تەنانەت چاپخانەکەش بەپارەی دەوڵەمەندانی سلێمانی کراوە دوای داخستنی تەسلیم بە پارتی دەکرێت.

ڕەفعەتی مەلا دەڵێت " دیارە ئێمە بازنەیەکی ڕۆشنبیریمان هەبوو لەسلێمانی ، کەزۆرجار لە بارەگای گۆڤاری رزگاری کۆدەبوینەوە کەلەلایەن ئەو گەنجە شۆرشگێرانەی ئەو سەردەمەوە ئەم حەلەقانە دروستکرابوون و کاك نەوشیروان دەوری سەرەکی هەبووە تیایدا کە لەوگەنجانەی ئەو سەردەمە کاك نەوشیروان بوو ، مەحمودی مەلا عیزەت بوو، فوادی مەلا مەحمود بوو، سمکۆ فەتحولا بوو، من و حەمە چاوشین و کۆمەڵێك گەنجی تر بووین کە مام جەلال دەهات محازەراتی دەداینێ لەو موحازەراتانەدا زیاتر وەك باو بوو کتێبەکانی ماومان دیراسە دەکرد "

ڕەفعەتی مەلا لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت " ئەم حەلەقە ڕۆشنبیرییانە لە کۆتایدا بووە بنەمایەك بۆ دروست بوونی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان ".

بە پێی وتەی ڕەفعەت پاش بەیانی ئازار ئەوان هەموو دوردەخرێنەوە لە سلێمانی بۆ خواروی عێراق و پاشان لەبەغدا یەك دەگرنەوە ئیدی لەوسەردەمەدا نەوشیروان مستەفا بەرەو نەمسا بەمەبەستی خوێندن و دورکەوتنەوە لە هەرەشەکانی ئەو سەردەمەی حوکومەتی عێراقی بەرێدەکەوێت کە لەوسەردەمەدا لەلایەن حەکەمەتی عێراقییەوە سزای لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو لە نەمسا پاش تەواوکردنی ماجستێر سەرقاڵی خوێندنی دکتۆرا دەبێت لە بواری یاسا نێو دەوڵەتییەکاندا، بەڵام بۆ دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی واز لە خوێندنەکەی دەهێنێ و دەگەڕێتەوە کوردستان. لێرە بەدواوە نەوشیوان مستەفا وەك سەرکردەیەکی دیار بەتەواوی دەردەکەوێت کە هەم سکرتێری کۆمەڵە و هەم جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمان دەبێت. بەبارەکەی تریشدا ژیانی پێشمەرگایەتی و خەباتی چەکداری نەوشیروان مستەفا بەم جۆرە بەتەواوەتی دەستپێدەکات. نەوشیروان مستەفا لەگەڵ کۆمەڵەی ڕەنجدەران کەلە ساڵی ١٩٧٢ بەتەواوی ئیعلانی دامەزراندنی دەکرێ، بەوتەی هاورێکانی لەوماوەیەی لەنەمساش بووە دانەبراوە پەیوەندی هەبووە. بەوتەی ڕەفعەتی مەلا دروست بوونی کۆمەڵەی ڕەنجدەران پاش ئەوە دێت کەباڵی مەکتەبی سیاسی دەگەڕێتەوە نێو پارتی ئیتر ئەو برادەرانە بریاریاندا تەنزیمێکی مارکسی – لینینی دروست

بکەن ئەوە بوو کۆمەڵەیان دروست کرد. پاش گەڕانەوەی لە نەمسا و دەستپێکردنەوەی شۆڕشی چەکداری نەوشیروان مستەفا دەبێتە سکرتێری کۆمەڵەی رەنجدەران کە وەك باڵێك لە نێو باڵەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە تازە دامەزراوە کاردەکات جگە لە خەباتی چەکداری وپێشمەرگایەتی نەوشیروان مستەفا لەگەڵ ئەوەشدا ئەوکاتە کە گۆڤاری کۆمەڵە دەرچووە زۆربەی نوسینەکانی خۆی لەوێ بلاّودەکردەوە.

نەوشیروان مستەفا ئەوکتێبانەی بەدرێژایی تەمەنی کە نوسیونی بریتی بوون لە مێژوو یادەوەرییەکان ، لەم بارەیەوە حەمە تۆفیق پێی وایە هۆکاری دەستبردنی نەوشیروان مستەفا بۆ نوسینەوەی مێژووۆ و یادەوەرییەکانی زیاتر پەیوەندی بە حەزی خۆیەوە هەبووە نەك شتێکی تر ، ئەو دەڵێ " نەوشیروان زۆر حەزی لەمێژووە بۆیە لەو بارەیەوە نوسیویەتی ".

لەم بارەیەوە چەندین کتێبی هەیە لەوانە(کورد و عەجەم ، حوکومەتی کوردستان ، لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ ، کورد لەگەمەی سۆڤێتیدا ، پەنجەکان یەکتری دەشکێنن ، ژیانی بەتەمەنترین رۆژنامەی کوردی لە(١٩٢٦ — ١٩٨٣ ).

نەوشیروان مستەفا بە پێی قسەی رەفعەتی مەلا زیاتر حەزی لە گۆرانییە فۆلکۆرییە کوردییەکانە بەتایبەت حەزی لە لاوك و حەیرانە ناوبەناو خۆشی لەبەرخۆیەوە دەیڵێت.

رەفعەتی مەلاش جەخت لەوە دەکاتەوە کە کاك نەوشیروان زۆر موهتەم نی یە بۆخواردن ، بەتایبەت لە هاویندا زیاتر حەزی لە تەماتە و خەیارە قاشی دەکات و دەیخوات.

لەلای خۆیەوە حەمە تۆفیق رەحیم کە ئێستا ئەندامی ئەنجومەنی کۆمپانیای وشەیە بەوتەی خۆی زیاتر لە ١١ ساڵی پێشمەرگایەتی لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا بەسەر بردووە ، لە ساڵی ١٩٧٩ تا ١٩٩١ ئەویش جەخت لەوە دەکاتەوە کە نەوشیروان زۆر موهتەم نی یە بەخواردن، نەوشیروان مستەفا وەك هاورێکانی باسی دەکەن کەسێکی سادەیە بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا زوو تورە دەبێت. حەمە تۆفیق رەحیم لەم بارەیەوە دەڵێ " کەسێکی زۆر سادەیە بەلاّم کەمێك تورەیە " سەبارەت بەوەی کە بە چ شتێك یان لە چ حاڵەتێکدا تورەدەبێت عەلی کەریمی یەکێکی ترە لە هاورێکانی سەردەمی شاخ ناسیویەتی دەڵێ " جاری واهەیە بە هەموو شتێك تورە دەبێت جاری واش هەیە بەهیچ شتێك تورە نابێت ".

یەکێك لە ئاواتەکانی نەوشیروان مستەفا وەك هاورێکانی باسی دەکەن جگە لەمێژوو نوسینەوە و مێژوو، ژیانکردنە لەگەڵ بەخێوکردنی مریشك و کەو و ئاژەڵە کێوییەکانی

وەك ئاسك و چەند ئاژەڵێكی تر. هەروەها لەسەردەمی ئەوەی كەلە دەرەوە بووە یەكێك لە هاورێكانی دەڵێت " پیاسە كردنی نێو پاركەكان چێژی زۆری دەدایە و حەزی لێبوو، ئەمە سەرەڕای سەردانكردنی مۆزەخانە و شوێنەوارە دێرینەكان ".

ئەگەر سەیری نەوشیروان مستەفا بكەیت ، بەوتەمەنەوە كە خۆی لە ٦٥ ساڵ دەدات و جگەرەكێشێكی بێ وێنەشە هەندێ كەس پێیان وایە جگەرە بەجگەرە دادەگیرسێنێت هێشتا خاوەنی لەش و لارێكی باریك و رەشیقە، لەوانەیە گومان بكەیت كەئەم كەسایەتی یە بەشێكی ژیانی رۆژانەی خۆی بە وەرزشكردنەوە بباتە سەر، بەڵام بەپێچەوانەوە هاورێ نزیكەكانی باس لەوە دەكەن كە بەهیچ شێوەیەك وەرزش ناكات ، ئەوان سەرەڕای ئەوەش دەڵێن " تەنانەت ئەوەندەی ئێمە بزانین سەیری هیچ جۆرە وەرزێكیش ناكات و حەزی لێی نییە ".

هەروەك شتەكانی تری هاورێكانی باس لەوە دەكەن كە نەوشیروان مستەفا لە خواردنیشدا زۆرسادەیە و كەمخۆرە و نەوسن نییە، بە شێوەیەك یەكێك لە هاورێكانی دەڵێت " نیسكێنەی بۆ دانێیت دەیخوات و هیچ كێشەی نییە ".

سكرتێری گشتی ئەو حزبە، لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاورێی، خۆی دایمەزراندووە كەمترین كاتی بۆ ژیانی تایبەتی خۆی ماوەتەوە ، هەمیشەش ماڵێكی سادەی هەیە و كەدەچیتە ماڵەكەی هەست ناكەیت كەدەچیتە ماڵی سەركردەیەك ، زۆر كەیفی بە گفتوگۆ دێت لەگەڵ ئەوانەی تازە دەیانناسێت و بەردەوامیش گەر وشەیەك یان رستەیەكی پێ بڵێیت وانەبێت راستەوخۆ قسەكەت پێ دەبرێت و دەڵێ وانییە گەورەترین كێشەی نەوشیروان ئەوەیە مجامەلەی كەس ناكات و قسە لەڕووە ، زۆربەی سیاسییەكانیش لەم ڕووەوە كێشەیان هەیە لەگەڵی، هەركەشێكیشی خۆشویست خۆشی دەوێت، ئەگەر كەسێكیشی خۆش نەویست راستەوخۆ پێی دەڵێ من تۆم خۆش ناوێت لەسەر مەسەلەی ژنان زۆر توندە و باوەری بە هاورێیەتی و پەیوەندی بەهێز نییە لەگەڵ ژناندا. ئەم هەڵسوكەوتەشی زۆر جیای كردۆتەوە لە هەموو هاورێكانی لەكاتی گفتوگۆ كردنیشدا زۆر بە كورتی و پوختی وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە كە روبەروی دەكرێنەوە ، كەمجاریش دەبینرێت جلی رەسمی لەبەر بكات ، جیاواز لەهاورێ بەرپرسەكانی، ئەم لەبازار سەری چاك دەكات و خۆشی دەچێتە بازار جل بۆخۆی بكرێت ئاساییە بەلاشییەوە چەندین دوكان بكات مامەڵەی كراسێك یان قاتێك بكات لەگەڵ خاوەن دوكانێكدا.

## کێ خاوەنی راستەقینەی یەکێتییە؟

### یەکێتی نیشتمانی کوردستان ، ماڵێکی لێکترازاو و جەستەیەکی بیمار

هەردی ئەحمەد

یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەلە حەفتاکانی سەدەی پێشتردا وەك حزبێکی سیاسی خۆی راگەیاندا، بەخێرایی توانی زوترین هەوادار و لایەنگر لەدەوری خۆی گرد بکاتەوە، ئەمەش بە ئەو ناهەمواریيەی کە لەو سەروەختەدا بەسەر کوردستاندا هاتبوو بەهەوڵێکی نێو دەوڵەتی، لەماوەی خەباتی سیاسی و چەکداریدا یەکێتی هەمیشە ئومێدی بالآدەستی وای لێکردووە بەچەند قۆناغێکی خوێناوی و پرکێشەدا ئەزمونەکانی تێپەڕێنێت کەم حزبی کوردی هەیە زەبری گوچکبڕی لەلایەن یەکێتی یەوە لێ نەدرابێت لە ئێستای هاوکێشە سیاسییەکاندا یەکێتی نیشتمانی وێرانترین ماڵی هەیە و ئەو بەرە و باڵانەی حزبەکەیان بنیادنا بە ئومێدی گەیشتن بە لوتکەی هەرەمی پارتەکە ململانێ و ناکۆکی یەکانیان بە ئەندازەیەك پەرەی سەندووە کە چیتر نەتووانن پێکەوە گردببنەوە و کار بۆ ئەوە بکەن " یەکێتی ریزەکانی یەکێتی " بپارێزن کەئەم دەستەواژە دەربرینی ئەم دواییانەی سکرتێرەکەی ئەو حزبە بوو. ناکۆکییەکانی خۆیان هێناوەتە سەرشەقام و دەیانەوێ لەماڵی خەڵکیدا کێشەکانیان یەکلایی بکەنەوە و خەڵك بریار بدات یەکێتی هی باڵی گشتییە یان باڵی ریفۆرم ، ئەمەش لەئەنجامی ئەو ترسە گەورەیەی کە لە کۆنگرە هەیانە.

جەلال تاڵەبانی وەك بەشێك لەململانێکانی هەرێمی کوردستان لەماوەی شەست ساڵی رابردوو دا، شارەزای هەموو کۆسپ و تەگەرە و ململانێیەکی حزبییە، بۆیە هەر لەسەرەتاوە کە یەکێتی نیشتمانی دوای راپەرین وەك حزبی یەکەم وێنای خۆی دەرکرد لە کوردستاندا ئەو راستییەی لە یاد نەکرد کە بەهێزی ئەم باڵە رابگرێت لە یەکێتیدا کە خۆی خاوەنداریتی دەکرد، بۆیە کێشەی سامان و دارایی یەکێتی گەورەترین هۆکاربوو بۆ دەست لەکارکێشانەوە ی ئەندامانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەسەر باڵی ریفۆرم و رایاندەگەیاند کە شەفافیەت لە بودجەی یەکێتیدا نییە و لەدەستی چەند کەسێکدایە کە

تاڵەبانی کلیلی هەموو غەزێنەکانی پێ بووە و هەرواش دەبێ، لەناو ئەو حزبەدا لە دەرەوەی تاڵەبانی چەند باڵێکی تر بونیان هەبوو ، وا دەردەکەوت کە کۆسرەت رەسول بەهێزترینیان بێت ، بەلام ئەوهاوکێشەیە شیکارێکی هێندەگرانی نەبوو دەزانرا بۆ تاڵەبانی کۆسرەت رەسول پارویەکی ئاسانە هەرکات بیەوێ بەرەیەك کە کۆسرەت رەسول دروستی بکات هەرچەند بەهێز بێت پەرتەوازەیان بکات لە بارودۆخی ئێستادا ئەمە بەروونی دەبینرێت کە ئەو جەماوەرەی کۆسرەت رەسول لەهەولێر هەیبوو تاڵەبانی پەرتەوازەی کردن و نیگەرانی ئەم دۆخەش بە ئاسانی بە کۆسرەت رەسوڵ قووت ناچێ، لە جولانەوەیدا رەنگی داوەتەوە بۆچونەکان کۆکن لەسەرئەوەی ساردییەك بە بانگەشەکانی کرسرەت رەسوڵەوە دیارە بۆ پرۆشەی هەڵبژاردن ئەوساردییەش لە ئەنجامی نیگەرانییەکانییەوە سەرچاوەی گرتووە لە دەرەوەی ئەم باڵە هەمیشە هێزێکی شاراوە مەترسی بووە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی باڵەکەی تاڵەبانی کەبەخەتی گشتی ناسراوە ئەویش ئەوباڵەی یەکێتی بوو کە زۆرینەی کۆنە ئەندامانی کۆمەڵە لەدەوری کۆبوبونەوە و کەمترین کاتیش دەردەکەوتن لە دوای " پرۆسەی ئازادی عێراق " سەرکردایەتی پارتی و یەکێتی وەك حوکمەتی هەرێم ، لەروی دارایی و دەسەلاتدارییەوە دەستکراوەتر بوون لەوەی کەماوەی ١٢ ساڵ بەشەری ناوخۆ و ئابلۆقەی عێراق و دەرەوە تێیانپەراند ئەو قۆناغە چەندە بوژانەوەی بۆ پارتی و یەکێتی پێ بوو ، هێندە فاکتەر بوو بۆ سەرهەڵدانی کێشەی دەسەلاتەکان لە یەکێتی بەتایبەت و پێناچێت پارتیش هەروا بەسانایی لێی دەربازبێت، بەلام ئەوەی بەرونی دەبێت بیخەینە بەر سەرەنجی ورد ناو ماڵە لێکتراوەکەی(یەکێتییە)لەبەر ئەوەی کە ئەو دۆخە گەشتۆتە رادەیەك یەکێتی لە خاوەنێك زیاتری هەیە و ململانێی گەورەش لەنێوان دوو بەرەی دەرکەوتوودایە ، لایەك خەتە گشتی یەکەی تاڵەبانییە کەلە بەردەم هەرەشەی گەورەدایە لاکەی تر نەوشیروان مستەفایە لەژێر چەمکی بەرەی ریفۆرمدا کۆی کردۆتەوە و گەشبینیش دەردەکەوێ بەرامبەر دۆخەکە، تاساتێك نەوشیروان مستەفا جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی بوو ، پرۆژەیەکی بەناوی ریفۆرمی یەکێتی خستەروو بەلام نەوشیروان مستەفا لەو هەوڵەی سەرنەکەوت، دەلیل بۆ سەرنەکەوتنیشی شکستی باڵەکەی بوو لە هەڵبژاردنی کۆمیتە و مەڵبەندەکاندا لە پێش ئەو پلنیۆمەی یەکێتی پێی هەستا، ئەو پێی وا بوو کە تاڵەبانی لەسەرەمەرگدایە و ئەگەر گرەوی سکتێری لە کاتی بوونی تاڵەبانیدا نەباتەوە ، دوای تاڵەبانی کە بەرەیەکی فراوانی

هەیە بەشێکی زۆریش لەبەرەکەی تاڵەبانی نەیاری سکرتێری نەوشیروانن، ئەوکات ناتوانێ بگاتە لوتکەی هەرەمەکە و پەشێوی یەکێتی دەتەنێتەوە ، لەئێستاشدا کە پەشێوی هێناوەتەوە ئاراوە باشترین خوێندنەوە ئەوەیە کە نەوشیروان مستەفا دەیەوێ بڵێت یەکێتی بێ من جەستەیەکی کەمئەندامە ، بەوئومێدەی خەڵکی یەکێتی لەدوای مەرگی تاڵەبانی پەنای بۆ ببەن و بە فریادرەسی یەکێتی بزانن. هەڵوێستی پارتی لەم باروو دۆخەدا لەبەرژەوەندی تاڵەبانییە ، ئەمەش پێوەند بە دوو هۆکارە، لایەنێك لەو پشتگیرییەی پارتی بۆ تاڵەبانی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە دانوستان لەگەڵ تاڵەبانیدا نەرمترە ، لایەنی دووەم خودی ئەوپرۆسەیەی یەکێتی پێیدا تێپەر دەبێت مەترسی بۆ پارتی و هەرێم بەگشتی هەیە و پارتی لەسەر وەختی شەری ناوخۆدا زۆرجار وەك دڵنیاییدان بەئەندامەکانی پێی دەگوتن کە نەیارە سەرسەختەکەی تەمەنی درێژنابێت تەمەنی بەقەد ئەو چەندساڵەی تەمەنی تاڵەبانی ماوە ، بەڵام ئێستا حەزناکات تاڵەبانی لەوکاتەدا بمرێت ، چونکە ئەگەر مردنی تاڵەبانی ببێتە هۆی پارچە پارچە بوونی زیاتری یەکێتی ئەوا سەرەنجام دۆخێکی ناجێگیر دروست دەبێت، کەلەو کاتەدا ئەوە بەقازانجی بارودۆخی کوردستان نییە، چونکە ئێستا پارتی لەگەڵ یەکێتی بەیەك هەڵوێست لەبەرامبەر پرسەنەتەوەییەکان روبەروی بەغداد دەبنەوە، ئەوکات هەم پارتی ئەستەم دەبێت لەگەڵ چ پارتێك هاوپەیمانی بکات هەمیش دەستی بەغدا ئاسانتر دەچێتە نێو پرۆسەی سیاسی کوردستانەوە، بەڵام تا ئێستاش پارتی دژایەتی نەوشیروان و رەوتەکەی بە ئەولەویەت وەرنەگرتووە و ئەمەش وا لێکدەدرێتەوە پارتی نایەوێ دژایەتی رەوتێك بکات کەروی ئاراستەی لێی نییە راستەوخۆ.

## کێ خاوەنی راستەقینەی یەکێتییە؟

ئەم پرسە ئاڵۆز و هەستیارە تاڵەبانی شەرعیەتی سکرتێری یەکێتی هەیە، بەڵام ئەو باڵەی یەکێتی کە باڵی رفۆرمیان هەڵگرتووە لە جێگری سکرتێرەوە بیگرە هەتا مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی ئەوانیش شەرعییەتی کۆنگرەیان پێیە و بەپێی پەیرەوی ناوخۆی یەکێتیش تەنها کۆنگرە دەتوانێت لەکاریان بخات باڵی ریفۆرم کۆمیتەیەکیان بەناوی کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان باڵی ریفۆرمیان پێکهێناوە و دووجاریش بەیاننامەیان بەرەسمی بەو ناوەوە بڵاوکردۆتەوە، عوسمان بانیمارانی ئەندامی سەرکردایەتی دەست لەکارکێشاوەی یەکێتی لەسەر باڵی ریفۆرم دەڵێت " ئێمە وەك ئەو

بەشەی پێمان دەوترێت سەرکردایەتی ریفۆرمخواز ، یان باڵی ریفۆرم خۆمان بەخاوەنی راستەقینەی یەکێتی دەزانین ". لەلایەکی دیکەشەوە بەکر مستەفا بەرپرسی مەڵبەندی(سێ)یەکێتی نیشتمانی ئەو قسەیە ڕەت دەکاتەوە و دەڵێ " یەکێتی نیشتمانی کوردستان یەك سەرکردایەتی هەیە کە جەنابی مام جەلال سکرتێری گشتییەتی، لەدەرەوەی ئەوە هەرکەسێکی تر دیعایەی ئەوە بکات کە کۆمیتەی سەرکردایەتی هەیە یان سەرکردایەتییە، ئەوە بۆچونی خۆیەتی " بەکرمستەفا بەردەوام بوو لەوبارەیەوە وتیشی " لەناو دەوڵەتان و ناوچەکە و عێراق و سەرکردایەتی سیاسی کوردستانیش یەکێتی نیشتمانی کوردستان یەك یەکێتییە و مام جەلالیش سکرتێریەتی ". بەلاّم عوسمان بانیمارانی هەڵوێستە لەسەرشتێکی دیکە دەکات و پێی وایە ئەوەی شەرعیەت بەوان دەدا خاوەنی یەکێتی بن جەماوەرە ، بانیمارانی دەڵێت " ئەوانەی کەبەخەتی گشتی ناسراون و لەئێستای یەکێتی دا دەسەلاّت بەدەستن، پێمان وایە ئەو دەسەلاّتانەیان لە بەرژەوەندی خۆیان بەکارهێناوە و ئەمەش بە شێوەیەکی ناراست، بۆیە پێمان وایە زۆربەی زۆری یەکێتی نیشتمانی کوردستان پشتگیری باڵی ریفۆرم دەکات "، لەوبارەیەشەوە رایدەگەیەنێت " ئێمە خاوەنی راستەقینەی یەکێتین یان ئەوان؟ ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی هەرێم هەموو ئەوانە یەکلایی دەکاتەوە و وەلاّمی پرسەکان دەداتەوە " ، هاوکات ئەوەش دەخاتە روو کاتێك دوای هەڵبژاردنەکان ئەگەر کۆنگرەببەسترێ ، ئەوان وەك باڵی ریفۆرم بەشداری تێداناکەن و دەڵێ " ئێمە بەشداری لەکۆنگرەیەکداناکەین کە باڵی گشتی دەیبەستێ، هەڵبژاردن ئەوە یەکلایی دەکاتەوە کێ خاوەنی راستەقینەی یەکێتییە ". بەکر مستەفا بەرپرسیارێتی ئەو بۆچونە بۆ ئەولایەنە خۆیان دەگەرێنێتەوە و جەخت دەکاتەوە کە یەکێتی یەك یەکێتییە و دەشڵێ " ئێمە بە پێویستی نازانین دادگا و شتی لەو بابەتەیان لێ بگرین ، چونکە هەموو خەڵك دەزانێ یەك یەکێتی هەیە ".

★- ئەو مانشێتە لەناونیشانی کتێبی روناك بیر فاروق رەفیق وەرگیراوە بەدەستکارییەوە.

## نەوشیروان مستەفا و خولانەوە لەنێو بازنەدا

رامیار علی

تا ئێستا لە زۆر شوێن و بۆنە، لە زۆر سایتی ئینتەرنێت یان رۆژنامە و گۆوار سەبارەت بەنەوشیروان مستەفا ئەمین زۆر شت نوسراوە ، هەندێك لەوانە كراونەتە كتێبیش یان لە دوو توێی نامیلكەدا چاپ كراون. نەوشیروان مستەفا ئەمین كە نزیكەی ٣٥ كەسایەتی پلە دووی ناویەكێتی نیشتمانی كوردستان بووە و بەردەوام لەكاتێكدا كە بریاردەر بووە ، هەولی داوە لای خەلك وەك رەخنەگر و ئۆپۆزسیۆن خۆی بنوێنێت. چاپكردنی زنجیرەكتێبێك كە بریتین لە بیرەوەرییەكانی خۆی و شێواندنی مێژووی كورد وای كرد كەخەلكانێكی زۆر دژ بەم مێژوو شێوێنییە دەنگ هەلبرن بەلام ئەوانەی كتێبەكانی نەوشیروانیان خوێندۆتەوە تەنها لەیەك یان دوو رووەوە نەوشیروانیان هەلسەنگاندووە رووی یەكەم بریتییە لە سپیكردنەوەی هەندێك لە ناراستییەكانی نەوشیروان كە نەیتوانیوە راستگۆیانە رووداوەكان تۆمار بكات، و رووی دووەمیشی بریتییەلە راستكردنەوەی ئەو چەواشەكارییەی كە روانگای نەوشیروان بۆ رووداوەكان و كەسایەتییەكان كردویەتی.

ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە بیخەمە بەردەستی خوێنەر(بەتەئكید كردنەوە لەسەر رێزم بۆ هەموو ئەو نوسەرانەی كە نەوشیروانیان لەبێژنگ داوە)كارێكی كەمێك جیاوازترە جیاوازتر لەو روانگەوە كەمن مەبەستمە بە نوسینەكانی خۆی " دیلكوژی ، ناراستگۆیی، بێ كاراكتەری، خۆبەزلزانی، دیكتاتۆری و. .. چەندین لایەنی دیكەی كەسایەتی نەوشیروان مستەفاتان بۆ شی بكەمەوە لە كۆتایشدا بیسەلمێنم كە نەوشیروان شایستەی ئەوە نی یە وەك رێبەرێكی سیاسی سەیربكرێت و پێویستە نەك هەر لەئێستای كوردستاندا خەلك روی راستەقینەی ئەو مرۆڤە بناسن ، بگرە پێویستە كوشتن و بەكووشتدانی هەزاران مرۆڤی كورد بدرێتە دادگا من هەولْ نادەم ئەم قسانە تەنها و تەنها قسەی ڕوت بن و بگرە بەبەلگەوە، بەبەلگە گەلێك كەلە ئێزدیواجییەتی كەسایەتی، بۆچون، تێروانن و بیركردنەوە و رەوتاری نەوشیرواندا هەلیان دەهێنجم ، ئەم باسەتان بۆ ساغ دەكەمەوە ئەو كاتە هیوادارم ئەوانەی وەكو قیبلەی، پاكی و راستگۆیی و زانایی و خەباتگێری سەیری

نەوشیروان دەکەن پێش ئەوەی دانیشن بیر لەوەڵامدانەوەی ئەم نوسینە بکەنەوە، جارێکی دیکەش نوسینەکەم بەدەنگێکی بەرز بخوێننەوە ئنجا ئەگەر هەر بیریان لەوەڵامدانەوە کردەوە قەناعەتیان نەهات ، موشکیلە نییە، دیارە نایانەوێ تێبکەن .

## دووڕوویی و بێوەفایی بەرامبەر بەوەلی نیعمەت

لەم لێکۆڵینەوەیەدا من هیچ کارم بە رابردووی نەوشیروان نییە و تەنها و تەنها باس لەسەرەتای کاری سیاسی ناوبراو تا ئەمرۆ کە سەرۆکی کۆمپانیای وشەیە دەکەم. بە کورتی سەرەتای کاری سیاسی نەوشیروان لە ١٩٦٤ ەوە دەست پێدەکات کە ئەوکاتە ئەندامی یەکێتی قوتابیان و لاوانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە. لەساڵی ١٩٦٨ دا وەك نەوشیروان خۆی دەڵێت لەسەر ڕەزامەندی ئەونجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش(بەعسییە کودەتاچییەکان)هەفتەنامەی رزگاری دەرکردووە ، خاوەن ئیمتیازی بووە و بەڵام ئەوان لەوکاتەدا هیچ پەیوەندییەکیان بە باڵی مەکتەبی سیاسییەوە نەهاتووە کە لەبارزانی جیا بوبونەوە و پشتیان کردبووە شۆڕش، ئەم سەردێرەی سەرەوە ستارتی یەکەم ناراستگۆیی و تەفرەدانی خەڵکە، هیچ کەس بەقەدەر نەوشیروان مستەفا خێری لە هەڵسوراوی و زیرەکی مام جەلال لە دوا ساڵەکانی تەمەنی ئیبراهیم ئەحمەد دا، تۆڵەی بۆ کردەوە بەڵام نەوشیروان بێوەفایانە مامەڵە لەگەڵ مێژووی وەلی نیعمەتی خۆیدا دەکات. بە دروستی بیرم نەماوە لەکوێ، بەڵام کەریمی حیسامی لە شوێنێك باسی پەیوەندی ئەوسای نێوان تاڵەبانی و نەوشیروان دەکات و دەڵێ بۆ هەرکوێیەك چوبا نەوشیروانی بەدواوە بوو ، لەمەجلیسێکدا مام جەلال نەوشیروانی وەك کەسێکی نزیکی و متمانەی خۆی پێ ناساند، ئەوە سەرەتای ناسینی نەوشیروان بووە لەلایەن کەریمی حیسامی ، بۆیە ئاوا بەبیری ماوە، کە نەوشیروان باسی یەکەم وێستگەی چارەنوسساز لە ژیانی سیاسی خۆیدا دەکات ، لەگەڵ خۆی و دەوروبەریدا راست ناکات، دێت لەوێ خۆی لە تاڵەبانی و ڕێبازەکەی جیا دەکاتەوە و هەمیشە وەك کەسی سێیەم مامەڵەیان لەگەڵدادەکات. مەکتەبی سیاسی وایگوت، بارزانی وایکرد و بەعس واچوو. ..! خۆی لەگەڵ کامیان دایە؟ نەخێر ئەو لەوکاتەدا نە مەلاییە نە بەعسییە و نە جەلالییە ، ئەو لەوێ کە بە پارەی مەکتەبی سیاسی هەفتەنامە دەردەکات نایەوێت خۆی بەشەریکی هەڵوێستی مام جەلال نیشان بدات. نەوشیروان دەڵێ مام جەلال ناوی هەفتەنامەکەی نا ڕزگاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش(مەبەست

بەعسە)رەزامەندی لەسەر دەرکردنی دا. ...[1] ، کەچی خۆی وا نیشان دەدات کە دورو نزیکی پەیوەندی بە جەنابی مام جەلال نییە و قەت خۆیی وستافەکەی فسلێکیان پارە لە مەکتەب سیاسی وەرنەگرتووە تا رۆژنامەی پێ دەربکەن و لەو سەردەمی قاتو قرییەدا تازەترین ئامێری ئینتەر تایپ دەکرن[2] ، بەلاَم بەپارەی گیرفانی خۆیان ! ئەوانە نیشانەی ئەوپەری بێوەفایی نەوشیروان مستەفان بەرامبەر بە جەنابی مام جەلال، چونکە ئەگەر جەنابیان نەبوایە ئێستا شتێك بەناوی نەوشیروان مستەفا جێگەی موناقەشە نەدەبوو من دەبوایە خۆم بەشتێکی دیکەوە مەشغوڵ بکەم بۆیە نەوشیروان لە هەنگاوی یەکەمیدا خۆی لەمام جەلال نەوشیروانی پێ دەردەکەوێت بێ بەری دەکات. . ئنجا دێت و دەڵێ دەمانویست تەیارێکی تازە لە جولاَنەوەی نەتەوییی کوردستانی عێراقدا دابهێنین جیاوازبێ لەرێبازی هەردوو باڵی: جەلالی و مەلایی. ..[3]

ئای لەوە بەپارە و بە پشتیوانی تاڵەبانی رۆژنامە دەردەکات، خۆی لەپشت کەسایەتی تاڵەبانی حەشارداوە، کەچی بەدوای ئینقلابکردنە بەسەر تاڵەبانیدا ! هەر بۆیە تاڵەبانی بۆی دەردەکەوێت کە ئەوکابرایە چی پیاوێکە لە دوا دانپێنانیدا تاڵەبانی لە مەجلیسێدا لەبارەی نەوشیروانەوە ئاوا دەڵێت: ئەو پیاوێکی ترسنۆك و دووڕووە، بەدرێژایی تەمەنی کارکردنم لەگەڵ ئەوپیاوەدا بۆم دەرکەوت کەهیچ نییە، هەر لەوە ئازا بوو کێشە بنێتەوە و داویی رابکاتە دەرەوە لەهیچ شەڕێکدا لەژیانیدا بریندار نەبووە، چونکە هەر لەدوای دواوە بوو. .. ؛ ئەمانە قسەی دەمی تاڵەبانین و رەنگ بێ زۆرجار لەزۆر بۆنەی دیکە ئەو قسانەی لەبارەی نەوشیروانەوە کردبێ و هیچ بەدووری نازانم کە نەوشیروان خۆشی ئەم قسانەی بیستبێتەوە ، بۆیە لە شوێنێك کەباسی مەلا بەختیار دەکات هەوڵ دەدات ئەو تێروانینەی مام جەلال لەسەر خۆی هەیەتی ئەو بیخاتە سەر مەلا بەختیار و دەڵێ کەوا مەلا بەختیار بەس لەوە ئازابووە ئاژاوەیەك دروست بکات و دوایی رابکات. ..!

## وێستگەی دووەم: توندوتیژی و تاوانکاری

---

[1] - نەوشیروان مستەفا ئەمین - پە نجەکان یەکتری نەشکێنن لا٩٧

[2] - نەوشیروان مستەفا ئەمین - پە نجەکان یەکتری نەشکێنن لا٩٧

[3] - نەوشیروان مستەفا ئەمین - پە نجەکان یەکتری نەشکێنن لا٩٧ - ٩٨

وەك باسم كرد لەوێستگەی یەكەمی ژیانی سیاسیدا نەوشیروان دەیەوێ خیانەت لە تاڵەبانی بكات و كاتێكیش مێژووی ئەوسا دەنوسێتەوە دێت تاڵەبانی دەكاتە خائین و خۆی لەهەموو شتێك بێبەری دەكات. ئنجا وێستگەی تێرامان و لێبوردنەوەی نەوشیروان مستەفا ساڵی ١٩٧٠ یە ، كەوەك دۆڕاوێكی جەنگ گوایە كۆتایی خۆی را دەگەیەنێت بێئاگایە لەوەی نەخشی سەرەتا بۆخۆیی و ژیانی سیاسی لێدەدات.

جەمالی ئەحەی خورشە برای هونەرمەند جەلال كۆچەر بەفەرمانی نەوشیروان مستەفا لە ئاداری ساڵی ١٩٧٠ نارنجۆكێك فرێ دەداتە ناو ئاهەنگی كچانی دواناوەندی سلێمانییەوە و پێنجیان لێ بریندار دەكات . ناوبراو لەسەنتەری سلێمانی لەسێدارە درا و نەوشیروانیش لە بەغداد وەك بەرزەكی بانان لەرێگەی نازم گەزازی بەرێوەبەری ئاسایشی گشتییەوە بەرەو قاهیرە و دواتر نەمسا بۆی دەرچوو [4] ، ئەمەوەك گوتم لەسەرەتادا وەك دوا فیشەكی نەوشیروان لەبەرامبەر سەركەوتنی بارزانی لەشەری بەعسدا دێتە پێش چاو، بەلام لە هەقیقەتدا ئەم روداوە دەبێتە سەرەتای تەمەنی پڕ لە توندوتیژی كوشتن وبڕینی ژەنەراڵێكی زاڵم كە حەزدەكات پتر لەوەی " أهل السیف " بێت پێی بێژن " أهل القلم " نمونەی هەرەدیاری ئەم كارە توندو تیژیانەی نەوشیروانیش ئەوكاتانەیە كەوادەزانێ دەبێ هەموو كورد مل بۆ دەسەلاتی رەهای ئەو كەچ بكەن، بەلام كەدەبینی وانییە پەنا دەباتە بەر توند و تیژی نەوشیروان مستەفا كوێرانە فەرمان بەپیاوكوژەكانی ناوشاردەكات كادیرانی پارتی و رۆشنبیرانی نەیاری ئەو بكوژن كاتێك یەكێك لە جەلادەكانی سەرپێچی یەكێك لە فەرمانەكانی ئەو دەكات، لە پایزی ساڵی ١٩٨٣ دوای ئەوەی چەندین كەسی پێ دەكوژێ ، دەیكوژێت و پارچە پارچەشی دەكات و پاساویشی بۆ كوشتنی ئەو جەلادەی ئەوەیە كە گوایە نهێنییەكانی كۆمەڵەی دركاندووە !!!.

پشكۆ نەجمەدین لەوەلامی كتێبەكی نەوشیروان(پەنجەكان یەكتری دەشكێنن)نامیلكەیەكی بلاوكردۆتەوە لەوێ دەقاودەق قسەیەكی مەلا بەختیار هێناوەتەوە " زۆری نەبرد وریای وەهاب(ئەوكەسەی نەوشیروان خەڵكی پێ تیرۆر دەكرد و دوایی پارچە پارچەی كرد) كە ئەو كارە تیرۆرستیانەی ئەنجام دابوون ، شاری بەجێ هێشت و هاتە شاخ، من وریام لەشارباژێردیت. ئەونكولی نەدەكرد و پێی وابوو كەوەكو كادری گوێ

[4] - سەعد عبداللە – نەوشیروان مستەفا لە شیری تا پیری لا٥٨

لەمستی کۆمەڵەیە، فەرمانی سکرتێری کۆمەڵەی جێ بەجێ کردووە و تەواوی ئەو نامانەشی لەلایە کەبەئیمزای خودی سکرتێر نوسراون. وریا لەنێوان دوو بەرداشی ترس و ئازاری ویژداندا لە مەنگەنەدار بوو. ترس لەوەی کە سکرتێری کۆمەڵە داوای ئەو نامانەی لێ دەکردەوە کە فەرمانی تیرۆرکردنەکانی تێدا بوو، نەبادا دەست لایەنە نەیارەکانی بکەون و ریسەکەیان لێ ببێتەوە خوری. ئەو پێی وا بوو بەبە دەستەوەدانی نامەکان ئەوکارانەی ئەو کردوونی دەچنە خانەی تیرۆری شەخسی و تایبەتییەوە و هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەری بۆ داکۆکی کردن لەخۆی بەدەستەوە نامێنێت و لەناوبردنی ئاسانتر دەبێت ئازارێکی سەختی ویژدان لەهەمبەر تیرۆرکردنی کۆمەڵێك کەسدا، کە حزبەکەی حاشای لەتیرۆرکردنەکەیان دەکر !! ئەو دەیویست کەلۆەکێی و کەللەرەقی لە ئاست سکرتێری کۆمەڵەدا بکات بەڵام بەلەدەستدانی گیانی و پارچە پارچەکردنی لاشەی تەواو بوو. تیرۆرکردنی وریا، چ ئەوسات و چ ساڵێك پاشتر لە کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا هەراو هەنگامەیەکی گەورەی لێکەوتەوە. لەو کۆنفرانسەشدا نەوشیروان مستەفا لەئەنجامی پێ داگرتنی کۆمەڵێك کادێر لەسەر چارەنوسی وریا گوتی " ئەوخیانەتی کردووە ! نهێنی یەکانی کۆمەڵەی بەدوژمنانی ئێمە داوە ئەگەر زیندوش بێتەوە سەد جاری تری دەتۆپێنمەوە. ...، باشە وریای وەها چ نهێنی یەکی درکاندبوو کە دەبوایە نەوشیروان بیکوژێت و جەستەی پارچە پارچە بکات؟ " نەوشیروان مستەفا داوای لە(وریا وەهاب)کردبوو کە(فوئادی مەجید میسری)ش تیرۆر بکات ئەویش بە فوئادی گوتبوو: من ناتکوژن بەڵام یەکێکی تری دەست دەکەوێت دەستی تێت بچێت. ئەمەش یەکێك بوو لەو نهێنیانەی کۆمەڵە کە(وریا)درکاند بووی. ... [5] ، نەوشیروان مستەفا وەك خۆی دەڵێت بەشێوەیەکی گشتی لەساڵی ١٩٧٨ وە تا ٢٠٠٦ کەلە یەکێتی دەچێتە دەر فەرماندە و سەرکردەی زۆربەی هەرە زۆری شەرە خوێناوییەکانی نێوان یەکێتی و لایەنە کوردستانییەکان بووە(کەلە راستیدا هەلگیروسێنەری هەرە زۆری شەرەکانیش شەخسی نەوشیروانە ئۆباڵەکە دەکەوێتە ئەستۆی ئەوەوە ئەوەش بەبەڵگەوە روون دەکەمەوە بەرپرسە لەو سەدان دیلەی کە لەشەڕی ناوخۆدا کەوتنە دەست یەکێتی نەوشیروان بەدرێژایی تەنی خۆی ئینکاری لەوە دەکات کە قەت فەرمانی دیلی کوشتنی نەداوە بەڵام

---

[5] - حەمەسەعید حەسەن - جەلالینامە. لا ٤٨

پاساوی بۆ دیلکوژی هێناوەتەوە و وا تیۆریزە کردووە کە دکتۆر کاتێ بیەوێ نەخۆش رزگار بکات، ناچار دەبێت پارچەیەکی جەستەی لێ بکاتەوە !! کوشتن لە روانگەی نەوشیروانەوە یەکێکە لەئامرازە هەرە سەرکوتووەکانی دامرکانەوەی فیتنە و ناکۆکی ، بۆیە قەت سڵی لە کوشتنی کەس نەکردۆتەوە.

پشکۆ نەجمەدین لەبەشێکی دیکەی وەڵامدانەوەی نەوشیروان مستەفادا کە پشکۆ نەجمەدین خۆی یەکێکە لە رێبەرانی کۆمەڵە لەو ساڵانەدا دەڵێ یەکەم کەسێك لەسەر نەکوشتنی دیلێکی ق.م لێپرسینەوەی لەگەڵ کردم خودی نەوشیروان مستەفا بوو !! من کە ئەو کارەم نەکردبوو، ئەو پێی وا بوو ترسنۆکم !... یەکەم جار کەدیل کوشتنم لە نزیکەوە لە ناو ریزەکانی یەکێتیدا بینی، پایزی ١٩٨١ بوو. .. لەماوەی کەمتر لە دوو رۆژاندا ٤٥ چەکداری جود کوژران و ژمارەیەکیان لێ بەدیل گیرا. .. چەکدارێکی هێزی گەرمیانی یەکێتی کە برایەکی لەو شەرەدا کوژرابوو ، بە بەرچاوی هەموو لایەکەوە، گوێچکەی دوو دیلی گرت و لەپەنای دیوارێکەوە گوللەبارانی کردن. . دوو مانگ پاش ئەوە مام ئاراس و چەند چەکدارێکی حسك لە شەرێکدا لەشارەزوور بەدیل گیران، بەکۆبونەوەیەکی سێ دەقیەیی سێ لێپرسراو ، دەستڕێژێکم بیست و ئیتر مام ئاراس دیلەکانی هاورێی نەبینییەوە. ...[6] ، نەوشیروان لەم پرۆسە خوێناوییەدا تەنها دیلەکان ناکوژێت، دیلەکان لە دوژمن گیراون، بەڵام ئەودەستی دەچێتە خوێنی خەڵکانێکیشەوە کە رۆژێ لەرۆژان هانای بۆ بردوون یان تەنانەت ژیانی نەوشیروانیان رزگار کردووە لە چنگیان، خەلیفە کەفەرماندەی دەستەیەکی حسك بوو ئەو(واتا نەوشیروان)ی لەمردن رزگار کرد کەچی کە کەریمی برای خەلیفە عومەری رەشەجوتەی کوشت و بۆلای رژێم هەلات ، بەفەرمانی نەوشیروان خەلیفەیان لە بری کەریم کوشت. .. حەیدەر کە چەندین ساڵ بوو لە راگەیاندنی (ینك)دڵسۆزانە کاری دەکرد نمونەی مرۆڤی تێکۆشەر بوو کە براکەی هەوڵی تیرۆرکردنی نەوشیروان مستەفای دا و هەلات، دەستبەجێ ئەویان لەبری براکەی کوشت حەیدەر تا گیانی دەر چوو هەر دەیگوت: بژی کۆمەڵە، بژی شۆرش. ..(شوان) کە سەروەختی وتوویژ نوێنەری(ینك)بوو لە کەرکوك ، دەکوژرێت و بکوژ هەڵدێت. پێمیەکانی نەوشیروان مستەفا بیست و دوو کەس لە خزمەکانی کابرای بکوژ کە دۆستی شۆرش دەبن.

[6] - پشکۆ نەجمەدین - وەڵامێك بۆ نەوشیروان مستەفا لا٥٥

دەستگیر دەکەن و لە تۆڵەی(شوان) دا حەوتیان ئیعدامی شۆڕشگێرانە دەکەن. ... [7] ، بەلاتانەوە سەیر نییە کە مرۆڤێك خۆی پێ سەرکردەی شۆڕشی نوێ بێت و باس لە دیموکراسی و چەمکەکانی مافی مرۆڤ بکات لە ئەوروپا ژیابێت، ئنجا ئەم رەفتارانە لە مێژووی خۆیدا تۆمار بکات، مێژووە کە هێندە دوور نییە کەخەڵك بەڵگە و نوسراوی عەودالْ بکات، قوربانیان هێشتا کەس و کار و برادەرەکانیان یان شاهیدعەیانەکان زیندوون و ئەگەر رۆژێك دابێت یاسا بتوانێت نەوشیروان پەلکێشی بەردەمی خۆی بکات دڵنیام دەیان کەسی دیکەش ئامادەی شایەدی دان دەبن.

لە دینی نەوشیروان‌دا نەهیچ شتێك حەرامە و نەهیچ شتێك گوناهە، ئەو رەفتارە بەدەوی و نامرۆڤانە نەوشیروان لەمێژووی ٣٥ ساڵەی کاری سیاسی خۆیدا تۆماری کردوون، تەنانەت مەغۆل و بەبەرەکانیش پێشرەویان لێ نەکردووە لای ئەوان ئەگەر دینێکیش نەبووبێت ئینسانیەت و ویژدان هەبووە کە رەفتاری وانەکەن، کەچی نەوشیروان برای بێ گوناه بەتاوانی کارێك کە نەیکردووە هەر ئاگاشی لێ نەبووە گوللەباران دەکات، ئای لەو داهێنانە گەورەیە ! هیچ یاسایەکی قەرەقوشی مەگەر بەعس ئەگەرنا هیچ کەسێك لەبری تاوانێك کە برا یان خزم و کەس وکاری ئەنجامیان دابێت گوللەباران ناکات. نەوشیروان شۆڕشەکەشی شۆڕشی خەڵکانی دواکەوتووە کە وەك چۆن لە خوێنداریدا شەلم کوێرم ناپارێزم لێکتری دەکوژن، لە بەناو شۆڕشیشدا هەمان رەفتارە بەلاّم بەشێوەیەکی سیستەماتیك دووبارە دەکاتەوە. ئەو ماسۆشیە. ئنجا وەرن بزانن نەوشیروان چۆن بەقسەی خۆی دەگرم ، نەوشیروان لە کتێبی پەجەکان یەکتری دەشکێنن باسی روداوێك دەکات کە کە تێیدا پێشمەرگەکانی یەکێتی عەولاّ ماویلی ناوێك کەئەندامی حزبی شیوعی بووە دەکوژن و لەدرێژەدا ئاوا دەنوسێ " لێپرسراوانی حسك لەناوچەکەدا لەمە زۆر تر دەبن یەکێتی کێیە و ئەوان کێن تا بتوانن دەستدرێژ بکەنە سەر و هاورێی حزب بکوژن . ئەوانیش بیریان لە تۆڵەکردبوەوە بەلاّم نەك لەوانەی ئەوکارەیان ئەنجام دابوو بەڵکو وەکو خێڵە دوا کەوتویەکانی کورد ، لەهەر یەکێتییەکی کە بەردەستییان بکەوێت [8] ، بەلاّم نەوشیروان

---

[7] - حەمەسەعید حەسەن - جەلالینامە. لا ٥٨

[8] - نەوشیروان مستەفا ئەمین - پە نجەکان یەکتری ئەشکێنن لا٢١٢

دواکەوتوو نییە کە برا بەتاوانی برابوون ، خزم بەتاوانی خزم بوون، ناسیاو بەتاوانی ناسیاو بوون، لەگەڵ بکوژێك یان تاوانبارێکدا، گوللەباران دەکات.

نەوشیروان بۆ دامرکاندنی رقی خۆی پەنا بۆ هەموو کەسێك دەبات ، وەك چۆن لە دژی بارزانی پەنا دەباتە بەربەعس دواتریش کە سکرتێری کۆمەڵەیە بۆ کوشتنی نەیارەکانی خۆی پەنا دەباتە بەر جاش و ئامر مەفرەزە کەنەوشیروان مستەفا لە ۱۹۸۱ لەلایەن(حسك)ەوە بەدیل گیرا و حسك دواتر ئازادیان کرد، رقێکی وای لێ هەلگرتن کە تا ئەمرۆشی لەگەڵدا بێت هەر بەو رقەوە دەژیەت بۆ دامرکاندنەوەی ئەم رقە بەدەیان شۆرشگێری(حسك) ی شەهید کرد، بەڵام ئەو رقە هەر نەنیشتەوە.

" کاك نەوشیروان زۆر حاقد بوو لەسەر سۆسیالست، ئارپیجییان لەماڵی باوکی کاك تاهر دا لەسلێمانی و کوشتنی مام ئاراس و ۹ کەسی تری لەرۆژی جەژنی قوربانی ساڵی ۱۹۸۲ دا شەهید کرد. بەئەمری کاك نەوشیروان و جێبەجێکردنی شەوکەتی حاجی موشیر و کاك حامید حاجی خالید کاك حاکم عومەر عەزیز کە هەر سێکیان لیژنەی هەرێم بوون بەدەستی خۆیشی شەهید عبداللە سور و هەڤاڵانی شەهید کرد و بریاری کوشتنی کاکە سوری قۆریتانی دا کەفەرماندەی کەرت بوو لای سۆسیالست لەدەشتی کۆیە لەکاتی ئاشتیدا چەکیان کردبوو بۆ کوشتنەکەی هیچ مەسولێکی یەکێتی جێ بەجێ ی نەدەکرد . لە ناوزەنگەوە گواستیانەوە بۆ بەرگەڵو ، ئامر مەفرەزەیەکی جاشیان گرتبوو لەمەنتیقەی ئاغجەلەر کاك نەوشیروان پێی وتبوو ئیشێکمان هەیە ئەگەر بیکەی عافوت دەکەین و دەتکەین بەپێشمەرگە کاك فاتیح شوانیش لە دانیشتنەکەیاندا بوو. کابرای جاشیش خۆ مەبەستی ئەوەیە پێشمەرگە بکوژێت چ لە رەبایە بێت چ لای کاك نەوشیروان بێت وەکو یەك وایە بۆی. بۆیە بۆیە جاشەکە کاکە سوری شەهید کرد و دوایی کردیان بەئامر کەرت لە تیپی ۲۱ ی کەرکوك. .....[9]

سەیر بکەن چ ئاگرێك لەدەرونی ئەم ئینسانەدا بەرپا بووە ، پێشمەرگە بەدیل دەکرێت و بەدەستی جاش دەیکوژێ جاشەکەش دەکاتە ئامر کەرت ! شوشتنەوە و تاوان و ناپاکییەکانی جاشێك، رشتنی خوێنی شۆرشگێرێکی کوردە؟!

---

[9] - حەمەی حاجی محمود - رۆژژمێری پێشمەرگەیە لا ٤١٦

ئـەو دوژمنـی هـەموو شـت و هـەموو کەسێکە. ئـەو دەڵـێ: " لەبـەیانی تـا بیـوەڕۆ رقـم لەخۆمە لە نیوەرۆ بەدواوە رقم لەخۆم و خەڵکە ". باشـە کەسێکی وا چۆن دەبـێ ئازادانـە بـسورێتەوە و نەخرێتـە شـوێنێك نـەتوانێت ئـازار بەخـەڵك بگەیـەنێ. داهێنانـە نـا ئینسانییەکانی نەوشیروان یەکجار زۆرن. " لەکۆنفرانسی سێدا(مەبەست کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەیە لەساڵی ١٩٨٤)کۆمیتەیـەکی هەڵبـژێردراو خـەریکی لێکۆلینـەوە دەبـن لەگـەڵ ئـەو دەستەیەی تاوانی لەتکردنی ریزەکانی کۆمەڵەیان درابووە پاڵ، نەوشیروان هاوار دەکات " لێکۆڵینەوەی ناوێت، بیاندەنە دەست من، هەریەکەیان لەژێر پۆستەری شەهیدێکدا دەکوژم. ..... "[10] ، ئەوە چ ئاشێکە لەخوێن تێر نابێت دەست لە هیـچ شـت و کەسێك ناپارێزێت دوای ئەو هەموو ساڵە دەمەوێ بڵێم هەقـە خـاوەن شـەهیدان و بنەماڵەکانیان جارێکی دیکـە لـە روداوی کـوژرانی کەسـوکاری خۆیـان ورد ببنــەوە، لێیـان بکۆڵنــەوە بـزانن ئایـا بەراسـتی کەسـوکاری ئـەوان کـێ کوشـتونی، چـونکە سـاڵی ١٩٧٩ بەئەنـدام بـوونی جەبـەباری حـاجی وەسمـان، بەکامــەران عـارفی پێنجـوێنی و دکتـۆر قـادر(کـە دوو کـادری کرمەڵـەبوون لـە شـارەزور)دەڵێـت: گلـەیی لـە رەوتـاری ئـەم کـادیری عەسـکەری و فەرمانـدەی پێـشمەرگەیە مەکەن لەشەرا لەپشتەوە بیانکەن بە قوربانی یەك دوو گوللە ئـیتر خوێندنـەوەی دوو سـێ دێـری لـە پرۆگرامـی کـاروانی شـەهیداندا ، بـەدەم مۆسـیقایەکی خەمناکەوە بـۆ ئێمـە چـی تێدەچێت؟..... "[11] ، ئەمەیە مرۆڤ لەسەرانسەری خەبات و قوربانی رێکخراوێکیش بە گومـان دەخات؟ ئایا پێشمەرگەکانی یەکێتی چەندیان بەدەستی یەکتری کوژراون؟ ئایا راستە فلاّنـە شـەهیدی (ینـك) لەمەیـدانی شـەڕدا بەدەسـتی جاشـێك یـان پێـشمەرگەی لایـەنێکی دیکـە کـوژراوە ، یـان نەوشـیروان رایـسپاردووە لـە پشتەوە یـەك دوو گوللەی پێـوە بنرێـت؟ ئـاخۆ دەبێـت نەوشـیروان چـەند گاڵتـەی بـەو فلوتـە حەزینـە هاتبێـت کـە بـۆ شـەهید بـوونی پێشمەرگەکانی(ینك)لێدەدران؟ هـەموو ئەوانـەی لای نەوشـیروان بونـە، قوربـانی، بکوژەکـان بەدەستی بکوژی نوێتر دەکوژرانەوە و ئەو پرۆسەیە بەردەوام دەبوو.

---

[10] - حەمەسەعید حەسەن - جەلالینامە لا ٥٩

[11] - حەمەسەعید حەسەن - جەلالینامە لا ٥٦

## نەوشیروان مستەفا ئەمین و خولانەوە لەنێو بازنەدا

رامیار علی

### شەڕەنگێز فیتنەچی و ترسنۆك

سەیرترین دیاردەی ناو ژیانی نەوشیروان مستەفا بەدرێژایی ٣٥ ساڵی کاری سیاسی و چەکداری ئەوەیە کە تەنها یەك جار لەژیانیدا ئەویش لە ١٠ ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٦ لە ئۆپەراسیۆنی فەتحی یەك، شان بەشانی پاسدارانی ئێران پەلاماری بیرە نەوتەکانی کەرکوکی داوە. یان حەمەسەعید حەسەن وتەنی " لەوێشدا وەك کوردێکی ماتۆڕسواری موسلمان چاوساغی پازداران بوو ". لەوە بترازی جگە لەکورد قەت فیشەکی بەکەسی ترەوە نەناوە، یەکەم فیشەکی بەهەڵە خۆی لەخۆی داوە لەکۆتایی شەستەکاندا لە سلێمانی شەوێکیان بەئومێدی راوە پێشمەرگە لە بۆسەدا دەبێت، لەشەری نەبوو، بەجۆرێك زراوی دەچێت بە غەدداره ژەنگاوییەکەی، خۆی بریندار دەکات. "[١٢]، ئەمە یەکەم چالاکی تۆمارکراوی سەربازی نەوشیروانە کە بۆ راوە پێشمەرگە چووە، ئەوسا لەگەڵ بەعسدا بوو، ئەوە لەکاتێکدا گەورەترین تۆمەتێك دەیخاتە پاڵ نەیارانی خۆیەوە " کۆنە بەعسی "بوونە. ئنجا کەلاپەرەکانی ژیانی ئەم کابرایە هەڵدەدەیتەوە دەبینی بەفیعلی بەدرێژایی تەمەنی کوردی لە دژی کورد هانداوە ، بەگژیەکی دا کردوون چێژی لە ڕژانی خوێنیان بە دەستی یەکیتری بینیوە.

زۆرترین کاری نوسینی نەوشیروانیش چ لەسەردەمی هەفتاکانەی رزگاری و چ لەسەردەمانی دوای ئەوە لەو یەکێتی و راگەیاندنی کۆمەڵە بریتی بووە لەوەی کە بەجۆرێك لە جۆرەکانی توند و تیژی رقی کورد بەرامبەر کورد زیاد بکات نەوشیروان ئەگەر ئەمرۆبێت و بڵێت بۆ کورد چ شانازییەکی تۆمار کردووە تەنها و تەنها دەبێت باسی ئەورۆژە بکات کەبەپێش پاسدارانی ئێران کەوتووە تا لەبیرەنەوتەکانی کەرکوك بدات باشە

---

[12] - حەمەسەعید حەسەن - جەلالینامە لا ٥٦

ئەگەر وانییە با نەوشیروان پێمان بڵێت لەکام شەر و لەکام ناوچەیە پەلاماری هێزێکی عێراقی داوە، لە چ شەرێکی بەعسدا ئەو سەرکردایەتی شەری کردووە؟

وەڵامی ئەو پرسیارانە بۆ نەوشیروان زۆر قورسن و دەبێت لە ئەزمونی کوردایەتیدا یان تەرکیان بکات، یانیش ئەگەر تەرکیان نەبێت دەبێت ئاوا وەڵامیان بدەتەوە " ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو چارەسەر بکرێت. .. هێزەکانیشمان کۆکردەوە و سازماندان بۆ پەلاماردان و راوەدوونانیان. .. [١٣] ، کۆبونەوەی هێزەکە لەشلێر بۆ چەند مەبەستێك بوو، یەکەمیا پشوپێدان و رێکخستنەوەی، دووەمیان دانانی رێوشوێنی هەڵکەندنی قم (مەبەست قیادە موئەقەتە)لە سورێن و هەڵوەشاندنی هێزەکەیان. .. [١٤] ، مەسەلەی پاککردنەوەی کوردستان لە چەکدارەکانی قم. .. دوودڵی و راڕایی لە لێدانی قم دا جارێکی تر لە دڵی هەندێکدا شین بووەوە. .. [١٥] ، هێزەکانی پارتی بەبیانوی یارمەتیدانەوە ویستیان لە چەمی نۆکان بپەرنەوە بۆ بەری بارەگاکانی ئێمە یەکیان بەهۆکی تۆکی قسەی دەکرد وتی: ئەمانەێ بێین لەو شەرەدا یارمەتیتان بدەین، پێم وتن: پێویستیمان بەیارمەتی ئێوەنییە، بەشی هەردوو لاتان دەکەین بەهێزەکانی خۆمانم وت رێگایان نەدەن حیز فرسەتی بکەن !. .. [١٦] ، نەخشەیەکمان دانا ئەگەر هێزەکانی پارتی لە ناوچەکە نەکشانەوە لەگەڵ دەستپێکردنی بارانی پەڵەدا لەچەند لایەکەوە پەلاماریان بدەین و دەریان بکەین. .. [١٧] ، هێزێك ببەم بۆ ناوچەی مەنگورایەتی و لەوێ لەگەڵ هێزەکانی مستەفا چاورەش یەك بگرینەوە هێزەکانی حسك بکەینە ناو " کەمماشەوە " وە [١٨] ، ئیتر چوم بۆ سەرکردایەتی شەرەکان. .. [١٩] ، و. .هتد ".

هیچ یەك لەو هەرەشە و گورەشە و پیلانە دژی رژێمی بەعس و سوپاکەی نین ، هەموویان پیلان و خۆئامادەکردنە بۆ لێدانی لایەنە کوردییەکان. بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە کەلەم شەرانەدا نەوشیروان هەمیشە لە پشتی پشتەوە، هەمیشە خەڵك دەنێرێت

---

13 - نەوشیروان مستەفا لەکەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ لا ٢١٨

14 - هەمان سەرچاوە لا٢٢٨

15 - هەمان سەرچاوە لا ٢٧٠

16 - نەوشیروان مستەفا پە نجەکان یەکتری نەشکێنن لا١٧٤

17 - هەمان سەرچاوە لا١٧٥

18 - هەمان سەرچاوە لا ٢١٦

19 - هەمان سەرچاوە ٢٩٠

شەر بکەن خۆی دوای کۆتایی شەر دەگاتە شوێنی رووداوەکان ، چونەك ئەو دەترسێ بکوژرێ و خوانەخواستە شەهید بێت کۆمەڵە بێ سەرکردایەتی بمێنێتەوە ! ئەو پیاوێکە لەسێبەری خۆشی دەترسێت جارێکیان " کەلە سوریاوە بەرەو کوردستان بەرێدەکەوێت گوێی لەتەقەیەکی دوور دەبێت بە جۆرێك دەشڵەژێت و هەڵدێت تەنانەت یەکەمین مۆری " ینك " یشی لێ جێدەمێنێ. ئایا لێ بەجێمانی یەکەمین مۆری شۆرشی نوێ شیاوی ئەوە نەبوو لە بیرەوەرییەکانیدا تۆماری بکات. .. "[20] ، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا کەئازانییە راستگۆنییە و هەموو روداوێکی بەقازانجی خۆی گێراوەتەوە.ساڵی ١٩٨١ حەمەی حاجی محمود کە حسك دەبێت ، نەوشیروان مستەفا دەگرێت، کاکە حەمە ئەو روداوەی وەك خۆی لەکتێبی رۆژژمێری پێشمەرگەیدا تۆمارکردووە، کاکە حەمە پیاوێکی سادایە، خۆئەگەر حەمەی حاجی محمود کاتێ ئەو کتێبەی لە ١٩٩٩ بلاوکردەوە دژی ینك بوایە رێگەی تێدەچوو کەپیاو بڵێت هەندێك غەریزەی تێدایە، بەلام حەمە لەباس کردنی روداوەکە و دواتریشی کەناوی نەوشیروان دەهێنێ بە کاك نەوشیروان ناوی دەبات بەلام سەیر ئەوەیە نەوشیروان روداوەکەی بە ١٨٠ پێچەوانە بۆ خەلکی گێراوەتەوە روداوەکە ئەوپەری بێ جورئەتی و بێوەفایی و بێباوەری و خۆپەرستی نەوشیروان نیشان دەدات کەلەدەمی کاکە حەمەوە ئاوایە:

قادر چاوشین و مام ئاراس هەموویان کۆکردبۆوە لە مزگەوتەکەو پێیان وتبوون کە کاك نەوشیروان لە کایەنەکەی ماڵی حاجی عەلییە، ئێستا دەچین بۆیان چونکە من لەنامەکەمدا تەئکیدم کردبوو کە بیگرن نەك بیکوژن، بۆیە برادەرانی ئێمە وتبویان هەوڵ بدەن ئەگەر دوو سێ کەسمان لێکوژرا تەقەمەکەن تا بیگرین وایان زانیبو کەکاك نەوشیروان تا ئاخر فیشەك لە ژوورەوە شەڕ دەکات ئاخر فیشەکیش خۆی پێدەکوژێت، ئەو مەسولانەش کەلەگەڵ قادر چاوشین و مام ئاراس بوون کە تێکەڵی هەموو هەرێمەکان بوون ئەمانەن: محی الدین حەمە حەسەن و مەحمودی حەمە تاتە و سیروانی سەید جوقلی جەباری عەلی عەزیز شەهید مام کەریم و شەهید مەلا نوری لە مزگەوتەکەوە دەڕۆن و رودەکەنە ماڵی حاجی عەلی. هەموو چەکەکانیان بەدەستیانەوە دەبێت و دەڵێن نابێت لێی ئەدەین. کاك نەوشیروان لە کونی کایەنەکەوە سەیردەکات کە هەموویان بەرەو ماڵەکەهاتن زوو بەکاك

---

[20] - حەمەسەعید حەسەن - جەلالینامە لا ٥٦

حەمەی حاجی سابیر دەڵێت تازە پێیان زانین با نەمانکوژن تەسلیم ببین ، کاکە حەمە دەنێرێتە حەوشەکەوە و هاواردەکات تەقە مەکەن تەسلیم دەبین بەلاّم بمانبەن بۆلای کاك تاهر یا قادر چاوشین بێت، تەسلیمی قادر چاوشین دەبم مام ئاراس و ئەوان کە دێن دەیانگرن کاکە حەمەی حاجی سابیر و ئەوان چەك دەکەن مام ئاراس دەڵێت بۆ ئیحترامی کاك نەوشیروان چەك ناکەین لەبەرچاوی خەڵك تا دەیبەینە لای برادەران ئیتر هەموو جلەکانی کاك نەوشیروان کەپڕ بوو لە کا و گزرەی ناو کایەنەکە پێشمەرگەکان بۆی دەتەکێنن و ئیحترامیان لێ دەگرن و دەیهێنن و مام کەریم و مام ئاراس و کاك قادر هێنایان وتیان خۆمان هێناومانە بۆ ئەوەی لەرێگە کەس قسەی پێ نەڵێت و شتەکە وا بووە . کاك نەوشیروان دانیشت و بەخێرهاتنمان کرد زۆر نارەحەت بوو زۆریش تێکچوو بوو، کاك تاهیر وتی چی لێ بکەین وتم ئەوە گیراوە و دوو رۆژ پێش ئێستا نامەی تەهدید و هەرەشەی نوسیوە با لاتان بێت ئێمە پێشمەرگەمان لای ئەوان گیراوە کاك رەووف بەکاك تاهیری وت بەردانی چی؟ کاك رەووف بەکاك نەوشیروانی وت: کاك نەوشیروان بێتاقەت مەبە دنیا وایە جارێ پێشمەرگە لای حوکومەت ئەگیرێ جارێ حوکومەت لای پێشمەرگە ئەگیرێ. چونکە کاتێ کاك رەووف سجن بوو لەسەر کردایەتی لای کاك نەوشیروان. کاك نەوشیروان وتبووی من حوکومەتم خەڵك دەسگیردەکەم و ئەیگرم و ئەی کوژم و بەری ئەدەم بەئارەزووی خۆمە کەس هەیە بلێ وامەکە. کاتێ کە کاك نەوشیروان کاك رەووف وەلاّمی دایەوە وتی تۆبەمنت دەوت من سجنت دەکەم وامنیش ئێستا تۆ سجن دەکەم ئەو چەکەش بکەرەوە لەشانت بێزەحمەت چەکەکەشی پێشمەرگەیەك هەڵیگرت و کاك رەووف بەخۆی بوو ، چونکە چەکەکەی کاك رەووف وەختی خۆی کاك نەوشیروان لێی سەند بوو لەسەرکردایەتی، کاك شیروان شیروەندی بەکاك تاهیری وت بە گۆری شەهیدان باسی بەردانی کاك نەوشیروان بکەیت ئێستا ئیستقالە دەدەم لەحزب ئێمە بەگرتنی نەوشیروان سکرتێری کۆمەڵە وەك ئەوە وایە رۆحی کۆمەڵە لەدەست ئێمەدا بێت، هەرکات بمانەوێ رۆحی دەردەکەین، کاك تاهیر وتی کاك نەوشیروان ئەوشەرە بۆدەکەن و رای ناگرن بۆ وادەکەن، وتی کاك تاهیر من ئێستا سجنم و دەسەلاّتم نییە من بۆشەر نەهاتووم و بۆلای دایکم هاتووم و ژن بهێنم ئێستە ئێوە بەرم بدەن وەعد بێت لە کوردستان دانەنیشم

ودەچمە دەرەوە دڵی زۆر پڕ بوبو هەر ئەومابوو لە پرمەی گریان بدات کاک تاهیر رەحمی جولاّ و وتی بابەری بدەین گوناحە، کاک شیروان شێروەندی وتی کاک تاهیر بۆ ئێستاش خۆت بەمەسول نازانی تۆی بگرتایە دەی کوشتی چۆن بەری دەدیت ئەگەر ئەو قسەیە ئیستقالە بکەیتەوە من ئیستقالەدەکەم، کاک قادر جەباری وتی کاک تاهیر ئێستە ئێمە سکرتێری کۆمەڵە و جێگیری سکرتێری یەکێتیمان ئەسیر کردووە واتا رۆحی کۆمەڵە لەدەست ئێمەدایە هەرکات بمانەوێ گیانی دەردەکەین لە کۆبونەوەی ئاسکان و لەبەردەم کاک نەوشیروان هەمان قسەی دوبارە کردەوە من وتم بالامان بێت تا شەرەکەیان پێ رادەگرین من لەگەڵ کوشتنی دا نەبووم و زۆربەی برادەران لەگەڵ کوشتنیدا بوون، هەندێ پێشمەرگە دەیانوت ئێمە دەیکوژین و تەسلیم بە رژێم دەبینەوە و دوایی دێینەوە ئەگەر پارەشیان دا ئەوە دەیدەینە حزب من و کاک تاهیر لەگەڵ کوشتنی نەبووین زۆر دەترسا لە کوشتنی یان تەسلیم بە قیادە موئەقەتەی بکەین، یان تەسلیم بە عێراقی بکەین، هەموو بۆچونەکانی هەڵەبوو گرتنی کاک نەوشیروان گەورەترین سەرکەوتنی سۆسیالست و ئێمە بوو چونکە لەکاتی خۆی لەسەر کردایەتی پێم وتبوو کە ئێستا کادرێکی یەکێتی بەدەمانچەوە دەڕواتە بەمۆ و خانەقین و کەس ناتوانێت دەستی بۆ بێنێت بەلاّم ئەگەر من لەگەڵ یەکێتی نەبم بە ٥٠ کەسیش ئەوە ناتوانن لە شارەزورەوە تێپەڕن بەلاّم کاتێ منیان کرد بەدژی خۆیان بە ٣٠٠ کەسیش ئەوەهات کە هێزەکەیمان ترساندبوو تەفروتونا بوو بوو، خۆشی تێدا گیرا دوا ئەوە من بڕیارم دا لەگەڵ سۆسیالست ئیش بکەم بەلاّم زۆر بەحەزەرەوە کاک تاهیر هێزەکە و مەسئولەکانی کۆکردەوە کە قسەی دژی یەکێتی نەکەن لەبەر موراعاتی ئێمە ناوی مام جەلال نەهێنن من پێم ناخۆش بوو سەرەتا یەکێتیش بەلاّم کۆمەڵە تاکیدی لەسەر بکرێت من ڕام وا بوو لەسەر کۆمەڵە تەئکید بکرێت پێشمەرگە قسەیان بەجەلالی دەوت چاویان بەمن کەوت قسەیان دەبڕی یان دەگێرایەوە. گرتنی نەوشیروان دوو لای دروست کردبوو لەناو یەکێتی دا یەکێ دژەکانی کاک نەوشیروان پێیان خۆش بوو بەتایبەتی کاک سالار و کاک مەلا بەختیار، بەلاّم وایان نیشان دەدا زۆر بەپەرۆشەوە بوون بۆی. نامەی تەهدیدیان بۆ کاک تاهیر نوسی بوو لە زەردۆیی بۆیان هێنابن کەدەڵێ ئەگەر کاک نەوشیروان شتێکی لێ بێت ئەوا بەرەچەڵەکتانا دەچینەخوار و

وادەکەین. کاك قادر و برادەرەکانی ئێمەش گریان گرتبوو دەیان وت دەی کوژین بزانین چی دەبێت، کاك نەوشیروان وتی ئەوانە دژی منن بۆیە وادەکەن ئێوە من بکوژن لەکۆڵیان ببمەوە، وا دەزانن جێگام لێ داگیر کردوون خۆ ئەوانە دۆستی من نین لە زەردۆیی بوون، نامەکە ئیمزای کاك سالار و کاك مەلا بەختیار و کاك بەکری حاجی سەفەری لەسەر بوو، کاك نەوشیروان وتی ئەو نامەیەیان بۆیە نوسیوە بۆئەوەی ئێوە من بکوژن و ساحە بۆ ئەوان تەخت بێت. ... "[21] . ئەم روداوە لەکتێبەکەی نەوشیرواندا ٪۱۰۰ پێچەوانە باسکراوە وەك حەمەی حاجی مەحمود دەڵێ کە " کاك نەوشیروان وا نیشان دەدات گوایە وەك پاڵەوانی ئەفسانەیی توانیویەتی لەدەست ئێمە رابکات، درۆدەکات خۆمان بەرماندا " لەوێدا نەوشیروان پاڵەوانێکە کە بەفێڵ گیراوە ! وەك ئەوەی رۆژێك پێشتر هەرەشەی تەفروتوناکردنی لە حسك کردبێت، ئەو نەبوبێت و یەکێکی دیکە بوبێت دەڵێ کە بۆشەر نەهاتووە و بگرە ویستویەتی بچێت بۆ لای دایکی ژنی بۆ بێنێت !. حەمەی حاجی محمود بەپێچەوانی نەوشیروان دەڵێ هیچ هەوڵێکی سەربازی بۆ ئازادکردنی نەوشیروان لە دەست حسك نەدرا ، دەڵێ کەوا قارەمانە شێرخۆرەکانی، بن دەست و باڵی نەوشیروان مستەفا بەو هیوایە بتوانن ئازادی بکەین پەلاماری داین کە ۷ یان ئامر کەرت بوونە و کاکەحەمە ئەوانیشی بەدیل گرتووە و بردونیە لای نەوشیروان و دەڵێ: " ئەو هەموو قارەمانانە گیرابوون و بردمنەوە لای کاك نەوشیروان. وتمان بۆ وادەکەن، ئەوەیش هێزەکەتانە بەرگەناگرێت کاك نەوشیروان دەترسا لێمان بکوژێت و ئێمەش ئەو بکوژین کاك نەوشیروان حەزی دەکرد هەموو هێزەکەی یەکێتی بکوژرێت. بەڵام یەکێ لەئێمە نەکوژرێت. ... "[22] ، ئەوەش بەخۆپەرستی نەوشیروان دادەنرێ، کە حەزبکات هەموو پێشمەرگەکانی ینك بکوژرێن، بەس یەك حسك نەکوژرێت چونکە ئەگەر حسکێك بکوژرابایە، بەپێی ئەو نەریتەی کە خۆی پەرەی پێدابوو پێشمەرگەیەکی حیسك دەهات دەیبرد و لەبن دیوارێك گوللەبارانی دەکرد. نەوشیروان تا ئەو رۆژەی لە کوردستان شەری براکوژی دەبێت هەمیشە ئامادەگی هەیە، بەڵام کاتێك لە ۸ی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۸٦ دا جەولەی یەکەمی شەری

---

[21] - حەمەی حاجی مەحمود رۆژژمێری پێشمەرگەیەك. لا ٤٠٢ - ٤٠٤

[22] - حەمەی حاجی مەحمود رۆژژمێری پێشمەرگەیەك. لا ٤٠٧

براکوژی بەرێکەوتنی پارتی و یەکێتی کۆتابی پێ دێت نەوشیروانیش هەست دەکات پێویستی بە ئیسراحەتە، بۆیە خەبات دژی بەعس ئیهمال دەکات و سەفەری ئەوروپا دەکاتو تاکاتی ئەونفالەکانیش ناگەرێتەوە.

## شەرەنگێز فیتنەچی و ترسنۆك

نەوشیروان مستەفا بێ کاراکتەرە و قەت ناکرێ بتوانێ لەژێر سێبەری مام جەلال دەرچێت، ئەو هەمیشە حەزدەکات بریار بەدەست بێت، بەلأم بە بەرپرسیار دانەنرێت، چونکە بێ ئیرادەیە، دوایی شانی خۆی لەبەرپرسیارێتی بەتاڵ بکات. بێ کاراکتەری نەوشیروان بەسەراپای مێژووی سیاسی ئەوەوە دیارە. لەکوێ بەرژەوەندی تاکەکەسی ئەوی تێدا بێت، بریارەکەی دەرکردووە و سڵی لەهیچ نەکردۆتەوە ولەکوێش زانیبێتی باری بەرپرسیارێتی کەوتۆتە سەرشان تۆپەکان هەمیشە هەڵدراونەتەوە ناوکۆشی مام جەلال یان مەکتەبی سیاسی یەکێتی. لە ١٩٨٤ دا خۆی ئەندازیاری ئەوەیە کە یەکێتی لەگەڵ بەعسدا ئاشت بکاتەوە ئەوکاتە مام جەلال لەدەرەوە دەبێت و لە بەعسەوە نامەی بۆ دێت، نەوشیروان چونکە کەیفی زۆر بەوکارە دێت، هەر زوو قەناعەت بەتاڵەبانی دەکات کە بچێتە بەغداد و لەگەڵ سەددامدا رێك بکەوێ ئەو دەیەوێ یەکێتی(یان باشتر بڵێم خۆی وەك نەوشیروان مستەفا)شتێك بەدەست بهێنێت کە هەیبەتی مەلا مستەفا بارزانی و بەیانی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ بخاتە ژێرەوە "[23] ، چونکە بەرای نەوشیروان " گرنگترین بەلگەی قانوونی بەدەس کردەوە و لە عێراقدا بەیانی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ یە "[24] ، نەوشیروان دەڵێ بەمام جەلالم وت ناوی خوای لێبێنە و رێککەوتنەکە ئیمزابکە "[25] ، بەلأم تاڵەبانی لەوەلأمدا دەڵێت " دەستیشم لەبنا ببرنەوە رێککەوتن ئیمزا ناکەم؟ کەنەوشیروان لێی دەپرسێ " ئەی کەواتە بۆچی ئەچی " مام جەلال لەوەلأمدا دەڵێ " بەزۆر ئەمنێرن " "[26] ، دیارە لەمێژویشدا ئۆباڵی ئەو دانوستانانەی ئەوسا هەر هەمووی دەکەوێتە ئەستۆی نەوشیروان مستەفا کەتەنها لە پێناوی گرێ دەروونییەکانی خۆی لەگەڵماڵباتی بارزانیدا ئامادەیە

---

[23] - نەوشیروان مستەفا - خولانەوە لەناو بازنەدا لا ٢٠

[24] - هەمان سەرچاوە لا٢٠

[25] - هەمان سەرچاوە لا ١٠

[26] - هەمان سەرچاوە لا ١٠ - ١١

هەموو کارێك بکات، کە ئەمرۆ نەوشیروان دەڵێ یەکێتی بەدرێژایی تەمەنی حزبێکی مەرکەزی بووە و نەکراوەتە حزبێکی دامەزراوەیی راست ناکات ، ئەو هەموو دەسەلاتێکی هەبووە، دەسەلات و کاریگەری ئەو بەسەر مام جەلالدا هێندەزۆرە، کە دەتوانێ قەناعەتی پێ بێنێت و و بینێرێتە لای سەددام. هەرخودی نەوشیروان کاتێ باسی نەیارانی یەکێتی دەکات، لەهەموو شوێنێك بەتوندی بەرپەرچی ئەو هەموو بیر و رایانە دەداتەوە کە دەڵێن مام جەلال دیکتاتۆرە و ئەوقسانە بەقسەی بێ بنەما و پرو پوچ لەقەڵەم دەدات.[27] ، ئەو لەژێر سێبەری تاڵەبانیدا دەژیەت و تاکتیکەکانی جێبەجێ دەکات دوایی کەدەبینێ توانای کاری نەماوە ئەوەتا ئەو حزبەی ئەو بۆی هەڵسوڕاوە وا لە ساحەی کوردستاندا قەناعەتی هاتووە کە حزبی یەکەم نییە لێی دەکێشێتەوە گوایە تاڵەبانی دیکتاتۆرە، بەقسەی کەس ناکا و. ... هتد.

دوای ئەوەی عێراق کوەیتی داگیر کرد خۆی گەیاندە کوردستان تا کۆتایی دانوستانەکانی نێوان بەرەی کوردستانی و حوکومەتی بەعس لە کوردستان بوو، ئنجا بێ ئەوەی نوقتەیەك بکات بارگەوبنەی خۆی پێچایەوە ودووبارە رووی کردوە هەندەران، وەك چاودێرێکی سیاسی ئاگادار دەڵێ: ئەو بەوهیوایەوە هاتبۆوە کەلەناو کوردستاندا خەڵك سوجدەی بۆبەرن، کەدیتی کوردستان ئەو کوردستانە نییە کە ئەو خەونی پێوە دەدیت و دەبێت لەژێر سێبەری تاڵەبانیدا بێت، نەوشیروان مستەفا زوو رێگەی خاریجی گرتەوە بەر و نەی ویست ئۆباڵی بەرپرسیارێتی دوای راپەرین، لە نەهامەتی و قات وقڕی بکەوێتە سەرشانی ئەو، بەلام کەفتیلی شەری ناوخۆی کوردستان ئاگردرا، بەکونی دەرزیشدا بێت خۆی گەیاندەوە کوردستان تا سەرکردایەتی شەرەکان بکات و یەکەم دوای ئەوەی کەشەری هێنایە ناوهەولێر(هەولێر کوێی موقەدەسە تاشەری تێدانەکرێت ! ن.م)ئیجرائاتی دووەمی گوللە بارانکردنی کۆمۆنیستەکان بو لەساڵی ١٩٩٥ لەناو شاری سلێمانی، کە ئومێدی بەردەومی شەری ناوخۆ لەکزیدایە و دو بارە رێگەی هەندەرانی گرتەوەبەر ئەمە ئەوبازنەیە کە نەوشیروان خۆی تێیدا دەخولێتەوە بەلام قەت باسی ناکات ".

نەوشیروان خۆی نازانێت چی دەوێت و نازانێ دەیەوێ ببێتە چی، بیروباوەری سیاسی شێواوی هەیە. (لەهەفتەنامەی رزگاریدا لەساڵی ١٩٦٨ تا ١٩٦٩ ئەم قەوانەی لێدەدا. .).

---

[27] -- هەمان سەرچاوە لا ٩٦ تا ٩٨

لینین فەرزی کردووە کەحزبی شیوعی خەبات دژی بزوتنەوە عەشایریەکەی بارزانی بکات، کە نۆکەر و بەکرێ گیراوی ئیمپرالیزمە. .(کەلە ١٩٧٤ یش حزبی شیوعی دەکەوێتە سەنگەری دژایەتی کردنی بزوتنەوەکەی بارزانییەوە پاڵ ئەو حزبە. ..) [28]. نەوشیروان هەمیشە هەست بەدۆران دەکات ئەم هەستی دۆراویە هەمیشە خستوێتیە بەردەم ئەوەی شتێك بكات کەکەس نەی کردووە، بەلاّم هەمیشە فەشەل دێنێت تاسەر بۆ هیچ کەسێك وەفای نییە وەتەنها بیر لەخۆی دەکاتەوە، ئەو ناوی منداڵەکەی خۆی ناوناوە(نما)کەهەموو کەس دەزانێ سێ پیتی یەکەمی(ن. نەوشیروان – م. مستەفا – أ. امین)ە. .. ئەم کارە کەکردویەتی عەیب نییە بەلاّم نیشانەی خۆ پەرستییە.

نەوشیروان خۆی وانیشان دەدات کە پیاوێکی سادەیە، بەلاّم ئەوەش راست نییە هەمووی بۆ شاردنەوەی حەزی گەورەیی و دەسەلاّتی رەهایە، ئەو دەیەوێت بەو شێوەیە سەرەنجی خەڵك بۆلای خۆی راکێشێت، نەوشیروان تاکێکی سەرانی شیوعی لەراکێشانی سۆز و عاتیفەی خەڵکی رەش و رووت باش دەزانێت، بۆئەوەی بڵێن کابرایەکە خۆی لەخەڵك جیانەکردۆتەوە، پێلاّو بەسەرپێوە دەکات ! خیلافی ئەو لەگەڵ تاڵەبانی لە ٢٠٠٦ نەلەسەر ریفۆرم بوو و نەلەسەر هیچی دیکە، ئەو نەی توانی ئەوەتەحەمول بکات کە تاڵەبانی بۆ داهاتووی کوردستان لەگەڵ پارتیدا رێك بکەوێت، دوای ٢٠٠٣ زۆری هەوڵدا کە پارتی و یەکێتی لەیەك نزیك نەکەونەوە، ئەو کەئێستا باسی هەڵە لەکیس چووەکان بەنسبەت کەرکوك دەکات، هێندەی کێشە و گرفت لەنێوان پارتی و یەکێتیدا دروست کرد لەسەر مەسەلەی یەکگرتنەوەی هەردوو حوکومەت و سەرۆکایەتی هەرێم و. ... هتد ، بواری بۆ ئەوە نەهێشتەوە کە پارتی و یەکێتی بیر لەکەرکوك بکەنەوە. تاوای لێهات جارێکیان لەکاتی ئەزمەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی هەرێم تاڵەبانی هێندە خرابووە ژێر گوشارەوە لەلایەن نەوشیروانەوە، ئیستقالەکەی خۆی لەدوکان بەجێ هێشت و هاتەسەری رەش هەرەشەی ئەوەشی لە نەوشیروان کرد کەئەگەر وازنەهێنێت ناگەرێتەوە دوکان !.

ئێستا ئەو لە سلێمانی لە ناوحەوشەی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەناو باڵەخانەی چاودێری دارایی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بە پارەی یەکێتی(کەخۆی وتەنی: تادوافلس لەموڵك و ماڵی یەکێتی شەریك و برابەشە) کۆمپانیایەکی دامەزراندووە

[28] - حەمە سەعید حەسەن – جەلالینامە لا ٥٧

چـی خـەڵکی دەرکـراو و پـەراوێزکراوی ناویـەکێتی هەیـە لـەخۆی کۆکردونەتـەوە دیـارە لەناویاندا خەڵکی(کۆنەبەعسی و کۆنـە ئیتلاعـات. .. هتـد)هەن، بەوخەڵکانـە و بـەو بیر و بۆچونەی کەخۆی هەیەتی داوای ریفۆرم و گۆران دەکات. ئەگەر بریارە ریفۆرمێـك بکرێـت، چ رەوای حەقە نەوشیروان (١٠ملیۆن دۆلار لەتاڵەبانی وەرگرێ و رۆژنامەی پێ دەربکات ئەی ئەوە گەندەڵی نییە؟ کێ پێویستی بە رۆژنامەی نەوشیروان هەیە، چ زەروریەتێکی مێژوویی ئەوە فەرز دەکات کە پارە لە یەکێتی وەربگرێت راست و چەپیش پەلاماری ئەم و ئەو بدات و دوایی بڵێی من ئـازادم، ریفۆرمخـوازم، واباشـە هەرنـەبێ کـە نەوشـیروان بیکاتـە مەکتـەبی سیاسی ینك بێتە دەرەوە و ئەنجام ئەم قسانە بکات ، ئەگـەرنا بـەم حاڵـە کـەس بـاوەری پـێ ناکات.

# نەوشیروان بۆ ناتوانێت بێتەناو خەڵکی؟

## وێك چونێك لەنێوان نەوشیروان مستەفا و هیتلەردا

مەلا هەندرێن

دەمێکە(ی. ن. ك)بەدەم گرفتە ناوخۆییەکانییەوە ئازار دەچێژێ و لە زۆر قۆناغیش هەتا لێواری هەڵوەشان و پەرتەوازەبون رۆشتووە، بەلأم هەموو جارەکان بەلێهاتوویی مام جەلال، فتیلەی گرفتە هەلأوساوەکان دەرهێنراوە و بارو دۆخەکە بۆماوەیەك ئارام کراوەتەوە. ئەوەی مایەی سەرەنج بێت، نەوشیروان مستەفا لەهەموو کاتەکاندا، ئەگەر رۆڵی سەرەکی ئاژاوە و گیرو گرفتەکانی ناو یەکێتی نەگێرابێت، ئەوە هەردەم لەجەمسەرێکی کێشەکاندا وەستاوە بێ ماندو بوون و بەدرێژایی مێژوووی(ی. ن.ك)پشکی دیاری لەم نائارامییە ناوخۆییە بەرکەوتووە.

نەوشیروان مستەفا خەون و حەزی گەیشتن بە ترۆکی دەسەلأت و هەمیشە لەخولیایدا بووە لەهەندێك قۆناغیش شێتگیرانە کاری بۆ وەدەستهێنانی کردووە، بۆئەم ئامانجەش دەیان جۆر رێگەی گرتۆتەبەر لەدەیان بارودۆخی جیاجیاشدا خۆی تاقی کردۆتەوە بەلأم نەوشیروان لەتەك ئەو حەز و خولیا بەهێزەی بۆ بون بەرابەر و سەرکردەیی مێژوویی، هەردەم روبەروی گرفتێکی دەرونی قوڵی کردووە باشترین بەڵگەی بارگاوی بوونی کاك نەوشیروان بەو گرێ دەرونییە ئەو سیفەت و خالأنەی لای خوارەوەیە: -

١- پیاوێکە زۆربەی ژیانی بەمر و مۆچی و تورەیی و گرژی بردۆتەسەر و پێکەنین و قسەی خۆش و نەرم بەدەگمەن بینراوە لێی، زیاتریش حەزی لەتەنیاییە و رقی لە ناو ئاپۆرای خەڵکە ئەوەتا لەم رۆژە چارەنوسسازە بۆلیستەکەی توانای هاتنە ناوخەڵکی نییە ، هەر لەرێگای راگەیاندن قسە بۆخەڵکی دەکات.

٢- بریاری دوژمنایەتی لەگەڵ کەسانی دەور و بەر زۆر بەئاسانی وەردەگرێت ، کەچی بریاری ئاشتبونەوە و ئاسییکردنەوەی پەیوەندییەکانی چییایەکی زۆر بەرزە و بەئاسانی ناتوانێت پیایدا سەربکەوێت ، ئەمەش وایکردووە پشکی رق و تورەیی زیاتر لە خۆشەویستی و ئاسودەیی لە ناخیدا کەڵەکە بێت.

٣- پیاوێکە لەژیانیدا نازانێت بەزەیی و گیانی لێبوردن بەرامبەر بەهەڵەکانی کەسانی دەور و بەر چییە و نمونەیەك لەژیانی کاك نەوشیروان نا بینرێت، کەبریتی بێت لەخەندە و بەزەیی و لێخۆشبوون لەکەسانی بەرامبەر ئەمەش دەیسلمێنێ کە نەوشیروان ئینتمای بۆ هیچ جۆرە جوانییەك نییە

٤- هەرکاتێك دەرفەتی بۆ هەڵکەوتبێت ، بەرامبەرکەسانی دەور و بەری بەتایبەت نەیار و رکەبەرەکانی، ئەوە زۆر بەتوندی و خێرایی هەڵمەتی تۆڵەسەندنەوەی ئەنجام داوە، لەکاتی تۆڵەش بێ رەحمانە مامەڵەدەکات و نمونەکانیش یەکجار زۆرن ئەمەش سیفەتی ئەوکەسانەیە کەباوەریان بەخۆیان نییە و زۆریش لە بەرامبەریان دەترسن.

٥- پیاوێکی هەناسە کورتەو هەرگیز ناتوانێت وەك سەرکردە لەسەرپێی خۆی رابوەستێت، ئەوەتە ئەگەر لەتەواوی مێژووی خۆیدا - تەنها ماوەیەکی کورت رابەر و سەرکردەی(ی. ن. ك)بوایە، ئەوە هەر زوو شکان و بێتوانایی ئەو پیاوە ئاشکرا دەبوو، بۆیە هەمیشە خۆی لەپاڵ مام جەلال ناوە بەلام حەزی سەرشێتانەی بوون بەسەر کردە گیانی یاخی بوونی ناوە ناوە تێدا رواندووە کەچی بلقی یاخی بونەکەی لەنێو ئاژاوە گێریدا، بەزوویی پوچەڵ دەبێتەوە .

٦- پیاوێکە ئەوەی ندەی لەگەڵ ساتەکانی شەر و خوێن رشتن تەبایە، ئەوەندە دۆستایەتی لەگەڵ ئاشتی و پێکەوە ژیانی لایەنە سیاسییەکان نییە، نەوشیروان لەتەواوی پرۆسەکانی ئاشتی خۆی بەدوور گرتووە، کەچی لەقۆناغەکانی شەری ناوخۆ رۆڵی کاریگەری خۆی گێراوە.

٧- پیاوێکە لەروی فکر و تیۆرییەوە زۆر زیرەکە و بەتوانایە و خاوەنی هێزێکی لەبن نەهاتووی نوسین و دارشتنە، بەلام هیچ سودێکی لەو توانا و بیرمەندییەی خۆی وەرنەگرتووە، بەتایبەت ئەم زیرەکییەی نەی توانیوە پارسەنگی لایەنە روکارییەکەی بۆراست بکاتەوە لە گرفت و گرێی دەرونی رزگاری بکات، بەداخەوە کاك نەوشیروان ئەگەرچی زۆریش زیرەکە نەگەشتۆتە ئەو راستییەی کە جوانی مرۆڤ تەنها ستایلی سەر و چاو نییە، بگرە جوانی کاریگەر، بزە و خەندە و قسەی خۆش و خۆشەویستی و گیانی لێبوردن و ئاشتیخوازییە، بەمەش نەوشیروان بەم هەموو توانای فکر و زانستییەوە نەی توانیوە لەگرێ دەرونییەکی رزگاری بێت، تەنانەت ئێستاش کەلەبەشی کۆتایی تەمەنیدایە بەدەستییەوە ئازار دەچێژێت.

٨- هیتلەر، سەرکردەی حزبی سۆسیالستی ئەڵمانی، یەکێکە لەو سەرکردانەی گرفتی دەرونی لەگەڵ روخساری خۆی هەبووە، لە بەژن و بالای خۆی نارازی بوو، چاوێکی خێل و خوار بوو، بۆیە زۆر رقی لە روخساری خۆی دەبووەوە، هیتلەریش بەرلەوەی بگاتە دەسەلاّت دروشمی(گۆران)ی هەلگرتبوو، وێکچونێك لەنێوان نەوشیروان و هیتلەردا هەیە، چ لەگرفت و گرێی دەرونی چ لەروی توند و تیژی و چێژوەرگرتن لە شەڕ و خوێنرشتن، لە دوشمی گۆرانیش وێکچونێك زیاتر قوڵ دەبێتەوە، بەلاّم هیتلەر بەهێمایەك بەتەواوی لە نەوشیروان جیا دەکرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کەهیتلەر باوەری بەخۆی زۆر بەهێز بوو، هەرگیز ئامادەنەبوو لەژێر سایەی کەسێکی تر بژێت.

٩- کاك نەوشیروان لە مێژووی خۆی سەلماندویەتی پیاوی رۆژانی تەنگانە نییە، بەتایبەت بۆ رابەرایەتیکردن ، ئەوەتا دەگێرنەوە لەکاتی دوا شکانەکانی هێزی پێشمەرگە و ئاودیوبوونی(ی. ن. ك)بۆ دیوی ئێران لە سالّی ١٩٨٨ ، ئەوکاتە مام جەلال لەکوردستان نابێت، نەوشیروان کەسی یەکەم دەبێت لە قاسمەرەش بەفەرماندە و پێشمەرگەکانی یەکێتی دەلێت " ئەوەی تەسلیم بەرژێم دەبێتەوە ئازادە، ئەوەی دەچێتە ئێران ئازادە، بەلاّم ئێمە ئیدی ناتوانین پێشمەرگە بەخێو بکەین باهەر کەس بریار لە چارەنوسی خۆی بدات " بەلاّم زۆری پێناچێت مام جەلال دەگەرێتەوە ورەی خەلکەکە بەرز دەکاتەوە پێیان دەلێت نابێت هیچ کەس بەملا و بەولادا بروات، بارودۆخ دەگۆرێت و ئێمەش دەتوانین باشتر لەجاران خۆمان رێکبخەینەوە بۆیە ئەگەر (ی. ن. ك) بەتەمای نەوشیروان بوایە لەو رۆژەوە کۆتایی پێ دەهات ئەوەش بەلگەیەکە گەرچی ئەو پیاوە زۆریش حەزی لەرابەر و سەرکردەی یەکەمی یەکێتییە بەلاّم لەرۆژە سەختە وەرچەرخانەکان چاو لەسەر کردەیەك دەگێرێت سەرکردایەتی وەزعەکەی بۆبکات، بۆیە ئێستاش کە دونیای وێرانکردووە بە دروشمەکانی گۆران کەچی جورئەتی ئەوەناکات لەژێرسایەی یەکێتی بوون دوربکەوێتەوە. دژی یەکێتییە، بەلاّم جارێ لەژێر سایەی مام جەلالە هەرگیز جورئەتناکات جیاببێتەوە و بە سەزکردایەتی خۆی حزبێك رابگەیەنێت. سەرکردایەتی(ی.ن.ك) بالّی ریفۆرمی بەیانکردووە، بۆئەوەی هەمو کاتێك بەئاسانی بتوانێت بخزێتەوە ژێربالّی مام جەلال . لەسەر ئەو بنەما راستییانە دلنیایی هەموو کەسێك دەکەمەوە کە نەوشیرزان ناتوانێت لە مام جەلال جودا ببێتەوە، ئەوەش نەوەك لەبەرئەوەی حەز ناکات. بگرە توانا و جورئەتی رابەرایەتی خەلکی نییە.

١٠- خاڵێکی تر کەپێویستە دەستنیشانی بکەم ئەوەیە کە نەوشیروان بەهۆی ئەو گرفتە دەروونییەوە رقی لەهەموو جوانییەك دەبێتەوە و تەنانەت کارە جوانەکانیش بە ناشیرین دەبینێت، دەیەوێت بەخەڵك بڵێت ئەوەی ئێوە بەچاو دەیبینن و پێتان وایە جوانە و کاری باشە، ئەوە گشتی درۆیە و سەیری ناوەوە بکەن من جوانم و پەیامی گۆڕانم هەلگرتووە، ئەوانەی تریش لەناخەوە ناشیرین و گەندەڵن.

١١- پێویستە قسەلەوەش بکەین دروشمی گۆران بۆچی؟ خۆپەیامی پێشتر و جوانتر و گونجاوتر بوو کە ریفۆرم بوو، دیارە ریفۆرم بریتییە لە چاکسازی نەك ئەوەی کە هەیە نەك رەتکردنەوە و لەڕیشە هەلکێشانی، بەلاّم گۆران بەمانای رەتکردنەوەی تەواوی ئەوەی کە هەیە و گۆرینی بە جێگرەوەیەك ئەویش زیاتر لە شۆرش و کودەتا دەچێت بۆیە هەردەم هەلگری پەیامی گۆران کەسانی توندو تیژن و مامەڵەیان لە بارێکی نائارامی و دڵەراوکێی دەرونی دەبینرێت، ئەگەر سەیر بکەین دەبینین گڕی ئارەزووی گۆڕان لەناو ناخی ئەندامانی لیستی نەوشیروان بەرێژەیەك جۆش دراوە خۆئامادەکردنیان، لەخۆ ئامادەکردن بۆ راپەرین و روخاندنی دەسەلاّت دەچێت، زیاتر لەوەی خۆئامادەکردن بێت بۆ پرۆپاگەندەی هەڵبژاردن بۆیە حەز و ناوەرۆکی ئەم لیستە خاوەنەکەی بۆ خەڵك ئاشکرا بوو، کەهەڵسوکەوتیان مایەی پەسەندی جەماوەرنییە، لەروی دەرونیش ئەگەر خوێندنەوەی بۆ بکەین دەبینین ئارەزووی گۆران، بەرهەمی کاردانەوە و یاخی بونێکی دەرونییە بەسەر تێز و شێوازی بیرکردنەوەی نەوشیروان کە سەرەنجام هەموو شتەکان بەناشرین دێنەبەرچاو ، بۆیە تەنها گۆران بە چارەسەر دەبینێت نەك چاکسازی.

•

## باڵی ریفۆرم و کۆسرەت رەسوڵ دەیانەوێت کۆنگرەی سێی یەکێتی کۆنگرەی تۆڵەکردنەوە بێت لە تاڵەبانی

ئەحمە میرە

### یەکێتی و ترس لەکۆنگرە

تەنها خودا و مام جەلال نەبێت کەس نازانێت کۆنگرەی یەکێتی دەبەسترێت یان نا؟ تەنانەت دوای چەندینجار دواخستن هەتا ئێستا کەس نازانێت بەدیاری کراوی کەی کۆنگرە دەبەسترێت لەروی عەمەلیشەوە جگە لە هەڵاَی ئیعلامی یەکێتی، هیچ ئامادەکارییەکی ئەوتۆی نەکردووە بۆ کۆنگرەکەی کەماوەی ساڵێکە بەرپرسە باڵاکانی دەڵێن بەم نزیکانە دەبەسترێت ئێستا هەمو شتێك لەدەست مام جەلالدایە. تەنها ئەو دەتوانێت بریار بدات کە کۆنگرە دەبەسترێت یان نا؟ رەنگە تاڵەبانی لەمەدا هەڵوەستەیەك بکات ئەگەر زانی ئەنجامەکانی کۆنگرە نابێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی، ئەوا کۆنگرە دەبەستێت و ئەگەر زانیشی ئەنجامەکانی کۆنگرە کێشە دەنێتەوە ئەوا کۆنگرە نابەستێت.

لەهەموو بارێکدا دەتوانین بڵێین یەکێتی ترسنۆکترین حزبی کوردییە لەبەستنی کۆنگرەدا، کەلەماوەی(٣٣) ساڵی تەمەنیدا تەنها دوو کۆنگرەی بەستووە. رەنگە ئەم ترسنۆکییەی لەجێگای خویدا بێت ، چونکە ئەگەر بۆ حزبەکانی دیکە کۆنگرە جێگەی چارەسەرکردنی کێشەکان بووبێت ئەوا بۆ یەکێتی شوێنی تەقینەوە و گەورەبوونی کێشەکان بووە، ئەمساڵ لە کوردستاندا جگە لەیەکێتی چەندین حزبی دیکە کۆنگرە دەبەستن، بەلاَم لەهەموویان گرنگتر کۆنگرەی یەکێتییە کە هەموو لایەك بەوردی چاودێری دەکەن ئەو کۆنگرەیەی رەنگە بۆ دواجار کۆتایی بە مێژووی حزبێك بهێنێت کەناوی یەکێتییە و لەهەمان کاتیشدا رەنگە ئەو کۆنگرەیە یەکێتی لەروی هێزەوە بگێرێتەوە بۆ ساڵانی هەشتا و بەرە لەژێر پێی پارتی دەربهێنێ.

### تاڵەبانی بەئاسانی پێکی شەرابی سەرکەوتن هەڵنادات.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە لەماوەی سی و سێ ساڵی تەمەنی خۆیدا تەنها دوو کۆنگرەی لە ساڵانی(١٩٩٢ — ٢٠٠٠)دا بەستووە، پێشتریش کۆمەڵە سێ کۆنفرانس و

شۆرشگێرانیش دوو کۆنفرانسی بەستووە، لە ئێستادا یەکێتی چاوەرێی کۆنگرەی سێیە کە چاودێرانی سیایی، ئەم کۆنگرەیە بە کۆنگرەی مام جەلال ناودەبەن نەك کۆنگرەی یەکێتی چونکە تاڵەبانی ئامادەکارییەکانی پێش کۆنگرەی بە جۆرێك کردووە کە سەرکەوتنی خۆیی و باڵەکەی مسۆگەر بکات، لەگەڵ ئەوەشدا تاشێستا بەستن و نەبەستنی کۆنگرە بەقوڵی لە ئارادایە و تۆپەکە لەقاچی مام جەلالـدایە هێشتا شەقی سیاسی لەو تۆپـە شومە هەڵنـەداوە کە رەنگە گۆڵ پێنەکردنی، دۆرانێکی چاوەروان نەکراو ئاراستەی باڵی تاڵەبانی بکات، راستە باڵی تاڵەبانی لەناو لەهەڵبژاردنەکانی یەکێتیدا بە براوەیی هاتنەدەر. بەڵام ئەم بردنەوەیە سەرکەوتن و دەست بەسەراگرتنی یەکێتی بۆئەم باڵە بەتەواوی مسۆگەر نەکرد، بەڵکو بارودۆخەکە گۆڕا و یەکێتی توشی ئیفلیجبونێکی گەورە کرد، بەتایبەتی بێباکبوون بەرامبەر بە چونەدەرەوەی نەوشیروان مستەفا و دواجاریش قورسایی ئەو لەسەر بەشێکی بەرچاوی کادر و رێکخستنەکانی یەکێتی زۆرێك لەشتەکانی ئاوەژوو کردووە و نەیهێشت تاڵەبانی هەروا بەئاسانی پێکی شەرابی سەرکەوتن هەڵبدات. راستە سەرەتا بەرپرسە باڵاکانی ئەم باڵە ویستیان نەیاری خۆیان بکەنە دەرەوەی حزب و لەم رووەشەوە هەندێك کارییان کرد و بۆچونیان وا بوو. مادام پارە و دەسەڵاتیان لەبەردەستایە، دەتوانن یەکێتی بە ویستی خۆیان بگۆرن، بەڵام هێشتا ترسی ئەوە لەئارادایە کە هاوکێشەکان لەناکاودا ئاوەژوو بکەنەوە، ئەوکات تاڵەبانی توشی شۆکێکی چاوەروانەکراو دەبێت ، بەتایبەتی لە ئێستادا کەوردە وردە خەریکە سەرکەوتنی باڵی تاڵەبان لە ناویەکێتیدا بەرە و کاڵبونەوە دەچێت و باڵەکانی تر لەناوخۆ و دەرەوەی یەکێتیدا ڕەگ دادەکوتن و نارەزاییەکانی ناوخۆی یەکێتیش رۆژ بە رۆژ لەزیادبوندایە زیاتر لەهەموو شتیش ئەوەی کەسەرکەوتنی باڵی تاڵەبانی دەخاتە ژێر پرسیارەوە ترسی کادیرانی یەکێتییە لە بچوك بونەوەی یەکێتی بەرامبەر پارتی، کەلە سایەی سیاسەتی تاڵەبانیدا گەیشتۆتە لوتکە.

ئەم دۆخەش وای لەمام جەلال کردووەکە تا ئەم لەحزەیە دوودڵ بێت لەبەستنی کۆنگرە و تەنانەت بڵێت " ئەم کۆنگرە. ...... یا هەر نەبەسترێت)

**مام جەلال بۆ کۆنگرە دەبەستێت؟**

تالەبانی دەیەوێت لەم کۆنگرەیەدا چەند ئامانجێك بهێنێتەدی ، لەسەروو هەموشیانەوە، هێورکردنەوەی بارودۆخی ناوخۆی یەکێتی و کالکردنەوەی باڵەکانی تر و کپکردنی نارەزاییەکانی ناوخۆی یەکێتی.

هەروەها دەیەوێت ئەم کۆنگرەیە بکاتە کۆنگرەی خۆنیشاندانی سیاسی و قەرەباڵغییەکی گەورە دروست بکات ، بەبانگهێشتی میوانێکی زۆر لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی و ئیقلیمی و ناوخۆیی مام جەلال ئەوە دەربخات کەخودی تاڵەبانی سەرۆکێکی بەهێزە و یەکێتی حزبێکی خاوەن نفوز و گەورەیە، هەر بۆیە پێدەچێت کۆنگرە لەشێوەی ڤیستیڤاڵێکی سیاسیدا کۆتایی بەکارەکانی بهێنێت.

هەروەها چاوەڕێ دەکرێت لەم کۆنگرەیەدا تاڵەبانی خواستێکی دیکە بێنێتەدی ، ئەویش بەهێز کردنی دەسەڵاتی خێزان و بنەماڵەکەیەتی لەناو یەکێتیدا بەتایبەتی کە خەریکە خۆری تەمەنی خۆی بەرەو ئاوا بوون دەچێت و لەم بارەشدا چانسی هێرۆخان بۆهاتنە پێشەوە، لەهەموو کەس لەبارترە، هەروەها(قوباد)یش دەرچونی مسۆگەرە ئەگەر بێت و ئارەزووی خۆ پاڵاوتنی هەبێت ئەمەش ئاماژەی ئەوەیە تاڵەبانی دەیەوێت سەردەمی لاوازی بنەماڵە لەناو یەکێتیدا کۆتایی پێ بێت و یەکێتی بەرە و حزبی بنەماڵە بەرێت.

## هەڵبژاردن بۆ کۆنگرە چۆن دەبێت؟

ئێستا لەناو رێکخستنەکانی یەکێتیدا فۆرم دابەش دەکرێت بۆئەوەی راپرسی بکرێت لەسەرئەوەی کەئەندامانی کۆنگرە بە پێی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی(٢٠٠٦) دیاری بکرێن یاخود هەڵبژاردنی تازە بکرێت بۆ دیاری کردنی ئەندامانی کۆنگرە، دیارە ئەم بابەتەش بۆخۆی کێشەیەکی دیکە بۆیەکێتی دروستدەکات و رێکخستنەکانی دابەشدەکاتەسەر زیاتر لە دوو بەرە، چونکە بەپێی ئاکامی ئەو هەڵبژاردنانە بەشێکی زۆری کادیرەکانی باڵی ریفۆرم بێبەشدەبن لە چونە کۆنگرە و ئەمەش واتای وایە ریفۆرمییەکان بەشێکی زۆری کورسییەکانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بەجێدەهێڵن لەهەمان کاتدا هەر بەپێی ئەو هەڵبژاردنە. قەبارەی باڵی کۆسرەت رەسوڵیش بچوك دەبێتەوە.

## سیناریۆکانی کۆنگرە

چاودێرانی سیاسی پێیان وایە کۆنگرەی یەکێتی لە سێ سیناریۆ بەدەر نییە:

یەکەم: کۆنگرەی پاکسازی: (تەسفیە): ئەگەر کرنگرە ئەم راستییە وەربگرێت ئەوا یەکێتی بەتەواوەتی بچوك دەبێتەوە دەبێتە خیزبێکی بچوکی بێ کاریگەری ئەم جۆرە کۆنگرەیە زۆرێك لە کاراکتەرە سیاسییەکانی ناو باڵەکەی مام جەلال لێدەکەن(مەلا بەختیار و ئەرسەلان بایز و عمر فتاح)بەلام تاڵەبانی تائێستا بریاری ئەوەی نەداوە کە حاڵەتی تەسفیەکردن لەناو کۆنگرەدا بکاتە واقع، چونکە دەزانێت تەسفیەکردن لەسەری باڵەکانەوە

هیچ ئاکامێکی نابێت چونکە ئەوبالانە خاوەنی بنکەیەکی فراوانی رێکخستنن کەلە حاڵەتی تەسفیەکردندا ئەو بنکە فراوانەی رێکخستن رەنگە رێگایەکی تر هەڵبژێرێت کە ئایندەی یەکێتی توشی مەترسییەکی گەورە دەکات.

دووەم: کۆنگرەی تەوافی: ئەگەر کۆنگرە ئەم راستییەوەربگرێت ئەوا یەکێتی پاش کۆنگرە و دوای کۆنگرە نابێت کە جیاوازی لەوە دادەبێت مام جەلال دەسەلاتی زۆرتر دەبێت چونکە تەنها خۆی ئەوانە دیاری دەکات کەدێنە سەرکردایەتی ئەم ئاراستەیە لە مەکتەبی سیاسیدا باڵی نەیار(ریفۆرمی ناوەوە)کە پێکدێن(عمر سیدعلی و جلال جەوهەر و عوسمانی حاجی مەحمود و مستەفای سەید قادر)بەناچاری پشتیوانی لێدەکەن هەرچەندە لەوانەیە ئەم پشتیوانی لێکردنە بەخراپ بەسەریاندا بشکێتەوە، چونکە لەوانەیە تاڵەبانی دوای دانانەوەیان بچوکیان بکاتەوە یان لە پۆستە باڵاکان دوریان بخاتەوە، یاخود بێدەسەلاتیان بکات تەنها بەناو ئەندامی مەکتەبی سیاسی بن.

سێیەم: یەکگرتنی سێ باڵە دژەکە. بەرامبەرباڵی تاڵەبانی: ئەگەر ئەم حاڵەتی یەکگرتنە روبدات لە نێوان باڵەکانی کۆسرەت رەسوڵ و باڵی ریفۆرمی ناوەوە (عمر سیدعلی و جلال جەوهەر و عوسمانی حاجی مەحمود و مستەفای سەید قادر) و باڵی گردەکە(نەوشیروان مستەفا و هاورێکانی)ئەوا ئاراستەی کۆنگرە بەتەواوی دەگۆڕێت، هاوکێشەکە پێچەوانە دەبێتەوە لەجیاتی ئەوەی تاڵەبانی نەیارەکانی تەسفیەبکات، ئەوا سێ باڵەکە دەتوانن رەگی باڵی پیرەکە لەبنا دەربهێنن و دەست بەسەر یەکێتیدا بگرن بەڵام دروست بوونی ئەم جۆرە هاوپەیمانێتییە لە ئێستادا زۆر قورسە چونکە ماوەیەکی زۆر نییە نەوشیروان و هاورێکانی زەبرێکی کوشندەیان لە سەر دەستی کۆسرەت و باڵەکەی خواردووە، هەرچەندە لەگەمەی سیاسیدا برینەکان بەسارێژکراوی بازیان بەسەردا هەڵدەدرێت و لەبیردەکرێن بۆیە لەم رووەوە لەم ماوەیەدا هەست بە نزیکبونەوەیەکی هاورێیانەی زۆری نێوان کۆسرەت رەسوڵ و نەوشیروان مستەفا دەکرێت کەلەوانەیە ئەم نزیکبەنەوە هاورێیانە سیاسییە، سەرەنجام هەوپەیمانێکی سیاسی و بەرژەوەندییانەی هاوبەشی لێبکەوێتەوە و جارێکی تر نەوشیروان مستەفا و کۆسرەت رەسوڵ وەکو دوو دەنگە زبرەکە قسەی خۆیان بدەنەوە بە گوێی تاڵەبانیدا بەمەرجێك ئەمەش گەمەیەکی دیکەی کۆسرەت رەسول نەبێت، بۆ ئەوەی تاڵەبانی هەست بەمەترسی بکات و مەرجەکانی قبوڵ بکات بۆ دەرچون لەو هاوکێشەیە.

## کۆنگرەی بێ نوزە

مام جەلال و باڵەکەی دەیانەێ کۆنگرەی سێ لەروی نارەزایی دەربڕینەوە بێدەنگترین کۆنگرەی دنیابێت و لەلایەکی تریشەوە پڕ لە هەڵلاّ و ژاوە ژاوترین کۆنگرەش بێت بۆ دەرەوەی خۆی، بۆیە هەر لە ئێستاوە پرکردنەوە لە بێدەنگترین دەنگە نارازی و نایاخییەکانی ناو یەکێتی ئەرکی یەکەم و سەرەکی تاڵەبانی و باڵەکەیەتی تاڵەبانی دەیەوێت داوی کۆنگرە یەکێتی وەکو پارتی ببێتە خاوەنی رێکخستنێکی بێدەنگ و کلۆڵ و ناوەند پەرست و بێ جوڵە، بەجۆرێك هەموو کەس لەناو یەکێتیدا وەلائی هەبێت بۆ تاڵەبانی و بنەماڵەکەی. هەرلەم رووەشەوە تاڵەبانی دەیەوێت داوای بێ کاریگەرکردنی نەوشیروان مستەفا بیر لە خستن و کەوتنی کۆسرەت رەسولیش بکاتەوە.

## ئارمایی نەوشیروان مستەفا لە کۆنگرەدا.

ئەوەی تا ئێستا رونە نەوشیروان مستەفا و هاوڕێکانی(باڵی گردەکە)بەشداری کۆنگرە ناکەن و تەنانەت دەوترێت نەوشیروان گاڵتەی بەکۆنگرە دێت بەگەمەیەکی تازەی مام جەلالی دەدەنێت و پێیوایە ناتوانێت هچ گۆرانکارییەك لە یەکێتیدا دروست بکات لەگەڵ ئەوەشدا نەوشیروان بە پاڵپشتی کۆسرەت رەسوڵ دەیەوێت یەکێتی لەدەستی خۆیدا بهێڵێتەوە، لەبەرامبەریشدا باڵی تاڵەبانی دەیانەوێت باڵی نەوشیروان و هاوڕێکانی لەیەکێتی دابڕن و خۆیان ببنە خاوەنی یەکێتی ئەم بۆچونە وایکردووە ئێستا ململانێی نێوان باڵی نەوشیروان مستەفا و تالەبانی زۆر زەقتر و ئاشکراتربێت و نەوشیروان مستەفا رونتر لە جاران هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر بەیەکێتی و پارتی و سیستەمی سیاسی و دەسەلاّت لەکوردستاندا دەربڕن، بە پێی بۆچونی بەرپرسانی ئەم باڵە ئێستا زۆر لەجاران بەهێزترن و توانیویانە خەڵکانی زۆر لەناو یەکێتی و دەرەوەی یەکێتی و نوسەران و رۆشنبیران بەرەو ئاراستەی بیرکردنەوەی خۆیان رابکێشن تەنانەت رەنگە لەحاڵەتی شکستی تاڵەبانیدا رێکخستنەکانی یەکێتی و جەماوەرەکەی بگەرێنەوە بۆلای نەوشیروان وەکو سەرکردە قبوڵی بکەن.

## نەوشیروان دەچێتە ناو کۆبونەوەی سەرکردایەتی

لە دواکۆبونەوەی سەرکردایەتی یەێتی نیشتمانی کوردستان ئەندامانی سەر بەباڵی ریفۆرم رەخنەی توندیان ئاراستەی ئەو بیرکردنەوەیەی ناو سەرکردایەتی کردووە، کەدەڵێت با تەسفیەی نەوشیروان و باڵەکەی بکرێت ئەوان وتویانە نەوشیروان رەقەمێکی

بەهێزە و ناکرێت پشتگوێ بخرێت تەنانەت کۆسرەت رەسولیش هاورای ئەو بۆچونەیە، کەناکرێت نەوشیروان مستەفا وەکو ڕەگەزێکی بەهێز لەناو یەکێتیدا حیسابی بۆنەکرێت، چونکە بەبۆچونی ئەو نەوشیروان لە بارودۆخە سەختەکاندا یەکێتی راگرتووە.

## کۆسرەت رەسولْ و ئەگەری هاوپە یمانی لەگەلْ نەوشیروان

کۆنگرەی سێی یەکێتی کۆنگرەیەکی بێدەنگە و مام جەلال هەموو ئاراستەکانی دیاری دەکات و بەهیچ شێوەیەك رێگە بە ئۆپۆزسیۆن نادات لەناو کۆنگرەدا، ئەمەش ئاماژەیە بۆئەوەی کە کۆسرەت رەسولْ نابێت وەك خۆی لە کۆنگرەدا بوونی هەبێت تەنها دەبێت لەژێر سێبەری مام جەلال بێت، ئەمەش وا لە کۆسرەت رەسولْ دەکات جارێکی دیکە بگەرێتەوە بۆلای ئەو هاورێیەی کەلە هەڵبژاردنەکاندا دۆراندی تاوەکو قورسایی خۆیی لەناو کۆنگرەدا نیشان بدات بۆئەمەش لەهەولْی باشکردنەوی پەیوەندییەکانیدا لەگەلْ نەوشیروان مستەفا، کەرەنگە دواجار هاوپەیمانێکی سیاسی نوێی بەدوادابێت و بەرە لەژێر پێی تالەبانی دەربهێنێ بەلاْم ئەم هاوپەیمانێتییە گرەوی لەسەر ناکرێت و تائێستا هەنگاوی جدی لەم بارەیەوە نەنراوە و تەنها بریتییە لەهەندێك ئاماژەی سیاسی.

فشارەکانی سەر کۆسرەت رەسولْ تادێت زۆرتر دەبن لەروی راگەیاندنەوە، کەنالْەکانی راگەیاندنی یەکێتی بایەخ بە چالاکییەکانی نادەن و پەراوێزی دەخەن و لەروی هەژمونی خۆشی بەسەر هەولێردا کەناوجەرگەی دەسەلاْتی کۆسرەتە، ئێستا رووی کردۆتە کێشە، ئەرسەلان بایز لە هەولێر دادەنیشێت و زۆر جار کێشە و گرفت بۆ کۆسرەت رەسولْ دروست دەکات و تەنانەت لە دەرەوەی هەولێریش، لەلایەن مالْی ابراهیم ئەحمەد و مەلا بەختیارەوە دژایەتی زۆری دەکرێت، بەلاْم مام جەلال نایەوێت لەگەلْیدا تێکی بدات، چونکە پێی وایە کۆسرە رەقەمێکی گەورەیە و فەرامۆش کردنی کارەسات بۆ یەکێتی دروست دەکات، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە مام جەلال دەترسێت لەهاوپەیمانێتی تازەی نەوشیروان مستەفا و کۆسرەت رەسولْ لە کۆنگرەی داهاتوودا، بۆیە مام جەلال دەیەێت راستەوخۆ دژایەتی کۆسرەت رەسولْ و نەوشیروان مستەفا نەکات بۆیە گوومان دەکرێت مام جەلال ئەم ئەرکە بسپێرێت بەمالْی بارزانی و پارتی.

## بەرهەم صالح دەنگێکی کوژاوە

پێش ساڵێك یەکێك لەبەهێزترین کاندیدەکان بۆ جێگرتنەوەی تاڵەبانی د. بەرهەم صالح بوو بەلاَم هاوکێشە سیاسییەکان لەماوەی ئەم ساڵەدا هەڵگەرانەوە و دەنگی بەرهەم صالح ئێستا زۆر بەکزی دەبیسترێت ئاماژەکانی ئەو پەراوێز خستنە ئەوکاتە دەرکەوت کە تاڵەبانی رازی نەبوو لەسەرئەوەی پۆستی سەرۆکی حەکەمەتی هەرێمی کوردستانی بداتێ بەبیانوی بەهێزی ئەوەوە لە بەغدا.

بارودۆخی ناوخۆی یەکێتی ئێستا زۆر گۆڕاوە، ماڵی برهیم ئەحمەد بەتەواوەتی خۆیان یەکلا کردۆتەوە بۆئەوەی دەست بەسەر ئایندەی یەکێتیدا بگرن، ئەمەش بۆ د. بەرهەم صالح سەرەتای ئاوابونی ئەستێرەی بەختیەتی لەناو یەکێتیدا هەم وەك سکرتێر و هەم وەك یەکێك لە رەمزە بەهێزەکانی ناو یەکێتی.

گەرانەوە بۆ رابردوویەکی نزیك، یارمەتیدەرێکی باشە بۆ ئەوەی لەم حاڵەتە تێبگەین، ئەو دەمەی د. بەرهەم صالح نوێنەری یەکێتی نیشتمانی بوو لە ئەمریکا لەسەر داوای ماڵی ابراهیم ئەحمەد هێنرایەوە بۆ کوردستان، بۆئەوەی دوری بخەنەوە لە ئاگادار بوون لە پارە و پولی یەکێتی لەوێ، وپەیوەندییەکانی یەکێتی لەگەڵ ئەمریکا، چونکە نایانەوێت بەرهەم ببێتە رایەڵی پەیوەندی نێوان یەکێتی و ئەمریکاو خۆیان جێگای بگرنەوە، سەرەتا د.محمد سابیر – یان داناو دواتریش(قوباد تاڵەبانی)لە ئەمجارەیان قورستر و کاریگەرترە، چونکە قوبادتاڵەبانی نەك نوێنەری یەکێتییە، بەڵکو نوێنەری حوکومەتی هەرێمی کوردستانە کەیەکێتی لەبەرامبەر ئەم نوێنەرایەتییەدا دەست بەرداری نوێنەرایەتی چەندین وڵاتی دنیا بوو بۆ پارتی. دواتریش کە د. بەرهەم صالح لە پۆستی سەرۆکی حوکومەت لە سلێمانی نەما، هەر لەسەر داوای ئەوان بوو، چونکە د. بەرهەم دەیویست لەداهاتی حوکومەت بەشی یەکێتی و بەشی خەڵکیش بدات، بەلاَم ئەمە قبوڵکراو نەبوو لەلایەن یەکێتییەوە .

د. بەرهەم صالح کەلەسەر باڵی تاڵەبانی حیسابە و ئەوانیش راستەوخۆ دژایەتی دەکەن، حاڵی لە کۆنگرەدا باش نابێت و دەنگێکە ڕوو لەکوژانەوەی دەکات و لەدەست مام جەلالدایە، بیهێنێتە سەرەوە یاخود لای بدات، بۆیە کاریگەری بەرهەم صالح لە کۆنگرەدا زۆر لاوازە و هیچ دەنگێکی ئەوتۆی نابێت، چونکە خاوەنی قاعیدەی رێکخستنی بەهێز نییە و تاکە خاڵی بەهێزی بەرهەم صالح پشتیوانی ئەمریکایە وە باڵی تاڵەبانی لەهەوڵی

ئەوەدایە لەرێی قوبادەوە ئەم مەلەفەش لەبەرهەم صالح وەربگرنەوە ، وەك دەوترێت(بونی بەرهەم صالح)بۆ راگرتنی هاوسەنگییە و رەقەمێك نییە بتوانێت هاوکێشەی ناو کۆنگرە بگۆرێت ، بەلاّم هەموو ئەمانە لە قورسایی سیاسی ئەو کەم ناکەنەوە وەکو سیاسییەکی بەهێز لەئاستی تاکەکەسیدا.

## مالّی براهیم ئەحمەد و ئاراستەی یەکبون و کۆنگرە

دوای گۆرانەکانی ناو یەکێتی مالّی براهیم ئەحمەد گەشتونەتە ئەو بروایەی کەدەبێت کاندیدی خۆیان هەبێت، بۆمەکتەبی سیاسی، سەرەتا بنەمالّە پێیان باش بوو، شانازی براهیم ئەحمەد کەنوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستانە لەبەریتانیا، کاندیدی بنەمالّەبێت. بەلاّم دواتر بۆچونەکان گۆران و بنەمالّە رازی بوو لەسەر کاندید کردنی هێرۆخان بۆسەرکردایەتی یەکێتی و دواتریش بۆمەکتەبی سیاسی و دوای تالّەبانیش بۆ جێگرتنەوەی ئەو.

مالّی براهیم احمد کاریگەری زۆریان بەسەر بریارەکانی مام جەلالەوە هەیە، دەتوانن ئەوەی دەیانەوێت لەکۆنگرەدا بیسەپێنن، بنەمالّەی تالّەبانی و براهیم ئەحمەد پێشنیازی ئەوەیان کردووە کە دەستەیەك دروست بکەن بۆ چاودێری کردنی کاروباری وەزارەتەکان کە کاری وەزارەتەکان و سەرۆکی حەکەمەت رێکبخات، ئەم دەستەیەش قوباد تالّەبانی سەرپەرشتی دەکات، کەواتە ناراستەوخۆ قوباد تالّەبانی دەبێتە جێگری سەرۆکی حوکومەت و رۆلّی عمرفتاح لە پۆستەکەیدا سفر دەبێت. چاودێرانی سیاسی پێیان وایە ئەم هەنگاوە سەرەتای پێگەیاندنی(قوباد)ە، بۆ پۆستی سەرۆکی حوکومەتی هەرێمی کوردستان. ئەو دەمەی حوکومەت دەردرێتەوە بەیەکێتی، کەواتە لەئێستاوە دەیانەوێت لەگەلّ واقیعییەکەدا بگونجێن و زەمینەسازی بۆ بکەن، بۆئەوەی لەکاتی گۆرینی پۆستی سەرۆکی حوکومەتدا، یەکسەر بێتە سەرۆك وەزیران.

## دەستگرتن بەکەواکەی مامەوە.

مالّی براهیم ئەحمەد کەئێستا کۆنترۆلّی تەواوی بالّی تالّەبانییان کردووە چاویان بریوەتە ئەوەی بەئاسانی بتوانن پۆستە گرنگەکانی تری ناویەکێتی دەست بەسەر بکەن ، لێرەدا ئەوپرسیارە دێتە پێشەوە کەئەندامانی تری بالّی یەکبوون چ رۆلّێکیان لەگەمەکانی ناو کۆنگرە و داهاتووی یەکێتیدا هەیە؟

دەكرێت وەڵامەكە لەوەدا كورتتربكرێتەوە، ئەوانەی لە ژێر باڵی تاڵە بانیدا خۆیان حساب كردووە، ناتوانن وەك رەگەزێكی كاریگەری خۆیان بسەلێنن، ئەگەر سەرەنج بدەین د.كمال فوئاد توشی نەخۆشی بووە و ماوەیەكی زۆرە لەدەرەوەی وڵاتە و توانای گەمەكردنی سیاسی نەماوە قورسایی لە گۆڕانەكاندا سفر بۆتەوە.

د.فوئاد مەحسوم – یش رای گەیاند بوو كە خۆی بۆ سەركردایەتی هەڵنابژێرێتەوە، هەرچەندە ئەگەر بێت و لەم بریارەشی پەشیمان ببێتەوە، ئەوا ناتوانێت كاراكتەرێكی جولاّو و دوور لەسێبەری مام جەلال دەربخات، د. فوئاد مەحسوم یەكێكە لەگوێرایەڵترین ئەندامی مەكتەبی سیاسی بۆ تاڵەبانی و زۆر جاریش لە ساتە هەستیارەكاندا مام جەلال دەی جولێنێت بۆ گەیاندنی سیاسەتی خۆی بۆناو یەكێتی ، دیارترین نمونەی لەم بارەیەوە بریتییە لە پلینیۆمی رابردوو یەكییەتی كەتیایدا دكتۆر فوئاد مەحسوم لەجیاتی مام جەلال پێشنیازی لە باربردنی هەڵبژاردنی لێخۆشبونی فایلدارەكانی ناو یەكێتی خستەروو.

ئەمە لەكاتێكدا، د. فوئاد مەحسوم لەرابردووی یەكێتیدا لەكاتی كۆنگرەدا ئەزمونێكی قبولكراوی نییە، بۆنمونە: پێش كۆنگرەی دووەمی یەكێتی، كۆمەڵێك لە شۆرشگێرەكانی كۆكردەوە بۆ ئەوەی لیست دروست بكەن لە هەڵبژاردندا، بەلاّم دواتر پیشت گوێی خستن و خۆی لە سەر پێشنیازی مام جەلال چووە ناو مەكتەبی سیاسییەوە سروشتی فوئاد مەحسوم وایە كە خۆی پیاو خراپ ناكات و لەتاڵەبانی جیا نابێتەوە هەرچی سەبارەت بە(مەلابەختیار و عمر فتاح و ئەرسەلان بایز)ە، ئەمانە هەڵدەبژێرن، ئەم سێ كەسەی ناو مەكتەبی سیاسی. زۆرترین هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی مام جەلال رازی بكەن، بەوەی بریارێكی توند بدات سەبارەت بەباڵی ریفۆرم لە(ناوەوە و لەسەر گردەكەش)تا لەیەكێتی وەدەریان بنێت.

## ریفۆرمەكانی ناوەوە

ریفۆرمەكانی ناوەوە، مەبەست لە عمر ی سەید علی و هاورێكانییەتی لەمەكتەبی سیاسی یەكێتی كەسایەتییەكی تری نزیكی ئەوان وە لەنزیك نەوشیروان، كەلەسەر كردایەتی و مەڵبەند و كۆمیتەكانی تری یەكێتین، ئەمانە تەنها لەیەك رێگەوە دەتوانن ئاراستەی كۆنگرە بگۆرن، ئەوەش بە هاتنەدەرەوەیان لە كۆنگرە، چونكە ئێستا گەشتونەتە ئەو بروایەی كە مام جەلال هیچ شتێك ناگۆرێت، ئەم باڵە لەناو مەكتەبی سیاسیدا دەسەلاّتیان نەماوە و باڵی تاڵەبانی كۆنترۆڵی مەكتەبی سیاسییان كردووە، لەگەڵ ئەوەشدا

دەبێت ئەوە بزانین کە ڕێژەیەکی زۆر لەناو کادیرانی خوارەوەیان لەگەڵدایە کەواتە پێکەوە کۆکردنەوەی(عمری سیدعلی و جەلال جەوهەر و مستەفا سەید قادر و عوسمانی حاجی مەحمود)دەبنە ڕەقەمێکی گرنگ لەکۆنگرەدا هەرچەندە بوونی ئەو چوار کەسایەتییەی لەناو مەکتەبی سیاسیدا، ئاراستەیەکی ناوچەگەری دەبەخشێتە کۆنگرەوە ئاماژەی ئەوەی لێدەکرێت ئەمجارە کۆنگرەی یەکێتی بەئاراستەی لیستی ناوچەکاندا بڕوات(سلێمانی، کەرکوك، گەرمیان، ڕانیە و پشدەر).

**بادینان لە کۆنگرەدا**

بادینییەکانی ناویەکێتی، قورسایی زۆریان نییە و تارادەیەکی زۆریش یەکلا بونەتەوە بەلای باڵی مام جەلال و هەندێکی تریان لەسەر کۆسرەت ڕەسوڵ حساب دەکرێت، کەواتە ڕەنگە هەر لەسەرەتاوە ڕەگەزەکانی بادینان لەناو ململانێکی کۆنگرەی داهاتووی یەکێتی بکرێنە دەرەوە و دواجار لەرێی بانگکردنی مام جەلالەوە بخرێنەناو سەرکردایەتی و لیستە تەوافوقییەکەی خۆیەوە ئەوەی جێگەی ئاماژەکردنە ئێستا لەناومەکتەبی سیاسی یەکێتیدا هیچ بادینانییەك باوی نییە.

**مام جەلال پارتی ڕادەکێشێتە ناو یەکێتیدا.**

یەکێتی و پارتی بەرێکەوتنێکی ستراتیژی نێوان بنەماڵەی بارزانی و تاڵەبانی دادەنرێت، چونکە دوای ئەم ڕێکەوتنە تێکەڵاوییەکی بەهێزی نێوان هەردوو بنەماڵەکە، لەسەر ئاستی سیاسی و ئابورییەوە هەست پێدەکرێت، پارتیش لەم ڕووەوە درێخی ناکات، لەلایەنگری باڵی تاڵەبانی و بچوککردنەوەی باڵی کۆسرەت و نەوشیروان، چونکە پێیوایە ئەم دووباڵە مەترسییەکی گەورەن بۆ سەر ئایندەی پارتی و بنەماڵەی بارزانی، کەرەنگە ئەم دوو باڵە قبوڵی بچوککردنەوەی یەکێتی بۆ ئەندازەیە نەکەن کە ئێستا بوونی هەیە.

پارتی پێیوایە کەوتنی مام جەلال، واتا تێکچون و هەڵوەشانەوەی ڕێککەوتنی ستراتیژی نێوانیان هەڵوەشاندنەوەی ئەو دو ڕێکەوتنەش زیان لە پارتی دەدات و دەیهێنێتەوە ناو ململانێکان کە ئێستا بەبێ ململانێ زەق و دیار، توانیویەتی کۆنترۆڵی تەواوی حوکومەت و دەسەڵات بکات لەکوردستاندا، هەروەها پارتی حەزناکات یەکێتی لەوەی ئێستا تیایەتی لاوازتر بێت، چونکە لەناوخۆیان دەترسن، ئەوان حەزدەکەن یەکێتی بمێنێتەوە بەڵام وەکو حزبی دووەم.

دەکرێت وەڵامەکە لەوەدا کورتتربکرێتەوە، ئەوانەی لە ژێر باڵی تاڵە بانیدا خۆیان حساب کردووە، ناتوانن وەك رەگەزێکی کاریگەری خۆیان بسەلمێنن، ئەگەر سەرەنج بدەین د.کمال فوئاد توشی نەخۆشی بووە و ماوەیەکی زۆرە لەدەرەوەی وڵاتە و توانای گەمەکردنی سیاسی نەماوە قورسایی لە گۆڕانەکاندا سفر بۆتەوە.

د.فوئاد مەحسوم – یش رای گەیاند بوو کە خۆی بۆ سەرکردایەتی هەڵنابژێرێتەوە، هەرچەندە ئەگەر بێت و لەم بریارەشی پەشیمان ببێتەوە، ئەوا ناتوانێت کاراکتەرێکی جوڵاو و دوور لەسێبەری مام جەلال دەربخات، د. فوئاد مەحسوم یەکێکە لەگوێرایەڵترین ئەندامی مەکتەبی سیاسی بۆ تاڵەبانی و زۆر جاریش لە ساتە هەستیارەکاندا مام جەلال دەی جوڵێنێت بۆ گەیاندنی سیاسەتی خۆی بۆناو یەکێتی ، دیارترین نمونەی لەم بارەیەوە بریتییە لە پلینیۆمی رابردوو یەکییەتی کەتیایدا دکتۆر فوئاد مەحسوم لەجیاتی مام جەلال پێشنیازی لە باربردنی هەڵبژاردنی لێخۆشبونی فایلدارەکانی ناو یەکێتی خستەروو.

ئەمە لەکاتێکدا، د. فوئاد مەحسوم لەرابردووی یەکێتیدا لەکاتی کۆنگرەدا ئەزمونێکی قبولکراوی نییە، بۆنمونە: پێش کۆنگرەی دووەمی یەکێتی، کۆمەڵێك لە شۆرشگێرەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی لیست دروست بکەن لە هەڵبژاردندا، بەلام دواتر پیشت گوێی خستن و خۆی لە سەر پێشنیازی مام جەلال چووە ناو مەکتەبی سیاسییەوە سروشتی فوئاد مەحسوم وایە کە خۆی پیاو خراپ ناکات و لەتاڵەبانی جیا نابێتەوە هەرچی سەبارەت بە(مەلابەختیار و عمر فتاح و ئەرسەلان بایز)ە، ئەمانە هەڵدەبژێرن، ئەم سێ کەسەی ناو مەکتەبی سیاسی. زۆرترین هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی مام جەلال رازی بکەن، بەوەی بریارێکی توند بدات سەبارەت بەباڵی ریفۆرم لە(ناوەوە و لەسەر گردەکەش)تا لەیەکێتی وەدەریان بنێت.

### ریفۆرمەکانی ناوەوە

ریفۆرمەکانی ناوەوە، مەبەست لە عمر ی سەید علی و هاورێکانییەتی لەمەکتەبی سیاسی یەکێتی کەسایەتییەکی تری نزیکی ئەوان وە لەنزیك نەوشیروان، کەلەسەر کردایەتی و مەڵبەند و کۆمیتەکانی تری یەکێتین، ئەمانە تەنها لەیەك رێگەوە دەتوانن ئاراستەی کۆنگرە بگۆرن، ئەوەش بە هاتنەدەرەوەیان لە کۆنگرە، چونکە ئێستا گەشتونەتە ئەو بروایەی کە مام جەلال هیچ شتێك ناگۆرێت، ئەم باڵە لەناو مەکتەبی سیاسیدا دەسەلاتیان نەماوە و باڵی تاڵەبانی کۆنترۆڵی مەکتەبی سیاسییان کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا

دەبێت ئەوە بزانین کە ڕێژەیەکی زۆر لەناو کادیرانی خوارەوەیان لەگەڵدایە کەواتە پێکەوە کۆکردنەوەی(عمری سیدعلی و جەلال جەوهەر و مستەفا سەید قادر و عوسمانی حاجی مەحمود)دەبنە ڕەقەمێکی گرنگ لەکۆنگرەدا هەرچەندە بوونی ئەو چوار کەسایەتییەی لەناو مەکتەبی سیاسیدا، ئاراستەیەکی ناوچەگەری دەبەخشێتە کۆنگرەوە ئاماژەی ئەوەی لێدەکرێت ئەمجارە کۆنگرەی یەکێتی بەئاراستەی لیستی ناوچەکاندا بڕوات(سلێمانی، کەرکوك، گەرمیان، ڕانیە و پشدەر).

## بادینان لە کۆنگرەدا

بادینییەکانی ناویەکێتی، قورسایی زۆریان نییە و تارادەیەکی زۆریش یەکلا بونەتەوە بەلای باڵی مام جەلال و هەندێکی تریان لەسەر کۆسرەت ڕەسوڵ حساب دەکرێت، کەواتە ڕەنگە هەر لەسەرەتاوە ڕەگەزەکانی بادینان لەناو ململانێکی کۆنگرەی داهاتووی یەکێتی بکرێنە دەرەوە و دواجار لەڕێی بانگکردنی مام جەلالەوە بخرێنەناو سەرکردایەتی و لیستە تەوافوقییەکەی خۆیەوە ئەوەی جێگەی ئاماژەکردنە ئێستا لەناومەکتەبی سیاسی یەکێتیدا هیچ بادینانییەك باوی نییە.

## مام جەلال پارتی ڕادەکێشێتە ناو یەکێتیدا.

یەکێتی و پارتی بەڕێکەوتنێکی ستراتیژی نێوان بنەماڵەی بارزانی و تاڵەبانی دادەنرێت، چونکە دوای ئەم ڕێکەوتنە تێکەلاوییەکی بەهێزی نێوان هەردوو بنەماڵەکە، لەسەر ئاستی سیاسی و ئابورییەوە هەست پێدەکرێت، پارتیش لەم ڕووەوە درێخی ناکات، لەلایەنگری باڵی تاڵەبانی و بچوككردنەوەی باڵی کۆسرەت و نەوشیروان، چونکە پێیوایە ئەم دووباڵە مەترسییەکی گەورەن بۆ سەر ئایندەی پارتی و بنەماڵەی بارزانی، کەرەنگە ئەم دوو باڵە قبوڵی بچوككردنەوەی یەکێتی بۆ ئەندازەیە نەکەن کە ئێستا بوونی هەیە.

پارتی پێیوایە کەوتنی مام جەلال، واتا تێکچون و هەڵوەشانەوەی ڕێککەوتنی ستراتیژی نێوانیان هەڵوەشاندنەوەی ئەو دو ڕێکەوتنەش زیان لە پارتی دەدات و دەیهێنێتەوە ناو ململانێکان کە ئێستا بەبێ ململانێ زەق و دیار، توانیویەتی کۆنترۆڵی تەواوی حوکومەت و دەسەلات بکات لەکوردستاندا، هەروەها پارتی حەزناکات یەکێتی لەوەی ئێستا تیایەتی لاوازتر بێت، چونکە لەناوخۆیان دەترسن، ئەوان حەزدەکەن یەکێتی بمێنێتەوە بەلام وەکو حزبی دووەم.

شتێکی ئاشکرایە لە هەڵبژاردنی پێشوودا، پارتی لایەنگری باڵی تاڵەبانییان کرد و ڕۆڵیشیان هەبووە بۆیە شتێکی بەڵگە نەویستە کەلەم کۆنگرەیەشدا پارتی دەیەوێت هەموو جۆرە هاوکارییەکی تاڵەبانی بکات و لەم ڕووەشەوە بارزانی دڵنیایی تەواوەتی داوەتە تاڵەبانی، هەر بۆیە دەبینین کەدژایەتی نەوشیروان مستەفا و کۆسرەت رەسوڵ دراوەتە دەست پارتی لەلایەنی خۆشییەوە دەزگا ئەمنییەکانی پارتی داوا لەهەندێك لەکارگێر مەڵبەندەکانی یەکێتی دەکەن، بۆئەوەی بچنە کۆمیتەی سەرکردایەتییەوە بۆ ئەم راپۆرتە چەند چاودێرییەکی سیاسی ڕاو بۆچونیان وەرگێراوە.

## بورگانەکە کەی دەتەقێتەوە؟

### گەرانەوە بۆ سەرخوانەکە یانماڵئاوایی یەکجارەکی

لڤین. تایبەت

رەنگە تاڵەبانی گەشبینترین سیاسی رۆژهەڵاتی ناوەراست بێت ئەو لەو جۆرە پیاوانەیە هەمیشە پێیوایە دۆخی سیاسی یەکێتی تەواو تۆکمە و بێگرێیە، ئەوەی لەناوخۆی ئەم حزبەدا دەگوزەرێت نیشانەیەی مومارەسەیەکی تەندروستی سیاسییە و بەرهەمی قبوڵکردنی جیاوازییەکان و سیمای بێکێشەیی و یەکێتی نیشان دەدات، لەبەرامبەریشدا نەوشیروان مستەفا ئاستی رەشبینییەکەی گەشتۆتە لوتکە و بۆ دواجار گەشتۆتە ئەو بروایەی جەستەی سیاسی یەکێتی بەرگەی نەشتەر گەری چاکسازی ناگرێت و دەبێت بەشوێن بەدیلدا بگەرێین. لێرەدا ئەوەی بۆ ناوخۆی یەکێتی گرنگە پرسیارکردنە لەوەی کەئایا چ هێزێکی سیاسی خاوەن سەلیقەیەکی دبلۆماسی دەتوانێت پیاوە رەش بین و گەشبینەکانی یەکێتی لەتاوەی پێکەوە ژیاندا کۆ بکاتەوە؟ بەبێ دوودڵی دەتوانین هێما بۆئەوە بکەین یەکێتی بەهۆی کۆمەڵێك کێشەی ناوخۆیی و پلانی دوژمنەکانییەوە هێزی بەرهەمهێنانی سەرکردەی لەدەستداوە، لەبار و دۆخێکی ئاوادا هەمیشە جەستەی سیاسی دەکرێتە قوربانی بیرکردنەوەی ئەو سەرکردانەی بەردەوام لە رابردووەوە بۆ ئێستا دەروانن و بیرکردنەوە لە شاخ و خەباتی چەکداری دەکەنە سەنگی مەحەکی سیاسی و ململانێی ناوخۆیی دوای ئەو هەموو گۆرانکارییانەی بەسەر کوردستاندا هاتوون، وەکەو دەوترێن یەکێك لە گرفتە پشت شکێنەکانی یەکێتی ئەوەیە کە سەرکردەکان توانای دیالۆگیان لاوازە و گیانی تۆڵەکردنەوە و بچووککردنەوە بەسەریاندا زاڵە. بەرادەیەك بەشی زۆری ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ ئەو بۆچوونانەدان کە لەنێوان رەش و سپی، یەکێکیان هەڵبژێرن واتە یان گەراندنەوەی نەوشیروان مستەفا و باڵەکەی و تەسلیم بوون بەباڵی گشتی یان دەرکردن و دورخستنەوەی باڵەکەی.

## تاڵەبانی و دەسەڵاتی ڕەها

ئـەم جـۆرە بیرکردنەوەیــە کــە خــەریکی مەکتــەبی سیاســی یــەکێتی کــۆنترۆڵ بکـات زەمینەیــەکی گونجـاوی رەخـساندووە و بـۆ دروسـت کردنــی تاکـدەنگی لــەناو یەکێتیـدا. لەکاتێکـدا تاکـدەنگی بـۆ حزبێکـی فـرە میمبــەری وەك یــەکێتی بــەواتای لێـدانی زەنگـی هەڵوەشـاندنەوە دێـت چـونکە رابـردووی یــەکێتی، رابردوویــەك بـووە ململانێکـانی بـواری ئەوەی پێداوە فرەدەنگییەکی زۆری تێدا بێت ، زۆر جاریش ئەم فرەدەنگییە بۆتە خۆرکە و کە لیێنـی گـەورەی لـە جەسـتەیدا دروسـت کـردووە، لـەرابردوودا سـکرتێری یـەکێتی هێـزی کۆنترۆڵکردنی هەموو یـەکێتی لەدەسـتدا نـەبوو، بـەڵکو ئـەو بـۆ بڕیـاردان لـە کێشە جۆراو جۆرەکـان دەگێرایــەوە بـۆلای هاورێکـانی، بـەلام بەسـتنی کـۆنگرەی دوو ڕودانــی ڕاپــەرین، سەرەتایەکی زێر ین بوو بۆ ئەوەی تاڵەبانی کۆی یەکێتی لە خۆیدا کۆبکاتــەوە و بـەجۆرێك ئەو قەزایەی بکاتە پێناسەی خۆی، کەدەوترێت یەکێتی بەواتای مام جەلال و مام جەلالیش بەواتای یەکێتی. ئیتر لێرەوە تاڵەبانی وردە وردە هەموو ئاوخۆرەکانی ناو یەکێتی وشـککرد و تێکــرای دەســەڵاتەکانی لەمەکتــەبی سیاســی و مەکتەبــەکانی تــر، بــەپێی پــەیرەو و پەسـەندکراوی نـاوخۆی یـەکێتی، لـە کـۆنگرەی دوو دا، لـەو کەسـایەتیدا کـۆکردەوە کـەپێی دەوترێت تاڵەبانی.

ئەودەســەڵاتە ڕەهایــەی ســکرتێری گــشتی، بــەجۆرێك کاردانــەوەی بەســەر مەکتــەبی سیاسییەوە هەبووە ، کە دانیشتنەکانی مەکتەبی سیاسی جگە لەسەکۆی گێرانەوەی چیرۆکی گەشتەکانی تاڵەبانی بۆ خۆرئـاوا و خۆرهـەلات، شوێنی گفتوگۆی سیاسی تێـدا نـەدەبووەوە. لــەجیاتی مــشت و مــڕە سیاســییەکان، میــزاج و تایبــەتی تەحــەکوم بــەتێکڕای کارەکـانی مەکتەبی سیاسییەوە دەکات.

دوانمونــەش، بریتییەلــە دەرکردنــی ئەوگروپــە کەلــەم دواییانــەدا خۆیــان راگەیانــد بەناوی(ڕەگ)و دەرکردنی هەلۆ إبراهیم ئەحمەد و عەتا سەراوی و هــەموو ئەوکەسـانەی لـە دیسپلینەکانی حزب لادەدەن.

قــسەکردن لەســەر ئــەم دوو جــۆرە دەرکردنــە. دەتوانێــت وێنەیــەکی نادروسـتی لــەناو مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا نیشان بدات. لەبەر ئەوەی بڕیاری دەرکردن بــەپێی پــەیرەو و پرۆگرامــی حــزب بێگەرانــەوەی بــۆ پرنـسیپە سیاسـییەکان نابێـت و

زۆرجاریش لەدەسەلاتی کۆنگرەدایە. دەرکردن لەکاتێکدا دێت کە ئەندامی حزب خیانەت بکات یاخود پێشێلی پەیرەو و پرۆگرام بکات.

## پەیامێك بۆ نەوشیروان مستەفا

ئەم دەرکردنە. هێندەی پەیامێکە بۆ نەوشیروان مستەفا و ئەوەندەی پەیوەندی بەقورسایی(رەگ)ەوە نییە چونکە شتێکی ئاشکرایە کە رەگ لە کوردستاندا پێگەیەکی جەوەماوەری نییە و ناتوانێت بەتەنها شوێن دەستی دیاری بێت لە گۆرانەکاندا. بەلام تالەبانی دەزانێت پشتی(رەگ )، ئەو(قەد)ە، زبرەیە کە چاوی لەگۆرانی سیستەمی سیاسی ولاتە، ئەویش نەوشیروان مستەفایە. رەگ بێ نەوشیروان مستەفا لەدوای دەرکردنی بەیاننامەکەیانەوە. دەمرن و دەبونە بەشێك لە مێژووی گروپە یاخییە بێ کاریگەرییەکانی ناویەکێتی نیشتمانی کوردستان، کەواتە نەوشیروان مستەفا زۆرجاریش دوور لە سیستمی خۆی هەموو یاخی بونەکان ناو یەکێتی لەدەوری کۆ دەبنەوە، بەلام ئەو جولە و چالاکییە ساسییانەی نەوشیروان مستەفا لەناو یەکێتیدا ئەنجامی دەدات. کەم نین و زۆرجاریش بالی تالەبانی هەراسان دەکات. لێرەدا شتێکی تەندروستە بگەرێنەوە بۆ سەر بریاری دەرکردنی گروپی(رەگ )، کەدەتوانیت بەبریارێکی میزاجی و شەخسی شلەژاو ناوبەرین لەبەر دووخال لەو سێ خالەی کە گروپی رەگی پێ دەرکران. لەبریارەکەی مەکتەبی سیاسیدا هاتووە باس لە(پارتی)و رۆلی ئەو دەکات، ناوهێنانی پارتی لەناو بریارێکی سیاسی ناوخۆیی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، ئەگەر ئاماژەبێت بۆ شتێك، ئاماژەیە بۆلاوازی و کەمدەستی و مەکتەبی سیاسی. لەوەش سەیر تر. خالی سێی بریارەکە، رستەیەکی شۆرشگێری سەردەمی شاخ و هیچ پەیوەندیی بە دۆخی بریارەکەوە نییە کەدەلێت: (بۆ پێشەوە ). ئەمە سەرەرای ئەوەی کەلە کاتی بریاردانەکەدان هەموو مەکتەبی سیاسی کۆك نەبوون لەسەر بریارە کە و مشت و مرێکی زۆر کەوتۆتە ناو ئەندامانی مەکتەبی سیاسییەوە تەنانەت دەوترێ جەلال جەوهەر بەمەلا بەختیاری وتووە: نابێت تۆ لە پێشت دەرکردنی بریارێکی لەو جۆرەبیت، لەکاتێکدا خۆت قوربانی ئەو سیاسەتە بوویت و هەروەها لەکاتی دەرکردنی بریارەکەدا دەمەتەقێ لەنێوان تالەبانی و جەلال جەوهەردا رویداوە. بەلام ئەندامی مەکتەبی سیاسی لەسەر خەتی گشتی، لەو بروایەدان کەئەوان بەرپرس بن لە پاراستنی یەکێتی تا کاتی کۆنگرە، ئەوبریارانەش دروستن بەلام(جەلال

جەوهەر و عمر سەید علی و عوسمان حاجی مەحمود)واژۆیان نەکردووە و(مستەفای سەید قادر)بەتێبینی یەوە واژۆی لەسەر بریارەکە کردووە،

## رەگ و قوڵکردنەوەی برینەکە

کەواتە دەرکردنی(رەگ )، جارێکی تر هێڵی ململانێی باڵەکانی پانکردەوە و کێشەکانی قوڵتر کردن، تەنانەت بەو رادەیەی کە ئێستا ئەو پرسیارە دروست بووە. کە ئایا تاڵەبانی گروپی ریفۆرمی ناوەوە بەدەردی(رەگ)نابات؟ کەرەنگە لەم دۆخەدا، کارێکی زۆر ئاسان بێت بەوەی کەرەنگە تاڵەبانی قۆناغی موجامەلەکردن تێپەراندبێت. هەرچەندە رەنگە تاڵەبانی پەلەنەکات . چەنکە بریارێکی لەو جۆرە گۆچانی سیاسەتی تاڵەبانی خوارتردەکات و مەرگی جەستەی یەکێتی نزیکتر دەکاتەوە، هەر بۆیەشە تاڵەبانی نەك بەرامبەر(عمری سید علی و هاورێکانی)بریارێکی لەو جۆرە نادات، تەنانەت بەرامبەر قەدی نارەزایی ناویەکێتی و هەرەشە مەزنەکەی سەیری(نەشیروان مستەفا)بریاری لەوجۆرە نادات بۆیە هەڵدەستێت بەدەرکردنی ئەندامانی سەر بەباڵی ریفۆرم و نەوشیروان. بەجۆرێك رەنگە مانگی تشرینی دووەم مانگی راوکردنی ئەندامانی باڵەکانی ناو یەکێتی بێت و شەپۆلی دەرکرن گەلێك کۆمیتە و مەڵبەند و مەکتەبەکان بگرێتەوە، هەرچەندە دەبێت ئەوە بزانین کەهەمیشە تاڵەبانی داوای ئەو کەسانە دەکات، کەلەروی جەماوەرییەوە بەهێزن دەرکردنی(هەڵۆ ابراهیم ئەحمەد)یش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە ئایا ئەم دەرکردنەش بەشێکە لەگەمە کۆمەڵایەتییەکانی تاڵەبانی. کە گوڵی سیاسییان پێدەدات. یاخود پەیوەست بە سەرکەشییەکانی خودی(هەڵۆ إبراهیم ئەحمەد)ەوە. دواجار دروستکردنی(پارتی پێشکەوتن)لەلایەن(هەڵۆ)وە.

ئەوەی سەلماند کە ئەومەرامی سیاسی هەیە ئەوەی لەم دەرکردنەدا سەرنج راکێشە ئەوەیە کەدەر کردنی هەڵۆ دوو پلەی لە پرنسیپی حزبی دور کەوتەوە، چونکە مەکتەبی سیاسی ئەنجامی نەداوە، بەڵکو مەکتەبی مام جەلال دەری کردووە، کەئەم مەکتەبە دەسەڵاتی دەرکردنی کەسی نییە. هەرچەندە دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە هەڵۆ إبراهیم ئەحمەد یەکێتی نەبووە و مەسئولیاتی لەناو یەکێتیدا نەبووە و لە کوردستاندا نەژیاوە بەو پێوانەکەی(هەڵۆ)و(هێرۆ خان)دەمێك نابێت ئاشت بونەتەوە، بۆیە ئەم دەرکردنە کارناکاتە سەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بنەماڵەی تاڵەبانی و إبراهیم ئەحمەد . چونکە نەك هێرۆخان بەڵکو شانازی خوشکیشی پاڵپشتەبێ مەرجەکەی تاڵەبانین.

( جەلالی نوێ )

ئەوەی خوێنی کردە ناو برینی دەرکردنی هەڵۆ إبراهیم ئەحمەد دووە بەجێهێشتنی ئەو هاورێ سیاسییانەی بوو. کە خۆیان ناونابوو(ئاراستەی یەکبوون).(ئاراستەی یەکبوون)بەرگەی یەك دەعوەت و برێك پارەی تاڵەبانی نەگرت. دوای ئەوەی تاڵەبانی ئەم گروپە بانگهێشتی خوانە دانراوەکە کرد. هەر زوو خۆیان هەڵوەشاندەوە و هەڵۆ- یان تەنها جێهێشت و ناوی خۆیان گۆری بۆ جەلالی نوێ دەبێت ئەو راستییەش بزانین کە(ئاراستەی یەکبوون) لەلایەن پاڤێڵ تاڵەبانییەوە پاڵپشتی ماددی دەکرا. ئێستا سیاسییەکان ناویەکێتی لەوە سەریان سورماوە ئەم گروپە چی بوون، چۆن دروست بوون و چییان کردووە. چۆن وا زوو هەڵوەشانەوە . پێدە چێت هەڵمەتی دەکردنی لەناو یەکێتیدا. بەردەوام بێت تا ئەوکاتەی نارازییەکانی ناو یەکێتی دەچنەدەرەوە یان بێدەنگی هەڵدەبژێرن.

## نەوشیروان مستەفا چی دەکات؟

ئەوەی کە تائێستا ئاشکرایە، بریتییە لەوەی کە نەوشیروان مستەفا هیچ بەرنامەیەکی رونی نییە بۆ گۆران و تەنانەت وتارەکانی ئەم دواییەشی جگەلە پێشنیازێکی چەند ئەگەرکارێکی جۆراوجۆر و بلاو هیچی تری نەخستۆتە روو بەدیوێکی تردا. نەوشیروان مستەفا پلانی گۆرینی داوەتە دەست خەڵك و چاوەرێی ئەوەدەکات کەخەڵك کام لە ئەگەرە پێشنیازکراوەکانی ئەو قبوڵ دەکەن. نەوشیروان مستەفا بەشداری شتێك ناکات کە خۆی باوەری پێ نەبێت و نەخولقاندبێ، بەلام بەرنامەی ئەم جارەی بەئاراستەیەکی تر تەرح کردووە، بەوەی کەخەڵك چی دەڵێ لەسەر گۆران و کام رێگا هەڵدەبژێرن، تاکو ئەویش پشتیوانی لێبکات، ئەم کارەش لە هەڵوێستی سیاسییە وردەکان دەچێت، کەکاردەکەن لەسەر ئامادەکردنی جەماوەر، پێش ئاشکرا کردنی بەرنامەی سیاسی خۆیان. تاکو ئێستا نەوشیروان مستەفا لەناو کێڵگەی ئەگەرە جیاوازەکاندا دێت و دەروات ناتوانێت خۆی یەکلایی بکاتەوە کە گۆران لەکام رێگاوە دەبێت.(چەك، رەخنە، کۆنگرە و حزبی نوێ)وەلەو بروایەدام هیچ کام لەمانە ناتوانێت دۆخێکی تەندروست بهێنێتە گۆرێ لەبەر ئەوەی هەریەکەیان کۆسپ و تەگەری زۆری هەیە.(کۆنگرە)میکانزمێکی لەپەل و پۆ خوراوە(چەك)زەمەنی بەسەر چووە و کێشەکان ئالۆوتر دەکات(رەخنەش)حوکومەتیش گوێی لێناگرێت و حزبی نوێش پێویستی بەپارە و خەڵکی دەرەوە و بوێری هەیە. بۆیە

نەوشیروان مستەفا و هاوڕێکانی زیاتر ئەو ئەگەرەیان قبوڵە کەباڵی خۆیان لەناو یەکێتیدا تۆخ بکەنەوە و ببنە خاوەن بەرنامەیەکی جیاواز و دیار لەناو یەکێتیدا.

نەوشیروان لەبەرنامە تازەکەیدا کەبەرنامەیەکی فراوانە بۆ خەڵکی پێشنیاز کردووە، کەدەیەوێت لەناو جەماوەرەوە بێتە ناو حزب و ناو حوکومەتیش، چونکە ئەو تەواو رەشبینە لە گۆران لە حزبدا. هەرچەندە باشترین چارەسەر لە ئێستای یەکێتی، بریتییە لەوەی نەوشیروان مستەفا بیر لەتۆخ کردنەوەی باڵە کەی بکات لەناو یەکێتیدا و بەفەرمی باڵی جیاوازی خۆی ئاشکرابکرێت، وەك نەریتێك کە لەزۆر حزبی سیاسی دنیادادا هەبووە بۆئەمەش کەدەتوانێت قەناعەت بەتاڵەبانی و باڵەکانی تر بهێنێت. چونکە جگە لەم چارەسەرە یەکێتی رەنگە بەرە و هەڵدێر بچێت و دواجاریش گۆی دەستکەوتە بەدەستهێنراوەکانی کورد بەرە و بچوك بونەوە لەناو بچن.

**نەوشیروان لەتەوەرە هەستبرەکەدەدات**

لێرەدا دیوێکی تریش هەیە کەدەبێت ئاماژەی بۆ بکەین کە ناکرێت تاقیامەت چاومان لە زروفی ناسك بێت و گۆڕانەکان دوابخەین بۆکاتی نادایار نەوشیروان مستەفا لەم بەرنامەیەدا زۆر تەرکیز دەکاتە سەر بودجە، چونکە یەکێتی و پارتی بە باسکردنی ئەم مەسەلەیە وڕ دەبن، تەنانەت ئەوان لەپێناوی مەسەلەی بودجەدا ئامادەی هەموو سازشێکن، وەك بینیمان کەرکوکیان قبولکرد لە نێوان گرێبەستە نەوتییەکاندا، لەم دۆخەدا نەوشیروان مستەفا دەتوانێت، هەم یەکێتی لاواز بکات ئەگەر بیەوێت، چونکە زەمینەی لاوازبوونی تەواو رەخساو لەناوخۆیدا، جگەلەوانەی کە بەرژەوەندییان بە تاڵەبانییەوە گرێدراوە، کەس بەرگری لێناکات و هەم دەشتوانن بەهێزی بکاتەوە، چونکە هەرگیز نەوشیروان مستەفا نایەوێت دەستبەرداری یەکێتی ببێت و مێژووی یەکێتی تەسلیمی باڵی تاڵەبانی بکات.

هەمیشە نەوشیروان تەرکیز دەکاتەسەر خاڵی دووەم لەبیر سەندنەوەی یەکێتیدا دەبێت لەدەست تاڵەبانی و باڵەکەی، بەڵام ئەم سەندنەوەیە کاری زۆری دەوێت، لە کاتێکدا رۆژ بەرۆژ نێوان تاڵەبانی و نەوشیروان ئالۆزتردەبێت و ئەگەری ئاشت بوونەوەیان زۆر کزە.

هەرچەندە لە ئێستادا بیرۆکەیەکی وا لەناوخۆی یەکێتیدا سەری هەڵداوە کەنەوشیروان ببێتە سکرتێر و مام جەلالیش ببێتە سەرۆکی یەکێتی. ئەم ئەگەرە لاوازە زۆر دورە لەواقیعی ئێستای یەکێتییەوە مەنتیقی تێدا نییە. بەڵام ئەگەر یەکە و بەشێك لەو چارەسەرە تەوافوقییەی کەئەمرۆ لە کوردستان و عێراقدا بۆتە مۆدێلی دیموکراسیەت.

## جێگرەکان بەرە و کوێ

دوو جێگری ناوچەیی زادەیی قۆناغێکی پڕ کێشە، لە باروو دۆخێکی ئێستای وەکو یەکێتیدا چییان پێدەکرێت؟ کۆسرەت رەسولْ تادێت نەخۆشی تەنگی پێهەڵدەچنێت و پرۆژە سیاسییەکەی پاشەکشە پێدەکات، رەنگە راسترین رستە ئەوەبێت(بەپێوانەی تێروانینە باوەکانەوە کە پێیان وایە باڵی نەوشیروان لە هەڵبژاردنەکاندا دۆران )دۆراندنی سەرەکی باڵی کۆسرەت رەسولْ بێت. چونکە رۆژ بەرۆژ بەرە و بچوك بونەوە دەچێت، هەرچەندە ئەم باڵە لەناوخۆی یەکێتیدا. باڵێکی کاریگەر نەبوو وەك بەرپرسی راگەیاندنی یەکێتی لە وتارێکی رۆژنامەوانیدا ئاماژەبەوە دەکات جگە لە دوو باڵ باڵی دیکە نییە، ئەمە بە دیوێك بە دیوەکانیدا، هێمایە بۆ توانەوەی باڵی کۆسرەت رەسولْ، ئەگەر لە ئێستادا باڵی کۆسرەت رەسولْ حالْی بەو جۆرە بێت، رەنگە دوای خۆی شتێك لەناو یەکێتیدا نەمێنێت بەناوی باڵی کۆسرەتەوە.

لە ئێستادا کۆسرەت رەسولْ کەوتۆتە خۆساغکردنەوە لەنێوان دوو بەرداشەکەدا، کەدەیەوێت هاوسەنگی رابگرێت و سود لە هەردوولا وەربگرێت، بەلاّم زەمەنی ئەو جۆرە یاریکردنەی کۆسرەت رەسولْ کۆتایی پێهات و توانای مانوەرە کردنی نەماوە، بەتایبەتی هەڵبژاردنەکانی یەکێتی زیانی گەیاند بە گەمە سیاسییەکانی کۆسرەت رەسولْ و خۆری مناوەرە کردنی ئاواکرد. ئێستا نەوشیروان لەنێوان دوو بەرداشی زبر دایە، کەهیچ مانایان ئەوی تریان قبولْ ناکات. هەرچی سەبارەت بە بەرهەم صالحە ئەوا ئەمیان توخمی زۆرە و زۆر زیاترە لەوەی کە چاوەرێی دەکات کە بەدەستی هێناوە. بەپێچەوانەی کۆسرەت رەسولەوە کە گەشتۆتە لوتکەی خەونەکانی بواری چونە پێشەوەی بەرهەم صالح زۆر زیادی کردووە، بەلاّم دەبێت ئەوە بزانین کە دوای تاڵەبانی شوێنی هەردوو جێگرەکە لەقە.

## سلێمانی لەیەکێتی هاتۆتە دەرەوە

وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆکرد، ئەگەر بێت و یەکێتی بەرە و پارچە پارچە بوون بروات، نەك سەرکردایەتی یەکێتی زیان دەکات بەڵکو ئاراستە دیارە سیاسییەکان لەهەرێمدا دەگۆرێت، تەنانەت وولاّتانی هەرێمی و ئەمریکا و چاودێری رەوشی ناوخۆی یەکێتی دەکەن و چارەنوسی یەکێتی کاردانەوەی زۆری بەسەر چارەنوسی کوردەوە هەیە لەعێراقدا، چونکە هاوسەنگییەکان تێکدەچن و باری ئاسایش دەشێوێت و بگرە حزبێکی وەك پارتی لە غیابی یەکێتیدا دەبێتە حزبێکی تاکرەوی.

ئەوەی ئەگەرەکانی لەت بوون لەناو یەکێتیدا زیاد دەکات غیابی سلێمانییە لەناوەندی بریاردانی یەکێتیدا، سلێمانی ئێستا لەلایەن خەڵکی تری شارەکانی کوردستانەوە داگیرکراوە و نوزەی لەبەر براوە، لە کاتێکدا لەسادەترین هەڵسەنگاندندا، دەتوانین بڵێین یەکێتی بەبێ سلێمانی حزبێکی بچوکە. ئەگەر سەرەنج بدەین دام و دەزگا هەستیارەکانی یەکێتی و ئەوبەشەی حەکەمەت کە بەدەست یەکێتی نیشتمانی کوردستانەیە، دەبینین سلێمانی بەتەواوەتی ونە.

## دەزگا هەستیارەکانی یەکێتی و بەرپرسەکانیان و شوێنەکانیان لەناو حزب و حوکومەتدا

فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگە مام جەلال(کۆیە )، سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان عەدنان موفتی(هەولێر) جێگری سەرۆکی هەرێم کۆسرەت رەسوڵ(هەولێر)، دەزگای زانیاری د. خەسرەو گوڵ محمد(خانەقین) ، مەکتەبی رێکخستن ئەرسەلان بایز(هەولێر )، مەکتەبی راگەیاندن ئازاد جوندیانی (هەولێر )، مەکتەبی رێکخراوەدیموکراتییەکان مەلا بەختیار(خانەقین)، مەکتەبی بیر و هۆشیاری مامۆستا جەعفەر(خانەقین )، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی فەرید ئەسەسەرد(هەولێر) ئاسایشی گشتی مامۆستا سەیفەدین(هەولێر )، جێگری فەرماندەی یەکێتی مستەفا سەید قادر(رانیە )، مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوە مەلا بەختیار - سەرپەرشتیار(خانەقین )، وەزارەتی ناوخۆ عوسمانی حاجی مەحمود(کفری )، وەزیری هەرێم بۆ کاروباری دارایی بایز تاڵەبانی(کەرکوك ).

## یەکێتی بەبێ( نەوشیروان مستەفا )کۆنگرە ببەستێ زەرەر ئەکات.
## شەهید ئارام بمایە کۆمەڵەی تەسلیمی یەکێتی نەدەکرد

ئاوات قارەمانی

دەربارەی رەوش و سیاسی حزبی ئەمرۆی کوردستان و دەنگۆکانی پێش بەستنی سێیەمین کۆنگرەی یەکێتی ، " شەن " بەپێویستی زانی دەربارەی پرسیارگەلێك لەگەڵ " ئاوات قارەمانی " ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان پێشوو بووە، قارەمانی بەوردی لە مێژووی کۆمەڵە و یەکێتی ئاگادارە ئەو کەلەساڵی ١٩٤٨ لە گوندی " قارەمان" ی ناوچەی قەرەداخ لە دایك بووە لەساڵی ١٩٧١ لەگەڵ کادێرە سەرتاییەکانی کۆمەڵەدا دەستی بەکارکردن کردووە بەوهۆیەوە نەیتوانیوە درێژە بە خوێندن بدات و پێش ئەوەی ببێتە رێکخستنی کۆمەڵە، لەساڵی ١٩٦٤ وە لە ناوریزەکانی پارتی شۆرشی ئەیلول دا کاریکردووە، ئەندامی کۆمیتەی هەڵمەت بووە کە لە حەفتاکاندا لە سلێمانی دروستکرا بوو، لە کۆنفرانسی(یەکەم و دووەم)ی کۆمەڵە دا بەشداری کردووە و لە کۆبونەوەی " نۆکان " کراوە بەئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە کتێبی یاداشتەکانی بەناوی(رێگا باریکەکان)بڵاوکردۆتەوە.

### فکری کۆمەڵە تەنها لەناو جەلالیدا هەبوو

قارەمانی دەربارەی کارکردنی وەکو کۆمەڵە وتی: لەگەڵ شەهید جمال تاهیر دا کەهەردووکمان جەلالی بووین دوای بەیانی ١١ی ئازار گفتوگۆی ئەوەمان کرد کەئایا کێشەی کورد چارەسەر بووە یان نا، لەو رووەوە من بە " جمال تاهیر " م وت: کێشەی پێموانیی کێشەی کورد چارەسەر بوبێت، دەربارەی مێژووی " کۆمەڵە "ش، قارەمانی وتی: کۆمەڵە لەسەرەتادا وەکو فکر هەبووە، دواتر رێکخستن، لەگەڵ ئەوە کەنسکۆی شۆرشی ئەیلول رویدا کۆمەڵە راگەیەنرا، لەسەردەمی بەیانی ١١ی ئازاردا پارتی دەسەلاتی هەبوو، مەسەلەی " پاراستن " هەبوو، ئەبوو زۆر نهێنی بوایە، نەتدەتوانی رێکخستن بکەیت و لەگەڵ خزم و هاورێکانتا کارت لەسەر فکری کۆمەڵە بکردایە، تەنها لەناو جەلالیدا هەبوو، کاك نەوشیروان و شەهید شازاد و مەحمود مەلا عیزەت و فەرەیدون عبد القادر خاڵە شەهاب و فوئاد

قەرەداغی و کۆمەڵێك کەسی دیکە لەو سەردەمەیا فکری جیاوازییان هەبووە، لەوکاتەیا زیاتر باوی فکری " ماویەت " بوو، کۆمەڵێ ڕێکخستنی ئێرانی هاتبوون لەناو جەلالیدا بوون بەناوی ماوییەوە کە زیاتر کاریگەرییان هەبوو، ئێستا برادەری وامان هەیە دەڵێت من لە(حەفتاکان) ەوە یەکێتیم ! بابەگیان حەفتاکان یەکێتی هەر نەبووە.

## بۆچونی جیاواز هەر لەسەرەتاوە هەبووە

قارەمانی کەدێتەسەرباسی سەرەتای کۆمەڵە دەڵێ دەربارەی رۆژگار و بیر و باوە ری مارکسی و کوردستانی بوونی، هەندێ لەو برادەرانە بۆچونیان جیاوازە بەوەی کە ئێمە دەبێت ڕێکخستنێکی تازەی مارکسیمان هەبێت بەلأم کوردستانی نەبێ عێراقی ئەبێ، لەوانە(فوئاد قەرەداغی )و(فازڵ)و کۆمەڵێك برادەر کەپێیان دەوترێت عێراقچێتی دەکەن، ئەوان پێیان وا بوو کەدەبێت لە عێراقدا یەك حزب هەبێت، بەلأم ئێمە وەك میللەتی کورد لەبەرئەوەی هەم چەوساندنەوەی نەتەوەیەکمان هەیە، هەم چەوساندنەوەی چینایەتی، کەواتە پێویست بوو لەبەرئەو واقیعە وا کار بکرێت ئێمە واقیعە نەتەوایەتییەکەمان پێش خست کە ڕێکخستی مارکس و لینینمان هەبێت بۆئەوەی بتوانین مەسەلە نەتەوایەتییەکەش چارەسەر بکات نمونەی " حزبی شیوعی عێراقی " و کۆمەڵێ حزب و کۆمەڵەم هێناوەتەوە کە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. تائێستا لەجێبەجێکردندان.

## کۆمەڵە و دروستکردنی کادیر

" ئاوات قارەمانی " دەربارەی چۆنیەتی بلأوبونەوەی فکری مارکس و لینین لەڕێی کتێب خوێندنەوە و دروستکردنی دەستەی رۆشنبیری گروپی فکری و بۆنمونە جمال تاهیر بەمنی وت حەزدەکەم دابنیشین و کتێب بخوێنینەوە، منیش پێم وت: خوێندنەوەی دانشتنی(دوو کە سی و سێ کەسی)ت، بۆچییە هەرکەسێ لەلایەن خۆیەوە حەزی لێیەتی دەتوانێ بخوێنێتەوە ، دواتر " جمال تاهیر وتی: ئەو کتێبانە دەخوێنینەوە کەباسی شۆرشی دونیا دەکات و بزانین چۆن سەرکەوتن و شکستیان بەدەست هێناوە ، دەبێت زانیاریمان هەبێت دەربارەی ئەو شتانە، ئەو کتێبانەی دەمان خوێندەوە کاریگەری زۆری هەبوو، رەفتاری کادیرەکانی ئێمە و پێشمەرگەی کۆمەڵە نمونەیی بوو لەناو خەڵکدا خۆیان گونجاند بوو، بۆ نمونە / کادێرێك کە دەچووە ناو خەڵکی لادێکانەوە دەیانپەرست، ئەوەش بزانن کە کارەکانی کۆمەڵە لە کەرکووك و سلێمانی و هەولێر و بادینان و بەغداد، بەرێوە دەچوو چەندین کادێری کارامان هەبوو.

## کۆمەڵە بۆ ئەوە دروست نەبوو کە یەکێتی دروست بکات

لەمانگی ٥ ی ساڵی ١٩٧٨ کۆبونەوەیەکك لەنۆکان کرا کە ئەوکاتە کاك ئارام شەهید بوبو، کاك نەوشیروان و برادەرانی دەرەوە هەموویان هاتبوون، ئێمەش چوبوین، کاك نەوشیروان پێشنیاری کرد کە تائێستا کۆمەڵە سەرکردایەتییەکی نییە و ئەو سەرکردایەتییەی هەیە لەبەغداد گیرا بوو، لەوانە(خاڵە شەهاب و کاك فەرەیدون و عمری سەید علی و کۆمەڵێکی تر)کە کەس وەکو سەرکردە لەدوای کاك ئارام کە کۆمیتەی هەرێمەکانی دروست کردبوو دەرنەکەوت، بۆیە پێشنیارەکەی بریتی بوو لەوەی پێویستە سەرکردایەتیمان هەبێت، دەربارەی ئەوەی لە کتێبی،(رێگا باریکەکانی)دا باسێکی دانسقەی تیایە دەربارەی شەهید ئارام شاسوار ئەوسەردەمەش کە قارەمانی زۆرنزیك بووە لێوەی وتی: ماوەیەکی دور و درێژە هەم لەشار، هەم لەدەرەوە لەگەڵ شەهید ئارامدا بووم بەواتای وشە مرۆڤێکی بەکردەوە لەسەرکردە باشەکانی کۆمەڵەبوو، ئەڵێم شەهید ئارام بمایە کۆمەڵە چارەسەر نەدەبوو، بەرەو پێشەوە دەچوو رێکخراوێکی سەربەخۆ بوو چونکە بروای تەواوی بەراستی هەبوو، کۆمەڵەی تەسلیمی یەکێتی نەدەکرد، پێم وایە کۆمەڵە بۆئەوە دروست نەبووە کە یەکێتی دروست بکات چونکە من بۆخۆم کە چوومە دەرەوە لەساڵی ١٩٦٧ بۆ پێشمەرگایەتی کە وەکو بەرپرس لەناوچەی قەرەداغ و گەرمیان بووم، ئەسڵەن باسی یەکێتیم نەکردووە چونکە لەناو یەکێتی نەمام، کەلە سوریا نامەیەك هات تا ئێمە کۆمەڵێك رێکخستن کۆبکەینەوە لە خەڵکە نیشتمانییەکان و تێکۆشەرەکان و ناوی بنێین یەکێتی، لەبەر ئەوەی هەموو کەس نابێت بەمارکسی " ئەمە وەکو چەترێك، بەحیساب یەکێتی یەکێتی دەبێت بەچەترێك و کۆمەڵە ناوەرۆکەکەی بێت، یەکەمجار فکرەکە وا بوو، دواتر وا دەرنەچوو کۆمەڵە لەیەکێتیدا توێنرایەوە.

## کۆمەڵە و گرنگیدان بەگەنج

ئەوانەی دەبونە ئەندامی کۆمەڵە و کادری کارا نەبوون، زیاتر گەنجەکان بوون لەناو(خوێندکاران و رۆشنبیرا و مامۆستایان)دا گەشەیان کردبوو، خەڵکیش ئەگەر کۆمەڵەش نەووبێت ئەوا پشتگیری لە سەدا سەدی کۆمەڵەی دەکرد و دەیانبینی هەمووی گەنجە و ئێمەش هەموو گەنج بووین و ئێمەش هەموو گەنج بووین و گرو تینێکی زۆرمان هەبوو، کۆمەڵەش وەکو فکرێکی مارکسی – لینینی هەبوو، لەناو توێژی خوێندکاران و

رۆشنفکراندا زۆر بوو، بەڵام مەسەلە قەومییەکە کەلەناو جوتیاران و خەڵکی گشتی کورددا زۆرە کاریگەری هەبوو کەزۆرترینیان لەدەرەوەی شۆرشەکە و کۆمەڵە کۆبونەوە.

## یەکێتە بەبێ نەوشیروان مستەفا کۆنگرە ببەستێ زەرەر دەکات

قارەمانی سەبارەت بەباروذۆخی سیاسی ئێستای کوردستان، پێی وایە هەمو شتێك بەرژەوەندییە، لەسەرەتاوە سەرکردایەتی کورد گەورەترین هەڵەمان ئەوە بوو کەلەگەڵ رزگار بوونی عێراقدا کەرکوکی چارەسەر بکردایە نەك ئاوا ئێستا بەپەلە بکەونە خۆ، مەسەلەی کەرکود وەك ئەوە وایە: من ماڵەکەی خۆمم خانووەکەی خۆمم کەتاپۆیە لەسەر خرم واتا بەرەسمی موڵکی خۆمە و بێم لەگەرەکەکەیا بەخەڵك بلێم ئەرێ خەڵکینە هەڵبژاردن بکەن ئەم خانووە هی منە یان هی من نییە ! بەبۆچونی من کەرکووك وا بووە، بەدرێژایی مێژوو سەدەی رابردوو کورد لەسەر کەرکوك شەری کردووە، شۆرشی ئەیلول لەسەر کەرکوك تێکچوو، گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٨٤ ی یەکێتی لەگەڵ سەددام حوسێن لەسەر کەرکوك تێکچوو، بەڵام لەکاتێکدا حوکومەتی بەعس روخا ئەوا تۆ بۆخۆت گەورەترین دەسەڵات بوویت لەکەرکووك دا و بۆ کەرکوکت وت لێ کرد؟.

سەبارەت بەسیاسەتی دەرەکی و ئەمریکا و وڵاتانی ناوچەکە ئاوات قارەمانی وتی " پێم وایە دەوڵەتانی دراوسیچی عێراق هەر هەموویان لە عێراق زیاتر دژی ئێمەن کورد دەبێت پشت بەخۆی ببەستێت نەك بەتەمای امریکا و وڵاتانی بێت و خێری پێ بکەن، چونکە امریکا بەرژەوەندی خۆی چۆن بێت وادەکات، وەزعی سیاسی کوردستانیش ئاساییە چونکە کورد راهاتووە لەسەر بارو دۆخەکە نابێت دەربارەی خواستەکانی گەلەکەمان تەنازول بکەین لەوخەباتەی کە چەندین ساڵە ئێمەی خەڵکی لەبرسا بەکوشت دەدەین و دەبێت ژیرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، سەبارەت بەبار و دۆخی ناویەکێتی و قارەمانی وەك کادری کۆنی کۆمەڵە و هەڵسوراوێکی سیاسی پێی وایە کە یەکێتی فیرە، یەکێتی یەکێکە لەلایەنەکانی کە ئەوەیە هەر لەسەرەتای دروست بونییەوە بەسێ باڵەوە ئەم ململانێیەیان هەبووە.

لەوەلامی ئەوپرسیارەی کەهەرچەند ململانێکان سەخت بوون و، ئەوە نەگەشتۆتە ئەوەی یەکێکی وەکو نەوشیروان مستەفا لەیەکێتی دەست لەکار بکێشێتەوە، ئەویش وتی سەردەمی شاخ لەبەرئەوەی دوژمن لەناو وڵات رژێمی بەعس بوو ، بەڵام ئێستا شەری بەعس نەماوە، سەردەمی شەری لایەنەکانی دیکە نەماوە، پێمواشە گەر کاك نەوشیروان

بیتوانیایە دەسەلاتی هەبوایە لەوەزعەکە وەکو لەشاخ هەیبوو، ئێستاش هەیبوایە بیتوانیایە وەزعەکان بگۆڕێ و بەرە و باشی بەرێت، مانەوەی لەناو یەکێتیدا زۆر باشتر دەبوو، بەلام کەدەسەلات نەبێت، ئەوە هاتنە دەرەوەی باشتر بوو. یەکێتی لەم سەردەمەیا کۆنگرە ببەستێ بەبێ نەوشیروان مستەفا زەرەر دەکات.

## ئومێدم بەکۆنگرەی یەکێتی نییە

قارەمانی دەربارەی دوو باڵەسەرەکییەکی یەکێتی وتی: ئێستا مەسەلەکە ئاشکرایە لەناو هەموو مەڵبەند و رێکخستنەکان و سەرجەم ئۆرگانەکانی حزب و حوکومەت دووبەرەی جیاوازە، وەکو ئەوە وایە چاوی خۆمانی لێ بنوقێنین ئەگینا ئەوە راستییەکەیە، ئەگەر تەوافوق و رێکەوتنێك نەبێت لەسەر کۆنگرە کە چۆن دەچنە کۆنگرە و حیساب بۆ باڵەکەی نەوشیروان مستەفا نەکرێ و زۆرییەتی، کۆنگرە ناگیرێت لەوانەش بێت بگیرێ و ببێت بە هۆسە، پێم وایە کە کاك نەوشیروان گەورەترین هەڵە کەکردبێتی کۆمەڵە وەکو کۆمەڵەبمایە، نەك تەسلیمی یەکێتی بکاتەوە، کاك نەوشیروان دەڵێت ئەوانەی کۆنەڵە هەر کۆمەڵەن، بەلام جیازوازی زۆر بوو چونکە ئەو سەردەمە وەکوو رێکخستنێکی سەربەخۆ نەی دەتوانی کۆنفرانس ببەستێ، دەربارەی ئەوەی ئایا فکری کۆمەڵە تاچەند کاریگەری بووە لەوبەرنامەیەی نەوشیروان و سەرکردایەتی کۆمەڵە دایدەرشت بۆ(راپەرینی ١٩٩١)جێبەجێکردنەکەی بەو جۆرە رۆڵی ئەو مەسەلەیەی خستە روو، کەیەکێك بووە دەسەڵاتی تەواوی هەبووە و پرس و راوێژی پێدەکرا، پێم وایە فکری کۆمەڵەش و بەرنامەکەی کاریگەری هەبووە، لەدوا پرسیارماندا لە ئاوات علی عبدالکریم کە پرسیمان ئومێدت بە کۆنگرەی یەکێتی هەیە؟ بەیەك وشە وەلامی داینەوە و وتی: نەخێر!

## چوار مەکتەب سیاسییەکەی ریفۆرم کەوتنە چ چاڵێکەوە؟

نیاز محمد

پاش دەست لەکارکێشانەوەیان، تاوەکو ئێستا دیار نییە چوار مەکتەب سیاسییەکەی ریفۆرم کەوتونە کوێی هاوکێشەی ململانێکانەوە و چاودێرێکی سیاسیش پێی وایە ئەوان نەیانتوانی پێکەوە کار بکەن و هاورابن لەسەر هەڵوێستەکانیان و دەستلەکار کێشانەوەشیان بەدەستلەکار کێشانەوەیەکی سلبی وەسف دەکەن.

سەرەتای مانگی شوباتی ئەمساڵ چوار ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەسەر بەباڵی ریفۆرم ناسراون و پێکهاتبوون لە(جەلال حەوهەر ، عمر سید علی، عوسمانی حاجی مەحمود، مستەفای سەید قادر )لەبەرامبەر قبوڵنەکردنی داواکارییەکاندا بۆ چاکسازی لەنێوحزبەکەیاندا، دەست لەکارکێشانەوە ی خۆیان پێشکەشکرد.

پاش دەست لەکارکێشانەوە یان ئەو چوار ئەندامەی مەکتەبی سیاسی کوردستان هەرچەندە لەپێشدا وایان راگەیاند بوو، کە پێکەوە وەك یەك گروپ کاردەکەن بەلام ئەوخەیاڵە هەر زوو بەتاڵ بووەوە کاتێك بینیمان هەریەکەیان و بەلایەکدا کەوتن.

### مەکتەب سیاسییەکان هاورای باڵی رفۆرمن

هەرچەندە لە راگەیەنراوی یەکەمی کۆمیتەی سەرکردایەتی باڵی رفۆرمدا کەلە حەوت ئەندامی سەرکردایەتی سڕکراوی ناویەکێتی پێکهاتوون ئامازەبەوە درابوو کەچوار مەکتەب سیاسییە دەستلەکارکێشاوەکەی یەکێتیشیان لەگەڵدایە بەلام سەرچاوەیەکی باڵای نێو یەکێتی سەربەباڵی گشتی کەنەی ویست ناوی ئاشکرابکرێت بەجیهان – ی راگەیاند کە ئەو چوار مەکتەب سیاسییە لەگەڵ ئەو باڵە نین بەتەواوی خۆیان یەکلانەکردۆتەوە هەرچەندە دەستیان لەکارکێشاوەتەوە، ئەو سەرچاوە باڵایەی نێو یەکێتی ئامازەی بەوەکرد کەتا رادەیەك هەردوو ئەندام مەکتەب سیاسی جەلال جەوهەر و عمر سید علی رەنگە لەگەڵ دروست بوونی ئەو کۆمیتەدا بن، بەلام بەو شێوازە نا کە ئەو حەوت ئەندامەی سەرکردایەتی رایان گەیاند، هەرچەندە ئەو دوو ئەندامەی تریش(مستەفای سەید قادر و عوسمانی حاجی مەحمود)بەدوور دەزانرێ کەئاگاداری ئەو کۆمیتەیە بوبن، چوار ئەندامە

دەستلەکارکێشاوەکەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لە هەفتەی دەست لەکارکێشانەوە یدا، جێی بایەخی راگەیاندنە ناوخۆییەکان بوون، بەڵام دوای ئەوەچالاکی و کارەکانیان دیار نەما و ئاوا بوون، بەبڕوای ئەو سەرچاوە بالآیەی نێو یەکێتی هۆکاری ئەمە ئەوەیە کەنەیانتوانی وەك گروپێك پێکەوە کار بکەن ئەمەش وایکرد سەنگ و قورسایی خۆیان دەربکەن.

**عوسمانی حاجی مەحمود سەربەکام لایە؟**

چوار ئەندام مەکتەب سیاسییە کە پاش دەست لەکارکێشانەوە یان نەیانتوانی بەشێوەی تیمێك ئەوەی دەیانەوێ بۆخۆیان کاری بۆ بکەن، ئەمەش هۆکارەکەی ئەوەبوو کەئەمان یەك شێوە تێروانینیان نەبوو، لەسەر مەسەلەی دەست لەکارکێشانەوە یان و کارکردن پاش هاتنەدەر لە یەکێتی.

تا ئێستا ئەوەی دیارە(جەلال جەوهەر و عمر سەیدعلی)بەتەواوەتی خۆیان یەکلایی کردۆتەوە لەگەڵ ئەو باڵەی کە نەوشیروان مستەفا سەرکردایەتی دەکات و بەباڵی ریفۆرم ناودەبرێت ئەوان ئێستا رۆژانە لەگردەکەی کۆمپانیای وشە کاردەکەن، هەرچەندە بەبڕوای سەرچاوە یەك ئەوان لەمەکتەبی سیاسی بونایە زۆر باشتر بوو، تاوەکو ئەو دەوامکردنەی کۆمپانیای وشە کە کەس نازانێ سەرقاڵی چین.

ئەوەشی پەیوەندی بە دوو مەکتەب سیاسییەکەی ترەوە هەیە(عوسمانی حاجی محمود، مستەفای سەید قادر)تاوەکو ئێستا روون نییە، سەرقاڵی چی دەبن، بەپێی هەندێ زانیاری مستەفای سەید قادر خۆی بۆ کارکردن بۆ لیستی گۆڕان کە دیسان نەوشیروان مستەفا سەرکردایەتی دەکات یەکلایی کردۆتەوە، ئێستا سەرپەرشتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی ئەولیستە دەکات لە ناوچەی پشدەر، بەڵام هەندێ سەرچاوەی تر ئەم زانیارییانە رەت دەکەنەوە و باس لەوە کەن کە مستەفای سەید قادر بەتەواوەتی خۆی یەگلایی نەکردۆتەوە بۆباڵەکەی نەوشیروان مستەفا تەنها وەك هاورێیەك جار جارە سەردانی کۆمپانیای وشە دەکات بە مەبەستی بەسەر کردنەوەی هاورێکانی.

لەهەفتەکانی رابردووشدا هەندێ دەنگو باس لە گەڕانەوەی عوسمانی حاجی مەحمود ئەندامی مەکتەبی سیاسی دەست لەکارکێشاوە بۆ ناومەکتەبی سیاسی دەکرد، بەڵام سەرچاوەیەکی نزیك لە عوسمانی حاجی محمود ئەو دەنگۆیانەی رەتکردەوە و رای گەیاند کەناو براو نەگەراوەتەوە ناو مەکتەبی سیاسی ئەو قسە و دەنگۆیانە هیچ بنەمایەکیان نییە، بۆلێکدانەوە لەو هەڵوێستە بوێرانەیەی عوسمانی حاجی محمود. سەرچاوەکە لە

درێژەی قسەكانیدا بۆ جیهان ئەوەشی رونكردەوە كە عوسمانی حاجی محمود تائێستا بیری لەگەرانەوە نەكردۆتەوە و بیریشی لێناكاتەوە، چونكە بەبروای ئەو سەرچاوەیەی نزیك لێیەوە ناوبراو ئێستا لەماڵەوە دانیشتووە و ئەستەمیشە لەو هەڵوێستەی پاشگەزببێتەوە.

لە لایەكی تریشەوە سەرچاوەیەكی باڵای نێو یەكێتی لەبارەی هەڵوێستی عوسمانی حاجی محمودەوە وتی: " كاك عوسمان تاوەكو ئێستا لەماڵەكەی خۆی دانشتووە و پەیوەندیشی نەكردووە بە كۆمپانیای وشەوە كەپێشتر لەوە دەچێ بۆئەوە دەستی لەكاركێشابێتەوە بۆئەوەی كار بۆ ئەوە كۆمپانیایە بكات ". بەلام بەبروای ئەو سەرچاوە یە هۆكاری ئەوەی كە تاوەكو ئێستا ناوبراو پەیوەندی نەكردووە بەو كۆمپانیایەوە دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی كە عوسمانی حاجی محمود پاش دەست لەكاركێشانەوەی وەكو وەزیری ناوخۆ درێژە بەكارەكانی بدات، بۆ ئەم مەبەستە باڵی ریفۆرم هاوكاری مانەوەی لەو پۆستە بكەن تاوەكو لەرێگەی ئەو پۆستەوە بتوانێت كار بۆ لیستی گۆران بكات، بەتایبەت لەهەڵبژاردنەكانە داهاتوودا كەوەزارەتی ناوخۆ دەوری دەبێت لە رێگریكردن لە پێشێلكاری حزبە دەسەلاتدارەكان.

ئەو سەرچاوەیە لە درێژەی قسەكانیدا ئاماژەی بەوە كرد بەهۆی ئەوەی كەباڵی ریفۆرم هەڵوێستێكی رونیان نەبوو لە پشتگیری كردنیان بۆ مانەوەی لە پیستەكەیدا و لەبەرامبەر هەنگاوەكانی باڵی گشتیدا كەئەو پۆستەیان تەسلیمی پارتی كرد بێدەنگ بوون، بۆیە عوسمانی حاجی محمود تارادەیەك نیگەرانە لە باڵی رفۆرمیش ئەوسەرچاوەیە ئەوەشی بەهۆكاری پەیوەندی نەكردنی ناوبراوەوە بە كۆمپانیای وشەوە ناوبرد.

سەرچاوەكە جەختی لەسەرئەوە كردەوە كە ناكرێت بوترێت عوسمانی حاجی محمود بەم هەڵوێستەی ئێستای سەر بە باڵی ریفۆرمە و هەروەك چۆن ناشكرێت بڵێین گەراوەتەوە نێو مەكتەبی سیاسی و سەربە باڵی گشتییە وەهەندێك دیعایەی لەو شێوەیەیان دەكرد، چونكە عوسمانی حاجی محمود تاوەكو ئێستا نەگەراوەتەوە ناو مەكتەبی سیاسی و لەماڵەكەی خۆی دانشتووە.

ئەوسەرچاوەیە حاڵەتی عوسمانی حاجی محمود ی بەحاڵەتی عمر فتاح چوواند، كە تاوەكو ئێستا دورە لە كۆبونەوەكانی مەكتەبی سیاسی و لەماڵەكەی خۆی دانشتووە هەرچەندە عمرفتاح دانشتەكەی لە نیگەرانییەوە نزیكە، بەرەسمی وەك عوسمانی حاجی محمود دەست لەكاركێشانەوە ی خۆی رانەگەیاندووە.

**دەست لەكاركێشانەوە بۆ مانەوە**

جۆرێك دەستلەكاركێشانەوە كەرەنگە بتوانین بەدەست لەكاركێشانەوەیەكی سلبی ناوی ببەین وەختە باڵ دەكێشێت بەسەر دەزگای حزبی و حوكومییەكاندا، ئەمە بڕوای چاودێرێكی سیاسییە كە پێشی وایە ئەو دەست لەكاركێشانەوەیەی چوار ئەندام مەكتەب سیاسییەكەی باڵی ریفۆرم ئەم جۆرە دەست لەكاركێشانەیە بە دەست لەكاركێشانەوەیەكی سلبی ناودەبات، بەبڕوای ئەو چاودێرە سیاسییە، چ لەمەیدانی سیاسی و چ لە بواری ئیداریدا دوو جۆر دەست لەكاركێشانەوە هەیە یەكێكیان دەست لەكاركێشانەوەیەكی ئیجابییە و بریتییە لەوەی كەكەسی دەست لەكاركێشاوە بەهۆی ئەوەی كە خەڵك و دەور و بەرەكەی لە ئەدای ئەو ناڕازین لەئەداكردنی ئەو پۆستەیەدا كەپێی دراوە خۆشی لە ژێر فشاردا بێت یان بێ فشار ، دان بەوەدا دەنێ كە نەیتوانیوە بەباشی لە ئەدای پۆستەكەی بكات، لەبەرئەوە دێت و دەستلەكار كێشانەوەی خۆی پێشكەش دەكات و دەست لە پۆستەكەی هەڵدەگرێت. ئەو چاودێرە سیاسییە ئەم جۆرەی یەكەمی دەست لەكاركێشانەوە بە دەست لەكاركێشانەوەیەكی ئیجابی وەسف دەكات و دەشڵێت " بەڵام بەداخەوە ئەم جۆرەیان لە كوردستان تا ئێستا زۆر كەمە یان هەر نەمانبینیوە ".

سەبارەت بەجۆری دووەمی دەستلەكاركێشانەوە ئەو چاودێرە دەڵێت هەرچی جۆری دووەمە خۆی لە راستیدا دەستلەكاركێشانەوە نییە بەڵكو كردنی دەست لەكاركێشانەوەیە بە كردنی وەرەقەیەكی فشار تاوەكو لەو رێگەیەوە چەند ئامانجێكی دیكە بپێكێت ". ئەو پێی وایە لەم جۆرەی دووەمی دەستلەكاركێشانەدا ئەو كەسەی لە پۆستێكدایە و بانگەشەی دەستلەكاركێشانەوە دەكات لەبەرئەوەی نارازییە بەرامبەر بەو ژینگە و دەور و بەرەی ئەو پۆستی تێدا هەیە، ئەو ژینگەیەش كاریگەری هەیە لە ژینگەی دەور و بەرەكەیدا بپێكێت ئەو چاودێرە سیاسییە لەدرێژەی قسەكانیدا دەڵێت " ئەم جۆرەی دووەم ئامانج لێی كردەی دەست لەكاركێشانەوەكە نییە، ئەوەندەی پێكانی ئامانجەكانی ترە، لەرێگەی هەرەشەی دەست لەكاركێشانەوەوە واتا لەم جۆرەیدا ئەگەر دەست لەكاركێشانەوەكە رویدا ئەوا تۆ ئامانجەكانی خۆتت نەپێكاوە "، هەرلەبەر ئەمەشە ئەم چاودێرە ئەم جۆرە یان بە جۆرێكی سلبی دەست لەكاركێشانەوە ناو دەبات.

ئەوپێی وایە ئەم جۆرە دەست لەكاركێشانەوە لە كوردستان نمونەی زۆرە و هەمووشی گوزارشت لە جۆرێك لە فەشەلی ئەو كەسانە دەكات كەهەڵدەستن بەم هەرەشەیە.

ئەو چاودێرە سیاسییە دەست لەکارکێشانەوەی ئەو چوار ئەندامەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بە جۆری دووەم دەزانێت و دەڵێت " ئەوان نەیانتوانی بەهۆی ئەوهەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوەیەوە ئامانجەکانی خۆیان بپێکن کە بریتی بوو لە جێبەجێکردنی ئەو داوایانەی کە هەیانبوو بۆ ئەوەی دەست لەکار نەکێشنەوە " چاودێرە سیاسییەکە دەشڵێت " ئەمە لەوەوە دێت ئەو برادەرانە بەباشی ئەو ژینگەیەیان نەناسیوە کەمەکتەبی سیاسی حزبەکەیان تاوەکو بتوانن ئەو داوایانە پێشکەش بکەن کە توانای جێبەجێکردنیان مسۆگەر یاخود ئەستەم نییە ". چاودێرە سیاسییەکە پێشی وایە ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکانی پەرتەوازەیی ئەم چوار ئەندامە دەست لەکار کێشاوەیە، چونکە لەبنەرەتدا ئامانجیان رودانی دەست لەکارکێشانەوەکە نەبووە، بۆیە ئێستا پەرتەوازە بوون.

ئەو سەرچاوەیە لەدرێژەی قسەکانیشیدا وتی " لەبەر ئەوە ناتوانن لەهەڵوێستەکانیان سور بن، چونکە ئەو هەڵوێستەی ئەوانی کۆکردەوە چاکسازیکردن بوو لەناو حزبدا نەك لەدەرەوەی حزب هەر لەبەرئەمەشە کەئێستا هاتونەتە دەرەوە ناتوانن کاری هاوبەش بکەن، چونکە کارە هاوبەشەکەیان لەناو حزبدا بوو نەك لەدەرەوەی حزب ". بۆیە ئەو چاودێرە پێی وایە ئەوان باشتر لەناو مەکتەبی سیاسیدا بمێننەوە و لەوێ دەیانتوانی باشتر کار بۆگۆڕانکاری و چاکسازی بکەن وەك لەدەرەوەی حزبەکەیان.

## دڵەکەی یەکێتی خەریکە لەلێدان دەکەوێت

عبدالله گۆران

هاتنە دەرەوەی ئەو کادرانـەی کار بـۆ لیستی گۆران دەکـەن سـەرەتا لەمەڵبەنـدی یـەکی سلێمانی دڵی یەکێتییەوە دەستی پێکرد، لێپرسراوانی هەردوو باڵەکەش لەومەڵبەندە ژمـارە و هۆکاری جیاواز دەخەنە روو لەبارەی ئەوانە هاتونەتە دەرەوە.

دوای راگەیانـدنی لیـستی گـران و بـاڵی ریفـۆرم بـاڵی گـشتی نێـو یـەکێتی بریـاری خۆسـاغکردنەوەی بەسـەر ئەنـدامانی ناوحزبەکـەدا سـەپاند ئـەم بریـارەش بـووە هـۆی چونەدەرەوەی کۆمەڵێك کادێری زۆر لە ریزی ئەو حزبە و خۆساغکردنەوەیان بـۆ کـارکردن بـۆ لیـستی گـۆران، سـەرەتای ئـەم چـونەدەرەوەیەی ئەنـدامانی یـەکێتی لـەنێو دڵـی حزبەوە(مەڵبەندی یـەکی سلێمانی)دەسـتی پێکـرد، کاتێـك بەرپرسـی ئەومەڵبەنـدە فشاری خستە سەرکادیر و ئەندامانی یەکێتی تاوەکو خۆیان ساغ بکەنەوە.

مەڵبەنـدی یـەکی سـلێمانی یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان بـەگرنگترین و بـەهێزترین مەڵبەندی یەکێتی و دڵی ئەو حزبـە لـەرووی رێکخستنەوە لەقەڵـەم دەدرێت، مەڵبەندەکە لـە(٢٩)ئەنـدامی ئەنجومـەن، (١٠) ئەنـدام بـەش، (٣٣) کـارگێر کۆمیتـە، (٣٥) کـادیری بـەش، (٢٥٠) ئەنـدام کۆمیتـە، (١١١٠) ئەنـدام کـەرت، پێکـدێت کـە کـۆی گـشتی کادیرەکـان سـنوری ئەومەڵبەندە دەکاتە(١٤٦٧)کادیر.

### دڵەکە خوێنی زیاتر بەکام باڵ دەدات

سەرچـاوەیەك هاتنــەدەرەوەی کـادیرانی مەڵبەنـدی یـەکی سـلێمانی بـەنزیك بونـەوەی دڵەکـەی یــەکێتی لــە لێــدان وەسـف دەکـات بەرپرســی مەڵبەندەکــەش رایدەگەیــەنێت کەمەڵبەندەکەی ئێستا لەجاران بەجۆش و خرۆشترە.

سەرچـاوەیەك لەمەڵبەنـدی یـەکی یەکێتییـەوە کـە نـەی ویـست نـاوی ئاشـکرا بکرێـت، بەجیهانی راگەیاند کە چونەدەرەوەی کادیرانی مەڵبەند بەوشێوەیە پەیوەنـدی بـە خراپـی ئەدای بەرپرسی مەڵبەندەکەوە هەیە، ئەو سەرچاوەیە لەدرێژەی قسەکانیدا بۆ جیهان وتـی " چونە دەرەوەی ئەندامانی باڵی ریفۆرم بەهۆی خراپـی ئـەدای بەرپرسـەی مەڵبەندەکەوە

بوو، کە ئەدایەکی خراپی هەیە لەگەڵ کادیراندا و بێباکە لەکادیرانی خوارەوەی مەڵبەندەکەی مەڵبەندی بەرپرس وادەزانێت تەنها گرنگ ئەوەیە کە ئەو بەدەنگ بووە بە بەرپرسی مەڵبەند بۆیە لەکۆبونەوەکانیدا دەڵێت کێ دەمێنێتەوە با بمێنێتەوە کێش دەروات خوای لەگەڵ زۆر بەموسەیتەرانە قسەدەکات لەکاتی کۆبونەوەکاندا منەتی بەکادیرەکانی خوارەوەی نییە، تاوای کرد کە دڵەکەی یەکێتی خەریکە لە لێدان دەکەوێت".

بەلآم لای خۆیەوە بەرزان ئەحمەد کوردە ئەوقسانەی رەتکردەوە و بەقسەی هەڵبەستراوی ناو بردن و وتی " ئەو جۆرە قسانە کارگێری مەڵبەند کە رۆشتووە لەگەڵ ئەوبەرپرسی کۆمیتانەی تریش کە رۆشتوون ئەوە ناڵێن، چونکە ئێمە بەرێزەوە ئەوانمان بەرێکردووە، ئەوە ئەوکەسانە وادەڵێن کە عەدالەتیان قبوڵ نییە، ئێمە پێمان وتن کێ کار بۆلیستی کوردستانی دەکات ئەوە یەکێتییە، کێش کار بۆلیستی گۆران دەکات ئەوە پێچەوانەی پەیرەو و پرۆگرامی یەکێتییە، ئازادن کاریش بۆلیستی گۆران بکەن، بەلآم خواحافیزتان بیت لە یەکێتی، من پەیوەندییەکی رۆحی باشم هەیە لەگەڵ کادیرەکانی خوا رەوەی یەکێتی و ئەوقسانە هەڵبەستراون ".

لەبارەی سست بوونی دڵی یەکێتی کەمەڵبەندی یەکەو هەنگاو بەرەو وەستان دەنێت بەرزان ئەحمەد کوردە وتی " بە پێچەوانەوە مەڵبەندەکەمان زۆر لە گەشەکردندایە، لەمەڵبەندی یەکدا دەڵێی تازە راپەرین کراوە و خەڵکی حەمماسی بەرزە، چونکە ئەوانە خەڵکیان دەرکردووە کاتێ دەسەلآتیان هەبووە و رێزی خەڵکیان نەگرتووە، خەڵکی گەندەڵیشیان هەبووە، لێرە خەڵکم دەرکردووە جاسوس بووە کە ئەندام مەڵبەند بووە دەریش چوبوو لەبەرئەوەی پەیوەندی بەحوکومەتی عێراقەوە بوو، بەناوی(شێخ مالیك)بەلآم ئەوان خستویانەتە لیستەکەیانەوە، خەڵکێك دەرکراوە کەلیژنەی هەڵبژاردنەکان دەریان کردووە، کە خودی کاك نەوشیروان بەرپرسی لیژنەکە بووە، بەلآم ئەوە پیشان دەدرێ و دەڵێن دەرکراوە، ئەو حەوت جێگری کۆمیتانە دوانیان لەسەر دزی دەرکراون کەدیوانی چاودێری، دزی لێگرتوون(ئاسۆ رەحیم و هاورێ سیروان)تەکلیفیان لێکردووم نەیاندەم بەدادگا، چونکە دووساڵ حەپس دەکران یەکێکیان ناوی ئارامە ئێستا کراوە بە ئەندامی لیستی گۆران ".

هەروەها سەرچاوەیەکی تر لەمەڵبەندی یەکی سلێمانی، پێی وایە چوونەدەرەوەی کادیرانی مەڵبەند و باڵی ریفۆرم لەو مەڵبەندە دەردەخەن، چونکە ژمارەی ئەو کەسانەی

کەلە مەڵبەند چونەتە دەرەوە و خۆیان بەریفۆرم دەزانن، بەپێی ئەو قسەی ئەو کەمترە لەرێژەی ئەو دەنگانەی کە ئەوباڵە لەدواین هەڵبژاردنەکانی نێوخۆییەکانی یەکێتیدا بەدەستیان هێنان. ئەوسەرچاوەیە لەمبارەیەوە دەڵێت " ژمارەی ئەوانەی لەمەڵبەندی یەکی سلێمانی چونەتە دەرەوە ١٥٧ کەسن، ٧١ کەسیان پلەیان لەسەر و ئەندام کۆمیتەوەیە، ٨٦ کەسیشیان پلەی ئەندام کەرتیان هەبووە ئەمەش شکستێکی گەورەیە بۆ باڵی ریفۆرم، چونکە لەکاتی دەنگدانەکەی ناو یەکێتی باڵی ریفۆرم بۆ بەرپرسی مەڵبەند، واتا ئاسۆ علی ٤٦٠ دەنگیان هێناوە، بەلام ئێستا ئەو هەموو دەنگانە لەگەڵیان نەچونەتە دەرەوەی یەکێتی ئەمەش سەرەتای شکستی کارەکەیانە کەبەناوی ریفۆرمەوە دەیکەن، ئەوکات بەرزان ئەحمەد کوردە کە کاندیدی باڵی گشتی بوو ٥١٥ دەنگی هێنا، ئەمەش دەرکەوتنی ئەو راستییەیە لای ئەندامانی باڵی ریفۆرم کەزۆربەیان پاشگەز بونەتەوە، چونکە ئەو کادیر و ئەندامانە وایان دەزانی لەناو یەکێتیدا ریفۆرم دەکەن نەك لەدەرەوەی یەکێتی ".

هەمان سەرچاوەش ئاماژەی بەوەشدا کەلەناو خودی مەڵبەندیشدا، تەنها(نۆ)کەسی باڵی ریفۆرم چونەتە دەرەوە ئەوانیش بریتین لە " ئاسۆ رەحیم و هاوڕێ ئەکرەم لەبەشی پەیوەندییەکان، هاوڕێ سیروان و ئامانج لەبەشی چاودێری کادیر، بلیمەت، حەمدی وەستا صدیق، رێبوار کە کارمەندن و هەروەها ئاریان و عبداللە شەمێران کە ئەندام بەشن ".

ئاسۆ رەحیم تەنها کەسێك بوو لەئەنجومەنی مەڵبەند، وەك کارگێر دەنگی هێنا لە هەڵبژاردنە ناوخۆییەکەی یەکێتیدا کە سەر بە باڵی ریفۆرم بوو لەبارەی هەڵبژاردنەکانی ئەوکاتەی مەڵبەندی سلێمانییەوە دەڵێت " با چیتر نەگەرێینەوە بۆ چوار ساڵ لەمەو بەر ئەوانیش شتی تایبەتی ناوخۆیی بوون، هۆکارەکەن گەلێك جار باسکراون و هەندێکیشیان لەبەر چاوی خەڵکی بەتەواوەتی روونە، کەلەمەڵبەندی سلێمانی رویاندا، بەلام ئەودەنگانەی هێنامان من تەنها کەس بووم دەرچووم ٥٦٧ دەنگم هێنا، کەمترین دەنگ لای ئێمە ٤٧٤ دەنگ بوو، شەش کەسی ئێمە لەسەروو ٥٠٠ دەنگەوە بوون، بەجیاوازییەکی زۆر کەم دەرنەچوون ئەو شەش کەسەمان، جیاوازییەکانمان زۆر کەم بوو، ئەو جیاوازییانە بەو شێوازانە نییە کە ئەوان باسی لێوە دەکەن، کۆی گشتی دەنگدەر لە مەڵبەندی سلێمانی ١١٩١ دەنگدەر بوو، ئاسۆ علی ٥١٥ دەنگی هێنا و بەرزان ئەحمەد کوردە ٦٢٥ دەنگی هێنا، ٥١ دەنگ نەخۆش و دەنگی سوتاو هەبوون، ئەمە راستی دەنگدانەکەی مەڵبەند بوو، نەك ئەوەی ئەوان دەیڵێن ئەوان ژمارەکانیش تەواو نازانن نەك شتی تر ".

دەربارەی ئەوەی کە بۆچی هاتۆتە دەرەوە ئایا نەی دەتوانی لەناو یەکێتیدا بێ و کار بۆ گۆران بکات. ئاسۆ رەحیم وتی " هاتنە دەرەوەمان بەکارێکی مێژوویی دەزانین، هەموو کەس دەزانێ دروست بوونی یەکێتی بە دیلی ئەو حزبانە بوو کە بڕوای بەدید و بۆچونی جیاواز نەبوو، کەخۆی کاری کردووە بۆ ئەوە دەبێت قبولی بکات ناکرێت ئێمە بەفکرێکی تایبەتی پەروەردە بووین و کار بەفکرەکەمان نەکەین، ئەوانەی کاری پێناکەن باش لێی تێنەگەشتوون ، چونکە فکرە بە بیست و چوار سەعات ناگۆڕێن بەردەوام لەناو یەکێتیشدا بیر و رامان جیاواز بووە و پرۆژەشمان پێشکەش کردووە، بەلام ئێستا تەوقیتەکە وا دەخوازێت، چونکە ئێستا هەلبژاردنی پەرلەمان هەیە، ناشکرێت لەناو ئەو حزبە بیت و کار بۆ شوێنێکی تر بکەیت ". لەبارەی ئەوە بۆچی لەکاتی هەلبژاردنەکەی ناو یەکێتی لە مەلبەندی یەك ژمارەیەکی زۆر دەنگیان هێنا، بەلام ئێستا کۆمەلێك کادیری کەم هاتونەتە دەرەوە بۆلای لیستی گۆران ئاسۆ رەحیم وتی " ئێمە هەمیشە کارمان دەکرد لە جێی خۆمانەوە شتەکانمان تەرح بکەین، ، بەلام هیچ ئەنجامێکیان نەبوو بۆیە هاتینە دەرەوە، ئێستا لەوە زیاتر خەلك دێت بەلام ئێستا ژیان خەلکی وابەستە کردووە بە حزبەکانەوە، ئێمە بەکەسمان نەوتووە بێنە دەرەوە ڕامان نەگەیاندووە کێمان هەیە لەناو یەکێتیدا بێتە دەرەوە، ئەوانەش دێنە دەرەوە قبولی ئەوە ناکات بە بیر و بۆچونەکان کاربکات، تەقیم لەسەر کادیرەکانی سەرەوە ناکرێ چەند کەست لەگەلە لەکۆی ئەندامان یان جەماوەر دەکرێت، چەندت هەیە ئەمە گرنگە، بەکەسیشمان نەوتووە بێتە دەرەوە، بەلام هەلسوکەوتی مەلبەندێك بۆ مەلبەندێکی تر دەگۆڕێت، چونکە لەمەلبەندەکان مەزاج کار دەکات ، نەك سیستەم و پەیرەوی ناوخۆ، ئێمە گەلێك خەلکمان ماوە لەناو مەلبەندەکاندا".

لێپرسراوی کۆمیتەی چوارباخ سەر بەبالی ریفۆرم لەبارەی چونە دەرەوەی و وازهێنانی لە پۆستەکەی وتی " لەسەر بیر و رای جیاواز دەستمان لەکار کێشاوەتەوە خۆم و چوار ئەندام کۆمیتە و چواردە ئەندام کەرت هاتینەدەرەوە، ئەوان رەخنە و پێشنیارەکانی ئێمەیان قبول نەکرد بۆیە بەناچاری هاتینە دەرەوە، لەبەر بزێوی نەبێت زۆر کەسی تریش هەن دێنە دەرەوە، ئێمە بەخواستی خۆمان هاتینە دەرەوە و کەس پێی نەوتین وەرنەدەرەوە ".

لەبارەی ئـەوەی بۆچـی زۆرتـری کـادیری هـاتووە دەرەوە و هاتنـە دەرەوەش لەمەڵبەنـدی سلێمانییەوە دەستی پێکرد، ئاسۆ رەحیم وتی " ئەگەر چاوێك بە مێژوو دا بگێڕیتەوە بۆت دەردەکەوێت تەبعی شاری سلێمانی وا هاتووە بـەهۆی وشیارییەوە، کادیرەکـانی زوو درکیـان بەشتەکان کردووە، بەرپرسی مەڵبەند بە بریاری سەرووی خۆی کـاری کـردووە کـە ئـەویش خۆساغکردنەوە و بانگکردن و پێـوتن بووە، چەندین شتی تـر بونەتـە هـۆی هاتنـەدەرەوەی کادیرەکانی باڵی ریفۆرم، ئەدای بەرپرسی مەڵبەند نەبۆتە هۆی هاتنە دەرەوەی ئێمە بەڵکو قبوڵنەکردنی بیر و بۆچونی جیاواز بۆتـە هـۆی هاتنـەدەرەوەمان " هـەروەها ئاسۆ رەحـیم دەربـارەی ژمـارەی ئـەو کادیرانـەی کـە هاتونەتـە دەرەوە لـەو مەڵبەنـدە، وتـی " لـەناو مەڵبەندی سلێمانی مـن وەکو دەرچـوو بـە کـارگێر و پێـنج بەرپرسـی کۆمیتـەوە و هەنـدێ جێگـر هـەبووە هاتوینەتـە دەرەوە، سـەرەتا هاتنـە دەرەوە زۆر بـوو، بـەڵام ئێـستا هێـواش بۆتەوە، ئەوبەرنامەیـەش لەمەڵبەنـدی سـلێمانییەوە دەسـتی پێکـرد کەخـەڵکیان بـانگکرد و فشاریان خستە سەر خەڵکی، کۆی ئەوانەی هاتونەتـە دەرەوە لەسـەروی ۲٥۰ ئەنـدام کـەرتن، بێجگە لەئەندام کۆمیتە و پلەکانی تر ".

سەرچاوەیەکی بـەرپرس لـەباڵی ریفـۆرم لـەبارەی ئـەو کادێرانـەی لەمەڵبەنـدی سلێمانی هاتونەتە دەرەوە وتی " لەناو مەڵبەندا ۳۱ کادیر و ٥ بەرپرس کۆمیتە و ۷ جێگر کۆمیتـە و سەرووی ۳٥ ئەندام و زیاتر لـە ۲۰۰ ئەنـدام کـەرتن کـۆی گـشتی دەکاتـە ۲۷۸ کـادیر، کۆمـەڵێ کادیری تر ماون تاوەکو زۆریـان بـۆ نـەهێنن نایەنـە دەرەوە چـونکە لیـستی گـۆران بەکـەس ناڵێت بێتە دەرەوە، لەبەرئـەوەی بـژێوی ژیـانی ئـەو کادیرانـە لەسـەر موچـەکانیانە لیـستی گۆڕان لە ئێستادا ناتوانێت پارەیان بۆ دابین بکات ".

## پەیرەوی ناوخۆ لەنێوان شەرعییەت و پەیرەویکردندا

بۆ وەرگرتنـی شەرعییەتی کارەکانیان زۆرجار بەرپرسانی هـەردوو لا پـەنا بـۆ پـەیرەوی ناوخۆی حزبەکـە دەبـەن و بەرپرسـێکی بـاڵی ریفـۆرمیش پێـی وایـە ئـەو پـەیرەوەی خـۆی شەرعییەتی نەماوە.

تا چەند دەرکردنی کادیران و نان بڕینیان لەگەڵ پەیرەوی ناوخۆی یەکێتیـدا دەگـونجێ ئاسۆ رەحیم لەمبارەیـەوە دەڵێـت " لـە پـەیرەو دا هـەموو ئەنـدامێك ئـەرك و مـافی هەیـە، موچەبڕین بەهیچ شێوەیەك رەوایەتی تێدا نییـە، چـونکە موچـە هـی تاکـە کەسێك نییـە، بەڵکو ژیانی منداڵەکانی لەسەرە، بەکام دەسـەڵات و بـەکام حـەق موچـەی دەبڕێـت، چـونکە

کۆمەڵێك کەس لەفەرمانگگەی حوکومی بووە و هێناویانەتە دەرەوە بۆ کاری حزبی ئێستا بەچ حەقێك موچەکەی دەبڕن، پەیرەوی هیچی نەماوە چونکە بەسەر چووە، ئەگەر بەپەیرە و کار بکرایە، دەبوو بەهەموو خاڵەکانی کار بکرایە نەك بەوو خاڵانەی کەلە بەرژەوەندی ئەواندا بێ و کەخواست و قازانجی ئەوانی تێدا بێت ".

لەبارەی دەرکردنی کادێر و موچەبرینیان کەئایا لەگەڵ پەیرەوی یەکێتیدا دەگونجێت بەرزان ئەحمەد کوردەوتی: " بەڵێ دەگونجێ، چونکە ئەوان کادێرن و بۆ پەیرە و کردنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەدەر لەو بەرنامەیەی کار بکرێت شەرەفی ئەندامایەتی لە دەست دەدەیت، لەبەرئەوەی حەقی خۆیانە کارناکەن بۆ یەکێتی دەربکرێن و موچەیان ببرێت ، بەبۆچونی جیاواز کاربکرێت بەلام لەچوارچێوەی پەیرەوی ناوخۆ ، لەناویەکێتی نیشتمانیدا، یەکێتی ئیسلامی و چەپ و هەموو جۆرەکانی دید و بۆچونی جیاوازی تێدایە. شەرەفی ئەندامایەتی لەئەندامانی سەرکردایەتی نەسەندراوەتەوە کە کۆنگرە هەڵی بژاردوون، بەڵکو سڕکراون و موچەکانیان نەبراوە تاکۆنگرە دەبەسرێ ". لەبارەی ئەوەی کە پەیرەوی ناوخۆی یەکێتی کار بەهەندێك دەکرێت بۆ بەرژەوەندی باڵێك و زۆربەی فەرمۆش دەکرێت، لێپرسراوی مەڵبەند وتی " تاکو ناوی حزب هەبێت پەیرەو و پرۆگرامی هەیە، چونکە کە پەیرەو و پرۆگرام نەبوو سیفاتی حزب نامێنێت، ئەوان حزب نین و پەیرەو و پرۆگرام و بەرنامەیان هەیە، ئێمە حزبێکی گەورەی کوردستانین، لەمەڵبەندەکەی ئێمە بە پەیرەو کاردەکەین جیا لەو پرۆژە ناتەواوەی کە هەڵبژاردنی پێکرا و یەکێتی توشی ئەم قەیرانە کرد، ئەکرێت بیر و بۆچونی جیاوازهەبێت، بەلام ئێمە مەکتەبی سیاسی بریاری داوە لەگەڵ پارتی بەیەك لیست دابەزین بۆ هەڵبژاردن، ئەوەی بە پێچەوانەی ئەو حزبە بێت وەکو وایە لەتیپێکی یاریکردن بیت گۆڵ لەخۆت بکەیتەوە ئەمە ناگونجێت، چ حزبێك لەدنیادا ئەمەی قبولکردووە تاکو ئێمە قبولی بکەین ئەمە شتێکی تازەیە.

لەناو ئەم کێشمەکێشەدا سەرەرای ئەوەی هەندێك سەرچاوە ئاماژەبەوە دەدەن، کەژمارەیەك لەکادرانی باڵی ریفۆرم پەیوەندییان بەمەڵبەندەوە کردۆتەوە و وازیان لەو باڵە هێناوە ئاسۆ رەحیم دەڵێ " بەش بەحاڵی خۆم کادری ئێمەم نەدیوە بگەرێتەوە، سەبارەت بەهەڵۆ ئەحمەد قەت لەگەڵ ئێمە نەبووە و نەشهاتووە تا بگەرێتەوە، مامۆستا سەربەست راستە لەگەڵ ریفۆرم بوو، بەلام پێش هاتنەدەرەوە بڕوای وابوو بچێت لەگەڵ ئەوان کاربکات.

## نەوشیروان مستەفا لە شکستی ریفۆرمەوە بۆ دەروازەی راگەیاندن

توێژینەوەیەکی ئەکادیمی، خ. ئیمتیاز

بەپێی زۆربەی توێژینـەوە ستراتیژییەکان دەبوایـە ئـەو پـرۆژە چاکسازییەی نەوشیروان لەنێویـەکێتی سـەرکەوتوو بوایـە، بـەحوکمی کەسـایەتی بـەهێزی خـۆی و مەبەسـت و پێویستییەکانی یەکێتی و کوردیش بۆ ئەو چاکسازییە، کەچی زۆر بەبێ ئومێدە، لەکاتێکدا دەبیـنین لـە کوردسـتان لـەنێوان ئـەوان و بـاڵی ئیسلامی ئـەو چاکـسازییەی تـا رادەیـەك سەرکەوتوو بوو، بەلای کەمی زۆرایەتی بەگەل چاسازی علی باپیر کـەوتوون، بـابزانین هـۆی ئـەو دیاردەیـە چییە و بۆچـی پرۆژەکـەی نەوشـیروان سـەرکەوتوو نـەبوو، گـرنگترین هـۆی کەسێتی؟ مێژوویی؟ ئایدۆلۆجیای یەکێتی؟ بارودۆخی کوردستان و جیهـان. .. رۆڵیـان چـی بـوو لەوشکـستە؟ ئنجـا پـرۆژەی چـەند سـەرکەوتووە؟ هـەوڵ دەدەیـن بـەکورتی هەنـدێك تەوەری گرنـگ باس بکەین.

**کەسێتی نەوشیروان:**

هەڵبەتە ئەوەی لە شۆرشدا بووبێت، دەزانێت ئەو پیـاوە نمونـەی قارەمـانی و مەیـدانی و لەخۆ بوردەییە، پیاوێکی راست و راشـکاوانەیە، زۆربـەی جـار بەبەرژەوەنـدی گـشتی بـەپێی ئایدۆلۆژییەکـەی خـۆی ڕەچـاو کـردووە و کـەمتر لـەباری کەسـێتی و خـەمی لەپایـە و بەرپرسیارییەتی خواردووە، لەروی ئەخلاقیشەوە(کەلەنێو کوردا ئەو فاکتەرە رۆڵـی گرنگـی لە پێکهێنەری شەخسی هەیە)نمونەیەکی زۆر جـوان بـووە، هەرچـەندە زۆر بەدرەنگـەوە لـە ساڵی ١٩٨٢ ژنـی هێنـاوە، هەتا لەبواری سیاسیش تارادەیـەکی زۆر ئـەو ئەخلاقانـە سیاسـییەی پێـوە دیـاربووە، هەرچـەندە خۆشـی لەمەدرەسـی میکـاڤیلی پـەروەردە بـووە و لـە تەنـشت بلیمـەتێکی وەك مـام جـەلال کـە زۆر بـەوردی و لێزانـی لەگـەڵ سیاسـەت(فـن المکفـن)وە بنەماکانی مکافیلی کاریکردووە، ئەگەر چی نەوشیروان زۆر کاریگـەر بـووە بـەمام جـەلال و چـەند جـار خـۆم گـوێم لێبـووە لەشـاخ لـەکاتی تـورە بـوونی دەیـوت لەبـەر ئـەو پیـاوە — مەبەستی مام جەلالە — نەبێت دەگەرێمەوە خوێندنەکـەم تـەواو دەکـەم. . بـەلام سـەرەرای

ئـەوەش كەسـايەتى نەوشـيروان زۆر جيـا لـەروى هەڵسوكەوت لەگـەڵ سياسـەت، لەراسـتيدا نەوشيروان زياتر پابەندە بە سەوابت و بەڵێن و باقى بەهاكانى سياسەت.

ئەوان سەروەرێكى مەزنى دەگمەنيان هەيە كەتوانايان لـەبارێكى مەحاڵدا شۆرش دەست پێبكەنەوە، بەراستى لەو كاتەدا لەتواناى حزبەكانى ترى ئێستاى كوردستان نـەبووە، بـەڕاى من ئەگەر ئەو كۆمەڵە خەڵكەى وەك مام جەلال، على عەسكەرى، د. خاليـد، نەوشـيروان، . ... نەبوايە شۆرشى كورد تا دواى شۆرشى ئێرانى لەساڵى ١٩٧٩ دروست نەدەبووەوە.

**لايەنى سەلبى لەكەسێتى:**

هەڵبەتە هيچ كەس تەواو نێگەتيف و پۆزەتيف نييە، لەو چوار چێوەيەدا كۆمەڵێك كـەم و كوڕى ترستانكيشى هەبووە، بەكورتى باسى دەكەين و بريتييە لەتەوەرى پێكهێنەرى ئـەو شكستەى لـەو پرۆژەيـەى چاكسازيدا رويـدا، يـان بـەكورتى واداى دەنـێين سـەر هۆيـەكانى شكستەكەن:

١/ نەوشيروان مستەفا لەناو شۆرش جێگرى سكرتێرى گشتى بـوو، بـەلام بـەپێى دابەشـى باڵـەكان، نەوشـيروان سـكرتێرى كۆمەڵـە بـوو، ئـيتر ئـەو دوو بەرپرسـياريەتييەى پـێ كـۆ نەدەكرايـەوە، باوەشـى ئەوەنـدە فـراوان نـەبوو وەك مـام جـەلال بتـوانێ هـەموو لايـەك لەباوەشى خۆى كۆبكاتـەوە، زيـاتر لاى كۆمەڵـەى دەگـرت و ئـيتر كـەمتر حـسابى سـەركردەى كوردى بۆ دەكرا بەڵكو وەك سەرۆكى حزبێكى تايبـەت، بۆيـە گـەلێك جـار لـەنێوان يـەكێتى خەڵكێكى زۆر خۆشيان نەدەويست و تارادەى رق لێبونەوە، ئـەوجۆرە ململانێيـەى حزبـەش كارى لەسەر كەسێتى وا دروستكردبوو كەبارێكى سياسى و فكرى و مەنهەجى وا دروست ببو هەموو جموجوڵى سياسى و پێشمەرگانە و ئيدارە ململانێ بێت، دەمارگيرى بێت، بـەجۆرێك دەمارگيرى و ململانێيەكە بەوشێوەيە ڕيز دەبوو، وەك يـەكێتى لەگـەڵ حزبـەكانى تـر، وەك كۆمەڵە لەگەڵ باڵەكانى ترى نێـو يـەكێتى، وەك كوردسـتان چـى لەگـەڵ باڵـەكانى تـرى نێـو كۆمەڵە. ... ئنجا هەموو ئەو بارودۆخە ململانێيە و لەژێر ئايدۆلۆژياى ماركسى كە(التنـاقج لـب الـدياليكتيك)بـوو فـەوزاى فيكـرى و سياسـى و هـەمووى نقـوم ببـو لـە دەمـارگيرى ئيقليمچيايەتى و شارچيايەتيش دەكرا، هـەتا لـەخودى نەوشـيروان مـستەفا. . جارێكيـان لـە وەرتێ لەساڵى ١٩٥٨ بەئێمەى وت: (ئەگەر ئێوە شەڕەكە باش ناكەن ئەوا من سێ تيپـى خـۆم دەهێنم لەم دۆڵە شەرى پێدەكەم)! ئەو قسەيە بارو دۆخێكى خراپـى خولقانـد دوايـى بـووە هۆى شەرێك لەنێوان(نەبەز)و(عەزيز داود)بە ئارپيجە لە زارگەلى و بەشێكيش بەيـەكجارى

لەیەکێتی تۆران. .. ئەو بارودۆخەو بەپێی مارکسیزمی رادیکالی گەلێ جار چارەسەری ڕادیکالی و ڕیشەیی وای بەکاردەهێنا کە بۆ دوژمن باش بوو نەك بۆ دۆست ئیتر زۆر جار دەبووە هۆی تێکگیران.

٢/ لەدەرەوەی یەکێتیش بەشی زۆری شەڕەکانی براکوژی بەسەرکردایەتی نەوشیروان بوو، هەڵبەتە لەنێو کورد بەتایبەتی ئەوکاتی ئەو دیمەنە زۆر ناشیرین بوو، گەلێ جار لەدوای شەری براکوژی کەسایەتییەکانی ناوچەکە زۆر بەتوندی دژی ئەو شەرانە دەوەستان و هەڕەشەی نان بڕینی پێشمەرگەشیان دەکرد، ئیتر گەلێ جار ڕێنماییەکانی نەوشیروان لە دورەوە گەلێ توند بوو، نەوشیروان بەتایبەتی لەشەرەکانی قرناقە و پشت ئاشان لە ١٩٨٢، کەچی ناحەزانی ئەو ئەوەندە توند نەبوون، هەربەنمونە کاتێ نەوشیروان مستەفا لەناوچەکانی سلێمانی لە ١٩٨٠ لەلایەن(حسك)گیرا دوایی ئازادکرا.

٣/ لەنێو شۆرشدا لەکاتی دەسەڵاتیدا کەمتر بەرنامەی چاکسازی هەبوو، بەپێی ئامۆژگارییە بەناو بانگەکەی مارکس(ئێوە شۆرشگێربن نەك چاکساز)بۆیە بەشی زۆری چارەسەرییەکانی توند و هەرەشە بووە، کارەسات و کردەی زۆر دڵتەزێنی لێ دروست دەبوو، کە کاریگەری تا ئێستاش ماوە فەرهەنگێکی توند و تیژی و یەکتر نەخوێندنەوە و. ...

٤/ هەڵبەتە هەموو ئەوکارە نێگەتیڤانە گەلێ جار دادەپۆشرێ بەسەرکەوتن هەڵبەتە بەشی زۆری لەو هەنگاوانە سەرکەوتوو دەبون(نسبیەن لە کوردستان)بۆیە تا رادەیەك لەلایەن بەشی زۆری خەڵکییەوە دیمەنە ناشیرینەکانی بزر دەبێ. ئەوەش رونە هۆیەکەی لەلایەن(دورکایم، میکافیلی، هۆبز. ..) باش کراوە، هەتا(ئیبن خلدون)یش باسێکی وایکردووە، دەڵێ کۆمەڵگەی عەوام لایەنی ئیجابی سەرکەوتوان و لایەنی سەلبی شکست خواردووان دەبینێ. بەلام ئەوەی کاریگەری قوڵی لەسایکۆلۆجیای قوڵی تاکی کورد کردبوو، ئەوەیە هەموو ئەو هەڵس و کەوتانە بە نا ئایینی لەقەڵەم دەدرێ، ئیتر کەباسی نەوشیروان بکرێ تا ئەم ساتەش یەکسەر یەکێ لە دیمەنەکانی نا ئاینی دێتە پێش چاو، جا ئەو فاکتەرە بۆخەڵکی تر رەنگە ئاسایی بێت، بەلام یەکێ لەئاستی سەرکردەی کارێزمی کوردی بێت و بەرنامەی چاکسازی هەڵگرتبێ ئەوا کاریگەرییەکی زۆری هەیە، چونکە ئەگەر بەووردی سەیری ئەو کار و چالاکییە عەلمانییەتە بکەین کەلەنەوەی یەکەمی عەلمانیەتی کورد لە ١٩٠٨ دەست پێ دەکات، تائەم ساتەش ناتوانن وابکەن کۆمەڵگەی کوردی بۆیەك سەعات لەپێناو ئەنجلس یان مارکس یان رۆسۆ. سەعاتێك خەڵك بەرۆژوو بن کەچی لەو

بێ خاوەنییەی تا ئێستا خەڵکی کورد ساڵانە(٣٠) ڕۆژ بۆ محمد بەڕۆژوو دەبێ. ... کەواتە هەرچی عەلمانییەتی کورد کردویەتی لەدژی دین بێ سود و عەبەسی بووە، کلیلی گۆڕانەکان هەرلەرێی ئایینەوە دەکرێ و ئەنتی ئایینی تەنها کات بەفیرۆدانە و سەرکردەش لاوازدەکات. هەرچەندە نەوشیروان کەمتر لێدوانی ئەنتی ئایینی لێ بەدی دەکرێت، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا، بەلاّم لەناخی کەسایەتی کورد ئەو ڕاستییەی وا چاندووە کە ئەوانە لایەنی ئەنتی ئایینین، بەم شێوەیە هەرگیز نابێتە سەرکردەیەکی جەماوەری وەك شێخ سەعید و قازی محمد و مەلامستەفا. .. ئیتر ناتوانێ پشت بەستو بەجەماوەر چاکسازی بکات. . ئەو گۆڕانانەی کە بەو جۆرە سەرکردانە دەکرێ تەنها بەهۆی توندوتیژی کلاْشنکۆفی شاخ یاخود زیندانی شارە. .. بۆیە چاکسازی پێویستی بەو هێزە مەزنە هەیە کەتا ئەم ساتەش نەوشیروان دەستی بۆ نەبردووە.

**چاکسازییەکەی لە قۆناغی نوێ**

هەڵبەتە نەوشیروان مستەفا سەرکردەیەکی زۆر گونجاوە بۆ شۆڕشی چاکسازی، چونکە وەك لە پێشوو باسمان کرد ئەو پیاوە لەشاریش لەنێو دەریای گەندەڵیدا سەلامەترین کەسێتییە لە چوارچێوەی هەردوو حزبی دەسەلاْتدار، نەنزیك گەندەڵی بووەوە نە بەکاریشی هێناوە، بەراستی ئەگەر بە بەرنامە و ستراتیژیەتی بێتە مەیدان خەڵکێکی یەکجار زۆری دەبێ، بەلاّم دیسان دەبێت لە پێشدا ئەو خالاّنەی کەلە خوارەوە باسی دەکەین چارەسەری بکات.

هەڵبەتە گۆران لەچارەسەری ریشەیی بۆ چارەسەری چاکسازی گوزارش لەگۆڕانێکی هـزری قـوڵ هـەم لەکوردسـتان و هـەم لـە هـزری نەوشـیروان مـستەفا دەکـا، چـونکە جـاران(چاکـسازی)تۆمـەت بـوو ئـیتر ئۆرۆشـیوعی و سۆشـیال دیموکراسـەکان لەخانـەی(منحـرف)تۆمـار دەکـران بەتۆمـەتی ئـەوەی گوایـە بەرنامـەکانیان چاکـسازییە، چاکـسازیش نەفەسـی بـە جمـود دەدا و گۆڕانـە شۆڕشـگێرەکان دوا دەخـەن کەجـەژنی ڕاستەقینەی مێـژوو گـۆڕانی تونـدوو تیژییـە، هەڵبەتـە لەمێـژووی کـۆن و نـوێی ئـەزمونی چاکسازی ئەوشـێوەیەی کوردسـتان زۆرە، هـەتا خـودی سیاسـەتیش لـە بنـچینەدا بـەمانای چاکسازی گشتی دێت، بەلاّم بەگشتی چاکسازی چەند سەرەنجامێکی هەبووە لەوانە:

١- بووەتە هۆی سەرکەوتن وەك ئەو چاکسازییەی لە ئەوروپاکرا لەدوای ڤیستڤالی ١٦٤٨.

٢- بووەتە هۆی هەڵوەشاندنەوەو پارچەپارچە بوون وەك ئەو چاكسازییەی گۆرباتچۆف بەهۆی بیرۆسترۆكا و گلاسنۆست)كردی.

٣- دەبێتە هۆی دوبەرەكی وەك ئەوەی لە نێوان ئیسلامییەكانی كوردستاندا كرا.

٤- گەلێ جاریش هەر ئەوچاكسازییەی هەر لەلانەكەیەوە شكست دەهێنێ، لەكۆتایدا چەند كەسانێك جیادەبنەوە یاخود سزادەدرێن، ئەو ترازە لە جیهانی عەرەبی نوێ و كوردستان زۆر باوی هەیە هەڵبەتە ئەو چاكسازییەی نەوشیروان ئەو ڕەوتەی وەرگرت.

سەرباری ئەو كۆمەڵەخاڵەی سەروو باسمان كرد لەكسایەتی نەوشیروان، ئەوا دوو گۆڕانی سەرەكی هەبوو لەكوردستان لەو پرۆژە چاكسازییەی یەكێتی لەلایەن نەوشیروانەوە رەچاونەكرابوو بووە، هۆی شكست، بەكورتی ئەوە بوو:

١- كۆمەڵگەی كوردی كۆمەڵگەیەكی بەبەهاو پیاوەتی و راستگۆ و بەڵێن و بەرگری و خۆنەویستی(زۆربەی)وەرچەرخانە بەهۆی هەڵس و كەوتی حزبە عەلمانییەكانی كوردستان بۆ كۆمەڵگەیەكی بێ سەروبەر و خۆویست و بێ ئینتما و بەرژەوەندی و پەرست و. ... هەڵبەتە ژێرخانی كۆمەڵایەتی ئەو دوو كۆمەڵگەیە زۆر لێك جیایە، لەكۆنەوە كۆمەڵگەی كوردی لەبەر بەها بەرزی بە(قورەیشی عەجەم)ناوزەد كراوە و بەپێی(الملل و النحل)میللەتی كورد بەدەگمەن نەبێ داگیر نەكراوە، بۆیە لەلایەن یۆنانییەكان بەكورد وتراوە(گرێی كورتبون)واتا هەرچی ئەو گرێیەی كوردی پێنەكرێتەوە ئەوا رۆژهەلاتی ناوەراست ناكرێتەوە، لەگەڵ زۆر سەروەری تر. كەچی ئێستا ئەو بارودۆخە گۆڕاوە بۆیە دەروازەكانی گۆڕان و چاكسازیش تیایدا گۆراوە، هەڵبەتە لەو رووە وە نەك پرۆژە چاكسازییەكەی نەوشیروان بەڵكو خودی یەكێتیش و ئیسلامییەكانیش تائێستا بەوردی ئەو دەردەیان پێ تەشخیس نەكراوە بۆیە نازانن بۆچی ئەو حزبانە لەبەرامبەر سەركەوتنی(پدك)لەكوردستان بەدوا كەوتن، هەڵبەتە چاكسازی بەپێی بنەمای ئەخلاقی ناگۆرێ زیاتر گۆران دەكەوێتە دەست بنەمای ماددی، ئەوەش وێرانكەرە و چاكسازی لێ دروست نابێت، زیاتر تێكدان ساناتر دەبێت، بۆیە ئەو پرۆژەیەی چاكسازی و تەواوی چاكسازانی كوردستان دەست كورت دەبن.

٢- هەڵبەتە(ینك)خۆی خستە گۆڕەپانێك لەگەڵ(پدك)و ئیسلامییەكان كەلە ململانێدا شكست بهێنێ هەڵبەتە تامەیدان ئایدۆلۆژی بوو،(ینك)زۆر سەركەوتوو بوو، لەدوای حزبە عەلمانییەكانی كوردستان لاسایی حزبە لیبرالییەكانی رۆژئاوایان كردەوە و دوركەوتنەوە لە

ئایدۆلۆژیا، ئەوا یەکسەر لە کوردستان فاکتەری کۆمەڵایەتی و فاکتەرەکانی تری شاقوڵی جێی گرتەوە، ئیتر لەو رووەش(پدك)لەهەمووان بەهێزترە، بۆیە لەو قۆشمەیە ئەوانی تر بەجێ ماون، ناچار کەوتنە جەنگێکی سارد و گەرم و هەموو شتێك لە پێناوی ئەو جەنگە بەکارهات و دەسەڵاتیش بووە ئەو ئامرازە، ئیتر یەکێتی لە قۆناغێکی وابوو وەك سۆڤیەت بەرامبەر امریکا، ناتوانێ دەستکارییەکی وای خۆی بکات لەبەرامبەر پارتی، هەڵبەتە چاکسازیش هەندێ بۆشایی پەیدادەکات ئیتر بەخێرایی دەبێتە هۆی تێکچونی هاوسەنگی و بچوك بونەوەی یەکێتی، هەڵبەتە ئەو هەنگاوە هەر لەپێش یەکێتییە، هەتا ئەگەر لەپێش مام جەلالیش بمێنێ، چونکە وا بەرە بەرە لەکورتی دەدات، هەڵبەتە هەردوو حزبی دەسەڵاتدار دەنگییان لەکورتییە یەکەمجار ٥٠٪ دەنگیان هێنا، دوایی بووە ٤٠٪ و داهەڵبژاردن هەردوکیان ٣٥٪ دەنگیان هێنا ئێستا رەنگە زۆر کەمتر بوبێتەوە بەڵام چونکە بەدیلێکی ئامادەنییە بۆیە جارێ دەنگی دەسەڵاتیان دەمێنێ. ..

کەواتە یەکێتی لەدوو لاوە لەشی دادەخورێ پێویستی بە خۆ فۆرماتکردنەوە و چاکسازی هەیە، بەڵام وا پێدەچێ گەندەڵی وەك کۆڵستڕۆڵ وا پەرەی سەندبێ لایەنی زۆرایەتییەکەی بێ، بۆیە لایەنی نا چاکساز بەهێزترە لەلایەنی چاکساز. ... سەرەڕای ئەوەی تا ڕادەیەکی زۆر گەندەڵەکانی نێو هەموو حزبەکان کوردستان خەریکە پارێزگاری لە بەرژەوەندی یەکتر دەکەن و دەبنە چینێك لەسەر سنوری حزبایەتیش دەوەستن، بۆیە دەبینین گەندەڵچی پارتی و یەکێتی و لایەنەکانی تر و زۆر تەبان و وا دەسەڵاتێکی چینایەتی لە کوردستان دروستبووە.

بەهێز و بازویەکی بەتین و لایەنی چاکسازی لە کوردستان لاواز بووە، بۆیە شکستی پرۆژەی چاکسازی نەوشیروان بریتی بوو لە شکستی چاکسازی لە کوردستان و زیاتریش گەندەڵچی زان بوون لەسەرانسەری کوردستان واش پێدەچێ هەمووولایەك لەو گەندەڵچییانە هاوکارییان کردبێ لەدژی ئەو پرۆژەیە بۆئەوەی لە پپلان و پرۆژەی داهاتووی ئەو پرۆژەیە سەرکەوتووبن، پێویستە رەچاوی هەموو ئەو خاڵانە و کۆمەڵێك خاڵی تری گرنگ هەیە کەدەرفەت نەبوو لێرە باسی بکەین، ئەو ئەرکەش بووەتە ئەرکێکی نیشتمانی پێویستە هەموو دڵسۆزێك یارمەتی بدەن، بەڵام لەپێش هەمووانیدا دەبێت چاکساز خودی خۆی لەپێش هەمووان خۆی چاکساز بکات و چاکسازی لە کارساز ڕا دەست پێبکرێت.

## نەوشیروان مستەفا لەئاوابوندا بۆ لوتکە دەروانێت

بەدواداچون و خوێندنەوەی: علی حمە صالح

قسەکردن لەسەر نەوشیروان مستەفا لەوسۆنگەیەوە سەرچاوەی گرتووە، کەهەنگاوەکانی نەوشیروان هەمیشە جێگەی تێرامان و پرسیارن لەنێو گۆڕەپانی سیاسی و راگەیاندنانی کوردیدا، ئەم تێرامان و پرسیارانەش بەهیچ شێوەیەك مانای ئەوە ناگەیەنن کە ئەو نێوەندانە لەگەڵ تەواوی هەنگاوە سیاسی و سەربازییەکانی نەوشیرواندا بن، یان رەتیان بکەنەوە، لەوانەیە بەپێی هەندێك پێوەری سیاسی بەشێکی ئەو هەنگاوانە کە نەوشیروان لەرابردوودا ناویەتی هەنگاوی گونجاو نەبن و بەشێکیشیان کاریگەری ئیجابی هەبووبێت، هەنگاوەکانیشی چەند تابەتمەندییەکی وایان تێدایە کە شایانی ئەوەن لەسەری بوەستین، کاری ئێمە لێرەدا هێندەی هەوڵدانە بۆ خستنە ڕووی دیوی پشتەوەی بابەتەکان، نیشان نییە، بریاردان نییە، لەسەر باشی و خراپی ئەم هەنگاوانە، وەك چۆن لەرابردوودا هەڵوێست و بیرکردنەوە سیاسییە کوردەکان کاریگەری هەبووە لەسەر خەباتی نەتەویی، بەهەمان شێوە هەنگاوە سیاسییەکانی ئێستای ئەم بەرپرسانەش دەرهاوێشتەی جۆراوجۆری دەبێت، بۆئەوەی ئێمە بتوانین دارشتن لەسەر ئەو بابەتانە بدوێین، کەلە ئێستادا کاریگەرن، دەبێت بگەرێینەوە بۆ رەگی هەنگاوە سیاسییەکان.

نەوشیروان مستەفا هەمیشە لەبێدەنگییەوە هەنگاو دەنێ حەز بەقەرەباڵخی و ژاوە ژاو ناکات، باوەری بەکۆکردنەوەی عەشیرەت نییە لەدەوری خۆیی و هیچ کام لەکەسە نزیکەکانی پۆستی ئەو تۆیان نییە زۆر متمانەی بەکەسایەتی خۆی هەیە وشانازی بەرابردووە وە ناکات، وادەردەکەوێت بەڵام تورەییەکەی هێندەی تاڵەبانی نییە، تا ئێستاش بە هەناسەیەکی شۆرشگێرانەی شاخەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو حاڵەتانەدەکات کە روبەروی دەبنەوە و بەدڵی نییە، بەئاسانی لە بیریان ناکات، هەر بۆیە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری هەڤاڵانی شاخ تەبانییە، یانیش دەیانخاتە پەراوێزەوە و پەیوەندی دەپچرێنێ خوێنەرێکی باشە و میدیای کورد بەدەگمەن – سەیر دەکات، ئەگەر چی شارەزاییەکی باشی سیاسیی هەیە، بەڵام لەروانگەی جۆراو جۆرەوە گەلێك جار هەڵوێستی دژبەیەکی لێبینراوە ،

کەلەگەڵ سیاسەتکارێکی خۆڕاگر یەکناگرێ، بەپێی بیرەوەری هەندێ لەسەر کردەکان نەوشیروان چەند لەکاتی سەرکەوتن لەخۆی باییە، بەو ئەندازەیەش لەکاتی دۆرانەکاندا شپرزە و ئالۆزە، زوو زوو نا ئومێد دەبێت، ئەگەر چی زۆر بەی جار هۆکارەکانی شەری ناوخۆی لەسەردەمی شاخ و شار کەوتۆتە ئەستۆ، بەڵام خۆی وتەنی: هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییەی یەکێتی نەبێت، شەڕی دۆڕاوی نەکردووە و نایکات وەك مەلا ئەحمەد بانی خێڵانی باسی دەکان، جارێکیان لە کۆتایی یەکێك لەشەڕەکاندا پێشمەرگەیەکیان گوللە بەئاسمانەوە دەنێت و دەڵێت بەس خوا ماوە شەڕی پێ بفرۆشن، ئەوە من شەر لەگەڵ ئەویشدا دەکەم لە باسکردنی پشتئاشان گەلێك نیگەران دەبێت و پێی وایە ئەوە سەردەمێکە بەسەر چووە و پێویست ناکات لاپەڕەکانی هەڵبدرێنەوە.

## نەوشیروان و تاڵەبانی، دووتاکتیك بۆ یەك ستراتیژ

میکانزمەکانی هەریەکە لە نەوشیروان مستەفا و جەلال تاڵەبانی بۆ چارەسەر کردنی گرفتەکان هەمیشە جیاواز بووە، ئەمە بۆتە خاڵێکی ناکۆکی نێوانیان لەماوەی چل و شەش ساڵی رابردوو، کەوێرای جیاوازی بەڵام هەروەك کۆنە هەڤاڵانی یەکدی ماونەتەوە، وێڕای فراوان بوونی کەلە نێوانیشیان و لەوکاتەی ئیمزا کۆکردنەوە دەستی پێکرد نەوشیروان لە کۆبونەوەیەکی ناوخۆی مەکتەبی رێکخستندا کەلە کوردستانی نوێدابلاّو کرایەوە بەراشکاوی رایگەیاند، کەهەموو هەوڵی ئەوان بۆ ئەوەیە مام جەلال ببێتە کەسێکی ژمارە یەکی کوردستان، ئەمەش هێمای بۆ بوونی رێژەیەکی نەگۆڕە لە پەیوەندی نێوان تاڵەبانی و نەوشیروان، کەنەوشیروان ئامادەیە تەنها مام جەلال سەرۆکی بێت و نەك کەسی تر، هەر بۆیە سەرەتا جێگری سکرتێری قبولکرد، بەڵام جیاواز بوون لە میکانزمی ئەم ستراتیژیەتە لە بواری نوێدا نەوشیروان وەك کەسی دووەم لە یەکێتیدا بمێنێتەوە. بۆ ورد بونەوە و شیکردنەوەی ئەم لایەنە دەبێت بۆ باکگراوندی پەیوەندی نێوانیان بگەڕێنەوە. زۆرجار ڕوی داوە ململانێی باڵەکانی ناویەکێتی تاڵەبانی و نەوشیروان روبەروی یەك بکاتەوە، بەڵام نەوشیروان هەمیشە تاڵەبانی(ضمان الامان) ی یەکێتی زانیوە و لەدەربەندی ئەو دووکێوەدا گرتووە و بەلاچونی ئاو هەمومان دەبات.

سەرەتای یەکتر ناسینی تاڵەبانی و نەوشیروان بۆساڵی ١٩٦١ دەگەڕێتەوە ئەوکاتە مام جەلال بەرپرسی لقی سلێمانی پارتی دیموکلاتی کوردستان بووە و نامەگۆڕینەوە لەنێوان تاڵەبانی و نەوشیروان هەبووە، تاڵەبانی هەواڵ و دەنگوباسەکانی بەنەوشیروان گەیاندووە و

بەبیر و ڕای خۆی لە بارەی هەندێك شت بۆ نەوشیروان خستۆتە ڕوو ئەویش بەهەمان شێوە، هەر لەدامەزراندنی یەکێتیشدا جەلال تاڵەبانی داوا لەنەوشیروان دەکات خۆی ئامادەبکات بۆ ئەو ڕێکخراوە نوێیە کە یەکێتییە و نەوشیروانیش بەخۆشحاڵییەوە داواکە قبوڵدەکات.

ئەگەر ئێمە لە هەڵوێست و بیر و راکانی نەوشیروان مستەفا بەرامبەر پارتی ورد ببینەوە، دەتوانین ئەوە بەرهەم بێنن کەپارتی هەمیشە وێنای نێگەتیڤی لای نەوشیروان هەبووە، هەر لەسەردەمی شاخەوە تا سەرەتاکانی شەری ناوخۆ و پاشانیش یەکگرتنەوەی ئیدارە، تەنانەت ئەو کاتەشی کە یەکێتی و پارتی سەرقاڵی یەکگرتنەوەی ئیدارە بوون، کاتێك لای تاڵەبانی شێوە نەرمی نواندنێك بۆ وەرگرتنی پۆستەکان هەبووە، لای نەوشیروان هەمیشە توندی و پێداگری نوێنراوە، ئەگەر چی ئەمە بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی وەك تاکتیکێکی حزبیش بوبێت بەلام هەڵوێستەکان بەو شێوەیە دەخوێنرێتەوە کە نەوشیران ئامادەی هیچ سازێك نییە بەرامبەر پارتی، لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتیدا لەساڵی ١٩٧٥ جەلال تاڵەبانی نامەیەك بۆ مەلا مستەفا دەنێرێت و دەربارەی دامەزراندنی یەکێتی دڵنییای دەکاتەوە لەوەی کە نەك دژی بارزانی نابێت، بەڵکو بەچاوی سەرەکی جولانەوەی کورد سەیر دەکات، بەلام ئەگەر بڕوانینە بیرەوەرییەکانی نەوشیروان ئەو لایەنە بەراشکاوانە دەردەکەوێت کەنەوشیروان ناوەرۆکی ئەو نامەیە بەهیچ شێوەیەك پێ قبوڵ نییە، وای لێدەخوێنرێتەوە دەڵێ بارزانی شۆرشی نەکردووە، بەڵکو بار و دۆخ ناچاریکردووە کە شۆرشی بەملدا هێنا.

نەوشیروان مستەفا پێشبینییەکی چەپی هەبووە وەك خۆی دەڵێت: پێش بینییەی فکرمان مارکسی چەپ بووە، ئەم بیرکردنەوەیەش لەناو ریزەکانی یەکێتیدا رەنگی داوەتەوە، چونکە خۆی ئەوە دەخاتە روو کەهەندێك لەو بۆچونە مارکسییانە قەناعەتی فکری بوو لەلایەن بیری چەپ ئەوەندە برەوەی هەبوو تاقمی وەك قمیش بونە مارکسی، بەلام تاڵەبانی زیاتر لەوەی کەبیەوێت خزمەت بە ئایدۆلۆژییەك بکات بیری لە فراوانکردنی یەکێتی دەکردەوە هەر لەسەرەتای دامەزراندنی یەکێتییەوە تاڵەبانی ڕای وابوو هەموو تێکۆشەرانی کورد لەچەپەوە بۆراست لە ڕێکخراوێکی فراواندا کۆبکاتەوە بۆئەم مەبەستەش پەیوەندی لەگەڵ زۆر کەسدا کرد، تەنانەت ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی

پارتیش، کەهاتبونە دەرەوە، ئەم جۆرە بیر کردنـەوە جیاوازانـەش لـە ریزەکانی یەکێتیـدا، ئەم حزبەی دوچاری چەندین بەریەککەوتن دەکات.

## گرفتی ئایدۆلۆژی و بەریەککەوتنی ناو حزب

یـەکێتی هەرلەسـەرەتای دامەزراندنییـەوە لەشـێوەیەکی بـەرەکی سیاسـیدا بـووە لـەناو ریزەکانیدا، چەندین ئایدۆلۆژیا و رێبازی جیاوازی بەرجەستە بوو بوو، مارکسیزم، سۆسیال دیموکرات، شێخ و مەلا و ئاغا دەبینرا، ئەمەش دەرهاوێشتەیەکی خراپی بەجێهێشت، ئـەم جیاوازییە لە بیرکردنەوەدا تەنها بەوە ناوەستێت کەلە نێوان ئـەو دوو کەسایەتییەدا بێـت، بەڵکو شۆرش دەبێتـەوە نـاو حـزب و بـۆ چـەندین جـار کاریگـەری نێگـەتیڤی لێکەوتۆتـەوە، تارادەیەکیش ئەم رێکخراوەی دوچاری پـەرت بـوون کـردووە لێـرەدا هـەوڵ دەدەم دوونمونـە بهێنمەوە.

بزوتنەوە، کـەباڵێکی سـەرەکی یـەکێتی بـوو لەسـاڵی ١٩٧٩ دا بەسـەرکردایەتی هەریەکەلـە رەسوڵ مامەندی سکرتێر، د. محمود عوسمان، تایەر عەلی والی، قادر جەباری، حـاجی حـاجی إبراهیم، سەید کاکە، قادر عزیز، عدنان موفتی، مەلاناصح، کەئەندامی سەرکردایەتی بـوون لەیەکێتی بوون و پاشان حزبی سۆسیالستیان پێکهێنا، یەکیك لەو هۆیانەی کە دەبووە هـۆی جیابونـەوە یـان ئـەوەبوو کـەدەیان وت: مـام جـەلال کۆمەڵـەی رەنجـدەران لەسـەر حیـسابی بزوتنەوە بەهێز دەکات و کۆمەڵـەش(مـاوی)و(موتەفـەریقین)و دژی ئـایین و مـەلا و ئاغـا و سـەرۆك عەشـیرەتن، ئەمــەش سـەرەتای بەریەککـەوتنێکی گەورەیـە کەبـەهۆی جیـاوازی ئایدۆلۆژیاوە روو دەدات، بزوتنەوە تـا رادەیـەك بیرکردنـەوەی عەشایری و دینییـان هـەبوو، کۆمەڵـەش بیرێکـی چـەپی هـەبوو، دیـارە تاڵـەبانی هەولیـدا هـەموو ئەمانـە لـەژێر چـەتر یەکێتیـدا کـۆ بکاتـەوە، بـەڵام لـە خییـانی ئایدۆلۆژییایـەکی قـوڵ بـۆ شـۆرش و نـەبوونی باوەرێکی وا بەهێز، کەلە پێناوی شۆرشدا هەموو ململانێیـەك وەلا بخات کۆکردنـەوەی ئـەو هەموو بیرکردنەوە جیاوازانە لە رێکخراودا کاریگەرییەکی ئەستەم دەبێت.

لەساڵی ١٩٨٤ مەلا بەختیار و هاوەڵەکانی لە شارباژێرەوە چونە قـەرەداغ، ئەمـە سـەرەتای جیابونەوەی مەلا بەختیار و هاوەڵانی بوو لەروی فکرییەوە ئەو کاتـە مـەلا بـەختیار خـۆی بەکۆمەنیـستێکی ئێـران و تێـزە فکرییـەکانی ئـەوان بـوو، لـەمانگی ئایـاری ١٩٨٤ دا مـەلا بەختیار و هاوەڵەکانی کۆنفرانسێکیان بەست و پـرۆژە و بەرنامـەی رێکخراوەکـەیان خـستە

روو، ناوی ڕێکخراوەکەشیان نا(ئالای شۆڕش )، هۆکاری جیابونەوەکەشیان بۆ تاڵەبانی و نەوشیروان دەگەڕاندەوە دەیان وت: نەوشیروان مارکسی نییە و لەپەیوەندی کۆمەڵایەتیدا وشکە و قسەی ڕەقە و لە موجامەلە نازانێت و خەڵك تەریق دەکاتەوە و لەکارە کانیشدا پرس بەکەس ناکات.

## پاش راپەرین وشێوازێکی نوێی ململانێکان

لە پاش راپەرین جگە لەشەری ناوخۆی حزبەکانی نێو کوردستان ململانێکانی نێو خۆی یەکێتی هەر بەردەوام دەبێت، بەڵام لەکاتەکانی شەرکردندا لەگەڵ هێزەکانی تری کوردستاندا یەکێتی هەمیشە ململانێ نێوخۆییەکانی وەلاوە ناوە، بەپرسێکی یەکێتی دەیوت: یەکێتی دەباڵیشی هەبێت لەکاتی شەردا یەك دەنوکی هەیە، نەوشیروان مستەفا لەمێژووی خۆیدا چەند جارێك لەم حزبە دور کەوتۆتەوە و گەراوەتەوە، بەڵام لەهیچ کاتێکدا دورکەوتنەوەی لەیەکێتی دورکەوتنەوەی یەکجارەکی نەبووە، جارێك بۆ نەشتەرگەری جارێك بۆکاری حزبی بووە، درێژترین دابرانیشی ساڵی ۱۹۹٦ بۆ ۲۰۰۲ بوو، کەلە هەستیارترین قۆناغی یەکێتیدا بوو، یەکێتی بەچەندین روبەرو بونەوەی سەخت و ڕێککەوتندا تێپەری و لەو ماوە یەشدا یەکێتی زۆر جار لە لوتکەی هێز دا بووە و دوری نەوشیروانیش هیچ کاریگەرییەکی ئەو تۆی نەبووە، بەڵام ئەو دابرانەی نەوشیروان تەنها دابران بووە لەژیانی رۆژانەی حزب، چونکە وەك خۆی دەڵێ: لەو کاتەی کەدور کەوتومەتەوە لە هەندێك لە کۆبونەوەکانی ناو کوردستان دورکەوتومەتەوە، ئەگینا لەکاتی روخانی سەددامدا من لەگەڵدا بووم، لە نوسینی دەستوردا حزورم هەبوو، لەگفت و گۆی نێوان پارتی و یەکێتیدا لەتاران جارێك لە ئێرلەندا جارێك لە پاریس ئامادە بووم، بەڵام لەگەڵ گەرانەوەی نەوشیروان بۆ کوردستان و باشبوونی پەیوەندییەکان نێوان پارتی و یەکێتی، ململانێ و مشت و مڕ لەنێوان یەکێتیدا دروست دەبێتەوە، ئەو ململانێیەی لەشار جیاوازە وەك لەشاخ و لەکاتی پێشمەرگایەتی، ململانێی سەردەمی شاخ زیاتر لەجیاوازی بیرکردنەوەی و بایەخدان بە باڵێك لەسەر حیسابی باڵێکی تر، تارادەیەکیش دەسەڵات سەرچاوەی دەگرت بۆ نمونە نەوشیروان دەڵێت: " لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەدا هەندێك لەسەرکردەکان دەرنەچوون، وەئەمەیان لەدڵ گرت و دەستیان لەکار هەڵگرت و پاشان ئالای شۆڕشیان دروست کرد، زیاتر هۆی نارەزایی بونە کەشیان شەخسی بوو تاجیاوازی بیر و باوەر ".

بەڵام ئەوکاتەی کە نەوشیروان لەدەرەوە گەرایەوە، واتا لەساڵی ٢٠٠٢ ملکملانێکان بەشێوەیەکی تر دەرکەوتن و شەری ناوخۆ کۆتایی پێ هاتبوو، ئەمجارەش لەسەردەمی دەسەڵات و حوکمڕانیدا ململانێ و ناکۆکییەکان تایبەت مەندی تر وەردەگرن، یەکێتی چەندین بیری بەهێزی بەرامبەر دەکردەوە، کە پارتییە زیاتر، بەڵام جارێکی تر هاتنەوە ناو ململانێی ناوخۆی حزب، تاڵەبانی پۆستە گرنگەکانی دەدا بە کەسە نزیکەکانی خۆی و نەوشیروان نیگەران دەبێت، باڵێك دروست بوو بەناوی ریفۆرم، کە نەوشیروان سەرکردایەتی ئەو باڵەی دەکرد، ریفۆرمیش هەمیشە لەبەرامبەر گەندەڵیدا دەکرێت یەکێتی حوکمرانە و بەشێکی زۆری پۆستە گرنگەکان لەلایەن تاڵەبانییەوە قۆرخ کراوە، گەندەڵییەکی زۆر ئیداری و سیاسی دەبینرێت، نەوشیروان دەیویست لەرێگەی باڵێکەوە کاربکات بۆ نەهێشتنی ئەم گەندەڵییانە، لەپێناوی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی تاڵەبانیدا پرۆژەی ئیمزا کردنەوەی دەستپێکرد، بۆدانانی جێگرێك بۆ تاڵەبانی و ئەنجامدانی هەندێ ریفۆرمی حزبی، ئەگەرچی لەسەردەمی شاخیشدا ئارەزوی وەرگرتنی پۆستی نەبووە، جگە لەتاڵەبانی فەرمانی لەکەس قبوڵنەکردووە دانانی جێگریش بۆ تاڵەبانی لەپێناوی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی تاڵەبانیدایە نەك وەرگرتنی پۆست بۆ نەوشیروان، کاتێکیش یەکێتی ناچار دەبێت کەسی دووەم بۆ تاڵەبانی دابنێت، کەسێك لەنەوشیروان شیاوتر نابینێتەوە و دەبێتە جێگر، واتا پرۆژەکە لە پێناو دەسەڵات و قۆرخ نەکردنییەتی لەلایەن یەك کەسدا، نەك پێدانی پۆست بەنەوشیروان مستەفا، لەمیانەی خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵبژاردنەکان، ململانێی نێوان باڵی تاڵەبانی و نەوشیروان دەست پێدەکاتەوە، دیارە لەململانێکانیشدا باڵی کۆسرەترەسوڵیش بوونی هەیە، کە لێرەدا جێی باس نییە، ململانێی نێوان نەوشیروان و تاڵەبانی لەئاستی مەکتەبی سیاسیشدا تێبینی دەکرا لەوەرگرتنی پۆستی جێگریشدا نەوشیروان ناتوانێت گەندەڵییەکان کەم بکاتەوە و دەسەڵات هەربەدەست باڵی تاڵەبانییە، دواتر نەوشیروان لەپێناوی چاکسازیدا پرۆژەیەك پێشکەش بە یەکێتی دەکات، ئەم جارەیان باڵی ریفۆرم دەیەوێت ململانێ بگوازێتەوە مەڵبەندەکان و هەواڵ بدەن لەوێوە دەسەڵات بگرنەدەست، کەچی لەهەڵبژاردنەکانی مەڵبەندیشدا نەوشیروان نەیتوانی هیواکەی بهێنێتەدی و سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا بۆیە بەناچاری وەك بەرپرس لە پەنجەرەوە دەرواتە دەرەوە و بەهیوای ئەوەیە رۆژێك لەدەرگاوە بێتە ژوورەوە، کۆمپانیای وشەش

دوایـەمین شـوێنی نەوشـیروان مـستەفایە لـە ئێـستادا، کەدەیـەوێت لەڕێگەیـەوە بەشـێك لـە ئومێدەکانی بۆ بگەڕێتەوە.

## قوربانیدان لە پێناو دەسەڵات و هەڵوێست

لە کاتێکدا نەوشیروان مستەفا لە زانکۆی ڤییەنا سیاسەت و یاسی نێودەوڵەتی خوێندووە، هاوکات نەیارانیشی بەکەسێکی توند و تیژی دەزانـن، ئـەو لـەدوا قۆنـاغی خوێنـدنی دکتـۆرا دەبێـت لـە نەمـسا و نامـەی دکتۆراکـەی تایبـەت دەبێـت بـە پەیـدابوون و گەشـەکردنی بزوتنەوەی نەتەویی کورد. بەڵام کەتاڵەبانی نامەی بۆ دەنێرێت و داوای لێـدەکات خـۆی بـۆ ئـەو ڕێکخـراوە تازەیـە کـە یەکێتییـە ئامـادە بکـات گەرچـی ڕەنگـە ئـەم بڕیـارە بـەلای نەوشیروانەوە قورس بێت، چونکە ئەوروپا لەو سەردەمەدا خـەون بـوو بـۆ کـورد بەتایبـەت یەکێك ئەگـەر لەزانکۆیـەکی گرنگی وەك(ڤییـەننا)بخوێنێـت، پاشانیش ماوەیـەکی زۆر بـوو نەوشیروان مستەفا لە کوردستان دابرابوو، وەك خۆی دەڵێت" ئیلتزامی ئەخلاقی و ئـەدەبی منـی بـە کۆمەڵـە و مـام جەلالـەوە بـە سـتبووەوە، بـە جـوانم نـەدەزانی لـە ژێـری دەربچم، ڕاستەوخۆ وتم کەی داوات کرد ئامادەم ".

نەوشـیروان لـە ١٩٧٥/٥/٢٢ دا ئامـادەی یەکـەم کۆبونـەوەی دەستەی دامەزرانـدنی یـەکێتی نیشتمانی کوردستان دەبێت لە شام، ڤییەنـا و خوێندنی دکتۆرا جێـدەهێڵێت و دەگەڕێتـەوە چیاکانی کوردستان، ئەگەرچی جیاوازی ئایدۆلۆژی و تەنانەت ڕێگەکانی گرتنەبەری شۆڕش گرفت دەبێت لـەنێوان تاڵـەبانی و نەوشیرواندا بـۆ نمونـە: ئەنـدام بـوون لەبـەرەی(التجمع الـوگنی العراقـی – تـوع)دا، ئـەو بەرەیـەی کەلەلایـەن ئـەو عێراقییانـەوە دامـەزرا کەلـە حەفتاکانـدا چـوبونە شـام، سـەرەتای جیاوازییـەکانی ئـەو ڕێگـە درێژەیـە کەتاڵـەبانی و نەوشـیروان دەیانـەوێت هـەنگاوی بـۆ بنـێن، نەوشیروان لەگـەڵ ئـەوەدا نـەبوو یـەکێتی لـەم ڕێکخراوەدا ببێتە ئەندام، چونکە شۆڕشی کورد دەبووە بەشێك لـە شۆڕشـی عێـراق دەبوایـە دروشمەکانی شۆڕشی عێراقی بەرزبکردایەوە یـەکێتی لـەژێر ئـاڵای تـوع – دا شـۆڕش بکـات، تاڵـەبانی لەگـەڵ ئـەوەدا بـوو ببنـە ئەنـدام و نەوشیروان و عـادل مـورادیش بەرهەڵـستییان دەکرد، گەرچی بون یان نەبونە ئەندام کاریگەری لەسەر ڕەوتی شۆڕشی کورد دەکـرد، بـەڵام هـەرگیز نـاکۆکی لـەنێوان تاڵـەبانی و نەوشـیرواندا دروسـت نـەدەکرد، هەنـدێك جـار نەوشیرواندا لەگـەڵ تاڵەبانیـدا گـرژی دروسـت دەکـرد لەسـەر هاوڕێکـانی، نەوشـیروان دەڵـێ: مام جەلال زۆر ڕێزی بیر و بۆچونەکانی منی دەگرت، بەڵام ئەندام سـەرکردایەتی هـەمووان

لە پاشەملە گلەییان لە مام جەلال دەکرد و رەخنەیان لێ دەگرت، گلەیشیان بەزۆری لەسەر شتی بچوکی خۆیان بوو، کە رێزی نەدەگرتن و لەبەرچاوی خەڵکی دەیشکاندنەوە، داوایان لەمن دەکرد ئەم پرسەیان لەگەڵدا باس بکەم چارەیەکیشی بۆ بدۆزمەوە کەچی هەموو جارێك کەباسم دەکرد دەبووە ناخۆشیمان خاوەن گلەیی و رەخنەش لەبری ئەوەی پشگیری لەمن بکات دەبووە ناوبژیکەر لەنێوان من و مام جەلالدا.

ئەم هەڵوێست وەرگرتنەی نەوشیروان لەسەدەی نوێشدا هەر بەردەوامە. بەڵام لەبەرگێکی جیاوازتردا پرۆژەی ئیمزاکۆکردنەوە بۆ دانانی جێگرێك بۆ تاڵەبانی بەتەنها کاری نەوشیروان نەبوو، زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ ئەو پرۆژەیەدا بوون و ئیمزایان کرد، کەچی کاتێك تاڵەبانی لە پرۆژەکە ئاگادار کرایەوە تەنها نەوشیروان وەك خاوەنی پرۆژەکە دەرکەوت نەك ئەندامانی تری مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی.

باڵی ریفۆرمیش تەنها لە نەوشیروان مستەفا پێك نەهاتبوو، عمری سید علی و عوسمانی حاجی مەحمود و مستەفای سید قادر و چەندین بەرپرسی دیکە پێکهاتەی باڵەکە بوون، بەڵام ئەوەی لەناو ئەواندا هەڵوێستی وەرگرت نەوشیروان بوو، زۆرترین ناکۆکی لە هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییەی یەکێتیدا لەنێوان باڵی نەوشیروان و تاڵەبانیدا بوو، تەنانەت کار گەیشتە شەر لە گەرمیاندا خەڵکیشی تێدا کوژرا، ، نەوشیروان خۆی راستەوخۆ سەرپەرشتی هەموو ناوچەکانی نەدەکرد، بەشی زۆری مەڵبەندەکان لەلایەن بەرپرسەکانی تری یەکێتییەوە سەر بەنەوشیروان بوون، بۆنمونە گەمیانییەکان لەرێگەی عوسمانی حاجی مەحمودەوە سەربەباڵی ریفۆرم بوون، ئەگەرچی ئەندامانی تری مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیش بۆمانەیان لە پۆستەکانی خۆیان و پۆستی گرنگتریشپێویستییان بەهێنانی دەنگ هەبوو، پرۆژەی ریفۆرمیش بەتەنیا هی نەوشیروان نەبوو، بەڵام ئەوەی هەڵوێستی وەرگرت تەنها نەوشیروان و چەندکەسێکی کەمی تر بوون، کەپێویستی زۆر گرنگیان نەبوو تالەدەستی بدەن، لەوانە قادری حاجی علی و حەمە تۆ فیق رەحیم نەك تەواوی باڵەکەی نەوشیروان، واتا نەوشیروان کاری لەپێناوی هەموو باڵی ریفۆرمدا دەکرد، بەڵام کەکەوت بەتەنها خۆی هەڵوێستی وەرگرت.

دەسەڵات، ئەو فاکتەرەی نەوشیروان نیگەران دەکات گەرچی وادەردەکەوێت کەنەوشیروان خودی خۆی تامەزرۆی دوەرگرتنی دەسەڵات نییە، بەڵام ئەو هێز و کەسایەتییانەی ئێستا دەسەڵاتی حزبی و حوکومی لەناو یەکێتیدا بەرێوە دەبەن سەربە تاڵەبانین، نیگەرانی

نەوشیروانیش لەم بارەیەوە رونە، لەبەرئەوەی پێکهاتە و بەرێوەبردنی هەموو ئاراستەکانی حزب لەنێو یەکێتیدا لەسەرەتاوە بەم شێوەیەی ئێستا نەبووە بروا کردنیش بەقۆرخکردنی دەسەلاَت لای بەرپرسانی یەکێتی بەتایبەتی ئەوانەی هەر لەسەرەتای دروست بوونی ئەم حزبەوە خۆیان بەخاوەنی زانیوە کارێکی ئەستەمە، گەرچی نەوشیروان ئەوەندەی گرفتی ئەوەی هەبووە دەسەلاَت چۆن بەکاردێت، ئەوەندە گرفتی ئەوەی نییە کێ بەکاری دەهێنێ، بەلاَم لەئێستادا لای نەوشیروان کێ بەرێیەوە دەبات و چۆنیش بەرێوە دەچێت گرفتە، نەوشیروان کاتێك دەبینێت لەپاش راپەرینەوە تالەبانی هەرخۆی سکرتێری یەکێتییە، و پاشانیش دەبێت بە سەرۆك کۆمار بە گوشار جێگرێکی بۆ دادەنرێت و جێگریش دەسەلاَتێکی وای نابێت، دەسەلاَتی داهات و دارایی و رێکخستنی حزبی و رێکخراوەکان و راگەیاندان و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان هەر لەدەست کەسانی نزیکی سەر بەون.

**ئەو هێزەی لەدەرەوەی یەکێتییەوە بۆ یەکێتییەکی تر دەروانێت.**

لەگەڵ ئەوەی نەوشیروان چەندین جار لەیەکێتی دورکەوتۆتەوە، بەلاَم هەرگیز جێ پەنجەی ئەو لە قۆناغە هەستیارەکانی یەکێتی بزر نەبووە، نەوشیروان لەگەڵ ئەو هەموو ململانێیەی لە رابردوو سەردەمی شاخدا وەکو کۆمەڵەو لە ئێستاشدا وەکو باڵی ریفۆرم روبەروی یەکێتی بۆتەوە نەیهێشتووە ئەم حزبە دوچاری پەرتبونێکی گەورە و لەناو چوون بێتەوە لە ئێستادا نەوشیروان وازی لە بەرپرسیارییەتی هێناوە، ئەگەر یەکێتی بکەوێتە حاڵەتێکی نائاساییەوە دور نییە ئەو بەهەمان هەناسەی پشتئاشان و شەری ناوخۆ ئامادەیی ئەوەی تێدا بێت وەك پێشمەرگەیەکی یەکێتی بێتەوە مەیدان، هەر ئەم پەیوەستبونەی نەوشیروانیشە وای کردووە ئەو لایەنانەی لەدەوری یەکێتین بەگومانەوە سەیری پرۆژەکانی نەوشیروان بکەن، ئەوان لەو بڕوایەدان ئەگەر یەکێتی نەبێت نەوشیروان ئەم قورساییەی ئێستای نابێت لەدەرەوەی یەکێتی ناتوانێت ببێت بەژمارەیەکی کاریگەر، هەر بۆیە هەموو هەنگاوێکی بەم ئاراستەیە بەمانۆڕ لەقەڵەم دەدرێت، ئەگینا وەك ئەندام لەگەڵ یەکێتیدایە، تەنانەت بیرکردنەوە لەوەش کە بەهێزەوە بگەڕێتەوە بۆ بەرپرسایەتی لای نەوشیروان وجودی هەیە، بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بۆچونە، دورلە سۆزداری لەم قۆناغەی لەبەردەم یەکێتیدایە نەوشیروان دەڵێت: من بەتەمانیم جارێکی تر لە کاروباری حزبیدا هیچ پۆستێکی گرنگ بگرمەوە دەست، بەلاَم روداوەکانی کوردستان جاری واهەیە لێقەومان

دێنێتــه پێـشەوه و ئینــسان ناتوانێـت بێلایـەن بێـت بـۆ چارەنوسی نەتەوەکـەی، ئایا ئـەو لێقەومانه چییه نەوشیروان ناچار دەکات بێ لایـەنی لەدەست بـدات ، لێرەدا دەگەینـه ئـەو ئەنجامەی که بیری یەکێتیبوون و لایەنداریێتی تا ئێستا لەزەینی نەوشیرواندا هەیـه، ئـەوەی نەوشیروان ناچار دەکات وەك هێزێکی کاریگەر و کوتلەییـەك کەپێکهاتەیـەکی زۆر یـەکێتی لەخۆ گرتووه و جیا نەبێتەوه بۆ چەند هۆکارێك دەگێرمەوه:

یەکەم: نەوشیروان هەمیشه رۆحێکی قوربانیدانی تێدایه و سـۆزێکی زۆر بەیەکێتییـەوه دەیبەستێتەوه، نایەوێت ئەو حزبەی خۆی دەستی لـه بنیـاد نانیـدا هـەبووه هـەر بەدەستی خۆی توشی پوکانەوەی بکات.

دووەم: روانینەکانی نەوشیروان بۆ هێزی بەرامبەر که پارتییه، نەوشیروان له رابردوشدا وەك هێزێکی نەیار له پارتی ڕوانیوه و بەشێکی زۆر ناکۆکییەکانی سەردەمی شاخ و شاریش دەخرێته ئەستۆی نەشیروان له نوسینەوه مێژووییەکانیشدا ئەمه بەدی دەکرێت، نەوشـیروان لەهەموو کاتێکیشدا و بەهەموو شێوازێك یەکێتی له پارتی پێ باشـتره، نەوشـیروان هـەرگیز ئامادەگی ئەوەی تێدانییه یەکێتی دوچاری بـچوکبونەوه و پوکانـەوه بکات و لەبەرامبـەردا ئەو هاوسـەنگییەی ئێـستا لـەنێوان یـەکێتی و پارتیـدا هەیـه، بـەلای پارتیـدا بـشکێنێتەوه و پـارتی بکاتــه هێـزی یەکـەم و گۆرەپـانی سیاسـی حـوکمرانی کردنـی لـه کوردسـتاندا پـێ ببەخشێت.

سێیەم: ئەوبیرەی کەلای نەوشیروان دروست بووه، کەلەوانەیه رۆژێك بێت بگەرێتەوه بۆ نـاو یـەکێتی و دەسـەلاتی ئـەم حزبـەی بکەوێتـه دەسـت، گەرچـی ئـەو ئەمـه بەلێقـەومان ناودەبات.

### کۆمپانیای وشه هیوایەکی تری نەوشیروان.

کۆمپانیای وشه دوایەمین هەولی نەوشیروان مستەفا بوو، بۆئەوەی بەشـێکی خەونـەکانی بهێنێتــەوه دی، بەشـێکی کـاری ئـەم لەئێـستادا وا دەرکـەوت روبەروبونـەوەی گەندەلێیـه، بەشـێکی کارەکـانی نەوشـیروانیش لــەم پرۆژەیــەدا کــاری رۆژنامەوانییــه، نەوشــیروان لەرابردوودا لەڕۆژنامەکاندا کاری باشی بۆیەکێتی کردووه، بەلام ئەوکارانـه لـه چوارچێوەی کاری حزبیدا بوون نەوەك رۆژنامەوانییەکی ئازاد ئەگەرچی لـەبواری نوسینەوەی مێـژووی رۆژنامەوانی کوردیدا نەوشیروان توانیویەتی خزمەتێك بکات، بـەلام ئـەم هەولانـه هێنـدەی ئەوەی دەچێته چوارچێوەی کاری کۆ کردنـەوه و نوسـینەوەی مێژووەوه ناچێته نـاو کـاری

ڕۆژنامەوانییەوە، بەپێی خوێندنەوەکانی ئێستاش نەوشیروان وەك سیاسییەك کاردەکات کەبەرژەوەندییەکی دیاریکراوی هەیە، وە کۆمپانیای وشەش دەکات بەفاکتەریك بۆئەوەی بەم بەرژەوەندییانە بگات، نەوەك نەوشیروان ڕۆژنامەنوسێکی بێلایەن بێتو هیچ کام لە سیاسیەت و کلتور و ئاین بەربەست نەبێت لەبەردەم کارەکانیدا و ئاراستەی کارە ڕۆژنامەوانییەکانی نەگۆڕێ.

بەرپرسەکانی یەکێتی بەتاڵەبانیشەوە دەڵێن: یارمەتی دەدەین، و باوەرناکەین کێشەی کادری ڕاگەیاندنی هەبێت، لەهەمانکاتدا خودی نەوشیروان مستەفا دەڵێت: لەرووی داراییەوە نە لەلایەن حوکومەتەوە و نە لەلایەن یەکێتییەوە دارایی ئێمە دابین نەکراوە و ناکرێت، هەوڵمانداوە ژێرخانی ئابوری پرۆژەکەمان دابین بکەین و باوەریشمان وایە تا سێ ساڵی تر بەبێ هیچ یارمەتییەکی حوکومەت درێژە بە پرۆژەکانمان دەدەین، لێرەدا ئەم لێدوانانە چاودێران توشی سەرسورمان دەکات، چونکە هەبوونی پەخشی کەناڵی ئاسمانی و کردنەوەی ئۆفیس لە پارێزگاکانی کوردستان و ڕۆژنامە وسایتی ئەلیکترۆنی و ناوەندێکی لێکۆڵینەوە پێویستی بەسەرمایەیەکی زۆر هەیە، بەپێی زانیارییەکانیش تائێستا هیچ کەسێکی بێلایەنی ئیداری بەشداری لە پرۆژەی کۆمپانیای وشەدا نەکردووە، گومانێك دروست دەبێت لەسەر سەرچاوە داراییەکانی کۆمپانیاکە و کاتێك گومان لەسەر کۆمپانیاکە دروست بووە، ئامانجە ڕۆژنامەوانییەکانی نەوشیروان وەك خۆیان ئاماژەی دەدەن، لێڵتر دەبێت و دەکرێت بیر لەئامانجێکی تری سیاسی بکەنەوە کەنەوشیروان دەیەوێت لەرێگەی کۆمپانیای وشەوە پێی بگات یاخود هەنگاوی بۆ بنێت، دەکرێت ئەمانە هەموویان گومان و پرسیاری ڕۆژنامەنوسییانە و چاودێرانی دۆخی سیاسی کوردستان بن، تا ئەوساتە وەختەی ڕوداوەکان خۆیان ئەرکەکان یەکلایی دەکەنەوە؟.

## کۆمپانیای وشه حزب نییه تاهەمووما بەیەك جۆر قسەبکەین

نەوشیروان مستەفا

لەوەڵامی چەند پرسیارێکی بزاودا نەوشیروان مستەفا هاتە وەڵام:

*** تۆئێستا کۆمپانیایەکی بەرچاو و چالاکی راگەیاندن بەرێوە دەبەیت، لەهەمان کاتدا خۆت بەتەواوی لەروناکی راگەیاندن پاراستووە ئەم دوانەیە چۆن تەفسیردەکەیت؟**

- راستە تارادەیەکی زۆر خۆم لە روناکی راگەیاندن پاراستووە، ئەویش لەبەرئەوەیە کە دامەزراوییەکەی ئێمە بەرنامەیەکی درێژخایەنی هەیە بۆ دامەزراندنی:

أ/ دوو دەزگای راگەیاندن بیستراو و بینراو و خوێنراو.

ب/ سەنتەری راپرسی.

ج/ دەزگایەك بۆ لێکۆڵینەوەی ستراتیژی.

پێم وایە زۆر وتنی من تەگەرە لەدامەزراندن و جێگر بوونی هەندێ لەو دەزگایانە دەدات. عەرەب پەندێکیان هەیە دەڵێ(اذا الكلام من الفضة فالسكوت من الذهب)

***- ووتارەکانی ئەم دواییەت لەبارەی فیدراڵیزم، ماددەی ١٤٠ و پەرلەمانەوە نا ئومێدی زۆرتان پێوە دیار بوون، لەکاتێکدا خۆت کاراکتەرێکی کاریگەری دارشتنی ئەو پرسانە بویت، سەرچاوەی ئەو نائومێدییە چییە؟**

- پێم وایە سەیرە نائومێدیتان خوێندبێتەوە لەوتارەکانی مندا بە پێچەوانەوە من گەشبینم بەرامبەر بەرەوتی رووداوەکان و شانازی دەکەم ئەگەر دەورێکم هەبوبێت چەند بچوکیش بوبێ، لەرەخساندنی هەلومەرجی دامەزراندن لە دامودەزگاکانی هەرێمی کوردستاندا بەلاّم من بەئەرکی نیشتمانی خۆمی دەزانم سەرەنجی گەلەکەم رابکێشم بۆهەندێ بابەتی چارەنوسساز و ئەوەندەی لێی بزانم، هۆشیارییان بکەمەوە لەو مەترسی و کەم و کورییانەی هەن .

***- سالار عزیز لەدیدارێکی بزاودا دەڵێ هێشتا ئێمە کوری تەنگانەی رۆژی سەختی یەکێتین رەوایە ئەگەر بڵێین پرۆژەی کۆمپانیای وشە هەر لەفەلەکی فراوانی یەکێتیدایە؟ یان بەموجەرەدی پرۆژەیەکی رۆشنبیرییە؟**

- کۆمپانیای وشه حزب نییه تاهەمووومان بەیەك جۆر قسەبکەین، ئێمە بیر و رای جیا جیامان تێدایه و رێزی بیر و بۆچونی یەکتری دەگرین و لەیەکتری قبول دەکەین ئومێدم وایه پرۆژەکەمان ببێته پرۆژەیەکی نەتەوەیی، کەسانی سەربە بیرو باوەری جیاواز کاری پێکەوە تێدا بکەن.

***- کەسێك بەئێمەی وت شەش ساڵ بەر لەئێستا کاك نەوشیروان بیرۆکەی کۆمپانیای وشەی هەبووە دواکەوتنی تا ئێستا تەفسیرێکی سیاسی هەیە؟**

- راستە چەندساڵ پێش ئێستا بیرم لەم پرۆژەیەکردبووەوە بەڵام بەرلە هەل و مەرجی ماددی سیاسی نەم توانی جێبەجێی بکەم، ئەمساڵ ئەوە هەلم بۆ رەخسا.

## گردەکە لەهەوڵی تێکدانی قەلاچۆلاندایە،
## نەوشیروان مستەفا، ئەندازیاری هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی

دلێر عبدالله

ئەوانەی دروستیان کردووە ئاشنان بە پێکهاتەکەی بۆیە تێکدانەوەی ئەوەی پێکیان هێناوە بەدەستی خۆیان ئاسانترە لەوەی چەکی قورسی لەبەرامبەردا بەکاربهێنی تاکو لاوازی دەکەیت یاخود دەیروخێنی، ئەندازیارێکی ئەو وێرانکارییەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان نەوشیروان مستەفایە، ئەویش هەرجارەی گروپ و کەسانێك دەکاتە خەڵکانی ئەو هەڵەیە، لە نزیکترین مێژوودا دەستی پێکرد، پاش ماوەیەك کەسانێکی بۆ پەیدا بوو، لەنوێترین هەوڵیدا(عمری سید علی و مستەفای سید قادر و جەلال جەوهەر و عوسمانی حاجی مەحمود)ئەو دەورەیان بینی بەلام ئەمانیش شکستیان هێنا لەوەدا کە کۆسرەت رەسوڵ رازی بکەن یەکێتی تەلاق بدات و بێتە لای نەیارە کۆنەکەی(نەوشیروان مستەفا)کە هەرگیز پێکەوە ناژین.

ئەو یەکێتییەی بە قولەی قاف ناسرابوو، ئێستا نەوشیروان مستەفا ئەمینی دامەزرێنەری نەخشەی تۆکمەی لێکترازان و لەبەین چوونی دەکێشێ و بەزیندوویی ئەیانەوێ لەچاڵی بنێن.

### یەکێتی پێکهاتەیەکی جیاوازە

یەکێتی نیشتمانی کوردستان(ینك)ساڵی(١٩٧٥)لە(بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان – ساڵح یوسفی و کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان – نەوشیروان مستەفا و خەتی پان – مام جەلال)دروست بوو، لەساڵی ١٩٨٤ خەتی پان لەگەڵ کەرتێکی بزوتنەوەی سۆسیالیستی پاش جیابونەوەی باڵە بنچینەییەکە لێی کە هێشتا لەناو (ینك)دا مابویەوە ، یەکیان گرت و یەکێتی شۆرشگێرانی کوردستانیان پێکهێنا لەو ساتەوە(ینك)لە کۆمەڵە و شۆرشگێران پێکهاتووە، واتا کەسی یەکەم تاڵەبانییە و نەوشیروانیش بە کەسی دووەم دەزانرا.

ناوی شۆرشگێران دەگەرێتەوە بۆ ساڵی(١٩٧١)و پەیوەندی بەپەیمانی(١١) ی ئازاری جەزائیرەوە هەیە. پاش تێکچونی براهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی لەگەڵ مستەفا بارزانی

له(١٩٦٤/٤/٩)دا لەماوەت کە ئەوکاتە کۆنفرانسێکیان بەست و ڕێککەوتنی نێوانی(بەرزانی و عارف)یان ڕەتکردەوە و بەرزانیان لەسەرکردایەتی لابرد.

## یەکێتی نیشتمانی و باڵە ناکۆکەکانی

یەکێتی نیشتمانی کوردستان وەك هێزێکی سەرەکی گۆڕەپانی سیاسی کوردستان، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریگەری بۆسەر پرۆسەی سیاسی کوردستان و بگرە عێراقیش هەیە، بەهێزی و پتەوی ئەو پارتە لەئێستادا تارادەیەکی زۆر کاریگەری ئەرێنی لەسەر دۆزی کورد بەجێ دەهێڵێت و بەپێچەوانەشەوە لاوازی و لێکترازانی ڕەنگە دۆزی کورد و بەرپرسە چارەنوسساز و هەنوکەییەکانی بەئاقارێکی خراپدا بەرێت، ئەمەش بەوپێیەی یەکێتی لەهەردوو پرۆسەی سیاسی عێراق و کوردستاندا ڕۆڵێکی کاریگەر و بەردەوامی هەبووە.

کێشە و گرفتە ناوخۆییەکانی ئەم دواییەی یەکێتی بەجیابونەوە و لێکترازانی چەند ئەندامێکی باڵاو پێشترش لە ٢٠٠٦ بە ئیستقالەی نەوشیروان مستەفا، لەسەر ئاستی ناوخۆیی و دەرەکیش لێکدانەوەی جیاجیای بۆ کرا، زۆرێك لە بۆچونەکان تەقینەوەی کێشەکانی یەکێتی لەکاتی ئێستادا جگەلەوەی بەمەترسی بۆ سەر پرۆسەی سیاسی کوردستان شرۆڤەدەکەن بەحاڵەتێکی ترسناك لەمێژووی خەباتی سیاسی ئەو حزبە لەقەڵەمی دەدەن، کە ساڵانێکی درێژە لەچەندین قۆناغدا ئەنجامی داوە.

## ماڵی یەکێتی لە ئاشتیدا وێران دەبێت

بەرای چاودێران و شارەزایانی سیاسی و تەنانەت خودی سەرکردەکانی یەکێتی، کێشە و گرفتەکانی ناوخۆی یەکێتی جگەلەوەی ڕەگێکی لەمێژینە و قوڵی هەیە، بۆ ململانێی سیاسی و کێبەرکێی دەسەلآت و قەڵەم ڕەوی دەگەڕێتەوە، کەئەندامە باڵاکانی ئەو پارتە یان باشتر بڵێین باڵە ڕکابەرەکان دەستیان داوەتێ، ئەوەتا ((د. بەرهەم صالح )) جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی لەمیانەی لێداونێکدا جگەلەوەی کێشە و گرفتەکانی یەکێتی بەئاسایی لەقەڵەمدا. ئەوەی ڕاگەیاند کە(ململانێی گەیشتن بەدەسەلآت و بەرژەوەندی تاك ڕەوانە کەبەشێکن لەگەندەڵی ئیداری و دارایی و پێشێلکردنی یاسا لەلایەن هەندێ کەسەوە، فاکتەرێکی سەرەکی ئەو کێشە و گرفتانەن کە ڕوبەڕوی یەکێتی بونەتەوە ).

یەکێتی جیاوازە لە حزبی دایك کە پارتی دیموکراتی کوردستانە، دروست بوون و دامەزراندنی لە چەندین ڕەوت و بیر و بۆچونی جیاواز پێکهات کەدواتر لەگەڵ توانەوەی

زۆرێکیش لەو بۆچوونانە پێکهێنەرەکان، نەتوانرا کێشە و راجیاوازەکان لەناو یەکێتیدا کۆتاییان پێ بهێنرێت، بەڵکو هەمیشە بەزیندوویی دەمانەوە و زۆر جاریش هێندە قوڵ دەبونەوە و مەترسی لێکترازان و پارچەپارچە بوون بەرۆکی دەگرت، کەئەگەر بێت و شەڕی نێوخۆ و گرژی و ئاڵۆزی حزبە کوردستانییەکان و دۆخی تایبەتی هەرێمی کوردستان نەبوایە، باڵە ناکۆکەکانی یەکێتی هەرزوو بریاری یەکلایی کەرەوەیان دەدا.

لەم بارەیەوە بەرپرسێکی پایە بڵندی یەکێتی کە نەی ویست ناوی ئاشکرا بکرێت ئەوەی بەرێگا راگەیاند (شەری نێوخۆ لەگەڵ ئەوەی بەزیانی یەکێتی و تەواوی پارتە کوردییەکان کۆتایی هات، بەلاَم لەلایەنێکی ترەوە سودی بە یەکێتی گەیاند و بەو هۆیە ریزەکانی هەمیشە تۆکمە و بەهێز دەبوون، هەربۆیە یەکێتی هەمیشە ساناترین هەلی دەقۆستەوە بۆئەوەی شەر لەگەڵ بەرامبەرەکانی بەلاَم بەتایبەتی پارتی هەڵگیرسێنێ تابەو هۆیەوە دوو نیشانە پێك بهێنن، یەکەمیان کێشە و ناکۆکی باڵەکان وەلا بنێت و خۆی لەو مەسەلانە قوتار بکات، دووەمیش هێزی خۆی بسەلمێنێت و کۆنترۆڵی بەشێکی زۆری حوکمرانی کوردستان بکات ). بە بۆچونی چاودێرانی سیاسیش باشترین کاتێك کەیەکێتی ریزەکانی تێدا پاراستووە، شەر و پێکدادانە ناوخۆییەکان بووە، بەمانایەکی تر یەکێتی هەرگیز لە ئاشتیدا خێری لە خۆی نەدیوە ئەو کێشانەی بۆ قوت بۆتەوە کە بەهۆی ململانێ و ناکۆکی باڵەکانی ناوی بوونی هەبووە، هەروەك ئێستا کەبەزەقی کێشە و گرفتەکان دەبینرێن

## نەوشیروان مستەفا سیاسییە رادیکاڵەکە

نەوشروان مستەفا وەك ئەوەی کۆمۆنیستەکان لەبەرامبەر کوشتنی چەندکادێراندا لەسلێمانی پێی دەڵێن " هەرچەندە هەوڵی ئەوەبدەیت وەك مێژوو نوس یان نوسەر ناو زەند بکرێی هەر ئەهلی شمشێریت و بەتەور خەڵکت کوشتووە "، ئەمە یەکێکە لەقورسترین ئەو رستانەی کەتاکو ئێستا بە نەوشیروان وتراوە، بەلاَم لەئێستادا ناوبراو وەك گەمەکەرێکی سەرەکی و باڵێکی زەقی ناکۆکییەکانی نێوخۆی یەکێتی، لە دامرکاندنەوە نوێبونەوەی کێشە و گرفتەکانی یەکێتی رۆڵێکی بەرچاو و کاریگەری هەبووە و زۆربەی کێشەکانی یەکێتی تا رادەیەکی زۆر بەم کەسایەتییەوە پەیوەستە و بەپێی قۆناغە جیاوازەکانە ململانێ و سیاسی و سەربازیانەی باڵەکانی نێو ئەم پارتەش نەوشیروان مستەفا – دیار – ترین جەمسەرە ناکۆکەکان بووە.

نەوشیروان مستەفا ئێستە حزبی نییە و کۆمپانیای هەیە بەناوی وشە، ئەو وشەیەی کەدەیەوێت یەکێتی پێ سەربڕێت، جاران ئەگەر لەگەڵ نەیارەکانیدا تفەنگی بەکارهێنابێت، ئەوا ئەمرۆ بە وشە روبەڕوی مێژووی حزبەکەی خۆی بۆتەوە و ئەندام و سەرکردەکەی لێدەکاتەوە.

**نەوشیروان نەیتوانیوە بەرامبەر لێزانییەکانی تاڵەبانی هەڵبکات.**

نەوشیروان مستەفا لەگەڵ ئەوەی لەسەرەتای تێکەڵ بوونی هەرسێ باڵی(کۆمەڵەی رەنجدەران و خەتی گشتی و بزوتنەوەی سۆسیالیست)وەك نەیارێك خۆی نیشاندا و بەئامانجی ئەنجامدانی چاکسازی لە ریزەکانی یەکێتیدا سەرکردایەتی باڵێکی گرتە ئەستۆ، نەیتوانی بەرامبەر لێزانی و ئەزمونی تاڵەبانی بەردەوامی بداتە جێبەجێکردنی سیاسەتەکەی هەر بۆیەشە بەناچاری کۆڵی لەو هەوڵەیدا و بەنیازی پراکتیکی هەوڵەکانی بەشێوازێکی دی و لەقۆناغێکی تردا بەرکابەریکردنی تاڵەبانی پاشەکشەی کرد و لەو ململانێ سیاسییە خۆی کێشایەوە کە ساڵانێکی دور و درێژە لە پێناو گەیاندنی یەکێتی بە قۆناغێکی دی دەستی داوەتێ.

هەروەك(پرۆفیسۆر دلاوەر عبدالعزیز)ئاماژە بەوە دەکات کە(تاڵەبانی توانیویەتی ئیدارەی کوتلەکان بەجۆرێك بکات کە لەتوانا و دەسەڵات و هەیبەتی خۆی کەم نەکاتەوە. هەرکاتێك گەشەنەکردنی پێکهاتەیەك وەیان کوتلەیەکی دیاریکراوی ناویەکێتی گەشتبێتە رادەی مەتری بۆی. ئەوا لەدەسەڵات و جموجوڵی سەرۆك کوتلەکەی کەمکردۆتەوە کادیرەکانی سەربەکوتلەکەیشی کردۆتە قۆچی قوربانی لە هیچ کاتێکدا ئەو جۆرە ئیدارەکردنەی ئاسان و ئاشتیانە نەبووە، بەڵکو لەزۆر بەی حاڵەتدا بووەتە مایەی کرژی و تەشەنە کردنی ڕەشبینی و رۆحی یاخی بون. خۆ لەساڵانی ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٤ تاڵەبانی سەرۆك و کادرە پێشکەوتووەکانی هەردوو کوتلەکەی تری خستبوو، دەسەڵاتی لەدەست دەرهێنا بوون. ئەوەیش بووە هۆی زویر بوون و یاخی بوونی تەواوی دوو کوتلەکە و بووە هەوێنی هەوڵە کودەتاکەی ساڵی ٢٠٠٤ کەلەجیاتی ئەوەی تاڵەبانی لەدوای ئەو روداوە مەترسی دارە بە سیاسەتەکەیدا بچێتەوە و کوتلەکاری لە بنەرەتەوە نەهێڵێ، کەچی بەردەوام بوو لە جۆشدانی هەمان رەوت و کوتلەکاری گەیاندە ئاستێکی مەزنتر و کرژتر ).

بەرای چاودێرانی سیاسی هاتنە دەرەوەی نەوشیروان مستەفا لەیەکێتی، سەرەتایەك بوو بۆ زەق بونەوە و دەرکەوتنی راستەقینەی کێشە و گرفتەکانی ئەو پارتە و جگە لەوەی چاو

کرانەوەی زۆرێك لە سەرکردە و کوتلەکانی تری بەدوای خۆیدا هێنا، یەکێتی گەیاندە قۆناغێك کەسەرەتای مەترسییەکانی لێك ترازانی لێ بەدی دەکرێت و هیچ کەس متمانەی بە پێکەوە ژیانی ناو ریزەکانی یەکێتی نەماوە.

## نەوشیروان مستەفا دەیەوێ یەکێتی بۆ خۆی هەڵبووە شێنێتەوە

نەوشیروان مستەفا پێگەی خۆی لەگردەکەوە بەجۆرێکی تر بەهێزکرد، ئەو گردەی کە هەرکەس لەنێو ریزەکانی یەکێتی بەجۆرێك بێت بتۆرێ یان دەربکرێت لەسەر هەرچییەك بێت، دەچێتە گردەکە و بەرد بەسەر یەکێتیدا فرێ دەداتە خوارەوە، هەرماوەیەکیش کونێك دەکاتە جەستەی یەکێتی و پارچەیەکی لێدەکاتەوە.

ئەوەتا پاش دەست لەکارکێشانەوەکەی چەندان گروپ و رێکخراوی بچوك هەڵتۆقین و وەك کاردانەوەیەك بەرامبەر سیاسەتەکانی تاڵەبانی و باڵەکەی کاری سیاسی خۆیان بەرەو دەرەوەی یەکێتی گواستەوە. کەلەوەش خراپتر و مەترسیدارتر بۆ یەکێتی هاتنەدەرەوەی کوسرەت رەسوڵ و پاشان چوار ئەندام مەکتەب سیاسی و ژمارەیەکی زۆر ئەندامانی تر بوون.

چاودێرێکی سیاسی ئەوەی راگەیاند کە دەست لەکارکێشانەوەی چوار ئەندامە باڵاکەی یەکێتی(مستەفای سەیدقادر و عمر سید علی و عوسمانی حاجی محمود و جەلال جەوهەر)کەسەر بەباڵی ریفۆرمی نەوشیروان مستەفان، جگە لەوەی پەیوەندی بەدۆخی ناجێگیری یەکێتییەوە هەیە، پەیوەندی بەو پرۆژەوە هەیە، کە نەوشیروان مستەفا بۆ داهاتوو گەلاڵەی کردووە و دەیەوێ یەکێتی و پارتی ناچاربکات مامەڵە لەگەڵ لیستەکەی بکەن بۆ هەڵبژاردن و لەهەوڵی ئەوەشدان زۆرترین لایەنگر و ئەندام لەدەرەوەی خۆیان کۆ بکەنەوە، تا پێی بگەنە پەرلەمان، ئەم قۆناغەی لێدانی یەکێتی درێژە پێدەری هەوڵی چاکسازی یەکێتی و ململانێی تاڵەبان و باڵەکەیەتی لەلایەن نەوشیروانەوە.

لەگەڵ ئەوەی چوار ئەندامەکەی مەکتەب سیاسی یەکێتی هۆکاری دەست لەکارکێشانەوەکەیان بۆ نەبونی شەفافیەت و پێشێلکردنی دیموکراسیەت و گەلێ هۆکاری تر دەگێرنەوە، هەروەك جەلال جەوهەر لەمیانەی لێداوانێکدا ئەوەی راگەیاند کەبنەمای دیموکراسی لەناو یەکێتیدا بەتەواوی پێشێل کراون و رێ بەئەنجامدانی چاکسازی نادرێت، بەلام بەرای زۆرێك لە چاودێران ئەمە هۆکار و پاساوی سەرەکی ئەوان نییە، بە پێچەوانەوە پێگەی ئێستای نەوشیروان مستەفا و ئەگەری دامەزراندنی لیستی سەربەخۆ بۆ

هەڵبژاردنەکانی داهاتوو پاڵپشتییەکی سەرەکی بوو، بۆ ئەوەی ئەوان لەیەکێتی بێنە دەرەوە پاشەکشە بکەن، چونکە ئەندامە دەست لەکارکشاوەکان دەیانەوێت لەدەرەوەی یەکێتی ببنە پاڵپشتی نەوشیروان مستەفا و لە پرۆسەی هەڵبژاردندا هاوکارێکی باشن بۆی، چونکە ئەوان لەناو یەکێتیدا پێگەیان لاواز بوبو. هەرئەوان بوون لەدەست لەکارکێشانەوەی نەوشیروان مستەفادا هێرشیان کردەسەر نەوشیروان بەوەی پلانی دەست بەسەراگرتنی یەکێتی لە کۆنفرانس دا سەری نەگرت، بۆیە نەوشیروان شکستی خوارد ئەو خەڵکەشی بەهەتیوی لەناو یەکێتیدا جێهێشت بەجۆرێك زۆربەیان لەپۆستەکانیان وەلانران، ئەمە تۆڵەی دەرئەنجامەکانی شکستی پێشووی باڵەکەیەتی کە بەریفۆرم ناسراوە بەڵام کاتێك دەستی پێکرد کە نەوشیروان بووە بەخاوەنی رۆژنامە و تەلەفزیۆن و کۆمەڵێك کادری دەرکراوی ناو یەکێتی.

## نەوشیروان ئیستقالەی بە ٤ ئەندامەکە کرد

لەلایەکی ترەوە زۆرێك لەچاودێرانی سیاسی پێیان وایە نەوشیروان مستەفا لە دەست لەکارکێشانەوەی ئەو ئەندامانە رۆڵێکی باڵای هەبووە و ئێستاش سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئەو ئەندامانەیە کەبەهۆکاری جیا لەریزەکانی یەکێتیدا نەماون، یاخود دەرکراون، وەك چۆن لەهەوڵی هێنانەدەرەوەی ئەندامانی ناویەکێتیدایە لەسەرجەم ئۆرگان و ئاستە جیاوازەکان ئەمەش وەك کارتی فشار بەکاردەهێنێ، ئامانجیش لێی دەست لەکارکێشانەوەی تاڵەبانییە.

نەوشیروان بۆیە ئەمە دەکات تا لەو رێیەوە پێگەی سیاسی خۆی لەهەڵبژاردنەکانی داهاتوودا بەهێز بکات و بەشێوەی پراکتیکی ئەو پرۆژە سەرنەکەوتووەی تەواو بکات، کە ساڵانێکی زۆر و بەهۆی نەیاری تاڵەبانی لە یەکێتی بۆی نەچووە سەر، بەواتایەکی تر نەوشیروان مستەفا وەك ئەندازیارێك دەیەوێت رۆڵی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی بگێرێت و تەواوی ئاراستە و هاوکێشەکانی یەکێتی بەلای خۆیدا پێچەوانە بکاتەوە.

## کێ وای لەکۆسرەت رەسوڵ کرد؟

ململانێی کوڕ کەببێتە پشتی باوك، لەناویەکێتیدا بەشێوەیەکی نارێك و دور لەگیانی یەکتر قبوڵکردن دەست هاتۆتە پێش، ئەمرۆ ئەوەی بیەوێ لەناو حزبی کوردی دا بمێنێتەوە و دەوری قەرەبالغ بێت، پێویستە کورەکەی یان خزمەنزیکەکانی لەپۆستەباڵاکانی حزب نزیك بکاتەوە تاوەکو هیچ تەکەتولێك نەتوانێ بەسەریدا زاڵ بێت، نەوشیروان کورەکانی بۆ گەورەبووە ئێستا خاوەنی کردێك و راگەیاندنە، تاڵەبانی کور و

برازای زۆر بۆ گەورە بووە و رۆڵی گرنگیان بۆی هەیە، کۆسرەت کورەکانی هێناوەتەوە و کردونی بەدەسەڵاتداری ماددی و مەعنەوی، ئەوانەی تریش کەماون لەرێگەی خۆپڕچەککردن، و دروستکردنی فەوجی عەسکەرییەوە پێگەی خۆیان قایم کردووە، تاکو لەکاتی روبەروبونەوەی مەترسیدا بەکاری بهێنن لەنێوان ئەم کێشە کۆن و دژوارانەی یەکێتیدا نەوشیروان کاری لەسەر راکێشانی کۆسرەت رەسوڵ کرد بۆ هێنانە دەرەوەی لەناو یەکێتی بەچوونە بن کلێشەی ئەو ٤ ئەندامەی مەکتەب سیاسی و بەهێزکردنی پێگەی کۆسرەت رەسوڵ لەدەرەوەی یەکێتی نەك لەو مەکتەب سیاسییەدا کە ئەگەر ٤ ئەندامەکەی ریفۆرمی لێ نەمێنێ ئەوا کۆسرەت رەسوڵ بەتەنها دەمێنێتەوە، ئەوکاتە ئیحتیواکردنی زۆر ئاسان دەبێت ئەوەبوو رازییان کرد دەست لە کاربکێشێتەوە بەچونی بۆ بەغدا و بینینی تاڵەبانی، کۆسرەت لەگەمەکە تێگەیشت و پاشگەز بویەوە لە ئیستقالەکەی.

**یەکێتی بەرەو کوێ و بۆکوێ؟**

چارەسەری کێشەکان روو لەمەسەلەی بەکارهێنانی هێز دەکاتەوە، چونکە گۆرانکارییەکان هەمان تاس و هەمان حەمام دێنێتەوە پێش و گۆرین پۆستەکان نابنە گۆران بۆ چاکسازی، چونکە لەئەمرۆی یەکێتیدا هەر کەسێك پۆستێکی وەرگرتبێ، لێسەندنەوەی بۆ خۆی گرفتێکی تر دێنێتە پێشەوە، باڵی ریفۆرم دەیانەوێ هەرکەسی خۆیان لەپۆستێکداماوە بەرزتری بکەنەوە، ئەوەشی کە شوێنی نزمە بەفشاری گردەکە بیکەنە پلەداری کاریگەر – بۆئەوەی دەست بەسەر یەکێتیدا بگرنەوە، ئەمەش تەقینەوەیەکی تر لەناو یەکێتیدا دەخولقێنێ و هەر رۆژێك بێتە دەقلێشێتەوە، قلێشانەوەیەك کەسەرجەم کورد زیانی بەردەکەوێ.

زۆرێك لەخەڵکی جۆراو جۆر پێی وایە ئەم قەیرانەی ئەمرۆ یەکێتی بەشێکی زۆری بۆ داواکردنی ئیمتیازات و وەرگرتنی پۆستی بەرزترە، هیچی لەبەرامبەر کێشەکانی خەڵکیدا نییە، کە زۆر گەورە ترە لەبیانووەکانی نەوشیروان مستەفا لە بەرامبەر یەکێتی، بەلام میللەت هەتیو و بێ خاوەنە و ئەوەی خۆی بەشوانی دەزانێ گورگە.

ئەگەرنا گۆرینی عمر فتاح هیچ لەمەسەلەکە ناگۆرێ کەلە بری ئەو عماد احمد داندراوە ئاڵو گۆری تریش بەهەمانشێوەیە.

## گردەکە دەیەوێ قەڵاچوالان بروخێنێ

گردەکە بۆتە ناوێکی نوێی نێو گەمەی سیاسی ئەمرۆی ناکۆکییەکانی ناو یەکێتی و دەوتریْ زۆرکات هێندە قەرەباڵغە پاڵەپەستۆیە، هەرچی دەرکراوە و دڵی نیگەران بووە و پۆستی نەماوە ڕوو لەو گردە دەکات، گردەکەی زەرگەتە ئەو گردەی نەوشیروان مستەفا بۆخۆیی و کۆمپانیاکەی دەستی بەسەرداگرت، ئەمجارە نەخشەی لێدانی یەکێتی لێدانێك کەبەردڵی دەکەوێت و توشی جەڵدەی دەکات، لە گردەکەوە نەخشەی دادەنرێ، نەخشەیەك کەماوە بەماوە کۆمەڵێك هاندەدرێ بەوازهێنان و پێشکەش کردنی پرۆژەی چاکسازی، ئەندامێکی باڵای یەکێتی کەناوی خۆی ئاشکرا نەکرد، وتی: چاکسازی ئەگەر دەست پێ بکات دەبێت لە باڵی ریفۆرمەوە دەست پێ بکات، کەئەوانەی لەدەوری کۆبونەتەوە خەڵکانی تۆمەتبارن بەزۆرشتی وەك گەندەڵی و زوڵم و خراپەکاری و لەمرۆدا هانایان بۆ گردەکە بردووە بەبیانووی ئەوەی سەربە کاك نەوشیروانە و دەرکراوە، نان براو بووە، بۆیە ئامادەیە لەگردەکەوە دەست بەو پرۆژەبکات کە پرۆژەی روخاندنی قەلاچۆلانە.

ئەمەش مەحاڵە لەجێبەجێ بوونیدا ئەگەری رژانی خوێن دێتە ئاراوە کە پێویستە خەڵکی پاك و دڵسۆز دەست و دەمی لێ بەدور بگرن، و هەوڵی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە بدەن و لەسەر لێبوردەیی و پێکەوە ژیان مومارەسە بکەن نەك لەسەر ئەوەی چۆن بتوانن ئێسکی یەکتری ورد و خاش بکەن، بەڵام ئەمرۆ ئەوەی بەهێزترین(پیك)لەسەری یەکێتی بدات، ئەوە لەگردەکە لە پێشەوە قسەدەکات و نۆرەی دەرکەوتنی زیاترە.

## ئەگەر یەکێتی وەك حزب لێك بترازێ کێ زیان دەکات؟ تاڵەبانی یان باڵەکانی تر؟

کێ سود دەبینێ، پارتی یان نەوشیروان مستەفا؟ ئەندامانی خوارەوەی یەکێتی سود دەبینن یان زیانی گەورەیان بەردەکەوێ؟ خەڵکی کوردستان چی سودێك دەبینێ؟ زیان دەکات یان تووشی گیرۆدەیی ئابوری و سیاسی دەبنەو؟.

ئەی دۆزی کورد چی زیانێك دەکات کەتەوازونی هێزی سیاسی و سەربازی لەم وڵاتە روو لەشکست بکات؟ ئەی سەرۆك کۆمار لەبەغدا چی رۆڵێکی دەمێنێ؟.

ئایا پارتی وەك تەنها هێزێك دەمێنێتەوە و هێندەی تر کۆنترۆڵی ئابوری و روبەری جوگرافی و حوکومەت دەکات؟ ئایا حزبەکانی تر لەکاتی لاوازبوون و هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیدا بەم جۆرەی ئێستا دەمێننەوە؟ یان دەبێت لەمەی ئێستا زیاتر موعاناتی حیساب بۆ نەکران بچێژن؟ ئەمانە هەموو ئەو ئەگەر و پرسیارانەن کە روو لەناوچەکە دەکات ئەگەر یەکێتی نیشتمانی توشی لێکترازانی نێوخۆیی بێت.

## دوای مام جەلال ناکۆکی کوتلەکانی نێو یەکێتی بە خوێنڕشتن چارەسەر دەکرێ

تایبەت: بەرێگا

نەوشیروان مستەفا خۆی بەسکرتێری خەڵکە باشەی کەی ناو یەکێتی نیشتمانی دەزانێ و چاوەڕێی ئاوابوونی خۆری مام جەلالە بۆئەوەی ببێتە سکرتێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان. زۆر جار باس لەوە دەکرێت کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان لە قەیراندا ژیان بەسەردەبات، بەهۆی ئەو باڵباڵێن و تەکەتولاتەی ناوخۆیەوە، ئەمە لەکاتێکدایە کەئەم حزبەتەمەنی ٣٣ ساڵی بەسەر بردووە یەکێك لەو ئاماژانەی کە بارودۆخی ئەم حزبەی شێواند دەست لەکارکێشانەوەی نەوشیروان مستەفای جێگری تاڵەبانی بوو، هەرچەندە زۆرێك پێیان وایە مانەوەی ئەم حزبە بەوشێوەی ئەمرۆی بەندە بەمان و ژیانی تاڵەبانییەوە، زۆرێکیش پێیان وایە لەم قۆناغەدا تاڵەبانی تەنها رۆژگار بەرێدەکات و سیاسەتەکانی تەسلیمە بەویستی پارتی دیموکرات.

جگە لەم ئەگەرانە تاڵەبانی زۆرکات توانیویەتی ئاو بەئاگر و ناکۆکییەکانی ناو یەکێتیدا بکات ، هەرچەندە ئەو ئاگری ناکۆکییەی ناویەکێتی بەردەوامە هەر بوونی هەیە لەژێر کادانی سیاسی ئەو حزبەدا هاکا شەماڵێك ئەو ئاگرەی گەشاندەوە و تەواوی باڵەکان و جەستەی یەکێتی سوتاند.

یەکێك لەو بەرپرسانەی نێو یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەناوی خۆی بلاۆنەکردەوە زانیاری وردی داوە بە رێگا، دەربارەی بارو دۆخی ناویەکێتی نیشتمانی کوردستان.

ئەو بەرپرسە باسی دوای ئەنفالی کرد کە ئەوکات یەکێتی لەروی لایەنی سەربازی و مادییەوە زۆر لاواز بوو، چونکە بەناوخۆدا لەگەڵ یەکتری ناکۆك نەبوون جیاوازیمان هەبوو بەڵام بەم رادەیە قووڵ نەبوو ئاشکراش نەبوو، ئەمرۆ واهەست دەکرێ کەتاڵەبانی کێشەکانی لەدەست چوبێت و بۆی چارەسەر نەکرێت هەرچەندە تاڵەبانی هەرگیز نایەوێ توشی شکست بێت.

ئەو وای بۆدەچێت کێشەکانی ناو یەکێتی لەنەخۆش کەوتنی تاڵەبانی و بوونی سەرەك کۆمار و چوونی بۆ بەغداد رووی لە زیادی کردووە، فرەکوێخایی لەناو یەکێتیدا روو

لـەزیادی دەکـات و گەنـدەڵی هێنـدەی تـر وڵات وێـران دەکـات نـەبوونی لێپرسـینەوەش ئەوەندەی تر کێشەکانی هەڵسپاردووە.

ئـەو بەرپرسـە نیگەرانـە لـەوەی کـەباس لـە کـۆنگرە دەکـرێ چـونکە پێـی وایـە بـێ بەرنامەییە سازکردنی کۆنگرە لەو بارودۆخەدا کەیـەکێتی پربـووە لـە کوتلـە و کوتلـەکاری، ئەو پێی وایە بەستنی کۆنگرە هەڵەیەکی کوشندەیە کە تێیدا بـارو دۆخـی مـەنگی نـاوخۆی یەکێتی دەتەقێتەوە. لەلایەکی ترەوە ئەو بەر پرسە بالآیـەی یـەکێتی نیشتمانی کوردسـتان نیگەرانە لەو نەرمی نواندنەی تاڵەبانی بەرامبەر پاشماوەکانی بـاڵی ریفـۆرم لەناویەکێتیـدا بـریتین لـە(مـستەفای سـەیدقادر و عمـر سـید علـی و عوسمـانی حـاجی محمـود و جـەلال جەوهـەر) کەلـە ئێـستادا بـاڵی ریفـۆرم لـەناو یەکێتیـدا لـە جـاران زۆر بـەهێزتـرن و کاریـان ئۆرگـانیزە کـردووە و دەسەلآتیـشیان بەدەسـتەوەیە وەك چـۆن عوسمـانی حـاجی محمـود وەزارەتی ناوخۆی لەبەر دەستایە و ئەگەر پۆلیـسێك ریفـۆرم نـەبێت یـان کەسـانی ریفرمـی سـەربە مەڵبەنـد و کۆمیتـەکان تەزکیەنەکـەن دایاننامـەزرێنێ یـاحود ئەوانـەی سـەربەباڵی ریفۆرم نەبوون هەموویان ئیهانەکردن، یان وایان لێکردن شوێنەکانیان بگوێزنەوە.

دەربارەی ئەوەی نەوشیروان مستەفا ئێستە خەریکی چییە لـەناو یەکێتیـدا ئەوبەرپرسـە باسی لەوە کرد کە نەوشـیروان مـستەفا پاراسـتنی نهێنـی هەیـە و ناوچـەکانی دابەشـکردووە بەسەر کەسانی دڵسۆزی خۆیـدا هەیکـەلێکی وەك بـەدیل لێ دروسـت کـردوون، تـاکو لـەکاتی ئێستادا بەکاریان بهێنێ.

هەرچەندە قورسایی نەوشـیروان لـەناو سلێمانیدایە و دوور نییـە لاوازبـوونی یەکێتیـشی لەشاری هەولێر پێ ئاسایی بێت لەم کاتەدا.

ئەو یەکێتییەی کە هەولێری لەژێر دەستدا بوو، هەیمەنەی کۆسرەت رەسوڵ باڵی بەسـەر سلێمانیدا کێشابوو، بـەڵام ئـەمرۆ هـەولێر ببینـە نـەك کۆسـرەت رەسـوڵ نەگەرایـەوە نـاوی بەڵکو تەواوی هەولێر بگـەرێی بەدەگمـەن وێنەیـەکی تاڵـەبانی دەبینـی بـۆ فرۆشـتن ئـەوەی هەیە هەر مەلا مستەفا و مسعود بارزانی و نێچیرەڤان بارزانییە.

لەم دۆخەدا نەوشیروان مستەفا بەبۆچـونی ئـەو بەرپرسـە چـاوەروانی ئـاوابوونی خـۆری تاڵەبانییـە، وەك چـۆن لـەناو مەکتـەب سیاسی یەکێتیـدا کـەس نییـە لەئاینـدەی یـەکێتی دڵنییابێـت، وەك چـۆن فەریـد ئەسەسـەرد دەڵـێ: (ئەگـەر یـەکێتی چارەسـەری کێـشە و قەیرانـەکانی خـۆی نـەکات دەبێتـە بەشـێك لەمێـژوو) لـەناو یـەکێتی نیشتمانیدا چەندین

راستە بونی هەیە، لەولاوە(د. بەرهەم)گۆشەگیر کراوە. هەڵۆی ابراهیم احمد ئاراستەی یەکبونی پێکهێناوە و نیگەرانە لەو هەموو گەندەڵییە و دورنییە نەوشیروان مستەفا نزیك ببێتەوە. داناى ئەحمەد مجید کەسەربە باڵی نەشیروان مستەفایە و وەك پێویست خزمەتی سلێمانی نەکردووە و بۆتە رەخنەیەك لەسەر باڵی ریفۆرم چونکە ئەگەر بەرێوەبەری قەزا و ناحیەیەك سەربەباڵی ریفۆرم نەبێت بەو جۆرە هاوکاری نکات، جگەلەوەش پرۆژەکان لەنێوان(داناى ئەحمەد مجید و عمر فتاح)دا دابەش بوون و موناقەشەیەکی توندی یەکتری دەکەن لەشاری سلێمانیدا.

کۆسرەت رەسوڵ کە هەولێرییە وەك باڵێك بوونی هەیە، بەلام ئەویش تەندروستی تەواو نییە، لاوازیش بووە لەروی نفوزەوە. لەلایەکی تریشەوە ئەرسەلان بایز ی مەکتەب رێکخستن خۆی بە قوتبێکی تر دەزانێت لەناو یەکێتیدا و ئەمیش ئیش بۆخۆی دەکات، وەك چۆن کۆمیتە و مەڵبەند نییە کێشەی ئەو باڵەی تێدانەبێت و هەر لایەك بەدزی ئەوی ترەوە دەچێتە لای بەرپرسی مەکتەب رێکخستن و مەکتەب سیاسی هەرچەندە چاوەروان دەکرێ ئەمریکییەکان بە تاڵەبانییان وتبێ لەگەڵ نەوشیروان مستەفا بارودۆخی حزبەکەت رێك بخەرەوە. لەم ماوەیەدا نەوشیروان مستەفا بە بەرپرسێکی باڵای ئاسایشی وتووە ئەگەر لەسەر ئەو سیاسەتە بەردەوام بیت، ئەوا ئەتخەمە سندوقی سەیارەوە، ئەمەش دوای ئەو هەموو دەرکردن و دور خستنەوەیەی ئەندامانی باڵی ریفۆرم دێت لەئاسایش.

هەرچەندە کەئێستە محمود سەنگاوی و عوسمانی حاجی محمود لە خانەقین بونیان هەیە، ئەگەری ئەوەیان لێدەکرێ رێگری لەیەکتر بکەن بەهۆی ئەو بارودۆخی تەکەتولاتی ناو یەکێتی.

ئەو بەرپرسە باڵایەی ناویەکێتی وتی ئەگەر بارودۆخی ناو خۆی یەکێتی لە پێش کۆچی دوایی تاڵەبانیدا چارەسەری بۆ نەکرێ ئەوا مومکین نییە بە خوێن رشتن و شەڕ کۆتایی دێت.

ئەو وتیشی ئێستا مەلا بەختیار لە خانەقینە و سەرپەرشتی ئەو وەزعە دەکات، بەلام بەرپرسمان هەیە حەز بەوە دەکات کە خانەقینمان لەدەست بچێ بۆئەوەی مەلا بەختیار شکست بهێنێ.

## جگە لەخوا و تاڵەبانی کەس نازانێ کەی یەکێتی کۆنگرە دەبەستێ

کمال چۆمانی

باڵەکایەتی کە سەنتەرەکەی قەزای چۆمانە، لە مێژووی بزافی رزگاریخوازی کورد جێ پەنجەی دیارە، ئەگەر سەدەی بیستەم سەدەی سەرهەڵدانی بیری ناسۆسیالیزمی کوردی بێت، ئەوا هەر لەسەرەتای ئەو سەدەیەشەوە باڵەکایەتی بەشداری بەرچاوی هەبووە، لەگشت شۆرش و جولاوەکاندا.

لەشۆرشی(شیخ محمود حفید)دا هێزی(باڵەك)ان بەشدارییەکی بەرچاویان کردووە لەکۆماری مهاباددا بەهەمانشێوە بەشدارییان کردووە دوابەدوای دروست بوونی حزبی شیوعی و هیوا و دواجاریش پارتی دیموکراتی کوردستان – عێراق خەڵکی باڵەکایەتی زوو چونە نێو رێکخستنەکانی ئەو حیزبانەوە و جێ پەنجەیان دیار بووە.

لەسەردەمی شۆرشی مەلا مستەفای بارزان و شۆرشی ئەیلولدا. باڵەکایەتی بوو بەپایتەختی شۆرشەکە، خەڵکی باڵەکایەتی لە شۆرشی ئەیلولدا. گەورەترین شانازی بۆخۆی بردەوە، دوا بەدوای وەك یەکێتییەکان دەڵێن (ئاشبەتاڵەکە)یەکەم گوللەی شۆرشی نوێ لە باڵەکایەتی تەقێنرا. ئێستاش مشت و مرێکی زۆر لەسەر ئەو تەقەیە هەیە، هەرکەسە و بۆخۆی دەبات هەر لەو دەڤەرەش یەکەم شەهیدی شۆرشی نوێ شەهید بوو.

دوا بەدوای ساڵی ١٩٧٥ و تادەگاتە راپەرینەکەی بەهاری(نەوەد و یەك)باڵەکایەتی هەمیشە جێی ململانێی هێزە سیاسییەکانی کوردستان بووە، کادیرێکی ئەوکاتی سۆسیالیست کە ئێستا لەهەولێر پارتییە دەڵێت: (ئەوەی ئاشکرایە یەکێتی نیشتمان و سۆسیالست دوو حزب بوون کە زۆربەی خەڵکی باڵەکایەتییان لەگەڵدا بوو بەو پێیەی پارتی دیمەکراتی لە شۆرشی ئەیلول دا نەیتوانیبوو خەڵکەکە یەکسان بکات لەگەڵ بارزانییەکان و(باڵەك)ەکان کە خانەخوێ و قوربانی بوون، کەچی هیچ پۆستێکی بەرزیان پێ نەدراوە هەربۆیە ئەوان وایان دانا کەپارتی ئەوانی ئیهمال کردووە، هەربۆیەش بوو ، وەهمی تاڵەبانی خەڵکی باڵەکایەتی بۆلای خۆی برد ).

ئێمە لەو راپۆرتەماندا کەمتر باس لەمێژوو دەکەین، ئەوەی لەسەری دەوەستین ئەو گەندەڵی و تەکەتول و شەرە قسە و دزی و جەردەییەی ناومەڵبەندی(٣٧)ی ڕێکخستنی چۆمانە، ئەویەکێتییەی تاسالآنی (نەوەد و یەك)و دوای(نەوەد و یەك)یش، ئەوەی خۆی پێهەڵدەکێشا بەڵەکایەتی بوو، ئێستا دوای هاتنەوەی یەکێتی بۆ ئەو دەڤەرە کە دوای شەری ناوخۆی بای بای کردبوو لە چۆمان، بەدەستی کادیرانی یەکێتی مێژووی ئەو حزبە دە روبار دەکرێت، کادیرێکی بالآی ناو مەڵبەندی چۆمان وتی(ئەو یەکێتییەی خاوەنی شەهیدانی وەك رەحمان سەیدە و کوێستانی و جەلال حاجی و عەزەی داود ی و ئەحمەد مەولود و هەشت سەد شەهیدی تری ناو سەنگەرە، وائێستا هێدی هێدی بەدەست جاهیلانی مەڵبەندی چۆمانەوە پێشکەشی پارتی دەکرێت ).

ئێمە لەو راپۆرتەدا باس لە دروست بوونی ئەو مەڵبەندە و سەرەتاکانی تەکەتول و ئەگەرەکانی دوای کۆنگرە و پێشهاتەکان دەکەین ، هەوڵدەدەین بزانین ئەو کادێرە بۆ ئەو قسەیە دەکات، ئەوەش دەخەینە روو کە ئەگەر یەکێتی بیر لەچارەسەرێك بۆ ئەو مەڵبەندە نەکاتەوە، ئەوا هیچ دوور نییە شەرێکی قورس لەو مەڵبەندەدا روبدات.

**هەڵبژاردنی یەکێتی و دروست بوونی مەڵبەندی چۆمان.**

لەکۆتاییەکانی مانگی نوێ ٢٠٠٦ هەڵبژاردنی مەڵبەندەکان و کۆمیتە و کەرتەکانی یەکێتی نیشتمانی دەستی پێکرد. لەوکاتەدا چۆمان تەنها کۆمیتەیەك بوو، بەلآم بەپێی بریارەکانی هەڵبژاردن قەزا دەبوو بەمەڵبەند شەری تەکەتول دەستی پێدەکرد. دەبێت ئەوەش بڵێین تەکەتول هەر لەگەڵ هاتنەوەی کۆمیتەی چۆمان دەستی پێکردبوو، بەلآم لەکاتی هەڵبژاردندا چرتر بویەوە یەکێك لەو کادیرانەی کە ئەوکات تفی لەو تەکەتولاتە و شەرەقسە وبوختانانە کردووە کە ئەوکات بۆیەکیان هەڵبەستبوون وتی(ئێمە دامانناbوو هەڵبژاردنێکی دیموکراتانە بکەین، بەلآم نەك نەمانکرد خۆزگە لەشاخ بکوژرابام و ئەم هەڵبژارنەمان نەدیتبا ).

هەڵبژاردنەکە بەشەری نێوان دوو تەکەتولی یەکێتی دەستی پێکرد(کۆسرەت رەسوڵ و جەلال تاڵەبانی)ئەو تەکەتولە راستەوخۆ بەئاگاداری هەردوو سەرکردە و سەرپەرشتیاری دوو ئەندامی پێشکەوتووی یەکێتی سەرپەرشتی دەکران کادرێکی ئێستای نێو مەڵبەند کە ئەوکات خۆی هەڵبژارد سەریشکەوت وتی(کوتلەی کاك کۆسرەت لەلایەن اسماعیل محمودی بەرپرسی پەیوەندییە نیشتمانییەکانی یەکێتی و ئەندامی پەرلەمانی کوردستان و کوتلەی

مام جەلالیش لە لایەن ئازاد جوندییانی ئەندامی سەرکردایەتی و بەرپرسی ناوەندی ڕاگەیاندن ئاراستە دەکران ).

لەوکاتەدا شەری تەکەتول بەجۆرێك بوو كە هاوسەنگەر و براش و ئامۆزاشی لەیەك دەکرد، کادێرێکی ئێستای دانیشتوو وتی(ئەگەر زەرەیەك ئینسانییەت لەدڵماندا ببوایە وازمان لە هەمووشتێك دەهێنا نەك هەر کادیرایەتی)کادرێکی نزیکی هەردوو کوتلەکە دەربارەی دژایەتییەکانی ئازاد و ئیسماعیل وتی(ئەوان ڕاستەوخۆ لەسەرخەت بوون، لەژیانیاندا بۆشتی باش سەردانی چۆمانیان نەکردووە، کەچی لەکاتی هەڵبژاردن زۆربەی شەوەکان لەچۆمان بوون ). لەو کاتدا هەڵبژاردنەکەی یەکێتی بەجۆرێکی سەیر بوبوە جێی خەڵك، خەڵکی باڵەکایەتی کەزۆربەی یەکێتین، تەواو نائومێد بوون لە یەکێتی و داهاتوی یەکێتیش. دوای شەرێکی توندی تەکەتول و جنێودان و ڕاکێشانی تفەنگیشی لێکەوتەوە، تەکەتولی کۆسرەت ڕەسوڵ توانی چۆك دابدات بە کوتلەکەی تاڵەبانی و جوندیانی ).

جێی ئاماژەدانیشە ئەوەی دەنگی نەبوو کوتلەکەی نەوشیروان مستەفا بوو، کادێرێکی ئەو کوتلەیە وتی (سەرەتا ئەو کوتلەیەی دەرچوو خۆیان وانیشان دەدا کەئەوان ریفۆرمن، بەڵام نەك ریفۆرم نەبوون بەڵکو هەرگیز نابنە ریفۆرم، چونکە رۆیفرم ئەوان قبوڵناکات. چونکە هەموویان گەندەڵن و بەدوای پارەوەن ). ئەو کادیرە وتیشی(ئێمە زۆرین کە نەوشیروان مستەفامان خۆشدەوێت، بەڵام ئەگەر باسی بکەین و پەیوەندی لەگەڵ کاك نەوشیروان ببەستین تووشی لێپێچینەوە دەبین، کادیرانی تریش زۆربەیان بەدوای پارەوەن نەك ئەو ریفۆرمەی کاك نەوشیروان باسی دەکات ).

### دوای دروست بوونی مەڵبەند

دوای دروست بوونی مەڵبەند، مەڵبەند دروست کراو مەلا حەسەن مژدەینانی وەك بەرپرسی مەڵبەند هەڵبژێردرا دوو جێگریشی بۆ دانران، حیکمەت وەلاشی و محمد داروسەلامی جێگری یەکەم و دووەمن چەندان کارگێر و ئەندام مەڵبەند و کادری تریش لەمەڵبەندەکە دەست بەکار بوون. ئەوەی جێی باسکردنیشە سەرە ڕای سەرفکردنی چەندین دەفتەر دۆلار کوتلەکەی تاڵەبانی بەدەست بەتاڵی لە هەڵبژاردنەکە هاتنەدەرەوە جگە لەخدر مستەفا کە بووە کارگێری مەڵبەند. کوتلەکەی کۆسرەت ڕەسوڵیش هەرگیز دانووی نەکوڵیوە لەگەڵ ئەوکادیرەی باڵی تاڵەبانی و جوندیانی هەر بۆیە زوو لەبەشێکی

سادەی ناو مەڵبەند(بەشی پەیوەندییەکان)وەك خانەنشین لەوێیان دانا و هیچ حیسابێکی بۆ نەکرا. دواجار لەبەرئەوەی کوتلەکەی تاڵەبانی کەمینە بوو. بەبریارێکی مەکتەب رێکخستن(کەمینە گرنگترین وەردەگرێت)بۆیە بەشی رێکخستن لە کوتلەکەی کۆسرەت سەندرایەوە و درایە ئەوکادیرەی کەتائێستاش بریارەکانی تا دەم دەرگای ژوورەکەی خۆی دەروات.

ئێستا مەڵبەند بەسەر ئەوناوانەدا دابەشکراوە و سێ کوچکەکە(مەلاحەسەن و حیکمەت وەلاشی و محمد دارو سەلامی)مۆنۆپۆلی پارە و هەموو شتێکی مەڵبەندیان کۆکردەوە کەس نازانێت پارە و نەسریەی ئەو مەڵبەندە چی لێدێت جگە لەوانە. ناکرێت ئەوەش لەبیربکەین کە کارگێرەکانی تریش پشکێکی باشیان بەردەکەوێت، هەربۆیە جگە لەچەند کادیرێك ئەندام مەڵبەندێك هەموویان بێدەنگ کراون.

**ئەگەری کۆنگرە و سیناریۆکانی کۆنگرە**

هەرچەندە(جگە لە خودا و تاڵەبانی نەبێت کەس نازانێت کەی کۆنگرە دەبەسترێت)بەڵام جارێکی تر لەبەستنی کۆنگرەدا کێشمەکێشمی تر سەرهەڵدەداتەوە، کادیرێکی تر وتی: (لەهەڵبژاردنەکان زۆرترین سندوقی دەنگدان. لەدەرەوە پێشمەرگە و کوتلەکان بە بیکەیسی وەستا بوون، ئەو کۆنگرەیەی کە برپارە بکرێت شتی نوێی بەدوادا دێت، سەرکردەکانی یەکێتی تا ئێستاش باڵەکایەتی بە قەلای سەوز ناوزەند دەکەن و کەچی هیچ حسابێکیشیان بۆنە کردووە ).

ئەو کادیرە وتیشی(دوای کوێستانی کەیەکێتی خۆی بە کوشتی دا چونکە نەدەبوو وەك نوێنەر بیناردبا حاجی ئۆمەران، چونکە دەیانزانی دەکوژرێت، تا ئێستا هیچ کەسێکی باڵەك دەنگیان نەگەشتۆتە پۆستی سەرکردایەتی هەرچەندە ئازاد جوندیانی لەسەر حیسابی خەڵکی باڵەکایەتی لەوێیە بەڵام کەس بەنوێنەری باڵەکایەتی دانانێت. جگە لەخدر مستەفا و تەکەتولەکەی لە چۆمان ).

ئەو کادیرە رونی کردەوە(لەو کۆنگرەیەدا ئەگەری هەیە هەردوك تەکەتولی مام جەلال و کاك کۆسرەت ئەندامێکی باڵەك ببەنە سەرکردایەتی. تەکەتولی مام جەلال دەیەوێت ئازاد جوندیانی بکاتە ئەندامی مەکتەب سیاسی و مەلا مستەفای مەسئول مەڵبەندی شەشی سۆرانی پێشوو بکاتە ئەندامی سەرکردایەتی، لەبەرامبەردا باڵی کاك کۆسرەت دەیەوێت ئیسماعیل محمود(کەئەویش پێیوایە بەدەست و قامی خۆی گەیشتۆتە ئەوێ و حیسابی

جددی بۆخەڵکی باڵەکایەتی ناکات. هەر بۆنمونە بەناوی باڵەکایەتی ئەندامی پەرلەمانە کەچی لەکاتی سەردانی وەفدی پەرلەماندا بۆ باڵەکایەتی نەهاتبوو بگەیەنێتە ئەندامی سەرکردایەتی ).

ئەو کادیرە راشی گەیاند(لە ئێستاوە دڵنییام دەبێت تەوافقێك بۆئەوە بکرێت، چونکە دوو کەسی باڵەك ناگاتە ئەندامی سەرکردایەتی هەر بۆیە لەئێستاوە ئەو مونافەسەیە هەستی پێدەکرێت)دڵنیاشم یەکیان ناگەنە ئەو پۆستە، چونکە تەکەتول دەکەن و واناکەن کەسێکی مەنتیقەکە بگەیەننە پۆستێکی باڵا)کادیرەکە نمونەیەکی زیندووی هێنا یەوە و وتی(لەکاتی پلینیۆمەکەدا، باس لەوە دەکرا ئەندامی نوێ بۆ سەرکردا یەتی هەڵبـژێردرێت بووە کێشەی ئەو دوو ناوەو دواجار بەوە کۆتایی هات کە پلینیۆم بڕیاریدا ئەندامە یەدەگەکان بباتە سەرکردایەتی ).

## یەکێتی لەبەرامبەر پارتیدا

لە قەزای چۆمان پارتی دیموکراتی کوردستان دەسەڵاتی رەهای بەسەر هەمووشتدا هەیە، یەکێتی وەك حزبێکی زۆر زۆر بچوك دێتە بەرچاو لەبەرامبەر پارتیدا. پارتی لەسەرەتادا ترسێکی یەکجار گەورەی لە یەکێتی و گەرانەوەی هەبوو. کادیرێکی پارتی وتی(کاتێك یەکێتی هاتەوە ئێمە بیرمان لەوە کردەوە بەهەر نرخێك بێت خۆمان رێك بخەینەوە چونکە تاهاتنەوەی یەکێتیش خەڵکەکە خەونیان بەهاتنەوەی یەکێتییەوە دەبینی، بەڵام کەیەکێتی هاتەوە و بینیمان وازی لە خەڵك هێناوە و خەریکی تەکەتول و پارەیە، ئێمەش ئیسراحەتمان کردو خەڵکەکە بۆی رون بوەوە کە ئەو یەکێتییە نەماوە ئەوان خەونیان پێوە بینیبوو)کادیرێکی یەکێتی کە ئێستا لەماڵەوە دانشتووە و وەك خۆی دەڵێت ئامادەش نییە جارێکی تر بچێتەوەو ناو هیچ حزبێك و یەکێتیش وتی: (خەڵکی چۆمان هاتنەوەی یەکێتیش رۆژانی شەری ناو خۆ و لێدان وکوتانی پارتییان لەبیر نەکردبوو، هەموویان سوربوون لەسەر یەکێتی بوونی خۆیان. بەڵام کە یەکێتییان بینی پەشیمان بونەوە. زۆربەیان بونە پارتی و پارتیش زۆربەیانی لە دام و دەزگا حزبی و حوکومییەکان تاعین کرد ).

کادیرێکی باڵای یەکێتی کە ئێستا دانیشتووە و لەهەولێریش دادەنیشێت، دەربارەی چۆمان و باڵەکایەتی لەساڵانی ١٩٨٢ و ١٩٨٣ وتی(یەکێتی لەو کاتەدا دوو بەرەبوو شۆرشگێران و کۆمەڵە. هەردووکیان ناوچە و کەرتی تایبەتی خری هەبوو، تەنها لە

چۆماندا کرمەڵەو شۆرشگێران ناوچە و کەرتی نهێنی و ئاشکرایان هەبوو کەئەمە لەتەواوی ناوچەکانی تری کوردستان نەبوو، جگە لەقەرەداغ کە نزیك بوو لەچۆمان ).

لە ئێستادا رێکخستنی یەکێتی نیشتمانی نزیکە لە نەبوون، تا ئێستا نەیتوانیوە رێکخستنەکەیان بەقەد رێکخستنێکی زۆر سادەی کوردستانیش بێت. کادرێکی ئاگادار لە رێکخستنەکانی یەکێتی لە چۆمان وتی (هیچییان نییە، نە ئەندام و نە پیلان بۆ خۆ دەربازکردن لەو بێ ئەندام و بێسەر و بەرییە ). ئەو کادیرە هۆکاری ئەو دەردەی یەکێتی بۆ تەکەتول و گەندەڵی ناو مەڵبەند گەراندەوە، دوو نمونەی شەرمهێنی تەکەتول کادرێکی تری مەڵبەند سیاسی لەهەندێك نمونەی تری شەرمهێنی تەکەتول کرد(ژنە شەهیدێك لەلایەن ناوەندی راگەیاندنی یەکێتی و بەهەولی خدر مستەفای کارگێر مەڵبەند. هاوکارییەکی جددی کراو پارەی کرێی خانووی بۆ دەدرا، بەلام لەکاتی هەڵبژاردن لەبەرئەوەی ئەو ژنە بەلای تەکەتولی کاك کۆسرەت کشایەوە ئەو برەپارەیەیان لێ بڕی لەماوەی رابردوو کاك کۆسرەت ئوتۆمبێلێکی پێشکەشی مەڵبەندی چۆمانکرد، وتبوی بیدەنە ئەوکەسەی کە ئوتومبێلی نییە و کچیشە، واتا شوکرییەخانی کارگێرمەڵبەند، بەلام سێ مانگ ئوتومبێلەکە وەستێنرا و نەیاندەدا بەو خانمە تا دواجار هەندێ شتی شەرمهێنتر باسکرا کە وەسڵەکەی لەلایەن چەند کەسێکەوە دزراوە و بزر کراوە تا دواجار بەهەر جۆرێك بێت درا بە کچەکە ).

## تەکەتول لەئێستای مەڵبەندا

ئێستا بەهەمانشێوەی پێشوو مەڵبەندی چۆمان بەسەر تەکەتولە سەرەکییەکەی ئەو حزبە دابەشبووە، باڵی کۆسرەت رەسوڵ کەزۆرینەیە و هەیمەنەی بەسەر ئەو مەڵبەندەدا هەیە، لەگەڵ تەکەتولە کەمینەکەی تاڵەبانی، کادرێك وتی(مەلاحەسەنی بەرپرس و وەلاشی و داروسەلامی و جەوهەر بیئەیی مەلا علی و شوکرییە کە کارگێری مەڵبەندن تەکەتولی کۆسرەت رەسوڵن، خدر مستەفا کارگێر و نوێنەری مام جەلالیی عبداللە ی حاجی براهیم. تەکەتولی مام جەلالە، ئەمە جگە لەکۆمیتەکانی(ڕۆست و چۆمان کە کۆسرەتین )، (قەسرێ و حاجی ئۆمەرانیش باڵی تاڵەبانین ).

ئەوکادێرە ئاماژەی بەوەدا کە ئێستاش کێبەرکێ و موونافەسەیەکی یەکجار توندیان لەنێواندایە، باڵی تاڵەبانی وەك نەبوو وان لەبەرامبەر ئەو تەکەتولەی هەیمەنەی هەیە بەسەر مەڵبەندەکەدا، ئەو کادێرە نمونەیەکی لەو ململانێیانە هێنایەوە(ماوەی رابردوو

خدر مستەفا لەبەرئەوەی توانی تا رادەیەك رۆشنبیری تێدایە ویستی كۆڕێك بگێڕێت، بەڵام داروسەلامی جێگری لێپرسراوی مەڵبەند لێی نەگەرا كۆڕەكە لەنێو مەڵبەندببەستێت، تا دواجار گوێزرایەوە بۆ ناو كۆمیتەی رێكخستن ).

ئەوەی جێی تێرامانە منافەسەكە گەیشتۆتە ئاستێك لەسەر جۆری ئۆتۆمبێلیش منافەسە دەكەن. ئەو تەكەتولەی ناو مەڵبەند تەنها لەسەر پۆست و زۆركردنی ئیمتیازاتە بۆ خۆیان ئەگەرنا هیچ باكگراوند و فكرێكی تێدانییە. یەكێك لەوانەی خۆی بەریفۆرم دەزانێت و تائێستاش ئەوەی لای كەس نەدركاندووە و پێیوایە(كادیرانی مەڵبەندی چۆمان ئەسڵەن نازانن فكر و سیاسەت چییە، هەربۆیە منافەسەكە جگە لەحەزی گیرفان هیچی تر نییە ).

ئەوەی ئێستا لەمەڵبەندەكەی چۆمان نوێیەو جێی قسەلەسەر كردنە. مونافەسەی ناو تەكەتولەكانییەتی كادیكرێكی باڵی كۆسرەت رەسوڵ ئاشكرایكرد(ئێستا لەمەڵبەندی چۆمان تەكەتولەكان خۆیان مونافەسەی یەكتر دەكەن. بەنمونە كاك مەلا حەسەن و حیكمەت وەلاشی و داروسەلامی تالە كۆبونەوەیەكی لەگەڵ خوێندكاراندا داروسەلامی وتبووی(ئەو مەلا حەسەنە سەر بە جەمەدانییە لێناگەرێت من هاوكاریتان بكەم، ئەگەرنا هاوكاریم دەكردن ). ئەوە ئاماژەیەكی رونە ئەوان خۆیان لەگەڵ خۆیان راست نین، هەر لەماوەی رابردوو وەلاشی و چەند پیاوماقولێكی باڵەكایەتی لەگەڵ خۆی بردبووە مەكتەب سیاسی و داوای لابردنی مەلا حەسەنی كردبوو، لەشوێنی ئەویشدا داوای دانانی خۆی كردبوو.

## گروپێكی ٣٥ كادری داوای چۆڵكردنی مەڵبەندی چۆمان دەكەن

لەبەر چەند گەندەڵی و بێسەر و بەرییەك كەلەبەر نەبوونی شوێن ناكرێت لێرەدا ئاماژە بەو پەنجاخاڵەبدەین كەبەدەستمان گەیشتووە و تێیدا ئەوە خراوەتە روو كەلەماوەی سێ رۆژدا نەسرییەكەی مەڵبەند كە سی و سێ ملیۆن دینارە، وندەبێت، كەچەند كادیرێك لەناو مەڵبەندی چۆمان لەیەك كۆبونەتەوە دەستیان داوەتە رەخنەگرتن، نزیكەی ٣٥ كادیر دەبن، ئەوەیان راگەیاندووە كە هەرخۆیان خاوەنی یەكێتین و لێناگەرێن چیدی یەكێتی بەو دەردە بڕوات ئەگەر(شەریشی بەدوادابێت)یەكێك لەو كادیرانە وتی ٠ ئێمە گەیشتۆتە چۆكمان، چیتر تەحەمول ناكەین پێمان قبوڵناكرێت تەنها پارە دزین ئیشیان بێت، ئەگەر خۆیان چاكنەكەن ئەوە پێیان دەڵێین لەمەڵبەند بڕۆنە دەرەوە ئێمە شەهید و قوربانیمان بۆ ئێونەداوە ).

ئەو كادیرە ئەندامی گروپی سی و پێنج كەسییەكە رونیشیكردەوە(راستە ئێستا ئێمە خۆمان ئاشكرا نەكردووە، بەلام خۆمان زۆر توند و چوست و مەبدەئین، لەسەر ئەوە رێككەوتوین یەكێتی بەئاقارێكی باشدا ببەین، لێنەگەرێین كەس زەفەر بەیەكێتی ببات لەو دەڤەرە، بۆیە ئێمە لەكاتی نەكردنی ریفۆرمێكی چاك لەمەڵبەندەكەدا، داوای چۆڵكردنی دەكەین.

## نەوشیروان مستەفا بۆ لاوازکردنی پارتی، یەکێتی هەڵدەوەشێنێتەوە

دلێر عبدالله

هەڵبژاردنی چاوەڕوانکراوی پەرلەمانی کوردستان کەبریارە ٢٥ ی مانگی داهاتوو بەڕێوەبچێت، بەهۆی فرە لیستی و بونی دەنگی جیاواز و نەیار، جیا لەهەڵبژاردنەکانی پێشوو بوەتە جێی گرنگی و لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەکی بەبایەخەوە تەماشا دەکرێت و چەندەها شرۆڤە و لێکۆڵینەوەی بۆ دەکرێت بەتایبەت بونی لیستی وەك(گۆڕان)کە(نەوشیروان مستەفا)کاراکتەری سیاسی نێو ریزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەرۆکایەتی دەکات کە جگەلەوەی گەرم و گوری و تین و تاوی هەڵبژاردن داوە و رکابەری و کێبرکێکانی زیاتر کردووە، پرسیارگەلێکی لای هاولاتیان و تەنانەت لایەنە سیاسییەکان لە سەروو هەموشیانەوە(پارتی)وروژاندووە کە تا هەنوکە بێ وەلامن هەمووان لە چاوەڕوانی ئەنجامەکانی هەڵبژاردندان.

### کێ خاوەنی ئەو نارەزایەتییە؟

نەوشیروان مستەفا کەئێستاوەك نەیارێکی سەرسەختی یەکێتی خۆی دەرخستووە و لەهەوڵی ئەوەدایە بەسود وەرگرتن لە کەموکوری حوکمرانی چەند ساڵەی یەکێتی و پارتی، لە خۆی و قەوارەکەی کۆبکاتەوە و لەم هەڵبژاردنەدا پێگەیەکی سیاسی فراوان بۆخۆی دروست دەکات، دەیەوێت بەدروشمی ئەنجامدانی گۆڕانکاری و بەرەنگاربونەوەی گەندەڵی و ناشەفافی لە بودجە و نارێکی لە سیستەمی دارایی ئەو رکابەری کێ برکێ سەخت و دژوارە بگوازێتەوە مەیدانی هەڵبژاردن کە ساڵانێکی زۆر لەنێو یەکێتیدا نەیتوانی لەگەڵ(تاڵەبانی)درێژەی پێ بدات، هەر بۆیە دەیەوێت لەم رێیەوە بەبەرگێکی نوێ خۆی بکاتە نێو رکابەری دەسەلات و رکابەرە لە مێژینەکەی بدات لەزەوی، بەلام دروست بونی واقعی نارەزایی خەڵك خاوەنەکەی نەوشیروان و لیستی گۆان نییە، بەڵکو بەلام پشکێکی گەورەی دروست کردنی ئەو دۆخەی کە نارەزایەتی بەرهەمهێناوە میدیای ئەهلییە ئەو میدیایەی کەماوەی ٩ ساڵە بەردەوام هەوڵی خستنەروی شتە شاراوەکان و ئاشکراکردنی گەندەڵی و بەئاگا هێنانەوەی خەڵکی داوە دۆخێکی دروست کردووە کەخەڵکی بتوانن

لەبەرامبەر ئەو هەموو گەندەڵی و بێ دادییە بوەستنەوە لە ئێستادا نەوشیروان بەسود وەرگرتن لە ناکۆکییەکانی لەگەڵ تاڵەبانی خۆی کردۆتەخاوەنی ئەو خەڵك و نارەزایەتییە.

**نەوشیروان مستەفا بۆچی هاتۆتەدەرەوە لە یەکێتی؟**

نەوشیروان مستەفا دەمێکە باس لە گۆڕان و چاکسازی نێوخۆی یەکێتی نیشتمانی دەکات، ئامانجی ئەوە بووە، لەکۆنفرانسی ٢٠ / ٩ / ٢٠٠٦ کەهەڵبژاردن و چاکسازی بۆ ٣٦ مەڵبەندی یەکێتی ئەنجامدرا کوتلەی نەوشیروان نەیتوانی کۆنترۆڵی یەکێتی نیشتمانی بکات و توشی شکستێکی بەرچاو هاتن لە ئاستی ڕێکخست و مەڵبەندا.

نەوشیروان مستەفا لەهیچ کاتێکی دژواری بارودۆخی کوردستان بۆچونی جیاواز و دەنگ و نارەزایەتی جیاوازی نەبووە، بەتایبەتی لە ٣١ ی ئاب و هێنانی پاسدار و چەندین جەولەی شەڕی ناوخۆدا، نەوشیروان مستەفا باسی لێوەدەکات دەرەنجامی ئەو ناکۆکییە لەمێژینە و کۆنەی نێوان تاڵەبانی و کۆمەڵەی رەنجدەرانە.

**ئایا ئەمەی نەوشیروان سیناریۆی تاڵەبانییە؟**

ئەگەر چی بەشێك لە چاودێرانی سیاسی بونی لیستی گۆڕانی نەوشیروان مستەفا بە پلانێکی یەکێتی دەزانن بۆراکێشانەوەی ئەو دەنگە نارەزاییەی خەڵکی بەهۆی بێزارییان لەیەکێتی و پارتی و ئەنجامی نەبونی خزمەتگوزاری و کەمتەرخەمی و بونی گەندەڵییەکی زۆر و ناشەفافی و بەهەدەربردنی سامانی وڵات و ناداد پەروەری، دەدەینە لیستە نەیارەکان تا لەم ڕێیەوە تۆڵەی خۆیان لەو دووحزبە بکەنەوە، هەربۆیە لەم نێوەندەدا یەکێتی نەوشیروانی قوت کردۆتەوە و وەك دەنگێکی نارەزایی دروستی کردووە، تابەهۆیەوە شکست بە حزبە نەیارەکان بهێنرێت، لەو دەنگە نارەزاییانە بێ بەشیان بکەن بە سود وەرگرتن لەو حاڵەتە جارێکی تر دەنگی جەماوەر بەدەست بهێننەوە بەڵام بۆچونگەلێکی زۆریش ئەوە ڕەتدەکەنەوە پێیان وایە دروست بوونی لیستی گۆڕان درێژکراوەی رکابەریەکانی نێوان نەوشیروان و تاڵەبانییە.

**لیستی گۆڕان بۆ لاوازکردنی ٤ حزبەکەیە؟**

هەمان کات چەند بۆچونێکی تر لەنێوان لایەنە سیاسییەکان و شەقامی کوردی ئەوە دەخەنە ڕوو کەیەکێتی بۆ لاوازکردنی پێگەی چوار حزبەکە و دورخستنەوەیان لەبەدەستهێنانی دەنگی نارەزایی خەڵکی بێزاری کوردستان، ئەم سیناریۆیەی ڕێکخستووە و نەوشیروان مستەفای هێناوەتە کایەکەوە، کە بۆ ئەمەش بەڵگەی ئەوە دەهێنرێتەوە

نەوشیروان و کۆمپانیاکەی لەلایەن یەکێتی و خودی تاڵەبانییەوە پاڵپشتی کراون، ئێستاشی لەگەڵدابێت هاوکاری و یارمەتی دەدرێن چونکە لە توانای هیچ کەسایەتییەکی سەربەخۆدانییە کۆمپانیا و دەزگایەکی وەك ئەوەی وشە بەرهەم بهێنێت و بەرێوەی بدات، تەنها دوو حزبی وەك پارتی و یەکێتی و حوکومەت و دەوڵەت نەبێت.

پێچەوانەی ئەمانە چەندین بۆچونی تر کەلەنێو کەسایەتییە سیاسییەکان و رۆشنبیران و زۆرێك لەجەماوەری کوردستانەوە سەرچاوەی گرتووە ئاماژە بەوەدەکەن بەشداریکردنی نەوشیروان مستەفا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی چوارچێوەی یەکێتی و لە ژێرناوی لیستی جیاواز و سەربەخۆدا، درێژکردنەوەی ئەو رکابەری و ململانێ چەندین ساڵییە کەخودی ناوبراو لەگەڵ تاڵەبانی لەنێو ریزەکانی یەکێتی هەیبووە بەپێی قۆناغەکانی ژیان و بارودۆخی نێو یەکێتی گۆرانکاری بەسەردا هاتووە، کەوازهێنانی نەوشیروان لە پۆستی جێگری سکرتێری یەکێتی و دورکەوتنەوەی لەکاروباری حزب سەرەتای گواستنەوەی ئەو رکابەرییە بوو لەقۆناغێکی تر کە ئێستا گەشتۆتە لوتکە و بەراگەیاندنی لیستی سەربەخۆ و جیاوازیش بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان هێندەی تر قوڵ بۆتەوە.

لەگەڵ ئەوەی یەکێتی و خودی جەلال تاڵەبانی لەسەرەتاوە هێندە پەرۆش و نیگەرانی جیابونەوەی نەوشیروان مستەفا نەبوون هیچ گرنگییان بۆ دانەدەنا، بەلام لەگەڵ گەشەکردنی باڵەکەی نەوشیروان و کۆبونەوەی ئەندامێکی زۆری یەکێتی لەو باڵە و گەورەبوونی بەو ئاستە و هەستکردن بەمەترسی لێدانی بەرژەوەندییەکانیان لەئێستا و لەئایندەدا، سەرکردایەتی یەکێتی و تاڵەبانی لەپێناوی گەرانەوەی نەوشیروان و وازهێنانی، چەندین رێگایان گرتەبەر و سازشێکی زۆریان کرد، بەلام سوربونی نەوشیروان لەسەر کارەکەی تاڵەبانی و حزبەکەی بێ هیواکرد، بەناچاری رێگەی دژایەتیکردن و سڕکردنی ئەندامانی باڵەکەی نوشیروانیان گرتەبەر کە ئێستایشی لەگەڵدابێت درێژەی هەیە.

**پارتی باڵی ریفۆرمی دروست کرد**

بەرای زۆرێك لە چاودێران کۆبونەوەی ئەو ئەندامە زۆرە لەباڵی ریفۆرم و پرۆژەکەی نەوشیروان مستەفا، بۆ چەند هۆکارێك دەگەرێتەوە کە گرنگترینیان سازشەبەردەوامەکەی یەکێتی و خودی تاڵەبانییە بۆ پارتی لەو رێککەوتنە ستراتیژییەی کە لەنێوان هەردوو حزبدا واژۆ کراوە، بەجۆرێك تاڵەبانی جڵەوی یەکێتی داوەتە دەست بارزانی و پارتی و

لەبەرامبەر ئەو هەموو گەندەڵی و بێ دادییە بوەستنەوە لە ئێستادا نەوشیروان بەسود وەرگرتن لە ناکۆکییەکانی لەگەڵ تاڵەبانی خۆی کردۆتەخاوەنی ئەو خەڵك و نارەزایەتییە.

**نەوشیروان مستەفا بۆچی هاتۆتەدەرەوە لە یەکێتی؟**

نەوشیروان مستەفا دەمێکە باس لە گۆران و چاکسازی نێوخۆی یەکێتی نیشتمانی دەکات، ئامانجی ئەوە بووە، لەکۆنفرانسی ٢٠ / ٩ / ٢٠٠٦ کەهەڵبژاردن و چاکسازی بۆ ٣٦ مەڵبەندی یەکێتی ئەنجامدرا کوتلەی نەوشیروان نەیتوانی کۆنترۆڵی یەکێتی نیشتمانی بکات و توشی شکستێکی بەرچاو هاتن لە ئاستی رێکخست و مەڵبەندا.

نەوشیروان مستەفا لەهیچ کاتێکی دژواری بارودۆخی کوردستان بۆچونی جیاواز و دەنگ و نارەزایەتی جیاوازی نەبووە، بەتایبەتی لە ٣١ ی ئاب و هێنانی پاسدار و چەندین جەولەی شەڕی ناوخۆدا، نەوشیروان مستەفا باسی لێوەدەکات دەرەنجامی ئەو ناکۆکییە لەمێژینە و کۆنەی نێوان تاڵەبانی و کۆمەڵەی رەنجدەرانە.

**ئایا ئەمەی نەوشیروان سیناریۆی تاڵەبانییە؟**

ئەگەر چی بەشێك لە چاودێرانی سیاسی بونی لیستی گۆرانی نەوشیروان مستەفا بە پلانێکی یەکێتی دەزانن بۆراکێشانەوەی ئەو دەنگە نارەزاییەی خەڵکی بەهۆی بێزارییان لەیەکێتی و پارتی و ئەنجامی نەبونی خزمەتگوزاری و کەمتەرخەمی و بونی گەندەڵییەکی زۆر و ناشەفافی و بەهەدەربردنی سامانی وڵات و ناداد پەروەری، دەدەینە لیستە نەیارەکان تا لەم ڕێیەوە تۆڵەی خۆیان لەو دووحزبە بکەنەوە، هەربۆیە لەم نێوەندەدا یەکێتی نەوشیروانی قوت کردۆتەوە و وەك دەنگێکی نارەزایی دروستی کردووە، تابەهۆیەوە شکست بە حزبە نەیارەکان بهێنرێت، لەو دەنگە نارەزاییانە بێ بەشیان بکەن بە سود وەرگرتن لەو حاڵەتە جارێکی تر دەنگی جەماوەر بەدەست بهێننەوە بەڵام بۆچونگەلێکی زۆریش ئەوە ڕەتدەکەنەوە پێیان وایە دروست بوونی لیستی گۆڕان درێژکراوەی رکابەریەکانی نێوان نەوشیروان و تاڵەبانییە.

**لیستی گۆران بۆ لاوازکردنی ٤ حزبەکەیە؟**

هەمان کات چەند بۆچونێکی تر لەنێوان لایەنە سیاسییەکان و شەقامی کوردی ئەوە دەخەنە ڕوو کەیەکێتی بۆ لاوازکردنی پێگەی چوار حزبەکە و دورخستنەوەیان لەبەدەستهێنانی دەنگی نارەزایی خەڵکی بێزاری کوردستان، ئەم سیناریۆیەی ڕێکخستووە و نەوشیروان مستەفای هێناوەتە کایەکەوە، کە بۆ ئەمەش بەڵگەی ئەوە دەهێنرێتەوە

نەوشیروان و کۆمپانیاکەی لەلایەن یەکێتی و خودی تاڵەبانییەوە پاڵپشتی کراون، ئێستاشی لەگەڵدابێت هاوکاری و یارمەتی دەدرێن چونکە لە توانای هیچ کەسایەتییەکی سەربەخۆدانییە کۆمپانیا و دەزگایەکی وەك ئەوەی وشە بەرهەم بهێنێت و بەرێوەی بدات، تەنها دوو حزبی وەك پارتی و یەکێتی و حوکومەت و دەوڵەت نەبێت.

پێچەوانەی ئەمانە چەندین بۆچونی تر کەلەنێو کەسایەتییە سیاسییەکان و رۆشنبیران و زۆرێك لەجەماوەری کوردستانەوە سەرچاوەی گرتووە ئاماژە بەوەدەکەن بەشداریکردنی نەوشیروان مستەفا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی چوارچێوەی یەکێتی و لە ژێرناوی لیستی جیاواز و سەربەخۆدا، درێژکردنەوەی ئەو رکابەری و ململانێ چەندین ساڵییە کەخودی ناوبراو لەگەڵ تاڵەبانی لەنێو ریزەکانی یەکێتی هەیبووە بەپێی قۆناغەکانی ژیان و بارودۆخی نێو یەکێتی گۆرانکاری بەسەردا هاتووە، کەوازهێنانی نەوشیروان لە پۆستی جێگری سکرتێری یەکێتی و دورکەوتنەوەی لەکاروباری حزب سەرەتای گواستنەوەی ئەو رکابەرییە بوو لەقۆناغێکی تر کە ئێستا گەشتۆتە لوتکە و بەراگەیاندنی لیستی سەربەخۆ و جیاوازیش بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان هێندەی تر قوڵ بۆتەوە.

لەگەڵ ئەوەی یەکێتی و خودی جەلال تاڵەبانی لەسەرەتاوە هێندە پەرۆش و نیگەرانی جیابونەوەی نەوشیروان مستەفا نەبوون هیچ گرنگییان بۆ دانەدەنا، بەلآم لەگەڵ گەشەکردنی باڵەکەی نەوشیروان و کۆبونەوەی ئەندامێکی زۆری یەکێتی لەو باڵە و گەورەبوونی بەو ئاستە و هەستکردن بەمەترسی لێدانی بەرژەوەندییەکانیان لەئێستا و لەئایندەدا، سەرکردایەتی یەکێتی و تاڵەبانی لەپێناوی گەرانەوەی نەوشیروان و وازهێنانی، چەندین رێگایان گرتەبەر و سازشێکی زۆریان کرد، بەلآم سوربونی نەوشیروان لەسەر کارەکەی تاڵەبانی و حزبەکەی بێ هیواکرد، بەناچاری رێگەی دژایەتیکردن و سڕکردنی ئەندامانی باڵەکەی نوشیروانیان گرتەبەر کە ئێستایشی لەگەڵدابێت درێژەی هەیە.

### پارتی باڵی ریفۆرمی دروست کرد

بەرای زۆرێك لە چاودێران کۆبونەوەی ئەو ئەندامە زۆرە لەباڵی ریفۆرم و پرۆژەکەی نەوشیروان مستەفا، بۆ چەند هۆکارێك دەگەرێتەوە کە گرنگترینیان سازشەبەردەوامەکەی یەکێتی و خودی تاڵەبانییە بۆ پارتی لەو رێککەوتنە ستراتیژییەی کە لەنێوان هەردوو حزبدا واژۆ کراوە، بەجۆرێك تاڵەبانی جڵەوی یەکێتی داوەتە دەست بارزانی و پارتی و

ئەوانیش بەویست و ئارەزووی خۆیان و چۆنیان بوێت لەبەرژەوەندی خۆیان بەکاریدێنن، کە ئەمەش زۆرێك لەسەرکردایەتی و ئەندامانی نیگەراون کردووە و بەرەو باڵەکەی نەوشیروان رایکێشاون، بەتایبەتی ئەوانەی قوربانی دەستی پارتین و لەشەری خوێناوی براکوژیدا(چ لەشاخ و چ لەشار)چەپۆکی ئاگرینی پارتی زیانی پێگەیاندوون ئەمەش وایکردووە زۆرێك لەئەندامانی یەکێتی نیشتمانی دەنگ بەسەرۆکی هەرێم نەدەن.

## ریفۆرم یەکێتین یان لەدەرەوەی یەکێتی باڵێکی سەربەخۆن؟

ئەوەی بەلای یەکێتی و سەرکردایەتییەکەوە بووەتە مایەی نیگەرانی و جۆرێك لە شۆك بوون و سەرسامی، مانەوەی نەوشیروان مستەفایە وەك ئەندامێکی یەکێتی جگەلەوەی یەکێتی لای پارتی ئیحراج کردووە خودی تاڵەبانی و سەرکردایەتی ئەو حزبەی قەیرانێکەوە کە رەنگە پاش هەڵبژاردن و دەرکەوتنی ئەنجامەکان زیاتر هەست بەبون و ئێش و ژانی بکەن، چونکە ئەم سیاسەتەی نەوشیروان مستەفا و هاوبیرانی ئامانجێکی گەورەی لە پشتە و کورد وتەنی(بەردێکە و دوو چۆلەکەی پێدەکوژێت)ئەم سیاسەتەی نەوشیروان مستەفا و بەخۆ هێشتنەوەی وەك ئەندامێکی یەکێتی زیانێکی گەورە لەو حزبەی دەدات و ئامانجێکی گەورەشە کەلە دوارۆژدا پێی بەدی دێنێت.

## نەشیروان مستەفا بۆلاوازکردنی پارتی یەکێتی هەڵدەوەشێنێتەوە.

چاودێرانی سیاسی پێیان وایە ئامانجی یەکەمی نەوشیروان مستەفا و هاوبیرانی لە خۆهێشتنەوەیان وەك ئەندامێکی، کۆکردنەوەی ئەندامە بێزراو و تۆراو و دەرکراوەکانی ناویەکێتییە لە خۆیان، بەو ئامانجەی لە قۆناغی پاش نەمانی تاڵەبانی(پیاوە نەخۆشەکە)جڵەوی یەکێتی بگرنەوە دەست و ئەوەی کەلەماوەی چەندساڵەی تەمەنیان لە یەکێتی بۆیان نەکراوە جێبەجێی بکەن و یەکێتی لەناز و نوزەکانی پارتی و بارزانی و سازشە بەردەوامەکانی تاڵەبانی بۆ بنەماڵەی بارزانی رزگار بکەن، ئامانجی دووەمیش ئیحراجکردنی تاڵەبانی و سەرکردایەتی یەکێتی بەرامبەر پارتی، هەربۆیە بەپێی رێککەوتنەکەی نێوانیان پارتی بەرامبەر ئەو کورسییانەی نەوشیروان لە هەڵبژاردن بەدەستی دێنێت کورسییەکانی یەکێتی کەمدەکاتەوە، کە ئەمەش گورزێکە نەوشیروان وەك قۆناغی یەکەمی پرۆژە گەلاڵەکراوەکەی لەتاڵەبانی و سەرکردایەتییەکەی دەوەشێنێت.

### ئەگەر لیستی گۆران سەرکەوت؟

هەرچەندە زۆرێك لەئەندامانی مەكتەب سیاسی و سەركردایەتی یەكێتی، پێشبینی ئەوە ناكەن لەم هەڵبژاردنەدا نەوشیروان مستەفا دەنگێكی ئەوتۆ بەدەست بهێنێت، كەمەترسی بۆ دوارۆژی حزبەكەیان دروست بكات، بەلاّم چاودێرانی سیاسی وای بۆدەچن نەوشیروان مستەفا وەك هەنگاوی یەكەم سەركەوتن بەدەست بهێنێت، وە لەیەكەم هەڵبژاردندا بەلیستی سەربەخۆ دەنگێكی باش كۆدەكاتەوە كەپرژەی زیانی ئەو سەركەوتنەش یەكەم كەس بەرپیاوە نەخۆشەكە دەكەوێت، دواتریش یەكێتی و ئەوانەی ئێستا سەربەرباڵی تاڵەبانین و لەسێبەری ئەودا لە لوتكەی دەسەلاّتی یەكێتیدا خۆیان دەبیننەوە دەبنە قوربانی پرۆژەكەی نەوشیروان مستەفا.

## هاتنه دەرەوەی کاك نەوشیروان ململانێیەکی خودییە و دەیەوێت شوێنگری مام جەلال بێت، ڕێگری سەرەکی لە گۆڕانی ناو یەکێتی ئەو برادەرانە بوون کە خۆیان ناوناوە باڵی ریفۆرم

شەنگار عبدالله

عارف روشدی رەخنەی توند لە نەوشیروان مستەفا و لیستی گۆڕان و باڵی ریفۆرم دەگرێ و بەهۆکاری بەربەستی گۆڕانکاری ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستانیان دەزانێ.

**ڕێگا: بەم نزیکانە هەڵبژاردنەکان دەکرێت ، پێشبینی چی دەکەیت لەم هەڵبژاردنە؟**

**عرف روشدی:** لەهەر وڵاتێکدا ئەگەر پرۆسەی دیموکراسی گەشەبکات و بەرە و پێشەوە بچێت بێ یەك و دوو دەبێت فرەدەنگی و فرەڕەنگی هەبێت، یەکێتی و پارتی وەك دوو هێزی سیاسی خەباتیان کردووە و ساڵانێکی دور و درێژ لەمەیدانی کاردا بوون، تەنانەت چەندین حزبی سیاسی ئێستا کەچوارچێوەی حزبیان هەیە، بەشی هەرە زۆرییان ئەندام بوون لەو دوو حزبەدا ئەمە شتێکی ئاساییە خەڵکی لەو حزبانە بچنەدەرەوە یان خەڵکی تازە بێنە پێشەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنێکە بۆ خەڵکی کوردستان و هەردوو حزبە سەرەکییەکەش کە ئەو زەمینەیان رەخساندووە، خەڵك بتوانێت ئازادانە بیر بکاتەوە و لیستی هەبێت بۆیە ئەمە پێشکەوتنێکی چۆنایەتییە لە کوردستاندا.

**ڕێگا: هاتنە دەرەوەی باڵی ریفۆرم لە یەکێتی چ زیانێك بەیەکێتی دەگەیەنێت؟**

**عارف روشدی:** من ڕای تایبەتیم هەیە لەبارەی ئەوەی هەقە ئەمانە ناوی خۆیان ناوە ریفۆرم؟ بەڵام ئازادیشن هەر ناوێك بۆخۆیان هەڵدەبژێرن، هەرکەسێك گۆڕانخوازبێت دەبێت خەڵك لێی بپرسێت لەو ماوە دور و درێژەدا تۆ لەکوێ بویت؟ کە ئێوە لەناو حزبێکی گەورە دابوون کەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە، ئەو حزبە لەهەموو کوردستان بەوەناسرابوو، کەدید و بۆچونی جیاوازی تێدایە، ئەو حزبە لەئەساسەوە سێ باڵی سەرەکی تێدا بوو، ئەو کلتورە رۆشنبیرییەی یەکێتی ئێستاش بەردەوامە، بۆیە دەبێت ئەو پرسیارە روبەروی ئەوان بکەینەوە بەوەی پێیان بڵێین بەراستی ئێوە ریفۆرمخوازن، چونکە ئەوبرادەرەی ئێستا سەرکردایەتی ئەو ئاراستەیە دەکات نەك هەرسکرتێری گشتی بوو، بەڵکو سکرتێری گشتی موکەڕەڕ بوو، ئەی باشە ئەوماوەیە ئەو هەموو دەسەڵاتەی

هەبوو، بۆ هەوڵی گۆرانکاری و چاکسازی نەدا؟ ئایا ئەوان بەراستیانە باوەریان بەچاکسازی هەیە، لە واقیعیشدا بەش بەحاڵی خۆم یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە مولائیم ترین هێز دەزانم کەدەتوانێت زەمینەی لەبار بۆ گۆرانکاری بەرهەم بهێنێ، چونکە باکگراوندێکی رۆشنبیری لەناو ئەو حزبەدا هەبووە، بۆیە هەموو هێزەکان دەتوانن گۆرانکاری بکەن، بۆیە لەهەر حاڵێکدا یەکێتی و پارتی دەتوانن زیاتر بەرنامەریژی پلانێك بکەن چاکسازی لێ بکەوێتەوە، ئەو برادەرانە باوەریان بەگۆرانکاری هەبوایە دەیانتوانی گۆرانکاری بکەن، بەس لەگەڵ رێزم بۆیان باوەرناکەم ئەوان باوەریان بەگۆران هەبێت ئەو ناوەجوانەی بۆخۆیان داناوە پێم وایە ناهەقن، باوەرت هەبێت لەزۆربەی کۆبونەوەکاندا ئەندامانی سەرکردایەتی(٤٥) کەس بوون، ئەگەر(٣٠) کەس قسەمان بکردایە، ئەوەندە رێز و حورمەت بۆ کاك نەوشیروان هەبوو مام جەلال دەیوت قسەکانی کاك نەوشیروان تەواوە، واتا کاك نەوشیروان باڵادەستییەکی بێسنوری هەبوو، دەیتوانی بریاری باش بدات، مام جەلال و سەرکردایەتیش رێزیان لێدەگرت، بەلام بەرای من بەکارهێنانی ریفۆرم لەجێی خۆیدا نییە، دەرچوونی ئەوان ململانێیەکی خودییە و دەیەوێت هەرچۆنێك بێت شوێنگری مام جەلال بێت، یان برادەرانی تر شوێنگری ئەوانی تر بن، ئەمەش بیرکردنەوەیەکی چەوت و سەپێنەرانەیە ئەو برادەرانە باس لە گۆران و شتی وا دەکەن ئوسوڵ حزبییە گروپێك دەیانەوێت ببنە باڵێك و یەکێتی بکەن بەحزبی مەنابە، بۆیە ئەوان دەتوانن لەکۆنگرەدا ئەو توێژانەی خۆیان بخەنە روو، ئەگەر توانیان زۆرترین دەنگی کۆنگرە بەدەست بهێنن ئەو کاتە دەتوانن کار بکەن بۆ ئەو ئاراستەیە.

**رێگا: ئایا ئەو ململانێیەی لەناو یەکێتیدا هەیە ئێستا هۆکاری چییە؟**

**عارف روشدی:** ئەو ململانێیەی ئێستا لەناو یەکێتیدا هەیە(3/4) سێ لەسەر چواری ململانێی شەخسییە، ئێمە ئەو برادەرانە باش دەناسین و چەندەها ساڵە پێکەوە کارمان کردووە، لەچوارچێوەی کێشەشەخسییەکاندا بترازێت زۆرکەم دەمێنیت باشیان کردبێتەوە، ئاساییە من دەیان رەخنەم هەبێت زۆرجار من رەخنەی توند دەگرم، من رازی نیم لەزۆرشت کە دەکرێت، بەلام ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنییە سەنگەر لەحزبەکەی خۆم بگرم، ئەمە کارێکی نەگونجاوە لەگەڵ داب و نەریتی حزبایەتی، ئەو هەڤاڵانە ئەگەر بەپێی پەیرەو مامەڵەیان لەگەڵ بکەین دەبێت لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکەین حزب نییە لەدونیادا لەهەڵبژاردندا بەدوو لیست دابەزێت، کە بووی بەدوو لیست دەبیت بە دوو حزب، چونکە

لیستێك دژی لیستێکی تر هەوڵدەدات، یەکێتی ڕێگری نەکردووە لەو هەڤاڵانە وەك ڕێکخراو یان حزبێك یان کوتلەیەك، بەڵام ئەگەر بێنو بەهەمان ناوی یەکێتییەوە لە مەیداندا بن ئەوە قبوڵناکرێت، ئێمە مامەڵەمان لەگەڵ ئەو لادانەدا بەپێی پەیرە و دەبێت.

**ڕێگا: ئەو برادەرانەی باڵی ریفۆرم دەڵێن لەناو یەکێتیدا بریار جەماعی نییە، ئەم قسەیە تا چەند ڕاستە؟**

**عارف ڕوشدی:** ئەگەر ئەوان دەڵێن بریار جەماعی نییە و کێشەی شەخسیمان نییە خۆ ئەوان دەسەڵاتدار بوون بۆ سیستەمیان دانەنا؟ بۆ نەیانتوانی شتە خراپەکان وە بنێن، بۆیە ئەم قسانە لای من بێزەمیرییە، چونکە ئەگەر باسی ئەوە بکەین پشکی شێر بەرئەوان دەکەوێت لە بێ سیستەمی، کلتوری قسەبەیەك وتن و یەك شکاندن ئێمە لەوان فێر بووین، دەیان جار جەنابی مام جەلال لەسەرکردایەتی وتویەتی ئەو خۆ خۆری و یەکتر شکاندن و ناو زڕاندنە بەسە، بۆیە ئەگەر لەناو یەکێتیدا ئەو کلتورە هەبێت ئەو برادەرانەلێی بەرپرسن.

**ڕێگا: هۆکاری دەست لەکارکێشانەوەی ئەو چوار مەکتەب سیاسییە چی بوو؟**

**عارف ڕوشدی:** ئەو پرسیارە یەکەم جار دەبێت لەوان بپرسرێت بەرای من ئەو(٤) ئەندام مەکتەب سیاسییە لەهەموو کەسێك بالادەست تر بوون، بەرپرسیارێتی گەورەیان هەبوو، بیانویەکیان نییە بۆئەوەی گۆرانکاری بکەن ئەگەر ئەوان نەتوانن گۆران بکەن ئەی من چۆن دەتوانم گۆران بکەم، خۆیان وەزیر بوون و خۆیان لەفەرماندەیی گشتی بوون نزیکترین کەس بوون لای مام جەلال زۆرجار گلەیی ئەوەمان کردووە مام جەلال لەبەرئەوان ئێمەی ئیهمال کردووە، بۆیە ئەمرۆدێن و ئەو قسانە بکەن دەبێت خۆیان لێپرسینەوە لە خۆیان بکەن.

**ڕێگا: بۆچی کۆبونەوەی سەرکردایەتیتان کردووە ئەندامانی باڵی ریفۆرمتان بانگهێشت نەکردووە؟**

**عارف ڕوشدی:** ئەو شەش کەسە لەبەرئەوە بانگ نەکران بۆ کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی، چونکە ئەوان کارکردنیان بەدەرە لە ئەتەکییەتی حزبایەتی و ڕۆژانە لێداوان دەدەن و تەشهیر بە حزب دەکەن، باشە تۆ چۆن ئەندامێکی سەرکردایەتیت یان مەکتەب سیاسییەکی چۆن حزبەکەت سوك و چروك دەکەیت ئەگەر ئامانجیان شکاندنی

فلاَن و فیساره ئەوا لەوە دەرچووە بۆیە تەنها مەبەستیان کەسێك نییە، بەڵکو یەکێتی و مێژووی یەکێتییە، پەیرەوی ئێمەش دوو شتی زەقی تێدایە کە ئەوان باش دەزانن دەڵێت ئەگەر هەرکەسێك دژایەتی حزبەکەی خۆی بکات یان هەوڵی تێکدانی ریزەکانی حیزبەکەی خۆی بدات لە ئەندامێتی دەکەوێت ئێ دەباشە ئەم برادەرانە ئەوەیان ئەنجام نەداوە، بەپێی پەیرەویش سیفەتی ئەندامییان لەدەستداوە ئێمە لەگەڵ ئەوەیشین بەپێی پەیرەو مامەڵەیان لەگەڵدابکرێت، ئەگەرچی زۆر کات درێژکرایەوە بۆ ئەوان بۆ ئەوەی ئەو مەسەلانەی دورە لە حزبایەتی وازی لێبهێنن، لەناو رێکخستنەکان و ئۆرگانەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان رای خۆیان بڵێن، زۆرجار ئێمە لەمەسەلەیەك تورە بوین هلتوین دانیشتوین بەمانگ و دومانگ و ساڵ نەشچوم تەشهیر بەحیزبەکەم بکەم، بۆیە رەخنە شتێکە و رەش کردنەوەی دەست کەوت و سەروەرییەکان شتێکی ترە.

**رێگا: ئەو شەش ئەندامەی باڵی ریفۆرم کۆمیتەی سەرکردایەتی باڵی ریفۆرمیان راگەیاندووە ئەمە تاچەند شەرعییە؟**

**عارف روشدی:** ئەوان خۆیان راگەیاندووە بەناوی کۆمیتەی سەرکردایەتی، ئەوان لادەرن و بەچی هەقێك ئەمەیان وتووە، ئەوانەی دژی سیاسەتی حیزبەکەی خۆیان کار دەکەن حزبەکە مەوجودە و(٣٧) مەڵبەندی هەیە، ئەگەر سەرکردایەتی شەرعییەتی نەبێت، دەبێت مەڵبەندەکان کەبەدەنی حیزبن ئەو شەرعییەتەمان لێ بسەننەوە ئەی کاك شەماڵ عبدولوەفا چۆن بوو بەئەندامی سەرکردایەتی؟ ئەی بۆچی بەشێوەیەکی نارەوا بوو بەئەندامی سەرکردایەتی؟ ئێمە نارازی بووین یان خۆی قبوڵی کرد، پێش نۆ مانگ پلینیۆممان کرد خۆیان ئەندامی پلینیۆم بوون ئەگەر ئەوە نا شەرعی بێت بۆچی هاتونەتە پلینیۆم، ئەی پلینیۆم(٨٠٠) ئەندامی تێدا بەشدار بوو، ئەو(٨٠٠) ئەندامە شەرعییەتی ئەو سەرکردایەتییەی نوێکردەوە، بۆیە ئێمە شەرعین، بەلاَم دەبێت ئەوان لەخۆیان بپرست بزانن شەرعین ئەو هەڤالاَنە لەمەڵبەندەکانی خۆیاندا دەنگیان نەهێناوە باشە ئەوەی دەنگی هێناوە شەرعییە یان ئەوەی دەنگی نەهێناوە؟

رێگا: ئایا بەنیازن لەم ماوەیەدا کۆنگرە ببەستن؟ کۆنگرە چارەسەری کێشەکانی یەکێتی دەکات؟

عارف روشدی: ئامادەکاری بۆکراوە دوای هەڵبژاردن کۆنگرە دەگرین، کۆنگرە بالاَترین دەسەلاَتە و هەموو پێکهاتەی حزب بەرە و گۆران دەچێت، لە کۆنگرەدا هەمووومان دەبینە

هاوڵاتی ئاسایی، ئەوکاتە کۆنگرە بڕیار دەدات، هەرکەسێ سیاسەت و ئەخلاقیەتی یەکێتی بەدڵ بێت ئێمە ڕێگرنین، ئەوەی ماوەیە ئەوەیە کە دەبینرێت ئەوکەسانەی دەرکراون و نانبراو کراون، هیچ کەسێك دەرنەکراوە و نابراو نەکراوە، ئەگەر بمان ویستایە خەڵك دەر بکەین. دەبوو دووساڵ لەمەوبەر دەیان کەسی وەك ئەوان دەر بکەین، چونکە بەپێی پەیرە و ئەگەر کاریان لەسەر بکەیت دەمێکە دەرکراون ئێمە هەموو شتێکمان قبوڵکرد و زۆر هەوڵماندا بە دیتنی یەك یەکیان و جەماعییان، بەڵام ئەوەی کە کراوە لە سنور دەرچووە، مام جەلال بەو تەمەنەوە چووەتە ماڵی ئەو برادەرانە و بانگکراون تەنانەت پرۆژەی چاکسازی تاڵەبانی نێردرابوو بۆ کاك نەوشیروان کاك نەوشیروانیش زیادەی خستبووە سەری، بەڵام ئەوبرادەرانە ناهێڵن پرۆژەکان سەربگرێت و جێبەجێ بکرێت، ئەو ناوهێنان و چاکسازییە مەبەستیان لە ڕێگرتنە، بۆیە خۆمان حازر دەکەین بۆ کۆنگرە ئەوان شتێکی تر دەهێننە پێشەوە، پێش ئەوەی ئەو زاراوانە لەگۆڕێ بن پرۆژەی مام جەلال بوو(چاکسازی وپاکسازی)نوسی، مام جەلال خۆی وتی(گەندەڵی هەیە، لەیەکەم دەزگاوە دەستی پێکرد دەزگای شەهیدان بوو بە بەرپرس و کارمەندەکانییەوە هەمویانی لادا)وتی(دەبێت سەرلەنوێ دەست پێبکەینەوە، دووەم وێستگە شارەوانی بوو، هەر ئەو برادەرانە بوون دەستی مام جەلالیان دەگرت و دەیان وت: نابێت ئەم کەسانە لا بدەیت، نەیانهێشت پرۆژەکەی مام جەلال سەر بگرێت، من پێش شەش ساڵ لە کوردسات وتومە بزافی کوردایەتی پێویستی بە چاکسازی هەیە، بەیەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە، بۆیە ئەمە شتێکی نوێ نییە فێرمان بکەن یان پێمان بفرۆشنەوە، یەکێتی لە بونییەوە تا ئەمڕۆ بەرنامەیەکی بوونی چاکسازییە، بەڵام چاکسازیش کات و زەمینەی لەباری دەوێت، بۆیە هەرکات ئێمە ویستومانە بەجددی چاکسازییەك بکەین ئەوبرادەرانە گرفتێکییان بۆ دروست کردوین هەر ئەمەیە نەمانتوانیوە بەردەوام بین واتا ڕێگری سەرەکی لە گۆڕان ئەو برادەرانە بوون کە خۆیان ناوناوە باڵی ریفۆرم، پێم خۆشە گۆڕان و لیستەکانی تر بەشداری هەڵبژاردن بکەن بۆ ئەوەی پەرلەمانێکی فرە ڕەنگمان هەبێت بەڵام ئەوانە نابێت بیانوو بەیەکێتی و پارتی بگرن، ئەوان نابێت خۆیان بە یەکێتی بناسێنن، ئەگینا چونەدەر ئاساییە، ئەگەر توانییان زۆرینەی دەنگ بەدەست بهێنن ئەوە ئێمە پیرۆزباییان لێدەکەین.

**ریگا: ئایا یەکێتی و پارتی قبوڵی گۆران دەکەن؟**

**عارف روشدی:** یەکێتی و پارتی بۆ قبوڵی گۆران ناکەن، ئەگەر قبوڵی گۆرانمان نەکردایە ئەو کەسانەمان دەگرت باسی گۆران دەکەن بەڵام باوەرمان بە گۆرانێکی فیعلییە نەك لەپێناو مەبەستە تایبەتەکانی خۆیاندا ئەو چەمکەش گەرِ و گول بکرێت. هەر رەخنەیەك جدی بێت و بنەمای هەبێت ئێمە گوێمان لێگرتووە، من حەز دەکەم میدیای ئازاد، ئازاد بێت، بەوەی بتوانێت هەموو دیوەکان ببینێت، بۆنمونە بەراوردی پێنج ساڵی سلێمانی بکات بە ئێستا ئەوکات بڵێت ئەم کەم و کورییانەش هەیە، شارۆچکەیەکی وەك سەید صادق وێران بوو لەسەردەمی بەعسدا، ئێستا زۆر جوان و ئاوەدان بووەتەوە خزمەتگوزاری باشی بۆ کراوە ئەی بۆ میدیای ئازاد باسی ئەو شتانە ناکات، ئنجا بڵێت ئەمە کەم و کورییە، زۆرجار ئێمە دەبینین رۆژنامەکان دەنوسن لەسەر فلان بابەتی ئێمە حوکومەت ئەو کارەی کردووە، واتا ئێمە موتابعین بەڵام کەزانیمان بۆ ناشیرین کردنی کوردە و بۆ هەندێ شتی تایبەتییە هەندێ جار ئێمە ئیهمالی دەکەین.

**ریگا: ئایا لیستی گۆران کاریگەری لەسەر ریکەوتننامەی ستراتیژی یەکێتی و پارتی دەبێت؟**

**عارف روشدی:** هیچ کاریگەرییەکی نابێت چونکە ئێمە و پارتی بەرپرسیارانە کار دەکەین و خۆمان بە بەرپرسی یەکەم دەزانین لە ژیانی خەڵکی کوردستان لە یەکلاکردنەوەی کێشە نەتەوەییەکان کەئێستا بە هەڵپەسێردراوی ماونەتەوە، بۆیە ئێمە لە پێناو حیزبایەتیدا کارناکەین، ئێمە زۆر ئارە زووی خۆمان وەلاوە ناوە لە پێناو مەسەلە گرنگەکان چونکە ئەگەر گەل و وڵاتی من نەما من چیم؟ بەداخەوە ئەو برادەرانە هەوڵ دەدەن ئەو ئەزمونە بروخێنن و ناوی بزرێنن، ئەوە کارێکی خراپە بۆیە دەتوانیین بەشدار بین بۆ چاککردن.

**ریگا: ماوەیەکە نوسینی توند دەنوسرێت لەسەر یەکتری، تا چەند ئەگەری هەڵگیرساندنی جەنگی لێدەکرێت؟**

**عارف روشدی:** من بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ زمانی زبر نیم، ئیتر ئەمە لە رۆژنامەی حزبی بێت یان ئەهلی من لەگەڵ ئەوەم بابەتییانە بیر لەمەسەلەکان بکرێنەوە، من دژی هەموو توند و تیژییەکم، بەڵام ئەوەی من لەرۆژنامەی حزبیدادەیبینم زۆر هێمنە، رۆژانە زۆر شتی ئیستیفزازی دەنوسرێت لەسە رۆژنامەکان ئەمانە بەئەنقەست وادەکەن کێشە

دروست بێت، بەڵام یەکێتی و پارتی و خەڵکی کوردستان لەوان هێمنتر و هۆشیارترن و توشی ئەو ئەزمە نابن.

**ڕێگا: تا چەند ئەوە ڕاستە ڕێککەوتنێك لەنێوان یەکێتی و پارتیدا هەیە بۆ چوارساڵی تر سەرۆکی حوکومەت و سەرۆکی هەرێم بۆ پارتی بێت؟**

**عارف روشدی:** کاك نێچیر وتی: (سەرۆکی حوکومەت مافی یەکێتییە )ئێمەش وارێککەوتوین تا دوای هەڵبژاردن هیچ ڕێککەوتنێکی نهێنیمان نییە، هەرچیمان هەیە ئاشکرایە هەموو ڕێککەوتنێکی ئێمە و پارتی بێت یان لایەنەکانی تر لە پێناو سەرخستنی ئەزمونەکەدایە.

یەکێتی و پارتی دوو حزبی بەرپرسن بۆیە قبوڵی ڕێککەوتنیان کردووە، وەك حزب مامەڵە ناکەن، بۆیە حزبایەتی ئێمە لەوە دەرچووە حزبایەتی بۆ حزب بێت حزبایەتی بۆ کێشەیەکە، حزبایەتی بۆ پاراستنی دەستکەوت وئەزمونێکە ئێمە و پارتی ئەو حەقیقەتە دەزانین بۆیە ئێمە قبوڵمانە، چ دەسەڵاتێك هەیە گلەیی لێنەکرێت، حزبی سۆسیالست دیموکراتی سوید(٧٥) ساڵ لەسەر حوکم بوو ئێستا ئۆپۆزسیۆنە، لەوانەیە خەڵك بیرێکی تری لێ پەیدا بێت، بۆیە خەڵکێك هەیە نارازییە و ئاسایشە نارازی بێت، لەوانەیە تۆ هاتبیت بۆلای من بۆ ئیشێك بەڵام من بۆم نەکردبیت، تۆ تورە دەبیت و دەڵێی دەنگ بەفلانەکەس نادەم.

**ڕێگا: ئایا ئەو گۆرانکارییەی لەم دواییەدا لەیەکێتیدا کرا لە پۆستەکان، خەڵك پێی وایە ئەمە بەس گۆرینی دەم و چاوەکانە و هیچی لەمەسەلەکان نەگۆڕیوە؟**

**عارف روشدی:** ئەو برادەرانە داوایان کردبوو کاك عمر فتاح بگۆڕێت، ئەی بۆ ئێستا پەشیمان بونەتەوە؟ خەڵك بگۆڕین گۆرانکاری نییە، ئەی گۆرانکاری چییە؟ من خۆم لەگەڵ گۆرانی سیستەمم، گۆرانی خەڵکیش شتێکی ئاساییە لابردنی کاك عمریش شتێکی ئاساییە، ئەگەرچی ماوەیەك نیگەران بوو، بەڵام ئێستا کاك عمر برای عەزیزی ئێمەیە و هیچ کێشەیەکی نییە.

**ڕێگا: بۆچی کۆمیتەی سەرکردایەتی لەکاتی خۆیدا کۆنابێتەوە؟**

**عارف روشدی:** ئەگەر خەڵکی تر جگە لەو برادەرانە قسەبکات قبوڵمە، بەڵام ئەوان بەربەستی کۆبونەوەن، خۆمان ئامادەدەکەین بۆ کۆبونەوە بەڵام ئەوان کێشەیەکمان بۆ دروست دەکەن، بەڵام من پێم باشە سەرکردایەتی هەر(٤) مانگ جارێك کۆببێتەوە لەگەڵ

بڕیاری جەماعیم، من ئەو قسانە لە تۆ قبوڵ دەکەم بەڵام لەو خەڵکانەی قبوڵناکەم کەخۆیان بونەتە هۆی دروست بوونی ئەم وەزعە.

**ڕێگا: دەڵێن سەرۆکی هەرێم خۆی کاندید کردووە و پرسی بەیەکێتی کردووە؟**

**عارف روشدی:** ئەگەر ئێمە دوو حزب بین لە یەك لیستدا کار بکەین مەعقولە پرس بەیەکتری نەکەین، نەك هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم، لەدانانی کاندیدەکانیش بۆ پەرلەمان پپرسمان بەیەکتری نەکردووە کاك مەسعود نوێنەری هەمووومانە و دەنگیشی بۆ دەدەین، بۆیە جوان نییە بۆ ئەو برادەرانەش هەموو شتێ بەرەنگی رەش ببینن.

**ڕێگا: ئایا بڕیارە بەم زووانە کەسی تر لەجێی ئەو(٤) ئەندامە دەست لەکارکێشاوەی مەکتەبی سیاسی دابنێن؟**

**عارف روشدی:** ئێمە بۆخاتری ڕێزگرتنی ئەو هەڤاڵانە ماوەیەکی زۆر دەزگاکانی خۆمان ئیفلیج کرد، هەر بۆ ئەوەی ئەو برادەرانە باشتر بیر بکەنەوە و بیر بکەنەوە و پەشیمان ببنەوە لە هەڵەکانی خۆیان، لەو ئەخیرەدا ئەو دام و دەزگایانە بێ بەرپرس بوون پرمان کردەوە، بۆ جێگەکەی ئەوان لە مەکتەب سیاسیش لە کۆنگرەدا پڕ دەکرێتەوە کە بڕیارە دوای هەڵبژاردنی پەرلەمان بکرێت ئەو برادەرانە هەموویان یەك دەستەن و بە ئیعازی کاك نەوشیروان دێن و دەچن.

**ڕێگا: ئایا ئێوە خاوەن یەکێتین یان ئەوان؟**

**عارف روشدی:** هەرکەس کار بۆیەکێتی بکات دەتوانێت خاوەنی یەکێتی بێت، بە پێچەوانەوە ئەوە ناتوان یەکێتی بن. بەوەی ئێستا دەیکەن ناتوانن خاوەنی یەکێتی بن، کۆنگرە بالادەسترین شتە و خۆی بڕیاردەدات، ئێمە ئێستا بەپێی پەیرەو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین.

عارف روشدی عارف ١٩٥٢ لەدایك بووە و خەڵکی زاخۆیە، لەساڵی ١٩٦٧ بۆ ١٩٦٨ تێکەڵ بەکاری سیاسی بووە و سەرەتا لە ریزەکانی پارتی کاریکردووە و بەرپرسی یەکێتی قوتابیانی پارتی بووە لە بەغدا، لەساڵی (١٩٧٦) ەوە، ئەندامی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە بەشداری لە سێیەم کۆنفرانسی کۆمەڵەی رەنجدەرانـدا کردووە، لە دوو کۆنگرەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵبژێردراوە، خاوەنی شەش منداڵە و لەسلێمانی دادەنیشێت، ئێستا ئەندامی سەرکردایەتی هەمان حیزبە لە خەتی گشتی.

## نەوشیروان مستەفا لەنێوان وشە و شمشێردا

چۆمان خەلیل

حەمەسەعید حەسەن و نەوشیروان مستەفا ناکۆکییەکی کۆن لەنێوانیاندا بوونی هەیە و درێژەشی کێشاوە، ناوبراو دەڵێ(هاوینی ساڵی ١٩٨٣ ئەرسەلان بایز کەئەوکات بەرپرسی راگەیاندن بوو، بەئامادەبوونی جەبار فەرمان پێی وتم(کتێبەکەت: یەکێتی نوسەرانی کورد چی بەسەرهات؟ لەژێر چاپدابوو لەسەر فەرمانی نەوشیروان مستەفا رامانگرت ).

حەمەسەعید حەسەن دەڵێ نەوشیروان لەکتێبی پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، جنێوی پێداوم بەڵام من ئەو هەلو مەرجەی ئەوپێدا تێپەڕیوە رەچاوی دەکەم و وڵامی نادەمەوە، چونکە دڵنیام ئەویش لەبنەرەتدا پیاوێکی چاك بووە، ئەوە بارودۆخە خراپەکانە خراپ کاریان تێکردووە، من هیچی تایبەتیم لەگەڵ ئەو نییە رێزیشم بۆ هەموو ماندوبووان و خۆ بەخت کردووە دڵسۆز و رابردوو خاوێنەکانی ریزی(ینك)بەڵام ناوبراو نوسیویەتی( دەڵێن هەرکەسێك لەگەڵ جەلال تاڵەبانی بەیەکێك لە هاوکارەکانی وتووە کەلەگەڵ مندا بەملاو بەولادا دێیت. بیت نەچێت پێشەکی هەندێك بەردبخە گیرفانەکانتەوە. خۆزگە تاڵەبانی بە نەوشیروانیشی وتبا زارت خاوێن بکەوە ئەوسا بنوسە ).

ناوبراو دەڵێ(ئەو زمانەی نەوشیروان پێی دەنوسێ نەك هەر پاراو نییە، بەڵکو زمانی کوردیش نییە، دیالێکتی ئەوانەیە کە بەبنەچە خەڵکی سلێمانین، ئەمجەد شاکەلی لە(سەرەتایەك بۆ خوێندنەوەی نوێی مێژووی چەپی کوردی دەڵێ(زۆربەی هەرە زۆری رێنوسی نەوشیروان مستەفا هەڵەیە، ئەو رێنوسەی ئەو پەیرەوی دەکات هی پەنجا و شێستەکانی ئەم سەدەیە ).

دەربارەی کتێبی پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، حەمەسەعید دەڵێ ئەم کتێبە زیاتر لە کەشکۆڵ دەچێت، لەباسی حزبی دیموکراتەوە دەچێتە سەر هاڕینی گەنم، لە بێتەلەوە دەچێتە سەر قورئان، لە جوودەوە دەچێتە سەر هەنگ، پشکۆ نەجمەدین لە کتێبی(سێبەری دیوی ناوەوەی روداوەکاندا)دەڵێ(راستییەکەی نەوشیروان بەکۆڵی کەری شەل دەگەڕێ)حەمەسەعید حەسەن لەکتێبی جەلالی نامەدا بەشێکی باسەکەی بریتییەلە(قەڵەم و شمشێر)کەباسی نوسینەکانی نەوشیروان مستەفا دەکات و تیایدا

نوسیوەیەتی(هەموو ئەوانەی لە نزیکەوە ئاگاداری بەسەرهاتەکانی کوردستانن و تێیدا ژیاون سەرەنجی خۆیان بەهەر شێوەیەك لەسەر بیرەوەرییەکانی نەوشیروان مستەفا أمین دەر بریبێت لەسەری ئەو کۆك و تەبان دەستپاکانە مامەڵەی لەتەك روداوەکاندا نەکردووە.

لە بزوتنەوەی کوردیدا گەلێ میر غەزەب هەڵکەوتوون، بەلام هیچیان بە تۆزی پێی نەوشیروان نەگەیشتوون.

حەمە سەعید حەسەن دەڵێ(لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٢ نامەیەکی نەوشیروان مستەفام لەڕێی شێرکۆ عبدالله وە لە سەروەختی ئەنفالەکاندا شەهید بوو، ئەو بوو لەساڵی ١٩٨٣ قەسابخانەی بۆ لایەنەکانی(جود)سازکرد. لەو بارەیەوە سەعد عبدالله لەکتێبی(نەوشیروان لە شیری هەتا پیری)دا دەڵێ(داوای لە چەکدارەکانی دەکرد پەرێزیان خاوێن بێت)مەبەستی ئەوە بوو دیلەکانیش بکوژن، نەوشیروان زۆربەوە نیگەران بوو کەخۆی سەری(جود)ی پانکردەوە، بەلام مەلا بەختیار پەڕ و باڵی نەکردن، هەر لەبەر ئەم هۆکارەش بوو غەزەبی لێگرت.

حەمەسەعید دەنوسێ(جەمالی ئەحمەد خورشە برای هونەرمەند جەلال کۆچەر، کەبەفەرمانی ئەو ئاداری ١٩٧٠ نارنجۆکێکی فرێدایە ئاهەنگی کچانی دواناوەندی سلێمانییەوە، پێنجی لێ بریندار کردبوون، لەسەنتەری سلێمانی لە سێدارە درا و نەوشیروانیش لەبەغدا وەك بەرزەکی بانان لەرێی نازم گزاری بەرێوەبەری ئاسایشی گشتییەوە بەرەو قاهیرە و پاشان بۆ نەمسا بۆی دەرچوو، ئەمەش سەعد عبدالله لەکتێی(نەوشیروان لە شیری هەتا پیری)لا٥٨ دا باسی کردووە، هەروەها لە(ئیدی ناتوانین بێدەنگ بین)ی ئالای شۆرشی ١٩٨٦ سوێد و لە رۆژنامەی برایەتی ١٩٩٦/٩/٣ دا باسکراوە، حەمەسەعید حەسەن وەك پەراوێز ئاماژەی پێکردووە، وریای وەهابی نەقار بەناوی ئەو لە سلێمانی چەند کەسێکی تیرۆر کرد، وەك(نو ری حەمە علی و عبدولی سۆران)هەوڵی تیرۆر کردنی بێستونی مەلا عومەریشی دا بەلام بۆی جێبەجێ نەکرا، وریا لە شاخ بە بێستونی وتبوو (ئەوە من بووم لەسەر خواستی سکرتێری کۆمەڵە تەقەم لێکردی، نەك ئاسایشی رژێم، وەك بۆی چوبوی ). لە کتێبی(سێبەری دیوی ناوەوەی روداوەکاندا)لا٥٦ کە پشکۆ نەجمەدین ساڵی ١٩٩٧ لە سوید چاپی کردووە حەمە سەعید نەقڵی کردووە(نەوشیروان بۆ ئەوەی دەستەکەی بەتەواوی نەکەوێتە ڕوو پایزی ١٩٨٣ رایسپارد وریایان تیرۆر کرد، لە کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا وتی وریا نهێنییەکانی کۆمەڵەی بە دوژمنانی ئێمە داوە، ئەگەر

زینـدوو بێتــەوە سـەدجاری تـری دەتۆپێنمـەوە.)ئەمـەش لەکتێبەکـەی نەوشـیروان مـستەفا خۆیدا لا١٦٥ دا باسی کردووە.

نەوشیروان داوای لـە وریـا کردبوو(فوئـادی مجید میـسری )ش تـیرۆر بکـات، ئـەویش بـە فوئادی وتبوو دەستم تێت ناچێت بتکوژم بەڵام یەکێکی تری دەست دەکـەوێت دەسـتی تێـت بچێت، ئەمەش یەکێك بـوو لـەو نهێنییانـەی کۆمەڵـە کـە وریـا درکانـدبووی، فوئـادی مجیـد میـسری دوای ئـەوە لەرێگـەی حەمـە سـەعید حەسـەنەوە نامەیـەکی ئاراسـتەی نەوشـیروان کردبوو بەمەبەستی ئەوەی لەخۆڕا نەیکوژن.

حەمە سەعید حەسەن لەو کتێبەیدا نوسیویەتی(بەهاری ١٩٨٣ کە جەمال تاهیرم بینـی و ئەو باسەم لەگەڵدا کردۆتەوە وتی راستە ئێمە نیـازی کوشـتنی فوئادمـان هـەبووە بـاش بـوو زوو زانیمان بەهەڵەدا چوو بوین. ئەگەر نا هەنوکە کوژرابـوو )، بـەڵام وەك حەمـە سـەعید حەسـەن نوسـیویەتی(نەوشـیروان خـۆی پێـی وتم ئێمـە دەسـتمان ناچـێتە خـوێنی هـیچ نوسـەرێك ئەگەرچـی فوئـاد لەهـەل و مـەرجێکی زۆر ناسکدا بـەجێی هێـشتین، مـن وریـام دەناسی هەفتەیەك پێش ئەووەی تیرۆر بکرێت، لەسـەرگەڵو کـە ئـەو رۆژە پێـشمەرگەی زۆر لێ بوو، بینیم دوای چاك و چۆنی یەکسەر پێی وتم چی زوتـره بـڕۆ لێـرە مەوەسـتە، نـازانم دەیویست لەگەڵ ئـەودا نـەم بینـن یـان دەترسـا هـەر لەوێـدا پـەلاماری بـدەن و منـیش بـەر بکەوم، ئاخر هیچ گومانی لەوە نەبوو کە دەیکوژن کە وریایان لەت و پەت کرد براکەشی کە پێـــشمەرگەی یـــەکێتی بـــوو فرێدایـــە ئـــەو زیندانـــەی ســـەرگەڵوو کـــە نەوشـــیروان لـــە کتێبی(پەنجەکان یەکتری دەشکێنن)وا بـەشان و باڵیدا هەڵدەدات دەڵێـی باسـی ئـوتێلی پێـنج ئەستێره دەکات.

دەربـارەی بـارزانی، حەمـە سـەعید دەڵـێ: لەروانگـەی نەوشیروانەوە بـارزانی کەسـێکی نەخوێندەوار و جنێو فرۆش بووە، ئەم بۆچونەشی لەکتێبی پەنجەکان دەشکێنن لـە لا٨٥ دا باس کردووە، چونکە بارزانی بەوەی کەچەندان پردی لە نێوان بزوتنەوەی کـورد و وڵاتـانی زل هێـز و دور و دراوسـێیان رۆنـا بـوو، کـەهاو زەمـان پەیوەنـدی خـۆی لەگـەڵ سـۆڤیەت و امریکـا و عـەرەب و جولەکـەدا پاراسـتبوو، ئەوانـە گـەواهی لەسـەر زیرەکـی ئـەو لـەبواری دبلۆماتیدا دەدەن، حەمە سـەعید دەڵـێ(نەوشـیروان ئـەو لێهاتووەی مەلامـستەفای بـەلاوازی نێوزەنـد دەکـات، کەچـی کـە جـەلال تاڵـەبانی سـەددامی لێـدەکات بـەنێو بـژیوان، بـەلای نەوشیروانەوە ئەو جۆرێکە لە دبلۆماسییەتی زیرەکانە.

جگە لەوە لەهەمان کتێب و لەلاپەرە ٧٤ دا دەڵێ بارزانی بە حوکومەتی وتووە(داخوازی من تەنها ئەوەیە ئاشتی هەبێت و بچمەوە بارزان و خەریکی شوانی بم ).

حەمە سەعید لەوەلامی ئەمەدا دەڵێ(کێ بروا بەوەدەکات ئەوێك لە ساڵی ١٩٤٦ جەنەراڵ بوبێت دوای فێربوونی زمانێکی تازە. خوێندن ئەزمونی دوانزەساڵی سۆڤیەت و شۆرشێکی نوێ لە ٦٤ دا بە شوانی قایل بێت لە هەمان کتێبدا و لە لا ١٠٣ دا نەوشیروان بە پێچەوانەوە دەڵێت(مەلا مستەفا لەگەڵ هیچ حوکومەتێکدا رێك نەکەوتووە ).

بەلاّم حەمەسەعید لەبەرگی سێیەمی رۆژژمێری پێشمەرگەیەك کە محمەدی حاجی محمود نوسیویەتی ئەوەی هێناوە(نەوشیروان مستەفا و رەسوڵ مەمەند کەلە ١٩٩١ بۆ سەندنی مافی کورد لە بەغداد دەبن. لەسەر ئەوەی کامیان لەپێشەوە بروان. دەست دەدەنە یەخەی یەکتری، رەسوڵ مەمەند کە بەدڵ شکاوییەوە بۆ کوردستان دەگەرێتەوە جانتا دبلۆماتییەکەی لەبەغداد بەبەڵگە نامە و مۆری حیزبەوە لێ بەجێدەمێنێ، دواتر ئاسایش بۆی دەهێنێتەوە.

## کۆمپانیای وشه، ساڵێك ڕێگا و تەواو کردنی ماوەی بێدەنگی

لڤین – تایبەت

*- کاتێك باڵی ریفۆرم لە هەڵبژاردنەکانی یەکێتی لەو دەنگانەی پێشبینی دەکرد کورتی هێنا، نەوشیروان مستەفا ڕێبەری ئەو باڵە لەناو یەکێتی هاتەدەرەوە و کۆمپانیایەکی ڕاگەیاندنی دروست کرد، لەسەرەتاوە هەموو خەڵك چاوەڕوانییەکی گەورەی لێ هەبوو، تەنانەت بەرلە بلاّو بونەوەی بەرهەمی ئەو کۆمپانیایە لە شێوە نوسین و ناوەڕۆك، خەڵك چاوەڕوانی ئەوە بوو شتێکی زۆر گەورە بەڕێوە بێت کە کاریگەری گەورەی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی جێ بهێڵێت، بەتایبەتی کاتێ کۆمپانیاکە مانیفێستی خۆی بەناوی(پەیامی سبەی)یەوە بلاچۆ کردووە، لەوانە ئاشکرا کردنی بودجە و چۆنیەتی خەرجکردنی و بەڕێوەبردنی تەندەر و قۆنتەراتی کۆمپانیاکان و هەڵسوکەوتی کاربەدەستان لەئەنجامی فەرمانەکانیان. پەیامەکەی(سبەی)کە پێدەچێت نەوشیروان خۆی نوسیبێتی، ئاماژە بەوە دەکات کە هێڵی سوری ئەوان، هۆشیاری سیاسیی لەبەرامبەر ئۆباڵی مێژوویدا کەئەمەش دەربرینێکی لاستیکی نارۆشنە و ئەو پرسیارەش دروست دەکات: ئایا بەفیعلی هێڵی سوری ئەوان بەرپرسیاری ئەوان بەرامبەر بە مێژوو یان کۆمەڵێك فاکتەری وەك فشاری شەخصی(تاڵەبانی و کۆسرەت رەسولّ، کەئەمەی دواییان هەر لەسەرەتاوە دژی کردنەوەی بووە. )دارایی و حزبی هێڵی سور ئەوانی دیاریکردووە، هەر لەسەرەتاشەوە کۆمپانیاکە کۆمەڵێك ئامانجی سەرەنج ڕاکێشی بۆخۆی دیاریکرد، بەلاّم ئەمە خەونێك بوو نەهاتەدی، سەرەتا سایتە ئەلکترۆنییەکە و پاشانیش ڕۆژنامەکەی نەیانتوانی لە ئاستی پێش بینی و چاوەڕوانییەکانییەکانی خەڵکدابن، لەمەشدا کێشەکەی نەوشیروان مستەفا ئەوە بوو واهەستی دەکرد ئەو قورساییەی خودی نوسین و قسەکانی خۆی لەسەر گۆڕەپانەکەهەیەتی، بۆ ستاف و هاوکارەکانیشی هەر ڕاستە، بۆیە جگەلە چەند وتارێکی خۆی کە سەرەنجی هەموو لایەکی بۆخۆی ڕاکێشا و کاریگەریشی هەبوو، زیاتر لەوە دەزگاکە نەیتوانی شتێکی زیاتر و ئەوتۆ بکات کە چاوەڕوانییەکانی خەڵك ڕازی بکات، تەنانەت دەست بەکار بوونی دەزگاکە بەو ڕاستەنزمەوە هەندێك جار کاریگەری لەسەر هێنانەخوارەوەی نەوشیروان لەناو گۆڕەپانە سیاسییەکەدا هەبووە. بۆنمونە: لاپەرەی

ڕۆژنامەکەی وشە نەیتوانی بگاتە ئاستی ڕۆژنامە ئەهلییەکانی وەك(هاوڵاتی)و(ئاوێنە)و هیچی لەلاپەڕەکی دیکەی کوردستان زیاتر نەبوو. هەروەها تیراژی ڕۆژنامەکە لە هەفتەی یەکەمدا کە ٥٠٠٠ دانە بوو، هەندێك ڕۆژیش لە بازاردا نەدەما، هێندەی نەدەخایاند ئەم تیراژە هاتە کزی و ڕۆژ بەڕۆژ بەرە و داشکان چوو، تا لە خراپترین ئاستیدا گەشتە ١٣٠٠ دانە و گەراوەکانی لە ڕۆژێکدا بۆ نزیکەی ٣٠٠٠ دانە بەرز بویەوە، کە بەپێی خەملاندنێك تەنها تێچووی گەراوەکانی لەمانگێکدا ٣٩٠٠٠ ملیۆن دینار بووە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کادرە باڵاکانی ئەو کۆمپانیایە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ڕاستە خەڵك چاوەڕوانی زۆریان لەو کۆمپانیایە هەبووە، بەڵام ئەوەش دەڵێن کەخەڵکی ئەرکێکی زۆر قورسیان داوەتە ئەو کۆمپانیایە کەلەڕاستیدا ئەرکی ئەوان نییە وەك کۆمپانیایەکی ڕاگەیاندن، ئەوان دەڵێن خەڵك حەزی دەکرد ئێمە لەبەرامبەر دەسەڵاتدا سەری ڕم بین، بەڵام کاری ئێمە ئەوە نییە، بەڵکو کاری ئێمە چاکسازیکردنی دەسەڵاتە نەك ڕوخاندنی، هەرچەندە هەندێك لە بەرپرسانی ئەو دەزگایە لەو باوەڕەدان کەدەسەڵاتی کوردی نییەتی بۆ خۆچکردنی نییە، لەسەر و هەموو ئەوانەی کە ئەم باوەڕەیان هەیە، نەوشیروان مستەفایە، هەروەها جەخت لەسەر ئەوەش دەکەنەوە وتاری ئەوان ڕوو لەدەسەڵاتە نەك جەماوەر، ئەوان پێیان وایە وتاری ڕاگەیاندنی ئەوان ڕوو لەدەسەڵاتە نەك جەماوەر و پێشیان وایە ئەم کارەیان کردووە، ڕەنگە هەر ئەمەش بێت وای کردبێت تا ئێستا ڕۆژنامەکەیان ڕۆژنامەیەکی جەماوەری نەبێت.

دابەزینی تیراژی ڕۆژنامەکە بەو شێوە چاوەڕواننەکراوە، مانای ئەوە بوو کەسەرسامی خەڵك بە پرۆژە ڕیفۆرمییەکەی نەوشیروان مستەفا، ڕوو لە کزییە و تەنانەت لە هەندێك باردا کاریگەری لەسەر پاشەکشەی ئەو باڵەهەبوو کە هەموو کەس پێی وابوو دەبێتە دیاردەیەکی سیاسی تازە لە کوردستاندا، چونکە خەڵك چاوی لە هێزەکە بەخێرای و قورسایی زۆرەوە بێت و گۆڕان دروست بکات، بەڵام لەمەدا ناکرێت هەموو تاوانەکە بکرێتە پاڵ ڕۆژنامە و سایتەکە و ستافەکانیان، بەڵکو ڕاستتر ئەوەیە ئەو سیاسەتەی کە لە پشتەوە دەزگاکە بەڕێوە دەبات بەوستراتیژییەوە و لەوباڕودۆخەی نەوشیروان مستەفای تێدایە کە نیوەی لەشی لە ناو حیزب و نیوەکەی کەشی لە دەرەوەیە، دەتوانێت هەرئەوەبکات بەڵگەش بۆئەوە، گۆڕینی چەند جارەی ستافەکەیەتی کەنەیتوانی ئەم کێشەیە چارەسەر بکات، لەم ڕووەشەوە بەرپرسانی کۆمپانیای وشە پاساوی خۆیان هەیە، لەسەرروو هەمویانەوەیە ئەوەیە

که هێشتا کۆمپانیاکه له قۆناغی خۆ دروست کردندایه و هێشتا گۆرانکاری لـه ستافەکەیدا بەردەوامه و خاسیەتی دەسەڵات و حزبیش بەرامبەریان هەر ئەوەنده هەڵدەگرێت، کەواتـه هێشتا نەوشیروان مستەفا نایەوێت شەری دەسەڵات بکات.

وەرگرتنـی ۲۲ ملیـۆن دۆلار بـه دوو وەجبـه لەیـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان و خـودی تاڵەبانی و لەسەر ئەوبەشه پارەیەی که ئیدارەی یەکێتی لەو بودجه بەری کەوتبوو، مانـای وایه که ئەم پرۆژەیه چاوی لەدەستی خـەڵکی دیکەیـه، بۆیـه پێناچێت بەسانایی یـەکێتی رازی ببێت ئەو پارەیـه لـه دژی خـۆی هەڵبـسورێنێت، وەك ئـەوەی لـه ئێـستادا هەنـدێك لـه بەرپرسی یەکێتی دەیڵێن، بۆیه له حاڵەتی تەواو بـوونی ئـەو برەپارەیـەدا، هەمیشه ترسـی دوبـاره کردنـەوەی لـه ئارادایـه و لـەم حاڵەتەشـدا بەتـەنها کۆمـەکی دۆسـتەکانی نـاتوانێ دەرەقەتی خـەرجی زۆری ئـەو پرۆژەیـه بێـت مەواخـەریکه کـەناڵی ئاسمانیـشی دێتـه سـەر، دوایەمین قسەش لەمبارەیەوە ئەوەیه کەتاڵەبانی به ئاشکرایی نارەزایی خۆی به نەوشیروان مستەفا گەیاندووه له سەر کەوتنەکاری کەناڵەئاسمانییەکەدا و وتوویەتی: (بریار بووه ئێوه دەزگای لێکۆ لینـەوه دروست بکـەن نـەك کـەناڵی ئاسمـانی و رۆژنامـه و. ..)ئەمـەش مانـای ئەوەیه کەئەگەر تاڵەبانی رێگری لـه کردنـەوەی ئـەو کەناڵەئاسمانییەنـەکات، ئـەوا پارەشـی پێنادات، ئەمەش گـەورەترین کێـشه بـۆ کۆمپانیاکـه دروست دەکات کەئەگـەر تاڵـەبانی رای نەگۆرێت، دۆزینەوەی چارەسەر هەروا کارێکی ئاسان نییه بۆی، ئەمەش دەبێته سـەرەتایەك بـۆ شـەر راسـتەوخۆ داخراوەکـه لەرێیراگەیاندنـەوه، نەوشـیروان کاتێـك لەیەکێتیـدا بـوو، بـرِوای وابـوو بەرۆشـتنی ئـەو یـەکێتی دەروخێـت و مـام جـەلال دەچێت داوا لەئـەو دەکات بگەرێتەوه، بەواتایەکی دیکه کەیەکێتی روخا، بەئەو نەبێت، بەکـەس هەڵناسـتێتەوه و ئـەو دەبێـت بـچێت دەورەی بداتـەوه، کەچـی ئـەو تێروانینـەش وا دەرنەچـوو، بەتایبـەتی کـه تاڵەبانی گەران بەشوێن خەونه تایبەتییـەکانی خۆیـدا، لـه ئاینـدەی یـەکێتی لـەلاگرنگتره و نایەوێت لەگەڵ دەور و بەرەکەیدا توشی هیچ روبەروبونەوەیەك ببێتەوه که ئێستای بخاتـه مەترسییەوه، هەروەك دەرکەوت تاڵەبانی بۆ پاراستنی زیاتری بارودۆخی خـۆیی و یـەکێتی، پەنای بۆ پارتی برد نەك نەوشیروان مستەفا.

لەسـەرەتاوه پـارتی بەترسـەوه دەیروانییـه ئـەم پرۆژەیـەی نەوشـیروان مـستەفا و بەکەناڵێکی دادەنا که ئامانجی له پێش بینی ئەوان بێت نەك شتێکی تر، بۆ رەوانەوەی ئـەم

ترسەش نەوشیروان ویستی دانوستانێك لەگەڵ پارتی و بارزانی بكات، ئەوە بوو جارێك مسعود بارزانی بینی و قسەشیان لەسەر چەندان مەسەلەی گرنگ كردبوو، تەنانەت باس لەوەش كرابوو كە كۆمپانیای وشە لەلایەن مسعود بارزانییەوە یارمەتی بدرێت.

دواتر بریار بوو چاوی بەنێچیرڤان بارزانی بكەوێت و لە دانیشتنی لەگەڵ نێچیرڤاندا داوای یارمەتی بۆ كۆمپانیای وشە لێبكات، بەلآم دواتر هاوكێشەكان بە پێچەوانە بونەوە، بەدەرچونی رۆژنامەكە پارتی ئەو مەترسییەی نەما كە چاوەروانی دەكرد، چونكە وادەزانرا لەو رۆژنامەیە بەلگەو دۆكۆمێنتی وا دەخرێتە ڕوو كە حوكومەت لە بەرامبەر خەڵكدا ئیحراج بكات. كەچی هەموو ئەمانە وا دەرنەچوون، رەنگە ئەو بەڵگانەی لای نەوشیروان مستەفا هەبێت بەلآم هۆكاری بلآو كردنەوەیان بەهۆی ئەو بەربەستە گەورانە بێت كەلەبەردەم نەوشیروان و پرۆژەكەییدا هەن. ئەوەیان پرسیارێكەو وەلآمەكەی لای خۆیەتی. رەنگە لایەنێكی تری ئەم پشت گوێ خستنەی كۆمپانیای وشە. پەیوەندی بەرێكەوتنی ستراتیژی نێوان پارتی و یەكێتییەوە هەبێت، بۆ سەركوتكردنی میدیا و دەنگی جیاواز لەكوردستاندا.

بلآوبونەوەی چەند وتارێكە نەوشیروان مستەفا لەسەر پەرلەمان و مادەی(١٤٠)و چارەنوسی كەركوك، سەركردایەتی كوردی تەواو تورە كرد بە خودی بارزانیشەوە، دەستبردنی نەوشیروان مستەفا بۆ ئەو بابەتە لەبەر ئەوەبوو گەورەترین خاڵی لاوازی سەركردایەتی كورد و سیاسەتەكەی، مادەی(١٤٠)بوو، ئەگەرنا نەوشیروان مستەفاش یەكێك بو لەوانەی لە نوسینەوەی دەستوری هەمیشەیی عێراق و دارشتنی ئەو مادەیەدا بەشدار بوو، بەپێی زانیارییەكانی(لڤین)دوابەدوای بلآوبونەوەی وتارەكەش هەر زوو پارتی نیگەرانی خۆی لەسەر ئەو وتارە گەیاندە یەكێتی و لەم رووەشەوە تاڵەبانی خاڵی دڵنیاكەرەوەی پارتییە كە دەزگاكەی نەوشیروان هێڵی سور نەبەزێنێت. بەلآم پێناچێت ئەم زامانەی پارتی تاسەربێت، ئەگەر نەوشیروان بگاتە ئەو ئاستەی دەتوانێت دور لە هاوكاری تاڵەبانی كۆمپانیاكەی لەرووی داراییەوە بەرێوە بەرێت. هەتا ئێستا گەورەترین كێشەی نەوشیروان و كۆمپانیاكەی ئەوییە تەنانەت بلآوكردنەوەی هەواڵێكی لەرۆژنامە و سایتەكەیدا، بە سیاسەت لەسەری حساب دەكرێت، نەك وەك كارێكی رۆژنامەوانی.

ماركس دەڵێت(دوای نیوسەدە لە بیر و باوەرێك و رێبازێك ئەگەر سەركەوتوو نەبو بێت، پێچەوانەی بكەوە.) دەكرێت بڵێین نەوشیروان مستەفا ئەمرۆ بەو بیر و ڕایەوە دێتە سەر

گۆڕەپانی سیاسی کوردستان بەڵام بۆ ئاینده نەك بۆ ئێستا دوای ئەوەی لە ڕێچکەکەی سەرکەوتوو نەبوو، ئەمجارە دەیەوێت پێچەوانەی بکاتەوە، ئەوەش بەرێککەوتن لەگەڵ ئیسلامییەکاندا، ڕەنگە نەوشیروان مستەفا گەشتبێتە ئەو باوەڕەی کە تەنها بەدیل بۆ دەسەلاتی کوردی لایەنە ئیسلامییەکانە. بۆیە دور نییە ئەگەر بڵێین ئەویش دەیەوێت دەستێکی باڵای لە ئاڵوگۆڕی هاوکێشەکاندا هەبێت، لە بەرامبەریشدا ئیسلامییەکان دەیانەوێت لە نەوشیروان مستەفا نزیك ببنەوە، چونکە ئەو ئەزمونێکی گەورە و شارەزاییەکی زۆری لە سیاسەت و سیستەمی بەڕێوە بردن هەیە، بەحوکمی ئەوەی چەندین ساڵ دارێژەری سیاسەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بووە، جگە لەوەش باڵی ریفۆرم باڵێکی گەورەی ناوچەی سلێمانی و گەرمیان بووە، لەو لاشەوە وەك نوسەرێکی گەورەی کورد کاریگەری زۆری لەسەر خەڵکی کەرکوك دروستکردووە، ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی بتوانێت لە داهاتوودا بۆ هەر مەسەلەیەکی سیاسی خەڵکێکی زۆری لەگەڵدا بێت، لە کاتێکدا یەکگرتوی ئیسلامی لەناوچەی ـ بادینان و هەڵبجە ـ کۆمەڵیش لەناوچەکانی ـ پشدەر و بتوێن و بەتایبەتیش لە رانیە ـ جەماوەرێکی بەرچاویان هەیە، بۆیە دورنییە ئەم هێزانە بەئاراستەی نزیك بونەوە لە یەکتری کار بکەن. بەم هاوپشتییەی نەوشیروان مستەفا ئیتر ئیسلامییەکان دەتوانن لەپاڵ دۆستە نوێیەکەیاندا دەنگیان بەرزتر بێت و بوێرانە قسەبکەن، لەم ڕووەوە تێبینی دەکرێت نەوشیروان وردە وردە لە ئیسلامییەکان نزیك ببێتەوە، بۆنمونە: علی باپیر کە ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامییە سەردانێکی تایبەتی بۆلای نەوشیروان مستەفا کرد و چاوی پێکەوت، علی باپیر راستە پێشمەرگەی کۆن بووە، بەلام لەروی بیر و باوەڕەوە لەگەڵ نەوشیرواندا دوو جەمسەری جیان، هاوکات نزیك بونەوەیەکیش لەگەڵ یەکگرتووی ئیسلامیدا لەم ماوەیەدا پەیدا بوو ئەگەر سەیر بکەین کۆمپانیای وشە بەپێچەوانەی دەزگا حزبییەکانی دیکەوە سانسۆری لەسەر ئەندامانی یەکگرتوو لە کۆمپانیاکەی نییە، جگەلەوەش تەلەفزیۆنی هەولێری یەکگرتوو زۆربەی سەردێری هەواڵەکانی هی رۆژنامەی رۆژنامە و سایتی سبەی ـ یە لەکاتێکدا زۆربەی ئەو هەواڵانەی تەلەفزیۆنی یەکگرتوو لە کۆمپانیای وشە وەری دەگرێت خۆیان دەتوانن بەئاسانی بەدەستی بهێنن یان لە رۆژنامەکانی دیکەشەوە وەری بگرن بەلام لەم نێوەندەدا هەست بەجۆرێ لە سیاسەتی لەیەکتر نزیکبونەوە دەکرێت.

بەنمونـە: مـانگی حـەوتی سـاڵی رابـردوو هـەواڵێك لـە رۆژنامـەی رۆژنامـە لەسـەر یەکگرتووی ئیسلامی بڵاوکرایەوە، ناوەرۆکی هەواڵەکە باسی لـەگرتنی بانـدێکی تیرۆرسـتی دەکرد، کە گوایـە دوان لـەو بانـدە کە ژمارەیـان حـەوت کـەس بـووە، ئەنـدامی یـەکگرتووی ئیسلامین و تەواوی باندەکەش لەئاسایشی بەردەرەش دەستگیر کـراون، بەبڵاوبونـەوەی ئـەم هەواڵە نەوشیروان مستەفا رەخنەی لـە سـتافی رۆژنامەکە گرتبـوو وتبـووی(نەدەبوایـە ئـەم هەواڵـە لەسـەر یـەکگرتووی ئیـسلامی بڵاوبکرێتـەوە، چـونکە جیـاوازی یـەکگرتوو لەگـەڵ یەکێتی و پارتی بۆ ئێمە نییە و تەنانەت یەکگرتوو لەیەکێتی و پارتی بۆ ئێمە گرنگترن ).

بـە پێەوانـەی پێـشوشەوە. واتـا ئەوکاتـەی نەوشـیروان مـستەفا لـەریزی سـەرکردایەتی یەکێتی دا بوو، ئێستا ئیسلامییەکان تێروانینیـان بـۆ ئـەو جیاوازترە پێشتر ئەوەنـدە لێـی نزیك دەبونەوە و قسەشیان لەبارەیەوە نەدەکرد، بەڵام ئێستا ئەمەپێچەوانە بۆتەوە، ئەگەر سەیر بکەین زۆرێك لە بەرپرسە حزبی و حوکومییەکانی حزبە ئیسلامییەکان لە رۆژنامـە نوسـانی ئـەو دەزگایـە نـزیکن و تەنانـەت موجامەلـەی دەزگاکـەش زۆر دەکـەن، بـۆ هـەر زانیارییـەکیش بـۆ ئـەو دەزگایـە، کـەمجار هەیـە رەت بکرێتـەوە زۆربەئاسـانی زانیارییـان پێدەدەن، لە کاتێکدا ئەو رۆژنامە نوسانە لـە دەزگاکـانی دیکـە بـوون و بەوشێوەیە لەلایـەن ئەو بەرپرسانەوە زانیارییان پێ نەدەدرا.

هـەروەها نزیـك بونەوەیـەکیش لـەنێوان جەوهـەر نـامیق و نەوشـیروانـدا دەبینرێـت کەیەکـەمیان نارەزاییـەکی بێـدەنگ و دووەمیـان نارازییـەکی قسەکەرە بـەبروای هەنـدێك ئەوەی ئەم دوانەبەیەکەوە کۆدەکاتەوە ئەوە یە هەردووکیان کار لەسـەر پـرۆژەی ریفـۆرمی دەسەڵات دەکەن، هەر لەم روانگەیەشەوە جەوهەر نامیق بەشێك لە نوسـین و راکـانی خـۆی لـە رێگـەی رۆژنامـەی رۆژنامـەوە بڵاودەکاتـەوە، ئەمـەش مانـای ئەوەیـە خـەریکـە دەنگـە نارازییەکان کۆدەبنەوە دەیانەوێت گوشارەکە بۆ سەر دەسەڵات زیاد بکەن.

ئەوەی هەنوکە دەبینرێت کە وتارە ئیعلانییەکەی وشە، گۆرانی گـەورەی پێوەدیارە کـە دەکرێت ناوی لـێ بنرێـت شـکاندنی بێـدەنگی و گـۆرینی سیاسـەتی کـارکردن کـە رەنگـە بـێ ئومێد بـوونی نەوشـیروان مـستەفا لـە تاڵەبانی هۆکـاری سـەرەکی بێـت ، بەهـەمان شـێوەش یـەکێتی بەهـەموو ئۆرگانـە ئیعلامییـەکانی خۆیـەوە خـەریکی وەڵامدانـەوەی تونـدی کۆمپانیاکە و رۆژنامەکەیەتی و رۆژ بە رۆژیش ململانێکە توندتر دەبێتەوە کە ئایندەیەکی باشی لێ چاوەروان ناکرێت چونکە ئەگەر تاڵەبانییان بۆ رازی بکرێـت ژمـارەی ئەوانـە لـەناو یەکێتیـدا کـەم نییـە کـە دەیانـەوێت لـەم مۆتەکەیـە رزگاریـان بێـت کـە نـاوی(کۆمپانیـای وشەیە).

## ململانێی ناوخۆی یەکێتی لەسەرەتای دروست بوونییەوەتا ئێستا

عەتا قەرەداغی

لێبوردەیی و یەکتر قبوڵکردن، دەشێت لەروی زمانەوە وەکو هەزارەها زاراوەی تر سەیر بکرێت، بەڵام کاتێك وەکو دوو چەمکی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئەخلاقی، سەیر بکرێن، ئەوە دەبێتە بنەما بۆ بریاردان لەسەر شۆرشی کۆمەڵگا جیاوازەکان و وەکو پێوانەش بەکاردێت، بۆئەوەی ئاستی پێشکەوتن و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیی پێ بپێورێت دیارە ئەوە ئاشکرایە کە.ئەم دوو چەمکەش هاو زەمەن و هاو زادەی زەمەن و لەدایك بوون یان دەرکەوتنی دیموکراسی و فرەرەهەندین لە هەموو ئاستەکانی ژیاندا.

لە کۆمەڵی کوردەواریدا ئەم دوو چەمکە لەدوای راپەرینەوە لەسەر ئاستی زەمان دەرکەوتوون، بەڵام دەرکەوتنیان لەسەر زەمینەی واقع و لە ئاستی پیادەکردندا هێشتا لاوازە و تەنانەت لەئاستی نەبو دایە، رەنگە ئەوانەی لە کۆمەڵگەی ئێمەدا باسی ئەم دوو چەمکە دەکەن بریتی بن لە نوخبەی سیاسی و نوخبەی رۆشنبیران، بۆیە جێگای خۆیەتی چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئەم دوو نوخبەیە لەگەڵ ئەم دوو چەمکەدا لەسەر زەمینەی واقع بخەینە بەردەم لێدوان.

لێرەدا دەربارەی هەڵسو کەوتی نوخبەی سیاسی لەو بوارەدا دەدوێین، ئەگەر سەرەنجی نوخبەی یەکەمیان بدەین کە نوخبەی سیاسین لەناو حزبە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا ئەوە ئەمانە لە هەموو کەس لەبارەی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و فرەدەنگی و فرە رەنگی و یەکتر قبوڵکردن و لێبوردنەوە دەدوێن، بەڵام ئایا ئەم نوخبەیە لەروی راستییەوە تا چ ئاستێك لەم چەمکانە تێگەیشتوون، ئەگەر تێگەشتون تا چ ئاستێك لە رەفتار کردن لەگەڵ گەوهەری ئەم چەمکانەداراستگۆن؟ ئایا ئەم نوخبەیە بەبرواوە لەم چەمکانە دەدوێن؟ یان وەکو مۆدی سەردەم ئەم چەمکانە بەکاردەهێنن بۆ خۆبردنە پێشەوە لەنێو دامەزراوی حزبی خۆیاندا و بۆ پارێزگاریکردن لە جەماوەرێتی خۆیان لەناو کۆمەڵگەدا؟ بۆ وەڵامدانەو ەی ئەم قرسیارانە باشترین شت ئەوەیە سەیری گەوهەر و ماهیەتی ئەو نوخبەسیاسییەی خۆیان بکەین لە ئاستی یەکەمیشدا لەوە بدوێین، کەتا چ ئەندازەیەك

لەنێو دامەزراوەی حزبی خۆیاندا، یەکتر قبوڵ دەکەن و لەدوای ئەویش لەنێوان حزبە جیاوازەکاندا یەکتر قبوڵ دەکەن؟

**بەشداریکردن لە پرۆژەی کوشتنی باوکدا**

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی پێشوو، هەتا چەند دەیەیەك دەگەڕێینە دواوە لە بارەی نوخبەی ئەو حزبانەوە دەدوێن، لە سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلولدا، وەکو سیاسییەکی کاریزمی سەرکردایەتی ئەو شۆڕشەی دەکرد، لەخوار ئەوەوە نوخبەیەکی سیاسی لەمەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی ئەو حزبەدا بوون، کە نمونەی دیاریان: ابراهیم احمد و همزە عبدالله و نوری شاوەیس و جەلال تاڵەبانی و. .... هتد. ئایا سەرباری ئەوەی کە ئەم نوخبەیە بەیەکەوە لە یەك حیزبدا کۆبونەتەوە تا چ ئاستێك پێکەوە ژیاون و یەکتریان قبوڵکردووە لە ناکۆکییەکاندا توانای دایەلۆگیان هەبووە و لە هەڵەکردن بەرامبەر یەکتر، توانای لێبوردنیان هەبووە؟ بەهەرحاڵ من نامەوێت لێرەدا خۆم بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەوە خەریك بکەم. بەڵام دابەشبونی ئەم نوخبەیە و لاوازبونیان لە بەرامبەر کەسێتی بارزانیدا چ پێش جیابونەوەی ساڵی ١٩٦٤ و چ گەڕانەوەی بەشێکی دیاریان بۆ لای سەرکردایەتی بارزانی لەدوای جیابونەوە، بەڵگەی نەگونجان و یەکتر قبوڵنەکردن و لاوازیی ئاستی لێبوردەیی بووە لەیەکتری، ئەوە جگە لەوەی کە هەریەکە لە ئەندامانی ئەو نوخبەیە لە روانگەی بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە سەیری هەڵوێست وەرگرتنیان کردووە و ئەنجامبش لەجیاتی بیر و باوەڕ و ئایدۆلۆژیا.(بەرژەوەندی)هەڵوێستیانی دیاریکردووە، هەرئەوەش وایکردووە کە بەشێکی دیار لەو نوخبەیە بگەڕێنەوە بۆ لای بارزانی و پشت لەبەشەکەی تری ئەو نوخبەیە بکەن و نەشتوانن لەسەر بنەمای جیاواز بۆچون و روانین بۆ مەسەلەکان، هەڵوێستی خۆیان دیاری بکەن.

بەجۆرێك بەشێك لەو نوخبەیە بگەڕێنەوە بۆ لای سەرکردایەتی بارزانی و چاوەڕوانی لێبوردەیی بکەنٙ و دیسان قبوڵکردنەوەیان لەلایەن بارزانییەوە هۆکاری ئاشکرای ئەو گەڕانەوەیە بووە. کەچی دواتر لەنێوان نوخبەی جیابووەوە و نەگەڕاوە و نوخبەی گەڕاوە بۆلای بارزانی، نەك دایەلۆگ و یەکتر قبوڵکردن دروست نەبووەوە، بەڵکو شەڕی خوێناویش کراوە. سەرەنجام ئەو نوخبە سیاسییەی کە پێشتر پێکەوە لەسەرکردایەتی پارتیدا بوون، لەدوای دابەش بوون سەختترین دوژمنایەتی یەکترییان کردووە و ئەو باڵەی کە جیابونەتەوە، نەیانتوانیوە جیاواز لەو روانینەی کە بۆ بارزانی هەیانبووە، سەیری نوخبەی

ڕۆشنبیرییەکەی لای بارزانی بکەن، هەروەك ئەو نوخبەیەی لای بارزانیش نەك هیچ دەورێکی نوخبەییان بۆ لەیەکتر نزیك بونەوە و دروستکردنی دایەلۆگ و یەکتر قبوڵکردن و هاندانی بارزانی بۆ لێبوردەیی و ئاشتبونەوە لەگەڵ باڵی جیاوازدا نەبوون، بەڵکو دەوری نێگەتیڤیشیان هەبووە لە ئاڵۆزکردنی کێشەکاندا و دەتوانین لە کاتێکی تردا ئەو دەورە نێگەتیڤەی نوخبەی سیاسی ئەو قۆناغە بخەینە بەردەم لێدوانەوە، بەهەرحاڵ لەڕێککەوتننامەی ئازاری ساڵی (١٩٧٠)شدا ئەوەی کورە هەڵگەراوەکانی قبوڵکردەوە و لێبوردەیی هەبوو، بارزانی خۆی بوو، نەك نوخبەی ڕۆشنبیری ناو سەرکردایەتی شۆڕش دەشێت لێرەشدا ئەو پرسیارەش سەر هەڵبدات: ئایا ئەگەر مەسەلەکە بەپێچەوانەوە بوایە، تەرازوی هێز بەلای نوخبەی جیاوازەوەی(إبراهیم – جلال)بشکایەتەوە، دەیانتوامی وەکو کەسێتی بارزانی ڕەفتار بکەن و لەهەڵەکان ببورێن؟ یان وەکو نوخبەیەی توند و تیژ ڕەفتاریان دەکرد و هەوڵی کوشتنی باوك و قەڵاچۆکردنی ئەو برایانەیان دەدا، کەیان هەر لەسەرەتاوە پشتگیری باوکیان کرد، یان لەگەڵ ئەمان بەرامبەر بە دەسەڵاتی باوك ڕاپەڕین بەڵام بەزوویی پاشگەز بونەوە و ئامادە نەبوون لە پرۆژەی تاوانی کوشتنی باوکدا بەشداری بکەن و گەڕانەوە لای باوك و داوای لێبوردنیان کرد؟

## نوخبەی سیاسی و هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ

بێگومان لەدوای هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا، کەئەمجارەیان چ سەرکردایەتی یەکێتی و چ سەرکردایەتی پارتیش زیاتر نوخبەی ڕۆشنبیری سیاسی ئەو سەردەمەی کۆمەڵەی کوردی بەشدارییان تێدا کرد و تەنانەت ئەو نوخبەیەش جگە لەوانەی شەهید بوون یان مردوون، زۆرینەیان تاوەکو ئێستا لەسەرکردایەتیدا ماون، لێرەدا دەشێت بۆ کەسێك کە بەچاوی چاودێر سەیری ڕوداوەکان بکات، ڕاستەوخۆ وەهای ببینێت کە شۆڕشی لە دواین نسکۆ کە هەڵگیرسایەوە، هەمان شۆڕشی دوو ئاراستەکەی دوای دابەشبونی ساڵی(١٩٦٤ )ی هەبوو، دیارە لێرەدا مەبەست ئەوە نییە بڵێین کە شۆڕشی نوێ هەر بەتەواوی لەو دوپێکهاتەیەی مەلایی و جەلالی پێشتر پێکهات، بەڵام لەڕاستیدا بەتەواوی هەمان سروشتی کارکردن و ئاقڵیەتی بەڕێوە بردن و کاری حزبی و ڕێکخستن و هەڵوێست لەبەرامبەر یەکتریدا، نەك بۆ سەرەتا و دەستپێکی شۆڕش، بەڵکو تاکو ئێستاش کاردەکات و ئامادەبوونی دیارە و بەردەوامی هەیە و من بۆخۆم وای دەبینم، زۆرێکی کێشەکانی ناو یەکێتی و پارتی چلە شاخ و چ لەشار و لە پەرلەمان و حوکومەت و تاکو

ئێستاش، هەرهەمان ئاقڵیەتی مەلایی و جەلالی لە پشتییەوەیەتی، ئەمە جگەلە بەرژەوەندی گەورەی مادییانە.

دیارە ئاشکرایە کە نوخبەی سیاسی لە شۆڕشی نوێدا، لەنێو سەرکردایەتی تاکە حزبی خۆیاندا ناکۆك و نەگونجاو بوون و لەگەڵ سەرکردایەتی حزبەکانی تریشدا کە دیسان هەمان نوخبەی سەرکردایەتی کردوون، دژ و نەیار بوون و هۆکاری تەقینەوەکان و شەڕی خوێناویش ئاشکرایە و نوخبەی سیاسی لەسەرکردایەتی حزبەکانیدا لێی بەرپرسیارن، نەك پێشمەرگە و ڕێکخستن، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆسەرەتای شەڕی یەکێتی و پارتی لە کۆتایی حەفتاکاندا، بەئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کەسەرکردایەتی یەکێتی نوخبەیەکی دیاری ڕۆشنبیری سیاسی تێدا بووە(بەمام جەلالیشەوە )، سەرکردایەتی کاتی پارتیش دیسان نوخبەیەك لە ڕۆشنبیرانی سیاسی تێدا بووە، کە ئێستا بەهەردوولا بەشێکی دیاریان ماوە، ئێمە لێرەدا لەدوای هۆکاری ئەو شەرە خوێناوییانە ناگەڕێین، بەڵکو سەرەنجی خوێنەر بۆئەوە رادەکێشین ئەگەر بهاتینایە ئەو نوخبە سیاسییەی کەلە سەرکردایەتی هەردوولا هەبووە بروایان بە جیاوازی و یەکتر قبوڵکردن و چەمکی لێبوردەیی هەبوایە، ئایا ئەو هەموو شەرە خوێناویانە رویان نەدەدا؟ بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە ئاشکرایەو لە پشتی رودوانی ئەو شەڕو ململانێ خوێناوییەوە، بوونی نەبوونی عاقڵیەتی یەکتر قبوڵکردن و بروانە بوون بە جیاوازی و بروانە بوون بەئەوی تر و بروا نەبوون بەدایەلۆگ دەردەکەوێت، کە بزوێنەری سەرەکیش بۆ تەقینەوە کانی، ڕۆحیەتی تۆڵسەندنەوە بووە لە بوون و ماهییەتی ئەو نوخبەسیاسییەدا، کە ئەوەش بەتەواوی دژ و ناکۆکە لەگەڵ گیانی لێبوردەیی و چەمکی جیاوازی یەکتر قبوڵکردندا.

### یەکێتی سەرکردایەتی ناکۆکی بەردەوام

ئەگەر لەسەر ئاستی تاکە حزبیش سەیری ئەو نوخبە سیاسییە بکەین، کە لەسەرکردایەتی حزبدا بووە، ئەوە دەیان بەڵگەی زیندوومان لەبەردەستدایە.

بۆ سەلماندنی بیر تەسکی وبروا نەبوونی ئەو نوخبەیە، بەجیاوازی بۆچون و باوەر نەبوون بەیەکتر قبوڵنەکردن و پێکەوە ژیان لێرەدا بەباشی دەزانم یەکێتی نیشتمانی بەنمونە بهێنمەوە چونکە یەکێتی کە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان پایەسەرەکی دروست بوونی بوو، وەکو ڕێکخراوی نوخبەی ڕۆشنبیری سیاسی بوون و مام جلالیش وەکو سکرتێری یەکێتی، دیارترین و بەتواناترین ئەندامی ئەو نوخبە سیاسییە بوو. کە لە

شۆرشی ئەیلولدا و لەتەمەنێکی زۆر گەنجیدایە، بوونی خۆی سەلماند و هەوڵیداوە دەسەڵات لە بارزانیدا دابەش بکات، کەواتە ئێستا دەتوانین بڵێین سەرکردایەتی یەکێتی هەر لەدروست بونەوە، سەرکردایەتی نوخبەی رۆشنبیری سیاسی بوو، هەر لەسەرەتاشەوە دیارە کەئەم سەرکردایەتییە لەگەڵ یەك ناکۆك و بارگاوی کرابوو بەململانێو ئاڵۆزی و پشت گوێی و تەنانەت رك و کینەش، ئەمەش چ لەسەرکردیەتی لەو لایەنانەی کە یەکێتییان پێکهێنابوو، چ لەسەر ئاستی سەرکردایەتی یەکێتی بەگشتی، مام جەلالیش وەکو سیاسییەکی بەئەزمون لەئیدارە و بەرێوەبردنی ململانێدا، زۆر شارەزایانە و سەرکەوتووانە ئیدارەی ئەو ململانێو ئاڵۆزییانەی نێو نوخبەی سیاسی لە سەرکردایەتی یەکێتیدا کردووە و هەمیشە کارەکانی بەجۆرێك کردووە، کەخۆی بەکەسی یەکەم و بەزاراوەی سەرکردایەتی یەکێتیش خۆیان، هەمیشە برای گەو رەبێت.

## ناکۆکی سەرکردایەتی کۆمەڵە و سکرتێری یەکێتی

هەندێك لەئەندامانی سەرکردایەتی ئەم حزبە بەخودی مام جەلالیشەوە، باش لەوە دەگەن کە ئەو ناکۆکی و ململانێیە هۆکاری بەهێزی و بەزیندوویی راگرتنی یەکێتی بووە، من پێم وایە بەهیچ لۆجیێك ناکۆکی و ململانێی سەخت و دژایەتی کردنی یەکتری لەنێو حزب و هەر دامەزراوەیەکی تردا، بێتە هۆکاری بەهێزی و زیندوویی، نەخێر ناکۆکی و دژایەتی کردنی یەکتری، هۆکاری سەرەکی لاواز بوون و روخاندنە، کورد لەمێژەوە وتویەتی هێز لەیەکێتی دایە، بەهەرحاڵ کاتێك کە شەهید ئارام سکرتێری کۆمەڵە بووە و مام جەلالیش سکرتێری یەکێتی، بەئاشکرا ناکۆکی و ناتەبایی و نەگونجان لەنێوان سەرکردایەتی کۆمەڵە و سکرتێری یەکێتیدا بووە، دابەزینی شەهید ئارام بۆ ناوچەیەکی نزیکی دەستی رژێم و لەساڵی ١٩٧٨ دا نایە پرسیار و لەسەر راوەستانە، ئایا بۆ دەبێت سکرتێری کۆمەڵە لەگوندی قەرەداغدا بێت و بچێت بۆچی لەشوێنێکی پارێزراو تر و دورتر لەدەستی رژێم نەمێنێتەوە؟ کاتێك شەهید ئارام شەهید دەکرێت هێڵی (مەلا بەختیار – سالار – جەعفەر)خۆیان بەنشتەجێ و جێنشینی ئارام دەزانن، لەراستیدا لەرێی بۆچون و نزیکیان لە ئارامەوە لەروی دوربینیانەوە لەئامادەکردنی پێشمەرگە و زیندوکردنەوەی کۆمەڵە لە دوای دەستگیر کردنی شێخ شەهاب و هەڤاڵەکانی، ئەم سێ کەسە و شەهید ئازاد هەورامی، بەپێی نوسین و ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستدان توانیان کۆمەڵە لەهەرەس رزگار بکەن. بەلام کاتێك لەدوای شەهید بوونی ئارام، کەسکرتاریەتی

کۆمەڵەی رەنجدەران بەنەوشیروان دەسپێردرێت، کاروبارەکان ئاڵۆزتر دەبێت، ئەویش لەبەر دوو هۆکـار یەکـەمیان نەوشـیروان وەك خـۆی چـەند جارێـك رای گەیانـدووە بـروای بـە مارکسیزم و چەکوش و داس نـەبووە، کـە کۆمەڵـە خـۆی بەهەڵگری ئـەم ئایـدیا و رێبـازە زانیوە، حەقە لە نەوشیروان بپرسین کە تۆ بروات بەو رێبـازە نـەبوو کـە کۆمەڵـە لەسـەری دامـەزرابوو رێکخـستنی خـۆی لەسـەر کردبـوو، چـۆن قبوڵـت کـرد ببیتـە سـکرتێری ئـەو رێکخـراوە، وەك ئاشـکرایە نەوشـیروان لەسـەردەمی جەلالیەتـدا، کـادرێکی دیـار و چـالاك و هەڵسوراوی ئەو ئاراستەیە بوە و زۆریش نزیك بووە لە مام جەلالەوە دیارە تاوەکو ئێـستاش باسی ئـەوە ناکرێـت کـەتا دوای گەرانـەوەی لەشـامەوە پەیوەنـدی بەکۆمەڵـەوە هـەبووبێت، کەواتە دەشێت وای لێـك بدەینـەوە مـام جـەلال بـە بەرنامـە نەوشـیروانی بەسـەر کرمەڵـەدا سەپاندبێت، ئەویش بەمەبەستی گۆرینی بەرنامە و ستراتیژی ئەو رێکخراوە و تواندنـەوەی لەناو یەکێتیدا و گۆرینی بۆ رێکخراوێکی هاوشێوە، درێژکراوەی هەمان ئەو رێکخستنەی کە دوای جیابونـەوە لـە سـەرکردایەتی بـارزانی، تاڵـەبانی دروسـتی کردبـوو، کەواتـە دەتـوانین بڵێین: سـەرەتای ململانـێ و نـاکۆکی لـەنێو سەرکردایەتی کۆمەڵـەدا، لەوکاتـەوە بەئاشـکرا دەسـت پێـدەکات کـە نەوشـیروان دەبێتـە سـکرتێری کۆمەڵـە هـەر لەوکاتەشـەوە مەسـەلەی کوردسـتانی و داش عێراقـی زەق دەبێتـەوە و لاپـەرەکانی گۆڤـاری کۆمەڵـە، وێنـاکردنێکی ئاشکرای ئەو ناکۆکییانەی ئەو سەردەمەی نێو سەرکردایەتی کۆمەڵەیە.

## باڵی( مەلابەختیار – سالار – جەعفەر )
## بەرامبەربەباڵی( نەوشیروان - فەرە یدون )

بـاڵی(مەلابـەختیار – سـالار –جەعفـەر)بەرامبەربـەباڵی(نەوشـیروان و فەرەیـدوون ). چ لەئاستی رێخستن و چ لەئاستی هێزی پێشمەرگەو چ لەسـەر لاپـەرەکانی گۆڤـاری کۆمەڵـەدا، دەرکەوتووەو زۆربەشمان لەبارەی گفتوگۆکـانی نێـو پلینـۆم و کـۆنفرانس و کۆبوونـەوەکانی نێـو سـەرکردایەتی کۆمەڵـەوە کـەم تـازۆر بیـستومانە و ئاگـادارین کەچـۆن ئـەو نوخبـە رۆشنبیرییە سیاسییە لەو سـەرکردایەتییەدا نـاکۆك و پێکـەوە نـەگونجاو بـوون چـۆن نـەیان توانیوە جیاوازی بیروڕای یەکتری قبوڵ بکەن و چەند توندوتیژبوون بەرامبەر بەیـەکتری و مەسـەلەی پێکـەوەژیان و لێبـوردەییش لـە چ قـەیرانێکی خنکێنـەردابووە، زۆربـەی کـاتیش مەسەلەکان بەرەو ئاڵۆزی تەواو چوون، مام جەلال وەکو سکرتێری گشتی یـەکێتی حەکـەم

بووە و دادوەری کردووە هەرچەندە لەبنەڕەتدا ئەوخۆی ئیدارەی ئەو ململانێیەی کردووەو هەرکەس یان گروپێك لەنێو سەرکردایەتی کۆمەڵەدابەهێزبوو بێت ، ئەوبەرامبەریان هاوشان یان بەزمانی خەڵکی دەرەوەو لادێکان هەوێی بۆدرووست کردووە کاتێ هێڵی (مەلابەختیار – سالار – جەعفەر ). لەدوای شەهید ئارام لەناو جەماوەر و ڕێکخستن و پێشمەرگەدا نفوسیان زۆر بووە و مام جەلال پشتگیری نەوشیروانی کردووە و بۆ لاوازکردن و ڕوتکردنەوەیان لەجەماوەرو ڕێك خستن و پێشمەرگە. تەنانەت ڕێگەدان بە مەلابەختیار بۆدروست کردنی ڕێخستنی ئالای شۆڕش. لەچوارچێوەی دەسەڵاتی یەکێتیداو بەو ناوەوە و ڕەوانەکردنەوەی بۆ قەرەداغ و ناردنی شەوکەتی حاجی موشیر لەپشتەوە بۆدەستگیر کردنی و گێڕانەوەی ڕستەیەکی نەوشیروانیش لەو سەردەمەدا. کەمن خۆم لە قەرەداغ لەزاری هەندێك بەرپرس و پێشمەرگەم بیستووە کە – گوایە وتوویەتی(کلاوومان ناوەتەسەری)سەلمێنەری نا ئاسایی بوونی پەیوەندی ئەندامانی ئەو نوخبەیە بووە پێکەوە، کەلەوکاتەوە بۆئێستا، درێژەی هەیە.

کاتێ باڵی(مەلا بەختیار – سالار – جەعفەر)لەبەردەم باڵی(نەوشیروان – فەرە یدون)دا دووچاری شکست هات ، بێگومان ڕیزەکانی کۆمەڵە زیانی گەورەی لێکەوت، بەتایبەتی واز هێنانی چەندین کادرو پێشمەرگەی ئازاو لێهاتووی کردە نەمری وا قیع و لەگرتنی مەلابەختیارەوە، ئیترلەناو کۆمەڵەدا مەسەلەی مارکسیزم و چەکوش و داسەکە کۆتایی پێهات

**کۆنگرەی یەکێتی و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵ. ..**

کاتێك لەبەرامبەر سەرکردایەتی نەوشیروان مستەفادا نەیار و ڕێگر نەما وبڕیاری کۆمەڵە بوو بە تاکە بڕیار. چونکە لەناو سەرکردایەتی یەکێتیدا تەنها شەهید ئازاد هەورامی و ملازم عمر لەو خێڵە مابونەوە کە هاوخەبات و سۆزداری باڵی(مەلا بەختیار – سالار – جەعفەر)بوون و ئەو کەسانەی تریش کە لەکۆنفرانسی ساڵی(١٩٨٤)ەوەو چونە سەرکردایەتی هێشتا ئەو ئامادەبونەیان نەبوو کەلە ململانێکاندا دەوریان هەبێت، بۆیە هەتا دوایی ڕاپەرینیش نەوشیروان وەکو تاکە کەسی بڕیار بەدەستی کۆمەڵە ئامادەبوونی خۆی هەبوو، بەجۆرێك کە کۆمەڵەی گەیاندە ئاستێك لەروی بەرنامە و بیرو بۆچونەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی نەمێنێت لەگەڵ هێڵی گشتی یان یان لەگەڵ بەرنامە و بیرو بۆچونەکانی مام جەلالدا. دیارە ئەنجامیش بەوە گەیشت کە لە کۆنگرەی یەکی یەکێتیدا لە

زستانی ساڵی(١٩٩٢) دا. کۆمەڵە هەڵوەشێنرایەوە و لە چوارچێوەی یەکێتیدا توایەوە، لەو کۆنگرەیەشدا هیچ کام لەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کۆمەڵەکە کە تاساڵی (١٩٨٠)لەسەرکردایەتیدا بوون، جگە لەخودی نەوشیروان مستەفا بەشدارییان نەکرد. راستە ژمارەیەکی دیاری ئەو خەباتگێرانە شەهید بوون، بەلام جگە لەوەی سێ ئەندامی سەرەکی(مەلا بەختیار – سالار – جەعفەر) لەدەرەوەی یەکێتی بوون، تەنانەت ملازم عمر و فەرەیدون عبدالقادریش لەو کۆنگرەیەدا خۆیان نەپالاوت و خودی نەوشیروانیش بە شکستەوە، کە پێم وایە زیاتر شکستی مەعنەوی بوبێت، لە کۆنگرەکە هاتەدەرەوە. چونکە وا پێدەچێت تموحی ئەوەی هەبوبێت کە ببێتە سکرتێری یەکێتی، بەلام دیارە لەو نوخبەیەی کە لە سەرکردایەتی بارزانی جیابونەوە، تا دواکەسی دیاری ئێستای ناو یەکێتی کەسیان نەیانتوانیوە نەبەبێ مام جەلال بچنە پێشەوە، نە ململانێ لەگەڵ مام جەلال بکەن، نە لەو ئاستەدابن شوێنی ئەو بگرنەوە(بە نەوشیروانیشەوە)هەروەك چۆن لەم چەند رۆژەی ئاڵۆزتر بوونی پەیوەندی نێوان نەوشیروان و مەلا بەختیاردا. کۆسرەت رەسوڵ لە رونکردنەوەکەی(کوردستانی نوێدا)وتبووی(هەمووومان بەنەوشیروانیشەوە مام جەلالمان بە برا گەورە قبولکردووە)بەلام لەراستیدا مام جەلال بەتواناو لێهاتویی خۆی نەك هەر بووە بە برا گەورە، بەلکو خۆی بەشی هەرە زۆری ئەو برا بچوکانەی خۆی دروست کردووە، ئەگەر پشتگیری مام جەلال نەبوایە زۆرێك لەوانەی ئێستا لەسەرکردایەتی یەکێتیدان بە خەونیش نەدەگەشتنە ئەو جێگایە.

### خودا نەوشیروانی وەك مەسیح بەتەنها بەجێهێشت

بەهەرحاڵ جوڵە و هەڵسوکەوتەکانی نەوشیروان لە کۆنگرەی یەکێتیدا، زەنگی بەئاگا هێنانەوەی بۆ مام جەلال لێدا و پێموایە لەو ساتە بەدواوە دەرکەوتنی هەردوو جەمسەری کۆسرەت رەسوڵ و جەبار فەرمان بەرهەمی جوڵەی مام جەلال بوو، بۆ ورياكردنەوەی نەوشیروان مستەفا جارێکی تر نەوشیروان کەوتە هەمان ئەو بارەوە کە پێشتر مەلا بەختیاری تێکەوت. بەلام بەشێوەیەکی ئەهوەنتر ئەوکات مەلا بەختیار هەستی دەکرد کە خودا وەکو مەسیح بەتەنها بەجێی هێشت، بەهەمانشێوەش نەوشیروان دوای کۆنگرەی یەك و دەرکەوتنی کۆسرەت رەسوڵ و جەبار فەرمان وەکو دوهێز لەبەرامبەر ئەودا هەستی کرد خودا(ئەویشی بەتەنها وەکو مەسح جێهێشت)چارەنوسی مەلا بەختیار بەرەو زیندان بوو، چارەنوسی نەوشیروانیش بەرەو دەرەوەی ولات و بەجێهێشتنی حزب کەئەمەش بۆکەسێك

کە نهۆمی سەرکردایەتی و ویستی ئایندەی هەبێت، جۆرێکە لەمردن. من خۆم بڕوام وا یە پرۆژەی نەوشیروان لەناو یەکێتیدا هەرچی بوبێت لەوکاتەوە کە حزبی بەجێشهێشت چووە بەریتانیا کۆتایی پێهاتووە.

لەدوای کۆنگرە و بەهێز بوونی هەردوو باڵی(کۆسرەت و جەبار)مام جەلال بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی ملازم عمر و فەرەیدون عبدالقادری هێنایەوە ناو مەکتەبی سیاسی، بەلام زەحمەت بوو ئەم دوو بەرێزە بتوانن ببنە جەمسەری ململانێ و هاوسەنگی دروست بکەن بۆیە جارێکی تر، هەر چۆن خودا سۆزی بۆ مەسیح گونجا، مام جەلالیش بەسۆزێکی بێ وێنەوە مەلا بەختیار و سالار عزیز و عماد احمدی هێنایەوە ناو سەرکردایەتی یەکێتی، بەڵام نەیبردنە مەکتەبی سیاسی، مەسەلەکەش بە بۆچونی من ئەوە بوو مام جەلال لەوە تێگەشتبوو کە مەلا بەختیار کادرێکی چالاك و هەڵسوراو و خەتیب و قسەزانە و دەتوانێت بەزوویی بچێتە پێشەوە، ڕەنگە ململانێی تر دروست بێت، بۆیە بواریدا بەنهێنی بجوڵێت.

بێگومان هەر یەکە لەم تاکە تازە دەرکەوتووانەی نێو نوخبەی سەرکردایەتی یەکێتی لەگەڵ ئەوانی تردا بێ کێشە نەبوون و جیاوازی بیروڕا و هەوڵدان بۆ بەهێزکردنی دەسەلاتی حزبی و جەماوەری تاکەکەسی خۆیان خالێکی ئاشکرا بووە و بۆ ئەو مەبەستەش پێویستییان بەوە بووە پێگەی ئابووری خۆیان لەسەر حسابی ئابووری حزب و داهاتی گەل بەهێز بکەن.

**لابردنی کۆسرەت رەسوڵ لەسەرۆکی حوکومەت**

دوای نەوشیروان مستەفا پێگەی کۆسرەت لەناو یەکێتیدا، لەهەمووان بەهێزتر بوو، بەکارهێنانی پۆستی سەرۆکی حوکومەتیش بوارێکی باشی بۆ کۆسرەت رەخنساند تاوەکو کەسی دووەمی حزب خۆی بسەلمێنێت، بەجۆرێك لەناو حزبدا کەسێکی وەها نەما مام جەلال لەبەرامبەر ئەودا دای بنێت، بەتایبەت دوای دوچاربونی جەبار فەرمان بەنەخۆشی، ئیتر هیچ بەربەستێك نەما چەند جار هاتنەوەی نەوشیروانیش دەورێکی ئەوتۆی نەبوو لە کەمکردنەوەی نفوزی کۆسرەتدا، کە نەدەشیا ئەو نفوز و دەسەلاتە بەوشێوەیە بەردەوام بێت، چونکە ئەگەری ئەوەی هەبوو کە مەترسی بۆ سەر کاریزمایی مام جەلال هەبێت، تاکە چارەسەر ئەوە بوو کە د. بەرهەم صالح بۆ ئەو جەنگە بەکار بهێنێ، ئەویش بەناوی ئەوەی کە د. بەرهەم لەلایەن امریکاوە پشتگیری لێدەکرێت، هەتا کۆسرەت رازی کرا کە واز لەسەرۆکایەتی حوکومەت بهێنێت، ئەمەش د یارە ئەم کارە لەلایەن نەوشیروانەوە پشتگیری

لێکــرا و زۆربــەشمان ئــەو نوکتەیــەی نــاو خــەڵکمان بیــستووە، کــە گــوا یــە د. بەرهەم لە نەوشیروان دەپرسێت: ئایا جیاوازی سەرۆك حوکەمتی ئەو و کۆسرەت لە چیدایە، نەوشیروانیش دەڵێت: مردین هەتا کۆسرەتمان لەسەرۆکایەتی حوکومەت لابرد، بەلاَم بەیانی تەلەفۆن دەکەم بۆ حیمایەکان بە تۆ بڵێن حوکومەت بەجێبهێڵە، ناچاریت بەجێیبهێڵی، ئەمە نوکتەی ناو خەڵکە بەلاَم لەناوەرۆکدا مانایەکی گرنگی هەیە، واتا جارێکی تر لە ململانێکاندا نەوشیروان ناراستەوخۆ لە بەرامبەر کۆسرەتدا هەمان رۆڵ دەبینێت کە پێشتر بەرامبەر بەباڵی(بەختیار و سالار و جەعفەر)بینی، یان هەمان رۆڵ کە کۆسرەت لەدوای کرنگرەی یەك بەرامبەر بینی.

## کۆنگرەی دوو کۆنگرەی فراوانبونی ناکۆکییەکان

دیارە جارێکی تر لە کۆنگرەی دووی یەکێتیدا، مام جەلال وەکو دادوەر بەرنامەیەکی پیادەکرد کەوەکو خۆی دەڵێت: یەکێتی ناو یەکێتی پاراست. هەموو ئەوکەسانەی مەبەستی بوون لە ململانێکداندا بەکاری هێنا بوون، بەتەسکیە واتا بێ دەنگدان کردینیەوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و بۆ رازیکردنیش، نەوشیروانی کردە جێگری سکرتێری گشتی و کۆسرەتیش کرایە بەرپرسی دەستەی کارگێری. کەواتە لێرەوە جارێکی تر نەوشیروان هاتەوەو شوێنی راستەقینەی خۆی کە شوێنی کەسی دووەمە لەناو یەکێتیدا و تەنها مام جەلال لە پێشییەوە، بەبڕوای من ئەوە هەلێکی باش بوو بۆ نەوشیروان ئەگەر بە فیعلی وەکو کەسی دووەم هەڵسوکەوتی بکردایە و جارێکی تر نەچوایەتەوە ململانێوە لەگەڵ ئەندامانی سیاسیدا. لەسەردەمی جێگری ئەودا، فەرەیدون عبدالقادر کەلایەنگرە نزیکەکانی ئەو بوو، دەستی لە ئەندامێتی مەکتەبی سیاسی هەلگرت، ملازم عمر و قادری حاجی علی لەپێش کۆنگرەوە بریاری وازهێنانیان دا.

ئەرسەلان بایز کەخەڵك لەدەرەوەی یەکێتی وەکو کادرێکی چالاك و بێ گیر و گرفت سەیری دەکەن، رای گەیاند(باشە ئەگەر کاك نەوشیروان خۆی بەبەرپرسمان نازانێت، بۆ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیمان پێدەکات)کەواتە لەم قسەیەوە بونی جۆرێك لەناکۆکی و دانەنانی ئەرسەلان بایز بەوەدا، کە نەوشیروان بەرپرسی بێت، ئاشکرا دەبێت، لە نوسین و گفتوگۆکانیشدا هەمان جۆر بۆچون لای مەلا بەختیاریش دەردەکەوێت، رەنگە هەم تموحی ئایندە و هەم رقی رابردوویش مۆتیفی دروست کردنی ئەم جۆرە هەڵوێستە بن، بەتایبەتی کە ئەم دوو بەرێزەی دوایی هەریەکەیان بەرپرسێکی مەکتەبی گرنگی یەکێتی نیشتمانین

و بێگومان ئەم چەند ساڵەی رابردووش دەشێت کاری گرنگیان بۆخۆیان کردبێت، خۆیان لەو ئاستە ببینن کەلەجیاتی دوو جێگرەکەی ئێستای سکرتێری گشتین، لەکۆنگرەی داهاتووی یەکێتیدا هەمان پۆستەکانی ئەوان وەربگرن، بەتایبەتی ئەگەر لە کۆنگرەی داهاتوودا پۆستەکان بەپێی ژمارەی دەنگ ئەم دوو بەرێزەش ئیتیلاف ببکەن، بەلام راستییەك هەیە کەناشێت ئەم بەرێزانە چاوپۆشی لێبکەن، ئەویش ئەوەیە کەئەگەر نەوشیروان نەگەرێتەوە ناو حزب ئەوا بۆراگرتنی هاوسەنگی تا مام جەلال سکرتێری گشتی بێت دوو جێگری دەبێت، یەکێك لەسلێمانی و یەکێك لەهەولێر، لە غیاب یان لەدور کەوتنەوەی کۆسرەتدا بەهەر هۆیەك بێت دەشێت ئەرسەلان بایز ئەو چانسەی هەبێت نوێنەری هەولێر بێت، بەلام پێم وایە کەمەلا بەختیار چانسی بەدەستهێنانی ئەو پۆستەی نییە، چونکە لەروی پێکهاتەی سۆسیۆسیاسی یەکێتییەوە کەدابەشبونی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی بەپێی شار و ناوچە و خێڵ و عەشیرەتە، ئەو پۆستە نەبەر خانەقین دەکەوێت، نەبەر مەلابەختیار کە کوری خێزانێکی هەژاری بێ ناونیشانە وەکو من. ئیتر گرنگی نییە بەتوانا لە چ ئاستێکدایە، بۆیە لێرەدا بەلای منەوە، بۆ نوخبەی رۆشنبیری نێو سەرکردایەتی یەکێتی، پێویستە لەپێناوی پاراستنی حزبەکانیدا یەکگرتووبن. کە هەم پاراستنی ئەو حزبە بۆ خودی حزبەکە پێویستە، هەم بۆ خەباتی کوردایەتی پێویستە، چونکە کێشەی کورد و هەوڵدان و بەردەوام بوون بۆ گەیاندنی بە کەناری ئارام، ناشێت بە ئێستادا بەبێ مانەوە و بەهێز بوونی یەکێتی و پارتی بگاتە ئەنجام، دیارە لێرەدا مەبەست ئەوە نییە کەچاوپۆشی لەکەم و کورییەکان و گەندەڵییەکان بکەین، بەلام من لەوە دەترسم کەهەر ئاژاوە و پەشێوییەك لە ریزەکانی یەکێتیدا بێتە هۆی زیانی گەورە بۆ بزوتنەوەی کوردایەتی و بەوەش نەك هەر یەکێتی، هەموو کورد زەرەر مەند دەبێت.

## تەمەنی سکرتێر جێگەکەی مەترسییە

دیارە پاراستنی یەکێتی نیشتمانی لەم کاتەدا، کەتەمەنی سکرتێریش جێگەی مەترسییە، هەرچەندە کورد دەڵێت تەمەن بەدەست خودایە، پێش هەموو کەس لە ئەستۆی نوخبەی رۆشنبیری سیاسی نێو سەرکردایەتی یەکێتییە، ئەوەش تەنها بەبروا هێنانای بە چەمکی لێبوردەیی و بەجیاوازی و یەکتر قبولکردن دەبێت، کەبۆ ئەم مەبەستەش دەبێت هەڵکانی رابردووش لە یاد بکەن و گیانی تۆڵەسەندنەوە و تۆڵەکردنەوە لەخۆیاندا بکوژن و لەوەش تێبگەن ئەوان لەئاستی بەرپرسیارێتی گەورەدان، کەناشێت وەکو هاولاتی ئاسایی رەفتار

بکەن، چونکە هەر هەڵەیەکی ئەوان دەشێت کارەساتی ترسناکی لێبکەوێتەوە، هەروەك حەق بەگشتی سەرکردایەتی ئێستای یەکێتی لەوە تێبگەن کە لەدوای مام جەلال هیچ کامیان ناتوانن یەکریزی یەکێتی بپارێزن و تاکە ئەگەرێك کە دەشێت تا ئاستێك لەدوای مام جەلال، بەلام بێگومان ناتوانێ وەکو مام جەلال یەکێتی بەرێوە ببات، نەوشیروانە. بۆیە کارکردن بە لۆجیکی عاقڵ و بەلۆجیکی بەرژەوەندی حزب و نەتەوەیش، ئەوەیە کەلەبری ململانێ و پەشێوی و یەك تاوانبارکردن. هەموان دان بەکەم و کورتییەکانی خۆیان بنێن ( بەنەوشیروانیشەوە )، لەوێشەوە چۆن لەخەباتی شاخدا هەمووان بەرازی بوون بوبێت، یان بەناچاری، ئەوەیان قبوڵکردووە کە نەوشیروان مستەفا سکرتێری کۆمەڵەبێت ئێستاش هەمووان دەست بێننەنێو دەستی یەکتر و نەوشیروان رازی بکەن بێتەوە شوێنی شیاوی خۆی، من بۆخۆشم پێم وایە کاری نەوشیروان تەنها ئەوە نییە کۆمپانیای راگەیاندن و رۆشنبیری دابمەزرێنێت، ئەو دەتوانێت لەناو حیزبیش بێت و ئەوەش بکات، بەڵکو ئەو چاوەروانی ئەوەی لێکراوە کە رابەرایەتی بەشێکی دیاری بزوتنەوەی کوردایەتی بکات و ئەو چاوەروانی کردنەی خەڵکیش لەئەنجامی خەباتی ئەوەوە لەلای خەڵك دروست بووە، بۆیە حەیف ئەو متمانە گەورەیەی کەجەماوەری دەرەوەی حزب بەئەو هەیانە لەدەستیبدات، دیارە ئەوەش دوا چانسە بۆ نەوشیروان کەدەوری سیاسی و مێژوویی خۆی ببینێت، خۆ ئەگەر نەتوانێت سود لەم بارودۆخە وەربگرێت و هەوڵنەدات لەئێستاوە جڵەوی کارو بارەکان بگرێتە دەست، ئەوا پێم وایە جارێکی تر ئەگەری ئەوەی لەبەردەمدا نابێت کەرۆڵی خۆی لەترۆپکی لوتکەی دەسەلاتی یەکێتیدا ببینێت، دیارە لەئێستاشدا بۆئەوەی بتوانێت ئەو جێگا بگرێت، دەبێت بەرۆحێکی مام جەلالییانە کاربکات و زۆرێك لە خاسییەتە سەرکردەکانی مام جەلال وەربگرییێت و کاریان پێ بکات، ئەمە سەرباری بەدەستهێنانی هێمنی و لێبوردەیی تەواو کە خاسیەتی دیاری سەرۆکن.

### مەلا بەختیار و خەونی سکرتێری

ئەگەر هات و لەم بارودۆخەی ئێستادا، نەوشیروان خۆی بەدورگرت و نەهاتەوە ناو سەرکردایەتی یەکێتی و وا هەوڵی خۆی نەدا، بۆ رزگارکردنی یەکێتی لە هەڵوەشاندنەوە لەدوای مام جەلال، ئایا بازنەی ململانێکان چۆن دەبێت و چی بەرهەم دەهێنێت و چی لێدەکەوێتەوە؟ من پێشتر لەوتارێکدا لە بارەی ئەگەرەکانی دوای مام جەلالەوە لەناو یەکێتی نیشتمانیدا بێجگە لە نەوشیروان لەسێ ئەگەری تردا بووم بەئومێدی ئەوەی دوای

مام جەلال ئەو سەرۆکایەتی یەکێتی بگرێتە دەست، کە ئەوانیش باڵی(کۆسرەت رەسول )، باڵی(د. بەرهەم)و باڵی(بنەماڵەی تاڵەبانی)یە. هەر یەکە لەم سێ پشتە تاکو ئێستا بۆ ئەوە کاردەکەن، بەڵام لەدەست لەکارکێشانەوەی نەوشیروان مستەفاوە، ئەگەرێکی تریش دەردەکەوێت کە ئەویش توانای ململانێی سەختی هەیە، ئەویش مەلا بەختیارە، کەخاوەنی کۆمەڵێك بنەمای بۆچونە نێو ئەو ململانێیەوە. مەلا بەختیار دیارترین و کۆنترین ئەندامی کۆمەڵە و هاورێی نزیکی شەهید ئارامە و یەکێکە لەو چەند ئەندامە کەمەی کە دوای گرتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە، دەوری چالاکی هەبووە لە زیندوکردنەوە و رێکخستنەوەی کۆمەڵە و ئامادەکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکان و سەرکردایەتی کردنیاندا هەروەك یەکێکە لەو چەند کەسە کەمەی کە توانیویەتی لەکۆتایی حەفتاکان و نیوەی یەکەمی هەشتاکان و لەتەمەنێکی زۆرکەمی هەرزەکاریدا، ململانێی سەخت لەگەڵ نەوشیروان و باڵەکەیدا بکات و ئەگەر پشتگیری مام جەلال نەبوایە بۆ باڵی نەوشیروان، مەلا بەختیار هەروا بەئاسانی نەدەبەزی. بەڵام کەمی تەمەن و کەم ئەزمونی لەبەرامبەر ئەوانی بەتەمەن و بەئەزموندا، هۆکارێکی سەرەکی بەزینی ئەم بوون.

مەلا بەختیار دوای راپەرینیش کە بەلاوازی هاتەوە سەرکردایەتی یەکێتی و چالاکانە کەوتە کار و لەماوەیەکی کورتدا جارێکی تر ئامادەبونی خۆی سەلماندەوە، بەجۆرێك لە کۆنگرەی دووەمی یەکێتیدا، توانی لە چواریەکی پێشەوەی هەڵبژێردراوەکان بێت و دەنگێکی باش بەدەست بهێنێت، ئەوەش متمانەی مەلا بەختیار کە کورە خێزانێکی هەژاری دەور و بەری خانەقینە و تەنها قۆناغی ناوەندی خوێندووە و هیچ پاڵپشتێکی خێڵ و عەشیرەتی نییە، لەماوەی دوای راپەریندا، توانیویەتی بونی خۆی لەشارێکی وەك سلێمانیدا کە بەحساب پایتەختی رۆشنبیری و کوردایەتی و شوێنی لەدایك بوونی یەکێتییە، ئەم بوونی خۆی بسەلمێنێت و لەهەموو ئەندامەکانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی کە خەڵکی سلێمانین، دیارتر بێت و پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی سار بەگشتی و دەور و بەری یەکێتیش بەتایبەتی بەهێزتر بێت، ئاستی رۆشنبیری و توانای بۆ قسەکردن و ئامادەبونی لە کۆڕ و کۆبونەوەکان و چالاکی رۆژانەی، وای کرد بێتە کەسێکی ناسراو و دیار. بەرزبونەوەی پێگەی لەناو مەکتەبی سیاسی و بەوتەبێژی یەکێتی و دەرکەوتنی لایەنگری مام جەلال بۆ عەشیرەتانی ئەویش بەهەرکار و گرفتێکی مام جەلال، زیاتر پێگەی ئەوی

بەرز کردووە. کەدەشێت وەها سەیری خۆی بکات، ئـەمی جێ نـشینی شـەهید ئـارام لـەدوای مام جەلال تاکە کەسە کەشایەنی ئەوە بێت ببێتە سکرتێری یەکێتی.

## یەکێتی، ئەگەری پارچە پارچە بوون

بێگومان لێرەوە بازنەیەکی تری ململانـێ دەست پێدەکات و ئـەم ململانێیـەش لـەغیابی نەوشـیرواندا، یەکلایکردنـەوەی سـەختتر دەبێـت، چـونکە هـیچ کـام لەکارەکتـەرەکانی ئـەم ململانێیە، ناتوانن زۆرینەی دەنگی یەکێتی بۆخۆیان مـسۆگەر بکـەن و بـەوەش یـەکێتی لـە هەڵوەشاندنەوە بپارێزن، بۆیە دورکەتنەوەی نەوشیروان نەك یەکێتی لەململانێ و ئاڵۆزی و ئەگەر هەڵوەشاندنەوە رزگار ناکات. بەڵکو ئەگـەری پارچـە پارچـەبوونی یـەکێتی دوای مـام جـەلال فـراوانتر دەکـات. بۆیــە هــەموو ئــەو ئەندامانــەی یــەکێتی کەبەتــەنگ مانــەوەی حزبەکەیانەوەن، هەقە دەست بکەن بەدەستی یەکدا و بۆ ڕازی کردنی ئەم پیاوە، بۆ شوێنی شایەنی خۆی، بەمەبەستی پاراستنی ئایندەی یەکێتی.

## نەوشیروان مستەفا پیاوی سەرکردایەتی نییە

جیهان هەولێر

مەلا بەختیار کارگێری مەکتەبی سیاسی وتەبێژی لیستی هاوپەیمانی و وتەبێژی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە، لەم دیدارەدا کەزیاتر لە گفتوگۆیەکی چڕ دەچێت دەست دەخاتە سەرهەموو ئەو خاڵانەی ئەمرۆ لەکوردستاندا ڕوو دەدەن.

**جیهان: لە ڕێککەوتنی نێوان پارتی و یەکێتیدا هەست ناکەیت تەنازولێك لە یەکێتییەوە بەرامبەر پارتی تێدایە؟**

**مەلا بەختیار:** لەچ خاڵێکدا؟

**جیهان: سەرۆکایەتی هەرێم و وەزارەتە گرنگەکان تەسلیمی هەرێم کراون و ئەوەی بۆ ئێوە ماوەتەوە دەست بەرزکردنەوەیە لەناو پەرلەمان؟**

**مەلا بەختیار:** یەکەم بەنسبەت وەزارەتەوە دوو دستون دانرا، خۆمان سەر پشك کراین کام ستون هەڵدەبژێرین ئەو ستونەمان هەڵبژارد کە هەڵمان بژاردووە.

**جیهان: جۆچی؟ چونکە ستونەکەی ئێوە زۆر لاوازە؟**

**مەلا بەختیار:** نەخێر لاواز نییە، پێمان وایە ستونەکان یەکسانن، ئەمەیەك. دووەم: بەنسبەت سەرۆکی هەرێمەوە لەبەرامبەردا ئێمە سەرۆکی عێراقمان هەیە، پێمانوایە بۆ هەلومەرجی ئێستای کوردستان و عێراق و ئایندە، سەرۆکایەتی عێراق زۆر زۆر گرنگە. ئێمە لەگەڵ

پارتی مەسەلەکان زۆر زۆر لێکدەدەینەوە، هیچ دەربازێك لەم هەلومەرجە و لە ئاسۆی ئەم هەلومەرجە نابینین، ئیلا دەبێت بەیەکەوە بین و وەکو یەك بین. هەر سیاسەتێك پێشتر تاقیمان کردۆتەوە، پێمانوایە بایی خۆی هەردوو لامان و میللەتەکەشمان باجەکەیمان داوە، هەر سیاسەتێکیش جگە لەم پێکەوە بوون و پێکەوە هەڵبونە بگرینەبەر، دیسان دەبێت هەندێك ڕوداوی ناخۆشی مێژوویی دیسان دوبارە بکەینەوە، لەبەرئەوە ئەم

یەکگرتنە پێویستییە مێژووییەکانی ئەم هەلومەرجەی لەعێراق و کوردستان و ناوچەکە هەیە ئەم یەکگرتنە یەکگرتنێکی مەوزوعییە نە تەناززولە بەنسبەت پارتییەوە، نە تەنازولە بەنسبەت ئێمەوە، سی ساڵی تر لەسەر ئەم یەکسانی سیاسییە لەنێوانی ئێمە و ئەوان بنوسێت سەرکردایەتی هەردوولامان لەسەرئەوەی گەشتوینە ئەم قەناعەتەی پەیرەوی لێدەکەین هەردوولامان لەئاستی لێپرسینەوەی مێژووی لەقەڵەم ئەدەن.

**جیهان: ئێستا هەر هاوڵاتییەك ئەگەر سەیری ستونی حوکەمەت بکات راستەوخۆ بۆی رون دەبێتەوە کە یەکێتی ئەو پۆستانە وەردەگرێت کە پۆستی لاوازن؟**

**مەلا بەختیار:** بە سەرۆکی حوکومەتیشەوە؟

**جیهان: ئێوە هەموو جارێك پێش هەڵبژاردن دەڵێن سەرۆکی حوکومەت بۆ ئێمەیە، دوایی تاڵەبانی بڕیارێك دەدات بڕیارەکەی مەکتەبی سیاسی قڵپ دەکاتەوە؟**

**مەلا بەختیار:** نا، خۆی جارێ ئەمە دووەمین جارە لەگەڵ پارتی یەکتر تاقی دەکەینەوە، هەموو جارێك نییە، جاری پێشوو پێش ئەوەی جەنابی مام جەلال بڕیار لەسەر ئەوە بدات، زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هەمان قەناعەتمان هەبوو، بۆ مێژوو ئەم قسەیەت لەگەڵ دەکەم.

**جیهان: واتا بڕیاری مەکتەبی سیاسی بوو؟**

**مەلا بەختیار:** نا، بزانە، زۆربەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ئەم قەناعەتەمان هەبوو، کەلەم دەورانە کاك نێچیرڤان سەرۆکی حوکومەت بێت باشە، چونکە یەکگرتنەوەمان کامڵ نەبووە، چونکە ئەنواعی کێشە دەهاتەپێش یەکگرتنەوەکەوە ئەگەر پۆستی سەرۆك حوکومەتمان لەپارتی وەربگرتایەوە، لەبەرئەوە هەر جەنابی مام جەلال نەبوو ئەو قەناعەتەی هەبوو مام جەلال رەئی زۆربەمانی وەرگرت بوو بۆیە ئەو بڕیارەی دا. ئەوە بۆ مێژوو پێت دەڵێم. ئەمجارەیان چەسپاندوومانە کەدەبێت ئێمە بین. برایانی پارتیش بەتەواوی قەناعەتەوە سەلماندویانە سەرۆکی حوکومەت بدرێت بەیەکێتی نیشتمانی کوردستان.

**جیهان: دڵنیایت کە سەرۆکی حوکومەت بۆ یەکێتییە؟**

**مەلا بەختیار:** بەڵێ بۆ یەکێتییە.

**جیهان: ئەگەر دوای هەڵبژاردن هاتمەوە لات و دیدارم لەگەڵ سازکردیت، ئاوا نەبوو، چی دەڵێیت؟**

**مەلا بەختیار:** رەخنە لەیەکێتی دەگرم.

**جیهان: بۆچی بەشێکی زۆری وەزیرەکان ئێوە موعجیبن بە نێچیرڤان؟**

**مەلا بەختیار:** پێموابێت ئەوە سیفەتێکی باشە کە بە مومارەسە دەرکەوتبێت سەرۆکی حوکومەت سەرکەوتوو بوە و ئەو جیاوازییانەی لێی دەترساین، ئەو جیاوازییەی نەکردبێت لە مومارەسەدا، پێم وابێت سیفەتێکی باشە وەزیرەکانی ئێمە دانیان بەراستییەکاندا نابێت لەبەرئەوە مەسەلەکە ئیعجاب نییە، بڵێیت کاریزمایەکە کاك نێچیرڤان لە نمونەی ئەو لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان نییە، ئیعجابە بۆ ئەوەی ئەو هەلومەرجە هەستیارە تێپەراند. توانی ئیدارەیەکی هەستیار و ناسك بە وەزیروکانی ئێمە و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بدات. ئەوەندەی لە دەسەلاتی بوو، ئەوەندەی بواری بۆ مومارەسەی ئەم پۆستەی هەبوو بەم نەوعە کە بتوانێت بەشێکی متمانەی ئێمە وەربگرێت کە فعلەن لەو هەلومەرجە ئینتقالییە سەرکەوتوبێت ئەو برادەرە. پێموایە ئەمە هەم بۆ کاك نێچیرڤان کارێکی جوان بووە، هەم بۆ وەزیرەکانی ئێمە کە راپۆرتی جوات و حەقیقەتیان بۆ مەکتەبی سیاسی نەقڵ دەکرد لەسەر ئەدائی کاك نێیرڤان بۆ هەردوو لایان شتێکی جوان بوو.

**جیهان: وەك خۆت وەك کەسێکی یەکێتی دڵخۆشیت بەوەی کە یەکێتی کاندیدی بۆ پۆستی سەرۆك هەرێم نییە؟**

**مەلا بەختیار:** جارێ لەناو یەکێتی قسەمان لەوە نەکردووە کە کاندیدمان بۆ سەرۆکی هەرێم دەبێت یان نا، لە راستیدا ئەمە مترەح نییە لەناو یەکێتیدا، چونکە مەسەلەکانمان بریوەتەوە کە لەم دەوری ئایندەیشدا سەرۆکی هەرێم کاك مەسعود بارزانی و سەرۆکی عێراقیش جەنابی مام جەلالە، ئەگەر ێمە قسەمان لەسەر ئەوە هەبێت کاندیدمان هەبێت یان نەبێت، بێگومان لەناو یەکێتی نیشتمانیدا هەم قابیلیەتی ئەوە هەیە، هەم تەجروبەی ئەوە هەیە، هەم چەندین سەرکردەی ناسراوی پڕ لە ئەزمون بۆ ئەوە هەیە.

**جیهان: نێچیرڤانێکتان هەیە لەمەکتەبی سیاسی بۆ سەرۆکی حوکومەت؟**

**مەلا بەختیار:** چەندینمان هەیە.

**جیهان: ئەجارە کێیە؟**

**مەلا بەختیار:** کاك بەرهەم صالّح

**جیهان: ئەی شوێنەکەی کاك بەرهەم بۆ کێ دەبێت؟**

**مەلا بەختیار:** لە گفتوگۆدایە.

**جیهان: ئەو شوێنە دەدرێت بە پارتی یان موڵکی یەکێتییە؟**

**مەلا بەختیار:** لە گفتوگۆدایە لای ئێمە.

**جیهان: پۆستی سەرۆکی هەرێم بە مقابیلی پەرلەمانە یان بەمقابیلی بەغدایە؟**

**مەلا بەختیار:** مقابیلی پەرلەمانە

**جیهان: کەواتە پۆستەکەی د. بەرهەم هەر یەکێتییە؟**

**مەلا بەختیار:** هەر یەکێتییە، بەڵێ.

**جیهان: تەسەور دەکەیت لەم هەڵبژاردنەی پارتی و یەکێتی لەسەدا چەند دەنگ بهێنێ؟**

**مەلا بەختیار:** خۆت دەزانی ساڵەهای ساڵ پێشمەرگە بووم و فەرماندەی پێشمەرگەش بووم هەمیشە خەیاڵی جوانم هەبووە لە شەردا، بەلام تا نەچومەوە ناوشار، نەم زانیوە سەرەنجامی شەرەکە چۆنە، کەگەرامەوە زانیومە سەرەنجامی شەرکان چۆنە. بەرنامەی وام هەبووە لەشەردا کە لە سەدا سەد سەرکەوتوو بووە، کەچی وا دەرنەچوو، زۆرجاریش بەترسەوە چومەتە شەر، کەچی سەرکەوتوو بووم هەڵبژاردن شەری سیاسەت و شەری ناو میللەتە، شەری حیزبەکانە. لەبەرئەوە هەتا نەیەینەوە لەشەری هەڵبژاردن ناتوانم بەوردی و دیاریکراوی بڵێم ئێمە چەند دەهێنین بەلام لەو باوەرەدام لەسەدا شەست کەمتر ناهێنین.

**جیهان: لە سەدا چلەکەی بۆکێ دەبێت؟**

**مەلا بەختیار:** دابەشی بکە بۆ خۆت.

**جیهان: تۆ بەدوژمنی سەرسەختی ئیسلامییەکان و نەوشیروان ناسراویت، ئەمە شتی شەخصی خۆت نییە تێکەڵی سیاسەتت کردووە؟**

**مەلا بەختیار:** ئیسلامییەکان دوژمنێکی سەرسەختی دیموکراسیەت و عەلمانییەتن.

**جیهان: چۆن؟**

**مەلا بەختیار:** لەبەرئەوەی کەئەوان حوکمی مێژوویی خۆیانکرد و کۆتاییان پێهات ئەوە ئێمەین کە حوکومەتێکی مۆدێرنە و دیموکراسی و عەلمانییەت دەمانەوێت پیادەی پکەین ئەوان قبولی ناکەن. ئەوانیش پێش ئێمە حاکم بوون ئێمە دوای ئەوان حاکم بووین ئەوان

دوای ئێمە بیر و بۆچونیان و فەلسەفەیان لە مەزاهیبیان و حکومی شەرعیان و تێکستە پیرۆزەکانیان و هەموو ئەمانەیان سەپاندووە بە درێژای ١٤٠٠ ساڵ لەناو کۆمەڵگاکانی ئێمە هەمووی چوارده پانزه ساڵە خەریکین , قبوڵمان ناکەن. لەبەر ئەوە ئێمە مەجبوورین بەرگری لە بیر و باوەری خۆمان بکەین و ئەو دەست کەوت و سەرکەوتنانەی بە دی هاتوون بیپارێزین سەبارەت بە کاك نەوشیروان بەداخەوە ئەو جیابوەوە ئەگینا ئێمە ئەومان قبوڵ بووە لە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان کە جیادەبێتەوە ململانێ دەکەوێتە نێوانمان.

**جیهان: لەرۆژنامەکەتدا بەشێوەیەکی زۆر ستراتیژی ئیش لەسەر ئیسلامیەکان دەکەیت , ئەمە سیاسەتی یەکێتی یە یان تەنها تۆیت؟**

**مەلا بەختیار:** هەموو هێزێکی عەلمانی ئەوە ئەرکیەتی , بەلام من لە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان دا , لەشاخیش بەوە بەناو بانگ بووم کە بایەخم بە کتێب و خویندن و فەلسەفە و بەئایدۆلۆجیەت داوە. یەکێك بووم لەوانە. من لەتۆی ناشارمەوە هەر سیاسەت مەدارێك هەر روناکبیرێکی دیموکرات یان سۆسیالیست ئەگەر بێت بە لێبراوی بۆ چوونی خۆی , فەلسەفەی خوی , باوەری خۆی لەگەڵ ئیسلامیەکان ساخ نەکردبێتەوە ناتوانێت بەتەواوەتی خزمەتی دیموکراتی و سۆسیالیست بکات ناوانێت خزمەتی عەلمانیەت بکات. چونکە ئێمە بمانەوێت و نەمانەوێت ئەبێت لەم قۆناغە ئەزمونەکەمان دیموکرات و عەلمانی و لەچوارچێیوەی ستراتیژی مۆدێرنیەتدا بێت. رێگایەکی دیکە لەبەردەم دیموکراتخوازە راستەقینەکان نییە، ئەوەی دیموکراتخوازان لەمێژودا تێبگات و لەشەرە چارەنوسسازە لەنێوان دیموکراتخوازەکان و بەتایبەتی سەلەفییەکان تێ بگات، دەبێت ئەوە بچێتە سەنگەر بۆ دیموکراسی یەکێك لە کێشەکانی ئێمە ئەوەیە هەموو حزبە دیموکراتییەکان، هەموو حزبە عەلمانییەکان و هەموو سەرکردە عەلمانی و دیموکراتییەکان و نوسەرە دیموکرات و عەلمانییەکان ئەوەیە کەبەراستی لە ناوەرۆکی ئەم شەرە تێنەگەشتوون.

**جیهان: ئەوەی من بزانم نزیکەی ١٣ ساڵە شەری ئیسلامییەکان دەکەی، لەوکاتەوە تا ئێستا شەری ئیسلامییەکان دەکەی هەست ناکەی ئەوەی نەوشیروان مستەفا کردی بۆ کپ کردەنەوی ئیسلامییەکان زۆر زۆر گەورەتر بوو لەو شەرەی کە رۆشنبیرەکان کردیان لەگەڵیان بە تۆشەوە؟**

**مەلا بەختیار:** بێگومان بەپێچەوانەوەیە، بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەوانە ئێستا زیاتر لەخۆیان رادەبینن لە هەڵبژاردن بیبەنەوە یەکێك لە هۆیەکانی لاواز کردنی یەکێتییە لەلایەن گردەکەی وشەوە، ئەمە یەك، دووەمیش نەوشیروان لەگەڵ کام حزبی چەپ و عەلمانی دانشتووە، گفتوگۆ بکات بۆ هاوکاری یەکتر. یەکەمین هێز کە لەگەڵی دانشتووە بزوتنەوەی ئیسلامییە، بزوتنەوەی ئیسلامی کە یەکگرتووی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی پێی رازی نەبوون نەوشیروان مستەفا دەچێت گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات بۆ هاوکاری.

**جیهان: بەس با دیویکی تری سەیر بکەین، خەڵك تورەیە لە پارتی و یەکێتی ئەو خەڵکە تورە لە هەڵبژاردنەکانی پێشودا دەنگیان بە ئیسلامییەکاندا، بەلام ئەمجارە دەنگەکانیان بۆ نەوشیروان دەبێت کەواتە دەنگەکەی بۆ یەکێتی هاتەوە؟**

**مەلا بەختیار:** دەزانی ئەگەر تورەبیت بەمانای ئەو تورەیەی کە تۆ دەیڵێیت، جاری واهەیە کور لە باوك تورە دەبێت، کچ لە دایك تورە دەبێت خێزانێك تورەبونی تێدەکەوێت، بەلام ئەوە مانای لێکترازان نییە. پێموایە ئەم تەجروبەیە و یەکێتی و پارتی لەناو پرۆسەیەکدان ئەم پرۆسەیە هێشتا دەورانی تەواو نەکردووە، زویر بوونی تێدەکەوێت، نارەزایی تێدەکەوێت، نوسینی لیبرالی تێدەکەوێت، تورەبون و داخوازی زۆریشی تێدەکەوێت بەلام من پێموانییە گەشتبێتە لێکدابرانی تەواو لەنێوان ئەو بەشەی کە لە ئێمە تورەیە لەگەڵ ئێمەیە کەنەمانتوانیوە ئەو بەشە بەتەواوی رازی بکەین، قەناعەتم وایە دوای ئەم هەڵبژاردنە و سەرەنجامی هەڵبژاردنەکە و خزمەتەکانی دوای هەڵبژاردنەکان ئەو تورە بونانە کەم دەکاتەوە.

جیهان: قەناعەتتان بەپارتی کردووە کە بەکردەیی نەوشیروان چوەتەدەرەوەی یەکێتی، ئەوان باوەڕییان بەمە هەیە؟

**مەلا بەختیار:** تا دوو هەفتە لەمەوبەر نیگەران بوون، داوای وەلامیان لەئێمە دەکرد، بەلام وەلامەکەیان وەرگرت.

**جیهان: بۆچی لەناو هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بەشێوەیەکی زۆر جددی تۆ زۆر قسە لەسەر نەوشیروان دەکەیت، دەمەوێ لەو سیحرە تێبگەم؟**

**مەلا بەختیار:** لەبەر سێ سەبەب، یەکەم: لە حەوت مانگ لەمەوبەر کە ململانێی نێوان کۆمپانیای وشە و یەکێتی گەرم بوو، دەستکرا بە وتار نوسین، پێنج پەخشنامە گیرا کە

گردەکە بەنهێنی نوسی بووی، کۆمپانیای وشە نوسی بووی و رەگ راگەیەنرا، لیژنەیەك بۆ وەڵامدانەوەی ئەوان پێکهات، پێش دەستلەکارکێشانەوەی چوار ئەندامەکەی مەکتەبی سیاسی بە ئیمزای هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بەچوار کەسە کەشەوە ئەو لیژنەیە بەرێزان: ئەرسەلان بایز و ئازاد جوندیانی و من بووم، بۆ وەڵامدانەوە و ئەرك بوو لەلایەن مەکتەبی سیاسی پێمان سپێردرابوو، کە وەڵام بدەینەوە . پێموانییە کە ئەوان لەمنیان کەمتر وەڵامدابێتەوە، بەڵام لەبەر یەك سەبەب من لەوان زەقتر بووم، ئەوەش لەبەرئەوەی من وتەبێژ بووم و یەکەمین پرسیار لە وتەبێژ دەکرێت لەراگەیاندن، ئەسڵن خەڵکی تر هەبوو قسەی دەکرد کە ئەوە ئیشی ئەوان نەبوو قسەبکەن، دەبو ئێمە قسە بکەین، لەبەرئەوەیە من زەقتر دەرکەوتم، ئەگینا لە کۆی هەموو وتارەکانی لە کوردستانی نوێ نوسراون، رەنگە(١٠)وتاریان لەلایەن منەوە نەنوسرابێت، زۆرترین کۆبونەوە حزبییەکان لەسەرئەوە کراوە کە کاك ئەرسەلان کردویەتی من نەمکردووە، کاك د. بەرهەم لەکۆبونەوە حزبییەکاندا و لە لە کۆبونەوەی ئۆرگانەکانی یەکێتیدا هەروەکو من قسەی کردووە، مەبادیئی منی شیکردۆتەوە کە لە کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی خستویانەتە سەرشانم، سەبەی دووەم ئەوەیە کە ئەگەر ئەو لیژنەیەی لێدەربکەین، سیفەتی وتەبێژییەکە فەرزی دەکاتە سەر من کە ئەگەر لیژنەکەش نەبێت، ئەگەر من لەبەرامبەر هەر وتارێك هەر ئاخاوتنێك کە لەلایەن کۆمپانیای وشەوە هاتبێت، من ملزەمم جواب بدەمەوە، وتەبێژییەکەسم ئیختیاری خۆم نەبووە، هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی منیان هەڵبژارد بۆ وتەبێژی، خۆت دەزانی پێش ئەم کێشانە کراوم بە وتەبێژ، من تەجروبەیەکی زۆرم لەناو یەکێتی نیشتمانی و لەگەڵ سەرکردەکانی یەکێتی هەیە، من پێرار دەمزانی کاك نەوشیروان بەرەو جیابونەوەی حزب و بەرەو راگەیاندنی رێکخستن و بەرەو رۆژنامەی موعارەزە و سەرەنجام بەرەو لیستی جیاواز لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان دەروات، ئەم قسانەم لەگەڵ برادەرانی مەکتەبی سیاسی و جەنابی مام جەلال کردووە، بەڵام بەراخەوە سیاسەتی پشودرێچی زاڵکرا بەسەر سیاسەتی جێبەجێکردنی واجبێتی حزبی بەپێی پەیرەو و پرۆگرامی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەبەرئەوە من پێموایە ئەگەر هەموو ئەندامێکی مەکتەب سیاسی یان سەرکردایەتی هەموو کادرە پێشکەوتووەکانی یەکێتی ئەوەندەی من و جەنابی مام جەلال کاك نەوشیروان بناسن، ئەوان زیاتر لەمن قسەیان دەکرد، چونکە من دەزانم چ نەخشەیەکی هەیە، دەزانم کە دێرێکی

نوسی باقی وتارەکە چۆن دەنوسێت، من لە ١٩٧٧/٧/٢٠ دوە ئەم کۆنە هەڤاڵەی خۆم دەناسم، رێك(٣٢)ساڵە دەیناسم، لەو(٣٢)ساڵە چوار ساڵ لەیەك دابراوین باقیەکەی هەمیشە بەیەکەوە بوین، سەدان کۆبونەوەم لەگەڵ کردووە، ئەو باش من دەناسێ و منیش باش ئەو دەناسم، لەبەرئەوە کاتێك دەزانم ئەو بەرەو کوێ دەروا لەو رێبازەی گرتویەتی و دەزانم هەموو خەباتی بۆئەوە بووە کە ئەم سەرکردایەتییە و مام جەلال و گومانیش نییە ئیشی بۆ ئەوە دەکرد یەکێتی توشی شکست ببێت، بۆئەوەی ئەو بەدیلەی خۆی دەیزانێت و لەخەیاڵیدا بوو ئەو چەرخەی خۆی بوو، گومانم لە هیچی ئەوانە نەبوو، وەزیفە بوو دیفاع لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بکەم، هیچ کێشەیەکی شەخسیم لەگەڵ کاك نەوشیرواندا نییە، ئەگینا من کاك هنوشیروان بە پیاوێکی بە قابیلەت دەبینم لە نوسیندا، کاك نەوشیروان عەقڵێکی گەورەیە، بەلاَم ناتوانێت براگەورە بێت و براگەورەیی پێناکرێت، ئاخر فەرق دەکات موفەکر بێت یان مودەبر بێت.

**جیهان: ویژدانییەن پێت ناخۆش نییە کە قسە لەسەر برادەرێکی خۆت بکەیت؟**

**مەلا بەختیار:** لەرووی ویژدانییەوە زۆرم پێناخۆشە، بەلاَم واجب واجبە، جیابونەوە لەناو هەر حزبێکدا ئەحکامی خۆی هەیە، ئەحکامی ململانێ و ئەحکامی بەرگری هەیە، لەرێباز و لە شەرعییەتت، ئەحکامی هەموو سەنگەر گرتنێکی هەیە، ئەگینا وازبێنە ئەگینا بۆ لەژێر باری ئەو مەسئولیەتەیت، بۆ لەکۆنگرە خۆمان هەڵدەبژێرین بۆئەوەی زۆرترین دەنگ بهێنین، ئەی بۆ کە کۆنگرە تەواو دەبێت زۆرترین واجبی خۆمان بەجێ نەهێنین، با لە کۆنگرە بڵێن شانمان هی ئەم کارەنییە، هەموو ئەوەی واجبی خۆی بەپێی بە پێی بەرنامە و بریار و کۆنگرەی یەکێتی جێبەجێناکات، لەکۆنگرەی سێیەمی یەکێتی روبەروی دەیان پرسیاری ئەندامانی کۆنگرەی سێیەمی یەکێتی دەبێتەوە.

من ئەپرسم قەواعیدی یەکێتی ئەگەر لەهەموو مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی بپرسن بڵێن ئەوە لە٢٠٠١ – ٢٠٠٦ سەختترین ململانێمان لەگەڵ ئیسلامییەکان هەبوو چەند وتارتان لەسەرئیسلامییەکان نوسی وەلاَمی چییان دەبێت، بەشی زۆریان، چەند کۆڕتان لەسەر ئیسلامی سیاسی کرد، زۆربەیان وەلاَمیان چی دەبێت، دەڵێن نەوشیروان وای کرد لەیەکێتی نیشتمانی کوردستان چەند سەنگەرتان دروست کرد و چەند مەناعەتان دروست کرد لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ ئەوەی یەکێتی لەوە زیاتر نەپوکێتەوە، چەندیان

وەڵامیان دەبێت، ئەندامانی کۆنگرە بۆیان هەیە ئەم پرسیارانە و سەبارەت بە هەموو شتەکانی تر پرسیار بکات.

**جیهان: لەناو مەکتەبی سیاسی کێت زۆر خۆشدەوێت؟**

**مەلا بەختیار:** راستت پێ بڵێم وەك مەکتەبی سیاسی هەموویانم خۆشدەوێت، بەڵام وەکو قابیلیەت جیاوازی لە نێوانیاندا دەکەم ئەگینا پەیوەندیم لەگەڵ هەر هەموویاندا باشە.

**جیهان: پێم بڵێ ئەوەم زۆر خۆشدەوێت، بۆ ئەوەی من پرسیارەکەی خۆم بکەم؟**

**مەلا بەختیار:** جەنابی مام جەلال

**جیهان: ئەگەر مام جەلال وەکو نەوشیروان بکات، هەر ئاوا مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت؟**

**مەلا بەختیار:** بەڵێ. لەبەرئەوەی لابدات لەناو یەکێتی من لەناو یەکێتی دەمێنم.

جیهان: تەسەور دەکەی نەوشیروان بازێك بێت وەستابێت بەدیار کەلاکێکەوە یان فریادرەسێکە دیەوێت یەکێتی رزگار بکات؟

**مەلا بەختیار:** پێموابێت نەوشیروان لەناخی خۆیدا باش دەزانێت ناتوانێت هیچ رزگار بکات، باش باش دەزانێت کاك نەوشیروان هەمیشە لەسایەی مام جەلالدا توانیویەتی سەرکەوتوو بێت، یەکێتی هێزێکی جەنگاوەری قوربانی بەخش بووە هەموو جارێك کە مام جەلال لەدەرەوەی وڵات بووە، چ لەپێش راپەرین چ لەدوای راپەرین لەسەردەمێ کە کاك نەوشیروان سەرپەرشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی کردووە، توشی ئەنواعی ئاستەنگ بووە، لەبەرئەوە کاك نەوشیروان ناتوانێت فریادرەس بێت پێشتر پێم وتی کاك نەوشیروان عاقڵێکی گەورەی نوسینی هەیە بەڵام کەسی سەرکردایەتی نییە.

**جیهان: نەوشیروان مستەفا بە خەتەر دەزانی لەسەر یەکێتی یان پارتی؟**

**مەلا بەختیار:** هیچیان.

**جیهان: هیچیان خەتەرنین لەسەر یەکێتی.**

**مەلا بەختیار:** نەخێر. ململانێمان لەگەڵ هەردوولادا هەیە بەڵام ئێستا یەکێتیمان لەگەڵ پارتی بەقووەتە ململانێمان لەگەڵ نەوشیروان بەقووەتە.

**جیهان: ئەگەر ئەو حەرەکەیەی نەوشیروان کردی کۆسرەت بیکات چی دەبێت؟**

**مەلا بەختیار:** ئەمە وەکو فاوڵ وایە ئەمەی تۆ دەیپرسی، لە مێژوودا کاك نەوشیروان شەخسیەتێکی گەورەتر بووە لە کاك کۆسرەت، وەکو فکر، وەکو قووەت، وەکو تەئسیر، وەکو سکرتێری کۆمەڵە.

**جیهان: ئەی وەکو جەماوەر؟**

**مەلا بەختیار:** وەکو جەماوەری عاممە، تەقریبەن کاك کۆسرەت بەقووەتترە.

**جیهان: تەسەور دەکەی یەکێتی بتوانێت لە سلێمانی بەدیلێکی نەوشیروان دروست بکات؟**

**مەلا بەختیار:** یەکێتی خۆی بەدیلە.

**جیهان: مەبەستم لە کارەکتەرە؟**

**مەلا بەختیار:** بەڵێ.

**جیهان: وەك؟**

**مەلا بەختیار:** د. بەرهەم بەقووەتترینیانە لەناو یەکێتی لە سلێمانی. پێشموایە وردە وردە لە پارێزگای سلێمانی لەبەرامبەر هەر کەسێکی سەرکردایەتی یەکێتی، خەڵکی سلێمانی کە چووەتە دەرەوەی یەکێتی شانسی د. بەرهەم بەقووەتترە.

**جیهان: مام جەلال وەزعی تەندروستی خراپە، ئەگەر شتێکی بەسەربێت تۆ چی دەکەیت؟**

**مەلا بەختیار:** من یەکێتی باشتر خزمەت دەکەم زمانی هەموومان یەکێتی نیشتمانی کوردستانە، تەبعەن جەنابی مام جەلال جەنابی مام جەلالە.

**جیهان: ئەگەر ئەو چترە نەما، ئێوە چی دەکەن؟**

**مەلا بەختیار:** یەکێتی دەبێت بە چەتر.

**جیهان: ئەی جەمسەرەکان چی دەکەن بە یەکێتی؟**

**مەلا بەختیار:** ئەوە کۆنگرە بریار دەدات. ئێمەی رۆژهەڵاتی جیاوازیمان لەگەڵ رۆژئاوا لەوەدایە، کە گەورەمان دەمرێت عاتفی تر و یەکگرتووتر دەبین. تۆ سەیری ئێران بکە، من قەناعەتم وایە مردنی ئیمام خومەینی بەقەد هاتنەوەی خزمەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانی کرد، چونکە یەك سۆزی یەکگرتنەوەی لەلا دروست کردن کە هەموو شکستەکانی عێراق — ئێرانی دپۆشی لەسەریان، لەبەرئەوە بیرتانە ئیمام خومەینی وتی وەستانی جەنگی نێوان عێراق — ئێران وەکو ژەهر وایە، بەلأم ئەیخۆمەوە، لەبەرئەوە هەموو کاربەدەستان و شارەزایانی جەنگ چونەلای و وتیان جەنگ دەدۆڕێنین ئەگەر راینەگرین، وەزعێکی

زۆرخراپمان هەیە، لەبەرئەوە ئەو ژەهرەی خوارد، بەڵام کە مرد، فرمێسك بوبە کەتیرەی یەکخستنەوەی ئێران، من پێموایە دوای مردنی مام جەلال ئەو برادەرانە ئەگەر بیری جیاواز و رەخنەی جیاواز و خوێندنەوەی جیاوازیان هەیە سۆزی یەکخستن و تۆکمەکردنی یەکێتی زاڵ دەبێت بەسەریاندا.

**جیهان: بۆچی زۆربەی عەسکەرییەکان لەباڵی ریفۆرمن؟**

**مەلا بەختیار:** مانگانە ٧٠ هەزار پێشمەرگە موچەدەدەین، باوەرناکەم ٧٠٠ پێشمەرگە لەگەڵ ئەوان بێت، زۆربەی ئەو فەرماندانەیان فەرماندەی مێژوو نین، ئەوانە یەکێکیان نەبێت کە نامەوێت ناوی بێنم، کە بەعەمەلی فەرماندەیی هەبوو، ئەویش تەجمیدکرا لەو ئاخیرە، ئەگینا ئەوانی تر هەموو فەرماندەی مەفرەزەکانیان هەبوو.

**جیهان: چی دەکەن بۆئەوەی حوتەگەورەکە( پارتی )پەلاماری یەکێتی نەدات و نەیخوات؟**

**مەلا بەختیار:** من بەحوتی نابینم، بەهاوپەیمانە گەورەکەی دەبینم.

**جیهان: ئێستا؟**

**مەلا بەختیار:** لەئێستا و لە خولی رابردووی پەرلەماندا و لە خولەکانی ئایندەشدا، ئێمە ئەگەر هەلومەرجی کوردستان و عێراق و ناوچەکە بەیەکەوە دەبین، بەیەکەوەش نەبین، تازە ببناغەی هاوپەیمانییەکی وامان دارشتووە کەئەگەر جیاش لە هەڵبژاردن دابەزین، بەڵام سنوری بەیەکەوە هەڵکردنی دیموکراسی لە نێوانماندا بنەمایەکی دانا کە تەجاوزکردنی ئاسان نابێت بۆ هەردوو لامان.

**جیهان: سەرەتا رۆژی شۆرشی یەکێتی لەسەر ئەوە بوو کە پارتی حزبێکی بنەماڵەییە، بەڵام هەست ناکەیت یەکێتی بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچێت؟**

**مەلا بەختیار:** تۆ دەزانی من لە جەنابی مام جەلال نزیکم.

**جیهان: تۆ ئەندامێکی بنەماڵەی؟**

**مەلا بەختیار:** خۆم بە ئەندامی بنەماڵە نازانم، خۆم بەکارگێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەزانم، بنەماڵە لەیەکێتیدا نییە تا من ئەندامی بم.

**جیهان: ئاخر بۆت دەژمێرم؟**

**مەلا بەختیار:** بیشی ژمێریت بنەماڵە نییە، وەکو شەخس هەن، بەڵام بەماڵە نییە، بنەماڵە واتا هەیمەنەتی بنەماڵە بەسەر دەسەڵات و حزبەکان، بنەماڵە واتا لەهەڵبژاردندا

کەسێك نەتوانێ خۆی کاندید بکات بەبێ بنەماڵە. لای ئێمە ئەوە نییە، من شانازی بەوەوە دەکەم کە لەگەڵ جەنابی مام جەلال خزمم، بەلاّم هەرگیزاو هەرگیز بەنەما سیاسەت و پرەنسیپی یەکێتی لەسەر ئەوە نییە کە ئایا بنەماڵە و کەس و کاری مام جەلال رازی بن یان رازی نەبن لەسەر ئەوەی کەمن کارگێربم، پێشموایە کە کاندیدکرام بۆ کارگێری و تا ئەو چرکەساتەی کە بوووم بە کارگێر هیچ کەس لەبنەماڵەی مام جەلال نەیزانیوە من بووم بەکارگێر کراشم بە مەکتەب سیاسی پرس بە هیچ کەس نەکراوە کە دەکرێم بە مەکتەب سیاسی، لەوەتەی من بەرپرسی رێکخراوە دیموکراتییەکانم کە ئەوە بۆ(١٤)ساڵ دەچێت مام جەلال لە ژیانیدا تەداخولی یەك بریاری مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتییەکان نەکردووە. من خۆم زۆر جار لە مام جەلالم پرسیوە بەتایبەتی ئەو(١٩)رۆژەی کەلەکاتی نەخۆشییەکەبیدا لە عەممان لەگەڵی بووم، وتم متم جەلال تۆ چۆن بیر لە کورەکانت دەکەیتەوە، بۆ کۆنگرە بۆ ئەوانە هیچ لەخەیاڵتدا هەیە یەکێکیان بێتە پێشەوە، وتی مەلا بەختیار من(٥٠)ساڵە دژی ئەو کلتورە کار دەکەم، پەنجەم ببرن بە ئیمزا و بریاری من یەك کوری من لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان پێش ناکەوێت،

**جیهان: ئەی بۆ ئێستا کورەکانی دەسەلاّتیان هەیە؟**

**مەلا بەختیار:** کام کوری؟

**جیهان: پاڤێڵ کەزاوای تۆیە و هێزێکی زۆری لەژێر دەستدایە. قوباد نوێنەری حوکومەتی هەرێمە لە ئەمریکا، هێرۆخان خانمی یەکەمی عێراقە و بەشێکی زۆر دارایی حزب بەدەستیەوەیەتی. برازاکانی تاڵەبانی. ....؟**

**مەلا بەختیار:** لەکەیەوە جوایت دەدەمەوە، خانمی یەکەمی عێراق مەنسەب نییە، خانمی یەکەمی عێراقە لەبەرئەوەی هاوسەری سەرۆکی عێراقە.

**جیهان: ئەگەر ژنی تاڵەبانی نەبێت، ئەوهەموو دەسەلاّتەی دەبێت.؟**

**مەلا بەختیار:** دەسەلاّتی کوردسات، بۆ کوردسات، تۆ لەمن زیاتر دەزانیت رەخنەی تیا بگریت، کوردسات نوسەرە رەخنەگرەکان لەمن زیاتر رەخنەیان تیا گرتووە، دەسەلاّتی خزمەتکردنی منالپارێزی کوردستان، دە سەلاّتی خزمەتکردنی کازیوە، ئەمە دەسەلاّتە یان خزمەتگوزارییە، ئەمە دەسەلاّتە یان میهرەبانییە، ئاخر ئەمە دەسەلاّت نییە، دووەم بائەوانی ترت بۆ بژمێرم پاڤێڵ تاڵەبانی کە مەسولی هێزێکی دژە تیرۆرە، بەقەد من

مەترسی لەناوبردنی هەیە، ئێستا وردە وردە ساڵێکیش دەبێت کشاوەتەوە لەو مەسئولیەتە، لەژیانیدا ئەو هێزەی پاڤێل تاڵەبانی لێی مەسئولە تەنها ئیشی ئەوە بووە بەدوای تیرۆرستاندا بگەڕێ. پێشم وایە لەسەدا شەستی هێمنی و ئاسایش لە سلێمانی دەگەڕێتەوە بۆ هێزی دژەتیرۆر. بەنسبەت قوبادەوە، خۆی کوڕێکی زۆر بەقابیلیەتە، بە قابیلیەتی خۆی پێگەشتووە، کاندیدی مام جەلالیش نەبووە بۆ ئەو پۆستە. یەکەمجار کاك بەرهەم هەڵبژێردرا بۆ ئەو پۆستە، دوایی بەرێز کاك نێچیرڤان بارزانی بەرەسمی لەم پۆستە جێگری کردووە، کوڕێکی ز ۆر بەقابیلەتە . من لەتۆ دەپرسم چەند نوێنەی حوکوکەتمان هەیە لەدەرەوەی وڵات، چەند بەرپرسی مەکتەبی یەکێتیمان هەیە لەدەرەوەی وڵات، کامیان بەقەد قوباد تاڵەبانی چالاك و بەرچاو رۆشنە لەسیاسەتدا.

**جیهان: تەسەور ناکەی د. بەرهەم زیاتر منداڵی بنەماڵەی تاڵەبانی بێت لەوەی کە یەکێتییەکی بەهێز بێت.**

**مەلا بەختیار:** حەزدەکەم وابێت، ماناکەی بزانە.

**جیهان: ئەمجارە کۆنگرە دەبەستن یان پلنیۆم دەکەن؟**

**مەلا بەختیار:** تازە پلنیۆم نابەستین، کۆنگرە دەبەستین.

**جیهان: تەسەور ناکەی کورەکەی کۆسرەت رەسوڵ بێتە ناو سەرکردایەتییەوە؟**

**مەلا بەختیار:** کاك کۆسرەت پێیخۆشە نەك کوری خۆی، کوری مام جەلال و کوری هەندێك لە مەسئولەکانیش شانسی ئەوەیان بدرێتێ بۆ پێشکەوتن، بەلام تائێستا لە مەکتەبی سیاسی باسی ئەوە نەکراوە.

**جیهان: ئەی تۆ چیت کردووە بۆ کورەکەت؟**

**مەلا بەختیار:** هیچ ناکەم

**جیهان: بەنیازی چیت؟**

**مەلا بەختیار:** هیچ.

**جیهان: چەند پۆستت لەناو یەکێتیدا هەیە؟**

**مەلا بەختیار:** دوو پۆستی رەسمی، کارگێڕ و بەرپرسی رێکخراوە دیموکراتییەکان، وتەبێژ پۆست نییە، وتەبێژیش نەبووم هەرئەوەندە قسەم کردووە.

**جیهان: ئەی ئۆلۆمپیات؟**

**مەلا بەختیار:** ئۆلۆمپیات من بەپۆستی نازانم.

**جیهان: پۆستە، ئێستا شوێنی یەکێکت داگیرکردووە؟**

**مەلا بەختیار:** ئیجازە بدە، دوساڵیش دەبێت داوام کردووە یەکێك لە شوێنەکەم دابنێن، نە ئۆلۆمپی قبوڵییەتی و نەیەکێتیش بەدیلێکی منی داناوە تا ئێستا. بێگومان برادەرانی پارتیش بەهەموو بەدیلێك رازی نابن، جگەلەوەی تەواوی کارەکانی ئۆلۆمپی لەدەست لیژنەی تەنفیزدایە من مانگی یەك یان دوو بۆ سەرپەرشتی کارەك ان لەگەڵیان کۆدەبمەوە، ئەگینا یەك دانە کاری تەنفیزی ئۆلۆمپی لەدەست مندا نییە.

**جیهان: ئەی دەزگای گەلاوێژ؟**

**مەلا بەختیار:** نا، لەدەست من نییە بەس فیستڤاڵی گەلاوێژ سەرپەرشتییان دەکەم، موتڵەقەن لەژیانمدا ئیلا بۆ فیستڤاڵی گەلاوێژ لەگەڵم دادەنیشن، لەبەرئەوەی فیستڤاڵی گەلاوێژ کەئەو هەموو شەخسیەت و نوسەرە بەناوبانگە بانگهێشت دەکەی پێویستی بەیەکێکی وەك من هەیە تا سیقە بکەن لێرە. ئێستا ئەدۆنیز هاتبوو بۆ کوردستان خۆ مەعلومە ئەگەر خەڵکی وەك ئێمەی لەپشت نەبێت ئاسان نییە بێتە کوردستان، ئەگەرنا لە حەیاتما ئیلاقەم بە گەلاوێژ نەبووە.

**جیهان: دەتوانیت پێمانبڵێیت نەسریەی رێکخراوەکان چەندە؟**

**مەلا بەختیار:** ئەوەی ئێمە دەسەڵاتمان هەیە لەمانگێکدا سەرفی بکەین،(٧٥ — ٨٠)ملیۆن دینارە، دەسەڵاتی بودجە کەبتوانین یارمەتی و هاوکاری بکەین، زیاتر لە(٥٨٠)ملیۆن دیناریش بودجەی رێکخراوە دیموکراتییەکانە. کە ئێمە وەریدەگرین و دەیاندەینێ، باقییەکەشی سەرف دەکەین بۆ چالاکییەکانیان و پێویستییەکانیان و لێقەوماوان.

**جیهان: بۆچی ئەمجارە بەلیستی جیا دانەبەزین، تا قووەتی یەکێتیتان بۆ دەر بکەوێت؟**

**مەلا بەختیار:** پێشتر باسمکرد ئەو هەلومەرجە ناوچەیی و عێراقی و کوردستانییە ئیشتبایەکی گەورەیە ئەگەر ئێمە ئاوا دانەبەزین. ئەوە قەناعەتی موتڵەقمانە.

**جیهان: تۆ قەناعەتی موتڵەقت بەوە هەیە دەزگاکانی ناوخۆ و ئاسایش و دەزگاکانی نهێنی بتوانن لەگەڵ پارتی بژین؟**

**مەلا بەختیار:** ئاخر دەبزانە ئەوە یەکێك لەسەبەبەکانە، هەر ئەو پرسیارە یەکێك لە هۆیەکانە کە ئێمە ناتوانین لێکبترازێین، کە بەیەکەوە دادەبەزین دادەبەزین ئەو دەزگایانە

هاوكاری كاملی یەكتر دەكەن، كەبەیەكەوە دانەبەزێین ئەو دەزگایانە لێك دەترازێن، كەواتە هێشتا رۆژگار ماوەتی ئێمە لەبۆتەی یەكگرتنەوەیەك و پرۆسەیەكی دیموكراتی راستەقیەن بتوێینەوە. هەموو شتێك بەئارەزوو دروست دەبێت، دەسەلات و ئۆرگانەكان بەئا رەزوو یەكناگرنەوە. ئنجا دەبێت كاتی بدەیتێ، هەولی لەگەلدا بدەیت، پێویستە مەوزعییەكانی دابین بێت. ئنجا ئەوە رودەدات.

**جیهان: گورزی كوشندەی یەكێتی و پارتی لەهەلبژاردنی داهاتوودا زیاتر ئاراستەی ئیسلامییەكانە یان ئاراستەی گۆران؟**

**مەلا بەختیار:** بێگومان هەردوو لایەنەكە خۆیان سەنگەری ئەوەیان هەلبژاردووە، كە لەهەلبژاردنەكاندا لە ئێمەی ببەنەوە، لەبەرئەوە ئێمە وەكو یەك هەولدەدەین، ئەو دوو جیهەتە لێمان نەبەنەوە و ئێمە لیستی بالا دەست بین ت پێشمانخۆشە زۆرترین دەنگ بهێنین، بۆئەوەی چۆنمان بوێت لە نەتیجەدا حوكومەت پێكبهێنین.

**جیهان: بەشێوەیەكی نهێنی چوار حیزبەكە چوون بۆ ئێران، هەستناكەیت ئێران دەیەوێت لەرێگەی ئەم چوار حیزبەوە گورزێكی باش لە یەكێتی بوەشێنێت؟**

**مەلا بەختیار:** لەخۆیان بپرسە، من دەپرسم ئەمانە پرسیان بە وەزارەتی ناوخۆ و سەركردایەتی سیاسی كردووە چووون بۆ ئێران یان نا؟ ئەمە پرسیارێكە و روبەروی ئەوانی دەكەمەوە، پێمخۆشە وەلامی بدەنەوە، ئەگەر تۆ بتوانی ئەو پرسیارەیان لێ بكەیت زۆرم پێخۆشە.

**جیهان: ئەگەر ئێران دەست نهێنێتە ناو مەسەلەكەوە لەرێگەی ئەوحزبانەوە، خەتەرێك ناكەوێتە سەر یەكێتی لە سنوری سلێمانی؟**

**مەلا بەختیار:** بێگومان هەموو جۆرە دەست تێوەردانێك لەلایەن هیچ دەولەتێكی ئیقلیمی لەلایەن حوكومەتی عێراق و حوكومەتی مەركەزی قبول نییە.

**جیهان: هەندێك جار ناوچەگەرێتی دەكەی، ئەو ئیشانەی بۆ خانەقینت كرد، نمونە بۆ بۆ مەخمورت نەكرد؟**

**مەلا بەختیار:** یەكەم خۆم خەلكی خانەقینم، ئەگەر خانەقین نەبووایە من نەدەبووم بە مەلا بەختیار، خەلكی سلێمانی بوام هەر نەدەبووم بەسیاسی، ئەو چەوسانەوەی لە خانەقین بەرامبەر بە خۆم و كەسوكار و شارەكەم كراوە، ئەوە هاندەرێكی سەرەكی بوو بۆم

بۆ ئەوەی سیاسەت بکەم، دووەم مەخمور ئەوکاتە لەئیدارەی هەولێر بوو، من نەمئەتوانی ئەو سەنگ و ئیمکانەت و پێشمەرگەیەی لە خانەقین هەمبوو بۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەخانەقین کۆی کەمەوە و بتوانم لە مەخمور هەمانشت بکەم، سێیەم ئیش لە مەخمور زۆر ئاسانتر بوو وەك لە خانەقین، مەخمور قەزایەکی بچوکترە لە خانەقین و خانەقین ناوچەیەکی ستراتیژی بوو حەوت کیلۆمەتر لەئێرانەوە دورە، زیاتر لە هەشت هەزار مجاهدین بە چەك و تفاق و دەبابەو راجماتەوە لەوێ بوون هێزە ئیسلامییەکان هەموو تەرکیزییان کردبوو کە خانەقین بگرنە دەست و هاتنە ناو خانەقین لەرێگەی تایبەتی خۆیان(٥٤) هەزار تەعریب لەناو خانەقین بووە، ئەم ئەرکە زۆر زۆر قورس بوو، لەبەرئەوە هەموو ئەمانە پاڵیان نا بەمنەوە کە سێ مانگ بچمە ناو خانەقین بەرنامەم بۆ خانەقین دانا بوو، سێ مانگ پێش ئەوە هەموو تابلۆی دائیرەکانی ناو خانەقینمان بە کوردی نوسی، ناوی هەموو گەرەك و هەموو خوێندنگا و کۆڵانەکانی خانەقین ئەوەی کە گەرەك و کۆڵانی کۆن کۆن بوو، ناوە کۆنەکانمان نوسی و حازرمانکرد، ئەوەی کە گەرەك و کرلانی تازەش بەتەعریب کردبویان ناوی هەموویانمان بۆ کوردی گۆری. ئێمە لەدوای سێ چارەك سەعات یەك تابلۆ لەخانەقین نەما عەرەبی بێت، تابلۆی هەرێمی کوردستانمان لە جێگەی دانەنابێت، لەماوەی یەك یەك هەفتەدا تەواوی شەقام و خوێندنگا و گەرەك هەموویان بونە کوردی، بەرنامەی زۆر وردمان بۆئەوە دانابوو، یەکەم شار لەدوای روخاندنی بەعس، پێنج رۆژ دوای روخاندنی خانەقین بوو، تاکە شار بوو لەدوای یەك سەعات لە رزگار بوون بەنزینخانەی خانەقین ئیشی کرد و کەوتنە خزمەتکردنی خەڵکی.

**جیهان: بۆچی ئەمەتان بۆ کەرکوك نەکرد؟**

**مەلا بەختیار:** لەراستیدا کەرکوك نابێت بە خانەقین، کەرکوك شارێکی زۆر گەورەترە لە خانەقین، کێشەی زۆر گەورەتر بوو لەناو کەرکوکدا، تورکمانێکی زۆر، کۆنە بەعسییەکی ئێجگار زۆر لەکەرکوك هەبوو، بەرنامەی هاوبەشی ئێمە و پارتیش تۆکمە نەبوو، دەستتێوەردانی تورکیا و ئیقلیمیش زۆر بوو، لای ئەمریکاش کەرکوك زۆر هەستیارتر بوو لە خانەقین، وەك یەکێتی کەمتەرخەمیشمان هەبوو بەرپرس و کادیرەکانی یەکێتی لەچوار رۆژی سەرەتای رزگارکردنی کەرکوك کەمتەرخەمییان هەبوو.

**جیهان: لەسەرەتادا وتت لە هەڵبژاردنی داهاتووی پەرلەمان لەسەدا شەستی دەنگەکان بەدەست دەهێنین، خێرە بەیەك هەڵبژاردن لەسەداچلی دەنکەکان دابەزن؟**

**مەلا بەختیار:** کۆ ئێمە لە هەڵبژاردنی پێشو لە سەدا چەندی دەنگەکانمان هێنا.

**جیهان: زیانر لەسەدا حەفتا.**

**مەلا بەختیار:** ئێ ئەوە لەسەدا چەندە شەست، لەبەرئەوەی ٢٥ لیست لەبەرامبەرمانە لە ئێستادا لە هەڵبژاردنی رابردوودا حەوت هەشت لیست هەبوو.

**جیهان: هەست ناکەیت لە هەڵبژاردنەکانی داهاتودا ئەو لەسەدا شەستە بێتە سەدا چل؟**

**مەلا بەختیار:** ناتوانم لە ئێستاوە هیچ حوکمێك بدەم، ئەوە خزمەتگوزاری و سیاسەت و سەرکەوتن لە ناوچە کێشە لەسەرەکان و چۆنیتی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئیحساس و فکری خەڵك ئەمانە تەحدیدی ئەوە دەکەن.

**جیهان: ئەو گەندەڵییەی لەم وڵاتە هەیە حزب یان حوکومەت دروستی کردووە؟**

**مەلا بەختیار:** هەردووکیان. ئەو ڕادە گەندەڵییە کە دیاری نەکراوە جارێ کە هیچ لیژنەیەکی پسپۆر لێکی نەداوەتەوە، بۆ ئەوەی دەستنیشانی بکات. پێموایە هەردوکیان.

**جیهان: حوکومەتەکەی ئەمجارەشتان هەر چل وەزیرە؟**

**مەلا بەختیار:** نا، پێموایە لە بیست و پێنج وەزیر زیاتر بێت، ئەگەر بگاتە بیست و پێنج.

**جیهان:** بە قەناعەتی تۆ سێ پارێزگا بیست و پێنج وەزیری پێویستە؟

**مەلا بەختیار:** نا، بەمن بێت لە پازدە وەزیری زیاتری نابێت، ئەویش زیاد نەبێت کەم نییە.

**جیهان: ئەو نەوتەی رەوانەی دەرەوە کرا، تەسەورت وایە پایەیەك بێت بۆ دروستکردنی دەوڵەت؟**

**مەلا بەختیار:** وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئایا ئابووری بۆ دروستکردنی دەوڵەت گرنگە یان نا، گرنگترین ژێرخانی ئابووری ئێمە تائێستا نەوتە، لەهەموو عێراق و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا، بەڵام ئایا ئێمە ئەوەمان بۆ دەوڵەت کردووە. ئێستا نا.

**جیهان: ئەوە گورزێك بوو لەئێران، ئێران حەقی ئەوەمان لێناکاتەوە؟**

**مەلا بەختیار:** بۆچی گورزێك بوو لە ئێران؟ ئیقتسادی بەقووەت لە کوردستاندا، پەیوەندی نێوانمان بەقووەتتر دەکات، ئێستا تەرازوی نێوان ئایران و هەرێمی کوردستان(٢)ملیۆن دۆلار تێپەڕیوە.

**جیهان: شتێکی تر هەیە، قورسایی ئیقتسادی ئێران لە سنوری ئێوە، قورسایی ئیقتسادی تورکیا لەسنوری پارتییە، پارتی بەمە گورزێکی لە ئێران نەداوە؟**

**مەلا بەختیار:** نا خۆ نەوتی شیواشۆك لەسنوری ئێمەیە.

**جیهان: بەس لە تورکیاوە دەچێت؟**

**مەلا بەختیار:** لەتورکیاوە دەچێت لەبەرئەوەی تورکیا توانی ئەو تەوقە بشکێنێت، تورکیا تەوقێکی شکاند، تورکیا تەحەمولی مەسئولیەتی بردنی تنەوتەکەی کرد. بەم سیاسەتە تەفزیلی سیاستی تورکیا ناکەینە سەر ئێران ئێمە ئەگەر دەوڵەتێك هەبوایە لە مەریخ نەوتەکە هەڵمژێت بۆ ئاسمان قبوڵمان بوو.

جیهان: مالیکی دەڵێت لەگەڵ حکومەتی ئایندەی هەرێم دادەنیشم، مەبەستی ئەوەیە لەگەڵ حکومەتی کابینەکەی یەکێتی دادەنیشێت ئەوە کێشە دروست دەکات یان یەکێتی لەژێرەوە رێککەوتنێکی لەگەڵ مالیکی هەیە؟ مەلابەختیار: ئێمەش بێگومان کەئەو وا سەیری حکومەتی ئێمەبکات، لەگەڵ حکومەتی دوای مالیکی

پەیوەندییەکە زۆرباشمان دەبێت.

**جیهان: ئێوە نەبوونەتەخەلەل لەنێوان حکومەتی مالیکی و نێچیرڤان؟**

**مەلابەختیار:** ئێمە کێین؟

**جیهان: وەکو یەکێتی؟**

**مەلا بەختیار:** ئەگەرڕادەیەك لەڕادەکانی چارەسەرهەبێت لەنێوان جەنابی سەرۆکی هەرێم و بەغدا، حکومەتی هەرێم وبەغدا، ئەوەدەتوانم بڵێم لە سەدا حەفتاو پێنجی یەکێتی نیشتمانی کوردستان جێبەجێکراوە،

**جیهان: جەنابی تاڵەبانی و نیچیرڤان یەك خیتابیان هەیە، جەنابی مەعود بەرزانی و جێگرەکەی یەك خیتابیان هەیە، خیتابێکی توند، خیتابێکی گرانەوە، ئەم دوو خیتابەکامیان باشترن؟**

**مەلابەختیار:** لەکاتی دیفاعدا ئەگەر رەخنەی توند یش بگرین حەقی خۆمانە. لەکاتێکدا پیلانمان لەسەرنەبێت سیاسەتی نەرم کارێکی باشە، ئەمەیەك: دووەمیش: من وای نابینم کەجەنابی حوکومەتی هەرێم خیتابی توندە، وای نابینم جێگرەکەی بەڕێز کاك کۆسرەت خیتابیان توندە، خیتابی توند نابینم.

ئـەوەی مـالیکی دەیڵێـت زۆرزیـاترە لـەوەی ئێمەتائێـستا جوابمـان داوەتـەوە، لەسـەرۆکی هەرێمەوە تا ئاخیرکەس، جەنابی مام جەلالیش سەرۆك کۆمارە، سیفەتی سەرۆك کۆماری و مەسئولییەتی سەرۆك کۆماری فەرق دەکات لەگەڵ سیفەتی سەرۆکی هەرێم.

**جیهان: بەتەسەوری تۆ کوورد تووشی حەفتاوچوار دەبێتەوە یان دەبێت بە دەوڵەت؟**

**مەلا بەختیار:** مێژوو دوبارەنابێتەوە، ئەمە یەك، دووەمـیش ئایا ئـەبین بەدەوڵـەت یـان نا، من چـەند جارێـك ووتوومـە، پـرۆژەی دروسـت کردنـی دەوڵـەتی سـەربەخۆی کوردستان لەدەسـتی سیاسـەتی نێودەوڵـەتی نێودەوڵـەتی و گۆڕانکارییـە هەمەلایەنـەکانی ئاینـدەی ڕۆژهەلأتی ناوەڕاستە. ئێستا لەدەست قیادەی سیاسی کوورددانییە....

## نەوشیروان مستەفا ئەمین
## سیاسە تمەداری ناسراوی کورد

ئـەم دیالۆگـە لـەکۆتایی مـانگی تـشرینی دووەمـی سـاڵی ۱۹۹۹ دا لەسـلێمانی سـازدراوە و لەکۆتایی مانگی یەکەمی هەمان ساڵدا و لەهەمان شاردا دوا دارشتنەوەی بۆ کراوە.

**دیـالۆگ: تـەوەری یەکـەم / کێـشەو بزوتنـەوەی ژنـان – ئافرەتـان لـەکوێوە سەرچـاوەیان گرتووە؟**

**نەوشیروان مستەفا:** سەرەتا مەبەستت لەکێشە و بزوتنەوەی ژنان چییە؟

**کام کێشە؟ کێشەی چی؟**

دیالۆگ: وەك بنەمایەکی گشتی هەرچین و توێژ و رەگەز و ئایین و مرۆڤێك. .. هتد، کاتێـك ئازادییـەکانیان لێـزەوت ئـەکرێت و مافـەکانیان لێ قـەتع دەکرێـت و ئەکەونـە ژێـر زەبـری چەوسـانەوە و سـتەمەوە، کێـشەیان بـۆ دروسـت دەبێـت دواتـر لەبەرامبەریـدا و بـۆ نـەهێشتنی ئەو چەوسانەوە و ستەمەش بزوتنەوەیەك دروست دەبێت، ژنانیش وەك یـەکێك لەدوو رەگەزە بنەرەتییەکەی مرۆڤ هەرلەدوایـدا کۆتـایی هـاتن بەکۆمەڵگـەی دایـك سـالاری، چەوسانەوەی پیاو لەدژیانـدا دەستپێکرد و تائێستاش بەردەوامی هەیە.

دواجار مەبەستم لەکێشەی ژنان نەبونی ئازادی و بێ مافی و چەوسانەوەیەکە، کەلەسـەر ئافرەتان هەیە، بزوتنـەوەی ژنانیش ئەو بزوتنـەوەیە کە بۆ نـەهێشتنـی چەوسانەوەی ژنان و دابینکردنی مافەکان و بەدەستهێنانی ئازادییەکانی ئافرەتان بەرێکەوتووە.

**نەوشیروان مستەفا:** مـن بۆخـۆم لەراسـتیدا حـاڵی حـازر هـیچ کێشەیەك نـابینم بـەناوی کێشەی ژنان. ژن لەکۆمـەڵی ئێمـەدا هـەروەك پیـاو بەشـداری ئـەکات لـە بـوارە جیاجیاکـانی کۆمەڵگـەدا، لـە حوکومەتـدا بەشـداری بەرچـاوی هەیـە، لەهـەموو وەزارەتەکانـدا جێگـاری گرنگیـان پێـداون، هەنـدێك وەزارەت هەیـە ژمـارەی ژنـان زیـاترە لـە پیـاوان تیایـدا وەك وەزارەتـی پـەروەردە، ئێـستا کـچ بـەزۆر بەشـو نادرێـت و سـوڵح کـردن بەژنـەوە لەکێـشەی عەشیرەتیدا زۆر کـەم بۆتـەوە. مـن بـەش بـەحاڵی خـۆم ئێـستا ئـەو کێـشەیەی ئێـوە باسـی لێوەدەکەن لە شاری سلێمانی نایبینم،

**دیالۆگ:** کێشەی ئافرەت هێندە زەق و دیار و بەئاستێك گەشتۆتە کەنەوەك قابیل بە ئینکاری رەتکردنەوە نییە بەڵکو قابیل بە تەحەمولکردنیش نییە، هەر بەکەمترین تێڕوانین لەهەلومەرج و وەزعییەتی ئافرەتانی دەوروبەری خۆمان ئەو راستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە ژنان لەچ مەرگەسات و واقێکی تاڵدا ژیان دەگوزەرێنن، هەر لە بەکەم سەیرکردنیان و لێدانیان لەخێزاندا لەلایەن باوك و براو مێرد و کورەوە و سوکایەتی پێکردنیان لەسەر شەقام و شوێنە گشتییەکان لە کۆمەڵگەدا و پێنەدانی پۆستی گرنگ پێیان لەحزب و حوکومەتدا، تا ئەگات بە تیرۆرکردنی ژنان کەلە لوتکەی تاوانە و بۆتە دیاردەیەکی دیاری ئەم کۆمەڵگەیە. ئەمەش لەسەر بناغە و بەبەڵگەی ئەو دوونامیلکەیەی، کەلەسەر تیرۆری ژنان دەرچووە و کەناوی سەدان ئافرەتی تیرۆرکراوی تێدایە. ئەگەر ئەم هەموو بێ حورمەتی و سوکایەتی و هەرەشە و تیرۆرە کێشە نەبێت، ئیتر دەبێت کێشە چی بێت؟

**نەوشیروان مستەفا:** پێموایە هەر ژن تیرۆرنەکراوە، بەڵکو پیاو زیاتر تیرۆرکراوە.

**دیالۆگ:** بەڵام هۆی تیرۆرییەکان جیاجیایە، تیرۆری پیاوان زیاترە لەسەر دوژمنایەتی و دزی و حزبایەتی و کێشەی عەشایری و شەخسی و. ..... هتد، بەڵام تیرۆری ژنان بەزۆری بیانوی ئەوەوەیە کە گوایە لەسەر بێ شەرەفی و بەدرەوشتییە.

**نەوشیروان مستەفا:** هەندێ لە پیاوەکانیش لەسەر ئەخلاق کوژراون، هەمووی لەسەر دزی و دوژمنایەتی نەبوون.

**دیالۆگ:** بەڵام رێژەکەی ز ۆر کەمە.

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر زۆرە.

**دیالۆگ:** بەڵام پشت ئەستور بەسەرچاوە بروا پێکراوەکانی دەزگا حوکەمی و حزبی و رێکخراوەکانی ژنان – ئافرەتان، ئەو راستییە دەسەلمێنێ کە زۆربەی کوژراو لەسەر مەسەلەی شەرەف ئافرەتە نەوەك پیاو.

**نەوشیروان مستەفا:** پیاویش کوژراوە، بەڵام کەس نەبووە دیفاعیان لێ بکات و زانیارییان لەسەر کۆبکاتەوە. تا ئامارێك بەدەست بهێنێ لەسەر ئەو پیاوانەی کە لەسەر ڕەوشت کوژراون. ئەم دیاردەیەش لەسەرتا سەری دنیا هەیە، تەنها هەر لە کوردستاندا نییە، بەڵام لەوڵاتی ئێمە لەبەر جێگیر نەبونی دام و دەزگای حوکومی وەك پۆلیس و ئاسایش ئەم

تاوانە زۆرتر نەکرێت، ئەگینا لە ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا تاکو سوید و سویسرا ئەو مەسەلەیە لەسەر خیانەتی زەوجی و ساردی کەوتنە نێوان ژن و پیاو روئەدا و کارەساتی دلتەزێن و کوشتنی لێئەکەوێتەوە.

**دیالۆگ:** جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان تیرۆری ژنان لەنێوان رۆژهەلات و رۆژئاوادا ، هەم لەروی ژمارە و رێژەوە، هەم لەروی هۆکانی تیرۆرەکەوە، لێرە تیرۆری ژنان زۆرجار بەهۆی بوختان و درۆ و ئەنجامی نائارامی و هەلچونی دەرونییەوە دەبێت، حالەتی تیرۆر لەویٚ زۆر کەمە، بەلام لێرە زۆرە بە لەبەرچاو گرتنی ژمارەی دانشتوانی هەردوولا ئەمەش واقعێکە کەهەر لە کەسێکی ئاساییەوە بۆ بەرپرسێکی گەورە دانی پیادەنێت.

**نەوشیروان مستەفا:** گەر وایە زۆر لەو بەرپرسانە کاربەدەستن بۆ مەنعی ناکەن؟ من پێموایە ئەو قسانە تەنها بۆ خۆ خۆشەویست کردنە لەلای ژنان گەروایە بۆ مەنعی ناکەن؟

**دیالۆگ:** راستە ئەمە قسەی زۆربەی خەلکییە بە ئاستە جیاجیاکانەوە، کە دەلێن بەرپرسانی ئێستا بۆ بەئەرکی سەرشانیان هەلناستن و ئیجرائاتی پێویست ناکەن بۆ بەرگرتن لەم تاوانە، جا لێرەدا کاتی خۆیەتی ئەم پرسیارە ئاراستەی جەنابت بکەین، کە تائێستا هیچت نەکردووە بۆ نەهێشتنی یان کەمکردنەوەی ئەم تاوانە؟

**نەوشیروان مستەفا:** من وەك بۆم باسکردی هیچ کێشەیەك نابینم، بەناوی کێشەی ژنانەوە.

**دیالۆگ:** کێشەکە زۆر رون و بەرچاوە ناتوانریٚ ئینکاری لە بونی بکرێت.

**نەوشیروان مستەفا:** من بۆخۆم نای بینم، تا ئێستا کەسێك نەهاتووە بۆ لام بۆ شکاتکردن لەم بارەیەوە، پێموایە ئەم شتە زلکراوە و موبالەغەی پێوە دەکرێت.

**دیالۆگ:** بەلام جیا لەقسە و باسی خەلکی و بەرپرسانی ناو بزوتنەوەی ژنان، ئەو دوو نامیلکەیەی دەرچوون بەناو نیشانی: یەکەمیان(هاواریٚ لە کوردستانەوە)کە لەلایەن رێکخراوی سەربەخۆی ئافرەتانەوە بلاوکراوەتەوە، دووەمیشیان بەناوی(زنجیرەیەك لە تراژیدیای تاوانەکانی دژ بە ژنان)کە لەلایەن سەنتەری راگەیاندنی سەر بە یەکێتی ژنانی کوردستان بلاوکراوەتەوە کە تیایدا ناو و ناونیشان و تەمەن و تەنانەت وێنەی ئافرەتە تیرۆرکراوەکانەوە، بەسەدان حالەتی تیرۆری ژنانی تێدا بلاوکراوەتەوە لەمە زیاتر بەرێزت بەلگەی چی ترت دەوێت؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەلاَم ئەو ژمارە زۆرەی باسی ئەکەن خنکاوە و سوتاوە و. .... هتد، چی پەیوەندییەکی بە تیرۆرەوەیە؟ هەرئەوە ماوە ژن بەدەردی خوا بمرێت و بلێین تیرۆر کراوە.

**دیالۆگ:** بروانا‌کەم هیچ کەسێك یان لایەنێك بتوانێت قسەبكات یان مەسەلەیەك لەهیچی خۆرایی دروست بکات، بلاَوی بکاتەوە بەئاسانی بەسەر خەلَکیدا بەتایبەتی کەسانی رۆشنبیر و بەئاگادا تێپەڕێت. سەبارەی بەژمارەی ژمارەی ژنانی سوتاو و خنکاو. .... هید، گەر لەکۆی هەموو ژمارەکانی دەربکەین هێشتا(١٤٠)حالَەتی تیرۆری ژنان ئەمێنێتەوە لە(١٥)مانگدا، ئەمەش لەسەر بناغەی ئەو زانیارییانەی لە نامیلکەی(زنجیرەیەك لە تراژیدیای تاوانەکانی دژ بە ژنان)کە لەلایەن سەنتەری راگەیاندنی سەر بە یەکێتی ژنانی کوردستان بلاَوکراوەتەوە ئاماری تیرۆرکراوەکانیش لەمەکتەبی مافی مرۆڤی یەکێتییەوە وەرگرتووە، واتا سەرچاوەی هەموو زانیارییەکان لە خوی یەکێتی نیشتمانییەوەیە.

**نەوشیروان مستەفا:** لەگەلّ ئەمانەشدا هەمووی هێشتا بروانا‌کەم تیرۆری ژنان بەو ئاستە بێت کە کێشەیەکی گەورەی بۆ ژنان دروست کردبێ، بەوشێوەیەی کەتۆ باسی ئەکەیت، هەروەها لەروی ئینسافیشەوە بێت پێویستە باسی ئەو سەدان پیاوانەش بکەیت، کە توشی کەئابە بون بەدەست ژنەکانیانەوە، لە کاتێکدا ئینسان بمرێت باشترە وەك لەوەی توشی کەئابە بێت، چونکە ژیانی دەبێتە دۆزەخ.

**دیالۆگ:** بەلاَم بەهەزاران ژنیش توشی جۆرەها نەخۆشی دەرونی بوون بەهۆی پیاوەکانیانەوە، بەهەرحالّ مادام تا ئێستا بەرێزت لەگەلّ بوونی ئەم بەلَگانەش بڕوات بە بونی کێشەیەکی تایبەت بەژنان نییە، پێمانباشە بزانین ئەم راو بۆچون و تێروانینە لەسەر چ بناغەیەك دارشتووە؟

**نەوشیروان مستەفا:** من ئەلَێم موبالەغەی زۆری پێوە کراوە، ئەو تیرۆری ژنانەنەی هەیە ئەچێتە چوارچێوەی ڕێرەوی ئەو تاوانانەی لە کۆمەلَگەدا ئەکرێت و تەنها تایبەت نییە بە ژنان و بەلَکو لە دژی ژنانیشدا دەکرێت، و بەشێکە لەکێشەی کۆمەلَەکەمان بەگشتی. ئەگەر ئێمە بتوانین یاسا سەروەر بکەین و دەزگاکان بەباشی کاربکەن و کەسێك کەسێکی تر ئەکوژێت نەتوانێك رابکات و خۆی بداتە پالّ لایەنێك، ئەوا حالَەتی کوشتن کەمئەبێتەوە، ئەمەش بەستراوە بەوەی دام و دەزگاکانی حوکومەت هەم چالاك بن هەم چاوپۆشی نەکەن.

**دیالۆگ:** ئەوە مەسەلەیەکی ئاشکرایە لای هەمووان، کە ئەو ئیدارانەی تا ئێستا هەبوون نەیانتوانیوە کار و ئەکەکانیان وەك پێویست بەڕێوەبەرن، هەر بۆنمونە تاوانبارن و وەك پێویست ناگیرێن و سزا نادرێن و ئەمە واقعە، بەلاّم قسەی ئێمە ئێستا لەسەر ئەو کێشەیەیە کە سەرتاسەری کۆمەلگەی گرتەوە.

**نەوشیروان مستەفا:** سەرتاسەری کۆمەلگەی نەگرتەوە بۆنمونە: هەر لەم گەرەکەی ئێمەدا چەند هەزار مالّی تێدایە، تاکو ئێستا یەك ژن تیرۆرنەکراوە، تیاشیەتی بە ئاشکرا پەیوەندی لەگەلّ ئەم و ئەودا هەیە، نازانم لەمە زیاتر ژنان چییان دەوێت؟ ئۆردوگای رانیە ئۆردوگایەکی دواکەوتووە، کۆمەلّێکن تا ئێستا پەیوەندی خێلّەکی باوە تیایاندا، داب و نەریتی عەشایەری زالّە بەسەریاندا ژنێك دەکوژرێت لەوێ، ناکرێت بکرێتە پێوەر بۆ پێوانەی هەموو کۆمەلگە.

**دیالۆگ:** یەکەم – ژن دەیەوێت وەك ئینسان سەیر بکرێت، ئەوەی بۆ پیاو ڕەوایە بۆ ئافرەتیش ڕەوابێت، دووەم – هەر لە ئۆردوگای رانیە تیرۆری ژنان نییە، بەلکو لەناو جەرگەی شارەکانی کوردستانیش جیا لە شارۆچکە و لادێکانی ئەم تاوانە هەیە.

**نەوشیروان مستەفا:** من وتم بەشێکە لەهەموو تاوانەکانی ناو کۆمەلّ.

**دیالۆگ:** بەلاّم ناحەقیانەترین و وەحشیانەترین تاوانە.

**نەوشیروان مستەفا:** کوشتنی ئینسان لەسەر هەر شتێك بێت جۆرێکە لە وەحشییەت و تاوان.

**دیالۆگ:** بەلاّم کاتێك لەسەر گومانێك یان خۆشەویستییەکی پاك بێت، ئازاری زامی ئەو تاوانە قولّتر و قورستر دەبێت،

**نەوشیروان مستەفا:** تۆ چوزانیت ئەوە گومان یان خۆشەویستییەکی پاك بووە؟

**دیالۆگ:** پشت ئەستور لەسەر بناغەی ئەو بەلگانەی لەو نامیلکە و رۆژنامانەدا بلاّوکراونەتەوە، کە بەدواداچون و لێکۆلّینەوەیان لەبارەی ژنانی تیرۆرکراوەوە کردووە.

**نەوشیروان مستەفا:** دەرچونی ئەو نامیلکە و رۆژنامانە بەلگەیە بۆ بونی ئازادی لە کۆمەلگەی ئێمەدا.

**دیالۆگ:** ئێمەش بڕوامان بە بونی جۆرێك لە ئازادییە لەم کۆمەلگەیەدا، بەلاّم ەبئاستێکی دیاریکراوی کەم، بەهەرحالّ ئێستا ئێمە قسەمان لەسەر بون یان نەبونی ئیزادی

نییه، بەڵكو قسەمان لەسەر بون و نەبونی كێشەی ژنانە، كێشەكەمان ئەوەیە برێزت بڕوای بەبونی كێشەی ژنان نییە.

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر بڕوام نییە كێشەیەك هەبێت بەناوی كێشەی ژنانەوە.

**دیالۆگ:** گەر كەسێكی وەك بەرێزت كەیەكێكی لە ناسراوترین سیاسەتمەدارانی كورد، دواجار قەناعەتی ئاوابێت كە بڕوای بەمەسەلەی كێشەی ژنان نییە، ئەبێت من چاوەڕێی چی بكەم لە كەسانێكی ئاسایەی ئەم كۆمەڵگەیە؟

**نەوشیروان مستەفا:** ئەوە موشكیلەی خۆتە، من وەكو پێموتی ئەو كێشەیەی تۆ باسی دەكەیت و بەكێشەی ژنان باسی دەكەیت من نایبینم و باوەڕم بەبونی نییە.

**دیالۆگ:** بەڕزت لێدان و سوكایەتی و هەرەشە و تیرۆری دژ بە ژنان بەكێشە نازانیت؟

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر.

**دیالۆگ:** بەچییان ئەزانیت؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەشێكن لەو تاوانانەی لە كۆمەڵگەدا دەكرێن.

**دیالۆگ:** ئەم تاوانانە كە لەدژی ژنان ئەكرێن، دواجار نابنەهۆی دروست بوونی كێشەیەكی تایبەت بەژنان؟

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر

**دیالۆگ:** چۆن

**نەوشیروان مستەفا:** ئەمە رەئی منە، تۆ دەتوانیت پێچەوانەی بیت.

**دیالۆگ:** بەدڵنیاییەوە پێچەوانەی ئەو رەئییەم.

**نەوشیروان مستەفا:** كەواتە گەشتینە خاڵی كۆتایی.

**دیالۆگ:** بەڵێ، بەلأم دەتوانین ئەم خاڵی كۆتاییە بكەینە خاڵی سەرەتا بۆ چەند باس و بابەتێكی تر، كە پەیوەندیدارە بەژنانەوە.

**نەوشیروان مستەفا:** منیش پێمباشە.

**دیالۆگ: تەوەری دووەم / كێشە و بزوتنەوەی ژنان –ئافرەتان ئێستا لە چ ئاستێكدایە؟**

**نەوشیروان مستەفا:** ئێستا دەوری ژنان لە كۆمەڵگەی ئێمەدا زۆرە لە هەموو بوارەكاندا كار دەكەن، دكتۆری ژن هەیە، پارێزەر و ئەندازیاری ژن هەیە، سەرنوسەر و رۆشنبیری ژن هەیە. .... هتد، هەندێ وەزارەت رێژەی ژنان زۆرترە تیایدا وەك لە پیاوان.

**دیالۆگ:** مەسەلەکە لە زۆری ژناندا نییە، لە گرنگی پۆستدایە، بەو واتایەی دواجار بریار لەدەستی کێدایە، بۆیە دەبینین ئەو وەزارەتە تاقانەیەی درابویە ژنان لەم ئالۆگۆرەی ناو حوکومەتدا لێییان سەندرایەوە لەکاتێکدا بەرێز مام جەلال لە پاداشتی کار و چالاکی فاتمەخان وەك وەزیرێکی سەرکەوتوو، رێزی لێنا و تەکریمی کرد. هەروەها نەبونی ئافرەت لەسەرکردایەتی و مەکتەب سیاسی یەکێتیدا جیجی پرسیارە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەبێ ژن خۆی ئیسپاتی وجودی خۆی بکات، دەرگایان لەرودا دانەخراوە. ئەگەر ژنی کورد خۆی لێوەشاوە بوایە، ئەیتوانی لەناو حزبەکان و ئیدارەی کوردیدا جێگەی خۆی بکاتەوە، ئەگەر ژن خۆی نەتوانێ خۆی بسەپێنێ ئیتر پیاو چی لێ بکات؟

**دیالۆگ:** مەسەلەکە بێتواناییی ژنی کورد نییە، بەلکو نەبونی فرسەتی گونجاو و رێپێنەدانە.

**نەوشیروان مستەفا:** کێ رێیلێگرتوون.

**دیالۆگ:** بەرێزت. .

**نەوشیروان مستەفا:** چۆن؟ من هیچ کات لە دژی ژندا نەبووم.

**دیالۆگ:** بەلام بەرێزت بۆت باسکردم ئەگەر ئافرەتتان وەربگرتایە لە پارتی کرێکارانی کوردستان، زیاترتان لەگەڵدا ئەبوو بە دەیان ئافرەت ئامادەبوون لە ریزەك انی یەکێتیدا خەبات بکەن و لە شۆرشدا بەشداربن، بەلام بەرێیزت رێگەت پێنەدا بوون، ئەمە بۆ؟

**نەوشیروان مستەفا:** لەبەرئەوەی ئەو بار و زروف و وەزعەی ئەو زەمانە تێیدا بووین زۆر سەخت بوو، مقەراتی جێگیرمان نەبوو، گەرۆك بووین لە دێهاتەکاندا ئەسوڕاینەوە، شوێنی چالاکی ئێمە شوێنە عاصییەکان بوو، کە سوێنی زۆر دابراوبوو لە شارستانیەت، ئێمە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی بەهێز لەگەڵ جوتیار و لادێ نشینەکانی ئەو ناوچانەدا دروست بکەین ئەبوایە بچوینایە ئاستی عاقڵ و بیرکردنەوەی ئەوانەوە، لە هەڵسوکەوت و خورەوشتماندا وەك ئەوان رەفتارمان بکردایە، بۆئەوەی بروا و متمانە لە بەیەنماندا دروستبوایە، چونکە ئێمە پێیستیمان بەوان بوو، لەو قۆناغەدا نەمان ئەتوانی ژن لەگەڵ خۆماندا بسورێنینەوە، چونکە ئەبو بەهۆی دابرانی ئێمە لەخەڵك لەو قۆناغەدا نەمان ئەتوانی ئافرەت وەر بگرین، و لە مەفرەزەکانی خۆماندا چەکداریان بکەین، چونکە ئێمە

ده‌چوینه مزگه‌وت بۆحه‌وتن خه‌ڵکی دیهاته‌که قبوڵیان نه‌ده‌کرد که ئافره‌ت له‌گه‌ڵماندا بێت، هه‌روه‌ها زۆربه‌ی زۆری پێشمه‌رگه‌کانی ئێمه گه‌نجی هه‌رزه‌کاری تازه پێگه‌شتوو بوون، ئه‌گه‌ر ئافره‌تیان له‌گه‌ڵ بوایه، توشی ده‌یان گیروگرفتی ئه‌خلاقی ئه‌بوون، بۆئه‌وه‌ی روبه‌روی روداو و پشێوی نه‌بینه‌وه و گرفت و کێشه‌مان بۆ دروست نه‌بێت، به‌باشم زانی ئافره‌ت وه‌رنه‌گرین له‌شاخ، به‌لاَم له رێکخستنه‌کانی ناو شاردا ئافره‌تی زۆری تێدا بوو بۆ مونه: کاتی خۆی له‌ناورێکخستنه‌کانی ئێمه له‌شاری سلێمانی که‌رتێکمان هه‌بوو ه‌بناوی که‌رتی(له‌یلا قاسم)یه‌کێك بوو له‌که‌رته گه‌وره و چالاکه‌کان.

**دیالۆگ:** به‌لاَم کۆمه‌ڵه‌ی ئێران له‌هه‌مان هه‌لومه‌رجی ئێوه‌دا بوو، به ده‌یان پێشمه‌رگه‌ی ئافره‌تیشیان له‌گه‌ڵدا بوو.

**نه‌وشیروان مسته‌فا:** به‌لاَم زۆر توشی گیرو گرفت و کێشه بوون و بووه هۆی دابرانیان له‌خه‌ڵکێکی زۆر.

**دیالۆگ:** ئه‌ی پارتی کرێکارانی کوردستان.

**نه‌وشیروان مسته‌فا:** پێ کاکا له‌ناو میلله‌ت و وڵاتی خۆیدانییه.

**دیالۆگ:** که‌واته به‌ڕێزتان قه‌ناعه‌تتان وابووه و واشتان به‌باشزانیوه ته‌نها بۆ بردنه پێچه‌وه‌ی هه‌ندێك له کاره‌کانتان رێز له‌داب و نه‌ریتێکی دواکه‌وتووی به‌سه‌ر چووی سه‌دان ساڵ له‌مه‌وبه‌ر بگرن، که‌له‌گه‌ڵ ژیانی هاوچه‌لاخی ئه‌م رۆژگاره‌دا ناگونجێت ئه‌گه‌ر پێچه‌وانه‌که‌تیان بکردایه باشتر نه‌بوو؟

**نه‌وشیروان مسته‌فا:** نه‌خێر باشتر نه‌بوو، هه‌موو خه‌ڵکمان لێئه‌بوو به دوژمن، هه‌روه‌ها کۆمه‌ڵێك له کاره‌کانمان نه‌بوو به‌ڵکو له‌به‌ر شۆرش بوو، مه‌سه‌له‌ی هه‌ڵسانه‌وه‌ی شۆرشی کورد بوو له تێکشکان، مه‌سه‌له‌ی به‌رگریکردن بوو له میلله‌ته‌که‌مان له‌به‌رامبه‌ر هێزی پێنجه‌می دنیا.

**دیالۆگ:** بێ ئه‌وان ئه‌وه نه‌ده‌کرا؟

**نه‌وشیروان مسته‌فا:** نه‌خێر، هه‌ربه‌به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌ی ئه‌نفالکرا، ئێمه‌یش ناچاربووین ئه‌و جێگایانه چۆڵ بکه‌ین و به‌جێیهێڵین، دێهاته‌کامی کوردستان هه‌روه‌ك ده‌ریا بوو بۆ ماسی، هه‌روه‌ك چۆن ماسی بێ ئاو نازی، پێشمه‌رگه‌ش بێ لادێ نه‌ده‌ژیا.

**دیالۆگ:** گەر مەسەلەکە ئابووە، ئیتر گوناهی ژنان دەبێت چی بێت؟ ژنان ئامادەبوون قوربانی بدەن بەهەموو شتێك دور لە کارەبا و ئوتومبێل و خۆشی و پشودانیان و بەهرەمەند بونیان لەژیانێکی هاوچەرخی ناوشار هاتبونە دەرەوە بۆ شاخ و لادێکان، بۆ ژیانێکی سەخت و دژوار، بەرێزیشتان قبولتان نەکردوون بەهۆی هەلومەرجی نەگونجاو و داب و نەریتی دواکەوتوانەی خەڵکی لادێکان ئیتر لەمەزیاتر ئافرەتان چی بکەن؟ قوربانییان داوە بەهەموو شتێك، بەلام کۆمەڵگە و بەتایبەت پیاو لە دژیان بووە.

**نەوشیروان مستەفا:** پیاو لەدژی نەبووە، کامەتا پیاو لەدژی بووە؟

**دیالۆگ:** هەر بەبەڵگەی قسەکەی بەرێزت کە ئێستا خۆت باستکرد.

**نەوشیروان مستەفا:** ئێستاش کەم لەشکری دنیا هەیە ژنی تێدا بێت، ئەوە چەند ساڵە ئیسرائیلی و ئەمریکییەکان ژنیان هێناوەتەوە ناو هێزی چەکدارەوە، هێزی چەکدار لە دنیادا بەزۆری پیاوە.

**دیالۆگ:** ئامادەییەکە هەبووە لە ئافرەتەکەوە، لە کاتێکدا رێگای پێ نەدراوە، ئیتر گوناهی ژن چییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ رێگامان پێ نەداوە، لەبەرئەو رێگایانەی کە پێموتی.

**دیالۆگ:** کەواتە دواجار گوناهی ئافرەتان نییە، کە ئیسپات و وجودی خۆیان نەکردبێت لە شۆرشدا، نابێت بکرێتە خاڵی بەهانەگرتن پێیان چونکە گەر پیاو رێگەی پێیان بدایە رۆڵی خۆیان بەسەرکەوتوویی دەبینی، هەر بەبەڵگەی خێزانەکانی بەرێزتان لەمەکتەب سیاسی و سەرکردایەتی و بەرپرسەکانی تر، کە ژیانی سەخت و تاڵی شاخ و شەریان هەڵبژاردو لە خۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵتان بوون.

**نەوشیروان مستەفا:** راستە ئێمە هەموو خێزانەکانمان لەدەرەوە لە شاخ لەگەڵماندا بوون، لەگەڵ ئێمەدا لەژێر تۆپ و تەیارەدا بوون، و ئیش و کاری خۆیان بەسەرکەوتوانە دەکرد، ئەوەش جێی شانازییە بۆ ئێمە و ئەوانیش، هەروەها هەڵوێستێکی سەروەرانەیە لەمێژووی خەباتی ئافرەتی کورددا، بەلام هاوکاتیش کەم نەبون ئەو ئافرەتانەی دەوری سلبییان گێرا.

**دیالۆگ:** وەکو چی؟

**دیالۆگ:** مەسەلەی باری ئابووری بەشێکە لەهۆیەکان، بەلاّم هەمووی نییە، چونکە ئاستی رۆشنبیری و نەبونی پەیوەندی پێشوەخت، بۆ یەکتر ناسین و بیروباوەری سیاسی و تەنانەت ئینتمای حزبیش لەم هەلومەرجەی ئێستادا رۆلّی خۆیان هەیە.

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر وانییە، مەسەلەی ئابوری لەهەمویان گرنگترە، بەبلگەی ئەوەی، پیاوێك لە خاریج دێتەوە باشترین و جوانترین کچ شوی پێدەکات، بێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی فکری و سیاسی و حزبی و رۆشنبیری هەبێت لەنێوانیاندا، واتا لەخاریج بوون بۆتە بەرزترین شەهادە، بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت جوانترین و شۆخترین کچ بهێنێ لەکاتێکدا کاتی خۆی بروات هەبێت ئافرەتی کورد ئامادە نەبوو شو بەکورێك بکات کە لە خاریج بێت، ئێباشە ئەوە خەتای کچەکەیە نەوەك کورەکە.

**دیالۆگ:** ئافرەتی ئێمە ئەمە بۆ دەکات؟

**نەوشیروان مستەفا:** بۆئەوەی بچێت بۆ خاریج زۆرجاریش لەوێ لە پیاوەکەی جیادەبێتەوە.

**دیالۆگ:** ئەمە بۆچی ئەکات؟

**نەوشیروان مستەفا:** نازانم ، بۆ؟

**دیالۆگ:** لەبەرئەوەی لەوێ وەك بەرێزت ئاماژەت پێکرد، هەم مانگانە برێك پارەی هەیە بۆ خەرجی رۆژانە و چاوی لەدەستی کەس نییە، هەم شوققەیەکی هەیە بۆ پشودان، بێ جێگە نییە و هەم ئازادە لە هەلّسوکەوتیدا کەس ناتوانێ سوکایەتی پێ بکات. کاتێکیش مێردەکەی ئینسانانە رەفتاری لەگەلّداناکات، جیابونەوەی پێ باشترە وەك لە پێکەوە ژیان لەگەلّیدا.

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر هەر ئەوەنییە، بەلّکو دوو دنیای جیاوازە، کە دەچێت بۆ ئەوێ دەچێتە دنیایەکی بەرلاّییەوە، چونکە ئەو ئازادییەی خەلّکی ئەوێ لێی بەهرەمەندن، لەئەنجامی گەشەی چەندەها سالّە یان باشتر بلّێین چەند سەدەیەکە، کە بەشێنەیی و لەسەرخۆ پێی گەشتوون، بەلاّم کەسێکی ئێرە کەدەچێتە ئەوێ ئەو ئازادییە بە بەرەلاّیی تێدەگات، توشی بەرلاّیی و بێ ئیلتزامە دەبێت.

**دیالۆگ:** ئەمە هەر بۆژن نییە بەلّکو بۆ پیاویشە، مەسەلەی تێگەیشتن لە ئازادی وەك خۆی یان سەیرکردنی وەك بەرەلاّیی زیاتر بەندە بە هۆشیارییەوە نەوەك رەگەزی نێر و

مێ، دواجاریش ئەوە هەرژن نییە، کە حەزی لەخاریجە، بەڵکو پیاو و منداڵ و گەنج و پیری ئەم کۆمەڵگەیە هەموویان ئامادەن قوربانی بدەن بەهەموو شتێك تەنانەت بە ژنانیش، ڕێگەی هات و نەهات ئەگەر نە بەڕو خۆیان ئەدەنە دەم دەریا و ئەچنە نێو کێڵگەی ئەڵغام ئەمەش لەپێناو چوون بۆ خاریج.

**نەوشیروان مستەفا:** بۆچی.

**دیالۆگ:** لەبەر نەبونی ضمان و ئەمان لەم وڵاتەدا، بەتایبەتی لە بواری سیاسی و ئەمنی و ئابوریدا، چونکە کەس نازانێت نەوەك لە داهاتوودا بەڵکو لە ئێستاشدا چی رودەدات؟ لەروی هەلومەرجی سیاسییەوە لەلایەك ئەگەری هاتنەوەی بەعس بۆ کوردستان بۆتە تارمایی ترس و هەمیشە هەرەشە لەخەڵك دەکات، لەلایەکی تر، شەری حزبەکان بەگشتی و شەری یەکێتی و پارتی بەتایبەتی، وەزعێکی نائارامی بەبەردەوامی بۆ خەڵکی کوردستان دروستکردووە و بێزاری کردوون، هاوکات نەبونی ئازادی بەواتا راستەقینەکەی خۆی لە ژیانی واقیعدا دور لە ئیدیعا و دروشم، ئەویش هەر لەنەبوونی ئازادی قسەکردن، تا دەگات بە تیرۆر بەتایبەتی تیرۆری سیاسی کەوای لەخەڵك کردووە هەمیشە لە حالەتی ترسدا بژین. .. هەروەها خراپی بواری ئابوری دیاری ئەم کۆمەڵگەیە، هەروەها لەبواری کۆمەڵایەتیدا تا ئێستا عورف و عاداتێکی کۆن ئیش دەکات و جۆرێك لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی هەیە کە بەواتای وشە دواکەوتووانەیە، سەرباری ئەمەش هەمووی ئەو فەسادییە ئیدارییەی کەزۆربەی فەرمانگە و کارگە و دەزگاکانی حوکومەتی گرتۆتەوە، بەتایبەتی پۆلیس و ئاسایش کە بەرتیل وەرگرتن بۆتە دیاردەیەکی بەرچاو لەناویاندا.

**نەوشیروان مستەفا:** جا کۆچکردن چارەسەرە؟

**دیالۆگ:** نەخێر، بەڵام خەڵکەکە بێ ئومێدە لە هەموو شتێك، هەر لەخودی خۆ یەوە کەبەتەنها هیچی پێناکرێت، تا دەگات بە حز بەکان کە هیچی بۆناکەن لەم وڵاتەدا هیچ پرۆژە و ئاسۆیەکی رون بەدیناکرێت، بەهەرحاڵ ئەم میللەتە هەمووی لەسەر سەفەرە، ئیتر بۆچی بۆپیاو حەڵاڵ و بۆژن حەرام بێت؟

**نەوشیروان مستەفا:** من باسی حەڵاڵ و حەرامم نەکرد، تۆ باسی مانەوەی کور و کچت کرد، منیش وتم مەسرەفی زەواج گرانە، هیچ ماڵێك ئامادەنییە کچی خۆی بەخۆڕایی بدات بەهیچ کورێك.

**دیالۆگ:** ئەمە داب و نەریتی کۆمەڵگەیە، ئیتر گوناهی کچ چییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** باشە تۆ و ئەو کچەی تۆ دیفاعی لێدەکەیت، بۆ دژی ئەو نەریتە نابن؟

**دیالۆگ:** بەدڵنیاییەوە کارمان بۆ ئەوەیە، بەڵام کاتێ دەسەڵات لە دژمان بووەستێ پارێزگاری لەو داب و نەریتە دواکەوتوانەیە بکات. هەر ئەم وەزعە دەبێت کە هەیە، تاوانی کچێکی داماو دەبێت چی بێت کە باوك و برا داوای زۆریان هەبێت.

**نەوشیروان مستەفا:** کچەکە داوای دەکات نەوەك باوك و برا.

**دیالۆگ:** بەڵام لەژێر کاریگەری دایك و بوکدایە، هەروەها پێویستە ئەوە بزانین بۆچی کچ داواکاری زۆر دەکات؟

**نەوشیروان مستەفا:** چونکە پێموایە تا مارەییەکەی زۆرتر بێت، رێزی زۆرتر دەبێت، تا خشڵ و جل و بەرگی زۆرتری بۆ بکرێت، پایەی کۆمەڵایەتی بەرزتر دەبێت، تا شەکراوەکەی خەڵکی زۆرتری بۆ بانگ بکەن دیارتر و ناسراو تر دەبێت.

**دیالۆگ:** ئەمە بۆخۆی واقعێکی تاڵی کۆمەڵایەتییە و زادەی عەقڵێکی دواکەوتووی ئەم کۆمەڵگەیەیە، ئیتر کچێکی داماو بەتەنها چی پێدەکرێت؟

**نەوشیروان مستەفا:** تۆ هەر باسی کچی داماو دەکەیت ئەگەر ئەو کچە داماوە رازی بێت بەگەنجێك و پێکەوە داهاتوی خۆیان پێکەوە بنێن باشتر نییە، لەوەی مێردەکەی بخاتە ژێر قەرزێکی گەورە و گرانەوە.

**دیالۆگ:** کارێکی چاکە کە کور و کچ بەیەکەوە ژیانی خۆیان پێکەوە بنیاد بنێن، کوران و کچانێکی دیاریش هەن کە ئەم کارەیان کردووە بەڵام بەداخەوە بەڵام کەمن، چونکە ئەم هەنگاوە پێویستی هەم بە هۆشیاری و هەم بە جورئەت هەیە، بۆ پێپەراندنی داب و نەریتی باوی کۆمەڵگە، کە لە ئێستادا کچانی کۆمەڵگە بەهۆی ئەو فشارە هەمە لایەنەی سەریانە ناتوانن ئەو هەنگاوە بنێن.

**نەوشیروان مستەفا:** فشاری هەمەلایەنەی چی؟ کامەتا فشار؟

**دیالۆگ:** فشاری عەقڵیەت و گوفتار و رەفتاری کۆمەڵگەی باوکسالاری، هەر لەخێزانەوە بۆ قوتابخانە و کارگە و شەقام و. ... هتد.

**نەوشیروان مستەفا:** گەر ژن خۆی بیەوێ دەتوانێ ئەم کۆسپانە تێپەڕێنێ، لە راستیشدا ئەمانە هیچی کۆسپ نین.

**دیالۆگ:** چۆن کۆسپ نین؟ هەر بۆنمونە هەزارەها ژن هەیە ئەیەوێ لە مێردەکەی جیا ببێتەوە، بەلاّم ناتوانێت بەهۆی ئەو رێگریانەوە. چونکە پەیوەندی نێوان ژن و پیاو لە خێزاندا تا سەر نابێت رەنگە هەر (١٠)ساڵ پێکەوە بن، ئەمەش لەسایەی سیستەمێکی چەوسێنەری وەك سەرمایەداری کە هەموو شت تیایدا لەسەر بناغەی بەرژەوەندی قازانج و زیان حسابی بۆ ئەکرێت، تاکو پەیوەندییە کۆمەلاّیەتی و ئینسانییەکانیش.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەوە راست نییە کەتەمەنی ژیانی هاوسەرێتی لە ئەوروپا(١٠)ساڵ بێت، چونکە ژن و مێرد هەیە زیاتر لە(٥٠)یاڵە پێکەوەن.

**دیالۆگ:** بەلاّم عەشیقە و هاوڕێیان هەیە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەوەش راست نییە، چونکە بونی عەشیقە وەك خیانەتی زەوجی سەیر دەکرێت، رەنگە پەیوەندی ژن و پیاو بە عەشق و غرام دەست پێ بکات. بەلاّم کە دواتر خێزانیان پێکەوەنا مەسەلەکە دەبێتە شتێکی تر، چونکە کەخێزان دروست دەبێت لەسەر بەرژەوەندی خێزان دروست دەبێت، منداڵ و خانو و میرات بەیەکیانەوە دەبەستێت، من بە پێچەوانەی ئەو رەئییە مەسەلەکە دەبینم دوای(١٠)ساڵ بەیەکەوە ژیان نەوەك جیانابنەوە، بەڵکو دەبنە هاورێ یەکتر، لای خۆشمان هەروایە خیچزانەکانی باووباپیرانمان زیاتر لە(٥٠)ساڵ بەیەکەوە ژیاون.

**دیالۆگ:** ئەو بەیەکەوە ژیانە لەسەر بناغەی ویست و خۆشەویستی نەبووە و نییە، بەڵکو ناچارییە من بۆخۆم ئەو خێزانانەی ئەیانناسم و سەردانم کردوون ، کەبە دەیان و سەدان زۆربەی هەرە زۆری لەیەك بێزارن.

**نەوشیروان مستەفا:** تۆ بەس ئەو مالاّنە دەگەرێیت کە کێشە و گرفتیان هەیە، من سەدان ماڵ چووم زۆر ئاسودەبوون.

**دیالۆگ:** من تەسەور دەکەم ئەو مالاّنەی تۆ سەردانت کردوون و زۆر ئاسودەبوون، زیاتر روکەش بووە، ئەگینا لە راستیدا و بەکردەوە وانین.

**نەوشیروان مستەفا:** بۆچی روکەشە، ژن و پیاو پێکەوە دەژین و منداڵیان هەیە پێکەوە پەروەردەی ئەکەن و هاوکاری یەکتر دەکەن و لە کار و ئیشەکانیاندا، قسەی خۆش لەگەڵ یەکتر دەکەن و سەیران و سەفەر پێکەوە ئەکەن، سەیرانی ماڵان ئەکەن و پێکەوە بۆ بازار و شوێنە گشتییەکان دەچن، ئیتر بۆ روکەشە؟

**دیالۆگ:** لەگەڵ ئەمانەشدا قسەی ناشیرین و رەق بەیەکتر دەڵێن، درۆ و بوختان بۆیەکتر دروست دەکەن، شەر و ئاژاوە دەنێنەوە و جیابونەوە دەبێت، هەروەها منداڵ پشتگوێ ئەخەن توند و تیژی لەبەرامبەردا ئەکەن. ... هتد.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەو رەفتارانەش بەشێکن لە ژیانی ئینسان، هەروەك چۆن پێکەنین بەشێکە لەژیان گریانیش هەروا بەشێکە لەژیان.

**دیالۆگ:** بەلام بەشە ناشیرین و قێزەونەکەیەتی کەدەبێت لەدژی بین، بەهەرحاڵ ئەوەی کە ئێستا دەیبینین و بۆتە واقعێکی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگەیە، ئەوەیە کە کێشەی خێزان زۆرە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەوەش راست نییە، لەهەموو دنیا کێشەی خێزان هەیە، لای خۆشمان ئەم کێشەیە هەیە، بەلام زۆر کەمە، بەتایبەتی کێشەی هەڵوەشاندەنەوەی خێزان.

**دیالۆگ:** ئەوە فشاری کۆمەڵگەیە کە خێزانی بەیەکەوە هێشتۆتەوە، ئەگینا ئێستا زۆربەی خێزانەکانی ئێمە لەبەردەم هەرەشەی هەڵوەشاندنەوەدان.

**نەوشیروان مستەفا:** زەختی کۆمەڵگە نییە، بەڵکو ئەو عەقدە زەواجەیە کە لەنێوان ژن و پیاودا هەیە، ئەگەر ژنەکە داوای جیابونەوە بکات ئەوە هەموو مافێکی دەفەوتێ، ئەگەر پیاوەکەش ژنەکە تەلاق بدات دەبێت پارەیەکی زۆر بدات.

**دیالۆگ:** ئەوەی بەرێزت باست کرد کە ترسە لەپارە، یەکێکە لە خاڵەکان لەگەڵ ئەمەشدا چەند خاڵێکی تر هەن ، وەك ترس لەتانە و تەشەری خەڵکی و کەمبونەوەی چانسی شوکردن، بۆ جارێکی تر و نەبونی سەرچاوەیەکی خەرجی بۆ بژێوی ژنان و نەبونی جێگەیەك بۆ حەوانەوە. ... هید، دواجار ئەم ترسانەیە کە خێزانیان بە یەکگرتوویی هێشتۆتەوە.

**نەوشیروان مستەفا:** بەلام ترسێکی باشە، ئەو ترسەیە کەخێزانی لە هەڵوەشان پارستووە و بە یەکبونی ئەیهێڵێتەوە.

**دیالۆگ:** بەلام ئەوە دەبێت چ ژیان و گوزەرانێك بێت، كە ترس ژن و پیاو و منداڵەكانیان لە چوار دیواری ماڵێكدا و لەژێر یەك سەقفدا كۆبكاتەوە كە هەمیشە لەسەنگەردا بن بۆ یەكتری، ژیانێك ترس و بێ ئارامی زاڵ بێت بەسەریا هەر نەبێت باشترە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەم فكر و تێروانینەی تۆ باسی لێوە دەكەیت، دیفاعكردنە لەبەرەڵایی و هەڵوەشاندنەوەی خێزان.

**دیالۆگ:** من نازانم لەم كۆمەڵگەیەدا بۆچی هەمیشە ئازادی بە بەرەڵایی ناو دەبرێت، زۆرجاریش تەسەوری ئەوە دەكرێت ئازادی یەكسانە بەفەسادی یان فەسادی بەرەنجامی ئازادییە، زۆر سەیرە ئەم تێروانینە.

**نەوشیروان مستەفا:** مەبەستت لە ئازادی چییە؟

**دیالۆگ:** لە سادەترین پێناسەیدا: هەرشتێك لەگەڵ و یست و ئارەزوی ئینسانانەی مندا هاتەوە، زیانی بۆتۆ و كەسانی تر نەبوو بیكەم. ئیتر نازانم ئەم ئازادییە بۆ بەفەسادی دادەنرێت؟

**نەوشیروان مستەفا:** ئێ فیعلەن ئەمە فەسادییە.

**دیالۆگ:** بۆچی فەسادییە، بەكام بەڵگە؟

**نەوشیروان مستەفا:** بۆنمونە تۆ دەتوانی حەشیش بكێشی زەرەری بۆمن نییە، بەلام زەرەر بە كۆمەڵ دەگەیەنێت، هەروەها كەسێك هەتوبازی دەكات زەرەری بۆ من و تۆ نییە، بەلام بۆ كۆمەڵ خراپە.

**دیالۆگ:** ئەم شتانەی باست كرد گەرزیانی بۆ كەسێك نەبێت، ئەوا بۆ كۆمەڵگەی هەیە كە ئەمە خراپترە، من هەر گفتار و رەفتارێك بەئازادی دەزانم كە بەویست و وشیاری ئارەزوی خودی ئینسانەكە بێت، دور لەهەموو فشار و چاوبەست و ئیغراییەك و زیانبەخش نەبێت، نە بۆتاك نە بۆكۆمەڵ، بەهەرحاڵ ئێستا ئێمە قسەمان لەسەر حەشیش و هەتیوبازی نییە، بەڵكو قسەمان لەسەر خۆشەویستی و پەیوەندی نێوان كور و كچە، كە ناسكترین و پیرۆزترین و بالاترین هەستی ئینسانییە، كێشەكە ئەوەیە لەم كۆمەڵگەیەدا هەرشتێك كەبتەوێ بە ئازادی بیكەیت رستەوخۆ تۆمەتی فەسادی خراوەتە پاڵ.

**نەوشیروان مستەفا:** من نازانم، دڵداری پاك كەس بە فەسادی باسی نەكردووە، بەلام ژنێك مێردی هەیە دەچێت پەیوەندی جنسی دەبەستێ ئەمە دیارە ئەمە فەسادییە.

**دیالۆگ:** پێموایە(خیانەتی زەوجی)لەژنەوە بێت یان لە پیاوەوە کەس بەباشی نازانێ، بەڵکو بە کردەوەیەکی قێزەونیش سەیر دەکرێ، بەلام لەجیاتی ئەوەی تۆمەتی فەسادی بخەینەپاڵ، ئەو کەسانە بالە هۆکانێ ئەو کارە بکۆڵینەوە و بزانین چییە؟ ڕێگا چارەی بۆ بدۆزینەوە، پێموایە یەکێك لەخەلەل و هەڵەگەورەکانی ئەم کۆمەلگەیە ئەوەیە کەنایەوێت بەرێگا دروست و سروشتییەکان چارەسەری کێشەکان بکات، بەڵکو ڕێگای سەرکوت و سزادان دەگرێتەبەر، هەر بۆنمونە ئەوروپاییەك پیچش سەردەمی ڕێنیسانس و ڕۆشنگەری چی بوو، ئێستاش چییە؟ ئەمەریکایەك(٥٠٠)ساڵە هەیە ئێستا تەحەکوم بەدنیاوە دەکات، بۆ؟

**نەوشیروان مستەفا:** هەر لەبەرئەوەیە کەژن ئازادە؟!

**دیالۆگ:** بەڵێ بەشێکی سەرەکی ئەوەیە، هەرچەندە ئافرەت تائێستا لە هیچ شوێنێکی دنیادا ئازادییەکی تەواوی بەدەست نەهێناوە، بەشێکی تری ئەوەیە ڕێگە دراوە بەخەڵکی بۆ ممارەسە کردنی ئارەزووە سروشتییەکانی خۆی بە ئازادانە، بەشێکی تریشی ئەوەیە عاقڵ بیردەکاتەوە و دەست ئیش دەکات.

**نەوشیروان مستەفا:** ئازادی ئاواتی ك ۆن و نوێی مرۆڤایەتییە، بەلام نابێت گەیشتن پێی بە قەڵەم باز و بازدان بێت، واباشترە بەشێوەیەکی شێنەیی و لەئەنجامی گەشەی ئاسایی و سروشتی خۆیەوە پێی بگەین.

**دیالۆگ:** بەلام بێ هەنگاوی جددی و گەورە گەیشتن بە ئازادی کارێکی مەحاڵە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئێمەیش دانەنیشتوین و لەکاری بەردەوامداین بۆ ئەو مەبەستە.

**دیالۆگ:** بەلام لە ئاستی پێویستدا نییە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئێمە لە ئێستادا هەرئەوەندەمان پێدەکرێت، کێ لەئێمە زیاتری پێدەکرێ با بیکات و ئێمەش دەستخۆشی لێدەکەین.

**دیالۆگ: تەوەرەی سێیەم / کێشە و بزوتنەوەی ژنان – ئافرەتان لەبەردەم سەدە و هەزارەیەکی نوێدا.**

**نەوشیروان مستەفا:** پاشەرۆژی ژنان روناك ئەبینم، تەسەور دەکەم دەوری ژنان زیاتر بێت لە ژیانی کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و ئابوریدا . رەنگە لەژیانی سیاسی رۆڵی گرنگ ببینن، بەلام لە داهاتویەکی دوردا، پێموایە کۆمەلی ئێمەش ساڵ لەدوای ساڵ بۆ پێشەوە

دەچێت شانبەشانی ئەویش دەوری ژنانیش کاریگەرتر ئەبێت، رەنگە کەسایەتی رۆشنبیری و سیاسی گەورەیان تێدا هەڵبکەوێت، بەلاّم لەسەدەی داهاتودا، ژنکوشتن هەر ئەمێنێت.

**دیالۆگ: تەوەرەی چوارەم / کێشە و بزوتنەوەی ژنان – ئافرەتان لەنێوان ئایدۆلۆژیا جیا و دژەکاندا.**

**نەوشیروان مستەفا:** ئەگەر ئیسلامییەکان بروایان بە کێشەی ژنان نەبێت ئەوە رەئی خۆیانە.

**دیالۆگ:** لەسەر ناسیۆلیستەکان ئەڵێی چی؟

**نەوشیروان مستەفا:** ئەگەر مەبەستت لە ناسیۆلیستەکان ئێمەیە، ئەوا ئێمە قەت شتی وامان نەو تووە، لە هیچ بۆنەیەکدا، نە بەنوسین و نەبە قسەش، هەر لەدامەزراندنی یەکێتییەوە لەساڵی ١٩٧٥ دا بەشێك لە پرۆگرامی یەکێتی بۆ ژنان تەرخانکراوە، کەمن خۆم ئەسڵی ماددەکانم ئامادەکرد و رێکم خست و نوسیمەوە، کە هەمووی داکۆکی کردن بوو لەمافەکانی ژنان. پێویستە ژنان شانبەشانی پیاوان دەوریان هەبێت، خەبات بکەن بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی قەومی.

**دیالۆگ:** بۆچی بۆ بەشدار بوون لە دروستکردنی دەوڵەت پێویستە ژن کار و ئەرکی لەسەر شان بێت، بەلاّم بۆ ماف و ئازادییەکانی نەهاتووە؟

**نەوشیروان مستەفا:** پێویستە ئەرك و مافی ژنان شانبەشانی پیاوان بچنە پێشەوە هەر چۆن پێویستە ژنان بەشداربن لە دامەزراندنی دەوڵەتدا هەرواش پێویستە زەمینەیان بۆ خۆشبکرێت بۆ گەیشتن بەمافەکانیان.

**دیالۆگ:** گەر یەکێتی ئەمە قەناعەت و بروایەتی بۆچی لەماوەی ئەم(٨ – ٩)ساڵەی دوای راپەریندا کۆمەڵێك کاری گەورە و گرنگی بۆژنان بە کردەوە نەکردووە، لە کاتێکدا هەم دەسەلاّتی لەبەردەستدا بوو هەم توانای ماددی لەبەر دەستدابوو.

**نەوشیروان مستەفا:** لەم(٨ – ٩)ساڵەی دوایدا زۆر لەناو یەکێتی نەبووم، ئەتوانی ئەم پرسیارە لەبەرپرسانی تری ناو یەکێتی بکەیت، بەلاّم ئەوەندەی بزانم زۆر شت کراوە ئەوە یەکێتی ژنان هەیە و سەنتەری راگەیاندنی ژنان هەیە، لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ساڵی ١٩٩٢ دا، دەنگیان داو لێرە بەدواوە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شا رەوانی دەست پێدەکات و ئەتوانن خۆیان کاندید بکەن، هەم بۆ ئەنجومەنەکە و هەم بۆ سەرۆکایەتی شارەوانی ئەمە

مافی خۆیانە، بەلاّم ئەگەر خۆیان بەکاری نەهێنن، ئیتر پیاو چی بکات، خۆ بەزۆر نایسەپێنێ بەسەریاندا.

**دیالۆگ:** ئایا تاچەند زەمینەخۆشکراوە بۆ ئافرەتان بۆ خۆ کاندیدکردن؟

**نەوشیروان مستەفا:** مەبەستت لەزەمینە خۆشکردن چییە؟

**دیالۆگ:** مەبەستم ئەوەیە ئاسانکاری و هاندان هەبێت، گەر ئەمەش نەکرا رێگری و دژایەتی نەکرێن؟

**نەوشیروان مستەفا:** لەکوێ دژایەتی کراوە، بۆنمونە چ ژنێك هاتووە خۆی کاندید بکات و دژایەتی کرابێت؟ ئێمە لەکاتی کۆنگرەی یەکێتیدا هەرەشەمان لە کام ژن کردووە بۆئەوە خۆی هەڵنەبژێرێت؟ ئێمە لەهەموو کۆمیتەکانمان هەڵبژاردنمان کردووە، بە چ ژنێککمان وتووە هەقی خۆ هەڵبژاردنت نییە.

**دیالۆگ:** ئەمە بەشێوەیەکی ئاشکرا نەکراوە بڕواشناکەم بکرێت، بەلاّم بەنهێنی کراوە و ئەشکرێت، بەرێزت لەمن شارەزاتر و بەئەزمونتری و باشتر ئاگاداریت، کە چۆن لەکاتی هەڵبژاردندا تەکەتولات دروست دەبێت ، پەیوەندی ژێربەژێر دەبەستریّ و چ فێلّ و چاوبەستکردنێك رودەدات لەناو خودی پیاوەکاندا، ئیتر چ جای ژنی داماو؟

**نەوشیروان مستەفا:** من رازی نابم بلّێی ژنی داماو، ژن بۆ داماوە؟ هیچ داماو نییە.

**دیالۆگ:** من وشەی(داماو)م بۆ لاوازی و بێ دەسەلاّتی ژنان بەکار نەهێنا، بەلکو مەبەستم ئەوەیە ژنان بەدلّێکی ساف و نیەتێکی پاك و سادەیی خۆیانەوە ئەچنە هەڵبژاردنێك کە(١٠١)فروفێلی تێدا دەکرێت، ئیتر چۆن شانسی دەرچونی دەبێت لەکاتێکدا ئەو راستییەش ئەزانین کە ژنان لەو ئیمکانیەتە ماددی و مەعنەوییە بەهرەمەندنین کە پیاو لێی بەهرەمەندە.

**نەوشیروان مستەفا:** بۆچی بەهرەمەندنییە، بەهرەمەندن و زیاتریش، خەتای ژن خۆیەتی نازانێت بەکاری بهێنێت، خەتای پیاو چییە؟ دواجاریش ژن خۆی ئەو وەزعەی پێباشە و رازییە پێی، پیاو چی لێبکات.

**دیالۆگ:** جا چ کەسێك هەیە لەروی فکری و عەقلّی و دەرونی و شارییەوە تەواو بێت، بیەوێت پلە دوو بێت و بەکەم سەیر بکرێت؟

**نەوشیروان مستەفا:** جا بۆ پلە دووە؟ کەی پلە دووە؟ هیچ پلە دوو نییە،

**دیالۆگ:** ئاخر چۆن پلە دوو نییە؟ ئەی ئەوەی ئەیبینن چییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** هیچ نییە، ئەوەتا لای ئێمە مافی دەنگدان و خۆهەڵبژاردنی هەیە.

**دیالۆگ:** ئەوە یەکێکە لەمافە سەرەتاییەکان.

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر هەرئەوە نییە، هەرمافێك پیاو هەیەتی لەم کۆمەڵگەیەدا ژنیش هەیەتی، لەروی نەزەرییەوە ژن و پیاو یەکسانن، بەلاّم لەروی عەمەلییەوە کە ژن خۆی نەتوانێ جێبەجێی بکات پیاو تاوانی چییە،

**دیالۆگ:** کام یەکسانی ژن و پیاو کەلەم کۆمەڵگەیەدا هەیە، ئەوەندەی نایەکسانی ئەبینین، یەك لەسەر دەی ئەو یەکسانییە نابینن.

**نەوشیروان مستەفا:** من پێچەوانەکەی بەراست دەبینم.

**دیالۆگ:** کەواتە پێویستە من ئێستا پێت بڵێم، جیاوازی و نایەکسانییەکان چییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ، پێم بڵێ.

**دیالۆگ:** من هەر لەخێزانەوە دەست پێدەکەم کەچۆن شێوازی رەفتاریان جیاوازە و نا یەکسانە لە بەرامبەر کور و کچدا ، تادەگات بە قوتابخانە و کارگە و فەرمانگە و شەقام و بازار تا دواجار دەگاتە حزب و حوکومەت، لێرەدا زۆرجێی خۆیەتی ئەو پرسیارە بکەین، ئەگەر یەکسانی لە نێوان ژن و پیاو لەم کۆمەڵگەیەدا بەرقەرارە، بۆچی لە مەکتەب سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتیدا نەوەك هەر نیوەی ژنان نین، بەڵکو تەنها یەك ژنیشی تێدا نییە، لەکاتێکدا یەکێتی(٢٤)ساڵە دامەزراوە، ئەبوایە تائێستا چەندین ژنی پەروەردە نەکردایە، بۆ پۆست و جێگە گرنگەکان.

**نەوشیروان مستەفا:** هەر یەکێتی وانییە، بەڵکو حزبی شیوعی عێراق و حزبی شیوعی سۆڤیەتی جاران و هەموو کزبەکانی تریش هەروان.

**دیالۆگ:** ئەمە بۆخۆی خەلەلێکی گەورەیە تیایاندا.

**نەوشیروان مستەفا:** لەهەموو دنیادا هەروایە، لە ئەمریکا تا ئەم ساڵانەی دوایی وەزیری ژنیان نەبوو.

**دیالۆگ:** بەلاّم لەبەریتانیا یەك مارگرێت تاتشەر هەبوو، کە پێیان ئەوت(ژنی ئاسنین)و لەهینددا کاندێرا غاندی هەبوو، لە تورکیا تانسۆ چیلەر هەیە. ... هتد. بەهەرحاڵ ئێستا پرسیارەکەمان ئەوەیە بۆچی لەسەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی یەکێتیدا ژنی تێدا نییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** تا ئێستا یەکێتی یەکجار کۆنگرەی خۆی بەستووە، لەو کۆنگرەیەدا هیچ ژنێك خۆی کاندید نەکرد، بەلاّم لەهەڵبژاردنەکانی ناو کۆمیتەکاندا خۆیان کاندید کرد و لەهەموویاندا دەرچوون.

**دیالۆگ:** هۆی خۆ کاندید نەکردن لە کۆنگرەی یەکدا چی بوو؟

**نەوشیروان مستەفا:** لەخۆیان بپرسە.

**دیالۆگ:** لەم بارەیەوە دوو رای جیاواز هەیە، یەکەمیان پێی وایە زەمینەی گونجاو نەبووە بۆ ژنان، دووەمیان ئەڵێت: بێتوانایی و لێنەهاتوویی ژنان خۆیانە.

**نەوشیروان مستەفا:** هیچییان راست نین، یەکەمیان ئێمە رێگەمان لە هیچ ژنێك نەگرتووە و دژایەتیمان نەکردوون، دووەمیان لەناو ئافرەتاندا ژن هەیە توانا و کەفائەتی لەهەندێك ئەندامی سەرکردایەتی زیاترە.

**دیالۆگ:** کەواتە بەبروای بەرێزت هۆەی چییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** ترسی ژن خۆیەتی، هەرکاتێ ئەو ترسەی بەزاند ئەتوانێ هەموو شتێك بکات.

**دیالۆگ:** بەرێزت بەڵێنی ئەوە دەدەیت پشتگیر و هاوکاری ئافرەتان بیت، لەو هەنگاوەیاندا بۆ پێپەراندنی حاڵەتی ترس و بەزاندنی.

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ.

**دیالۆگ:** سەبارەت بەکۆمۆنیستەکان دەڵێ چی؟

**نەوشیروان مستەفا:** مەسەلەی ژنان لای کۆمۆنیستەکان لە دنیادا مەسەلەیەکی مەبدەئییە و بروا‌کەم، ئیستغلال هەبێت.

**دیالۆگ: تەوەرەی پێنجەم / کێشە و بزوتنەوەی ژنان – ئافرەتان لەنێوان رۆژئاوا و رۆژهەلاتدا.**

**نەوشیروان مستەفا:** گەشەکردنی ئابوری و کۆمەلایەتی فەرهەنگی دەوری سەرەکی خۆی بینیوە، لە پێشکەشکردنی ژنان لە ئەوروپادا بەتایبەت گەشەی ئابوری پێویستە بۆ ژنان کە بتوانن وەك پیاو رۆڵی خۆیان ببینن، جیاوازی نێوان ولاّتی ئێمە و ئەوان لەچەند رویەکەوەیە، دوو عەقلیەتی جیاواز، دوو ئاینی جیاواز، دوو رۆشنبیری جیاواز دوو تێگەیشتن و دوو تێروانینی جیاواز. .... هتد.

ئاینی مەسیح جۆرێك لە لێبوردنی تێدایە و ئێستا تارادەیەکی زۆر کاڵ بۆتەوە، ئەو تەئسیرەی جارانی نەماوە لەسەر خەڵکی رۆژئاوا، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا ئاینی ئیسلام تائێستاش تەئسیری لەسەر عاقڵیەت و دەرونی خەڵکی خۆمان ماوە، ئیسلام جۆرە بۆچونێکی تایبەتی هەیە بۆ ژنان و پەیوەندی نێوان ژن و پیاو. ... هتد. هەر بۆ نمونە ژنی ئەوروپی پەروەردەدەکرێت تاکو چەند بۆی بکرێت خۆی برازێنێتەوە بۆ ئەوەی ئیسارەی پیاو بکات و سەرنجی بۆلای خۆی رابکێشێ، بەڵام لەوڵاتی ئێمەدا ئافرەت وا پەروەردە دەکرێت تاکو چەند بۆی بکرێت خۆی داپۆشێ و خ ۆی لە پیاو بشارێتەوە، گۆرینی ئەم جۆرە عاقڵیەت و تێروانینە هەروا بەئاسانی ناکرێت و پێویستی بەکات و کار هەیە،

**دیالۆگ: تەوەری شەشەم / تیرۆری ژنان – ئافرەتان، لەنێوان مافی ناموس پەرستی تاوانی وەحشی گەریدا.**

**نەوشیروان مستەفا:** تیرۆر یان باشتربڵێین کارێکی وەحشیانەیە، ئیتر لەدژی ژندابێت یان پیاو، لەهەر شوێنێکدا یاسا سەروەر بێت پێویستە هەرکەسێك تاوانێکی کرد بدرێتە دادگا، کوشتنی ژن بەبیانوی بەدرەوشتی و بێ شەرەفییەوە، کارێکی نا ئینسانانەیە، بۆ هیچ کەسێك نییە بەهەر بیانویەکەوە بێت هیچ کەسێك بکوژێت. تیرۆر عورفێکی داوکەوتوی کۆمەلایەتییە،

**دیالۆگ:** هەریەك لە ئاین و عورف و یاسا و دەسەلات و رۆشنبیر چەندێ بەرپرسیارن، یان تاوانبارن لەم تاوانەدا؟

**نەوشیروان مستەفا: ئاین:** بەرپرس نییە، چونکە مەرجی زۆر سەختی داناوە، ئەبێت پیاوەکە بەسەر ژنەکەوە بێت و بەروتی و مومارەسەی جنس بکەن بەدیار چاوی چوار کەسەوە کەئەمەش ز ۆر زەحمەتە روبدات.

**عورف:** زەمینە خۆشدەکات.

**یاسا:** یاسایەکە بەعس دایناوە پێویستە بگۆرێت.

**دەسەلات:** هەر ئەوەندەی بۆکراوە کەکردویەتی، بەڵام گەر دەسەلات بتوانێ هەرئەوکەسانەی ئەم تاوانەیان کردووە بگرێت، ئەم دیاردەیە زۆر کەم دەبویەوە.

**رۆشنبیر:** کەسی کوشتووە؟

**دیالۆگ:** نەخێر.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەی تاوانی چییە؟

**دیالۆگ:** بێدەنگە.

**نەوشیروان مستەفا:** بێدەنگ نەبووە.

**دیالۆگ:** بەڵام وەك پێویست قسەی نەکردووە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەوەی لەسەری بووە کردویەتی، دەنگی نارەزایەتی بەرزکردۆتەوە، ە گوێی لێنەگرن چی بکات؟ دەستبداتە چەك و شەر بکات، ئەمە ئێیشی رۆشنبیر نییە.

**دیالۆگ: تەوەرەی حەوتەم / گۆرینی یاساکان، ئەحوال شەخسی و سزادانی عێراقی ەنێوان کاری مەحاڵ و** بریاری شۆرشگێرانەدا.

**نەوشیروان مستەفا:** لە ساڵی ١٩٩٢ دا، کە پەرلەمانی کوردستان دامەزرا، یەکێك کارەکانی ئەوە بوو دەستکاری هەموو ئەو یاسایانەی عێراق بکات، کە لەگەڵ مافەکانی رۆڤدا ناگونجێت، بەڵام کە دواتر شەر لەنێوان یەکێتی و پارتیدا دەستی پێکرد پەرلەمان ڕشی شەلەل بوو، لە ئێستاشدا ئێمە پەرلەمانمان نییە.

**دیالۆگ:** کەواتە خەڵك دەبێت چاوەرێ بن، تا هەڵبژاردنێکی نوێ دەکرێتەوە و ەرلەمان دروست دەکرێتەوە، دواتر ئەو یاسایانە دەگۆرن.

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر پێویست بەو چاوەروانییە ناکات، چونکە پشت ئەستور یاسای(٢)مام جەلال سەلاحیەتی ئەوەی هەیە وەك سەرۆك هەرێم یاساکان بگۆرێت. ەرێزیشی داوای کردووە لە کۆمەڵی یاساناس و شارەزا لەو بوارەدا ، کە هەموو یاساکان ستکاری بکەن، بەشێوەیەك کەبگونجێت لەگەڵ بەندەك انی مافی مرۆڤدا. تا ئێستا یاسای زادان تەواو بووە، لە داهاتویەکی نزیکدا یاسای ئەحوال شەخسیش تەواو دەبێت، بەڵام ەندێ مەسەلە هەیە پەیوەندی بە ئاینەوە هەیە، رەنگە نەتوانین لەیاسادا دەستکاری کەین، بۆنمونە رێگەنەدان بە کچێکی موسلمان شوبکات بەپیاوێکی مەسیحی یان جولەکە، ەڵام ئەو ماددانەی کە رێگە(باوك و برا و مێرد و کور)دەدات بۆ کوشتنی ژن و خوشك و چیان ئەومادانە بەتەواوی لابراون. لە داهاتویەکی نزیکدا کاریان پێئەکرێت.

**دیالۆگ:** ئەتوانین ئەم قسانەی بەرێزت وەك بەڵێن وەربگرین.

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ.

**دیالۆگ:** تەوەری هەشتەم / بە پەراوێزکردنی ژنان - ئافرەتان لەنێوان بێ توانای سروشتی و بێ فرسەتی سەپێنراودا.

**نەوشیروان مستەفا:** من پێموایە کۆمەڵێك پیش هەیە ژن پێی ناکرێت، گەر بیشیکات ئەیشێوێنێت.

**دیالۆگ:** وەك چی؟

**نەوشیروان مستەفا:** کرێکارییەکی قورس، بەڵام هەر کارێك پەیوەندی بە عاقڵ و فکر و زانینەوە بێت، جیاوازییەکیان نییە ، بەڵکو وەکو یەکن.

**دیالۆگ:** کەواتە بەرێزت بڕوات وایە فرسەتی گونجاو نەدراوە بە ئافرەتان تاوەکو بونی خۆیان بسەلمێنن؟

**نەوشیروان مستەفا:** لە چ شتێکدا بونی خۆیان بسەلمێنن؟

**دیالۆگ:** لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەتایبەتی ژیانی سیاسی.

**نەوشیروان مستەفا:** هەن.

**دیالۆگ:** پۆستی گرنگ و حەساسیان نییە.

**نەوشیروان مستەفا:** با بێن بەزۆر بیسەنن و خۆیان فەرز بکەن.

**دیالۆگ:** هەرچەندە دەیان کۆسپ هەیە، لەرێگیاندا بۆئەوەی ئەو کارەبکەن، بەڵام لەکاتێکدا ئەم کارەشیان کرد پیادەی کام سیاسەت دەکەن؟ سیاسەتێك لەکە خزمەت ژناندایە یان ئەو سیاسەتەی کەدانراوی پیاوە و لەخزمەتی پیاودایە، بۆنمونە چیللەر لە تورکیا چ سیاسەتێکی پیادە دەکرد؟ هەر هەمان سیاسەت نەبوو کەپیاوەکانی پێش خۆیی و دوای خۆشی پیادەیان دەکرد.

**نەوشیروان مستەفا:** سیاسەت پەیوەندی چییە بەژن و پیاوەوە؟ سیاسەتی ولاچتێك کە دادەنرێت بۆ سود و قازانجی ولاتەکە و میللەتەکەیە بە گەنج و پیر و ژن و منداڵەوە.

**دیالۆگ:** بەڵام بەشی ژن لە قازانج و سود چەندەی تیایە؟

**نەوشیروان مستەفا:** زۆرجار ژن بەشداری نەکردووە لە بەدەستهێنانیدا، بەڵام بۆ سود و قازانجەکەی شەریکە.

**دیالۆگ:** بڕواناکەم هیچ شۆرشێك یان بزووتنەوەیەك یان کارێك کرابێت ژن بەشداری تێدانەکردبێت. بەڵکو قوربانی داوە لەپێناو هەر دەستکەوتێك کە ئێستا بەدەستهاتووە، لە

پاداشتی چاکە و قوربانیدانیان بەرێزت ئەوەشیان پێ ڕەوا نابینیت، کە بەشێك لەو دەستکەوتانە لەخزمەتی ئافرەتاندا بێت.

**نەوشیروان مستەفا:** بۆ پێیان ڕەوا نابینم؟ هەقی خۆیانە.

**دیالۆگ: تەوەری نۆیەم / ژنان – ئافرەتان لی ئاینی ئیسلام و دەسەلاتە ئیسلامییەکاندا.**

**نەوشیروان مستەفا:** ئیسلام بۆ سەردەمی خۆی کاری باشی بۆ ژنان کرد، توانی ژنان لە کۆمەڵێك نەریتی دواکەوتوی ئەوکاتە رزگار بکات، بەلام بۆ ئێستا و دوای تێپەربوونی دوای ١٤٠٠ ساڵ پێویستی بە گۆڕانکاری هەیە. بۆئەوەی لەگەڵ گیانی سەردەمدا بگونجێت، لە ئیسلامیشدا بوار و ڕێگە پێدان هەیە بۆ ئاڵوگۆڕ و چاکسازی، ئێمە لە کۆمەڵگەی خۆماندا کارێك بکەین کە ئیسلام ئایین بێت و ژن یەکسان بێت و کۆمەڵگەش پێشکەوتوو بێت.

**دیالۆگ:** ئەمە چۆن دەکرێت؟ لە کام کۆمەڵگەیەدا ئەمە هەیە؟

**نەوشیروان مستەفا:** ئەگەر ئێمە بتوانین کۆمەڵگەی مەدەنی دروست بکەین، ئازادی و دیموکراسی تیا بەرقەرار بێت، ئەوا دەتوانین ئەو شتانەیش بەیەکەوە کۆبکەینەوە.

**دیالۆگ:** ئەوتریّ لە ئیسلامدا کۆمەڵێك ئایەت و فەرمودە هەن، کەلە دژی ئازادی و مافی ژناندان، ئەمە چۆن دەبینی؟

**نەوشیروان مستەفا:** زۆرجار تەفسیر و لێکدانەوەی هەڵە بۆ ئەو ئایەت و حەدیسانە دەکرێت، ئەگینا دەوترێت دینی ئیسلام لەهەموو زەمانێکدا لەگەڵ پێشکەوتنی ژیاندا بگونجێنرێت.

**دیالۆگ:** هاوکاتیش دەوتریّ هەندێ ئایەت و حەدیس هەیە کە بەباشی باسی ئافرەتی کردووە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەمەیان چاکە و پێویستە بایەخی زیاتریان پێ بدرێت. بۆئەوەی پیاوانی موسلمان لەژیانی ڕۆژانەیاندا رەفتاری باش بکەن لەگەڵ ژن و کچ و خو شك و دایکیاندا.

**دیالۆگ:** ژیان و کاری ئافرەتان چۆن دەبینیت لەسایەی دەسەلاتە ئیسلامییە سیاسییەکانەوە؟

**نەوشیروان مستەفا:** سەرەتا پێویستە ئاماژە بەو خاڵە بکەم، کە ئایین پەیوەندییەکی گیانییە لەنێوان ئینسان و خوداد و نابێت بکرێتە سیستمی حوکمرانی، ئیسلام وەك ئایین

پێویسته رێزی لێبگیرێت چونکه ئایینی ز ۆربەی خەڵکی ئێمەیە، بەڵام ئیسلام وەك سیاسەت و دەسەڵات مەترسیدارە، چونکه زۆربەی ئەو ئازادییانەی هەیە نایهێڵێت هەروەها هەرشێتك لەگەڵ بیر و بۆچون و ئەو قەناعەتی ئەو دەسەڵاتە نەیەتەوە گەر سەرچاوە گرتوو نەبێت لە ئایینەوە بە کوفر و ئیلحادی دادەنێت و فتوای کوشتنی دەدات، حزبە ئیسلامییەکان ئێستا دینیان کردووە بە وەسیلەیەك بۆ گەشتن بەدەسەڵات. لەرێگلی ترەوە ناتوانن بگەنە دەسەڵات دەیانەوەێ لەڕگەی ئیستغلال کردنەوە بگەنە دەسەڵات.

**دیالۆگ:** بەڵام دەوترێ ئیسلام دین و دەوڵەتە، هەرچۆن بیر و بارەر و خواپەرستییە، ئاواش سیاسەت و ئیدارەکردنی کۆمەڵگەیە بەڵگەشیان ئەوەیە هەر لەسەردەمی پێغەمبەر و دواتر خەلیفەکانی راشدییەوە، ئیسلام دەسەڵاتی سیاسی بووە و ئیدارەی کۆمەڵگەی کردووە.

**نەوشیروان مستەفا:** رەنگە بۆ سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەکانی راشیدی ئیسلام وەك سیستمی حوکمران گونجاوبێت، بەتایبەتی بۆ جێگەیەکی وەك نیمچە دورگەی عەرەب، بەڵام لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانیدا، ئەو سیستمی حوکمرانییەیان گۆڕی لەرۆژگارێکی وەك ئەمرۆدا ناکرێت، بەعەقڵیەتێکی چوارده قەرن لەمەوپێش حوکمرانی کۆمەڵگە بکرێت، ئەمە ئیشێکی مەنتقی نییە و قابیل جە جێبەجێکردن نییە.

**دیالۆگ:** بەڵام ئەوترێت ئێستا کۆمەڵێك حزب و رەوتی ئیسلامی سیاسی هەیە، کە هەوڵی جددی ئەدەن بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و ئامادەشن لەو پێناوەشدا هەموو شتێك بکەن. ئەمەش بەمافی رەوای خۆیان ئەزانن، بەڵام لای بەرەی عەلمانی ئەم حزب و هێزە سیاسییانە خەتەری گەورەیان هەیە بۆسەر کۆمەڵگە بەرێزت لەسەر ئەمە دەڵێیت چی؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ وایە، ئێستا ئەو حزب و رەوتە ئیسلامییانە هەن، وە هەوڵی گرتنە دەستی دەسەڵات دەدەن، ئەگەر بەوشێوەیەش خەتەرناکن لەسەر کۆمەڵگە بابەهەمووشمان کارێك بکەین ئەوانە نەگەنە دەسەڵات، وە بۆ خەڵکیشی رون بکەینەوە ئەگەر رۆژێك ئەوانە دەسەڵات بگرنە دەست، کوردستان وەك ئەفغانستا لێدەکەن.

**دیالۆگ:** ئەوترێ مەسەلەی تەکفیر کردن لە کوردستاندا بۆتە دیاردە، بەرێزت چۆن ئەم مەسەلەیە هەڵدەسەنگێنی؟

**نەوشیروان مستەفا:** جگە لەوەی هیچ کەس و هیچ گروپێك نوێنەری خوا نین لەسەر زەوی تابتوانن خەڵك تەکفیر بکەن، بەڵام سەرباری ئەوە خودی تەکفیر کردن کۆتایی هێنانە بە دایەلۆگی عەقڵ و مەنتیق و پەنابردنە بۆ ترس و تۆقاندن ، کە زۆر جار ئەگاتە فەتوادانی کوشتن ئەوەش تەنها لەسەر گومانێك کە دروست دەبێت لای ئەو گروپە ئیسلامییانە لەسەر کەسێك، کە بە پێوانە و تەسەوری ئەوان لەریزی بێبروا و بێدینەکاندایە، تەنها ئەمەش بەسە بۆ فتوادانی کوشتن. بۆیە پێویستە ڕێگە نەدرێت بەو گروپە ئیسلامییە توندرەوانەی کە بەزمانی هەرەشە و تۆقاندن قسەدەکەن و بە چەك و کوشتن رەفتار لەگەڵ خەڵك دەکەن، بەهیچ شێوەیەك بگەنە دەسەلاَت.

**دیالۆگ:** گەر بکرایە قسەیەکت بکردایە لەسەر ژیانی ژنان لە ئەفغانستان و ئێران.

**نەوشیروان مستەفا:** لەئێراندا راستە ژن حجابی بەسەردا سەپێنراوە، بەڵام ڕێگەی هەموو شتێکی پێدراوە، مافی دەنگدان و خۆ هەڵبژاردنی هەیە، ئەندام پەرلەمانە، دادوەرە، سەرنوسەری رۆژنامە و گۆڤارە، بەرێوەبەرە، . .. هتد . لە سعودیە ژنان کۆیلەن و لە زۆرماف بێبەشکراون، لە ئەفغانستان نەوەك ژن بەڵکو پیاویش وەکو ئینسان سەیر ناکرێت هیچ ماف و ئازادییەکی ئینسانانەی هاوچەرخ بەدیناکرێت، ئەفغانستان نەوەك هەر مەترسی هەیە بۆ ژنان بەڵکو خەتەرە بۆسەر مرۆڤایەتی.

**دیالۆگ: تەوەری دەیەم / ژنان – ئافرەتان لە دیدی مارکسیزم و ئەزمونە سۆسیالیزمەکاندا.**

**نەوشیروان مستەفا:** لە فکری مارکسیدا جیاوازی نێوان ژن و پیاو نییە، بەیەك چاو سەیری هەردووکیان دەکرێت، لە ئەزمونەکانی ولاَتە سۆسیالیستەکاندا بەکردوە یەکسانی ژن و پیاویان پیادە کردووە.

**دیالۆگ:** بەڵام ئەوتری لەسەردەمی(ستالین)دا لەیەکێتی سۆڤیەت ستەمی زۆرر لە ژنان کراوە.

**نەوشیروان مستەفا:** من ئەمەم نەبیستووە.

**دیالۆگ:** بەرێزت کۆمۆنیستەکانی کوردستانی خۆمان چۆن دەبینی؟

**نەوشیروان مستەفا:** کۆمۆنیستەکانی کوردستان لە چەند رێکخراوێکی جیاوازدان، لەسەر هەندێکیان ئاگادارییەکی ئەو تۆم نییە

**دیالۆگ:** جێی خۆیەتی لە بەڕێزت بپرسم تاچەند باوەڕت بە مارکسیزم ماوە؟

**نەوشیروان مستەفا:** من زۆر دەمێکە باوەڕم بە مارکسیزم نەماوە، بەلاّم خۆم هەر بە چەپ دەزانم، بەو مانایەی کە هەمیشە لەگەڵ هەژار و ڕەشوڕوتی میللەتەکەمدابم، لەگەڵ ئەو لایەنەدابم کە زوڵمی لێکراوە، هەوڵی بەردەوام بدەم بۆ نەهێشتنی چەوسانەوە و بەدیهێنانی عەدالەتی کۆمەلاّیەتی.

**دیالۆگ:** ئەوە دواجار ناچیتە خانە و بەرەی مارکسی و کۆمۆنیستەکانەوە؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ وایە دەچێتەوە ئەو بەرەیەوە، بەلاّم ئێستا من خۆم بەمارکسی نازانم.

**دیالۆگ:** ئەی کاتی خۆی؟

**نەوشیروان مستەفا:** زەمانێك مارکسییەکی تەمام عەیار بووم و سکرتێری ڕێکخراوێکی مارکسی بووم.

**دیالۆگ:** پێمباشە ئەم تەوەرەیە بە بە پرسیارێکی زۆر ئاسایی، بەخش کۆتایی پێبهێنین، مارکس کێ بوو؟

**نەوشیروان مستەفا:** مارکس ئەو فەیلەسوفە گەورەیە بوو کە دنیای گۆڕی. هەتا ئێستاش زۆربەی ئەو ئاڵوگۆڕانەی لە دنیادا دەبێت، بەتایبەت لەدنیای سەرمایەداریدا دەکرێ، فەزڵەکەی بۆ مارکس دەگەڕێتەوەو بەتایبەت، ڕەخساندنی هەلی کار، ضمانی کۆمەلاّیەتی، مافی دەنگدان. .... هتد.

**دیالۆگ: تەوەرەی پانزەیەم / ڕزگاری ئافرەتان لە نێوان بێدەنگی ژنان و هاواری پیاواندا.**

**نەوشیروان مستەفا:** پێموایە زۆربەی ئەو پیاوانەی کەلە ژیاندا هاتونەتە قسە تەنها بۆئەوەیە خۆیان لای ژنان خۆشەویست بکەن، ئەگینا زۆربەی زۆریان بە کردەوە لە دژی ژنانن، هەر بۆنمونە من بەسەرهاتێکی واقیعی خۆمانت بۆ باس دەکەم، کاتی خۆی لەناو زەنگ بوین، کۆمەڵێ برادەرمان هەبوو زۆر بازرگانیان بە قسەوە دەکرد، جارێك دانشتبوین گفتوگۆکرا لەسەر مافی ژنان، من پێم وتن باوەڕم بە مافی ژنان نییە !، هەموویان هەڵچون و وتیان چۆن ئەمە دەڵێیت، شتی وا نابێت، ساڵ هات و تێپەری دنیا ڕۆیشت و برایەوە، ڕۆژێکیان دەعوەت کرابووم لەماڵی برادەرێم لەهەولێر، زۆربەی ئەو برادەرانەی لێبوو کە دیفاعی لە ژنان دەکرد، ئێستا دوو ژنی هەیە، منیش ژنەکانیانم بانگکرد و پێموتن: پێشتر

به مێردەکانتانم وتبوو: من باوەرم بە مافی ژنان نییە، هەموویان هاتن بە گژما، ئەوە من ئێستا بە کردەووە بم ئیسپات کردن کێ باوەری بەمافی ژنانە و کێ باوەری پێ نییە ". بۆیە من پێموایە هەندێکی کەمی پیاوان نەبێت قسە و کردەوەیان وەکو یەکە، بەراستی دیفاع لە ژن دەکەن. ئەگینا زۆر بەیان هەر قسەیە و هیچی تر. پێشموانییە ژنان بێدەنگ بوون، کوا بێدەنگن؟

**دیالۆگ:** کەمترین رێژەی ژنان هاتونەتە قسە لەکاتێکدا پێویست بوو زۆرترین ژمارەیان نەك هەر قسەبکەن، بەڵکو بەکردەوەش کاریان بۆ رزگاری خۆیان بکردایە.

**نەوشیروان مستەفا:** لە هیچ زەمانێکدا هەموو خەڵك چالاك نابن، بەڵکو بەشێکی کەمی چالاك و ئیشکەرن، ئەوانی تر خەریکی ژیانی خۆیان دەبن، دواتر من دەپرسم بۆ ژنان وەك پێویست نایەنە قسە؟

**دیالۆگ:** یەمەم / کەمی هۆشیاری، دووەم / هەرەشەی پیاوان لە دژیاندا، سێیەم / ترس لە دروستکردنی تۆمەتی تۆمەت و ئەخلاقی بۆیان.

**نەوشیروان مستەفا:** جا ژنان دەیانەوێت رزگاریان بێت و قوربانی نەدەن؟ پێویستە ژنان ئەو راستییەباش بزانن ئەگەر بیانەوێ یەکسان بن لەگەڵ پیاواندا دەبێت قوربانی بدەن.

**دیالۆگ: تەوەرەی دوانزەیەم / ئافرەت و سێکس..... تابۆی تابۆکان، یان بنەمای ژیان.**

**نەوشیروان مستەفا:** سێکس پێویستییەکی ژیانی ئینسانە. پێویستە بار و زروفێکی گونجاو دروست بکەین، بۆئەوەی هەموو کەسێك کە تەمەنی گەشتە سەرو بیست ساڵ بتوانێ مومارەسەی ئەم هەقەی خۆی بکات، لەرێگای زەواجێکی یاساییەوە.

**دیالۆگ:** لە کۆمەڵگەدواکەوتوەکاندا لەوانەش کۆمەڵگەی ئێمە جنس حەساسیەتێکی زۆری هەیە، بەچاوێکی مەترسیدارەوە سەیر دەکرێت و رێگری زۆری بۆ دەکرێت، هۆی ئەمە چییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** ئەگەر رێگری و سنوردانان نەبێت، ئەوا بەرەڵایی جنسی دروست دەبێت.

**دیالۆگ:** بەرێزت پێتوایە گەر پەروەردە و فێرکردنی جنسی هەبێت، بەرەڵایی جنسی دروست دەبێت؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ.

**دیالۆگ:** لەزۆربەی ولاّتە پێشکەوتوەکانی دنیادا سێکس وەك بەشێك لە کاری ئاسایی و رۆتینی ژیانی ئینسان سەیر دەکرێت، لەبەرئەوەی لەوێ پەروەردە و فێرکردنی سێکس هەیە، خەلکەکەی نەوەك هەر سێکس بەلکو سێکی ئازادیش بە خەتەر نازانن، رەنگە بەبنەمای پێشکەوتنی ولاّتی خۆشیانی بزانن، هەر بۆنمونە سوید.

**نەوشیروان مستەفا:** من قەت حەزناکەم ولاّتەکەی من وەکو سویدی لێ بێت لەروی کۆمەلاّیەتییەوە.

**دیالۆگ:** بۆچی؟

**نەوشیروان مستەفا:** چونکە خەلکی سوید ئاواتەخوازن پێیان باشە بگەرێنەوە بۆ چەند سەدەیەك پێش ئێستا، لەم بوارەدا ئێستا ئێکە لەوان باشترین.

**دیالۆگ:** ئەگەر لەدید و بۆچون و تێروانینێکی واقعی و ئینسانی هاوچەرخەوە بەراوردێکی ئێمە و ئەوان بکرێت، ئەوا ئێمە چەند سەدەیەك لەدوای ئەوانەوەین، ئیتر نازانم ئێمە چۆن لەوان باشترو پێشکەوتووترین؟

**نەوشیروان مستەفا:** راستە لەچەند بوارێکدا ئێمە چەند قەرنێك لەدوای ئەوانەوەین، بەلاّم لەبواری پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکاندا بەتایبەتی پەیوەندی نێوان ئەندامانی ناو خێزان و هەروەها خێزانەکانی ناو یەك بنەمالّە، ئێمە زۆر لەوان باشتر و لەپێشترین، پەیوەندی کۆمەلاّیەتی لەوێ زۆر لاوازە، بەلکو دابراوە.

**دیالۆگ:** گەروابێت ئێستا ئەبێت خێزان لەوێ هەلّوەشابێتەوە، کۆمەلگەش لە هەلّوەشانەوەدا بێت.

**نەوشیروان مستەفا:** بەلێ تارادەیەك خێزان لەیەك هەلّوەشاوەتەوە و کۆمەلگەش وایە، هەر بۆیە دەیانەوێ سەرلەنوێ پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان بەهێز بکەنەوە، بۆئەوەی خێزان و کۆمەلگە لەو هەلّوەشاندنەوەیە رزگار بکەن.

**دیالۆگ:** سوید یەکێکە لەو ولاّتانەی رۆلّ و کاریگەری لەسەر دنیا هەیە. چۆن کۆمەلگەیەکی لەبەریەك هەلّوەشاوە ئەو رۆلّ و کاریگەرییەی دەبێت؟

**نەوشیروان مستەفا:** ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت خەوێکی گەنجانەیە، ئیحساسی کورێکی گەنجی وەك تۆیە، گەر تۆش بگەیتە چل سالّی قەت قبولّی جنسی ئازاد ناکەیت، حەقێکی

مەشروعی ئینسانە غەریزەی جنسی خۆی تێربکات، بەڵام لە چوارچێوەی ژن و مێردایەتی و خێزاندا، بەڵام لەدەرەوەی ئەمە شتێکی باش نییە.

**دیالۆگ:** مەسەلەی جنس هەر خەونی گەنجانەنییە.

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ هەر ئەوەیە، لەوە زیاتر نییە.

**دیالۆگ:** ئەگەر ئەو مەسەلەیە وابوایە، ئەوا دەبو هەر گەنجەکان باسیان لە جنس بکردایە، بەڵام لە واقیعدا هەر لەمنداڵ و هەرزەکارەکان و تا دەگاتە کامڵ و پیرەکانیش باسی جنس دەکەن.

**نەوشیروان مستەفا:** بڕواناکەم.

**دیالۆگ:** هەر بەبەلگەی ئەوەی جنسکردن بە زەبری پارە و دەسەلات، لەلایەن دەوڵەمەند و بەرپرسەکانەوە کە تەمەنی گەنجییان تێپەرانـدووە، بۆتە دیاردە لەم کۆمەلگەیەدا.

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ ئەوە هەیە، شتێکی نا ئاسایی و زۆر قێزەونە، گەندەڵی جنسییە.

**دیالۆگ:** بەڵام ئەوە واقیعە و هەیە.

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵام ئەمە قەبوڵ نییە، لەرووی یاسایی و کۆمەلایەتییەوە، ئەگەر کۆمەڵی ئێمەش لە حاڵەتێکی نائاسایی ئاوادا نەبوایە، ئەو جۆرەکەسانەش نەیانـدەتوانی ئیستغلالی جێگە و دەسەلاتی خۆیان بکەن.

**دیالۆگ:** ئێستا دەمانەوێت بە دیاریکراوی قسەی بەرێزت بزانین، لەسەر ئەو کەسانەی ئەم جۆرەکارانە دەکەن، لەناو یەکێتیدا بەتایبەتی هەندێك لە بەرپرسە دیارەکانی.

**نەوشیروان مستەفا:** ئاخر کاکە تۆ بۆ لەخۆڕایی خەڵك بۆ ئیتهام دەکەیت، ژ دەلیلێکت هەیە.

**دیالۆگ:** ئەم دیارە ئەوەندە زەق و دیار و ئاشکرایە، کە پێویستی بە بەلگە نییە، وات بۆتە شتێکی بەلگە نەویست، هەر کەسێکی ئەم کۆمەلگەیە بگریت، لە کەسێکی ئاسایی ناو بازار بۆ بەرپرسێکی گەورە، ئوە دەزانێت کە ئەم کارە کراوە و بەبەردەوامی دەکرێت، تا ئەو ئاستەی بۆتە دیاردە.

**نەوشیروان مستەفا:** کێ ناڵێت پروپاگەندەی دوژمن نییە.

**دیالۆگ:** ئەوە ئەگەرێکی بەهێزە، بەلآم پرو پاگەندە و بوختان بۆ ماوەیەکی کەم کاردەکات، دواتر لەبەردەم راستییەکاندا خۆی ناگرێت.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەوەی تۆ باسی دەکەیت منیش بیستوومە بەکارێکی زۆر خراپی دەزانم، هەر ئەمەش بۆتە یەکێك لەهۆکانی کەمبونەوەی جەماوەری یەکێتی، هەندێك لەو کارە چەوتانە کەلەلایەن بەرپرسانی یەکێتیەوە دەکرێت، لایەنەکانی تر سودی لێوەردەگرن و یەکێتی پێ لاواز دەکەن، دیاردەیەکی زۆر نادروستە.

**دیالۆگ:** سەبارەت بە زەواجی سیغە و میسار قسەی بەرێزت چییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** سیغەکە دەزانم، بەلآم میسارەکە چییە؟

**دیالۆگ:** میسارەکە زەواجێکە بەدزی ژنی ئەسلییەوە دەکرێت، زیاتر بۆ رۆژە نەوەك بۆ شەو.

**نەوشیروان مستەفا:** لەکوێ هەیە؟

**دیالۆگ:** لەناو سوننە مەزهەبدا، لە میسر و ولآتانی کەنداو.

**نەوشیروان مستەفا:** سەبارەت بەسیغەکە ئەوانەی کە بروایان پێی هەیە، پێیان وایە بەم کارەیان موشکیلەیەکی گەورەی جنسی حل دەکەن، رەئێکی تریش هەیە کەئەمە بە جۆرێك لە لەشفرۆشی دەزانێت، بەلآم لەشفرۆشییەکی ئایینی و یاساییە، وەکو چۆن لە ئەوروپا قەحبەخانە هەیە، ئەمان لە باتی قەحبەخانە ئەم رێگەیەیان هەڵبژاردووە، لەوێتی ئێمە نە قەحبەخانە هەیە و نە ئەم جۆرە لە زەواجیش لەبەرئەوە نازانم چی لەسەر بڵێم، هەر لە دورەوە بیستومە.

**دیالۆگ:** پێتباشە یان خراپ؟

**نەوشیروان مستەفا:** پێم خراپە.

**دیالۆگ:** ئێستا با بێینە سەر مەسەلەیەکی گرنگ، ئەویش مامەڵەکردنی دووفاقەیی کۆمەڵگەیە لەگەڵ خەڵکی لە مەسەلەی جنسدا، بۆ بەشێك لە خەڵکی ختوەن دەسەلآت و خاوەن پارە هەیە هەموو جۆرە جنسێك بکەن، لە چوارچێوەی خێزان و لە دەرەوەی خێزان وە لەبەرامبەریشدا هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەکیش نییە، بەلآم بۆ کور و کچی گەنج نەوەك هەر پەیوەندییەکی خۆشەویستی بەحەرام دادەنرێ، بەڵکو مافی سەیرکردنیشیان لێ قەدەغە کراوە.

**نەوشیروان مستەفا:** هیچ قەدەغە نییە، لەکوێ قەدەغەیە؟

**دیالۆگ:** تەنها بۆ یەك ڕۆژ بەڕێزت وەرە ناو بازار و شەقام و جێگە گشتییەکان ئەوسا بۆت دەردەکەوێت کە قەدەغەیە یان نا.

**نەوشیروان مستەفا:** هاتووم و بینیومە لە زانکۆ و دائیرەکان و لەسەر جادەکان و هەموو شوێنێکدا کوران و کچان سەیری یەکتر دەکەن و قسە بەیەکەوە دەکەن، کەی وەك ئەوەیە کە تۆ باسی دەکەیت دەڵێی لە کابوڵ دەژیت و باسی ئەوێم بۆ دەکەیت.

**دیالۆگ:** یەکەم – من باسی سلێمانی دەکەم، کە ێشکەوتووترین شاری کوردستانە، بەڵام پێکەنینی ئافرەت لە بازار و شەقامەکانیدا بە عەیب و عار دادەنرێ بەخاڵی لاواز و بێ شەخسیەتی ژنان دادەنرێ، دووەم – ئەوە سەیرکردن نییە، بەڵکو خێسە و داخکردنە دڵی یەکترە، ئەوە قسەکردن نییە، بەڵکو قسەی ڕەق و دڵشکان و هەست بریندار کردنە، کامەتا ئەو کور و کچەی سەیرکردنیان بۆیەکتر سەیرکردنێکی ئینسانانەیە و بۆ خۆشەویستی بێت، کامەتا قسەکردنیان بۆ دڵ و دەروون و هەستراگرتن و ڕێزگرتن بێت لەیەکتری، ئێستا بەحوکمی داب و نەریتی ئەم کۆمەڵگەیە کچ و کوڕ کراونەتە دژی یەکتر، هەریەکەیان ئەوی تر بەخەتەر دادەنێ لەسەر خۆی، کە نزیك بونەوەی لێی توشی کێشە و گرفتی دەکات.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەمە تەنها ڕەئی تۆیە من بروانا کەم وا بێت.

**دیالۆگ:** ئەتوانی جیا لەمن لە هەزارەها گەنجی تر بپرسی، بزانە هەمان ڕەئی منیان نابێت. بەمەرجێ بەراستی وەڵام بدەنەوە.

**نەوشیروان مستەفا:** بەقسەی تۆ بێت ئێستا هەموو کور و کچی ئەم کۆمەڵگە یە لە سەنگەردان دژی یەکتر.

**دیالۆگ:** بەڵێ لە سەنگەردان دژی یەکتر، بەڵام بەشێوەیەکی نهێنی نەوەك ئاشکرا، ڕەنگە کچ و کوری کەم خەبن توانیبێتیان هەلومەرجی دواکەوتوی ئەم کۆمەڵگەیە تێپەڕێنن و پەیوەندییەکی خۆشەویستی ببەستن، بەڵام ئەمانە دەگمەنن و ناتوانن بۆ گشت کۆمەڵگە حسابیان بۆ بکرێت.

**نەوشیروان مستەفا:** هۆی ئەمە چییە؟

**دیالۆگ:** نەبونی زەمینەی لەبار و گونجاو بۆ دروستکردنی پەیوەندی ئینسانانە.

**نەوشیروان مستەفا:** گەروایە کور و کچ بۆ ئەو زەمینەیە دروست ناکەن بۆ خۆیان؟

**دیالۆگ:** عورف و ئایین و دەسەڵات هەموو لە دژیانن.

**نەوشیروان مستەفا:** کور و کچیش با لە دژی هەموویاندا بن.

**دیالۆگ: تەوەرەی سیانزەهەم / ڕێکخراوەکانی ژنان – ئافرەتان – خوشکانی لەنێو کۆمیتەی حزبی و ئەرکی مێژوودا.**

**نەوشیروان مستەفا:** زۆر راستە، هەموو ڕێکخراوەکانی ژنان و ئافرەتان شوێنکەوتووی حزبەکانی خۆیانن، ئەمەش باشترین بەڵگەیە کە کێشەیەکی راستەقینە نییە، بەناوی کێشەی ژنان گەر هەبوایە، هەموویان لە یەك ڕێکخراودا کردەبونەوە.

**دیالۆگ:** بەڵام سیاسەت و ئەفکاری حز بەکانیان ڕێگەیان پێنادەن.

**نەوشیروان مستەفا:** جا ژنان بۆ مل ئەدەن بۆ ئەو سیاسەت و ئەفکارانە و ئەبنە پاشکۆی حزبەکان.

**دیالۆگ:** بەناچاری.

**نەوشیروان مستەفا:** بۆ ناچارییە، تۆ باس لە توانا و دەوری ژنان ناکەی؟ ئیتر بۆ ناچارییە؟

**دیالۆگ:** لەبەرئەوەی سەرچاوەی دەرامەتی داراییان حزبەکانە، لە ئێستاشدا هیچ کارێك ناکرێت گەر سەرچاوە یەکی ماددی لە پشتەوە نەبێت.

**نەوشیروان مستەفا:** جا ژنان بۆچی سەرچاوەی دەرامەت بۆخۆیان دابین ناکەن دور لە چاوەڕوانی دەستی پیاو؟

**دیالۆگ:** لەکوێ دابینی بکەن؟

**نەوشیروان مستەفا:** لەهەر کوێیەك بێت.

**دیالۆگ:** لە هەلو مەرجێکی وەك ئێستادا دابین ناکرێت، چونکە هەموو سەرچاوەکانی دەرامەت لەدەستی پیاودایە، پیاویش قایل نابێت، بە دەست بەردان لە بەشێکی ئەو سەرچاوانەی یان وازهێنان لەبەشێکی بۆ ژنان.

**نەوشیروان مستەفا:** کەواتە دەبێت وەك ئێستا چاو لەدەستی پیاوان بن، یان ئەوەتا خۆیان بسەپێنن و سەرچاوەی دەرامەت بۆخۆیان دابین بکەن و سەربەخۆیی خۆیان دابین بکەن.

**دیالۆگ:** پەیوەندی نێوان یەکێتی ژنانی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان چۆنە؟

**نەوشیروان مستەفا:** پەیوەندییەکی زۆر بەهێز نییە.

**دیالۆگ:** ئەکرێت بەرێزت جۆر و سروشتی ئەو پەیوەندییەمان بۆ رون بکەیتەوە.

**نەوشیروان مستەفا:** یەکێتی ژنان رێکخراوێکە بۆ دیفاع کردن لە ژنان و خزمەتکردنیان دروست بووە، یەکێتی نیشتمانی هاوکارییەتی لەم کارەدا، پشتگیری ماددی و مەعنەوی دەکات.

**دیالۆگ:** ئەو پشتگیرییە بێ مەرجە؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ.

**دیالۆگ:** ژنان ئازادە لە هەڵوێست و بڕیارەکانیدا؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ.

**دیالۆگ:** ئایا ئەو هەڵوێست و بڕیارانە لە چوارچ ێوەی سیاسەتی یەکێتیدا نییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ.

**دیالۆگ:** کەواتە یەکێتی ژنان ناتوانێت لە چوارچێوەی سیایەتی یەکێتی نیشتمانی دەربچێت.

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر ناتوانن، لەبەرئەوەی یەکێتین ناتوانن.

**دیالۆگ:** کەواتە دواجار یەکێتی ژنان جێبەجێکاری سیاسەتی یەکێتی نیشتمانییە.

**نەوشیروان مستەفا:** ئەتوانین بڵێین جێبەجێکەری بەشێکی سیاسەتی یەکێتی نیشتمانییە، بەتایبەتی لە مەسەلەی ژنان و پاراستنی مافەکانیاندا.

**دیالۆگ: تەوەرەی چواردەیەم / ئاشکراکردنی نهێنییە تایبەتییەکان لەنێوان ئازایەتی وتن و ترسی بێدەنگیدا.**

**١- بەرێزت چۆن خۆت دەبینیت؟**

**نەوشیروان مستەفا:** خۆم بە ئینسانێکی ئاسایی دەزانم، هەروەك هەموو هاوڵاتییەکی تری ئەم کۆمەڵگەیە، لە قۆناغێکی دیاریکراوی گەلەکەمدا فرسەتی ئەوەم بۆ رەخسا لە شۆڕشی گەلەکەمدا بەشدار بم، کەم تا زۆر دەوری تیا ببینم، رەنگە هەر لەبەرئەوە لە

خەڵکێکی ئاسایی یان کەسێکی ئاسایی تر ناسراوتربم، لەوە زیاتر هیچ شتێکی تر نییە، من خۆم نە بەسۆپەرمان دەزانم نە بە قارەمان.

**دیالۆگ:** لەگەڵ ئەوەی بەڕێزت بەرەسمی لەهیچ پۆستێکی حزبی و حوکومەیدا نیت، بەڵام خەڵکێك هەیە هیوایەکی زۆری بە بەڕێزت هەیە و تەسەوری کاری گەورەت لێدەکەن، ئەوە بۆ؟

**نەوشیروان مستەفا:** پێویستە لەوان بپرسیت بۆ؟ رەنگە تەفسیرەکەی لەلای خۆم ئەوە بێت: کە من نزیکەی ١٣ ساڵ لە شاخ بووم، ئەو زەمانە باشترین پەیوەندی هاورێیانەم هەبوو لەگەڵ هەریەك لە کادیر و پێشمەگە و خەڵکی دێهاتەکان و رێکخراوەکانی ناوشاریش قەت من بە گیانی خۆبەزلزانی مامەڵەم لەگەڵ نەکردوون، لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵیان بووم، هەمیشە هاورێی نزیکی هەموویانبوم، چەند جارێکیش کەوتوینە وەزعی خەتەرەوە من شەرەفی ئەوەم پێبرابوو سەرلەنوێ هێزی پێشمەرگە و رێکخستنەکانی ناوشارم رێکخستبۆوە.

**دیالۆگ:** تەنها لەبەرئەو هۆیانەبوو کە باستکرد؟ هیچ هەهۆیەکی تر نییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر هیچ هۆیەکی تر نییە، نە جوانم، نەدەنگم خۆشە، نە یاریزانێکی باشم.

**٢- زەواجت کردووە؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ لەبەرئەوەی پێویستییەکی ژیانە.

**دیالۆگ:** بە خۆشەویستی بوو؟

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر.

**دیالۆگ:** ئەی بەچی بوو؟

**نەوشیروان مستەفا:** **بەرەزامەندی و ئارەزووی هەردوولامان؟**

**دیالۆگ:** چەند ساڵە ژنت هێناوە؟

**نەوشیروان مستەفا:** زیاتر لە ١٥ ساڵە، بەڵام نیوەی زیاتری ئەو ماوەیە بەیەکەوە نەبووین.

**دیالۆگ:** لەماوەی زیاتر لەو ١٥ ساڵەدا شەر و ئاژاوە رویداوە لە نێوانتاندا؟

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر !. جار و بار دەمەقاڵەمان دەبوو، بەڵام قەت روی نەداوە شەو و رۆژێك بەیەكەوە قسەمان نەبوبێت.

**دیالۆگ:** قەت بیرت نەكردۆتەوە یان بیرت لەوە نەكردۆتەوە جیاببیتەوە لێی؟

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر.

**دیالۆگ:** بەرستەیەك، چۆن هەڵوێستی لەگەڵتا لە شاخ دەنرخێنیت؟

**نەوشیروان مستەفا:** نمونەی ژنێكی بەوەفا بوو.

**٣- زەواجی ئایینی شەرعی، یان مەدەنی یاسایت پێباشە؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** مەدەنی یاسایی، چونكە ئەرك و مافەكانیان دیاریدەكات.

**٤- سەیری كەناڵەكانی ئیغرا و سێكست كردووە، پێتباشە؟**

**نەوشیروان مستەفا:** چەند جارێك سەیرم كردووە بۆئەوەی بزانم بەرنامەكانی چۆنە، زۆر خراپە و زیانبەخشە، رەوشتی گەنجی وڵاتەكەمان تێكدەدات، لەبەرئەوە ئەو شتانە تەنها لە قەحبەخانەكاندا هەیە، ئەگینا لە ناو خێزانە ئەو روپییەكانیشدا نییە.

**٥- هاورێیەتی كور و كچت پێباشە؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ، چونكە هەردوكیان ئینسانن و پێویستییان پێیەتی.

**٦- بروات بە ئازادی جنسی هەیە؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر، چونكە دەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی خێزان.

**٧- بروات بە یاسای " گی " هەیە؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر، تەواو دژیم، چونكە كارێكی سروشتی نییە،

**٨- كێ یان چیت خۆشدەوێت؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** هەموو كەسێكم خۆشدەوێت.

**دیالۆگ:** بە خراپەكانیشەوە؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ.

**دیالۆگ:** بۆچی؟

**نەوشیروان مستەفا:** چونكە خەڵكی شاری سلێمانی بە باش و خراپیشییەوە بە هاوشاری خرم دەزانم، هەروەها كورد بەباش و خراپییەوە بە نەتەوەی خۆمی دەزانم.

**٩- رقت لە كێ یان چییە؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** رقم لە دوژمنی میللەتەکەمە، لەبەرئەوەی ئازاری میللەتەکەم دەدات.

**١٠- ژیان ژانە یان تێرامانە؟ یان چی ترە؟**

**نەوشیروان مستەفا:** ژیان ژیانە.

**١١- سێکس چییە؟ مافە یان تاوان؟**

**نەوشیروان مستەفا:** سێکس خۆشترین شتی ژیانە، ئەگەر بە رێگای دروست بێت.

**١٢- لە مەرگ دەترسیت؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** زیاتر لە ١٥ ساڵە لە مەرگ ناترسم، چونکە تەمەنم گەشتۆتە ئاستێك ترسم لە مەرگ شکاوە، بەڵام پێشتر چەند جارێك هەستم بەترس کردووە لەبەرامبەرمەرگدا.

**١٣- سەفەری دەرەوەت کردووە؟ بۆچی؟**

**نەوشیروان مستەفا:** زۆرم سەفەرکردووە، ژمارەیەکی زۆرم لە پایتەختەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست، ئەوروپا، ئەمریکا بینیوە، هەندێ لەسەفرەکانم بۆ گەشت و گەران بوو، هەندێکیشی بۆ کاری سیاسی.

**دیالۆگ:** چەند زمان دەزانیت؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەباشی تەنها کوردی دەزانم ئەویش کوردی سلێمانی.

**دیالۆگ:** ئەی ئەو زمانانەی تر کەدەتوانی لێی تێبگەیت و قسەی پێ بکەیت؟

**نەوشیروان مستەفا:** عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی ئەڵمانی.

**دیالۆگ:** بەرێزن چ ئاستێکی خوێندنت تەواو کردووە؟

**نەوشیروان مستەفا:** ئەگەر پێت بڵێم تەنها چەند مانگێکم مابوو شەهادەی دکتۆرا لە فەلسەفەدا وەرگرم، رەنگە باوەرنەکەیت.

**دیالۆگ:** بۆچە وەرت نەگرت؟

**نەوشیروان مستەفا:** لەبەرئەوەی هاتمەوە بۆ کوردستان و یەکێتیمان دروستکرد و شۆرشی نوێی گەلەکەمان هەڵگیرسانەوە.

**دیالۆگ:** کەواتە بەرێزت شۆرشت پێ گرنگتر بوو لەشەهادەی دکتۆرا؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەڵێ.

**دیالۆگ:** بەرێزت شەهادە چۆن دەبینی؟

**نەوشیروان مستەفا:** بەهیچی نابینم.

**دیالۆگ:** ئەوە بەکەم سەیرکردنی شەهادەنییە؟

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر.

**دیالۆگ:** ئەی چ شتێك گرنگە بۆ ئینسان؟

**نەوشیروان مستەفا:** زمان زانین لەهەموو شتێك گرنگترە بۆ ئینسان، بەتایبەت زمانە زیندووەکانی جیهان. چونکە بەهۆیانەوە دەتوایت، لە رۆشنبیری و شارستانیەتی جیهان تێبگەیت.

**١٤- کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانی جاران و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی ئێستا چی دەگەیەنن لای بەرێزت؟**

**نەوشیروان مستەفا:** دوو رێکخراو بوون هەموو ژیانم پێشکەش کردن، ئەوەی بۆ کۆمەڵەی جارانم کرد بۆ یەکێتی ئێستای دەکەم، بۆ هیچ شتێکی ترم نەکردووە لە ژیانمدا.

**دیالۆگ:** بۆچی؟

**نەوشیروان مستەفا:** چونکە پیچموایە پەیامێکی پیرۆزیان پێیە بۆ میللەتەکەم.

**دیالۆگ: تەوەرەی پانزەیەم / بابەتی ئازاد.**

**نەوشیروان مستەفا:** پێمباشە لەم تەوەرەیەدا سەرنجی ژنان بۆ چەند خاڵێکی گرنگ راکێشم، کە ئێستا لەهەموو شتێك گرنگترە بۆ ژنان:

**١- سەربەخۆیی ئابوری:** پێویستە هەموو ژنێك سەرچاوەیەکی دەرامەتی هەمیشەیی هەبێت بۆ بژێوی و پێداویستییەکانی خۆی بۆئەوەی چاوی لە دەستی کەس نەبێت، خێر و سەدەقەی پێ بکات.

**٢- جێگەیەك بۆ نیشتەجێبوون:** ئیتر شوققەبێت یان ماڵ یان هەرشتێکی تر، گرنگ جێگەیەکی تایبەتی هەبێت بۆخۆی هەرکاتێك ویستی جیا ببێتەوە لەماڵی باوکی یان مێردی یان کەسوکاری، نەکەوێتە سەرجادە و کۆڵانەکان.

**٣- پاسایەك بۆ پاراستنی ژنان:** یاسایەك بۆ پاراستنی ژنان هەبێت، بۆئەوەی کەس نەتوانێت سوکایەتی و هەرەشەیان لێ بکات و دەستدرێژی بکاتە سەریان و تیرۆریان بکات.

هەرکاتێك ئەم خالآنە بەکردەوە جێبەجێکران، ئەوسا زۆربەی ئەو ستەم و چەوسانەوانەی ئێستا لەسەر ژنانە ئەسڵەن هیچ مانا و بونێکی نامێنێت. بۆیە داواکارم لە ژنان و ئەو کەسانەی خۆیان بە لایەنگری مافەکانی ژنان دەزانن هەوڵی جددی بدەن و کاری کردەوەیی بکەن، بۆ جێبەجێکردنی ئەو خالآنە، ئەمە ز ۆر باشترە بۆ ژنان وەك لە قسە و دروشم و دروستکدرنی کێشە بۆیان لە هیچی نەبوو.

**دیالۆگ:** کەواتە دوای ئەم هەموو گفتوگۆ و دیالۆگە هێشتا قەناعەتت نییە بەکێەی ژنان؟

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر.

**دیالۆك:** بەلآم گەر وابێت ئەمە مەرگەساتە.

**نەوشیروان مستەفا:** بۆچی مەرگەساتە؟

**دیالۆك: نەوەك هەر مەرگەساتە، بەڵکو زۆر خەتەریشە.**

**نەوشیروان مستەفا:** ئەمە رەئیمنە ئیتر مەرگەساتە، یان خەتەرە، گرنگ نییە.

**دیالۆك:** چۆن گرنگ نییە، بەرێزت ناترسیت لەوەی ئەم رەئیەت تەسەور و کاردانەوەی خراپ دروست بکات، لە دژت لەلایەن ژنان و پیاوانی یەکسانیخوازەوە، بەگشتی و ژنانی یەکێتی بەتایبەتی.

**نەوشیروان مستەفا:** نەخێر، لەبەرئەوەی من بەهیوانیم جارێکی تر خۆم هەڵبژێرمەوە گەر خۆشم هەڵبژارد با دەنگم پێنەدەن.

**دیالۆك:** مەسەلەکە هەر حزبایەتی و هەڵنەبژاردن و دەنگ نەویستن نییە، بەڵکو لایەنێکی زۆر گرنگتری هەیە ئەویش مێژووە، بەرێزت لەوەناترسیت وەك کەسایەتییەکی سیاسی ناسراوی ئەم میللەتە، مێژوو ئەم هەڵوێستەت وەك هەڵوێستێکی دژ بەژنان بۆ حساب بکات.

**نەوشیروان مستەفا:** ئاخر خۆ من دژی ژنان نیم.

**دیالۆك:** بەلآم بەوتنی ئەو قسەیە کە بروات بە کێشەی ژنان نییە، ئەو تەسەورە دروست دەبێت لەسەر یەرێزت کە دی ژنانیت.

**نەوشیروان مستەفا:** من سەرەتا بۆم باسکردیت کە ئەو کێشەیەی تۆ دەیبینیت من نایبینم، من و تۆ دوو بۆچونی جیاوازمان هەیە لەو بابەتەدا.

**دیالۆك:** بەڵام.ئێستا لە کۆمەڵگەدا رەئی من و بەرەی من زۆرتر و بەهێزترە لە بەرە و رەئی بەرێزت.

**نەوشیروان مستەفا:** جا زۆر باشە مادام بەرە و رەئی تۆ زیاترە هیوادارم سەرکەوتووبن.

**دیالۆك:** ئێمەش هیوامان وایە بەرێزت بێیتە بەرەی ئێمەوە , بەرەی بزوتنەوەی یەکسانیخوازی ژن و پیاو.

**نەوشیروان مستەفا:** جا من لە دەرەوەی ئەم بەرەیەدانیم، من بروام لەیەسانی ژن و پیاو هەیە، بەڵام بروام بەکێشەی ژنان نییە.

**دیالۆك:** بەرێزت ئەم هەنگاوەی سەنتەری دیالۆگ بۆ دیالۆگکردن لەسە کێشە و بزوتنەوەی ژنان – ئافرەتان چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

**نەوشیروان مستەفا:** پێموایە بۆ خۆ سەرقاڵکردنە و هیچ تەئسیرێکی نابێت لەسەر ئازادکردنی ژنان.

**دیالۆك:** دوا وتەی بەرێزت؟

**نەوشیروان مستەفا:** سوپاست دەکەم و هیوادارم سەنتەرەکەتان سەرکەوتوو بێت.

**دیالۆك:** دوا وشەی بەرێزت؟

**نەوشیروان مستەفا:** هیچ !

## ژیاننامە

***- نەوشیروان مستەفا أمین**

***- ساڵی ١٩٤٤ لەسلێمانی لەدایك بووە.**

***- ژنی هێناوە و خاوەنی ٣ منداڵە.**

***- لەساڵی ١٩٦٧ لە زانکۆی بەغدا بەشی زانستە سیاسییەکانی تەواو کردووە.**

***- دواتر درێژەی بە خوێندن داوە لە زانستە سیاسییەکان و پەیوەندییە دەولییەکان لە زانکۆی ڤییەننا لە ساڵانی ١٩٧٥ – ١٩٧٦**

***- یەکێکە لە دامەزرێنەرانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەساڵی ١٩٧٥ دا.**

## شەڕی گلادیتۆرەکان

لڤین هێمن باقر

نەوشیروان مستەفا و بەرهەم سالح بەسەرمایەی رەمزی خۆیانەوە شەری بردنەوەی سلێمانی دەکەن

یەکێك لە دیارترین سیماکانی ئەم هەلبژاردنە، ڕووبەڕووبونەوەی نەوشیروان مستەفاو بەرهەم صالحە. لەسلێمانی گرەوەی گەوەرە لە نێوان لیستی کوردستانی لیستی گۆڕاندایە، بەرهەم سالح و نەوشیروان مستەفا نوێنەرایەتی ئەم گرەوە دەکەن.

ئێستا ئەوان لە دوو گلادیتۆر دەچن کە لە مەیدانی جەنگدا ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. ئەم گرەوە لەگەڵ ئەوەی گرەوێکە لە سەر سلێمانی، لە هەمان کاتیشدا گرەوە لەسەر کەسێتیی خۆیان. چونکە هەریەکە لەم دووکەسایەتییە، بەهەموو سەرمایە ڕەمزیەکانی خۆیانەوە ڕوو بەڕووی یەکتر بونەتەوە.

نەوشیروان مستەفا وەك چۆن گوزارشت بووەلە ڕۆحی سلێمانی لە ناو یەکێتی نیشتیمانیدا، گوزاریشتیش بووە لەبەشێکی گەورەی یەکێتی. هەربۆیە ڕووبەڕووبوونەوەی نەوشیروان مستەفا لەگەڵ باڵی تالەبانیدا، یەکێکە لە قورسترین ئەزمونەکان کەیەکێتی پێدا تێپەڕ دەبێت.ئەویش بەهۆی ئەو تایبەت مەندییانەوە کە لە کەسێتی نەوشیروان مستەفادا هەن.

یەکێتی وپارتی بیریان لە وە کردەوە، کە بەهیزترین کاندیدیان ڕووبەڕووی ئەم دیاردەیە ببنەوە کە پێ ی دەوترێ نەوشیروان. بۆ ئەم مەبەستەش دەستیان بۆ داشە هارەکەیان بردوو لە بەغداوە بەرهەم سالحیان هێنایەوە بۆ سلێمانی سەرۆکایەتی هەڵمەتی هەلبژاردنیان پێ سپارد.

بەرهەم سالح تاکە بەر پرسی یەکێتی بوو، کە دەیتوانی لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا ڕووبەڕووی ململانێکەرە بە هێزکە ببێتەوە. چونکە ئیدی خەڵکی سلێمانی بێزار بوون لەو دەمو چاوانەی دیکەی مەکتەبی سیاسی، کە بۆ خۆیان سەرچاوەی بەشێکی زۆری ڕق وتوڕەیی خەڵك بوون. هەرچەندە بەرهەم ساڵح تا ئێستا لەلایەن پارتییەوە بەڵێنی تەواوەتی دەست نەکەوتوە بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی حکومەت، بەڵام لە ماوەی

هەڵمەتی هەڵبژاردندا بە شێوەیەکی زۆر ڕکخراو لەسنوری سەنتەری پارێزگاری سلێمانی هەڵمەتەکەی دەستپێکردو بەبێ ماندو بوون زیاتر لە(٣٠) کۆبوونەوەی جەماوەری ڕکخست بەدرێژایی هەڵمەتەکەش، چووە ناو جەماوەری سلێمانییەوە. لەولاشەوە نەوشیروان مستەفا وردە وردە خەریکی فرِدانی کارتەکانێتی و هەر ڕۆژە بۆمبێکی چێنراو لەناوجەستەی یەکێتیدا دەتەقێنێتەوە.

بەدیویکی دیکەدا، شەڕی نێوان ئەم دووگلادیتۆرە جیاواز لە خەلاتە ئاشکراکەی(بردنەوەی هەڵبژاردنە،) بۆ بەرهەم ساڵح شەڕێکی قورسیشە لەپێناوی مسۆگەر کردنی پۆستی سەرۆکی حکومەت، کە سالانێکە خەونی پێوە دەبینێت وپۆستە سیادییە کەشی لە بەغدا، زیاتر وەکو نەفیکردنی تەماشا دەکات. بەرهەم ساڵح چاوی لەئایندەی سیاسی خۆیەتی لە کوردستان وزۆر بە وریاییشەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم دۆسیەیەدا دەکات.

بۆنەوشیروان مستەفاش ئەم شەڕە شەڕی بەرهەم ساڵح نی یە، بەلکو شەڕی بەهێزترین گلادیتۆری گۆڕەپانەکەیە، کە ئەویش تاڵەبانی یە. ئەگەر نەوشیروان مستەفا بتوانێت لەم حەلبەی هەڵبژاردنەدا، بەرهەم ساڵح بدات بە زەویدا، ئەوە مانای زاڵبونە بەسەر شادا. بەلام بەرهەم ساڵح هەر بەتەنها گلادیتۆرێکی سادە نی یە لە پێناوی دەست خۆشیدا شەڕ بۆ شاکە بکات، بەڵکو ئەو چاوی لەوەیە کە بەهۆی سەرکەوتنیەوە لەم شەڕەدا پێگەی خۆی لەناو حیزب وحکومەتدا بەهێز بکات ودوا جاریشتاجی شاهانە لەسەر بنێت لەم هەڵبژاردنەدا هەردوو گلادیتۆرەکە کەسێتی مەعنەوی خۆیان وەکو یەکێك لەسەرەکیترین ئامێرەکانی ململانێ وشەڕ بەکار دەهێنین. بەو پێیەی هەردوکیان خاوەنی چەندین سیفەتی بەهێزو کاریگەرن. ئەو تایبەتمەندییانەش کاریگەرییان لەسەر یەکلاکردنەوەی ململانێکە دەبێت.

نەوشیروان مستەفا

نەوشیروان مستەفا لەساڵی(١٩٤٤) لە دایك بووە، لەتەمەنی گەنجیدا ئەندامێکی چالاکی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە. کاتێك لە ساڵی(١٩٦٤)جیا بونەوەی نێوان باڵی جەلالی ومەلالی ڕویدائەو باڵی جەلالی هەڵبژارد.

مستەفا لەڕوی ئایدۆلۆژییەوە لە ژێر کاریگەری ئیبراهیم ئەحمەدو تاڵەبانیدا بەرەو بیری چەپی ماویزم ڕۆیشتووە. دوواتریش لەساڵی(١٩٦٨) کە گۆڤاری(ڕزگاری) ی دەرکردووە، ئەم گۆڤارە گووزارشتی لە چەکەرە کردنی بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی بەمەیلی چەپ کردووە

وهەر ئەمەش بۆتە هەوێنی دروست بوونی یەکەم شانەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە ساڵی(١٩٧٠)دا

دوای بەیاننامەی(١١)ی ئازای(١٩٧٠)مەلا مستەفا لەگەڵ حکومەتی عێراقدا ڕێکەوت. بەو هۆیەشەوە باڵی جەلالی هەڵوەشانەوەی خۆیان ڕاگەیاند. ئیترنەوشیروان مستەفا بەرەو هاندەران بەرێ کەوت و لە نەمسا گیرسایەوە. ئەو لە نەمسا خوێندنی ماستەری لە بواری سیاسەتدا تەواو کردو سەرقاڵی دەست پێ کردنی دکتۆرا بوو، کاتێک تاڵەبانی لە ساڵی(١٩٧٥)و دوای هەرەسی شۆڕشی مەلا مستەفا، پێشنیاری دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانی خستە بەردەستی. نەوشیروان مستەفا بەبێ گوێدان بە خوێندنی دکتۆرا بیرۆکەکەی تاڵەبانی قبوڵ کردوو بووە یەکێك لە دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.

لەو دەمەدا کەنەوشیروان مستەفا وڵاتی بەجێ هێشتووە، کۆمەڵەی ڕەنجدەران ڕێکخستنێکی نهێنی دوور لە کاریگەریی ئەوی دروست کردبوو. دوای ئەوەی کە بەشێکی زۆری سەرکردەکانی گیران وئیعدام کران، سەرکردایەتی ئەم هێزە نوێ یە کەوتبوە دەستی ئارام، کە سالار عەزیزو مەلا بەختیار دوولە دیارترین سەرکردەکان بوون لە گەڵیدا. بەپێی گێڕانەوەکانی خۆی، نەوشیروان مستەفا دوای ئەو سەفەرەی بۆ ئەوروپا لە سیستمی سۆسیالستی دلگرمێ دەبێت و وردە وردە باوەڕی بە ئایدۆلۆژیای چەپ لاواز دەبێت.

کاتێکیش لە ساڵی(١٩٧٧)دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و لە چیای قەندیل نیشتە جێ دەبێت، لەبەر ئەوەی ئارام ڕازی نابێت ڕێکخستنەکانی خۆی تەسلیمی تاڵەبانی و یەکێتی بکات، ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە و لەم سەرو بەندەشدا هێندەی پێناچێت، کە ئارام لەبەری قەرەداغ دەکەوێتە کەمینی جاشاوە دەکوژرێت.

دوای کوژرانی ئارام، سەرکردە مەیدانییەکان ئەو کاتی کۆمەڵە لەنێوخۆیاندا ڕێك ناکەون بۆ دەست نیشانکردنی سکرتێرێکی نوێ. ئیدی هەموان ڕازی دەبن کە نەوشیروان مستەفا وەکو یەکەم بزوێنەری بیری چەپ بکەنە سەرۆکی ڕێکخراوەکەیان. ئەو کاتەی کە بووە سەرۆکی کۆمەڵەی ڕەنجدەران، وەکو خۆی دەڵێت لەناخەوە باوەڕی بەچەپ نەمابوو، تەنها وەك ئایدۆلۆژیایەك سەیری دەکرد، کە دەتوانێت لە ڕێگەیەکەوە قەزیەیەکی نەتەوەی لەپەنادا بکات. نەوشیروان مستەفا جگە لە لێهاتویی خۆی، بەهۆی ڕێکخستنی فراوانی کۆمەڵەوە، کەبەشی زۆری یەکێتی پێك دە هینا، لە ماوەیەکی کەمدا وەکو سەرۆکی یەکەمی

کۆمەڵەو سەرۆکی فیعلی و مەیدانی یەکێتی دەرکەوت. بە تایبەت کە تاڵەبانی لەو کاتدا لەدەرەوەی وڵات بوو. لەو کاتەدا کەئەو سەرۆکایەتی کۆمەڵەی دەرکرد، لەنا وریکخستنەکانی کۆمەڵەدا چەند خەتێکی جیاوازی فیکری، کەلە ڕاستیداڕێکخستنی سیاسی بوون و بنەمای کارەکەیان بریتی بوو لە دۆزینەوەی پێگەی بەهێز بەناوی فیکروە دەرکەوت. ئەمە سەری کێشا بۆ دروست بوونی ڕێکخراوێکی دیکە لە ناو کۆمەڵەدا بە ناوی(ئاڵای شۆڕش)ەوە بەسەرۆکایەتی مەلا بەختیارو سالار عەزیز، کە بنەمای کارەکەیان ڕەفز کردنی سەرکردایەتی نوێ ی کۆمەڵە بوو، لەلایەن نەوشیروان مستەفاو فەرەیدون عەبدوالقادرەوە. نەوشیروان مستەفا بە ڕاسپاردەی تاڵەبانی زۆر بە توندی ڕووبەڕووی ئەم ڕێکخراوە تازەیە بووەو سەرکردەکەیانی بۆماوەی شەش ساڵ لەزینداندا توند کردو تۆمەتی خیانەتی خستە پاڵی.

نەوشیروان مستەفا لە ساڵی(١٩٩١)لە کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیدا کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی هەڵوەشاندەوەو ڕێکخستنەکانی تێکەڵ بە یەکێتی کرد. وەك خۆی ئاماژەی پێ دەکات، لە ساڵی(١٩٧٦) هەتا ساڵی(١٩٩١) ئەو سەرکردەی فیعلی و مەیدانی یەکێتی بووەو بەرپرسیارێتیی هەموو سەرکەوتن و شکستەکانی لە ئەستۆ دەگرێت. بەڵام لە دوای ڕاپەڕینی(١٩٩١)ەوە لە هیچ جەولەیەکی شەڕی ناوخۆ خۆی بەرپرسیار نازانێت و ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو هەر لە کوردستان نەبووە. نەوشیروان مستەفا کەسایەتیەکی بەهێزی هەیەو چەند سیفەتێکی بە هێزی تیدایە کەسەرنجی هەوا دارانی ڕاکێشاوە، لەوانە کەسێکی ڕاشکاو و قسە لە ڕووە، بە جۆرێك هەندێك جار ڕووشکێنیشە. حەزی بە موجەلە کردن و ماستاو نی یە، سیفەتی هەرە بەهێزی ئەوەیە کە دەست پاك و داوێن پاکە. بەڵام کەسێکە ڕەق و وشکە، تەنانەت لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆشیدا.

نەوشیروان مستەفا کەسێکی توندەو حەزیشی بە موجازەفەیە. باگراوندێکی مێژوویی و ڕۆشنبیری گەورەی هەیە. زمانزان و کوردی زانێکی بە توانایەو نوسەرێکی بەهێزەو لە هەربوارێکدا نوسیبێتی، بەهای ئەکادیمیی خۆی هەیە. لەوانەیە کە رقی لە شیعرەو لەگەڵ شاعیرەکان خۆشی نایەت.

کەسێکی سادەو ساکارە زۆربەی جار بە شەڕواڵ و کراسێك یان قاتێکی پێشمەرگانە وە دەردەکەوێت و جوتێك کالە یان پێڵاوی لە پێدایە. هەرچەندە کەسێکی دنیا دیدەیەو بەشی زۆری وڵاتانی دیوە، بەڵام زۆر بەکەمی بایەخ بە ئەتەکێت دەدات و جگەرە خۆرێکی

پلە یەکیشە. نەوشیروان مستەفا بەوە ناسراوە کەسێکی دڵ ڕەقە لە ململانێدا و چەندین ڕوداوی کوشتنی دەخرێتە پاڵ، وەکو ڕوداوی پشت ئێشان و کوشتنی وریاو کوشتنی کۆمۆنیستەکانی سلێمانی. خاڵی بەهێزی ئەوەیە کە سەرکردەیەکی کاریزمییەو هەموو سیفەتێکی سەرکردەی کاریزمی تێدایە. نەوشیروان مستەفا بەبێ ئەوەی پارە ببەخشێت، تەنانەت بێ ئەوەی بەرژەوەندی ئەوانەش بپارێزێت کە لەگەڵیدان، خەڵکێکی زۆر باوەڕیان پێیەتی و دوای دەکەون تەنانەت ئامادەشن لە پێناویدا خۆیان بە کوشت بدەن. بەتایبەت ئەوانەی سالأنێك لە ناو پێشمەرگەو حیزبدا لەگەڵیان ژیاون. وەك وچۆن لەناو گەنجاندا کەسێکی کاریگەرو سەرنج ڕاکێشە، بەهەمان شێوەش لەناو پێشمەرگەدا کەسێکی کاریگەرو سەرنج ڕاکێشەو بەشی زۆری ئەو پێشمەرگانەی کە لەگەڵیدان، تەنها لەبەر خودی کەسێتی ئەو، پشتگیری گۆڕان دەکەن و ئامادەیشن لەگەڵیدا بچنە ناو ئاگرەوە. نەوشیروان مستەفا زیاتر گرنگی بەوە دەدات، کە ئەوەی لە مێشکیدایە بەسەر کۆمەڵگەدا جێبەجێی بکات. زۆر بەکەمی چاوی لەوەیە ئایندەی سیاسی خۆی بپارێزێت. ڕاستییەکەی ئەو لە پێناوی ئەو بیرۆکەیەی کە هەیەتی.وازی لە بەرزترین پۆستی حیزبی هێناو دەسەڵات وپارەی زۆرو زەوەندەی حیزب و حکومەتیشی ڕەتکردەوە، کە بێگومان ئەگەر بیویستایە، دەیتوانی جگە لە جێگەی تاڵەبانی، هەموو جێگەیەك هەڵبژێرێت خاوەنی هەموو دەسەڵاتێك بێت کە خۆی حەزی لێ بکات. بەڵام خاڵی لاوازی کەسێتیی نەوشیروان مستەفا، ئەوەیە کەزۆر جار موجازەفەی سیاسی گەورە دەکات و لەو موجازەفەکردنانەشدا سەرکەوتوو نابێت. بەواتایەکی دیکە، لە زۆر قۆناغی سیاسی هەستیارداخەملأندنە سیاسیەکانی ڕاست دەرناچن. هەربەو هۆیەشەوە گەلێگ جار خەون وپرۆژەکانی شکستیان هێناوە.

بۆ نمونە: لە ساڵی(١٩٨٦)دا، بە بیرۆکەی ئەو، پاسداری ئێرانی بەچاوساغی پێشمەرگە هێنرایە سەر کەرکوك و بیرە نەوتەکان کەرکوکی تەقاندەوە، بەو ئامانجەی حکومەتی عێراق ناچار بە موفاوەزات بکات. بەڵام ئەم ڕووداوە ئەنفالی بەدوادا هات. لەساڵی(١٩٨٨) لە کاتی پەلاماردانی سەرکردایەتیدا لە سەرگەڵوو، ئەم جارەش بە بیرۆکەی ئەو، ئێران پەلاماری هەڵەبجەی دا، بەو ئامانجەی فشار لە سەرکردایەتی کەم بێتەوە. لە ساڵی(١٩٩١)کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی هەڵوەشاندەوە، بەو ئامانجەی کە خۆی ببێتە سکرتێری تەواوی یەکێتی. لەم بیرۆکەیەشدا سەرکەوتوو نەبوو. لەساڵی(٢٠٠٥) پێشنیاری هەڵبژاردنی مەڵبەندەکانی کرد، بەو ئامانجەی باڵەکەی زۆرینەی مەڵبەندەکانی بباتەوە. لەو

هەڵبژاردنەشدا شکستی هێنا. ئێستا هاتنە دەرەوەی لەیەکێتی و دروست کردنی لیستی گۆڕان و جیاکردنەوەی یەکێتی بۆ دووباڵ(باڵی ڕیفۆم و خەتی گشتی)، دوایەمین پڕۆژەی سیاسی نەوشیروان مستەفایە، کە لە(٢٠٠٩/٧/٢٥) دا ئەنجامەکەی دەردەکەوێت.

بەرهەم ساڵح

بەرهەم ساڵح بە پێچەوانەی نەوشیروان مستەفاوە، کوڕی خێزانێکی بۆر جوازیی شاری سلێمانی یەوە. بە پەروەردەیەکی ناسك و لەژێر چاودێریدا بەبەر هاتوە. وەکو سلێمانییەکان دەڵێن ئەو(منداڵی عەقاریە) بەرهەم ساڵح لەدایك بووی ساڵی(١٩٦٠) ە. واتە شانزە ساڵ لە نەوشیروان مستەفا بچوکترە. ڕاستیەکەشی، ئەو کاتەی کە بەرهەم ساڵح لە تەمەنی(١٨) ساڵیدا کەڵکەڵەی سیاسەت کەوتۆتە سەری، کاریگەر بووە بەو قوتابخانە سیاسیەی کەنەوشیروان مستەفا ڕابەرایەتی دەکرد. بۆیە دەکرێت کە بەرهەم ساڵح بەمنداڵێکی هەڵگەڕاوەی قوتابخانەی نەوشیروان مستەفا سەیر بکەین.

بەرهەم ساڵح هەرچەندە ڕۆژ یك لە ڕۆژان لەشاخ پێشمەرگایەتی نەکردوە، بەلاَم لە تەمەنی(١٨) ساڵیداو ئەو کاتەی لەقۆناغی شەشەمی ئامادەییدا دەبێت لەسەر پەیوەندی بە ڕێکخستنە نهێنیەکانەوە دەستگیر دەکرێت و بە کەلەپچە کراوی تاقیکردنەوەی شەشی ئامادەیی دەکات و یەکەمی باکووری عێراق دەبێت. باوکی بەهۆی ناسراوی زۆریەوە لەناو دەوڵەتدا، دەتوانێت لە زیندان دەریبهێنێت. بۆ دوورخستنەوەیشی، بەخێرایی ڕەوانەی بەریتانیای دەکات. بەرهەم ساڵح لەبەریتانیا خوێندنی ماستەری لە بواری(ئەندازیاری مەدەنی وبینا) لەزانکۆی(کاردیف) تەواو دەکات و دکتۆراش لە بواری(ئامارو کۆمپیوتەر) لە زانکۆی(لیڤەرپوڵ) تەواو دەکات. پاشان دەست دەکات بە کاری ئەندازیاری لە چەند کومپانیایەکی ئەوروپی. بەرهەم ساڵح ئەو کاتەی لە بەریتانیا بووە، پەیوە ندیی نزیکی لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد پەیداکردووە وتێکەلاَوی خێزانەکەی بووە. ئەو تێکەلاَوییە هەم سودی پێگە یاند و هەم زیان. چونکە بە هۆی ئەم تێکەلاَوییەوە لەنزیکەوە کەوتە ژێر کاریگەری ئەزمونی سیاسی ئیبراهیم ئەحمەدو لە تاڵە بانیش نزیك بووەوە. بەلاَم لە هەمان کاتدا ئەم نزیك بونەوەیە بووە هۆی دروستبوونی کیشەی کومەلاَیە تی لەگەڵ بنەماڵەی ئیبراهیم ئەحمەد تائێستاش، ئەم مەسەلەیە وەك ورقێکی شەخسی لە نێوان هێرۆ ئیبراهیم خانمی یەکەمی عیراق و بەرهەم ساڵحدا ماوە. لەگەڵ ئە وە شدا بەرهەم ساڵح جێگەی متمانەی زۆری تاڵەبانییە، هەر بەو هۆیەشەوە داوای لێ کرا دەستبەرداری

کارەکەی بێت و بچێتە ئەمەریکا لە جێگەی د. محمەد سابیری نوێنەری یەکێتی لە ئەمەریکا دەست بەکار بێت. بەرهەم ساڵح لە ساڵی( )لە ئەمەریکا نوێنەرایەتی یەکێتی لە ئەمەریکا گرتە دەست. لەو ماوەیەدا توانی تۆڕێکی پەیوەندی بەهێز لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکانی ئیدارەی ئەمەریکا دروست بکات، بە جۆرێك کەلە ناوەندی بڕیاری ئەمەریکادا، چەندین دۆستی گرنگی بۆ یەکێتی پەیدا کرد. پەیوەندی ئەمەریکی یەکێتی لە سەردەمی بەرهەم ساڵح دا گەشەی گرنگی بە خۆوە بینی، کەبووە جێگەی سەرسامی تاڵەبانی. قۆناغی خۆ پێگەیاندنی بەرهەم ساڵح لە ئەمەریکاوە دەستی پێ دەکات، ئەو توانی لە ئەمەریکاوە وەکو ڕەمزێکی سیاسی خۆی پیشانی دیپلۆماتکارەکانی ئەمەریکا بدات و ببێتە جێگەی متمانەیان. بەدوای ئەمانەدا، تاڵەبانی کەوتە سەر ئەو بڕوایەی کە بەرهەم ساڵح لە ئەمەریکا ئەوەندە گەورە بووە، کە ئیدی لە کوردستان پێویستی پێ یەتی لە پاڵ خۆیدا بێت. بۆ ئەم مەبەستەش، بەرهەم ساڵح هێنرایەوەو کرایە سەرۆکی حکومەت. لەمەشدا نەوشیروان مستەفا پاڵپشتی کرد، بەلاَم هەر زوو نەوشیروان مستەفا لێی دڕدۆنگ بوو و ئومێدی پێ نەما. نەوشیروان مستەفا تێگەیشت کە بەرهەم ساڵح لەگەڵ ئەو پڕۆژە سیاسیەدا یەك ناگرێتەوە، کەئەو پلانی بۆ داناوە. بۆیە هەر زوو لێ ی کەوتە تەقە. بەرهەم ساڵح لە کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی لە ساڵی(١٩٩١)بووەتە ئەندامی سەرکردایەتی ولە کۆنگرەی دووەمی یەکێتی، بەبێ هەڵبژاردن لەلایەن مام جەلالەوە وەکو ئەندامی مەکتەبی سیاسی دەست نیشان کرا. دکتۆر بەرهەم خاوەنی چەند سیفەتێکی بەهێزی کەسێتییە.ئەو زمان زان و دیپلۆمات و وتار بێژێکی گەورەیە. پەیوەندییە دیپلۆماتیەکانی بەتایبەتی لە ئەمەریکا، لەهەموو سەرکردەکانی دیکەی یەکێتی زیاترە. ئەو زیاتر دەیەوێت وەکو سەرکردەیەکی جیهانی ناسراو دەربکەوێت، نەك وەك سەرکردەیەکی لۆکاڵی، کە سنوری ناسینی لە چوار چێوەی هەرێمی کوردستاندا تێنەپەڕێت. بەرهەم ساڵح سیاسییەکی چوست وچالاك و خوێن گەرمە و بەزوویی دەچێتە دڵی خەڵکەوە. بە پێچەوانەی نەوشیروان مستەفاوە، کەسێکە زۆر بایەخ بە ئە تەکێت دەدات، بۆ نمونە: ڕۆژانە دووکات ژمێر وەرزش دەکات بۆ ئەوەی جەستەی تێك نەچێت. هەروەها لەسەر شێوازی ئەمەریکی ستافی کاری ڕێکخستووە و بە بەرنامە سەردان و کارەکانی دەکات بۆ نمونە: بە پێ ی خشتەی کار، سەردان و دەرچونەکانی ڕێك دەخات و بۆ ئەم مەبەستەش ستافێك لەگەڵیدا کارەکانی بۆ ڕایی دەکەن. بەپێچەوانەی نەوشیروان مستەفاوە، کە کەسێکی خاکییە و زۆر گوێی بەستافی

کارو بەرنامەدانان نادات. لە زۆربەی کاتدا، هاورێکانی لەدەوری دانیشتوون. ئەوەی کە لەبەرهەم ساڵح دا دەبینرێت، کەسێکی خاوەن تموحە وخواستی گەورە گەورەی هەیە. لە پێش هەمووشیانەوە خواستی گەیشتن بەکەسێتی ژمارەیەك لە کوردستاندا. بەم پێ یە، تەنها تاڵەبانی ئەو کەسەیە کە نابێت ململانێی بکات، چاویشی لەوەیە کە لە داهاتودا ببێتە سەرکردەی ژمارەیەك لە ناو حیزب وحکومەتدا. هەربۆیە ناچێتە ئەو پرۆژانەوە کە لە ئامانجەکەی دووری دەخەنەوە. بەرهەم ساڵح کە ساڵانێك لەناو ژمارە قورسەکانی مەکتەبی سیاسیدا دیار نەبوو. ئێستا وردە وردە خەریکە رێگەکەی بۆ پاك دەبێتەوە. بەتایبەتی دوای چونە دەرەوەی نەوشیروان مستەفاو باڵی ریفۆرم، ئێستا دوای تاڵەبانی وەکو قورسترین ژمارە دەبینرێت. بەرهەم ساڵح هەرچەندە لە حیزبێکی سۆسیال دیموکرات دایە، بەلام لە ناخدا پیاوێکی لیبراڵە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەباشی ئاگاداری چونە پێشەوەو ململانێ ی ناوەکیەکانی خۆیەتی و نایەوێت بە هیچ شێوەیەك لەو بازنەیە بێتە دەرەوە، کە دەیگەیەنێتە ئامانجە گەورەکەی.

گرفتی گەورەی بەرهەم ساڵح لە پێشتردا ئەوە بووە، کە بەهۆی نەبوونی خەباتی شاخەوە ئاستی قبولکردنی لەناو جەماوەری مەڵبەندەکان و هێزی پێشمەرگەدا وەکو پێویست نەبوو. تەنانەت لەلای باڵی مام جەلالیش، بەلام لەم هەڵبژاردنەدا زیرەکانە کاری کردو هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی قۆستەوە بۆ چەسپاندنی هەیمەنەو شەخسیەتی خۆی بەسەر رێکخستن وئۆرگان ودامو دەزگاکانی یەکێتییەوە. هەر بۆیە بەرهەم ساڵح هەڵمەتەکەی لەسەرقورسایی کەسێتی خۆیی بونیاد ناوەو پۆستەرو لافیتەکانی بانگەشەی هەڵبژاردنی لە پارێزگای سلێمانیدا، هەموو بەوێنەی خۆیەوە بلاوکردۆتەوە. رازیکردنی دەنگدەر بەدەنگدان بە یەکێتی، لە سەر بنەمای کەسێتی د.بەرهەم، بەشێکە لەو پرۆسەیەیی کە دەیباتە پێشەوە و دەیکاتە سەرکردەی ژمارەیەك لە سلێمانیدا. بەمەش گورزی کوشندەی دا لە پێگەی هاورێکانی لە مەکتەبی سیاسی، چونکە وادەردەکەوت کەجەماوەر بەرهەم ساڵح یان قبوڵە لە ناو مەکتەبی سیاسیدا. لە کاتێکدا ئەوانی دیکەیان بۆ دەرەوەی سلێمانی نارد. بەرز کردنەوەی وێنەی د. بەرهەم دیاردەیەکی نوێی ناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە، لە کاتێکدا بەدرێژایی مێژووی یەکێتی ئەوە تەنها وێنەکانی تاڵەبانی و کۆسرەت رەسوڵ بوون، کە بەرز دەکرانەوە لەم هەڵبژاردنەدا وێنەی کارەکتەرێکی سیاسیی دیکە جیاواز لە هەموومان دێتە پاڵ وێنەکەی تاڵەبانی و کۆسرەت

ڕەسوڵ، ئەویش وێنەی بەرهەمساڵحە. ئەمەش بەو مانایە دێت، کەبەرهەم ساڵح ئەوەندە متمانەی بە خۆیەتی، کەدەیەوێت لە گەمەکەی ئەمجارەدا، قومار لەسەر کەسێتیی خۆی بکات. بەرهەم صاڵح کەسێکی ڕوو خۆشو موجامیل و دەستکراوەیە. ئەوەی کە لەم کارەشدا هاوکاری بووە، ئەو پارە زۆرەی حیزبە کە لە بەردەستیدایەو درێغی ناکات لە بەخشینی بە کەسانی نزیك و دەوروبەری د٠ بەرهەم ئێستاشی لەگەڵدا بێت، خۆشەویسترین سەرکردەی یەکێتییە لە ئاستی جەماوەریدا وهەریەکەو بەشتێکی سەرسامە. هەندێك بە زیرەکییەکەی وهەندێکیش بە ڕووخۆشییەکەی هەندێکی دیکەیش بەدەستکراوەییەکەی. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، وەك نەوشیروان مستەفا نەبووەتە سەرکردەیەکی کاریزمی وسیفاتی سەرکردەی کاریزمی تێدا نییە. خاڵی بەهێزی کەسێتییە بەرهەم ساڵح ئەوەیە، کەخاوەنی وتار بێژێکی بەهێزوو کاریگەرەو دەتوانێت قەناعەت بە بەرامبەرەکانی بکات. سەرەڕای ئەوانە، کەسێکی کراوەو لەسەر خۆیەو قبوڵی جیاوازی دەکات. بەلاّم خاڵی لاوازی ئەوەیە، کەناتوانێت ئەو بەڵێنانەی دەیانـدات، جێبەجێیان بکات. لەمەشدا پاساوی ئەوەیە کە ئەوکەسێکە بەتەنیایەو شەڕەکەی بەردەمیشی، شەڕێکی قورسە. ئەمەش کاریگەری سلبی لەسەرمتمانەی ئەو دروست کردووە لەناو ئەو جەماوەرەدا، کە پێشتر ناسیویانە. بەرهەم ساڵح کەزار دەکاتەوە، زیاتر لە سیاسیەك دەچێت کەلە ولاّتێکی ئەوروپی بژی. ئەو خوازیاری سەروەری یاساو دەست وەرنەدانی حیزب وئازادیی شەخسی وپەرەپێدانی دیموکراسی و ڕای جیاوازو هەموو ئەو شتە جیاوازییانەیە، کە مرۆڤ ئاواتی بۆ دەخوازێت. بەلاّم دەتوانێت کەمترین جووڵە بکات بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە. سیفەتی هاوبەش لە نێوان بەرهەم ساڵح ونەوشیروان مستەفادا، ئەوەیە کە هەردووکیان پراگماتین وبە پێی واقیع و بەرژەوەندی سیاسی، مامەڵە دەکەن. بەلاّم جیاوازی جەوهەریی نێوانیان ئەوەیە، کەنەوشیروان مستەفا دەیەوێت ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە سەربخات کە لە مێشکیدایە. پێگەی شەخسی خۆی دەکات. نەوشیروان مستەفا لە پێناوی سەرخستنی ئەوبیرۆکەیەی کە هەیەتی، وازی لە جێگری سکرتێرو هەموو پلەو پایەیەك هێنا. بەلاّم بەرهەم ساڵح لە پێناوی چوونە پێشەوەی خۆیدا، هەندێك جار دەچێتە هەندیك هاوپەیمانیەوە کە بۆ خۆیشی لە ناخی دڵەوە پێ ی خۆش نی یە جیاوازیەکی دیکەی نێوانیان، ئەزمونی سیاسیە. نەوشیروان مستەفا خاوەنی ئەزموونێکی دوورو درێژی سەرکەوتن وشکست و ڕێکەوتن و مفاوەزات وناکۆکی و مناوەرەیەو شارەزاییەکی باشی هەموو قۆناغە مێژووییەکانەو بەهۆی

ژیانییەوە، لە ناو شۆڕشدا شارەزایی لە باری کۆمەڵایەتی‌وسایکۆلۆژیی کۆمەڵگە هەیە. لە کاتێکدا بەرهەم ساڵح سیاسیەکی پێگەیشتووی ناوهونەری دیپلۆماتیی ئەوروپی و ئەمەریکیەو کەمتر شارەزایی لە تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی وتەنانەت سایکۆلۆژیای حیزبەکەی خۆیشی هەیەو کەمترین هەڵکشان و داکشانی بینیوە. لەکاتێکدا نەوشیروان مستەفا خاوەنی سەرکەوتنی گەورەو کۆستی گەورەشە لە ناو شۆڕشدا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، نابێت ئەوەنەمان لە بیر بچێت کە لە پشتی بەرهەم سالحەوە، دووکۆڵەکەی بنەڕەتی وەستاون، کە تا ڕادەیەك یارییەکەی ناهاوسەنگ کردووە بەرامبەر بە نەوشیروان مستەفا. ئەویش دەسەڵات وپارەیە. کە یەکەمیان خۆی لە بوونی تاڵەبانی دەبینێت لە پشتییەوەو دووەمیشیان خۆی لەو بودجە زەبەلاحەی بەردەستی یەکێتی وپارتی و دەبینێتەوە، کە درێغیان لە بەخشینەوەیدا نەکردووە.

موفاجەئەی نەوشیروان مستەفا

نەوشیروان مستەفا هێشتا موفاجەئەی زۆر لە هەگبەیدا هەیە کە نیشانی یەکێتی وپارتی بدات. تا ئێستا سەرکەوتوو بووە لەو قۆناغە بەندیەی کە بۆ کەشف کردنی سیحرەکانی خۆی دایڕشتووە، بۆ ئەم مەبەستەش ئێستا نەوشیروان مستەفا باس لە موفاجەئەی پێش هەڵبژاردن دەکات کە هێنانە دەرەوەی(٨٠٠٠)پێشمەرگەیە کە لە ڕیزەکانی فەرماندەیی یەکێتی و تەنانەت باس لەوەش دەکرێت کە موفاجەئەی دوای هەڵبژردنیشی هەیە. ئێستا کۆسرەت ڕەسوڵ لە نێو کاندیدەکانی لیستی کوردستانیدا، نزیکەی(٢٠) کاندیدی هەیە، هەر ڕۆژێك کۆسرەت ڕەسوڵ لە ناو یەکێتیدا هەست بە نیگەرانی بکات، ئەو کات کوتلەکەی لەپەرلەمان دەچێتە پاڵ فراکسیۆنی گۆڕان و بەوەش دەتوانێت هاوکێشەی هەموو هەڵبژاردن وڕێکەوتنە ستراتیژیەکەی نێوان یەکێتی وپارتی بگۆڕێت.

## نەوشیروان مستەفا، بەرپرسی کوشتارگەکانی شاخ بووە

سەردەشت حمە سالح

ریفرۆم، ئەگەر بۆ چاکسازی بکرێ، پێشکەوتنی زۆر فەراهەم دەکات، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر بۆ بەرژەوەندی تاك و گرووپ بێت لەسەر حسابی گشتی، ئەوا گورزێکی کوشندەیەو هەنگاوێکی مەتریسیدارە کە بەرەو دیکتا تۆری هەنگاوی دەنێت. لەکوردستان و لە ئێستادا ریفرۆم بۆتە سەرباس و ویردی سەر زمان، ئایا ئەوەی کە ئێستا هەیە، رێرەوە راستەقینەکەی گرتۆتە بەر یاخود تەنها بەرگێکە بۆ چەواشە کاری کراوەتە بەر؟ هەڵبەت وەڵامدانەوەی، ئەم پرسیارە، بەڵێ و نەخێر دەبێت، بەڵام ئەگەر بڵێ، کێ و چۆن؟. لەم راپۆرتەدا دەچینە بەردەرگای پرسیارەکان و بەشرۆڤە کردنی ورد هەوڵ دەدەین کە وەڵامێك بە خوێنەران بدەینەوە. ئیمە پێمان وایە ئێستا لەکوردستاندا ریفرۆم هەیە، بەڵام هەرزیەو کامڵ نییە. بۆ وەڵامی بەڵێی پرسیاری پێشومان، ئێستا دەبینرێت چ حیزب یان حکومەت دەستی کردووە بە گۆڕان، بەڵام بەداخەوە لە ئاستی پێویستدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا مادام هەیە ئومێدێکە.

ئەگەر وردتر سەیر بکەین گۆڕان لە ناو حیزبدا زیاتر دەستی پێکردووە، بەتایبەت یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. ریفرۆم، لەکوردستاندا دەمێکە بوونی هەیە، هەنگاوانی بەرەو دیموکراسی کەلەدوای راپەڕینەوە لە هەڵبژاردنی ساڵی(١٩٩٢)وە هەتا دەگاتە ئەمڕۆ، خۆی لە خۆیداریفرمێکی گرنگە ، هەروەها ئەگەر بگەڕێینەوە سەر یەکێتی کە هەمیشە لەگۆڕاندایە، باشتر بڵێین سەرچاوەی ریفرۆم و گۆڕان لە ناو یەکێتییەوە هەڵقوڵاوەو هەڵدەقوڵێ، کە مێژووەکەشی هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە بووە، دیارترین ریفرۆم لە ناو یەکێتیدا(پشکۆ نەجمەدین) دەیگێڕێتەوە بۆ ئالای شۆڕش، کە مەلا بەختیار کارگێڕی مەکتەبی سیاسی ئێستای یەکێتی سەرکردایەتی کردووە بۆیە لێرەدا دەکرێ بڵێین ئەوانەی ئێستا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایە ئەمانە داینە مۆو دروستکەری ریفرۆمن، ئەو بەرگە دەگرێتەوە کەبەناوی ریفرۆمەوە کراوەتە بەر، واتە سڕینەوەی مێژووی ریفرۆمەو چەواشە کردنی راستییەکانە. ئەمە جگە لەوەی لە ساڵی ١٩٩٤بەدواوە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان

له دەروازەكانی شەڕی ناوخۆ، پڕۆژەیەكی فراوان وهەمە لایەنەی دارشت و پێشكەش كرد بۆ جیا كردنەوەی حیزب ودەسەلآت وبە دامەزراوە كردنی دەسەلآت، بەلآم لە بەر هەر هەلو مەرجێك بووە سەری نەگرت. ڕیفرۆم كەناراستی لەسەرەتاكەیەوە بێت ئەوا بناغەیەكی لە رزۆكی هەیەو هەنگاوەكە بۆ وەرگرتنی پۆست و بردنەوەی كورسییە، كە ئایندەكەشی نارۆشنە!. سەبارەت بەوەی كە هەندێك بەبەكارهێنانی ناوی ڕیفرۆم دەیانەوێ بەشەقام بلێن كە ئێمە گۆڕانكاری و چاكسازی و شەفافیەت دەكەین، ئایا ئەوانەی كە لەسەرەتاوە ناوەڕاست بووبن، دا خۆ مەبەست و مەرامەكانیان چی دەگرێتەوە؟ئایا ئەمەدژی حەقیقەتی چەمكەكەش نییە؟دكتۆر فوئاد مەعسوم كارگێڕی مەكتەبی سیاسی یەكێتی نیشتیمانی كوردستاندەلێ:ئەو بانگەشەیە تەنها بۆ مەرامی شەخسی وتایبەتییە، جگە لەوەی كە بۆ كورسی و پۆست هیچی دیكەی نییە. گۆڕان ئەگەر بكرێ لە ناو یەكێتیدا دەكرێ ئەوانەی كە چونەتە دەرەوەی یەكێتی ئێستا بانگەشەی ڕیفرۆم دەكەن، ڕاست ناكەن وهەرگیز لەگەلّ گۆڕانیشدا نەبوون. دكتۆر سەروەر عەبدولڕەحمان مامۆستای زانكۆی سلێمانی دەلێ{گۆڕان لەناو یەكێتیدا دەكرێ، لەدەرەوەی ئەمە جگە لە تاو دانی ئەسپ بۆ گەیشتن بە دەسەلآت هیچی تر نییە }حەمەی حمە سعید بەر پرسی مەلبەندی هەلەبجەی یەكێتی هەمان بۆ چونی هەیە، كە:ڕیفرۆم وگۆڕان لە ناو حیزب بنەماكانی سەركەوتنی زیاترە ولە دەرەوە مەحالە سەر بگرێت }.ێینە سەر ئەوەی ڕیفرۆم بۆ گۆڕانی سیستەم و+ دەسەلآت پێویستی بە چییە، ئەوا دەبێت ئەو ڕاستیەمان لە بەر چاو بێت، كە ڕیفرۆم بۆ ئەو مەبەستە واتە گۆڕینی سیستەم، پێویستی بەسەدان بیرومەندو فەیلەسوف و سەدان دكتۆر و پسپۆڕ لە بوارەكانداو پرس و ڕا و دیدی جیاواز هەیە، بەلآم ئەوەی كە ئێستا نەوشیروان مستەفا هەندێ دەیكەن تەنانەت باوەڕیشیان بەدیالۆگ نییە چ جای رای جیاواز!.

ئەو بیرمەندانەی دەبینرێن قسە لە پێناو ڕێبازە تەمومژاوییەكەی نەوشیروان مستەفا دەكەن بۆ گەیشتن بە دەسەلآت بە ناوی ڕیفرۆمەوە، هەر ئەوانن كەپێشتر دەسەلآتدار بوون، ئەو كاتەی دەسەلآتیان هەبوە هیچیان ئەوە نەبوون كە ئێستا جیاواز بن ومایەی شانازیی بن هەتا خەلك و كۆمەلّ بڕوا بەوە بكەن، كە ئەوان بە فعلی چاكسازن.یەكێك لە فەیلە سوف و بیر مەندە دیارەكەی كە پشتگیری نەوشیروان مستەفا دەكات و بانگەشەی بۆ دەكات(عوسمان بانیمارانی )یە، ئەم كەسایەتییە لە چاو پێكەوتنێكدا دەلّ،پەشیمانم كە لەپەڕلەمان بووم !!

ئایا چوار ساڵ لە پەڕلەمان دەرفەتێکی تیا نەبوو ئەم ئەندامە پەشیمانەی پارلەمان واز لە پەڕلەمان و موچە زۆرەکەی بهێنێ؟!،لە هەمووشی کۆمیدی تر ئەوەیە دیسانەوە خۆی کاندید کردۆتە وە بۆ پەڕلەمان !.

ناوبنراو سەبارەت بەوەی ئەی دەوام دەکات لە پەڕلەمان؟دەڵێ: ئەگەر غائیب بین دەگیرێین!!.

ئەم بیر مەندە داخۆ ئەم قسەیەی لە کوێ هێنا بێ و لە چ یاسایەکدا کۆلاجێ کردووە، لەکاتێکدا چوار ساڵە دەوام دەکات کەچی نازانێ ئەندام پەڕلەمان حەسانەی هەیە !!.لەلایەکی دیکەوە پرۆژەکانی ئەم گروپە دیارنین و تا ئێستا٠ هیچیان نەکردووە، تەنها ئەوان دێن کارو پرۆژەو خزمەت گوزارییەکانی حکومەت و یەکێتی و پارتی فێزەون دەکەن ونەیارو ناحەزەکان دژی ئەمانە کۆدەکەنەوە، بێگوێدانە کەسایەتی، ئەوانەی قسە لەسەر حکومەت و یەکێتی و پارتی دەکەن، ئەوانە دەهێننە سەرکەناڵەکانیان، بەتەنها ڕەخنەیەك رووپەڕی ڕۆژنامەو رادیۆو تیڤییەکەیان داگیر دەکات !. محەمەدی مەلا قادر ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان دەڵێ:چونکە ئەوانە بێ پرۆژەن و کارو خزمەت گوزارییان پێ نییە، دێن کار لەسەر بێ ئەهمیەت کردنی ئیش و کارەکانی ئێمە دەکەن، کەلە ڕاستیدا خەڵك ئەو ڕاستییە یان بۆ دەردەکەوێت و بەدەنگەکانیان وەڵامی ئەوانە دەدەنەوە.

لەلایەکی دیکەوە نەوشیروان مستەفا ویستی پەردە لەسەر کارەکانی ڕابردوو هەڵبداتەوە بۆ ئەوەی جەماوەر بەوە سەرقاڵ بکات وپرۆژەو کاری ئەمانیان بیر بچێتەوە هەتا کاتی هەڵبژاردن، بەلاَم هەر زوو ووتەبێژی سیاسی و چەند بەرپرس وکەسایەتییەك ئەوەیان بێمنەت کردو مەلا بەختیار ووتی:{ئەگەر گۆڕە ئاشکراکانمان هەڵنەدەنەوە، ئەوا ئێمەش گۆڕە نهێنییەکان ئاشکرا ناکەین}،لای خۆشیەوە دکتۆر فوئاد مەعسوم سەبارەت بەو هەوڵەی نەوشیروان وەك وەلاَمێك ووتی:{پێویستە کەس خۆی بەفریشتە نەزانێ}

حمەی حمە سەعیدیش ئەوە دووپا ت دەکاتەوە: نەوشیروان مستەفا لە کێشەکاندا، هەمیشە ڕەشبین بووەو لەنیوەی کێشەکاندا مەیدانەکەی جێهێشتووە، ئەمەش لە زۆر قۆناغی مێژوویی یەکێتی دا بە ڕوونی دەردەکەوت، و دواترینشیان نەفەس کورتی ئەم سیاسەتەمەدارەیە لە بەرامبەر ئەنجامی هەڵبژاردنی مەڵبەندەکان، کە پێشنیازو تەنانەت بەرنامەی سەپێنراوی خۆیی بوو؟!.

نەوشیروان مستەفا پێی وایە مەترسی لەسەر کوردستان نییە، ئەمەش خەڵکی تووشی شۆك کردو کەوتە بەر ڕەخنە، ئەندامێکی سەرکردایەتی یەکێتی نەیویست ناوی ئاشکرا بکەین ووتی: ئەم قسەیە لە حاڵەتێکی ئاسایدا نەوتراوە، قسە زۆر هەڵدەگرێ، تەنها ئەوە دەڵێم لە کاتێکدا کە ئەو قسەیەی کردووە، نەوشیروان(٣٠٠) پاسەوانی هەیە، کەسێکی بێوەی وەك ئەو سێ سەد پاسەوانی هەبێ، ئیدی چۆن لە کوردستان مەترسی لەسەر نییە. بەرلەوقسەیەی نەوشیروان ئەوەشی ڕاگەیاند کەمەکتەبی سیاسی یەکێتی وەك(مەجلیسی قیادەی سەورەی بەعسە)، ئەم قسەیەی نەوشیروان ناڕەزایی لەناو لایەنگرانی خۆشیدا دروست کردو یەکێك لە ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی ووتی: ئەگەر مەکتەبی سیاسی مەجلیسی قیادەی سەورە بێت، ئەوا نەوشیروان مستەفاش عیزەت دووری بووە، چونکە بە پێ ی ئەو شوبهاندنە بێویژدانییە خۆی هەمان پێگەی ناوبراوی دەبێ.

کەسێکی نزیك لە کارەکانی کۆمپانیای وشەی نەوشیروان مستەفا پێی ڕاگەیاندین، کاك نەوشیروان متمانەی بەو هاژو هوژەی دەورو بەری نییە، دەزانێ کە بۆ پۆست وپلە لێ ی ئالاون.

ئەو کەسە ووتیشی: ئەگەر کاك نەوشیروان بەم جۆرە بەبێ کەس تێی ناگاو کەس نازانێ بەتەمای چییە، ئەوا زۆرێك لەلاینگرانی لە دەست دەدات.

بەخوێندنەوەمان بۆ قسەی ئەو بەڕێزە لە گردەکەی نەوشیروان مستەفا قسە گەلێکی جیا وەردەگرێ کەلە زۆریاندا ڕەهەندی دیکە دێنە ئاراوە.

گرنگترین شت لە وقسانەدا دەردەکەوێت کە نەوشیروان کەسێکە لە خۆڕازی، تەنانەت کەسە نزیکەکانیش نازانن بەتەمایی چییە !.

ئامـاژە بە قسەکان وخوێندنەوەکان بۆ بینین و بیستن و خوێندنەوەکان نەوشیروان بەرەوجیا لە دیموکراتیەت دەڕوات، هەندێ توندی و خۆبەزل زانینی ئەم کابرایە لەهەموو کەس بەزیاتر بەبەرەو دیکتاتۆری دەخوێننەوە، بەکارهێنانی نەوشیروان لە هەمووشتێکدا لەلایەن لایەنگرانییەوە پەنجەیەکی دیکە بۆ ئەو بۆچونە درێژ دەکەن، وەك لە زۆرێك لەکەناڵەکانیدا دەبینین سەری قسەو بنی قسە یان دەڵێن(نەوشیروان ووتی: نەوشیروان وا دەڵێ. نەوشیروان پێ ی وایە هیواداریـن ئاخری خێربێت.

ئەو قسانەی پێشتر هەر لە بلاوکردنەوەی هەندێ نهێنی لە شەڕی ناو خۆو شوبهاندنی مەکتەبی سیاسی(ی ن. ك) بەمەجلیسی قیادەی سەورەو باسکردن لەوەی کەمەترسی لە

کوردستان نەماوە و هەندێ شتی تر،جگە لە سەرقاڵ کردنی خەڵك وخۆ دزینەوە لە پرۆژە کانیانەو پرو پاگەندەی هەڵبژاردن هیچی دیکەی نییە.

سەبارەت بەوەی کە کتێبی(خەون یان مۆتەکە) ی پێشکەش کردووە کە بەئەندازیاری شەڕی ناوخۆی دەزانن، ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی یەکێتی ووتی: بەڵێ نەوشیروان ئەندازیاری شەڕی ناوخۆ بووە، مەبەستی ئێمە شەڕی ناوخۆو بووە لەشاخ، کەئەو بەر پرس بووە لە کوشتارەگاکان و دووریش نەبوە لە شەڕی ناوخۆی دوای ڕاپەڕین.

هەروەها ووتیشی: ئەو کابرایە خۆی داوەتە دەست کات ورۆژگار، ئەو لەسیاسەت چۆتەوەو پێش بینی بۆ ڕووداوو پێش هاتەکانی نییە.

ووتیشی: نەوشیروان مستەفا ئەگەر خۆی بەو فریشتەیە دەزانێ کە دەست و پێوەندەکەی ئیدیعای بۆ دەکەن، بۆ بەدیالۆك نایەتە پێشەوە بەرامبەر بە بەرەی بەرامبەری خۆی، بۆ ئامادە نییە لەگەڵ کاك مەلا بەختیاری کارگێڕی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لە سەر تەلەفیزیۆن دابنیشێت، وەك پێشتر مەلا بەختیار پێشنیازی کردبوو. تەنانەت ئەو پیاوە تا ئێستا کۆڕێکی کراوەی بۆ جەماوەر نەگرتووە. کەسمان نەدیووە هێندەی نەوشیروان لە ڕەخنە بترسێت، هەرگیز نەی وێراوە پۆستێك وەر بگرێت دەزانیت ئەو پایانەی بۆی دروست کراوە لە ئەنجامی ئیشەکەیدا نامێنن، چونکە دەردەکەوێت توانای چەندە، بۆیە دەترسێ پێش تریش یەکێتی کردوویەتی بەسەرۆکی پارلەمان، بەسەرۆکی حکومەت، بەلام ئەو نەی کردووە تەنانەت خۆیی زۆر لەو پۆستانە بە گەورە تر زانیوە، لەبەر ئەو هۆکارەی باسم کرد.

ئەو برایە دەیەوێت تەنها ئەمر بکات، بەڕێز مام جەلال بەو تەمەنەو بارە تەندروستەیەوە کاردەکات و پۆست بەڕێوە دەبات، کاك کۆسرەت هەروایە، بەلام ئەم تاقانەیە، نابێت ئیش بکات.

دواپرسیارکە لایەنگرانیی وئێمەش پێویستە بیکەیت، ئایا دوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و بەدەست نەهێنانی ڕێژەی پێویست لە پەرلەماندا لەلایەن لیستی(گۆڕان)ەوە، وەك هەموو پرۆژەکانی ترکاك نەوشیروان زویر نابێت وکوردستان جێبێڵێت وماوەی چەند ساڵێك ڕوو لە ئەوروپا بکاتەوە؟ ئەمە پرسیارێکە لە ئەزموونی چەندین پرۆژەی پێشووی کاك نەوشیروانەوە سەرچاوە دەگرێت وپێویستی بە وەڵامێکی جیدییە، بەلام ئەم جارە وەڵامەکان لەدەست سندوقەکانی هەڵبژاردن دایە.

## بێدەنگی مام جەلال و بێئۆقرەیی لیستی گۆڕان!!

تێکدانەوە-خەڵك

### سەرەتاو ململانێ

چاودێرانی سیاسەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، لە سەرەتای دامەزراندنییەوە، هەروەها کادرو بەرپرسە بالاکانیشی، بەردەوام باسی ئەوە دەکەن کە ئەوەتەی یەکێتی دامەزراوە، ململانی لە ناویا هەر هەبووە. ململانێکان جیا بوونەوەشیان لێ کەوتۆتەوە، هەروەها زۆربەی یەکگرتنەوەکانیش لەگەڵ یەکێتی دا ئەنجام دراون.(یەکگرتنەوەی یەکێتی و سۆسیالست، یەکێتی و ئالای شۆڕش، یەکێتی شوراکان. ..تاد). ئەو ڕاستیانە لە مێژووی یەکێتیدا، ساغ بونەتەوە. بەلام ئەوەی ساغ نەبۆتەوە، یان کت ومت نازانرێ، ڕەگوو ڕیشەی جیابوونەوەی ئێستای(کۆمپانیای ووشە)یە. هەر لەبەر ئەم هۆیە، بەشێکی خەڵك، بەتایبەتی ئەوەی دوای راپەڕین، یان ئەو خەڵکانەی پێش ڕاپەڕین کە دووربون لە ڕوداوەکان، ئەمانە کەوتونەتەژێر کاریگەری پڕو پاگەندەی گوایە ریفرۆم و، گوایە دژایەتی گەندەڵی و...تاد. ئەم خەڵکانە، ئاگایان لەوە نییە، سەردارانی کۆمپانیای ووشە، بیست ساڵ پێش ئێستا، لە ناو یەکێتیدا کەوتونەتە ململانێ لەگەڵ سکرتێری گشتی یەکێتی وزۆربەی سەرکردەکانی ئەو کاتە، دوورو نزیك باسی دەسەلات و گەندەڵی و ریفۆرمیان هەر نەکردووە.چونکە ئەو دەمە یەکێتی لە بەرەنگاری و پاشەکشەی عەسکەری دا بووە، نەك لەبەر دەسەلات. ئەمە ڕاستیەکەیە چاودێرانی سیاسی و بەرپرسانی یەکێتی، لەچاوپێکەوتنەکاندا پەیتا پەیتا دانیان پیاناوە. مێژووی چارەکە سەدەی رابردووی یەکێتیش، لەزۆر وێستگەی جیاوازدا، ئەم ڕاستی یە دەسەلمێنێ. بەوردی خوێندنەوەی کتێبەکانی(نەوشیروان مستەفا ئەمین )یش، بە ڕۆشنی دیدە جیاوازەکانی لە ناو شۆڕش و لە دوای ڕاپەڕین، باسدەکات، بەلام بە شێوەو شێوازی ڕۆژنامە نوسێکی بەسەلیقە. نەك وەکو بەناو یاداشتی چەند فەرماندەیەکی عەسکەری و کادری مامناوەندی، کە مەگەر هەر خواو خۆیان بزانن، چەند ڕاستیەکانی مێژوویان شێواندووەو چەندیش فشەیان کردووە.

## مام جەلال، سکرتێرێکی بێدەنگ

ڕەگــوو ڕیــشەی ناکۆکیــەکان، وەکــو گوتمــان، ڕۆچــۆتە مێــژووی یــەکێتی. بەداخــەوە، ناکۆکیەکان لـە مێـژووی یەکێتیـدا زۆر بـوون، بـەڵام کـەمیان لـە سـەر نوسـراوە. بەتایبـەتی لەسەر سـەرەتای سـەرهەڵدانی نـاکۆکی نێوان نەوشـیروان ومـام جـەلال. ئەمـەش زۆر زیـانی گەیاندۆتە مێژووی یەکێتی وئەندامانی یەکێتی و رای گشتی کوردستانیش.هەر بۆیە، ئێستا زۆرن ئەوانەی فریو دراون و بە دروشمەکانی کۆمپانیـای ووشـە، لـە خشته بـراوون. ئـەوەی زیـاتر ئـەم چەواشـەکارییەی قـوڵ کـردوە، ئـەو پـڕو پاگەندانـە نییـە کـە کۆمپانیـای ووشـە بڵاویان دەکاتەوە. یان ئەوەش نییە ناو بە نـاو کاژێـك لـە یـەکێتی دەکەنـەوە. یـا خـود ئـەو چــەند وتــارو چــاوپێکەوتنانەش نییــە کــە کۆمپانیایەکــەی ووشــە لــە تەلــەفیزیۆن ورۆژنامەکەیانــدا، پەخــشیان دەکــەن. نــەك ئەمانەنییــە، بــەڵکو بەشــی زۆری نوســین وچـاوپێکەوتن و هەواڵـەکانیان، زیـانی پـێ گەیانـدووە. ئـەوەی کـە لای زۆرینـەی خـەڵك، بەتایبـەتی هێـزە سیاسـیەکان و نوسـەرو خوێنـدەواران مایـەی سـەر سـوڕمانە،بێ دەنگـی ڕاستەوخۆی سکرتێری یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە لـە سـەر گـیرو گرفتـەکان، بەتایبـەتی هەر هیچ نەبێت لە دوای دامەزراندنی کۆمپانیای ووشەو مەترەح کردنی لیستی گۆڕان.

خــەڵك دەپرســێ: بۆچی؟سـکرتێری یـەکێتی، دژایـەتی حیزبەکـەی دەکـرێ، دژایـەتی سـەرکردایەتی وخـودی خۆیـشی دەکرێ،کەچی سـکرتێری یەکێتی نـاو بـە نـاو بـە ئاسـتەم قسەیەك دەکات، یان گلەیەك فڕێ دەدات؟ئـەم بـێ دەنگیـەی سـکرتێری یـەکێتی، ڕەنگـە لای خۆی،سـەرەنجامی ئـەزمونێکی قـوڵی بـێ لـە سیاسـەت و دووبـەرەکی، بـەڵام وەکـو تـر، ئـەو بێدەنگی یە،لە چەندساڵی رابردوودا،ڕۆژانە جەستەی یەکێتییان هیلاك کردووەو بـە شـێکی ڕای گشتیش وردە وردە بەهەڵە دەبەن.

## زاڵکردنی رەوشت بەسەر سیاسەتدا

لەمێــژووی سیاســەت و نــاکۆکی حیزبایــەتی دا،سیاســەت مــەدارێك نادۆزرێتــەوە لــە بەرامبەرهەوڵی تێك وپێك دانی حیزبەکەی و مێژوەکەی وهاوڕێکانی، هێنـدە پـشوو درێـژ بێ و هێندە بێ باك بێت. لەبەرامبەریشدا،ئەوانەی جیا بوونەتەوە،نەك ڕێز لەم بێ دەنگی وکەم توخنی ناکۆکی کەوتنە، ناگرن، لە بەر پرسیاری کۆمپانیای وشەوە، هـەتا دەگاتـە ئـەو کەسانەی پێشمەرگەی ئاسایی بـوون، لـەم ململانـێ سیاسیەدائارام نین،بـەڵکو تـوڕەوتڕۆن. هەرچی لەهەمانەی توڕەو تڕۆی سیاسیاندا هەیە، لە نوسین و کۆبونـەوە تایبەتیەکانـدا، لـە

چاوپێکەوتن ولەسەر خوانی خواردنەوەیاندا،هەڵیان ڕشتووە. تەنانەت ڕێز لەو مێژووەش ناگرن کە خۆیان بەشێکی زیندووی لەو مێژووە، لەبەرامبەر تەواوی ئەو ڕاستییەتاڵانەدا، سکرتێری یەکێتی، لەنێوان سیاسەت و ڕەوشدا،ڕەوشتی زاڵ کردۆتە سەر سیاسەت. ڕەوشتی زاڵ کردۆتە سەر بەرگری کردن و پاراستنی حیزبەکەی. کە هەموو سیاسەت مەدارێك دەزانێت،ئەگەر لەنگەرێك لە نێوان سیاسەت وڕەوشت نەگیرێ،تەرازووی بەر پرسیارێتی تێك دەچێت. بەڵکو ڕاستیەکانیش دەشێوێت.زیاتریش لەمە،ڕەنگە کارەساتیش بقەومێ.

بێدەنگی و ڕەوشت بەرزی لە گەرمەی ململانێ دا،کاتێك دەچێتە خزمەتی دیموکراسییەوە کە لەبەرام بەریشدا،هەبن لەم ڕەوشت و بێدەنگی یە، تێ بگەن. یان تەقدیری بکەن.بەڵام کاتێك ڕەوشت بەبێ ڕەوشتی وبێ دەنگی بەتوڕەیی وەڵام درایەوە،ئیتر کەسی یەکەمی هێزێکی سیاسی و سەرکردایەتی ئەو هێزە،دەبێت ووریاتر بن و پێشبینی بکات کە ئاراستەی ناکۆکیەکان،کەبەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت بەرەو کوێ دەڕوات.

**کێشەی چارەسەر نەکراو**

ئەگەر یەکێتی،لەناو خۆیدا،دوو یان سێ ساڵ لەمەو بەر،یان ووردتر بڵێین:هەرهیچ نەبێت لە دووەمین کۆنگرەیدا،بنج وبنەوانی کێشەکانی یەکالآ بکردایەتەوە،ناکۆکیەکانی لە تەمومژ پاك بکردایەتەوە،سیاسەتی پینەو پەڕۆی ناکۆکیەکانی پێرەو نەکردایە،ئێستا ئەم کێشانەی نەدەگەیشتنە جیابوونەوە هەروەها کێشەکانی ناو یەکێتیش،پەنگیان نەدەخواردو پەیتا پەیتا یەکێتیان نەئەدۆشی.

ململانێ..سروشتی خۆی هەیە.ئاڕاستەی هەیە.هاندەری هەیە.دیارە سەرئەنجامیشی هەیە.بەتایبەتی ململانێی لەم چەشنەی گردەکەی ووشە،کە ڕەگوڕیشەی لە مێژینەی چارەسەر نەکراوییان هەیە.

ئێستا..لە هەموو کاتێك زیاترو زۆرتر هەست دەکرێ،بە چارەسەرنەکردنی ململانێی شاخ،کێشەکان گوێزرایەوە ناو یەکەمین کۆنگرەی یەکێتی،بەچارەسەرنەکردنی گرفتەکان لەناو یەکەمین کۆنگرەدا،حەواڵەی دووەمین کۆنگرەی یەکێتی کرا.لەم کۆنگرەیەشدا کێشەکان چارەسەر نەکران،زۆرترین دەرفەت درایە پەیڕەوانی تەکەتول،کە بەردەوام بن لەسەر تەکەتول،هەتا زۆربەی تەکەتولەکان کەوتنە ڕۆخێك ودۆخێکی نالەباریان بۆ یەکێتی دروست کردوو گەیاندییە جیابوونەوەش.

ئەمەلە کاتێکدا،جیابوونەوە، یان لیستی جیاواز،خواستی بنەڕەتی وئامانجی ڕاستەقینەی سەرانی لیستی گۆڕان نەبوو،بەڵکو بەرنامەو بڕیاری ئەوان، ساڵەها پێش ئێستائەوە بووکە ئاژاوەیەکی گەورە بخەنە ناو خەڵك وەکو خەڵکی ڕۆژهەلاتی ئەورووپا هان بدەن،رابپەڕن وپەلاماری دامو دەزگاکان بدەن تەنانەت هەندێکیان خۆیان بۆ ئەوەش ئامادە دەکرد چۆن چۆنی ماڵی سکرتێری گشتی تالان بکەن وبە چ شێوەیەکیش ئارامگای برایم ئەحمەد تێك وپێك بدەن. چەند تاقیکردنەوەیەکی بچوکیشیان لێرەو لەوێ ئەنجام دا.بەلام نەیانتوانی دۆخەکە وەکو مەرامیان وابوو،لە گرێژنە دەربکەن.هێشتا ئەم بەرنامەیەی لە گرێژنە دەرکردنی دۆخی کۆمەلایەتی و ئاژاوە نانەوە،لەبەرنامەیاندا ماوە.دوورنییە بیانویەك لەکاتی هەڵبژاردن،یان دوای دەرکەوتنی سەرەنجامی هەڵبژاردن،بە پرۆسەی هەڵبژاردن بگرن و ئاژاوەیەك بنێننەوە

## گۆڕا نخوازو ئاوێنەی مێژوو

ئێمە..دڵنیاین،کۆمپانیای ووشە و لیستی گۆڕانییان، ئامانجیان گۆڕان و نەهێشتنی گەندەڵی نییە،چونکە ئەگەر مێژوو، دایکی ڕووداوەکانە، ئەوا مێژووی یەکێتی و ڕەفتار وگفتاری ئەم ئالا هەلگرانەی بە ناو ڕیفرۆم،ئاوێنەیەکی بالانمای بەردەممانەوئیتر هەرگیزناشێ باوەڕ بەلاف لێدانی گۆڕانی لیستی گۆڕان بکرێت. خۆ ئەگەر مێژووش لە بازنەی هاوکێشەکان دەربکرێت(کەمەحاڵە دەربکرێ)ئەمەیان مەسەلەیەکی ترەو دەشێ لەم حاڵەتەدا، لیستی گۆڕان لە مێژوو دەربکەین وئێستایان بۆ بکەینە بنەمای کارکردن.

بۆ ئێستاش، ئەوا هەڵبژاردن بەڕێوەیە. سەرئەنجامەکەشی دەردەکەوێت دەریش دەکەوێت هەموولایەنەکان چەند لەبەرز کردنەوەی دروشمی ڕیفرۆم و گۆڕان ڕاستگۆن. مێژووی کەسایەتی هەموو هێزەکان زۆری ڕۆیشتووە و کەمییان بەبەرەوە ماوە.ئەوانەی لە زۆربەی تەمەنی خۆیاندا، ڕابردوویان پاڵپشتیان نەبێ بۆ چاکسازی و چاکە خوازی، هەرگیز لەتەمەنی کەمی وئێستاو ئایندەیاندا ناتوانن ببنە فریادڕەسی گۆڕان. چونکە نەخۆیان بیر وفەلسەفەی ڕاستەقینەی گۆڕانیان هەیە، نەڕوداوەکانیش لەگەڵ ویست وئارەزووی ئەوان دێتەوە.

لەگەڵ پاشماوەی کادرو پێشمەرگەکانی هەرێمی یەك کە لەگەڵ کاکە حمەدا نەبوون،بەتایبەتی کادرەکانی کۆمەڵە.

مەلا بەختیاریش بەو هێزە وە دێتە خوارەوە بۆ ڕەزڵەو حاجی مامەندو پاڕەزان. مەلا بەختیار نامەی بۆ کاکە حمە نویسبوو کە لەگوندەکانی ڕەزڵە، یان حاجی مامەندە یان پاڕەزان، دانیشتنی لەگەڵ بکات، بەڵام کاکە حمە قبوڵی ناکات وئەوناوچەیە چۆڵ دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ شارەزوور، کەسایەتییەکی ئاگادار لەناو هاوکێشەکاندا ووتی:{لەڕاستیداکاکە حمە داوای دەرچونی لەکارەساتی هەکاری و لەکاتی ئامرهەرێمی یەکدا،حسابی بۆ زۆرکەس لە نێو سەرکردایەتی(ی.ن.ك)دانەدەکرد، بەڵام هەمیشە سڵی لەکاك مەلا بەختیار دەکردەوە، هەر ئەو ترسەیش بوو وای کرد کە کاکە حەمە بەو دانیشتن و گفتوگۆیە ڕازی نەبێت، چونکە دەیزانی کاك مەلابەختیار کەسێکی نەترس وخاوەن ئەزموونە لە چاك کردن وراست کردنەوەی کەسانی لادەر }.

کەسایەتییەکی دیکە ئاماژەی بەوە کرد {جارێك لە سەرکردایەتی کاکە حەمە پەلاماری مولازم عومەر دەدات، مولازم عومەر ڕادەکات، لە کاتێکدا مولازم عومەر بەرپرسی(ی.ن.ك)بوو} بۆیە بەو کەسایەتیەش رای وابوو ئەو کات کاکە حمە هەندێ سنوری بەزاند بوو، کەسێکیش بیتوانیایە سنوری بۆ دابنێت تەڵەکەی مەلا بەختیار بوو، مەلا بەختیار بەو هێزە مایەوە لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی(مام جەلال دا).هەر لەو شەوانەدا ڕەئوفی خەلیفە سەعید ڕادەکات و دەچێتە بارەگاکانی حزبی سۆسیالست کە نزیك بوون لە باگارەکانی سەرکردایەتی(ی.ن.ك).(رەوفی خەلیفە سەعید لەگەڵ دلێر جاف وئەحمەد زەردۆیی دەست بەسەر بوون لەسەرکردایەتی )،سۆسیالستیش ئەمەیان زۆر بەهەل زانی بۆ سەرکەوتنە سیاسی وسەربازییەکانی خۆیان،بەهێزێکی(١٥٠)پێشمەرگەییەوە لەگەڵ(تایەری عەلی والی بەگ)و چەندلێپرسراوێکی تریان بەرەو گوندەکانی پاڕەزان وڕەزڵەو حاجی مامەند بە ڕێدەکەون، دەگەنە گوندی(دۆستەدەرە)نزیك گوندی(ڕەزڵە)، مەلا بەختیار بەو هێزەی هەورامان وهەڵەبجەو شارەزوورەوە لە گوندی(ڕەزڵە)دەبێت. پێش بەهێزەکەی سۆسیالست دەگرێت.نامەیەك بۆ تایەری عەلی والی بەگ دەنوسێت کە تکایان لێ دەکات، کێشەی ئەوان وحمەی حاجی مەحمود کێشەی نێو خۆی خۆیانە واتە(ی.ن.ك)،کاکە حەمە زویر بووە، ئێوە تەداخول مەکەن وبگەڕێنەوە.کادرو پێشمەرگەکانی هەرێمی یەك کەلەگەڵ کاکە حەمە نەڕۆیشتبوون زۆر داخ لە دڵ دەبن بۆ لێدانی ئەو هێزەی سۆسیالست، بەڵام مەلا بەختیار ڕێگەیان پێ نەدادت. کەسێکی ئاگادار لە نێو کێشەکان وڕووداوەکانی ئەو کات ووتی:{کاك مەلا بەختیار ووتی: ڕێکەوتننامەمان هەیەو نابێت شەڕبکەین }.

مەلا بەختیار توانی هەندێ لەو ئامر کەرتانەی کە زۆر داخ لەدڵ و سەرگەرمی شەڕەکە بوون لەشاخەکان دابەزێنێتە خوارەوە،وەك(محمود گەرمیانی،ئەحمەد شاتوانی،دکتۆر محمودی خورماڵ، عومەری قالە گوولباخ)،کە ئامرکەرت بوون.بەڵام تایەری عەلی والی بەگ بە پێی پێویست وەڵامی نامەکەی مەلا بەختیار ناداتەوە.سۆسیالست نەخشەو خەیاڵیان ئەو هەلەیە بە هۆی زویر بوونی حەمەی حاجی مەحمودەوە دەست بگرن بەسەر شارەزوور و شارباژێردا،بۆیە هەر ئەوشەوە بەشارەزایی رەزایی ڕەئوفی خەلیفە سەعیدکە ئامۆزای کاکە حەمە ئەو کاتە(ی.ن.ك)دەستی لە کاکە حەمە داشت، چونکە پەیوەندی کرد بە حیزبی سۆسیالستی کوردستانەوەو، بوونە سۆسیالستی خۆی ڕادەگەیەنێت. ئەو دەمە کاك مەلا بەختیار ووتی {فکرەی ئازادەو ئێمە ئیعلانی شەڕناکەین، ئازادە لەوەی دەبێت بە سۆسیالست} ،ئەمە وتەی شایەت حاڵێکی ئەو سەردەمە بوو. پاش ئەوەی مەلا بەختیار دەزانێت حەمەی حاجی مەحمود بۆتە سۆسیالست ولەگەڵ هێزەکەی تایەری عەلی والی بەگ یەکیان گرتووە، مەلا بەختیار بەرەو گوندی حاجی مامەندو گوندەکانی تری بەرزنجە دەڕوات و هێزەکەی بڵاوە پێدەکات، بۆ پشوودان دەچێتە گوندی ڕەزڵە، پاشان نامە دەنوسێت بۆ ئەو کەرتە پێشمەرگانەی کە هێشتا لەگەڵ حەمەی حاجی محمود مابوون، کە بگەڕێنەوە بۆ ناو(ی.ن.ك)،چونکە کاکە حەمە بووە بەسۆسیالست، وەك کەرتی(حەمە ڕەش )کە ئامر کەرتێکی دیاری هەرێمی یەکی یەکێتی بوە، ئەوانیش پەیوەندییان لە گەڵ حەمەی حاجی محمود دەپچڕێنن، دوا بەدوای ئەم ڕووداوە کت و پڕیانە پەیوەندییەکان لە نێوان بەرپرسانی یەکێتی لە هەرێمی یەك وسەرکردایەتی ئەو حزبە، بەنامەیەو درەنگ ئاگاداری یەك دەبن، لەبەر ئەوەی جیهاز نەبوو نەش زانرا کاك نەوشیروان مستەفا چۆن دەست گیرکرا.

## چۆنێتی گرتنی نەوشیروان مستەفا

کاك نەوشیروان نازانرێت تا چ ڕادەیەك زانیاری لەسەر ئەو ڕوداوانە هەبووە کەپێشتر باسمان کرد،(یان هەر زانیاری نەبووە)،بە دوو پێشمەرگەوە دابەزیوەتە بەری گوندەکانی(ڕەزڵەو حاجی مامەندو پارەزان )،کە ئیشی تایبەتی خۆی هەبووە ئاگای لە هاتنی کاك نەوشیروان نەبووە. نەوشیروان مستەفا دەگاتە گوندی دۆستەدەرە، کە بە پیادە(٣٠)دەقیقە لە گوندی(ڕەزڵە)وە دوورە،ئەچێتە یەکێك لەماڵەکان بەنێوی(سابیری مام شەریف)،نامەکەبە(شێخ عومەر شێخ نوری)دۆستەرەدا دەنێرێت بۆ حەمەی حاجی

سابیر.(حەمەی حاجی سابیر )کادری کۆمەڵایەتی یەکێتی بووە لەو ناوچەیەدا،ماڵەکەیشی لە گوندی(بیوەك)بووە.کاك نەوشیروان لەو گوندە ناوی خۆی گۆڕی بوو بۆ(مستەفا)،(ئەگەر کاك نەوشیروان ناوی خۆی نەگۆڕیایەو بمان ناسیایە،ئەوا کاك مەلا بەختیار بە هاتنەکەی دەزانێ وکاك نەوشیروان بەو بێئاگاییە نەدەڕۆیشت بۆ قەویلەو بەردە ڕەشە)،ئەوەیش وتەی کەسایەتییەکی ئاگاداری ناوچەکە بوو. بۆ ڕۆژی دوایی حەمەی حاجی سابیر دەگاتە لای کاك نەوشیروان، پێکەوە دەڕۆن بەرەو گوندەکانی چەمی گەلاڵ(قەویلەو بەردەڕەشە)، ئەو کەسەی مەبەستێتی لەوێ دەیبینێ، هەتا ئەم کاتەیش مەلا بەختیار ئاگاداری هاتنی نەوشیروان نییە بۆ ناوچەکە. .هێزەکەی سۆسیالست بەسەرکردایەتی تایەری عەلی والی بەگ، کە لەگەڵ حەمەی حاجی محمود یەکیان گرت، لە شارەزوورەوە سەرکەوتنەوە بۆ گوندەکانی ڕەزڵە و چەمی گەلاڵ و لەوێوە بەرەو شارباژێر، هێزەکەی سۆسیالست دوای ئەو یەککگرتنە بووبوونە(٣٠٠-٣٥٠)پێشمەرگە، گەیشتبوونە گوندی ڕەزڵە، هێزەکەیان کردبوو بەسێ بەشەوە، نزیکەی سەد پێشمەرگەیان ناردبوو بۆ گووندی(دۆستەدەرە)بە سەرکردایەتی ڕەئوفی خەلیفە سەعید، پێشمەرگەی تریشیان بەسەرکردایەتی ئەنوەری سعید بەگ ورەشە کەچەڵ ناردبوو بۆ گووندی(بیوەك)،پێشمەرگەکانی دیکە کە نزیکەی(١٠٠-١٥٠)دەبوون لەگەڵ حەمەی حاجی محمودو تایەری عەلی والی بەگ شەو لە گوندی ڕەزڵە دەمێننەوە،واتە ڕەزڵە دەبێتە بنکەی پلان ونەخشەی ئەو جەولەیەیان. هەر ئەو ئێوارەیە سێ پێشمەرگەی یەکێتی کە پێشمەرگەی دەڤەری پێنجوێن دەبن،لە گوندی دۆستەدەرە دەکەونە تەڵەکەیانەوە، دانەیەکیان چەك دەکەن و دوانەکەی دیکە هەڵدێن. هەرهەمان شەو کەرتێکی پێشمەرگەی یەکێتی کە نزیکەی(١٨)پێشمەرگە دەبن وئامر کەرت فەرەیدوون حمە ساڵح پێنجوێنی و جەلال کولکنیان لەگەڵ دەبێت،کە لە گوندەکانی چەمی گەلاڵ جەولەیان کردبوو،گەڕابوونەوە بۆ گوندی(بیوەك)،نەیان زانی بوو(١٠٠)پێشمەرگەی سۆسیالست لەو گوندەدان، بەلام لە قەرەداغ گوندەکەدا، پیاوێکی ئەو گوندە کە دەزانێت ئەم پۆلە پێشمەرگەی یەکێتین ئاگاداریان دەکاتەوە لە هێزەکەی سۆسیالست، ئەوانیش پلان ونەخشەی خۆیان دادەنێن، لەتاریکیدادەچنە مزگەوتی گوندەکە،عادەتی ئەو کاتەی پێشمەرگە وابوو دابەش دەبوون بۆ ماڵەکان بەزۆری دوو دوو، دواتر دەگەڕانەوە بۆ مزگەوتی گوندەکە بۆ خەوتن،دوای نانی ئێوارە پێشمەرگەکانی سۆسیالست دوو دوو دەگەڕێنەوە بۆ مزگەوتەکە،لە نێو مزگەوتەکەدا(١٠)یان لێ بەدیل دەگیرێت، دواتر پلانەکە

ئاشكرا دەبێت و تەقە دروست دەبێت لە نێوان هەردوو لادا. بەوشەوەساردەی زستان، هێزە پەرتەوازەکەی سۆسیالست دەگەڕێنەوە بۆلای کاکە حەمەو تایەری کەلی والی بەگ لە گوندی رەزڵە.

پێشمەرگەکانی یەکێتیش بەو(١٠)دیلەوە دەگەڕێنەوە بەرەو گوندی سلێمانەومیرمام. ئەو پۆلە پێشمەرگە لەوێ دەگەن بەکاك نەوشیروان، کەفەرمیدون حمە ساڵح پێنجوێنی و جەلال کۆڵکنی کاك نەوشیروان دەناسن،کاك نەوشیروان رووداوەکەی زۆر پێناخۆش دەبێت دکتۆر کەمال شاکیریشیان لەگەڵ دەبێت.(کەنازانرێت چۆن لەگەڵ نەوشیروان و هاورێکانیدابووە).دکتۆر کەمال کادرێکی پێشکەوتوی ئەو کاتی یەکێتی بووە. نەوشیروان ئەو شەوە دەیەوێت نامە بنوسێت بۆ(تایەری عەلی والی بەگ)،

## هەڵوێستی مەلا بەختیار و سالار عەزیز لە ڕزگارکردنی نەوشیروان مستەفادا

ئا//چرۆ

پاش هەکاری و تێکشاندنی سیاسی وسەربازی(ی.ن.ك)،هەرێمی یەك کە(محەمەدی حاجی محمود)سەرپەرشتی دەکرد،هێزێکی سەربازی لە ناوچەکەدا دروست کرد،کەزیاتر لە(٣٠٠-٤٠٠)پێشمەرگەی ئەو سەردەمە دەبوو.کادرەکانی کۆمەڵە لە هەورامان و هەڵەبجەو شارەزوور کەوتنە ململانێیەکی سیاسی لەگەڵ(کاکە حمە)،هەرچەندە کاکە حەمەیش بە کۆمەڵە دادەنرا لەناو(ی.ن.ك)دا، بەڵام محەمەدی حاجی محمود کۆمەڵەی وەك فیکرهەزم نەکردبوو. بەڵکو قەناعەتێکی کاتی بوو، بە پێچەوانەوە کادرەکانی دیکە پڕاو پڕ دەیانویست فیکرو پرنسیپەکانی کۆمەڵە جێ بەجێ ی بکەن. لێرەدا تێکستێك لە کتێبی(ئەزمون ویاد)ی پشکۆ نەجمەدین وەردەگرین کە هاوکاری زۆرمان دەکات لە ڕونکردنەوەی ئەو ململانێ یەدا(خەسڵەتی عەشایەریی حەمە،بە ناچاری هەندەك کاری پێ دەکردو کەسانێکی وای لەدەور کۆکردەوە کە لەژێر چەتری دەسەلاتی ئەودا،کاری ناشایستەو خراپیان ئەنجام دەدا. هەرچەندململانێی نێوان ئێمەی کۆمەڵەوحەمە توندتر دەبوو،دەرفەت بۆ کەسانی پۆخڵەوات و بێکەڵك زیاتر دەڕەخساو کێشەی کادرانی کۆمەڵەو(حەمە)ی قوڵتر کردەوە،ئەوە بووکە هێزی پێشمەرگەی هەورامان وەکو بەشێك لە هەرێمی یەك سەرپاکی کادرو پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بوون،(حەمە)ش کە جارێ فەرماندەی هەرێم نەبوو،لە هەوڵی دروست کردنی پێگەو چاوی(خەتی گشتی)دا بوو.لەشارەزووردا،کۆمەڵێك کادری دیارو لێوەشاوەی کۆمەڵە هەبوون،کە وەکو پێویست بواریان پێ نەدەدراو کەسانی دیکەی ناشایستە بەسەر ئەواندا پیش دەخران.

قەیرانەکان گەیشتە ئەوەی کاکە حەمە بە هەموو کادرو پێشمەرگەکانی هەرێمی بانگهێشتی سەرکردایەتی بکرێت، یەکەوە، لە سالانی(٧٩-٨٠)مام جەلال لەدەرەوەی ولات بوو،پاش وتو وێژو لێپرسینەوەی سەرکردایەتی،بڕیاری(تجمید)بۆ محەمەدی حاجی مەحمودو ڕەئوف خەلیفە سعید(کە جێگیرو ئامۆزای کاکە حەمە بوو)،دلێر جاف(ئامر کەرت)،ئەحمەد زەردۆیی(ئامر کەرت)،چەند کادرو مەفرەزەیەکی تر،لەسەر پۆخڵەواتی ئەو

سەردەمە کەلەسەرەوە ئاماژە بە هەندێك لایەنی دراوە، دەست بەسەر کران. کاکە حەمە بەبێ بڕیارو ئاگاداری سەرکردایەتی شەوو بە هێزێکی(٧٠-٨٠)پێشمەرگەییەو، بە قاچاخ لە سەرکردایەتییەوە و لە ناوچەی پاڕەزان و حاجی مامەند و ڕەزڵەوە گەڕایەوە بۆ شارەزوور.

سەرکردایەتی لە دەفەری ناو زەنگ بوو،بە بڕیاری کاکە حەمە خۆیی، تا مام جەلال نەگەڕێتەوە ئیلتیزام بە سەرکردایەتی(ی.ن.ك)ەوە ناکات، دوا بەدوای زویر بوون و هەڵهاتنی حەمەی حاجی مەحمود، بۆ ڕێکخستنەوەو هێور کردنەوەی دۆخەکە بە بڕیاری سەرکردایەتی،(مەلا بە ختیار)یان هەڵبژارد بۆ هەرێمی یەك، بەلاَم لەبەر ئالۆزی وەزعەکە ناگونجێت، ئەو شەوە لە گوندی(میرمام)دەمێننەوە، بۆ بەیانیەکەی هێزەکەی سۆسیالیست لە گوندی ڕەزڵە کۆدەبنەوە،بۆ تۆڵە سەندنەوەی ١٠پێشمەرگە گیراوەکەیان بەرەو گوندەکانی چەمی گەلاڵ دەڕۆن، بەیانی دواتر کاتژمێر(٨)ی بەیانی پێش ئەوەی پێشمەرگەکانی یەکێتی کە(کاك نەوشیروان) یشیان لە گەڵ دەبێت لە گوندی میرمام دەرچن،هێزەکەی سۆسیالست شاخەکانی چوار دەوری گوندەکانی میرمام وسلێمانە دەگرن،ئامر کەرتەکانی یەکێتی، فەرەیدو ن حەمە سالح وجەلال کولکنی بە کاك نەوشیروان دەڵێن دەبێت تۆ بڕۆیت. ئێمە شەڕدەکەین، ئەگەر هەمویشمان بکوژرێین،بۆیە کاك نەوشیروان لەگەڵ دکتۆر کەمال شاکیرو حەمەی حاجی سابیر دەنێرن بۆ گوندی(مۆریاس وقەویلە)پێیان دەڵێن ئەگەر ئێمەش دەرچووین شەو دێینە ئەم گوندانە، کە ماڵیان بۆ دەست نیشان کردبوون لە هەردوو گوندەکە کە تێ یبچن،بۆ ئەوەی دواتر لەوێوە بەرەو لای کاك مەلا بەختیار بڕۆن،ئەو هەژدە پێشمەرگەیەی یەکێتی بۆ ئەوەی نەوشیروان مستەفا دەرچێت ونەگیرێت یا خود نەکوژرێت، لە بەیانییەوە بۆ سەعات نۆی شەو بەرامبەر زیاد لە سێ سەد پێشمەرگەی سۆسیالست دەکەونە شەڕ،پێشمەرگەیەکیان لێ بریندار بوو بوو بەناوی(کامەران پێنجوێنی )کەدواتر سۆسیالست بە بریندای دەیگرێت.لەشەودا پێشمەرگەکانی یەکێتی پاشە کشەیان لە شەڕکردبوو،بەدوای کاك نەوشیرواندا دەڕۆن بۆ گوندی قەویلی لەوێ خەڵکی گوندەکە نەیان ناسی بوون،بۆیە نەیان وتبوو کاك نەوشیروان لێرەیە،لە کاتێکدا کاك نەوشیروان لەوێ بوو بوو لە ماڵی دانیشتوویەکی گوندی قەویلە بە نێوی(حاجی عەلی)،لەوێشەوە بەرەو گوندی مۆریاس ڕۆیشتبوو،لەوێش کاك نەوشیروانیان نەدیتبووەوە،ئیدی پێشمەرگەکان لەوێوە بەرەو گوندی حاجی مامەند دەڕۆن بۆلای کاك بەختیار. کاك نەوشیروانیش لە قەویلە لەگەڵ دکتۆر کەمال شاکیرو حەمەی حاجی سابیرو

دووپێشمەرگە بەجێدەمێنێت، کاك نەوشیروان نامەیەك بە دکتۆر کەمال دا دەنێرێت بۆ تایەری عەلی والی بەگ کە هاورێی ی خوێندن وپێشمەرگایەتی بوون.

لەنامەکەدا ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەو وەزعە چییە ڕویداوەو، ئەوان ئەو وەزعەیان پێ خۆش نییە، حەمەی حاجی مەحمودیش کە هاتۆتە نێو سۆسیالست شتێکی ئاساییەو،نایەوێت شەڕ ڕووبدات، چونکە ئەگەر شەڕیش ڕووبدات دەتوانن شەڕەکە بەلایەکی تردا بگۆڕن و،داوای بینینی تایەر عەلی والی بەگ دەکات. جەماعەتی سۆسیالست کە نامەکە دەبینن زۆریان بەلاوە سەیر بووە کە چۆن ئەو نامەیەی نەوشیروان گەیشتۆتە ئەوێ، بۆیە هەست دەکەن کە لەو گوندانەی دەورو بەردایە،سەبارەت بەو نامەیە کەسایەتی و کادرێکی یەکێتی جاران و ئێستای ناوچە دەیوت: (ئاخر کاك نەوشیروان کە نەڕۆیشت وخۆی دەرباز نەکرد،بە دووپێشمەرگەوە چۆن نامە دەنێریت و داوای بینینی تایەر دەکات، بۆیە کاك نەوشیروان خۆی،خۆی دا بەگرت، کە نەدەبوو سەرکردەیەکی کۆمەڵە ئەوەندە خۆش باوەڕبێت)، دوای بەدوای دکتۆر کەمال کە نامەکەی بردبوو، هێزێك بەرەو گوندی قەویلە دەنێرن،کەئەچن کاك نەوشیروان لە ماڵی(حاجی عەلی)قەویلە دەبینن،لەگەڵ خۆیان دەیبەن بۆ گوندی(ئۆزی خواجا)بۆلای تایەری عەلی والی بەگ و حەمەی حاجی محمود، لەوێ نەوشیروان و تایەر دەکەونە گفتو گۆوە،تائەو کاتەیش حسابی گرتنیان بۆ کاك نەوشیروان نەکردووە، بەلام لە ژێر گوشاری ڕەئوفی خەلیفە سعید کە تازە لەزیندانی یەکێتی لە سەرکردایەتی رایی کردبوو،هەندێ لە ئامار مەفرەزەکانی سۆسیالستی کۆن وەك(مام ئاراس و جەباری عەلی عەوێزو خولی حەمە تاتە)،تایەری عەلی والی بەگ دەسەلاتی نامێنێت و بڕیاری گرتنی کاك نەوشیۆوان ئەدەن.

## چۆنێتی ڕزگارکردنی نەوشیروان مستەفا

کاك نەوشیروان لە گوندی قەویلە دەگیرێت. .مەلا بەختیار لەگوندی حاجی مامەند بەهێزەکەیەوە دەگەڕێتەوە گوندی رەزڵە، لە گوندی رەزڵە دەزانێت کە کاك نەوشیروان دابەزیوەو گیراویشە،جێگای سەرسورمان دەبێت لای،دواتر پێشمەرگەکانی یەکێتی کە زیاد لە٤٥٠پێشمەرگە بوون لە گوندی ڕەزڵە کۆدەبنەوە هێزەکانی شار بازێرو سەرگەلوو پێنجوێن وهەورامان و هوڵەبجەو شارەزوور دەبن.بە سەرکردایەتی مەلا بەختیار وسالار عەزیز،سۆسیالستەکان لە گوندی ئۆزی جواجاوە بەرەو گوندی(دۆڵە چەوت)دەگەڕێنەوە،کاك نەوشیروان یشیان بەدیلی پێ دەبێت. ئەو گوندەش کاتژمێرێك بە پیادە لە گوندی رەزڵەو

هێزی یەکێتیەوە دوورە.مولا بەختیارو سالار عەزیز کۆبونەوەیان بە پێشمەرگەکان کردبوو،ووتبوییان ئێمە هیچ بریاری شەڕمان نییە لەگەڵ سۆسیالست،ئێستا ئەوان کاك نەوشیروانیان گرتووە، کەبەکارێکی خۆی دابەزیوەو هیچ هێزێکیشی لەگەڵ نەبووە،پێشمەرگەکان بەهەموو شێوەیەك ئامادەییان دەربڕی بوو بۆ ڕزگار کردنی نەوشیروان و لێدانی سۆسیالست، شەو پلان ونەخشەیان دارشتبوو کە لەگوندی(دۆڵە چەوت)لێیان بدەن وکاك نەوشیروان بگێڕنەوە. بەڵام کاك مەلا بەختیار لە کۆتایەکەیدا ووتی:من نامەوێ لپیان بدەین، چونکە لە کاتی شەڕدا کاك نەوشیروان تیا دەچێت،بەڵ کاك سالار عەزیز بەرپرسی یەکەم بوو،بەلآم پێشمەرگەکان زیاتر پەیوەیست بوون بە کاك مەلا بەختیارەوە،کاك سالار حەزی بە لێدانی حسك دەکرد،ووتی: ئێمە دەیان سەرکردەی وەك کاك ئارام و عەلی عەسکەری و خالە شەهاب و دکتۆر خالیدمان تیا چووە،کاك نەوشیروانیش وەك ئەوان،بەلآم کاك مەلا بەختیار ووتی:لەم کاتەدا کاك نەوشیروان بۆ یەکێتی وکۆمەڵە زۆر زەروورە،بۆیە کاك بەختیار وتو وێژی هەڵبژارد لە جیاتی شەڕ.ئەوەش گێڕانەوەی کەسایەتی و شایەت حالێکی ئاگادارو ووریای ناو ڕوداوەکانی ئەو کاتەی ناوچەکە بوو.

یەکێك لە پێشمەرگەکانی شێخ کاوەیش جەختی لەسەر ئەو ڕا جیاوازەی مەلا بەختیارو سالار عەزیز کردەوەو ووتی:(کاتێك ئێمە لەگەڵ شێخ کاوە چوین بۆلای سۆسیالست بۆ ئازاد کردنی کاك نەوشیروان،کاك نەوشیروان بەمندا جوابی بۆ کاك مەلا بەختیار نارد کە سۆسیالست داوای هەرشتێکیان کرد بیان دەنێ،منیش ئەمەم لە گوندی(دۆڵە چەوت بە کاك مەلا بەختیار ووت:کە لەگەڵ کاك سالار عەزیز لەسەر یەکێك لە بانگێژەکانی ئەو گوندە پیاسەیان دەکرد،کاك بەختیار ووتی:ئەگەر بزانین سۆسیالست بە چەکەکانمان کاك نەوشیروان بەرئەدەن،ئەوا هەموو پێشمەرگەکانی یەکێتی بۆ چەك ئەکەین بەلآم کاك سالار عەزیز ووتی:هەر ئەوەم پێ باشە لێیان بدەین وکۆتایی بە سۆسیالیست بێنین،با ئەوانیش کاك نەوسیروان بکوژن.

هەر ئەو پێشمەرگەیە کە ئێستا فەرماندەیەکی خانە نیشینی یەکێتییەو نەیویست ناوی بلآو بکرێتەوە ئاماژەی بەوە کرد کە کاك نەوشیروان لە کاتی گیراندنەکەیدا بێ وورە بووە، سۆسیالیستیش سوکایەتیان زۆر پێ کردووە، تەنها کەسیش کە بەگژسۆسیالستەکاندا چووەوە(سامانەچکۆل) بوو کەپەلاماری چەکی لێدان،کە دواتریش نەوشیروان مستەفا لە نێو یەکێتیدا دەریکرد.

سەرکردایەتی یەکێتی چۆڵ بووە، مام جەلال لە دەرەوەی وڵات دەبێت،بڕیار دەدەن سالار عەزیزبگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتی یەکێتی،مەلا بەختیار بە هێزەکەوە لە رەزڵە دەمێنێتەوە.وتوو وێژدەست پێدەکات،لەسەرکردایەتی یەکێتی جەمالی حەکیم ئاغاو شێخ دارای حەفید لە گەڵ نوێنەری حزبی شیوعی شێخ کاوەی شێخ لەتیفی حەفید،دەبنە وەفدی گفتو گۆ،ئەو وەفدەیش بۆیە لەو کەسانەی پێکدێت چونکە جەمالی حەکیم ئاغاو شێخ دارا کۆمەڵە نەبوون لەناو یەکێتیدا،سۆسیالست رق وحەساسەتێکی زۆریان بەرامبەر کۆمەڵە هەبووە،نوێنەری حزبی شیوعی وشێخ کاوەیش وەك بێلایەن.وەفدەکە دێنە خوارەوە بۆ وتوو ێژ لەگەڵ سۆسیالت،پێش ئەوەی ئەوان دابەزن،مەلا بەختیار لە رەزڵەوە سامانی هەورامان کە کادرێکی پێشکەوتووی یەکێتی بووە بە نامەکەییەوە دەنێرێت بۆلای سۆسیالست واتە بۆ لای تایەری عەلی والی بەگ و حەمەی حاجی مەحمود لە گوندی دۆڵە چەوت،بەلأم سۆسیالست سامانیش دەگرن و هیچ وەلأمی نامەکە نادەنەوە.ئینجا وەفدەکە دێتە ناوچەکە، هێزەکەی سۆسیالست بە کاك نەوشیروانەوە خۆیان لەو ناوچەیە پێ ناگیرێت ودەگەڕێنەوە بۆ شارەزوورو سورێن. مەلا بەختیار چاوی بە شێخ کاوە نوێنەری حزبی شیوعی دەکەوێت. بە شێوازێکی میانڕەوانەو سیاسیانە گفتوو گۆیان لەگەڵ دەکات،(شێخ کاوە نگینێکی تایبەتی تێدا بوو،ئەو نگینەی لە شێخ مەحمودی مەلیك بەجێ مابوو بەر شێخ کاوە کەوت بوو،زانینی و جورئەتێکی تایبەتی هەبوو،کاکە حەمەو تایەری عەلی بەگ رێزێکی زۆریان لێ دەگرت،چونکە شێخ کاوە زۆر بێ فێڵ بوو).کەسایەتیەکی نێو ڕووداوەکان بەو شێوەیە وەسفی شێخ کاوەی کردوو باسی لەکاریگەری ئەو کرد لە ئازاد کردنی کاك نەوشیروان.شێخ کاوە مەفرەزەیەك پێشمەرگەی لە گەڵ(حەمە زیادی شێخ عبداللا)لای مەلا بەختیار جێ دەهێڵێت،مەلا بەختیار دوو جیهازی(هۆکی تۆکی) بچوکی لادەبێت.یەکێکیان لای شێخ کاوەو ئەوی تریشیان لای حەمە زیادی شێخ عبداللا دەبێت(کە ئێستا پێشمەرگەیەکی دیرین وخانە نیشینکراوی یەکێتی یە لە سلێمانی).

ڕۆژانە لە شاخەکانی رەزلەوە بەو جیهاوانە قسەیان لە گەڵ شێخ کاوە پێدە کرد لە سورێن.چەند ڕۆژێك شێخ کاوە دەمێنێتەوە لەگەڵ نوێنەری حزبی شیوعی لای سۆسیالست لە سورێن،بارەگای سۆسیالست و شیوعی لە سورێن لە یەك نزیك بوون،حزبی شەعی ئێوارەیەك شێخ کاوە میوانداری دەکەن بۆ بارەگاکەی خۆیان،لەبەرئەوەی حزبی شیوعی دۆستایەتیەکی کۆنیان لەگەڵ(شێخ لەتیفی حەفید)ی باوکی شێخ کاوە هەبووەو،چاکی

زۆری مێژوویی شێخ لەتیفیان بەلاوە بووە،بۆیە ڕێزی زۆری شێخ کاوەو ئەو بنەماڵەیەیان دەگرت.لەو میواندارییەدا شێخ کاوە دەڵێت:نەوشیروان لەگەڵم نەیەت نایەم،بۆیە حزبی شیوعی تەکلیف لە تایەری عەلی والی بەگ وحەمەی حاجی مەحمود دەکەن،کەنەوشیروان ئیزن بدەن لەگەڵ شێخ کاوە بێت بۆ میواداریيەکەی،(حەمەی حاجی مەحمود)ڕێزی شێخ مەحمودی نەمر لە شێخ کاوە دەگرێت بۆیە نەی توانی دڵی بشکێنێ وکاك نەوشیروان ئیزن بدات لەگەڵ شێخ کاوە بچێت بۆ داعوەتەکەی حزبی شیوعی،پێشمەرگەو پاسەوانیشی لەگەڵ نەنارد.کەسێکی نێو ڕوداوەکە بەو شێوەیە باسی لە ئیزندانی نەوشیروان کرد بۆ داعوەتەکەی شەو لەبرە گای حزبی شیوعی، پێشمەرگەکانی شێخ کاوە بە پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی دەڵێن سەرە پاسەوانی ئێمەیە،لەنیوە شەوێکی درەنگدا،سالاری شێ جەلالی سەرکان(کەدواتر دەبێتە یەکێتی و ئێستاش لە سلێمانییە)،موحەمەدی شێخ رەزای چنارەی باساك کە هەردووکیان پێشمەرگەی شێخ کاوە دەبن،لە نیوەشەودا لەسەر بڕیاری شێخ کاوە،کاك نەوشیروان هەڵدەسێنن لەگەڵ سامانی هەورامان(کەنامەکەی مەلا بەختیاری بۆ سۆسیالست برد بوو گیرا بوو)،سامان کوڕێکی ئازاو تەواو شارەزای ناوچەکە دەبێت، دووقومبەلەی دەستی ودەمانچەیەك ئەدەن بە سامان،سامان پێیان دەڵێت(دە مەتر دوورمان خەنەوە،ئیتر کەس ئێمەی بۆ ناگیرێت،ئەو شەوە بەنێو بارەگاکانی بە عس ولایەنەکاندا،سامان،کاك نەوشیروان دەگەیەنەتە گوندی شانەدەری،کە ناوجەرگەی بەعس بوو،کاك نەوشیروانی بردە ماڵی(جەلالی حاجی کاکەلی)کە بەرپرسی ڕێکخستنی کۆمەڵە بووە لەسەید سادق و شانەدەری،لەوێ نانیان خوارد بوو،پشویەکی کەمیان دابوو،پاش ڕۆژ بوونەوە بە گوندی پەڕییەڕۆو گوندەکانی دیکەدا،دەگەنەوە گوندەکانی چەمی گەلاڵ،بۆ ڕۆژی دواتر دەگەنە گوندی بیوەك نزیکی(بەرزنجە).

هێزێکی یەکێتی لێ بوو،مەلا بەختیار هەر لەرەزلە دەبێت،لەوێ پێشمەرگەیەك بەناوی(عەبدوالله بچکۆل پێنجوێنی)،لەوێوەخۆی دەگەیەنێتەگوندی رەزلەبۆ ئەوەی هەواڵ بگەیەنێتە مەلا بەختیار،کەکاك نەوشیروان بەربووە. مەلابەختیار لەگەڵ مستەفا چاوڕەش لەماڵی(شێخ محەمەدی رەزالە) دەبن لەگوندی رەزلە،کاتی نان خواردنی ئێوارە دەبێت(عەبدوالله بچکۆل) خۆی دەکات بەژوردا،(عەبدوالله هەر دەیووت کاك بەختیار مزدەم بەرێ، کاك بەختیار هەر ئەیوت چیتە بیلێ ئەویش هەر ئەیوت مزدەم بەرێ لەئاخردا وتی دوو مەغزەن فیشەکم بەرێ ئینجا پێت دەڵێم، دواتروتی کاك نەوشیروان بەربوە کاك

بەختیاریش وتی: بلێ رۆحی خۆت بلێ دەمانچەکەت مبەرێ نەك دوو مەخزەن فیشەك)، ئامادەبویەکی ئەو ئێوارەیەبەوشێوەیە هەوالی بەربونی نەوشیروان مستەفای گێرایەوە.مەلابەختیارو مسیەفاچاوڕەش نانی ئەئێوارە ناخۆن،دەکەونەرێ بۆ گوندی بیوەك، کەزیاد لەکاتژمێرێك بەپیادە لە رەزلەوە دوورە،دەچن بۆلای کاك نەوشیروان مستەفا، دووسێ رۆژ لە بیوەك و خانوە قوڕەکان و حاجی مامەندو دەمێننەوە، چاوەڕوانی هاتنەوەی شێخ کاوە دەکەن، پاش دوو سێ رۆژ لەئێوارەیەکدالەهەمان کاتی کاك نەوشیروان دا، شێخ کاوە دەگاتەوە گوندی حاجی ماند. مەلا بەختیار ونەوشیروان مستەفا سوپاسی زۆری شێخ کاوەیان کردبوو شێخ کاوەش وتبووی من بئەرکی خۆمی دەزانم وچوەڕوانی هیچ پاداشتێك نیم، ئەوەی من بۆئێوەم کرد باوکیشم بۆ مەلا مستەفای کرد،لە دەست بەسەرییەکەی سلێمانییەوە بە خولە پیزەو شامە بۆرەکەی دا ڕەوانەی(بارزانی)کردەوە.

# لاشەی یەکێتی، لەژێر کەڵبەی شێرەکانیدا

ڕاپۆرتی —خەڵك

## یەکێتی چی بوو؟

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان،دووروست بووی دوای شکست و لەدایك بوونی ڕۆژگاری بێ ئومێدی تروسکایەی ناو پرسەی مردنی شۆڕشی بارزانی،لە دوای هەرەسی ١٩٧٤،یەکێتی لەدۆخێکی دژوارو بەرامبەر بەرژێمێکی ئێجگاربەهێزو لە سالآنی مەرگی شۆڕشی پارتیدا دروست بوو،واتە هەرەس بووە مامانی لە دایك بوونی یەکێتی.

ئەو یەکێتییەی کە نەلە بڕوای دووژمنان،نەلە بڕوای میلەتیشدا کە بەو بەهێزییەی دروست ببێت بگاتە ئەو یەکێتییەی ئەمڕۆ،کە ئەندام بێت لە سۆشیال ئەنتەر ناسیۆنالی جیهانداو سکرتێرەکەی جێگری سەرۆکی هەمان ڕێکخراو، لە هەمان کاتیشدا سەرۆك کۆماری عێراقی فیدراڵ بێت،کەم نییە ئەو یەکێتییەی هەمیشە کانگای گۆڕان و داهێنانەکان بووەو دەش بێت،ئەو یەکێتییەی لە ڕۆژ هەلآتی ناوەڕاستیشدا بێ وێنەیە.لە ژێری وئازایی وڕاپەڕاندندا،بێ لەوێنەی لە بەدیهێنانی ماف وداخوازییەکانی نەتەوەکەی،لە قوربانیداندا هەر بێ وێنەیە،یەکێتی سەربەرزترین حزبی کە زۆر ترین سەرکردەی شەهید بوو.

هەر یەکێتی بوو،بە دووژمنانی ووت ئالآی خەبات،ئالآی کوردستان ناکەوێ ونانەوێ،ئەوەشی بە دروست بوونەوەی شۆڕشی نوێ وبەکردەوەی ڕاگەیاند.

ئەو یەکێتییەی باکی بەکەس نییە لەپێناو کوردو کوردستاندا،جوامێرو ژیرانە لەگەڵ هەموو پێشهات و ڕووداوەکاندا گوزەر دەکات وتا ئەمڕۆ لە خەباتیدا بۆ ساتێ سارد نەبۆتەوە.

سەدام حسێن،سەرۆکی لە سێدارە دراوی ڕژێمی بەعس،پێ دەکەنی ودەیوت(تاڵەبان لەپشت شاخەکانی مامەندەوە،دەیەوێت گۆڕانکاری لە دەستوری عێراق بکات)،بەڵێ نەك هەر گۆڕانکاری،بەڵکو تەواوی دەستوری عێراقی گۆڕی)بێگومان حزب ولایەنەکانی عێراق وهێزەکانی هاو پەیمانیش ڕۆڵ گێر بوون.

هەر ئەو سەدامە،تەنهاناسنامەی عێراقی لە جەلال تاڵەبانی قەدەغـە کرد،کەچی جـەلال تاڵەبانی لە سێدارەدانی سەدام حسێنی ئیمزا نەکرد،ئەمەیە سەرکردەی یەکێتی.

جاران یەکێتی بە هەوڵ وتەقەلای زۆر،بە دوای هاوکاری ولاتـی زۆر بـچوکدا دەگەڕا،هـەتا پشتگیری زیاتر بۆ دۆزی کوردپەیدا بکات، زۆر ئەستەم بووتەنانـەت لـە زۆریانـدا وەڵامیشی وەرنەدەگرتەوە،ئەمێستا یەکێتی لەو ولاتـەزلهێزەکانی دنیـادا سـەنگین و هاوپەیمانە،لـە زۆر کۆنگرەی نێودەوڵەتیدا میوان و بەشدارە،بەشێوازی فەرمی و دەسـتوری،ولاتان پێشوازی لـێ دەکەن.

## تەقینەوەی کێشەکانی ناوخۆی یەکێتی

یەکێتی،هەر لەگەڵ دامەزراندنیدا لە چەند تەیارێك درووسـت بوو،لـەو کاتـەوە هەمیـشە بۆ چونی جیاواز لەناو ئەم حیزبەدا هەبووە،کەواتـە دەردەکـەوێت جیـا بوونـەوەکان ناچـنە ئـەو بابەوە،واتـە مەسـەلەکە بـیرو بۆچـوونی جیـاواز نییـە لـە پێنـاوی حیزبەکەدا،بـەڵکو سـەربەخۆیی و ویـستنی هەنـدێك بـۆ گەیـشتن بـە دەسەلات،دەسـەلات وەك سـەرۆك،هەتا هەژموونی بەسەر هەموو ئۆرگانەکاندا هەبێت.

لەبەر ئەوەی زۆربەی سەرکردەکانی یەکێتی،کەسانی مانـدوو شۆڕشـگێڕن و کاریگـەرییان هەیـەو پێگـەو سـەنگی خۆیـان هەیە،ئەمـە وای کردووە،هـەر یـەك لـەو چـەند سەرکردەیە،هەمیشە گەیشتن بە پلەی سەرۆك تەزوویەك بێت و زۆر جار لێیـان بدات،بۆیـە دەبیـنین زۆربـەی کـات نـاز دەکـەن بەسـەر حیزبدا،ئـەم هۆکـارە وای کـردووە کێـشەکان هـەرجارەو لەوێـستگەیەکی خەباتـدا بتەقنـەوەو تەزووکـە بـە هێـز بێت،بـەجۆرێك لـەناو یەکێتی دەرپەڕێنێ.

وەك بینیمان نەوشیروان مستەفا دوایین لەو وێستگانەیە کە تەزووەکە لێیـداو خـەون بـە دەسەلاتی(سەرۆکایەتی)باوکی پێ بەجێبهێڵێ ویەکێتی بخاتەوە ڕێکخستنەوەی خۆی.چونکە هەمیشە یەکێتی لەم کاتانەیدا دەستەکانی لە هەنگاونان کردۆتەوە دەربەست بە کێشەکانی کـاریکردووەو دواجـار بـە سـەرکەوتووتر هاتۆتـەوە ساحەکە،ئەوەشـی کـە لەیـەکێتی ڕۆیشتووە،تەنها لە خۆی چووە!.

## زیانەکانی دۆخی ئێستای یەکێتی

لەم کاتەدا ئەم هەوڵی پارچە لـێ کردنەوەیـە سلبیاتی لـە ئیجابیـات زۆر ترە،لـە ئێـستادا یەکێتی ئەو لاشەیەیە کە شێرەکانی خـۆی پارچـەی لـێ دەکەنـەوە و لـێ ی دەخۆن،ئەمـەش

قسەیەکی خوالێ خۆش بوو(کە بەرپرسێکی ناسراوی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو دێنێتە پێشەوە کە وتبووی:

(ئەگەر واز لە یەکێتیەکان بهێنی خۆیان،خۆیان دەخۆن،کەچی کە تووشی شەڕێك دەبن لەگەڵ هێزێکی دەرەکیان،ئەڵێ سەد ساڵە بران)، بەڕاستی یەکێتییەکان خۆیان دەخۆن!.

لەم کێشانەدا هەمیشە دوژمن یاریزانێکی بەلیاقەیەو دەتوانێ ساحەکە بقۆزێتەوە،هەر زوو پڕو پاگەندەکانی دەخاتە ناوەوەو مە خابن کوڕەکانیش بەر دەبنە باوکیان کە یەکێتییە.ئەوەتا هەندێك لە ڕۆشنبیرەکانیش کەوتونەتە هەڵەوەو دەتوانرێ بوترێ ئەوانیش پێیان خۆشە،چونکە بەڕاستی هەندێکیان سلبیانە ڕۆڵ دەگێڕن،فەرهاد پیربالْ کەنوسەرێکی دیارە لە لێدوانێکدا دەڵێ زۆرم پێ خۆشە بەربوونەتە یەك!!.

برایەکی بەڕێز کەلە(پاراستن) دەزگا هەوالگرییەکەی پارتی کار دەکات،پێ ی ووتم:پاراستن کار لەسەر ئەم ململانێیەی ناو خۆی یەکێتی دەکات،ووتارو ڕەخنەو بوختانەکانی هەردوولا کۆدەکاتەوەو لە ڕۆژی خۆیدا سوودیان لێ وەردەگرێت،بەلام نکوڵی لەوە کردکە ئەوان دەستیان لەتێکدان و گەرمکردن بارگرژیەکان هەبێ،بەلام ئەمە تاچەند ڕاستە یان ناڕاستە،ئەوە ڕەنگە ئایندە وەلامی بداتەوە،یاخود خوێندنەوەما بۆ مێژوو وەلامەکانما بەچنگ بخات.

یەکێکی دیکە لە خراپیەکانی ئەم دۆخەی بە سەر یەکێتیدا هاتووە،سەیرکردنی ناحەزانە،ئەوە ئەو ڕۆژەیە ئەوان ویستیان،بێ بلیت بینەری یارییەکە بن و مولاکیمەکانی یەکێتی یەکتر بپرۆکێنێنن،هەروەها دەست خستنە ناو کێشەکانەوە بەشێوازی لایەنگری کە ئەمەیان لە هەموویان زیاتر بەنزین بە ئاگرەکەدا دەکات.

زیانێکی دیکە کە مەترسی بۆ سەر هەرێمی کوردستان هەیە بەگشتی،ئەگەری تێکدانی هاوپەیمانێتییەکانە کە یەکێتی هەیەتی لەگەڵ ئەحزابەکانی عێراقدا،بە تایبەت ئەو هاوپەیمانییە بە هێزەی کە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستاندا هەیەتی،کە دواجار هاوپەیمانی کوردستانیش لە بەغدا پەکدەخات،کە ئەمەیان خەونی زۆرترین دوژمنانی کوردە،کە پێوەی دەیەهاو سەدەها بەرژەوەندی کورد تیا دەچن،لەوانە(ناوچە ناکۆکی لەسەرەکان وبودجەو پێشمەرگەو..هتد).

**سوودەکانی ئەم دۆخە**

یەکێتی بەوەوە جوانە کە هەمیشە نەێ دەبێتەوە،مێژوو پێمان دەڵێت:جیا بوونەوەکان لەم حزبە،گووڕی زیاتر بە نوێ بوونەوەکە دەدەن.ئەم جارەوەك دەبینین یەکێتی چۆن گورج و گۆڵ بۆتەوەو هاکا بووەوە بە یەکێتییەکەی شاخ کە بازووی هێند بەهێزبوو،کە بەغداو تاران ئەنکەرەو دیمەشق لەدەست شکاندنەوەی دەترسان.

ئەوەتا لەم جارەیدا نەوشیروان مستەفا بەهەڵەیەکدا چووە،کە خراپترین کەسەکان لێی ئالاون و یەکێتی بەجۆرێك پاك بۆتەوەکە لە لە ڕابردووی ناترسێ،هەڵبەت لای کاك نەوشیروان کەسانی باش و پاکیشی تیایە،بەڵام کەمینەن.

دەبوا نەوشیروان مستەفا لەم جیابوونەوەیدا،سەرەتاکەی پشتی بە(بۆر)ی نەبەستایە،بەڵکو بە پوختی بۆی بچووایە،دەبینین،ئەوانەی پێشتر لەسەر کاری دزێوو گەندەڵی داوێن پیسی دەرکراون،ئێستا جلی کاك نەوشیروانێکیان لەبەر کردووە کە ڕۆژێ بووە ئەو پیاوە جێی فەخر بووە،بەداخەوە،نەدەبوو ئەو هەموو هەموو ئەندامە دژ بەیەکە وەربگیرانایە،بەڕاستی وەك دەڵێن(گردە ووشە)بۆتە حەمام،هەرچی ناپاکە دەچێتە ئەوێ، ئیتر ناوی ڕیفۆرم وەردەگرێ وپاك دەبێتەوە!!.

سودێکی دیکەشی لەوەدایە کە کرانەوەی یەکێتی دەردەخات، پێچەوانەی ئەو حیزبانەی کە مەنگ بوون، هەروەها سودێکی ئەوەشی تیادایە کە یەکێتی کورە ڕاستەقینەکانی خۆی بۆ دەربکەوێ هێلکەی پیس لە هێلکەی پاك جیا دەکاتەوە.

دیداری:سۆران عمر

کارگێری مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان {مەلا بەختیار}تایبەت بەگۆڤاری رێگا ڕاشکاوانەو بۆ یەکەم جار بەو جۆرە لەسەر ناکۆکی کۆنی مام جەلال و نەوشیروان مستەفاو گرفتە ناوخۆییەکانی کۆن وئێستای یەکێتی و مەسەلەی گردەکەو مەرامی لیستی گۆڕان و ئاکامەکانی هەڵبژاردن دەدوێت.

رێگا: یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کە بەحزبێکی تۆکمەو زۆرکاتیش بەقولەی قاف ناو دەبرا،چی وای لێ کرد ئێستە ئەندامەکانی پۆل پۆل بشکێنەوەو تووشی قەیرانێکی گەورەی ناو خۆیی ببێت؟

مەلا بەختیار: بەدرێژای مێژووی یەکێتی لە هەناویدا ململانێ هەبووە،ڕەوتی جیاواز هەبووە،ڕەخنە هەبووە،جیا بوونەوەو یەکگرتنەوە لەناویدا هەبووە،کۆمەڵە ساڵی(١٩٧٠) دامەزراوە،کەچی دوای دوو مانگ تێدا جیا بوونەوە ڕوویدا.

ئەم کێشەیەی ئێستا کەلەکۆمپانیای ووشە کۆبۆتەوەولە لیستی گۆڕان- دابەرجەستە بووە،ڕەگ وریشەکەی بۆ ساڵانی(٨٤)دەگەڕێتەوە،ئەوەش لەسەر مەسەلەی گفتو گۆ بوو لەگەڵ ڕژێم،باڵێك لەناو یەکێتی پێی وا بووگفتو گۆکردن لەگەڵ ڕژێم دەگاتە سەر ئەنجام،مام جەلال و باڵێکی تر پێ ی وابوو گفتو گۆلەگەڵ ڕژێم هیچ ئەنجامێکی نابێت،ئەمە بووە هۆی ئەوەی وردە وردە ناکۆکییەکانی ناو یەکێتی لە نێوان سەرکردە ئەساسیەکانیشدا زەق بێت، لەوەش زیاتر دەتوانم بلێم:بەرپرسی کۆمپانیای ووشە لەگەڵ مام جەلال لە دامەزراندنی کۆمەڵەوە ناکۆکی لە نێوانیاندا هەیە،لەسەر ئەوەی ناوبراو پێ ی باش نەبوو مام جەلال لە کۆمەڵەدائیش بکات، لەگەڵ شەهید شەهابیش ناکۆك بوون،هەر لە سەرەتاوە ئەو گروپەی کە لەگەڵ ئەو بوون،لە دامەزرێنەری کۆمەڵە نەبوون.

رێگا: کەواتە کاك نەوشیروان دامەزرێنەری کۆمەڵە نییە؟

مەلا بەختیار: شەهید شەهاب دەست پێشخەری لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا کرد،بۆیە ئەوەی ئێستا هەیە ئەوەندەی پەیوەندی بە کێشەی ئیداری ئەمڕۆوە هەیە،ئەوە هەموو شتێك نییە،ئەم ناکۆکیانە ڕەگ وڕیشەی مێژوویی هەیە،بەرە بەرە ناکۆکیەکان قوڵ بوون.

رێگا: تۆ لەو کاتەدا لەکوێی ئەم کێشانەدا بویت؟

مەلا بەختیار: من لاویك بووم تازە چوو بوومە دونیای سیاسەتەوە،دوور بووم لەو کێشانە،تاکو ساڵی(١٩٧٥)کە کۆمەڵە بەر جەزرەبەی لێدان و گرتنی سەرکردایەتی و کادرەکانی کەوت،لەوە بەدواوە هاتم خۆم شاردەوە لە سلێمانی،ئەوسا کەوتم بەسەر ناکۆکیەکان و ململانێی جەمسەرەکانی کۆمەڵە.

ڕێگا: ئاڵای شۆڕش چی ناکۆکییەکی هەبوو لەگەڵ کۆمەڵەدا؟

مەلا بەختیار: ئاڵای شۆڕشیش هەربەشێکە لە درێژەی ئەو هاوکێشەیەی کە هەیە،ئەو کاتە لەناو شۆڕشدا ناکۆکیەکان جگە لەمەسەلەی ئایدۆلۆژی،ڕەهەندیسیاسی جیاوازیشی بە خۆیەوە دی،ئەویش لەسەر ئەوەی ئایا کێشەی کورد لە هەر چوار پارچەکەی کوردستان یەك مەسەلەیە،یان لە قۆناغی رزگاری و دیموکراسیدا.

لەناو چوار چێوەی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان لە ناودا دابەشکراوە چوار مەسەلەیە،ئەمە جگە لەمەسەلەی چۆنیتی بەڕێوەبردنی شۆڕش،چۆنیەتی مامەڵەی لەگەڵ کادیرانی یەکێتی ، ئەوکردارو رەفتارانەی لەتیپەکان دەکران، لەهەرێم و کەرتەکان پاشان تێروانینی جیاوازیش لەسەر شەڕی ناوخۆسەری هەڵدا.

پراکتێکی شۆڕشگێرانەئەوکاتە لەکەدار دەکرا،لەلایەن کۆمەڵێك لەو خەڵکانەوە کەدەیانویست بەئاراستەی زەبروزەنگی سەربازی کۆنترۆڵی دامودەزگاکانی ناو یەکێتی بکەن.

ڕێگا:ئایا ناکۆکی ئاڵایشۆڕش لەگەڵ کۆمەڵەئەوەبوو کەئێستەش بەرامبەربەیەك ڕەنگدانەوەی هەبێت؟

مەلا بەختیار: بەهیچ شێوەیەك کێشەکانی ئەمڕۆ نابەستمەوە بەکێشەکانی ڕابردووەوە،ئەوە جۆرێك لە تۆمەتە بۆ چەواشە کردنی قەواعیدی یەکێتی و رای گشتی،ئەوە تۆمەتێکە دەیانەوێت بڵێن(منی مەلابەختیار ئەم بەرگرییە بۆیە لە یەکێتی دەکەم،چونکە کۆنیش کێشەکەم هەبووە لەگەڵ لێپرسراوی کۆمپانیای ووشە)کە لەڕاستیدا وانییە،بەبەڵگەی ئەوەی ساڵی(٢٠٠٦)لێپرسراوی کۆمپانیای ووشە لە دانیشتنی مەکتەب سیاسی لە ماڵی مام جەلال لە بەغدا یەکێتی جێهێشت،من ڕاستگۆیانە دڵتەنگی خۆم دەربڕی و زیان وخراپی ئەو هەڵوێستەم ڕونکردەوە،لێپرسراوی کۆمپانیای وشە کە گەڕابووەوە،لەناو هاوڕێکانی خۆیدا ووتبوی: تەنیامەلا بەختیار ڕاستگۆیانە نیگەرانی دەربڕیووەوە لەوەی یەکێتی بەجێ بهێڵم،لەبەر ئەوە من پێم وایە ئەو برادەرانە باش دەزانن کێشەی ئێستا پەیوەندی بە ڕابردووەوە نییە.

ڕێگا:ناکۆکییەکان ڕیشەی مێژوورییان هەیە،تۆ لە کوێی ئەو ناکۆکیانەدا بوویت؟

مەلا بەختیار:ڕاستیت دەوێت،ناکۆکیەکانلە سەرەتای دروست بوونی کۆمەڵەوە لە نێوان مام جەلال وهاوڕێکانی هەبوو کە ئەو کاتە من هیچیانم نەدیبوو،ناکۆکیەکانی کۆمپانیای وشەو لیستی گۆڕان-یش لەناو یەکێتی –داڕاستەوخۆ بە شێوەی سەرەکی دژی مام جەلالە بۆ ئەوەی دەست لە یەکێتی هەڵبگرێت،ئەوان پێیان وایە مام جەلال ڕۆڵی تەواو بووەو هەلو مەرجی نوێ هاتۆتە پێشەوە،نەك هەر ئەوە،زۆر جار ئەو قسانەمان بیستووە کەلێپرسراوی کۆمپانیای ووشە وتویەتی هەقی وایە هەموو ئەم سەرکردایەتی و مەکتەب سیاسیانە واز بهێننومەکتەب سیاسی و سەرکردایەتی تەسلیم بەسەرکردایەتی ومەکتەب سیاسیەکی نوێ بکرێت،ئەوەی لە ڕاگەیاندنەکەی(ڕەگ)دا هاتبوو،ڕێکقسەی لێپرسراوی کۆمپانیای ووشەیە.

ڕێگا:ئەمە تا چەند قابیلی قبوڵ بووە؟بۆ نەگۆڕێن هەر ئەو کەسانە مەکتەب سیاسی بن کە چەندین ساڵە بەرپرسن؟

مەلا بەختیار:بێگومان کەس قبوڵ ناکات،گۆران کاریش لەمەکتەب سیاسی وسکرتێری حزبەکاندا بەپێشنیارو پیلان گێڕی و ڕق ناکرێت،ئەوە بە گۆڕانکاری ئاسایی کۆنفراس و کۆنگرە دەکرێت،لە مێژووی هیچ حزبێکدا نەبووەبڵێت ئەوسەرکردایەتی وسکرتێرە خوا حافیز قۆناغەکەیان تەواو بووە.

ڕێگا:بۆچی نەوشیروان مستەفا ساڵی(٢٠٠٦)یەکێتی نیشتیمانی جێهێشت؟ناکۆکییەکان هی ئەوە نەبوون چارە سەر بکرێن؟

مەلا بەختیار:سەر ئەنجامی کەڵەکە بوونی ئەو کێشەو ناکۆکییانەی پێشوو لای ئەو گەشتە بنەبەست،ئەو پێ ی وابوو بچێت دەزگایەکی توێژینەوە دروست بکات باشترە چونکە چیکە ناتوانێت لە ناو یەکێتی درێژە بە سیاسەت بدات،بەلاَم من پێم وابوو کە ئەو ئەو بڕیارەیدا،هەڵەیەکی ستڕا تیژی کرد.

ڕێگا: بەلاَم ئەوانەی لە نزیك ئەون پێیان وانییە خاوەنی فیکرو نەفەس و سەبرێکی درێژیان هەیە بە پێچەوانەی ئەوەی تۆ دەیڵێیت؟

مەلا بەختیار:دەتوانم بڵێم پێچەوانەکەی وایە،بەشی زۆری فەرماندەسەربازییەکان هەندێك لە کادیرە سیاسیەکان کە لەدەوری کۆبوونەتەوە ئەوان کەکاتی خۆی لەسەر پێشێلکاری سزا دراون،لەسەر گەندەڵی،لە سەرکاری نابەجێ،ڕۆژێك دێت ئەو بەڵگە نامە لە سەر پێشێلکاری ئەوانە دەخرێنە بەر ڕای گشتی.

ڕێگا:پێت وایە لەم قۆناغەدا قوڵ بوونەوەی کێشەو بێ ئیمکانێتی وبێ موچەی فشاری زۆری لەسەر نەوشیروان مستەفا دروست کردووە؟•

مەلا بەختیار:وەك پێشتروتم،لێپرسراوی کۆمپانیای ووشە هەڵەیەکی ستراتیژی کرد لەیەکێتی چووە دەرەوە،لەناویەکێتی-دادەیتوانی پێگەی خۆی تۆکمەتر بکات، دەیتوانی ئەوقابیلیەت وڕۆشنبیریەی کە هەیەتی باشتر گرەوی پێ بدات،ئەوە(٣)ساڵە چۆتە دەرەوەی یکێتی ڕەنگ بوو لەم(٣)ساڵەدا کۆمەڵێك گۆڕانکاری باشی بکردایە،بەبێ گەمان ئەگەر ئەو گۆڕان کارییە ئەنجام بدرایە،بەهاوکاری هەمووومان،ئێستا باشتر لەم هەڵبژاردنەدا دەهاتە مەیدان.

ڕێگا:ئەو بیانوە تاچەند وایە کە دەڵێن لەناو خۆی یەکێتی نیشتیمانی گۆڕانکاریمان پێ نەکرا بۆیە هاتینە دەرەوەی یەکێتی نیشتیمانی؟

مەلا بەختیار:ناتوانم بڵێم ئەو بیانووە هەمووی بەتاڵە، بەلام دەتوانم بڵێم کۆی هەموویەو پاسەوانەی دەیهێننەوە، بای ئەوە نەبوو بچێتە دەرەوەی یەکێتی نیشتمانی، نەخۆی و نەهاوڕێکانی، باوەڕم وایە بڕ یاری دابوو لەناو یەکێتی نەمێنێت،ئەو لەناو یەکێتی ئیشی کرد بەو ئاڕاستەیەی خۆی دەیەوێت کۆنترۆڵ بکرێت کەنرا، نەخشەکێشا یەکێتی تووشی قەیرانێکە گەورە بکات،تاقیکردنەوەشی هەیە،لە سەردەمی پارتی شۆڕش گێڕاندا(جەلالی)ساڵی(١٩٧٠)،دەستی هەبوو لە هەڵوەشاندنەوەی،ئۆباڵی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ڕەنجدەران،ساڵی(١٩٨٩)لە ئەستۆی بەر پرسیاری کۆمپانیای ووشەدایە،پێ ی وابوو لەسێ یەمین ئەزموونیشدا بۆ تێك وپێکدانی یەکێتیش بۆی دەچێتە سەر،بەلام جیاوازی سەردەمی پارتی شۆڕش گێڕان و کۆمەڵەو یەکێتی لەوەدایە پارتی شۆڕش گێڕان لەهەلو مەرجی بەیانی ئازاردا ڕوویدا،بۆیە توانیان هەڵیوەشێننەوە،کۆمەڵەی ڕەنجدەرانیش لە سەردەمی ئەنفال و حاڵەتێکی سایکۆلۆژی خراپدا بۆی چووە سەر هەڵیوەسێنێتەوە ساڵی پاریش دانی پیاناوە کەهەڵەی کردووە،بەلام یەکێتی ئێستا لە دەسەلاتدایەو پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ هێزەکانی دونیادا هەیە،یەکێتی ئەو بیروباوەڕو سیاسەت وستراتیژەی هەیەتی،زۆر بەهێزەو سەدان هەزار کەسی لە خۆی کردۆتەوە کەبەرگری لە خۆی بکات،لەبەر ئەوەی نەی توانی سێیەمین هەولی بۆ هەڵوەشاندنەوەی دوای پارتی شۆڕش گێڕان و کۆمەڵە سەربگرێت،بۆیە ناچار چۆتە دەرەوەی یەکێتی تا بەنەخشەیەکی ترو لەژێر دروشمی گۆڕان-دا پلانەکەی بهێنێتە دی..

ئێستە ئەوەی کە بۆی نەچۆتە سەر،دەیەوێت لە دەرەوەی یە کێتی ئەو بودیلە دروست بکات،من پێم وایە قەناعەتی خۆشمە هیوادارم هەڵە بم،ئەوان ئەگەر بۆیان بکرایە پارو پێرار دەدا باری ئەمنی لەگرێژنە دەربکەن وخۆ پیشاندانی گەورە دروست بکەن،کەباری ئەمنیش تێکچوو،وەك ئەوروپای شەرقی وچەند وڵاتێکی ئاسیای ناوەڕاست،حکومەت دەگۆڕێت،حزب تێکدەچێت،ولات توشی کارەساتی گەورە دەبێت.

ئەوان وویستیان ئەمە بکەن،چەند هەولێکیشیاندا بۆیان نەچووە سەر، لەسلێمانی و گەرمیان وهەڵەبجەو رانیە خۆپیشاندان کرا،لەهەندێکیان دەستیان هەبوو،لەهەندێکیشیاندا پێیان خۆش بوو،ئەوەیان دەکردە بیانوو بۆ ئەوەی فشاری زیاتر بخەنە سەریەکێتی بۆ سەپاندنی مەرامەکانیان لەناو یەکێتیدا.

ڕێگا:هەندێك لەو برادەرانە دەڵێن کاك بەختیار تاکو ڕاپەڕین لەزینداندا بووەوئاگاداری بارودۆخی یەکێتی نەبووە،کە ئێستا ئەو یەکێتی بوون بەئێمە دەفرۆشێتەوە؟چونکە ئەوانە پێ یان وایە لەسەرەتای شۆڕشەوە ئەوانە هەبوون؟

مەلا بەختیار: ئەم پرسیارەم پێ خۆشەو پێشم ناخۆشە،پێم خۆشە لەبەر ئەوەی دەبێت وەلامت بدەمەوەوهەندێك ڕاستی بلێم،پێم ناخۆشە لەبەر ئەوەی کاتی ئەوە نەهاتووە ڕووداوەکانی ڕابردوو بوروژێنین.

من لە ساڵی(١٩٧٠)ەوە کۆمەڵە بووم،لە(١٩٧٥/٩/٥)ئیختیفام کردووە،سەرەتای ساڵی(١٩٧٦)بەرپرسی هەموو ڕێکخستنەکانی یەکێتی بووم لەسەرتاسەری کوردستان بە ناوچەکانی عێراقیشەوە،دوایە بەرپرسی پێشمەرگەکانی ناو شار بووم،لە شۆڕشی نوێ(١٩٧٦)بە بڕیاری شەهید ئارام و کۆمیتەی هەرێمەکان سەرەتا من نەچومە دەرەوە،تاکو مانگی(١٢)مامەوە،لە بەرئەوەی سەرپەرشتی پێشمەرگەکانی ناو شارو پێشمەرگەوشۆڕش بووم،دوای لێدانی پارێزگای سلێمانی لە(١٩٧٦/١٢/٢١)چوومە دەرەوە.

ئەگەر کەسێ هەبێ ئەوە بە شانازی بزانن کەمنیان گرتووە،من پێم وایە ئەوە مانای شەرمەزارییە بۆیان،ئەو شەرمەزارییەی کەلەسەر بیروڕای ئازاد وجیاواز پەلامار دراین،ئەمە مانای شانازی نییە،ئەو بەیاننییەی کە هاتونەتە سەرمان ئەوە کاك عیمادو مامۆستا پشکۆ شایەتن،هەرپاسەوانم نەبووە،من قەت ئەوەم ڕەچاو نەکردووە لەناو یەکێتیدا کەسانێك هەبن دیموکراسییەکە تاکو ئەو ڕادەیە سەربڕن کەسێ لە تاوانی گەورەش نەکەنەوە،لەسەر هیچیش ناتەنیا لەسەر جیاوازی ڕێبازی سیاسی،ئەگینا بایی ئەوە دەمتوانی لە قەرەداغ و

بازیان(١٥٠)پێشمەرگە لە دەوری خۆم بکەمەوە، یان پێشتر بگەمە شوێنی دوورە دەستی هێزی یەکێتی،ئەوە بەدابڕانی من دەزانن لەسیاسەت؟یاخود لەسەر بیرو باوەڕو لەسەر دیموکراسی ولەسەر پاکێتی شۆڕش ئەوان تاوانیان کردووە بەرامبەر بەمن وهاوڕێکانم،ئەمە پرسیارەو لە ویژدانی ئەوانی دەکەم؟

پاشان وەرە تەمەنی سیاسی من وتەمەنی سیاسی ئەوانەی وادەڵێن بەراورد بکەن،کاك نەوشیروان ساڵی(١٩٧٧)هاتۆتەوە،من ساڵی(١٩٧٦)پێشمەرگە بووم، کاك نەوشیروان لەساڵی(١٩٧٢)تاکو ساڵی(١٩٧٧)هیچ پەیوەندییەکی بەکۆمەڵەو یەکێتیەوە نەبوو،من ئەو کاتە کۆمەڵە بووم،نەك ئەوەش من ساڵی(١٩٧٣)فەرمانی گرتنم دەرچووە،ساڵی(١٩٧٥)دیسان فەرمانی گرتنم دەرچۆتەوە،ساڵی(١٩٧٦)یش بەرپرسی تەواوی ڕێکخستنەکانی یەکێتی بووم لە کوردستان وعێراقدا،کێ لەوانەی لە گردەکەن دەتوانێت نکوڵی لەمە بکات؟لەبەر ئەوە ئەو قسانە نەکرێت باشترە،من حەزناکەم بچینە ناو ئەو شتومڕەوە،تێناگەم چۆن جەلاد شانازی بە کوشتنی قوربانییەوە دەکات و ڕوویشی بێ ئێستاش لاف دیموکراسی و گۆڕان لێ بدات؟!.بەڕاستی تێناگەم!تەحەداشیان دەکەم کە دوای ڕاپەڕینی ساڵی(١٩٩١)ودوای ڕووخانی سەدام کە زۆرترین بەڵگە نامەی سەدام دەستی یەکێتی کەوت،تەحەدایان دەکەم یەك ووشە کە مایەی شەرمەزاری بێت لە سەر من وسەرکردە ئەساسییەکانی ئالای شۆڕش بڵاو بکەنەوە،لەبەرئەوە ئەوانەی ئەو قسانە دەکەن،هەق وایە جوان ئاوڕ لە مێژوو بدەنەوە.

**ڕێگا: هەندێك پێ ی وایە ئەم هەڵبژاردنە نەوشیروان مستەفا لەهەوڵی تۆڵە کردنەوەیدایە لە یەکێتی**

**مەلا بەختیار:**بێگومان ئەو بەرنامەیەی هەی بوو بە م هەڵبژاردنە،خستییە چوارچێوەی شەریعەت و یاساییەوە،ئەم برایەیەکێکە لەو کەسانەی ئەو بیرو باوەڕو پیلانانەی کە ئاشکرایان دەکات،کەمترە لەوەی باسیان ناکات بۆ هەلوو مەرجی گونجاو دوایان دەخات،لەبەر ئەوە ئێستا بیرو بۆ چونەکانی تری لەم قۆناغەدا خستە چوار چێوەی هەڵبژاردنەوە،بەناوی دژایەتی گەندەڵی بۆ گۆڕان،بەلام ئەمە بۆ شاردنەوەی پیلانە ڕاستەقینە باس نەکراوەکانێتی.

من خۆم باوەڕم وایە ئەگەر دەربچێت ولیستی زۆرینە بە دەست بهێنێت،بێگومان ئەو کاتە ئەو بۆچونانەی کە ئێستا دەری نەبڕیون،ئەوە دەکاتە ڕێبازی سەرەکی ئیشکردنی.

**ڕێگا:ئەو بۆچونانە چین کە ئەو کتە ئەوە دەکات بەنەهجی سەرەکی خۆی؟**

مەلا بەختیار: بێگومان هەوڵی ئەوە دەدات بە پاساوی جۆراو جۆر نەخشە شاردراوەکانی بهێنێتە دی دژی یەکێتی وهەروەها دژی پارتیش.

ڕێگا:بەرامبەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان چۆن دەبێت لەکاتێکدا زۆرێك پێ یان وایە نەوشیروان مستەفا باوەڕی بە پێکەوە ژیانی پارتی کەمترە؟

مەلا بەختیار:ئەگەر سەیری مێژوو بکەین لە ڕاستیدا ناتوانی بڵێ ی ئەم بەر پرسیارێتییە هەمووی لەسەر لێپرسراوی کۆمپانیای ووشەیە،ئەگەر ساڵنامەی شەڕی ناخۆش هەڵبدەینەوە هەڵبەتە بێویژدانییە مەسولییەتەکە هەمووی بخەینە سەر ئەو،چونکە مەسائیلی تر هەیە چ بۆ یەکێتی چ بۆ پارتی،چ بۆ لایەنەکانی تریش،بەلام ئایا ناوبراو ئێستاش ناکۆکە لەگەڵ پارتی؟بەڵێ ئێستاش لەگەڵ پارتی ناکۆکە،لەو باوەڕەدام سەرۆکی لیستی گۆڕان تەجاوزی ڕابردووی بەرامبەر بە پارتی نەکردووە،ئەمە هەڵەی فیکری کاك نەوشیروانە لە سیاسەتدا،ئێمە هەمووومان لە ناو گەرمەی ڕوداوەکاندا بوین،کەسمان بێبەری نین لە شەڕی ناوخۆو لە هێرش و بەرگری،ئەوەی فیشەکێکی تەقاند بێت ئەوەی بەشداری شەڕێکی جەبهەیی کرد بێت،بەشداری شەڕی ناوخۆیە،ئەو قۆناغە بەو جۆرە بووە.

لەبەر ئەوە ئەگەر ئێستا بەحکومی ئەوەی پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی،پەیوەندییەکی گونجاوی ستراتیژییە،بمانەوێت خۆمان بێبەری بکەین لە ڕابردوو،یان پارتیش بیەوێت پەرێزی خۆی پاکژ پیشان بدات لە شەڕی ناوخۆ، هیچمان ناتوانین لە سیاسەتدا ئەوە گرنگە کەقۆناغ گۆڕا تۆش تەجاوزی قۆناغی ڕابردوو بکەیت و لەگەڵقۆناغی نوێ و ئەرکەکانی بگونجێنێت، نەك لە ڕابردوودا بچەقێت.

من پێم وابێ توانیومانە بەم ڕێککەوتنە ستراتیژییەی کە کردومانە،تەجاوزی قۆناغی ڕابردوو بکەین.

ڕێگا:هۆی چییە کاك نەوشیروان خۆی لە شەڕی ناوخۆ دەردەکات بە تایبەت لە دواین نوسیندا بە ناوی خەون و مۆتەکە؟

مەلا بەختیار:لەو نوسینەدا باسی شەڕی ناوخۆ لە سەرەتاوە ناکات،بەڵکو لە دوای ساڵی(١٩٩٤)باسی شەڕی ناوخۆ دەکات،شەڕی نتوخۆ لە ساڵی(١٩٧٦)دوەهەڵگیرساوە،ئەو شتانەی بلاوی کردۆتەوە شتی مەنتیقی تێدایە،هەرچەندە کاتیشی نەبووئەوە رۆشنە کە ئەو بەشێکە لەو واقیعەی کە شەڕێکی ناوخۆی تێدا خولقاوە.

ڕێگا:ئەوەی قسەی زۆری لەسەر دەکرێت مەسەلەی کوشتنی شیوعیەکانی پشت ئاشانە ئەمە چۆن بوو؟

مەلا بەختیار:کاك نەوشیروان لە ساڵی(١٩٨١)دا هاتە خوارەوە،کێشەی کاك محەمەدی حاجی مەحمود ڕووی دابوو،لەلایەن سەرکردایەتییەوە من نێردرام بۆ چارەسەری کێشەکان،بە چوار ئەندامی سەرکردایەتی و مەکتەب سیاسیان وت کەس ئامادە نەبوو بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە بڕوات،من کاتی خۆی ئامر هەرێمی هەورامان بووم،باش ناوچەکە شارەزا بووم،کاك نەوشیروان هات بۆ ئەو ناوچەیە،نامەیەکی بچوکی لە گوندی پارێزان بۆ من نووسی بوو دەڵێت(هاتووم ئەچم بۆ شارەزوور بۆ ئیش وکاری خێزانی خۆم،تکایە ئاگادار بە)،کە نامەکەم پێگەیشت وتم هەڵە دەکات بەو شێوەیە بڕوات،بەپەلە شەهید فەرەیدون حەمە ساڵح و(٢٠)پێشمەرگەم نارد ووتم لە پاڕەزان و ئەو ناوە بیدۆزنەوە مەهێڵن بچێت بۆ شارەزوور هەتا خۆم دێم،تاکو پێشمەرگەکان گەیشتبوون ئەو ڕۆیشتبوو،ئەمەش مامۆستا شاهۆ مامۆستا پشکۆ کاك بەکری حاجی سەفەرو فەرماندەکانی ئەو کاتە هەمووشایەتن.

کە ڕۆیشتبوو،لە قەویلە تووشی ئەو کێشەیە بووەوە،حزبی سۆشیالستیش ڕاست ناکەن دەڵێن گرتوومانە،خۆی تەسلیم کردبوو،ئەو لەماڵی حاجی عەلی قەویلە دەبێت،سۆسیالیست دەگەنە ئەوێ،کاك نەوشیروان نامەیەك دەنوسێت ودەیدات بە حاجی عەلی دەڵێت بۆیان بەرە دەمەوێت چاوم پێیان بکەوێت، ژنەکەی حاجی عەلی دەڵێت(دەستمان دامێنت ئەمانە ئەو شتە نازانن دەتگرتن،،کاك نەوشیروان دەڵێت بە پێچەوانەوە،ئەگەر بێنە ژوورەوە من لێرە بدۆزنەوە خراپترە،با من خۆم بچم بۆلایان)،ژن وماڵەکە زۆر تکای لێ دەکەن کە ئەو کارە نەکات،بەڵام ئەو سوورە لەسەر ئەوەی نامەکە بەرن بۆیان کاتێك نامەکە دەبەن دێن دەیگرن،دەیکەنە تەقەو خۆشی کە دەیگرن دەڵێن گرتوومانە وا نییە لە ڕاستیدا نەیان گرتووە ئەمە ڕاستی ڕووداوەکەیە،هەرچەندە هەڵەیەکی گەورەی کردووە بەقسەی ژنەکەی و پیاوەکەی نەکردووەو ئەوانیش ڕاست ناکەن کە دەڵێن گرتوومانە.

یەکەمین کەسیش من چومە ماڵی حاجی عەلی بۆ لێ کۆڵینەوە لە چۆنییەتی گرتنەکەی، قسەکانی حاجی عەلی و ژنەکەیم تۆمار کردو هەر ئەو کاتە بەکاك ئیبراهیم جەلال-دا ناردم بۆ مەکتەبی سیاسی.

ئەوە بوو بە هەموو لایەکمان هەوڵماندا رایکردوو دەرباز بوو، بۆ مێژووش دەیڵێم کاوەی شێخ لەتیف ڕۆڵی خۆی هەبوو لە ئاسانکاری پاسەوانێتییەکەیدا بۆ ئەوەی هەڵبێت، شیوعیش خزمەتیان زۆر کردبوو،بەڵکو ماوەیەك وەك میوان بردبوویانە لای خۆیشیان.

کە هاتەوە بۆ بەیانییەکەی من وخۆی و کاك شەوکەتی حاجی مشیر کۆبونەوەیەکمان کرد، ووتی چی بکەم؟ووتم کاغەزێکیان بۆ بنووسە بڵێ ئەوە من ڕامکرد،گەیشتوومەتەوە ناو هێزەکانمان بۆ ئەوەی کە باوەڕ بکەن من بۆ هیچ نیەتێکی خراپ نەهاتبووم، وەرن با گفتووگۆ بکەین و کێشەکە چارەسەر بکەین،نامەکەی نوسی وشەهید شەوکەت بۆی نارد،بەلاّم خۆی دیار بووکەپڕبوو لە ڕق بەرامبەر بە(جوود)،تەنانەت لە پارەزان لەگەڵ مەفرەزەیەکی حزبی شیوعی تێك چوو ناوی کاك قادر بوو،ووتی:بزانە خۆم دەزانم چیتان لێ دەکەین،ئەوەبوو کە چوو بیانووی دەست کەوت شەڕی قرپانەو پشت ئاشان بقەومێنێت،لە ڕاستیداسەرئەنجامی هەڵەیەکی عەسکەری بچوکی یەکێتی دژی مەفرەزەیەکی شیوعی،دوای ڕێکەوتنامەی ستراتیژی نێوانمان،حزبی شیوعی شەڕی گەورەی دژی یەکێتی وەکو جوودڕاگەیاندمن لە مەڵبەندی یەك هەوڵمدا حزبی شیوعی لە شەڕەکە دوور خرایەوە،خودی کاك نەوشیروان(۳)جار بەجیهاز فەرمانی پێکردم لە حزبی شیوعی بدەم،ئامادە نەبووم، تەنانەت پێم ووت ئەو تاج ونەجمەی دەیخەیتە سەر شانی یەکێکی تر،ئەو شەڕەی پشت ئاشان هەلەیەکی کوشندە بوو،بەو شێوەیەش کە کرا.

ڕێگا:بارودۆخی ئێستەی یەکێتی نیشتیمانی کە ڕۆژانە خەڵك لە کۆمیتەکان دەست لە کار دەکێشننەوە یان خەڵکێك دەردەکەن ئەم نابڕینەی خەڵکی یەکێتی بۆ

مەلا بەختیار: تاکو ئێستە یەك کەسمان دەرنەکردووە، ئەوەی کە هەیە ئەمەیە:

ئەو برادەرانە کە بەرپرس بوون چونەتە دەرەوەی یەکێتی،پاسەوانیان هەبووە،بانگ کراون و پێیان ووتراوە،ئێوە پاسەوانی ئەوان بوون لە بەرئەوەی بەر پرس بوون لەناو یەکێتی،ئێستا ئەوان لە یەکێتی نەماون،کوێتان ئەوێ تاکو بتان گوازینەوە، ئەوەی کە خۆی داوای کردووە بە دڵی خۆی نەقڵمان کردووە،ئەوەی کە بەئارەزوو لایان مایەوە ئازاد بووە،لەمەش زیاتر نییە.

ئەوانەی کۆمیتەکانیش خۆیان دەکێشنەوە،هەرچەندە ڕۆژی پێنج دەکشێتەوە،بەلاّم(١٥)دێتەوە،کاتژمێرێك پێش ئێستا(٢٢)کەس هاتەوە،لەدوورەوە کەشتێك دەبیستی شتێکەو کە ئەچیتە نزیك و ناوی،شتێکی ترە،ئێستا ئەو گردەو ئەو لیستە،

مەرجەعییەت ودیسپلین وپەیڕەوو پرۆگرامی نییە،تووشی ململانێکی گەورە هاتووە،ئەم ململانێیە ئەبدیعای جۆراو جۆری هەیە،حساباتی جۆراوجۆری لەسەرەو ئەحکامی جۆراو جۆری هەیە،ئەم خەڵکە کە بەشێکی ئەو گەنجانەی کە بەبێ ئەزموون چوونەتە لایان کە دەبینینن مەسەلەکە سەدان جۆر کێشەوبێشەیە،ئەوسا بەشێکیان دوور دەکەونەوە.

ڕێگا:تا چەند وایە کە ئێوە خەڵکتان بە زەبری پارەو دەسەڵات ڕاگرتووە؟ئەوان ئەوەیان پێ گرنگترە کە پارەیان نییەو دەوریشیان قەرەباڵغە؟

مەلا بەختیار: من پێیان دەڵێم کوا کادری ئەوان بەبێ پارە ئیش دەکات؟یەك کادرم بۆ بێنە لە ئیزگەو ڕۆژنامەو تەلەفزیۆنەکەیان کە بەبێ پارە ئیش بکات؟بگرە مووچەی زۆرێکیان لە هەندێك کادری ئێمە زیاترە لە تەلەفیزیۆن وئێزگەکەیان.

ڕێگا:ئەوان دەڵێن پارە لەهیچ لایەنێك وەرناگرین و ئەو پارەیەی کە هەیانە هی خەڵکی سەرمایەداری دڵسۆزی گۆڕان-ە؟

مەلا بەختیار: ئەمە باسی وڵاتانی سۆسیالیستی یە نەك سەرمایەداری،تۆ باوەڕ دەکەیت کوردستان وابێت کەسەرمایەداران بەملیۆنەها دۆلار بدەن بەلایەك بۆ ئەوەی هێزێکی سیاسی نوێ پێك بێت؟سەرمایەداری بەرژەوەندییەکانی لەلای یەکێتی و پارتییە.

بازاڕی ئازادییان بۆ دابین کردوون،فڕۆکە خانەیان دروست کردووە،کۆمپانیاکانی دنیایان هێناوە بۆ کوردستان ومتمانەی پەیوەندییەکی گەورە لەنێوان سەرمایەداری ئێمەو دەرەوە دروست بووە،هەموو ئەزموونی دوونیا ببینە سەرمایەدارەکانی دوونیا لەگەڵ حزبی دەسەڵاتدا بەرژەوەندییان جووتە،لەبەر ئەوە من قەناعەتم وایە هەر سەرمایە دارێکپارەی دابێت بەئەوان لەبەر هۆی تایبەتی بووە.

ڕێگا:واتە هەڕەشەیان لێدەکەن

مەلا بەختیار:نا هەڕەشەیان لێ ناکەین،ئەگەر بشمانەوێت هەڕەشە بکەین،ئێستا پێیان دەڵێین ئەگەر(١٠)دۆلار بەوان بدەن دەبێت(١٠٠٠)دۆلار بدەن بە ئێمەش،سیاسەتی ئێمە لەدوای شۆڕشەوە بۆ کۆکردنەوەی هاوکارییەنەماوە بۆیە هەڕەشەش لە کەس ناکەین.

ڕێگا:لیستی گۆڕان ئەمەلی وایە بە هێنانی کورسیەکان،بودجە لە حکومەت وەربگرێت؟

مەلا بەختیار:بە پێی ژمارەکانی کورسیەکانە کە دەیبەن،بایی ئەوە وەردەگرن،چەندییان بردەوە ماڤ خۆیانە ئەوەندە وەربگرن.

ڕێگا:خەڵکێك لەم شارەدا بەرپرسی یەکەی ئیداری بووەو ئێستە خۆی بەبێ خەوش وبێ کەمووکوڕی دادەنێت،وەك سالار عەزیز کەماوەیەکی زۆر پارێزگار بووە،ئایا هەر کەس چووە گردەکە دەتوانێت بلێت کەموو کوڕییە؟

مەلا بەختیار(بەپێکەنینەوە)من بەتۆ دەڵێم ئایا شتی وادەبێت؟!گردوکو ساونایە؟گردەکە کەعبەیە؟خەڵك لە خۆیەوە ناتوانێت ئەوە بلێت،لاپەڕەکانی مێژوو لەسەر هەر کەسێك چۆن نووسراوە، ئەوە ماڵە لەسەر هەمووکەسێك، کەسیشبەسەرکەوتنە سەر گردەکە ناتوانێت خۆی لە کردەوە و ئاکاری ڕابردوو پاك بکاتەوە،تەنانەت کەسایەتیشی لەسەر گردەکە ناگۆڕێت،چونکە ئەوان فیکرو فەلسەفەیان نییە هەتا پەروەردەی خەڵك بکەن.

ڕێگا:دەربارەی ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کە نەهێنرانە کۆبونەوەی سەرکردایەتی،لەم ڕۆژانەدا بەیانێکیان دەرکرد بەناوی کۆمیتەی سەرکردایەتی باڵی ڕیفرۆم،ئەوانە تەجمیدین ئەمە چۆن بوو؟

مەلا بەختیار:ئەبوو بیان ووتایە سەرکردەکانی بەناو باڵی ڕیفرۆم،چونکە کۆمیتەی سەرکردایەتی بە پێنج کەسپێکنایەت،کۆمیتەی سەرکردایەتی(٣٥)بۆ(٣٧)کەسە، پێنج کەس چۆتە دەرەوە ئەمە نابێت بە کۆمیتەی سەرکردایەتی،ئەوانە لە بەرئەوەی کە بڕیار بوو بانگ بکرێن و هەڵوێستی خۆیان ساغ بکەنەوە لە نێوان گردەکەو یەکێتی، وەکو کەمایەتی ووتبویان لەگەڵ گردەکەین،مەکتەبی سیاسیش بە پێ ی دەسەلاتی پەیرەوی ناوخۆ تاکو پلنیۆم یان کۆنگرەی تەجمیدی کردوون.

ڕێگا:کەی کۆنگرە دەبەستن؟

مەلا بەختیار: دوای هەڵبژاردن،بەلام ناتوانم کات دیاری بکەم، چونکە دوای هەڵبژاردن زۆر مەسەلەمان بۆ ساغ دەبێتەوە، ئێستا هەموو ئامادەکارییەکانی کۆنگرە لە بەردەستمانە.

ڕێگا:لە ڕابردوودا هەست ناکەیت لەبەر ئەو باروو دۆخە ناو خۆییە نەتانتوانی کۆنگرە ببەستن؟

مەلا بەختیار:بەڵێ ئەو بارووددۆخە ناوخۆییەی کاری گەری هەبوو،ناچار بووین ئیدارەی بارودۆخەکە بدەین،تاکو لە زەمینەیەکی گونجاودا کۆنگرە ببەستن؟

ڕێگا:ئێستە پێتان وایە یەکێتی پاك بۆتەوە یان جیا بۆتەوە لەچی ولە کێ؟

مەلا بەختیار:ناکرێت ئینسان یەکۆ حوکم بدات،بێگومان نە لەناو ئەواندا هەمووی خراپە،نەلەناو ئێمەش هەمووی باشە،لەناو ئەواندا خەڵکێك هەیە بەڕاستی کەڵکی ئەوەیان نەمابوو یەکێتی بمێنن،دەرەوەی یەکێتییان پیرۆز بێت،هەشن بەداخەوە چۆتە دەرەوەی یەکێتی،لە ناو ئێمەش هەیە ناتوانم بڵێم تا ئێستا لەسەدا سەد شایەنی حزبێکی سۆشیال دیموکراتە!لەگەڵ ئەوەشدا یەکالابوونمان ئەوان بەڕێ ی خۆیان و ئێمەش بەڕێ ی خۆمان،پێم باشترە لەوەی لەناو خۆمان لە(٨٠٪)ی کۆبونەوەکانمان بەشتی لاوەکییەوە سەرقاڵ بین و متمانەش بەیەك نەکەین،ئێستا کە ئەوان چوونەتە دەرەوە،هەندێك ئەحکامی جیابوونەوەی لێ دەربکەیت،بەش بەحاڵی خۆم پێم وایە دەبێت ڕێزییان بگرین،بەلام لەسەر بنەمایەکی دیموکراتی و زانینی جیاوازییەکان،نەك بە پیلان و پیلانگێڕی.

ڕێگا: ئەوان پێیان وایە بودجەو داهاتی ئەم وڵاتە بە ناشەفافی ولە نێوان چەند کەسێکی یەکێتی وپارتیدا بەش دەکرێت بێ ئەوەی کەس ئاگای لێی بێت؟

مەلا بەختیار:من لەوان ئەپرسم:بۆچی ئەوانە لەساڵی(١٩٩١)کەبەرەی کوردستانی حوکمی کردووە لەساڵی(١٩٩٢)حکومەت و پەرلەمان دروست بووە،تاکو ساڵی(٢٠٠٣)داهاتی هەموو کوردستان لەژێر دەستی ئەو دووئیدارەیەی پێشووی ئەم حکومەتە بووە،ئەوان بۆ تەحەمولیان کرد؟لەساڵی(١٩٩٣)تاکو ساڵی(٢٠٠٣)ئەو برادەرانە بۆ تەحەمولیان کردووە؟کە ئەو هەموو پارەیە سەرف کراوە؟لە ساڵی(٢٠٠٦)تاکو(٢٠٠٩)کە برادەرەکانی تر دەستیان لە کار کێشایەوە یان دوور خرانەوە،بۆ تەحەمولیان کرد؟ئەم تەحەمولەی سەرف وپارەو هاوکارییە بۆ گەیشتە یەکێك لە چرکە ساتە مێژووییەکان و ئیتر تەحەمولیان نەما؟ئەو هەموو ساڵە ئەگەر ئەو هەموو پارەیە خوراوە ئایا ئەوان پێگەیان هەبوو یان نا؟وەزارەتیان بە دەستەوە بوو یان نا؟لەمەکتەبی سیاسی بوون یان نەبوون؟لە فەرماندەیی هێزی پێشمەرگە بوون یان نەبوون؟بەرپرسی مەڵبەندەگەورەکان بوون یان نەبوون؟بودجەیان هەبوو یان نا؟پێشمەرگەیان پارەی وەرگرتووە یان نا؟خۆیانهاوکاری جۆراوجۆرکراون یان نا؟دەوروبەریان هاوکاری جۆراو جۆرکراون یان نا؟بۆ هەزاران داوای هاوکایان کردووە یان نا؟هەزاران کەسیان دامەزراندووە یان نا؟باشە ئەم پارەیە بۆ کوێ هاتووە؟ئەوانیش وەکو ئێمە چوار پێنج سەیارەیانلە گەڵدا بووەیان نا؟مەسرەفیان هەبووە یان نا؟نەسرییەیان هەبووەیان نەیان بووە؟هاوکاری تایبەتی کراون سەفەری دەرەوەیان کردووەلەسەر حسابی

یەکێتی یان نا؟خانویان بۆ کراوە یان نا؟تەنانەت هاوکاری کەس و کاریشیان کراوە،خۆ دەبێت ئەم پرسیارە بکەی ئەم پارەیە لە کوێ هاتووە؟فەرماندەیی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەو بودجەیەی کە یەکێتی لە حکومەتی وەردەگرت چەندی سەفەر دەکرد؟جێگری مام جەلال یەکێك بوو لەوانەی کەئێستا چۆتە دەرەوەی یەکێتی مانگانە چەندی وەردەگرت لە بوودجە؟لە یارمەتی تایبەتی؟بۆ ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیووت ئەم بوودجەیە غەدرە دەیدەن بە فەرماندەیی گشتی؟یان بەمەکتەب وئۆرگان وبەرپرسە گەورەو بچوکەکان.

ڕێگا:ئێوە هەڵەتان نەکردووە کەئەو گردەتان لەسەر کاك نەوشیروان تاپۆ کرد؟

مەلا بەختیار:با هەڵە بووائەبووایە بە زەمانەتەوە ئەوە بکرایە،من ڕەئم وابوو چەندین قات بەرامبەر بەوەش بدرایە ئاسایی بوو،بەڵام زەمانەت و ئیتیفاق مۆر کراو بکرایە،هەتا ووردتر بتواندرێت لێپێچینەوەی حیزبی ویاسای لەسەر بکرێت.

ڕێگا:دەربارەی ئەو ڕێکەوتنەی لە نێوان تاڵەبانی ونەوشیروان مستەفا هەیە؟

مەلا بەختیار: مام جەلال هەموو ئیلتیزامەکانی خۆی جێ بە جێ کرد.

ڕێگا:مووچەی شەخسی کاك نەوشیروانتان بڕیووە؟

مەلا بەختیار:باوەڕناکەم مووچە بڕابێت،مەگەر خۆی نەیویست بێت،ئێستاش مووچەی هەندێك پێشمەرگەی دەوری نەبڕاوە.

ڕێگا:ئەم لیستە نوێیە(گۆڕان)تاچەند کاریگەری هەیە؟

مەلا بەختیار:کاری گەری هەیە،عادەتەن ناکۆکی لەمیللەتی ئێمەدا کاری گەری سلبی هەیە،بەدرێژایی مێژوو کوردلە جیابوونەوەو ناکۆکی دەسلمێتەوە کاری گەری دەبێت،بەڵام ئەو کاریکەرە چارەنوسسازەی نابێت کە ئەوان چاوەڕوانی دەکەن.

ڕێگا:بۆچونت چییە لەسەر ئەوەی کە دەوترێت گۆڕان(٣٠)کورسی دەهێنێت؟

مەلا بەختیار:(٣٠)کورسی؟؟(بەپێکەنینەوە)جائەوان(٣٠)بهێنن وو(٤)حزبەکە(٣٠)بهێننوە هەندێ حزبی تر(٤بۆ٥)کورسی بهێنن،ئەی چی بۆ ئێمە دەمێنێتەوە؟! ئەگەر ئەم حساباتانەبێ ئێمە دوو حزبی داماویکەس لەدەور نەماوی کوردستانین(بە پێکەنینەوە بەردەوام بوو)

ڕێگا: ترس لەوە هەیە یەکێتی وپارتی تەزویرات بکات؟

مەلا بەختیار:پێم بڵێ چ هەڵبژاردنێکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ئەوەندەی هەڵبژاردنی کوردستان چاودێری هەیە؟تەنانەت جامیعای عەرەبی چاودێری ناردووە،نەتەوە یەکگرتووەکان،ئەمەریکا،میدیا،حزبە موعاریزەکان بەگردەکەشەوە چاودێریان هەیە،لەمە زیاتر زەمانەت چی یە؟ئەمانە بەم قسانە لە ئێستاوە زەمینەی پاساو هێنانەوە بۆ دۆڕان خۆش دەکەن

ڕێگا:ترسی دووبرە بوونەوەی ئەو باروو دۆخەی ئێران لە کوردستان نییە؟بەتایبەت لە کاتی ئەنجامی چاوەڕوان نەکراودا ئەوە ڕوو دەدات؟

مەلا بەختیار:هەموو لایەکمان دەبێت ئەنجامی هەڵبژاردن قبوڵ بکات، هەر لایەك قبوڵی نەکات ئەوا ئیرادەی خەڵك قبوڵ ناکات،هەرکەسیش کێشە بنێتەوە ئەوا کێشەی بەرامبەر ئیرادەی گەل دەنێتەوە یاسا پێشێل دەکات.

ڕێگا:ئەگەر ئێوە ئەنجامەکان قبوڵ بکەن،خەڵکی تر کێشەی نییە؟

مەلا بەختیار:دڵنیابن ئەنجامەکان قبوڵ دەکەین.

ڕێگا:ئەگەر لیستی گۆڕان زۆرینەیەی چاوەڕوان نەکراوی هێنا؟

مەلا بەختیار:پیرۆزبایان بێت ومن یەکەمین کەس دەبم پیرۆزباییان لێ دەکەم.

ڕێگا:ئەم جارە پۆستی سەرۆکایەتی حکومەت لەپارتی وەردەگرنەوە؟کێ دەکەن بە سەرۆکی حکومەت؟تا چەند ڕاستە د.بەرهەم سالح دەبێتە سەرۆکی حکومەت؟خەڵکی یەکێتی دەڵێن ئەگەر یەکێتی پۆستی حکومەت وەرنەگرێتەوە،دەنگ نادەین بە سەرۆکی هەرێم(مەسعود بارزانی)،چی زەمانەتێك بۆ ئەوە هەیە پارتی کێ دەکات بە سەرۆکی پەرلەمان؟

مەلا بەختیار: بەڵێ سەرۆکی حکومەت بۆ یەکێتی وکاك دکتۆر بەرهەمیش کاندیدی سەرۆکی حکومەتە،هەر بۆیە سەرۆکی لیستی کوردستانی یە،پارتیش کاك محمود موحەمەد کاندیدیانە بۆ سەرۆکی پەرلەمان.

## نەوشیروان مستەفا ڕێگە خۆش دەکات بۆ ئەوەی هەڵگەڕانەوە لەناو پارتیدا دروست بکات

دیداری:هاوڕێ کاوە

بەشی دووەم وکۆتای

بەهادین نوری پاش ئەوەی حزبی شیوعی بەتۆمەتی کەمتەرخمی دەریکرد، چۆتەوە بەری قەرەداغ تاکو ئەنفال و کیمیاباران لەوناچەیە بووەو دوتر چۆتە سوید و لەپڕپێندا گەڕاومەتەوە کوردستان.

ڕێگا:بەگشتی شەری ناوخۆی ساڵانی نەوەدەکان چۆن لێك دەدەنەوە؟!

بەهادین نوری:ئەو شەڕانە شەڕی دەسەڵات و پارە بوون

ڕێگا:ئایا یەکێتی و پارتی کاریان کردووەبۆ ئەوەی کەرکوك وناوچە دابڕاوەکان بگەڕێنەوە سەر کوردستان؟

بەهادین نوری:کاریان بۆ کردووە ئەو کێشەیەش هێندە ئاسان نییە زوو چارەسەر بکرێ،چونکە بەرامبەر عەرەبەو زۆرینەن و حکومڕانی لە ژێر دەستی ئەواندایە،کەرکوکیش بەشێکی لە ڕابردوودابووە بەعەرەب،لە بەرئەوە چارەسەری ئەو کێشانە کەم نییە،یەکێتی و پارتی وەك دوو حزبی قەومی بەرژەوەندییان لە وەدایە کە کەرکوك و ناوچەکانی تر بگەڕێنەوە سەر هەرێم

ڕێگا:ئایا لە ئێستادا یەکێتی نیشتیمانی کوردستان چۆن دەبینی؟

بەهادین نوری: یەکێتی لە ئێستادا حاڵی ناوخۆی شڕە!نەوشیروان ماوەیەکی باش لە یەکێتی دا بووە کەسی دووەمی ناو یەکێتی بووەو ئێستاش دژایەتی یەکێتی دەکات و دەیەوێت خەڵکێکی زۆری ناو یەکێتی بەرێت بۆ خۆی،خەڵکێکی زۆری ناو یەکێتی بەرێت بۆ خۆی،خەڵکێکی زۆریش گوێ لە نەوشیروان دەگرن،ئەم ڕەوشەی ناو یەکێتی لە بەرژەوەندی پارتیدایە وەکو حزب بەلام لەلایەکی ترەوە هەڵوێستی نەوشیروان دژی بەرژەوەندی پارتیشە لە داهاتوودا،چونکە ئەو ڕێگە خۆش دەکات بۆ ئەوەی لەناوپارتیشدا هەڵگەڕانەوە ڕووبدات هەرچەندەپارتی حزبێکی بنەماڵەییە بەلام پارتیش لەبەرامبەر ئەو کێشانەی لەناو یەکێتیدا ڕوودەدەن پارێزراو نابێت!

ڕێگا:ئێوە پێتان وایە نەوشیروان شەڕی دەسەڵات دەکات یان کۆڕان؟

بەهادین نوری: نەوشیروان لە ناو یەکێتی بووەو بە باش وخراپ هەر یەکێتی بووە،پێشتر نەوشیروان پارتی بووە

نەوشیروان دەرچووی هەمان قوتابخانەی قەومی پارتی و یەکێتییە،لە ناو پارتیدا دەستی کردووە بە سیاسەت و پێ گەیشت،پاشان وەك جەلالیەك هاتۆتە پێشەوە یەکێتی بووەو پاشان ناکۆکیەکانی نەوشیروان لەسەر بیرو باوەڕنییە لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا،ناکۆکیەکان لەسەر دەسەڵاتە!لەسەر ئیتیحکاری دەسەڵاتە ئەو هەراو هۆریایەی هەیانە،هەر کەسەو ناوێکی لە خۆی ناوە نەوشیروان بەناوی ڕیفرۆمەوە دەرخستووە بەلام نەوشیروان بە بڕوای من لەچوارچێوەی قوتابخانەی یەکێتی ناتوانێت بێتە دەرەوە وەکوو بیرو فیکر،تاوەکو ئەمڕۆ شتێکی دیاری نەکردووە کە خۆی لە دەرەوەی ئەوەی خۆی ببینێتەوە.

ڕێگا:نەوشیروان مستەفا دەڵێت من دەمەوێت حزب لە حکومەت جیابکەمەوە؟

بەهادین نوری: جاخۆ جەلال تاڵەبانیش هەروای ووتوە!ئەیەوێ شتێکی ترە!نەوشیروان ئەو کاتە دەستی دەڕۆیشت چۆنت جیا کردەوە؟چەندڕۆژێك مام جەلال چووە دەرەوەی وڵات نەوشیروان جێگری بووە ئەو کاتە نەوشیروان سەرۆکی حکومەت نەبووە وەزیری ناوخۆ نەبوو بەلام بە فەرمانی نەوشیروانلە ساڵی ٢٠٠٢دا کۆمۆنیستی کرێکاران کەلە چارچە کرد!پێنجیان لێ کوشتن و هەندێکی تریشیان بریندار کردن!نەوشیروان بە پراتیکی ئاوا حزبی لە حکومەت جیا کردەوە !کوشتنی ئەو کۆمۆنیستانە لە کاتێکدا بوو کە نەوشیروان بەرپرسیاری یەکەم بوو،هەر ئەو بوو کوشتن یان نەکوشتن گرتن یان نەگرتنی دەردەکرد،جەلال تاڵەبانی لە دەورە بوو ئیشەکە هەموو لای نەوشیروان بوو.

ڕێگا:ئایا تۆ پێت وایە هەڵوێستی نەوشیروان مستەفا هەڵوێستی شەخسیە بەرامبەر جەلال؟

بەهادین نوری: زۆر سادەیە بە لامەوەنەوشیروان لە ناو یەکێتی دا بێت و کێشە بکەوێتە نێوانیانەوە یان جەوهەر نامیق لەگەڵ پارتی دا کێشە بکەوێتە نێوانیانەوە،سادەیە کەسێك حزبێك جێبهێڵێت و ڕێکخراوێکی تر دروست بکات،لە ژیاندا ئەو جۆرە هەڵوێستانە سادەن و واقیعن،نابێت کاری لەو جۆرە تۆمەتبار بکرێت ئەو جۆرە کارانەش زۆر ئاسانە بەلای منەوە.

بەلاّم من دەڵێم نەوشیروان خۆی بەشدارە لە باش و خراپی یەکێتی،ئێستا دەبوایە نەوشیروان مستەفا شتێکی بلاّو بکردایەتەوە کە یان وازییەکانی لە یەکێتی ئاشکرا بکردایە نەوشیروان هەر لە چوار چێوەی هەمان بیرو بۆچوونی قوتابخانەی یەکێتیدا جولاّوەو دەجولێ.

ڕێگا: تۆ پێت وایە نەوشیروان مستەفا لە پەرلەماندا وەکو لیستەکەی بتوانێت ببێتە هێزی گۆڕان کاری؟

بەهادین نوری: وەللاّهی گۆڕانکاری چی؟ئەگەر تەماشای ڕابردوو بکەین لە وە ناچێت!!ڕابردووی ئەوان ڕێگا بەوە نادات مرۆڤ گەشبین بێت بەوەی نەوشیروان بتوانێت گۆڕانکاری بکات!بەلاّم دنیاش دەگۆڕێت ولە گۆڕاندایە.

ڕێگا:تۆ بڵێ ی تاڵەبانی دەتوانێت جارێکی تر ناو ماڵی یەکێتی ڕێك بخاتەوە؟

بەهادین نوری: من ئەوە نازانم بەلاّم باسی لایەنی تەندروستیشی ناکەم، بەلاّم بە گشتی مام جەلال حەز دەکات ناوماڵی یەکێتی چاك بکاتەوە.

ڕێگا:زۆر کەس دەڵێن ئەمەی نەوشیروان دەیکات تاکێتی نێوان ئەوو تاڵەبانییە تۆ چی دەڵێیت؟

بەهادین نوری:نە!نە باوەڕم نییە ولە تاکتیك دەرچووەوهەڵوێستی نەوشیروان زەرەرێکی زۆریشی بەیەکێتی گەیاندووەو تەنانەت بەخوودی جەلال تاڵەبانیشی گەیاندووە!

ڕێگا:ئایا ترسی ئەوە هەیە کە شەڕێك ڕووبدات بە هۆی ناکۆکی نێوان یەکێتی و نەوشیروان مستەفا؟

بەهادین نوری: هەلوو مەرجی ئەمڕۆی عێراق و کوردستانیش زەحمەتە شەڕ دروست ببێت چونکە هێندە ئاسان نییە،ڕەنگە شتێکی کەم ڕووبدات و زوو چارەسەری بکرێت بەلاّم نابێتە شەڕی ناوخۆ!

من وەك خۆم ترسی شەڕی ناوخۆم هەیە لەسەر نلوچە دابڕاوەکان و کەرکوك کە لەزەمانی سەدامدا نەخراوەتە سەر کوردستان،کەرکوك وخانەقین وشنگارو مەخمورو چەندین شوێنی تریش.

ڕێگا: گەر سبەینێ نەوشیروان مستەفا لە هەڵبژاردنزۆرینەی بەدەست هێنا،یەکێتی وپارتی قبوڵی دەکەن؟

بەهادین نوری: دەبێت قبوڵی بکەن!ئەگەر قبوڵی نەکەن دەبێت یەکێتی وپارتی ئیدانە بکرێن و خەڵك لەگەڵ نەوشیروان دەبێت بە شێوازی مەدەنی نارەزایی خۆیان دەربڕن! بەلام من وەك خۆم باوەڕم نییە نەوشیروان زۆرینە بەدەست بهێنێت!

ڕێگا:بەبڕوای تۆ نەوشیروان چەند دەنگ دەهێنێت؟

بەهادین نوری: بە بڕوای من نەوشیروان هێندە دەنگ ناهێنێت تۆو بتوانێ دەسەلات وەر بگرێ!بەلام لە پەرلەمان دەتوانێ ببێتە هێزێکی ئۆپۆزسیۆن ئەمەش کارێکی باشە!

ڕێگا:بڕوات وایە کۆمەلگای کوردی ناوك یاخود هێزی گۆڕان و ئۆپۆزسیۆنی تیایە؟

بەهادین نوری:ئەم هەلبژاردنە بەبڕوای من ئۆپۆزسیۆنێکی ڕاستەقینەی تیا دروست دەبێت ولە دایك دەبێت،چ نەوشیروان چ ئیسلامیەکان و وردە حزبیتریش !

ڕێگا:بلاوکردنەوەی پارەو هەندێك ئیتیزامات لەلایان یەکێتی و پارتییەوە ڕۆڵی دەبێ بۆ سەرکەوتنی ئەوان؟

بەهادین نوری:بە دلنیاییەوە !لەکۆمەلگایەکی ئاوا دواکەوتوو پارەو هەلی کار ڕۆڵی خۆی دەبینێ!

ڕێگا:دەرکردنی خەلك لە پۆستەکانیان چۆن تەماشای دەکەی لەلایەن یەکێتییەوە؟

بەهادین نوری: دەرکردنی حزبی لەحکومی جیایە!گەر هەرکەسێك دژی حزبەکەی دەری بکات مافی خۆیەتی،بەلام لە پلەی حکومی ڕاست نییە!هەق نییە دەربکرێن وناهەقە!

ڕێگا:تۆ پێت وایە چوار حیزبەکە دەنگ بهێنێت؟

بەهادین نوری: من پێم وایە لەدوای پارتی ویەکێتی یەکەم دەبن واتە ئیسلامیەکان دووەم دەبن.

ڕێگا: بەو وتەیەی تۆ بێ کوردستان بەرەو عیلمانیەتە؟

بەهادین نوری:ئاسان نییە لە ئێستادا،تالیبان لە ئەفغان ڕوخێنرا وەزعی ئێرانیش باش نییە وەزعی حەماسی لە فەلەستین باش نییە کەش و هەواکەی بەرەو ئەوە ناڕوات ئیسلامی پێش بکەوێ لە کوردستان و عێراقدا راستە لایانگریان هەیە بەلام بەهۆی ئامادە بوونی ئەمەریکییەکان لە ناوچەکەو عێراقدا زەحمەتەو ئەمان نییە تاکو ئیسلامیەکان بتوانن دەسەلات بگرنە دەست.

بۆ نمونە مایکل ڕۆبن ڕۆژنامەنووسی ناوداری ئەمەریکی شتی بلاوکردەوە لە ڕۆژنامەکانی ئەمەریکاو لێرەش دەقی ئەوە بلاو کرایەوە ووتی مەسعود بارزانی(١٠٠٠)ملیۆن

دۆلاری لە بانقدا هەیەو جەلال تاڵەبانیش(٤٠٠)سەد ملیۆن دۆلاری لە بانقدا هەیە،حسابی هێرۆش هەر خوا دەیزانێ چەندی لە بانقدا هەیە!یەك ووشە لەلایەن ئەو دووهێزەوە قسەی لەسەر نەکرا،ئەو بێدەنگیە جۆرێکە کە ئیسپاتی بڵاوکراوەکە،ئەو ئیعتیراف کردنە بە هەقییەتی بڵاو کراوەکە،ئەوە تۆمەتێکی بچوك نییە گەورەیە،ساڵی ١٩٩١داکەتازە ڕاپەڕین بوو بوو ڕۆژنامەیەکی سویدی بڵاوی کردەوە جەلال تاڵەبانی(٨٨)ملیۆن دیناری ئەو کاتەی لە بانقدا هەیە!هیچ قسەیان نەکرد بێ دەنگ بوون لێی.

ڕێگا: دوای تاڵەبانی یەکێتی چی بەسەر دێت؟!

بەهادین نوری: یەکێتی ئێستا حاڵی شرتر دەبێت!ئەگەر خۆی بنیات بنێتەوە لەسەر بنچینەیەکی نوێ ئەتوانێت ببێتە حزبێك بۆ دواهاتوو،بەلآم زەحمەتە،بەمردنی تاڵەبانی یەکێتی حاڵی شرتر دەبێت!

ڕێگا:ئەی بەمردنی مەسعود بارزانی پارتی چی بەسەر دێت؟

بەهادین نوری:ئەم وەزعەی ئێستای یەکێتی تیا دەژی لە بەرژەوەندی پارتییە،من بۆچوونم وایە لەم هەڵبژاردنەدا دەنگەکانی پارتی لە یەکێتی زیاتر دەبێت،بەشێك لە خەڵك دەنگ دەدەن بۆ پارتی نایدەن بە یەکێتی لەسەر ئەو وەزعەی کەهەیە،بەلآم مردنی مەسعود بارزانی لەم قۆناغەدا کەمتر کاریگەری دەبێ بۆ سەر پارتی چونکە زیاتر پارتی حزبی بنەماڵەییە،بەلآم ئەوانیش پارێزراو نین لە کێشە.

## نەوشیروان مستەفا و د.قاسملۆ

## ئەودوو پیاوەی لە یەك قوتابخانەدا دەیان خوێند

لە دوای تیرۆرکردنی د.قاسملۆ"نەوشیروان مستەفا"بەینی لەگەڵ تاڵەبانی تێك دەچێت و تاڵەبانی و بارزانیش پەیوەندییان لەگەڵ ئێران زیاتر دەبێت

ئەمڕۆ کە ٢٢ساڵ بەسەر کارەساتی تیرۆر کردنی"د.عەبدولرەحمان قاسملۆ"سەرکردەی کاریزما وکاراماای شۆڕشی کورد لەبەشی ڕۆژهەلاتی کوردستان تێدەپەڕێت،لەجێ ی خۆیدایە جگە لەوەی هەر ساڵ یادی ئەو شەهیدە بکرێتەوەو دەستە ڕەشەکانی کۆماری ئیسلامی لەو کارەساتەدا ریسوا بکرێت،هاوکات بەنجە بۆکۆمەڵێك هێمای پرسیارو سەرسوڕمان درێژ بکرێت کە پێش ڕووداوەکەو پاش ڕووداوەکەش لە ئاستی ناوخۆی کوردستان دەکەوێتە سەر بەرەی شۆڕشی کوردی لە باشوری کوردستان و،لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا ولاتانی ئەوروپا،بە تایبەت دەوڵەتی نەمسا کە تاکو ئێستاش هەڵوێستێکی جدی لە بەرامبەر ئەو تیرۆرە ئاشکرایە نەبووە کە لەناو خاکی ولاتەکەی ئەنجام درا،وە نازانرێت لەبەرامبەر چیدا قبوڵی ئەوە کراوە ها پەڵەیەکی ڕەش بکەوێتە سەر ناوچاوانی سیستەمی بەڕێوبەرایەتی وسوڵتەی قەزایی ئەو وولاتە!ئەمەش وێڕای ئەوەی لە دوای کردەوە تیرۆرستیەکە کە لە ڕێستۆرانتی "میکۆنۆس"ئەنجام درادەست بەجێ بکەرانی تیرۆر لەلایەنهێزە ئەمنیەکانی ئەو وولاتەوە دەستگیرکران و،دانیان نا بەوەی کە بەکرێگیراوی کۆماری ئیسلامی ئێرانن و مەبەستی تیرۆر کردنی د.قاسملۆ و هاوڕێنانی روویان کردۆتە نەمسا!بەلام ئەوەی مرۆڤ دەخاتە دۆخی گومانەوە ئەوەیە کە نەك ئەو دەوڵەتە،بەڵکو دەوڵەتانی تری ئەوروپیش وەکو پێویست هەڵوێستیان نەبووە بۆ کاربەدەستانی حکومەتی تاران.

ئەمە لەلایەك لە لایەکی ترەوە هەڵوێستی ناکاف"تاڵەبانی"وبێ هەڵوێستی"بارزانی"بوو دوا بەدوای ئەو ڕووداوەدڵتەزێنە،تەنانەت بینینیمان کە پاش ئەوەی بەرەی شۆڕش لە ڕۆژهەلاتی کوردستان سەرکردەیەکی وەك"قاسملۆ"ی لەدەست دا،هەردوو حزب(یەکێتی وپارتی)بە سەرکردایەتی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی،پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی زیاتر بەرەو پتەوی و دۆستایەتییەکی بە هێزتر ڕۆیشت!ئەمە

لەکاتێکدا کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران چ لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول و چ شۆڕشەکانی دواتری باشوری کوردستان وێڕای ئەوەی گوشاری حکومەتی عێراقی لەسەر بووە بۆ بەشداری کردن لە سەنگەری دژایەتی شۆڕش لەو بەشەی کوردستان،بەلام سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ڕۆژێك لەڕۆژان ملکەچی ئەو داوایە نەبووە و نەکەوتۆتە بەرەی خیانەت.هەربەم هۆیەشەوە چەندین جار هاوکاری لۆژیستێکی و ماددیان لەسەر بڕاوە و تووشی تەنگەشەی گەورە بوونەتەوەلە لایەن ڕژێمی بەعسی لە ناو چوو.کەچی بەداخەوە کاتێك لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەدەینەوە،ڕووبەڕووی هەڵوێستی پێچەوانەو دوور لە واتاو فەهمومی نەتەوەیی بوون دەبینینەوە کە چەندەها جار یەکێتی و پارتی زۆر بە ئاسانی سنورەکانیان بەزاندووە و ڕاستەو خۆ یان ناڕاستەوخۆ کەوتونەتە خۆ هەڵقورتاندن لە کارو باری بەشەکانی تری کوردستان بە تایبەت لە ڕۆژهەلات و باکووری کوردستانیش. ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناوچەکانی"شنۆ"وجادەی "سەردەشت –خانێ"شان بەشانی سوپای حکومەتی مەلاکان لە ئێران کردی قەت لە بیر ناچێتەوە و نموونەیەکی زەقە بۆ سەلماندنی کۆمەڵێك ڕاستی!هەروەها دەست تێوەردانەکانی"تالەبانی"لە کارو باری چارەنووسی کوردەکان تورکیا و تەنانەت ئەو شەڕانەی کە هەردوو حیزب(یەکێتی و پارتی)لەگەڵ چەکدارەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان کردیان جگە لەوەی بڵێین بەهانای دەوڵەتێکی دژە کوردەوە چوون چیچ واتایەکی تری نی یە.

هاودەم لەگەڵ بە بیر هێنانەوەی کارەساتی "میکۆنۆس"،لەم بارەیەوە نوسەرو سیاسەتوان "عەلی کەریمی"شێوەیە بۆ گۆڤارەکەمان دوا:-

"عەلی کەریمی"دەڵێت ئەوەندەی من لە بیرم بێت،ئەو کاتە هیچ شتێکم لە بارزانیەوە نەبیست،بەلام یەکێتی شەخسی مام جەلال هولوێستیان هەبوو وە ئەو کردەوەیان ئیدانە کرد.بەلام دەبێت بووترێت کە هیچ لایەکیان ڕاستەو خۆ خودی کۆماری ئیسلامیان ئیدانە نەکردو ئەو واقیعەیان پشت ڕاست نەکردووە کە پرسیاری یەکەم دەوڵەتی ئێران بێت،نەك یەکێتی و پارتی،تەنانەت خودی ولاتی نەمسا و ولاتانی تری ئەوروپا ئەو تاوانەیان بەرەو ڕووی کۆماری ئیسلامی نەکردووە.ناوبراو ووتی:ئەو کوردانەی کەلە هاندەران بوون بەگشتی هەڵوێستیان باشتر بوو لە هێزە سیاسیەکانی کوردستان. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندییەی کە هێزە سیاسیەکانی باشور لەگەڵ دەوڵەتی مەلاکان هەیان بوو.

## پاش تیرۆرکردنی"قامیسلۆ"پەیوەندییەکانی یەکێتی وپارتی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی زیاتر بەرەو پتەوی ڕۆیشت!

لەو بارەیەوە"عەلی کەریمی"ووتی:دوای کارەساتی ئەنفال ئەو هێرشە پان و بەرینەی کە"سەدام حسێن"کردیە سەر کوردستان وای کردزەربەیەکی گەورە بەر هێزە چەکدارەکانی کوردستان بکەوێت،ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بۆ زوربەی شەرت وشروتەکانی ئێران ملکەچ بن.تا ڕادەیەك هاوکاری ڕاستەوخۆی سەر بازیان لەگەڵ بکەن هاوکاری سەربازی نیزامی دیکتاتۆری مەلاکان لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناوچەی"شنۆ"و جادەی سەردەشت-خانێ-زەفترین نموونەیە. بەڕای"عەلی کەریمی"دوو هێز کەپەیوەندیان گەیشتە ئەو ئاستەی هاوکاری سەربازیان هەبێت ولە بەرەیەك دابن،زۆر زەحمەت نییە کە بەو ڕاستیە بگەین لە زۆربەی بواردابتوانن هاوکاری بکەن.ئەگەر یەیری کوردەکانی ئێران بکەین،بۆ خەباتی چەکداری نموونەیەکی وانەبووە کە لەگەڵ سەدام هاوکاری سەربازیان کردبێت و لەگەڵیان بووبن بەیەك بەرە،بەڵام"موجاهیدینی خەڵق"لە هەشتاکاندا وەك فەیلەقێك لە سوپای عێراق ئەو کارەی دەکرددژ بەئێران.

## پەیوەندییەکانی "نەوشیروان مستەفا"لەگەڵ"د.قامیسلۆ"و هەڵوێستی بۆ خەباتی بەشەکانی تری کوردستان

بۆ ئەو بابەتە"عەلی کەریمی"بەم جۆرە دوا:بەگشتی ساڵانێکی زۆرە کاك نەوشیروان لە نزیکەوە دەناسم. بە نیسبەت شەخسی خۆمەوە لەبەر یەك شت ئەو دۆستایەتیەم ڕاگرتووە،ئەویش مەسەلەی نەتەوەیی بوونی کاك نەوشیروانە.ئەو باکگراوندەی لە کاك نەوشیروانەوە دەیزانم لە ساڵانی ٦٠وە ئەو پیاوەم بە پیاوێکی نەتەوەیی ناسیەوە و بڕوای تەواوی بە کێشەی کورد هەیە.لە ئاست کێشەکانی پارچەکانی تری کوردستان ئەگەر بواری سیاسیش دەست نەدات ئەو لەسەر ئەو ڕاوو بۆچونەیە کە نابێت تەداخولی پارچەکانی تری کوردستان یەو شێوە زەقە بکرێت کە ئەوانی دیکە دەیکەن،بەڵام ئەگەر پێویست بوو هەڵوێستێك نیشان بدرێت لە ئاستێکی نەتەوەی دابێت وسیاسەت کردن و چۆنێتی دیاری کردنی چارەنووسیان بۆ خۆیان جێ بهێڵرێت."عەلی کەریمی"ئەوەی من بیزانم لە ساڵانی(٨٣-٨٤)کە دیموکرات و کۆمەڵەش ڕۆژانە خەڵکی ئازاریان لێ دەبێتەوە دەهاتنە لای"نەوشیروان"بەڵام بلێ ی ڕۆژێك لەڕۆژان ئەو شتەی بۆ خۆی قۆستبێتەوەو لە خۆیانی

کەم بکاتەوەو بەکاریان بهێنێت،ئەوەی نەدەکرد.کەچی لایەنەکانی دیکە جۆرە حزبی کارتۆنین بۆ خۆیان دروست کردووە.

بۆیە پێم وایە پیاوێکی نەتەوەییە و ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان هەبێت بیرو هزری "نەوشیروان مستەفا" کوردستانی بوونە. ئەوەندەی من بزانم و ئاگادارم "نەوشیروان مستەفا"لەبەر ئەوەی لە سیاسەتداپیاوێکی ڕوو ڕاست بووە پەیوەندییەکی سیاسی گەرم و گوڕی لەگەڵ "د. قاسملۆ"هەبووەو"د. قاسملۆ"ش ئەوەندە من بیزانم چونکە دەیزانی "نەوشیروان"زۆر جدیە ڕێسپێکتێکی زۆری بۆی هەبوو.

سەبارەت بە پەیوەندی "نەوشیروان مستەفا"د. قاسملۆ لە شاخ،"محمەد تۆفیق ڕەفیق"بەرپرسی دووەمی کۆمپانیای "ووشە" بەم جۆرە بۆ "کلیل "دوا:پەیوەندییەکەی کاك نەوشیروان و قاسملۆ دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی لاوێتیان،چونکە کاتی خۆی لە ئەوروپا بەیەکەوە خوێندکار بوونەو پەیوەندییەکی پتەوییان هەبووە،هەر بۆیەش لە قۆناغی شاخ وخەباتی چەکداری دا وەك دوو هاوڕێ ی و هاوخەبات لێك نزیك بوونە.ووتیشی:لە ناو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتیدا"نەوشیروان مستەفا"لە هەموویان زیاتر پەیوەندی دانیشتنی بووە لەگەڵ "د.قاسملۆ"و لە هەڵسوکەوتی سیاسیدازۆر خاڵی هاوبەشیان هەبووە."محەمەدتۆفیق ڕەفیق"ئاماژەی بەوەدا کەلە بواری ڕۆشنبرییدا هزرو بیریان زۆر لەیەك دەچوو ئەمەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ وای دەکرد کە زیاتر بیر بگۆڕنەوە لە نێوانیاندا بێت.ناوبراو ووتی:پاش تیرۆر کردنی "د. قاسملۆ "ئاخۆ پەیوەندییەکانی "نەوشیروان مستەفا"لەو کاتەوە لەگەڵ تاڵەبانی تێکچووە یان نا هیچ زانیاریەکم نییە بۆ ئەو بابەتە دەکرێت لەگەڵ خوودی کاك نوشیروان قسە بکرێت. بەلام ئەوە جێ ی هەست پێکردنە،پێدەچێت هۆکاری لاواز بوونەوەی پەیوەندییەکانی "نەوشیروان مستەفا"و "تاڵەبانی "لەو کاتەدا،پەیوەست بێت بەبەهێز بوونی پەیوەندی تاڵەبانیش و بارزانیش لەگەڵ حکومەتی ئێران،ئەمەش لە پاش کارەساتی "میکۆنۆس"کە تیرۆری "قاسملۆ"ی لێ کەوتەوە.

## ئەوەی نەوشیروان هەوڵی بۆ دەدات تۆڵەیە لەو شکستانەی بەسەریدا هاتووە،نەك ئۆپۆزسیۆنێکی بەرنامەدار

راپۆرتی شیکاری: ئاریز گۆران

رکەبەری ململانێی جۆراو جۆرو دژایەتی کردنی یەکتری بەهەر شێوازێك بێت،لەنێو کایەو دامەزراوە سیاسەکانی کوردستاندا مێژوویەکی ئەوەندە درێژی هەیە،زۆر جار دەگوترێ هەر لەگەڵ دروست بوونی کۆمەڵگای سیاسی کوردستاندا،ئەو بەرپێنەدانی یەکتری و مل شکاندنی یەکترە تا گەیشتنە کوشتنی یەکتر دروست بووەو لە هەر قۆناخێکدا بەشێوەو شێوازی جیا لە پێش خۆی بەرێوە چووە. لە نێو هەموو بزووتنەوەی حزبێکیشدا کارەکتەری بەهێز هەن کەئەو کەشی ململانێ و دژایەتیە بەرێوە دەبەن، یان لەدژیان دەکرێت،ئەو کارەکتەرانەش خۆ گونجاندن و بەرنامەکانیان لە هەموو قۆناخێك هەیە وە هەندێك جار دەسەلات دارن و هەندێك جاریش دەبنە ئەنتی دەسەلات،بۆ هەردوو قۆناخێکیش زمان و پەیرەوی خۆیان هەیەو لەو کارلێکەوە تێکەڵی هێزی جەماوەر دەبن و تەماسی لەگەڵ دەگرن.

یەك لەو کارەکتەرانەی کە لە بزوتنەوەی سیاسی کوردستاندا بەلای کەمی لە ٤٠ساڵی رابردوودا رۆڵ و کاریگەری هەبووە و لە پێگەی بەرزی سیاسی و ململانێکاندایە،نەو شیروان مستەفا یە،ئەو سیاسیەی کەلە سەرەتای دەرکەوتنییەوە ئەفکارو میکانیزمی سیاسەت کردن و بەرێوە بردنی ململانێکانی جێەگەی باس بووە.

نەوشیروان کە لەیەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا تا پلەی جێگری سکرتێری گشتی رۆیشت و سەرکردایەتی باڵێکی دەرکر،دوو ساڵ بەر لە ئێستا وازی لەو پۆستە هێنا. ئێستاش بە شێوەیەك لە شێوەکان خۆی وەك ئۆپۆزسیۆن دەردەخات و بانگەشەی ئەوە دەکات کە لەسەر جۆری بەرێوبردنی ولات لەگەڵدەسەلاتی کوردستان ناکۆکە.بەلام بەرپرسێکی یەکێتی باس لە رۆڵ و کاریگەری ئەو کاراکتەرەبە هێزەی سەردەمێکی ناو یەکێتی دەکات و دەڵێ ''نەوشیروان رابردووەکەی و بیر کردنەوەی ئێستاشی لە خزمەتی دا نییە بۆ ئەوەی رۆڵی ئۆپۆزسیۆن ببینێ،،.

## سەنگەری دیکە بۆ ململانێ

نەو شیروان مستەفا بە درێژایی ئەو ماوانەی لە نێو یەکێتیدا بووە(ئەندامی مەکتەبی سیاسی تا دەگاتە جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)باڵێکی کارا و بە هێزی ململانێکانی ناو یەکێتی بووە،کاریگەرو ڕۆڵی لە بڕیارو کارەکانی ئەو حیزبەدا هەبووە،لە شاخیشدا بە باڵە توند ڕەوەکەی نێو یەکێتی پێناس دەکرا،ئەو سکرتێری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کووردستان بوو،کە ڕێکخراوێکی سەرەتا ماوی و دواتر مارکسی و لینینی توندڕەو بوو،پێشمەرگە و کادیرانی لەسەر راهاتن لە توندو تیژی پەروەردە دەرکرد و دروشمیان ئەوە بوو ''ئەوەی لە گەڵمان نەبێ دوژمنانمانە''

### لە شیری هەتا پیری

ئەو بەر پرسەی یەکێتی کە لەو ڕاپۆرتەدا قسە دەکات،پلەیەکی بەرزی هەیە بەلام بۆ ئەوەی نەزانرێ کێ یە،ڕازی نەبوو ئاماژە بە ناوەکەی بکەین،بەڵکو ڕازی نەبوو پۆستەکەشی ئاشکرا بکەین.

لەو ساڵانەی دواییدانەوشیروان نەوشیروان لەناو یەکێتی دا وەك باڵی ڕیفرۆم خۆی پێناس دەکرد،تەنها ئەو پێناسەیەش بەسە بۆ ئەوەی باڵەکانی دیکە پێ ی پەست بن،کەماوەیەکی زۆرە لە ململانێ دان ولەم ساڵانەی دوایی ململانێکە خەستر بۆتەوە، ئەو بەر پرسەی یەکێتی بە پێکەنینەوە باسی لە ''ریفرۆم''دەکرد و پێ ی وایە ڕیفرۆم بە کەسێ ناکرێت کەنەتوانێت لەگەڵ سەردەم هەڵبکات، یان بەلای کەمەوە خوێندنەوەیەکی واقیعانەی بۆ بارو دۆخ و سەردەمی نوێ نەبێت.

بەر پرسەکەی یەکێتی باس لە ڕابردووی نەوشیروان دەکات،کە بەڕای ئەو ''رابردوویێکی شەڕانی و ئاژاوە گێڕی'' هەیەو دەیەوێ بەخستنە ڕووی ئەو ڕابردووە بە خەڵك بڵێ نەوشیروان هەمان کەسەکەی جارانە،بەلام لەبەرگێکی تردا.ئەو باسی لە هەڵسەکەوتەکانی نەوشیروان لە شاخدا دەرکرد،کە بەگووتەی ئەو لە جۆشدانی شەڕی برا کوژی و دیلکوشتن وئازاردانی نەیاران و کەس وکاری پێشمەرگەی لایەنەکانی دیکە خۆی دەبینێتەوە،بەلام دیارترین ئەو ڕووداوانەی ئەو سەردەمە ڕەنگە ڕووداوی قەرناقەو پشت ئاشان بووبێ کە هێرشی کردە سەر سەرکردایەتی حیزبەکانی شیوعی و سۆسیالست و پاسۆك وەك بەر پرسەکەی یەکێتی دەڵێت ''هەڵسوکەوتی هێزەکە کە نەوشیروان سەرۆکایەتی دەکرد لەو شەڕەدا زۆر دڕندە بوو''.

قرناقه پشت ئاشان ڕووداوێکه بووەته لەکه له مێژووی یەکێتی نیشتیمانیدا،ئەگەر چی ساڵی پار گوترا که مام جەلال دەیەوێ داوای لێبووردن لە حیزبی شیوعی بکات،بەلام ئەو بەرپرسەی یەکێتی دەلێ ''شتێکی وا لەئارا نییە، بەلام ئەگەر هەبێ ئەوە پێویسته نەوشیروان مستەفا داوای لێبووردن بکات،نەك مام جەلال''.

نەوشیروان له کتێبەکەیدا(پەنجەکان یەکتری دەشکێنن)باس لە ڕووداوی قرناقه وپشت ئاشان دەکات و بە دژەکردەوەیەکی دادەنێ دژ بەو حیزبانە.ئەم کتێبە وەلامی زۆر درایەوە،لەوانە پشکۆ نەجمەدین،هەروەها سەعد عەبداالله نامیلکەیەکی به ناوی نەوشیروان مستەفا له شیری هەتا پیری نووسی،هەروەها قادر ڕەشید(ئەبوو شوان )ی شیوعی کتێبێکی بە ناوی پشت ئاشان لە نێوان ئازار و بێدەنگیدا''نووسی و فاتیح ڕەسولیش لە بیرەوەریەکانی خۆیدا باسی لەو ڕووداوە کردووە،زۆرترین ئەوانەی قسەیان لەسەر ئەو ڕووداوە کردووە وەلامی نەوشیروانیان داوەتەوە،شیوعیەکانن،بەو پێیەیەی گورزی گەورە لەو ڕووداوە بەوان کەوت.فاتح ڕەسوڵ یادی بەخێر ساڵێك بەر لە کۆچی دواییکردنی لە دانیشتنێکی دووقۆڵیدا وەها باسی ئەو ڕوداوەی بۆ کردم پێش ئەو ڕووداوە من بە نوێنەرایەتی کەریم ئەحمەد لە زۆر کێشه لەگەڵ نەوشیروان دانیشتم،لەدانیشتنەکەداهەر زوو هەڵچووکۆمەڵێك جنێوی ناشرینی پێداین.لە پشت ئاشان ژمارەیەك کادیری خەبات گێری عەرەبی ژن و پیاو هەبوون،کاك کەریم دەگێڕێتەوە دەلێ خۆم گوێم لێ بوو نەوشیروان هاواری دەکرد کە عەرەبەکان بە ژن ومنداڵیانەوە بکوژن.ئێستاش ژمارەیەك خێزانی عەرەب کە کەسوکاری ئەو عەرەبانانەن خەریکی بەلگە کۆکردنەوەن لە سەر نەوشیروان بۆ ئەوەی بیدەنه دادگا،من خۆم یەك دوانێکیانم بینی کە لەناسریەوە هاتبوون لەو ڕووداوەیان دەکۆڵییەوە و دەیان وویست بەلگەی بەهێز وەدەست بخەن ونەوشیروان بدەنه دادگا..بەڕاستی نەوشیروان له مێژووی خۆیدا دەورێکی تێکدەرانەی له نێوان حیزبه سیاسەکاندا بینیوە''.

هەروەها ئەحمەد بانیخێلانی بەوتارێك لەژمارە(٥)ی ڕۆژنامەی بەلێن کەلە ئەورووپا دەرچوو،وەلامی نەوشیروان دەداتەوەو ئەو بیرەوەریانەی نەوشیروان ناو دەنێت ''پەیامی شەڕ''و لەبەشێکی ووتارەکەی دەلێت ''نەوشیروان کە خۆی بەیەکێك لە دامەزرێنەرانی خەباتی چەکداری خەباتی چەکداری و پارتیزانی دژی ڕژێمی بەعس دەزانێت

،دەبوو لە دووبەرگی کتێبەکەیدا باسی چەند شەڕێکی بکردایە کە دژی بەعس ڕابەرایەتی هێزە چەکدارەکانی یەکێتی کردبێت،ئایا نەوشیروان بۆچی ناتوانێت باسی شەڕێکمان بۆ بکات کە دژی بەعس سەرپەرشتی کردبێت،بڵێی پسپۆڕێتییەکەی تەنیا لەشەڕی ناوخۆیی و کورد کوژیدا بێت و بەس''.هەروەها لە بەشێکی دیکەدا دەڵێت ''لە هەردوو کتێبەکەیدا مرۆڤ واهەست دەکات نەوشیروان و حیزبەکەی لە هەموو ساڵانەی شەڕی ناوخۆیی کورد دژی وێراکردنەکەی کوردستان تا مەزرۆییان نەشکا بێت، بۆیە وا بەتاسوق تامەزرۆییەوە ئگری شەڕ خۆش دەکات و تەنیا جارێکیش ئامادە نییە لەخۆی بپرسێت بۆچی و لە پێناوی چیدا چارەگە سەدەیەك زیاترە کچان وکوڕانی کووردلەشەڕی ناوخۆیدا بە کوشت دەدرێن''.

بەر پرسیەکەی یەکێتی دەڵێ کاتێ شەڕی پشت ئاشان کرا،لە لایەکی تر مەلا بەختیارو بەهادین نوری ڕێککەوتنێکیان ئیمزا کردبوو کە هێزەکانی هەردوولاڕوو بەڕوی یەك نەبنەوە،بەلام نەوشیروان گوێی بەمە نەداو قەسابخانەیەکی لەو شوێنە درووست کردکە تا ئێستاش بووەتە خاڵێکی ڕەشی ئێمە، زۆر لەو کارە خراپانەی لە سەردەمی شاخ کراون و بوونەتە ماڵ بەسەر یەکێتییەوە لە لایەن کۆمەڵەی ڕەنجدەران و نەوشیروانەوە ئەنجام دراون.

## ڕا پەرین چی لە نەوشیروان دەگۆڕێت؟

دوای ڕاپەڕین واقیعێکی تری جیابوو لە پێش خۆی و لە٩٢ەوە یەکێتی لە حیزبە شەڕەکەی شاخەوە بوو بە حیزبی دەسەلات دار و سەرۆکایەتی حکومەتی وەرگرت.ئەم واقیعە بۆ نەوشیروان مستەفا نوێ دەبێ و هاوکات بە پێ ی قسەی بەر پرسەکەی یەکێتی نامۆ و نەگونجاو بە فیکرو سیاسەتی نەوشیروان مستەفا دەبێ،وەك دەڵێت''لە دوای ڕاپەڕنیشەوە نەوشیروان مستەفا ویستی بەهەمان شێوازی سەردەمی شاخ ململانێکمان بەرێوە ببا،دوای ڕاپەڕین ڕاستە یەکێتی وهەموو حیزبەکانی کوردستان لە ژێر کاریگەری کەلتوری شاخ دا بوون،بەلام لە نێو خودی یەکێتیدا ئاراستەو ڕێبازێکی مەدەنیانەوە هێمنانەش هەبوو،کە هەوڵی دەدابە شێوەی زۆر باش کارلێك لوگەڵ واقیعی نوێ بکات ولە جیاتی ململانێ ی چەکداری خۆی بۆ ململانێ ی هەڵبژاردن و ئامادەکردنی بەرنامەی سیاسی گونجاو بۆ ئەو واقیعەو حکومەت داری و گۆڕان کاری لە کۆمەڵگادا بکات، ئەو ئاراستەو ڕێبازەش لای بەشێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هەبوو.بەلام بەهێزی

نەوشیروان لە ناو یەکێتیدا و بوونی خەت وکۆبوونەوەی زۆری کادیران لەدەوری ئەو خەتە وای کرد کە ئایدیایەکی تر لە نێو یەکێتی دا زاڵ بێ، کە ئەویش تەسفیە کردنی ململانێکانە بە چەك لەگەڵ لایەنی بەهێزی کوردستان کە پارتییە،لەوەشدا کۆسرەت ڕەسوڵیش هاو بۆ چوونی بوو''.

ساڵی ١٩٩٢یەکەم هەڵبژاردن لە کوردستان ئەنجامدرا، هەریەکە لە پارتی،یەکێتی وزەحمەت کێشان،سۆسیالست،گەل،پاسۆك،بزوتنەوەی ئیسلامی،شیوعی بەشداری هەڵبژاردنیان کرد،ئەوە بوو ئەو کات ئەنجامەکە واباسکرا کە پارتی لە٥١٪ کورسیەکانی پەرلەمانی بەر دەکەوێت و یەکێتی٤٩٪،بەلام لەسەر ئەو ئەنجامە خەریك بوو شەڕێکی گەورە لەکوردستان هەڵبگیرسێ،بەرپرسێکی پارتی پێ ی گوتم نەوشیروان سوور بوو لەسەر ئەوەی یان دەبێت یەکێتی براوە بێت یان دەبێت شەڕبێ و بەچەك خۆی بسەپێنێت،ئەو هەڵوێستەی بە ئاشکرا دەردەبڕی بۆیە ئەمە مەترسیەکی لای هێزە سیاسیەکانی دیکە درووست کردبوو،هەر بۆیە ئەوان سەریان خستە سەر پارتی بۆ ئەوەی شەڕ هەڵنەگیرسێ،ئەو تەنازوولە بکات، هاوکات پارتیش لە ڕووی هێزی سەربازییەوە ئامادە نەبوو بۆ شەڕ،بۆیە پارتی تەنازوولی کردو حکومەتی فیفتی فیفتی پێکهات،کە دواتر بەهۆی ڕیککەوتنی واشنتۆنەوە ئەنجامە ڕاستەقینەکە جێ ی خۆی گرت.

ئەگەر چی ئەوکات بەهۆی تەنازوول کردنی پارتی لە کورسییەکەی خۆی ئەو شەڕە هەڵنەگیرسا،بەلام پاش ٣ساڵ شەڕەکە هەلگیرسا،بەرپرسەکەی یەکێتی لە بارەی ئەو کاتەوە دەڵێ''ئێمە چاوەڕێ بووین لە هەڵبژاردن ببەینەوە بەو پێ یەی پارتی بۆ ماوەیەکی زۆر لە سەردەمی شەڕی براکوژیدا لە ناوچەی سۆران و جودێکی وەهای نەبوو،هەروەها لە ڕووی چالاکی و بانگەشەکاری ئیعلامی و توانای ڕێکخستن،ئامازەکان وایان نیشان دەدا کە ئەنجامەکان لە قازانجی یەکێتی دەبێت،بەلام کە ئەنجامەکە دەرچوو بۆ یەکێتی وەك هێدمە وابوو''.

دوای ئاشکرا بوونی ئەنجامەکان ئیتر کێشەکان لێرەوە دەست پێدەکەن و بەرپرسەکە دەڵێ''نەوشیروان زۆر توند بوو،ئەو دۆڕانەی هەرگیز قبوڵ نەبوو،یەکێك لە خاسیەتە کەسیەکانی نەوشیروانیش ئەوەیە کە لە حاڵەتی شکست لە ڕووی نەفسیەوە زۆر ئامادەیە بۆ هەڵچون.دەرکردنی بڕیاری زۆر توند کە ئەنجامەکەی زۆر جار خراپ دەکشێتەوە''.

**ڕووخسارە دیارەکەی سەردەمی شەڕ**

چاودێرانی سیاسی هەمیشەپێیان وابووە کە نەوشیروان کە زۆرتر لەگەڵ کەشی بارگژی و شەڕداهەڵدەکات،نەك ئاشتی وتەناهی،بۆیە لەدوای ڕاپەڕینەوە ئەو کاتانەی شەڕ هەبوو بێت نەوشیروان کەسێکی باڵای نێو پرۆسەی سیاسی بووە،کە هودنەو ڕێکەوتنی ئاشتیش دەرکرا خۆی ون دەکردو لەبەر چاوی میدیا نەدەما.لە ساڵی ١٩٩٤کاتێك کێشەکانی پارتی و یەکێتی تا دەهات زۆرتر دەبوون.نەوشیروان کاراکتەرێکی بەهێزی بەگەڕ خستنی کێشەکان بووە،ئەو کات زۆر لێدوان وگوتاری توندی توندەدا.لەو ساڵە هەریەك لە دکتۆر ڕۆژ نوری شاوەیس وفەلەکین کاکەیی وەك دوو کەسایەتی سیاسی نەك وەك پلەی حیزبیان کە کەمیان ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی وجێگری سەرۆکی حکومەتی هەرێم و دووەمیان ڕاوێژکاری سیاسی بارزانی بوو،ووتارێکیان نووسی داوایان کرد پارتی ویەکێتی یەکبگرن لەبەر ئەوەی هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەو دوو حیزبەدا نییە،بەڵام ئەو کاك نەوشیروان مستەفا زۆر ئیستفزازیانە وەڵامی ئەو ووتارەی دانەوەو گووتی پارتی حیزبێکی عەشایەرییە ویەکێتی حیزبێکی مۆدێرنە و ناکرێ لە حیزبێکدا یەکبگرن،ئیتر هەمووئەمانە بوونە هۆی ئەوەی باروو دۆخەکە لە تەقینەوە نزیك بێت.

لە ئایاری ١٩٩٤شەڕی نێوخۆ لە قەڵادزێوە هەڵگیرسا،هەر زوو زۆر ناوچەی دیکەی کوردستانی گرتەوە،هەولێر وەك پایتەختی حکومەت و وەك ناوەندێکی بڕیاریش بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان وەك سەرەداوی مانەوەی پەیوەندی پارتی و یەکێتی هەوڵ دەدرا شەڕی تیا نەبێت،بەڵام وەڵامی نەوشیروان ئەو کاتە ئەوە بوو ''هەولێر کوێ ی موقەدەسە تا شەڕی تیا نەکرێت''بەر پرسەکەی یەکێتی دەڵێ ئەو کاتە جگە لەبەر گرنگی هەولێر وەکوپایتەختی حکومەتی هاوبەش و هاوکات شەڕ نەکردن لە هەولێر نیشانەی نیاز پاکی بوو کەدیارە سەرکردایەتی هەردوو حزب دەیانەوێت ئاوێك بەئاگری شەڕەکە بکەن و نەهێڵن زیاتر تەشەنە بکات،هەروەها بەرپرسە هەولێریەکانی پارتی و یەکێتیش لە نێو خۆیاندا ڕێککەوتبوون کە شەڕەکە لە شارەکەی خۆیان دوور بخەنەوە،کە ئەو کات سەعد عبداللە بەرپرسی لقی دووی پارتی و ئەرسەلان بایز بەرپرسی مەڵبەندی سێ ی یەکێتی بوو،ئەو دوانە خزمیش بوون،بەڵام نەوشیروان ڕازی نەبوو شەڕ لە هەولێر نەکرێت، کە شەڕی هەولێریش کرا ئیتر بارو دۆخەکە لە دەست چووو ئەوەی دواتریش بە ٣١ی ئابەوە کە بەسەر یەکێتی هات،هەمووی نەوشیروان لێ ی بەرپرسە ''.هەروەها دەڵێت ''نەبوونی مەرکەزییەتی بەهێز لە ناو یەکێتیدا لەو کاتانە سلبیاتەکانی بەدەر دەکەوێت،لەبەر ئەوەی

باڵە بەهێزەکان هەر کاتێك بیان ویستایە شتێك پێچەوانەی ڕێکەوتنەکان بکەن دەیان کرد''.

لەو کاتەدا پارتی ویەکێتی زۆر دانیشتنیان دەکردو لە هەندێ جاریش دەگەیشتە ڕێکەوتن،تەنانەت ئەو کات ڕێککەوتنێکی ستراتیژی تا ساڵی ٢٠٠٠لە نێوانیاندا مۆر کرا،بەلاَم وەك بەر پرسەکە دەڵێ لەناو یەکێتیدا نەوشیروان مستەفا دژی ئەو ڕێکەوتنە لە بار ببات،لە باریشی بردو لە چەند شوێنێك ئەمری بە هێزەکان دەکرد پەلاماری هێزەکانی پارتی بدەن،بۆیە لەو کاتانە نەوشیروان موسەببی سەرەکی بوو،هەم لە هەڵگیرساندنی شەڕی ناوەخۆ هەم لە نەگەیشتنە ڕێککەوتن ودانەمرکاندنەوەی شەڕ،ئەو هەستم دەکرد لەزەتی لە شەڕو دووبەرەکی و ئاژاوە دەبینی،هەر بۆیە کاتێك هودنە دەکرا تێکی دەداو دەزگا ئیعلامییەکان جۆش دەدا بۆ هێرش کردنە سەر پارتی و بنەماڵەی بارزانی و دەتوانم بڵێم داینە مۆی بەگەڕ خستنی شەڕە جنێو تەشهیرکردنەکانی سەر وەختی شەڕی ناوخۆوە بوو لە نێو یەکێتی ''.ئەو کاتە پارتیش هێرشە ئیعلامیەکانی زۆر تر لەسەر نەوشیروان مستەفا بوو،بە تایبەتی باسی ئەو کردەوەیەی دەکرد کە نەوشیروان لە دوای بە یاننامەی ساڵی ١٩٧٠قومبەلەیەك دەخاتە قوتابخانەیەکی کچان لە سلێمانی. مەسعود بارزانی لە کتێبەکەی خۆشیدا باسی لەو ڕووداوە کردووە.

دوای ڕێککەوتنی واشنتۆن لە ئەیلولی ١٩٩٨پارتی و یەکێتی کۆبونەوەی بەردەوامیان هەبوو بۆ گەیشتنە ڕێکەوتن،

ئەو کۆبونەوانە لە دوای ڕووخانی بەعسەوە چڕتر بوونەوە،ئەو کاتە نەوشیروان کەسێکی کارای نێو دانیشتنەکان بوو،وۆر جار پارتی و یەکێتی ساردی دەکەوتە نێوانییان، ئەو کاتیش دەگوترا کە نەوشیروان لە بەرامبەر مەرجەکانی پارتی زۆر توندە و هۆکارێکە بۆ نەگەیشتنە ڕێکەوتن،ئەو بەرپرسەی یەکێتی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە نەوشیروان مستەفا حەزی لە ڕێکەوتن بەوشێوەیە نەبوو،زۆر جار هەنگاوی باش دەران،بەلاَم لە خالێکدا نەوشیروان دەیوەستاند پرۆسەکەی خاو دەکردەوە،ئەو دەیویست یان مەرجەکانی ئەو هیچ نین،بەلاَم مام جەلال زۆر پەرۆشی ڕێککەوتن بوو،قوربانیشی بە هەندێ شت دەدا بۆ ئەوەی ناوماڵی کورد ڕێکبخرێتەوە،یەك لەو هۆکارانەی کە نەوشیروان نارازی بوو وکەشی گرژی دەخستە ناو باڵەکانی یەکێتی ئەوە بوو دەیویست بڵێ مام جەلال لە بەرامبەر پارتی

تەنازوول دەكات،چونكە ئەو دەیویست لە هیچ شتێك تەنازوول نەكرێ و هەرشتێك ئەو بیەوێت ئەوە سەر بگرێت،كە ئەمەش لە دانوستاندا بوونی نییە''.

وەك پرسەكەی یەكێتی باسی دەكات لێرەوە هەوڵەكانی نەوشیروان لە خستنە گەڕی باڵەكەی بۆ سەرنەگرتنی ڕێكەوتنی پارتی و یەكێتی دەست پێ بكات،بەڵام كە نەیتوانی ئیتر كەووتە بیانوو،كە گوایە یەكێتی پێویستی بە ڕیفرۆم هەیەو دەبێ چاكسازی بكرێت،بۆ ئەمەش هەموو ڕێگاكانی ڕێكخستن و ڕاگەیاندنی گرتە بەر،لە ژێر ناوی ڕیفرۆمدا كەوتنە بانگەشە،بۆیە لەم چەند ساڵەی ڕابردوو ململانێ ی كوتلەكانی ناو یەكێتی لە هەموو كاتێك بەهێز تر بوو،زۆر جار هێزیش تێیدا بەكار دەهات وكوژراویش هەبوو.لە ئەنجامدا كوتلەكەی نەوشیروان

تووشی شكست هات خۆیشی چاوەڕێ ی ئەنجامێكی وەها نەبوو،ئەم ئەنجامە نەوشیروانی توشی حاڵەتێك كرد كە چیتر نەتوانێ لە پۆستی لێپرسراوێتیدا بمێنێتەوە،لەو ئەنجامەدا پارتیش ڕۆڵ وكاریگەری كەم نەبوو،دەرفەتێك بوو بۆ پارتی كە ئەو نەیارە سەر سەختەی بێهێز بكات.

زۆر جار باس لە نەبوونی ئۆپۆزسیۆنێكی كاراو تەندروست لە كوردستان دەكرێ،ئەمەش خاڵێكی لاوازی پرۆسەی دیموكراسی هەژمار دەكرێ،كە لەهەر تەجرووبەیەكی دیموكراسیدا بوونی ئۆپۆزسیۆن مەرجێكی سەرەكیە،ئێستا نەوشیروان خۆی ئۆپۆزسیۆن مەرجێكی سەرەكییە، ئێستا نەوشیروان خۆی وەك ئۆپۆزسیۆنێكی دەسەڵاتی كوردستان دەخاتە ڕوو،هەندێ جاریش لای هەندێ ڕۆژنامەنووسانەوە بە پاڵپشتی ڕاگەیاندنی ئازاد قەڵەم دەدرێ،بەرپرسەكەی یەكێتی لە بارەكانی كارەكانی ئێستای نەوشیروان مستەفاوە دەڵێت ''نەوشیروان كۆمپانیای ووشەی بە پارەی یەكێتی درووست كردوو،من پێم وایە دەیەوێ لەو ڕێگایەوە خۆی نمایش بكاتەوەو كاریگەری لەناو یەكێتی دروست بكاتەوە،بەڵام ناڕاستەو خۆ لە پشت هاوڵاتیاتی و ئاوێنە ولڤینە،هەروەها بە دڵنیاییەوە دەڵێم لە پشت كوردستان پۆستەوەیە بۆ ئەو قسانەشم بەڵگەم هەیە كە ئەو سایتە تا ئێستای پەلامارى هەرچی سەركردەو لێپرسراوی پارتی و یەكێتی داوە،بەڵام تا ئێستا بە خراپ باسی نەوشیروان مستەفای نەكردووە ئەوە جگە لەوەی چەند نووسەرێكی كوردستان پۆست ئێستا لە كۆمپانیاكەی نەوشیروان مستەفا كاردەكەن،وەك هیوا گوڵ محەمەدی. هەروەها سڕی ئەوە چییە ئەوەی لە هاوڵاتی یان ئاوێنە واز دێنن لە كۆمپانیای ووشە كارێكی دیكەی پێ دەدرێ،

بەمەش دەیەوێ تۆڵەی ئەو شکستانە بکاتەوە کەلە ماوەی ئەخیرد لە کاری سیاسی و حیزبیدا تووشی بوو، وەك ڕق هەلگرتنێکیشە لەوەی کە ئەوەی دەیویست بۆی نەچووە سەر،بۆیە جار بەجار پشتی ئیسلامیەکانیش دەگرێ تەنیا بۆ ئیستفزازکردنی پارتی و یەکێتییە ئەگەر نا لە فکردا نێوانیاندا نێوانیاندا ئاسمان ورێستانە،بۆیە ئەوەی ئەو هەوڵی ئەو هەوڵی بۆ دەدات تۆڵەیە لەو شکساتانەی بەسەریدا هاتووە، نەك ئۆپۆزسیۆنێکی بەرنامەدار،،.

ئەو بەر پرسەی یەکێتی پێ ی وایە نەوشیروان هەرگیز بۆ ئۆپۆزسیۆنی دەست نادات،چونکە::

١-نەوشیروان بە درێژای ماوەی سیاسەت کردنیدا کەسێکی دەسەڵاتدار بووە،لە چاکەو خراپەکانی یەکێتیدا دەستی هەبووە،بۆیە ئەوەی ئێستا ڕەخنە لە سیاسەتی کوردی لە ماوەی ڕابردوودا دەگرێ،جێگای سەرسوڕمانە،چونکە ئەو خۆی کەسێکی کاراو کاریگەری نێو گۆڕەپانی سیاسی و کوردستان بووەو تەنانەت لە ساڵی ١٩٩١یەکێك لە ئەندامانی شاندی بەرەی کوردستانی بۆ ووتو وێژی لەگەڵبەغدا و لەپاش ڕووخانی ڕژێمیش ئەندامی شادی کوردی بووە بۆ گفتوگۆکان لە بارەی داڕشتنی دەستور و لە ناو خودی یەکێتیشدا جێگری تاڵەبانی بووە،کەواتە یەکێك بووەلەوانەی کاریگەری لە سەر بڕیاری سیاسی هەبووە.
٢- نەوشیروان بەو فکرو سیاسەتەی هەیبوە،هەمیشە جۆشدەری ململانێ سیاسیە گەرمەکانی نێو کوردی بووە،سەرکردەیەکی کارای نێو شەڕی براکوژی بووە کە دەتوانم بڵێم خۆشکەری ئاگری شەڕی برا کوژی بووە، لەو حاڵەتە کەسێکی وانابێتە ئۆپۆزسیۆنێکی تەندروست.

٣-ئەو هێزە ئیعلامیەی کاری پێدەکات بە پارەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دەیکات،هەر خۆیشی تەنیا وازی لە پۆستی سیاسی هێناوە،ئەگەر نا ئێستاش یەکێتییە،تا ئێستا بەو ئاڕاستەیە بەو ئاڕاستەیە کاری کردووە،ڕەنگە لەسەر داوای مام جەلال لە کۆنگرەی داهاتووی یەکێتی بگەڕێتەوە ناو کۆنگرە،بۆیە ئەمە وەك کارکردنێکە بۆ خۆی،دەشبینین کوتلەکەی لە ناو یەکێتی بە ئەفکاری ئەو کاردەکەن''.

ئەو جۆرە کارکردنەی نەوشیروان مستەفا زۆرتر یەکێتی نیگەران کردووە،چونکە لە پەیوەندیکردنم بە بەرپرسێکی باڵا دەستی پارتی لە بارەی ئەو باسەوە هیچ شتێکی نەدرکاند، بەڵام ئێستا نەوشیروان بە کەسێکی یەکێتی دەزانین،چونکە خۆی تا ئێستا بە بانێکی بڵاونەکردوەتەوە کەمن لە یەکێتی چوومەتە دەر،بۆیە ئەگەر تێبینیەکمان هەبێت ڕاستەو خۆ بە یەکێتی دەڵێین نەك نەوشیروان ''.

## نەوشیروان مستەفا خەون بە دروستکردنەوەی میرنشینی بابانەوە دەبینێت

رِاپۆرتی: :نەبەز گۆران

نەوشیروان مستەفا ئەو کارەکتەرە یە لە دەرگاکانی یەکێتییەوە دەچێتە دەرەوەو لە پەنجەرەکانیەوە دێتە ناوی.هەموو دەرچونێکی نەوشیروان لەناو یەکێتیدا گەرِانەوەیەکی لە گەڵدایە.ئەم پیاوە ناتوانێت بێ یەکێتی بژی و ناشتوانێت لە ناویدا بژی،بوونی ئەم کارەکتەرە سیاسیە پەیوەستە بەحیزبەکەوە،لەدەرەوەی یەکێتی دەبێتە ئەو غەریبەیدی خەون بەنیشتمانەوەدەبینێت، هەر چۆن غەریدەیەك هەمیشە بیر لەوانە دەکاتەوە بگەرِێتەوە وەتەنی خۆی، بەهەمان شێوەش نەوشیروان مستەفا کاتێك لە دەرەوەی یەکێتی خۆی دەبینێتەوە،خەونی ئەوەیە چۆن جارێکی دی بگەرِێتەوە بۆ نیشتیمانەکەی کە یەکێتییە،لەماوەیەکی کەمدا لەم دواییەدا تیمەکەی نەوشیروان(واتە کەتولەکەی)لەماوەی"٢٦"رِۆژدا لە مانگێکدا"٦"جار تاڵەبانییان بینی.بینینەکانیش بینینی تایبەت بوون تەنها بە تاڵەبانیو گروپەکەی نەوشیروان بە بێئامادە بوونی هیچ ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی،ئەم بینینەش هێندەی پەیوەندی بە گۆرِانکاریە سیاسیەکانی ناو یەکێتییەوە هەیە، هێندە پەیوەندی بە دۆستایەتی نێوانیانەوە نییە،چونکە تاڵەبانی یەکێکە لەو سیاسیانە تەنانەت لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی خۆشیدا سیاسەت دەکات، تەنانەت لەو حاڵەتانەی لەگەڵ دۆستەکانیشی دا تێکەڵ دەبێت.ئەو تێکەڵ بوونەش، تێکەڵ بوونێکی سیاسیە نەك کۆمەڵایەتی، بۆیە لەهەموو حاڵەتێکدا دەبێت لەگەڵ تاڵەبانی پەیوەندی سیاسی ببەستێت نەك پەیوەندی کۆمەڵایەتی.تاڵەبانی لە هەر شوێنێکیش بەرژەوەندییەکی سیاسی بەدی بکات.ئەمرِۆ نەوشیروان بۆ تاڵەبانی ئەو گاڵۆکەیە هێزیپێدەبەخشێت،ئەم حاڵەتەش پەیوەندی بە قودرەتی نەوشیروانەوە نییە بۆ پشتگیری تاڵەبانی،هێندەی ئەوەی پەیوەندی بە ترسی تاڵەبانییەوە هەیە بەرامبەر بە هەیبەتی کۆسرەت رِەسوڵ کۆسرەت رِەسوڵ بۆتە مەترسیەکی گەورە بۆ تاڵەبانی و بۆ ئایندەی خەونەکانی نەوشیروانیش،سیاسەیەکی ناو یەکێتی پێ ی وابوو "نەوشیروان لەم کاتەدا لە پێناوی سرِینەوەی کۆسرەت رِەسوڵدا،تەسەور دەکەم ئامادەیی تیایە بۆ هەموو رِێکەوتنێك".

کۆسرەت ڕەسوڵ لوگەڵ نەوشیرواندا لە سەرەتای پرۆژەکانی دا هەنگاوی ناو لەپشت پرۆژەکەشەوە سیاسەتی خۆی کرد،بۆیە هەڵبژاردنەکان بوونە هۆی دەرخستنی قودرەتی کۆسەت ڕەسوڵ لە ناو سەرجەم تەکەتولەکانی یەکێتیدا،تەنانەت ئەو شارە شاری نەوشیروان بوو،ئەوەندەی دەنگیان بە کۆسرەت دەدا، دەنگیان بە نەوشیروان نەدا،دەبووایە نەوشیروان دوای ئەو تاقیکردنەوەیەی خۆی نەچوایەتە دەرەوەی یەکێتی و ئیشی بۆ ئەوە بکردایە لە هەڵبژاردنێکی تردا جارێکی تر چانسی خۆی تاقی بکاتەوە،بەلأم دەبێت لێرەدا بپرسین: ئایا تاڵەبانی و نەوشیروان دەتوانن لە هەیبەتی کۆسرەت ڕەسوڵ کەم بکەنەوە؟ئەگەر دەیان توانی بۆچی لە هەڵبژاردنەکاندا ئەمەیان نەکرد؟دوای هەڵبژاردنەکان ئەم هەولأنە تا چەند تەندروستن؟کەمکردنەوەی هەمبیەتی کۆسرەت ڕەسوڵ چەند لە بەرژەوەندی پارتیدایە وەك حیزبێکی بەرامبەر بە یەکێتی؟هاتنەوەی نەوشیروان بۆ ناو دەسەلأت بەسە بۆ ئەوەی تاڵەبانی ترسەکەی بڕەوێتەوە بەرامبەر بە کۆسرەت ڕەسوڵ؟ئەی ئەگەر نەوشیروان جارێکی تر گەڕایەوە، تاڵەبانی ترسی لێ ی دروست ناکاتەوەو لە دژی نەوشیروان ڕێککەوتنێك لەگەڵ کۆسرەت ڕەسوڵدا مۆرناکاتەوە؟ئەی ئەگەر نەوشیروان و تاڵەبانی ئەم نەخشەیەیانسەری نەگرت،چی دەقەومێت؟گەر کۆسرەت ڕەسوڵ وەك نەوشیروان بیر بکاتەوەو بچێتە دەرەوەی یەکێتی،یەکێتی تووشی ئیفلیج بوونێکی مەترسیدار نابێت،ئەمانە هەموو ئەو پرسیارانەن دوا دانیشتنەکانی تاڵەبانی و تەکەتوولی نەوشیروان دێنە بەردەم یەکێتی.

ڕاستە تاڵەبانی بڕیار بەدەستی یەکەمی یەکێتییە، بەلأم جەمسەرەکانی تری وەك کۆسرەت کە ئێستا بەهێز ترین جەمسەری یەکێتییە لە ئاستی ناوخۆی یەکێتیدا نەبووەتە بار گرانیەك بۆ تاڵەبانی و نەوەکانی؟هەڵبەتە ئەوە ڕوونە کە تاڵەبانی لە هەوڵی ئاشت کردنەوەی نەوشیروانە لە پشت سێبەرەکەی کۆسرەتەوە،نەوشیروانیش دەیەوێت بەهەیبەتێکەوە بگەڕێتەوە ناو یەکێتی کە بتوانێت ئەو حیزبە بخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، بەلأم بۆ ئێستای نەوشیروان زەمیندەکە لە بارینە، چونکە سێبەری کۆسرەت و تاڵەبانی ئەو دوو سێبەرەن یەکێتی لە ژێریاندا بە ئازارێکی زۆرەوە دەژی،بەرپرسێکی یەکێتی پێی ووتم"تاڵەبانی بۆیە هەوڵی گەڕانەوەی تەکەتولی نەوشیروان دەدات چونکە پاش هەڵبژاردنەکان جگە لە کۆسرەت ڕەسوڵ چەند مەڵبەندێکی برد،دوای هەڵبژاردنەکانیش دوو مەڵبەندی سەر بەتاڵەبانی کەسپکردووە بۆ خۆی،ئەمەش

بەتەواوەتی حاڵی تاڵەبانی شپرزە کردووە"دیارە کردنەوەی دەرگاکەی نەوشیروان بۆ ئێستای تاڵەبانی تروسکایەکە دوور نییە ڕێگاکانی لێ وون بکات، چونکە هەرگیزکۆسرەت نەی وویستووە شوێنی تاڵەبانی بگرێت بۆ خۆی،بەڵام نەوشیروان بەدەم چاوەڕوانییەوە سەیری ئەستێرەکانی مەرگی تاڵەبانی دەکات،دەبێت تاڵەبانی لەوە تێبگات ئەوەی دێتە شوێنەکەی و چاوی بڕیوەتە کورسیەکەی نەوشیروانە نەك کۆسرەت.هەر هەنگاوێکی تاڵەبانی بۆ گەڕانەوەی نەوشیروان لەق کردنی کورسیەکەی خۆیەتی،دیارە نەوشیروانیش بەو ئاسانییە ناگاتە ئەو باوەڕەی بە لۆژێکی تاڵەبانی بگەڕێتەوە،چونکە لۆژێکی کاڵ کردنەوەی کۆسرەت ڕەسوڵە،لۆژێکی نەوشیروانیش کاڵکردنەوەی هەردووکیانە هەم تاڵەبانی هەم کۆسرەت ڕەسوڵ ئەم پڕۆژانەی ئەمڕۆی نەوشیروان بەڕێوەیان دەبات پڕۆژەی ئێستا نین.پڕۆژەی ئەو خەونەن کاتێك کوتای تاڵەبانی دیت و سەردەمی دە سەڵاتی باڵای نەوشیروان دەست پێ دەکاتەوە، ئەم دەسەڵاتەش تەنها لە سنوری سلێمانی تێ ناپەڕێت. ڕەنگە گرنگ بێت لێەدا بپرسین:بۆ تەنها سنوری سلێمانی ئەم وەڵامانە دەبێت بگەڕێنینەوە سەر نووسینەکانی نەوشیروان مستەفا کەهەمیشە لە ژێر کاریگەری ئیمارەتەکاندا ژیاوەو بەشێکی بیرکردنەوەی خۆی تەرخان کردووە بۆ ئیمارەتەکان،دووریش نییە گەر بکەوێتە سەر دەسەلات بگەڕێینەوە بۆ ئەسڵی بیر کردنەوەکانی خۆی و دەست بۆ خوڵقاندنی زەمینەی ئیمارات ببات،بەڵام بە مۆدێلی ئێستا، یەکێك لە دەسەلاتدارەکانی سەر بە تیمەکەی نەوشیروان لە دانیشتنێکدا پێ ی ووتم "گەر کاك نەوشیروان دەسەڵاتی ئابووری بەهێز بێت،دەتوانێت یەکێتی هەڵبووەشێنێتەوە "ئەمە ڕەنگە بۆ سنوری سلێمانی قسەیەکی مەنتیقی بێت،بەڵام بۆ سنوری هەولێر وەهمێکە زەحمەتە بێتە دی، هەولێرییەکان ئەوەندەی پەیوەستن بە کۆسرەت ڕەسوڵەوە هەرگیز ئەوەندە پەیوەست نین بە یەکێتیشەوە نەك نەوشیروان مستەفا.یەکێك لەو خاڵانەی کە خەڵکی هەولێری تووشی ڕق لێ بوونەوە کردووە بەرامبەر بە نەوشیروان، قسە بەناوبانگەکەی نەوشیروانە کاتێك بۆ تەفسیری هەولێر دەڵێت "هەولێر گوندێکی گەورەیە ".ئەم قسەیە بۆ ئیستای هەولێر قسەیەکی نا تەندروستە، چونکە هەولێر ئەو ئاستەی تێپەراند بەو شێوەیە ببینرێت،بەڵام کێشەکە ئەوەیە ئەم قسەیە بەردەوام دەوترێتەوەو لەگەڵ هەموو ووتنەوەیەکی ئاستی هەیبەتی نەوشیروان لای هەولێریەکان کاڵ دەکاتەوە،بەتایبەتی ئەو هەولێریانەی لە ناو یەکێتیدا دەژین و ئێستا سەر بەتەکەتوولەکانی تری دەرەوەی باڵی نەوشیروانن،هەر

یاسیەکی تری ناو یەکێتی گەر بیەوێت لە سنوری هەولێر بالآنسی نەوشیروان نەبەزێنێت، ئەم قسەیە بەسە بۆ دابەزاندنی بالآنسی ئەو کارەکتەرە سیاسیەی ناو ەکێتی.حاڵەتێکی تری نەوشیروان کەوای لێ دەکات شکستەکانی زیاتر بن لە ەرکەوتنەکانی،ئەوەیە بەردەوام بەوە ناسراوە کارەکتەرێکی شەڕەنگێزە، بەلآم بەر رسێکی بالآی یەکێتی پێ ی وتم: ڕاستە نەوشیروان لە شەڕەکاندادەوری هەبوو بەلآم ۆمەلێك کەسی تری ناو یەکێتی هەن کەڕەقەم نین وناشکرێت بچنە ناو نووسینی بدییەوە،بەردەوام دینەمۆی شەڕو دینەمۆی تەکەتولن، لەوانەش: ئەرسەلان یز،هەرچەندە ئەم پیاوە خۆی بوونێکی بە هێزی نییەو بەردەوام لە ژێر سێبەری ئەوانی ردا دەژی،بەلآم بناغەی شەڕو تەکەتولە".پێشمەرگەیەکی جوامێری بە هێزی یەکێتی پێ وتم "ئەرسەلان بایز یەکێك بوو لەو بەر پرسانەی هەموو جارێك یەکەم کەس ئیمزای ەکرد بۆ دروست بوونی شەڕی ناوخۆ. کەچی لەشەڕەکاندا ئەوەندەبینرا ەبوو،هەمووجارێك کۆسرەت ڕەسوڵ ئیجازەی دەداودەیناردەوە بۆماڵەوە،تا چەند جارێك ۆسرەت تووڕە بوو بە تاڵەبانی ووت:ئەم پیاوە یەکەم کەس ئیمزای شەڕ دەکات و یەکەم ەسیش داوا دەکات بچێتەوە بۆ ماڵەوە "بەیەکێك لەتەکەتولەکانی نەوشیروان مستەفا بۆی ێڕامەوە ووتی"کاك کاتی گەرمەی دوورکەوتنەوەی نەوشیروان مستەفا جارێکئەرسەلان ایز خەبەری نارد بوو،ووتبوی:بەهەر دەپەنجەکەم ئیمزا دەکەم،نەوشیروان بێت ەسکرتێری یەکێتی بەمەرجێك لەمەکتەبی سیاسی بمێنمەوە،نەوشیروان مستەفاش پێ وتبوو ئەو ڕۆژەی بوومە سکرتێری یەکێتی.ئەرسەلان و مەلا بەختیارو عمر فەتاح ەوانەی زیندان دەکەم".ئەمڕۆ زەمینە خۆشکەری ئەم تەکەتولانە زیاتر ئەو کارەکتەرانەن ، ژێر سێبەری سی جەمسەرەکەدان نەك خودی جەمسەرەکان.

## نەوشیروان مستەفا سیزیفەکەی یەکێتی

سیزف ئەو پالآوانەیە هەمیشە بەردێك لەسەر شانیەتیو دەیباتە سەر لوتکەی اخەکە،کاتێك دەگاتە،جارێکی تر بەردەکە بەردەبێتەوەو دێتە خوارەوە.دیسانەوە سیزیف ەردەکە هەڵدەگرێتەوەو دەیباتەوە بۆ لوتکەکە،ژیانی سیزیف بەم شێوەیە تێدەپەڕێت تا ەرگ دێتە لای. نەوشیروان مستەفاش بەهەمان شێوە تووشی ئەو حاڵەتەی سیزف بووە ەناو یەکێتیدا، هەمیشە دەچێتە سەر لوتکەو دێتە خوارەوە،ئەمە ژیانی سیاسی ئەم پیاوە ووە تا ئەو ڕۆژەی کوتایی دێت،نائومێدییەکانی نەوشیروان ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبن وەك

نائومێدییەکانی سیزف،هەرگیز ڕوی نەداوە بە بەردەوامی بەبێ کەوتن و هەڵسانەوە ل
خوارەوە بمێنێتەوە یان لە لوتکەدا، ئەوەی واشی لێ دەکات بەم شێوەیە سیزفی
بژیت،خودی خۆیەتی نەك تەکەتولەکانی تری ناو یەکێتی. سەیرکە کۆسرەت ڕەسو
پێشمەرگەی نەوشیروان بووە،بەلاّم ئەمڕۆ کۆسرەت ڕەسوڵ و نەوشیروان تووشی گەورەتری
شکست دەکات بە بە دەنگهێنان، کەواتە دەبێت نەوشیروان دان بەوەدا بنێت پێشمەرگەکە
لە ڕووی سیاسی و جەماوەرییەوەزۆر لە خۆی بەهێز تر بووە،بۆیە بۆتە گردێکی گەورە ل
بەردەمیدا.ئەمڕۆش ئەمرۆش گەر هەولێرییەك بدات بە پشت بەستنتاڵەبانی بۆ کا
کردنەوەی کۆسرەت ڕەسوڵ هەولێکە تر دەیهێنێتەوە خوارەوەو دەبێت بۆ چەند ساڵێکی ت
بەردەکە بگریت کولیەوەو چاوەڕێ ی سەرکەوتن بکاتبۆ لوتکە.تۆ کاتێك دەتوانیت کەسێ
بخەیت.جەماوەری نەبێت وئەدای لاواز بێت،لەگەڵ جەمسەرێکی بەهێزی نا
حیزبەکەتدابڕ کردنەوەلە کەوتنی کارێکی ناتەندرووستە.چونکە تاڵەبانی کاتێ
دەستەکانی لە نەوشیروان نزیك دەکاتەوە،هەستی بەمەترسیەکی تر کردبێت، لە هە
شوێنێکیشدامەترسیەکە لەسەر خۆی ڕەوییەوە،ئاڕاستەی مەسەلەکان دەگۆڕێت و نەوشیروا
دەکات بەمەترسی بۆ خۆی تا جارێکی تربیخاتەوە دەرەوەی یەکێتی.لە هەمو
حاڵەتێکیشدا،کاڵ کردنەوەی کۆسرەت لە هەموو حاڵەتێکیشدا،کاڵکردنەوەی کۆسرەت کاڵ
کردنەوەی یەکێتییە لە هەولێر،ئەو شارەی یەکێتی خەونی پێوەدەبینێت بیکات بە هی
خۆی هەولێرە نەك سلێمانی، چونکە سلێمانی لە ڕووی دەسەلاّت و جەماوەرییەکەیەو
بووە بەهی یەکێتی،دەکرێت بیر لەوە بکاتەوە هەولێر بکات بە هی خۆیئەویش تەنه
دەتوانێت لەو دەرگایەوە بچێتە ناو هەولێر کە لەسەری نوسراوەکۆسرەت ڕەسوڵ،ئە
کاراکتەرە سیاسەش یەکێتی خۆی بەهێز کردووە،ئیدی چۆن ئێستا دەتوانێت ئەو هێزەی
لێوەر بگیرێتەوە، لە کاتێکدا هێزەکەی بەرامبەر بە خودی یەکێتییە. بەدیوێکی
ترداڕێگەدان بە هێزتربووونی کۆسرەت ڕەسوڵ دیسان کێشەکان گەورەتر دەکات بۆ تاڵەبانی
تەنها چارەسەرێك بۆ تاڵەبانی،تێکەڵ بوونە لەگەڵ سەرجەم جەمسەرەکان نەك شەڕکردن
لە گەڵیاندا.

## تاڵەبانی و نەوشیروان ماڵی پارتی ئاوەدان دەکەنەوە

کاتی خۆی نەوشیروان کاندید کرا بۆ پۆستی جێگری سەرۆکی هەرێم،قبوڵی نەکرد،ئەم
جارەش تاڵەبانی لەم گۆڕانکاریانەدا دەیەوێت بە تموحی بەخشینی کۆمەڵێك پۆستی

ئیداری بە تیمەکەی نەوشیروان وخودی خۆیشی بیان خاتەوە ناو گەمە سیاسیەکانی خۆی، بەلام دۆستێکی نەوشیروان پێ ی ووتم"کاك نەوشیروان ووتی:من کاتێك پۆستی سەرۆکی حکومەتی و جێگری سرۆکی هەرێمم بۆ دانرا،خەلکێکی زۆر خەونی بەو پۆستەوە دەبینی،من نەم کرد،ناکرێت ئێستە بە تموحی ئەو پۆستانەی بۆ ئێمە دادەنرێن،خۆمان بخەینەوە ئەو شوێنەی کە قبولمان نەبوو بەو شێوەیە تیادا بژین".

نەوشیروان مستەفا باوەڕی تەواوی بە گۆڕینی سەرتاپای هەیکەلی یەکێتییە،گووتارەکانیشی لە ئاستی حیزبییەوە گۆڕاون بۆ ئاستی نەتەوەیی،لەهەموو دانیشتنە دۆستانەکانی دائەوەندەی باس لە دەولەت بوون وچاکسازی دەکات،ئەوەندە باس لە پەیوەندییە ناو کۆکەکانی ناو کاراکتەرەکانی یەکێتی ناکات، بەلام برینێك لەسەر جەستەیەتی هەولی ساڕێژ کردنی دەدات،ئەو برینەش ساڕێژ نابێت تا تالەبانی هەناسە بدات،هەرچەندە لە کۆنگرەی ئەمجارەی یەکێتی دا لە کۆی"٤٥"ئەندامی مەکتەبی سیاسی وسەرکردایەتی،"١٥"ئەندامیان دەگۆڕدرێن، وەلێ ئەمە بەس نییە بۆ نەوشیروان،تالەبانیش لەبەر خاناوادەکەی خۆی کۆمەلێك هەولی جدیی دەدات تا لە ئایندەدا جارێکی دی حیزبەکەی بکەوێتەوە ژێر چەمۆلەی یەکێك لە خێزانەکەی خۆی، هەرچەندە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی هەرگیز ئەمە قبولناکەن وهەر کەسێك یەکێتی بە هی خۆی دەزانێت و هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کۆمەلێك گەنجی تەکنۆکراتبهێنە ئاستی مەکتەبی سیاسیەوە.یەکێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پێ ی ووتم:با ئێمە خۆمان گێل نەکەین، تالەبانی ئەم حیزبەی بۆ خۆی داناوە،ڕاستە هەموومان خەباتمان کرد تێدا کردووە،بەلام ئەوە حزبی تالەبانیە،هەر کەسێك ئەم حیزبەی قبولە بابەم شێوەیە قبولی بێت،ئەوە قبولیشی نییە،زەمینە سیاسی هەیە با بچێت حیزب یۆخۆی دابمەزرێنێت و قودرەتی خۆی تاقی بکاتەوە،ئەم قسەیە زەنگێك بوو بۆ نەوشیروان مستەفا،بەباوەڕی زۆر بەی یەکێتیەکان،نەوشیروان مستەفا چوونە دەرەوەکەی هەلەیەکی سیاسی بوو،هاتنەوەکەشی جارێکی تر هەلەیەکی تری نەوشیروانە،تالەبانیش دەیەوێت هەموومان کۆ بکاتەوەو پێ ی کۆناکرێتەوە.

ئەو هەولەی تالەبانیش دەیدا بۆ کال کردنەوەی کۆسرەت ڕەسول،هەولێکە دلخۆشییەك دەدات بە پارتی،چونکە پارتی دەیەوێت هەولێر بەتەواوەتی بکات بەهی خۆی،ئەوەی بۆتە ڕێگرلە بەردەم پارتیدا،کۆسرەت ڕەسول لە هەولێر،هەولدانە بۆ کالکردنەوەی

یەکێتی.یەکێتیەکانی هەولێرکۆسرەتین،لەو شوێنەش کۆسرەت کۆتای پێهات، یەکێتی لە هەولێر تووشی شۆکێکی مەترسیدار دەبێت وکۆتای پێدێت تا بتوانن بەهەموو هێزی خۆیانەوە شاری هەولێر وەربگێڕنە سەر پارتی و شەڕەکانی خۆیان لە هەولێرەوە بگوازنەوە بۆ سلێمانی گرەو لەسەر سلێمانی بکەن بۆ بردنەوەی.دەبووایە نەوشیروان لەبەر خەونەکەی ئایندەی خۆی،باوەڕی بەم واقیعە بکردایەو بیتوانییایە ئەم حاڵەتانەبەشێوەیەکی جدی وەربگیرێت،تا بتوانێت لە ئایندەدا ئەو حیزبە بەهەموو جیاوازییەکانییەوە لای خۆی کۆبکاتەوە،چونکە ئێمە دەزانین پاش تاڵەبانی و کۆسرەتڕەسوڵ،یەکێتی موڵکی نەوشیروانە،بۆ ئەوەی لە هەولێریش بێت بوخاوەنی یەکێتی،دەبێت دۆستی کۆسرەت بێت،ئەگەر بەمشێوەیە نەبێت ئەو گردەی بۆتە موسیبەت بۆ پارتی لە هەولێر،بە دەستی خودی کارەکتەرەکانی ناو یەکێتی نامێنێت و گۆڕەپانەکە لەبار تر دەبێت بۆ پارتی.

لە کاتێکدا نەوشیروان و تاڵەبانی ئەم هەولانە دەدەن بۆ خستنی کۆسرەت ڕەسوڵ بەرامبەر بە نەوشیروان مستەفا دەڵێت"نەوشیروان مستەفا گەورەی هەمووومانە،من لەسەر بڕیاری ئەو بوومە پێشمەرگە،دەبێت هەمووومان ڕێزی بگرین،هەر کاتێك قبوڵی بوو ئێمە قبوڵ بکات،ئێمە ئەومان قبوڵە پێشمان خۆشە بەرپرسی هەمووومان بێت ".ئەم بینینەی کۆسرەت ڕەسوڵ بۆ نەوشیروان مستەفا زۆر جیاوازە لەو بینینەی نەوشیروان مستەفا بۆ کۆسرەت ڕەسوڵ،دەبێت نەوشیروانیش بیر لەوە بکاتەوە حیزبەکەی توشی تێك شکان نەیەت نەك بیر لەوە بکاتەوە چۆن هەموو جەمسەرەکانی تر کۆتاییان پێ بێت تا خۆی بێتە تاکە مەرجەعی ئەو حیزبە،ئەگەر لۆژێکی یەکتر سڕینەوە بەمشێوەیە ی ئێستا لەیەکێتی دا بەردەوامی بەخۆی بدات،زەحمەتە ئەم قەیرانەی حیزب بتوانێت بەو شێوەیە ئیدامە بە ماناوەی خۆ بدات،دوور نییە ئاوا بوونی یەکێتی بەچاوی خۆمان ببینین،تاڵەبانیش بۆ ئەوەی چیۆکەکانی کۆسرەت بنووسێتەوە،نابێت ڕوو لەماڵی نەوشیروان بکات،دەبێت لە ماڵی کۆسرەت بنوسرێتەوە نەك لە ماڵێکی تری غەریبەدا.

یان دەکرێت ئەو سێ جەمسەرە پێکەوە بچنە ناو ماڵەکەی یەکێتی وکار بۆ چاککردنی بیمارییەکانی حیزبەکەیان بکەن کە خۆیان بۆیان دروست کردووە،یاندەبێت هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە ئەو واقیعە قبووڵ بکات کەناتوانێت ئەوی دی کۆتای پێ بهێنێت،ئەزموونی پارتی، باشترین ئەزموونە بۆ یەکێتی،ئەوە بۆ نزیکەی نیو سەدەیە پارتی و یەکێتی شەڕی

یەکتر سڕینەوەیان کرد،بەڵام دواجار گەیشتنە ئەو باوەڕەی ناتوانن یەکدی تەواو بکەن،بۆیە هاتنەوە لەسەر خوانێك دانیشتن و پێکەوە کاریان کرد،تەکەلوتەکانی ناو یەکێتیش کەسیان توانای تەواو کردنی ئەوی تریانی نییە،تاکە دەروازەیەك بەرەو ڕوویان بکرێتەوە دەروازەکەی یەکێتیە تا هەرسێکیان پێکەوە بچنەوە ناوی، هەرچەندە حاڵی یەکێتی ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبێت وتەکەتولەکانی لە ئاستی سەرەوە بۆ خوارەوە دێن و تەنانەت گەیشتونەتە ناو ڕێکخراوو خێزانەکانیش،وەلێ هیچ شتێك مەحاڵ نییە،بۆ بیر کردنەوەی ئینسان،یەکێتی ئەوەندە سەرقاڵی شتی شەخسیە،ئەوەندە سەرقاڵی خۆی بووایە هەرگیز ڕووینەدەدا لە سلێمانی کە بەشاری خۆی دەزانێت"٥٠"هەزار دەنگ کە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا بۆ کۆمەڵی ئیسلامی بن، ئەمە لە فەراغی یەکێتیەوە، کۆمەڵی ئیسلامیەوە لەشاری بەناومەدەنی وەك سلێمانیدا، "٥٠"هەزار دەنگ دەهێنێت،هەر کێشەیەك لەناو یەکێتیدا روبدات، چانسی حیزبەکانترە،چ پارتی چ ئیسلامی.

بۆ ئەو پیاوە نەخۆشەی کە ناوی یەکێتییە،پێویستی بەنەشتەرگەرییەکی تەواو هەیە،ئەو نەشتەرگەریەش تەنها بەو سێ جەمسەرە دەکرێت کە خۆیان برینەکانیان بۆ خولقاندووە،ئەگەر نا بەچاوی خۆمان دەبینین ئەو سێ جەمسەرە تەرمی حیزبەکەی خۆیان هەڵدەگرن وبەرەو گۆڕستانێك دەیبەن.

تێبینی:بۆ ئەم نویسینە سوودی زۆرم لەسەرجەم تەکەتولەکانی ناو یەکێتی وەرگرتووە،بەتایبەتی باڵی ڕیفرۆم،ئەم نووسینە هەوڵێکە بۆ ئاشکرا کردنی دانیشتنەکانی ئەمجارەی تاڵەبانی وتیمەکەی نەوشیروان و مەترسیەکانی ئەو ڕێککەوتنە نهێنییەی بڕیارە ئەو دوو تیمە دژ بەتیمێکی تری ناو یەکێتی ببەستن،کاریشمان بەوە نییە کام لەم تیمانە باش یان خراپن

**"لەسەر ڕوداوی پشتئاشان،دەبێت یەکێتیی داوای لێبوردن لەهەموو کورد بکات،نەك تەنها لە شیوعی**

**ڕاپۆرتی"هەڵگووردسەمەد و ئیبراهیم عەلی هەولێر**

ئەحمەد دلّزار(ئەحمەد مستەفا حەوێزی)،شاعیرو ڕۆشنبیری ناسراوی شیوعییەکانی عێراق و کوردستان بووە،ئەندامی کۆمیتەی مەحەلی حزبی شیوعی عێراق بووەلەو کاتەدا ئێستا تەمەنی(٨٧)ساڵی تەواو کردووە،بەشدارێکی ڕاستەوخۆو تێکرای ئەو ڕووداوانە بووە کەلەماوەی(٦٠)ساڵی ڕابردوودا،ڕووبەڕووی شیوعییەکانی عێراق بوونەتەوە،ڕووداو لە مێژوی هاوچەرخی شیوعییەکانی عێراقدا بریتییە لە شەڕی(پشتئاشان)،دلّزارو فریشتەخان-ی خوشکی،لە دیدارێکی گۆڤاری لڤین-دا ئەو ڕووداوە بۆ خوێنەران دەگێڕنەوە.

دلّزارم بەم جۆرە دەستیکرد بە گێڕانەوەی ئەو شەڕە"لە١/ئایاری ساڵی ١٩٨٣دا لە ناوچەی خۆشناوەتی،بەهۆی ناکۆکی لە نێوان یەکێتی و برادەرانی ئێمەدا،شەڕێك ڕوویدا.وەك بزانم یەکێتیی دەستی بەو شەڕە کردو کە دەڵێت مام جەلال داوای لێبوردن دەکات،لەبەر ئەوەیە کە ئەوان دەست پێشخەر بوون.پێشتر دیار نەبووکە ئەو شەڕە ڕوو دەدات،بەڵکو چەند ڕۆژێك پێش شەرەکە بەرێ کەوت کە ئەو شەڕە ڕوودەدات،ئێمە لەگەڵ یەکێتی دۆست بووین و پەیوەندیمان لەگەڵ یەکێتیی زۆر خۆش بوو،یارمەتییان دەداین وهاتوو چۆمان هەبوو،مام جەلال هاتە لامان،بەلام جارجار ناکۆکییەکان هەبوو لەگەڵ ئەبو حیکمەت(یوسف حەننا).حکومەتی عێراقی،ڕۆڵی هەبوو لە دروست کردنی ئەم شەڕەدا،ئێمەش ئەوەمان زانی بوو کە سەدام حسێن پێ ی وتبووین"من نازانم لەگەڵ کامتان پێکبێم،ئەوە پارتی هەیە،ئەوە شیوعی ئەوانی تر،ئێوە بیسەلمێنن کەکێ هێزی بنەڕەتی و ئەساسیە،تا من لەگەلی دانوستان بکەم"ئەمە درۆیەك بوو لەگەڵی کردن،جا ئەوان ئەو شەڕەیان کرد".

ئەحمەد دلّزاری ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی ئەو دەمەی حیزبی شیوعی،بەردەوام دەبێت لەسەر گێڕانەوەی شەڕەکەو زیانەکانی ئەو ڕووداوەو دەڵێت"سەرکردایەتی ئەو شەڕە نەوشیروان مستەفا کردی ڕۆژی یەکەم زۆر شوێنیان گرت و دواتر هێزێکی زۆریان هێنا کە پێم وایە(٥٠٠٠)کەس بوو، پشت ئاشان دوا وێستگەی حزبی شیوعی حیزبەکانی تریش

بوو،نەخۆش و پەککەوتەو پارەو چەك و ئازووقەی زۆری لێ بوو ئەوان لەم شەڕەدا هاوکاریش کران،چەکی باشیان پێ بوو، بەلاّم من کۆپتەرم نەدی کە بەشداری بکات، ئەو کات هەر کەسێك دەرکەوتبا، دەیان کووشت با هەموو کەس بزانێت کە نەوشیروان مستەفا دەیوت "دیل نییە، دیل نییە"،(٦٠-٧٠)گەنجییان کوشت کە هەموویان دووژمنی سەدام بوون، ئەوە واتای ئەوەیە لە جیاتی دووژمن کوشتیانن، بە داخەوە شتێکی زۆر بێمانایان کرد،ئەو شەڕە گەورەترین زیان بوو کە لە حیزبی شیوعی بزاڤی نیشتیمانی کوردیان دا،بۆ ئەوەی سدام ڕازی بکەن، بەداخەوە کارێکی زۆر خراپ بوو،نەدەبووایە ئەوە بکەن، لە دوایشدا هیچیان نەدابە کوردو یەکێتی گەڕایەوە بەرەی کوردستانی پێکهات، بۆ ڕۆژی دووەم لە ژێر ناوی پارتیدا چوینە ئێران،پارتی پێ یان وتبوون ئەوان برادەری ئێمەن کە دێنە ئێران، پارتی هەڵوێستی لەگەڵ ئێمە بوو، بەڵێنییان دابوو کە هێزێکی زۆر بنێرن بۆ یارمەتیمان، کەچی کەسیان نەنارد، چونکە ووتیان ئێمە وامان زانیوە کە ئێوە بەرگرییەکی زۆر دەکەن، بۆیە دوامان خست،ئەگەر نا دەهاتین،وەك ووتم ڕۆژی دواتر بەرێ کەوتین بۆ ئێران تا گەیشتینە لای پاسدارانی ئێرانی وپێشوازییەکی زۆریان لێ کردین و خواردنێکی زۆریان بۆ هێناین".

لەسەر ڕۆڵی وەفدی ژیانی شیوعی لە ڕووداوەکەدا، ئەحمەد دلّزار بەم جۆرە بۆ گۆڤاری لڤین دوا"دوای شەرەکە،وەفدێکی ژنان بە سەرکردایەتی فریشتە خانی خوشکم دەچنە لای نەوشیروان مستەفا، یەکێك لە پێشمەرگەکان وتبووی: ئەوە زۆر دەم درێژیی دەکات، دەبێت بیکوژم، بەلاّم نەوشیروان لێنەگەڕابوو، فریشتە بە نەوشیروان مستەفای ووتبو: بەداخەوە کە دەستان چووە خوێنی شیوعییەکان، نەوشیروان ووتبوی:خوشکم: شیوعی نابێت لە عێراقدا هەبێت، نابێت لە کوردستان کەس چەکی بەدەستەوە بێت،،دەبێت هەموو بە گۆچان بڕۆن، لە کاتی شەڕدا دیلین دەکوشت،بەلاّم دوای چونی وەفدی ژنان، دیل کوشتنیان ڕاگرت".

دەربارەی سەرکردە دیلکراوەکانی حیزبی شیوعی لەلایەن یەکێتییەوە، دلّزار بەم شێوەیە بۆ گۆڤاری لڤین دوا"کەریم ئەحمەد و ئەحمەد بانی خێلاّنی و قادر ڕەشید(قالەی ڕەشە ناسك)کە خەڵکی سلێمانی بوون ڕێیان لێ وون دەبێت و دەچنە ناوچەی یەکێتییەوە،دەستگیر دەکرێن، مام جەلال کەریم ئەحمەد بە مامۆستای خۆی دەزانێت، چونکە لە کۆیە دەرسی بە مام جەلال وتووە،مام جەلال کە چاوی پێدەکەوێت ڕێزێکی

زۆری لێدەگرێت و لەوێ بونامەییەك دەردەكەن بەیەكەوە كە شەڕ ڕابگرن و مام جەلال پێیان دەڵێت كە ئێوە ئازادن، دەمانچەیان پێدەدات، وەری ناگرن، تەنیا قادر ڕەشید وەری دەگرێت. هەرچەندە،گومان لەوەدا نییە كە مام جەلال ئاگای لەم ڕووداوە هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوە نەبووە كە ئەو كوشتو بڕییە ببێت ودیل بكوژرێت''".

سەبارەت بە داوای لێ بوردنەكەی مام جەلال لە شەڕی پشت ئاشان، دڵزار ووتی"پێویستە مام جەلال داوای لێبوردن لە هەموو میللەتی كورد بكات كە ئێمە كارێكی وامان كردووەو ڕاست نەبووە، فیعلەن ڕاستیش نەبوو،ئەو كاتە داوای لێبووردنی لە كەریم ئەحمەد و ئەوان كردووە،ئەوە گومانی تێدا نییە، باعسیەكان پیلانێكیان دانا بوو،نامەیەكیان نووسی بوو بەناوی یوسفی حەنناوە كە كورتەی نامەكە ئەوە بوو(برادەرانی شیوعی لە هەر جێگایەك، یەكێتییان بینی،بیانكوژن، چونكە ئەوانە دووژمنمان و وان و وان....هتد). ئەو نامەیە بە درۆ ئیمزایەكی ئەبوو حیكمەتیان لەسەر كردبوو،بە شێوەیەك ئەو نامەیەیان گەیاند بووەدەستی مام جەلال، بەعس شتی وای هەبوو،مام جەلال بڕیاری شەڕەكە دەدات و نەوشیروان دەگاتە سەركردەی شەڕەكە لە پشت ئاشان".

دەربارەی ئەوانەی كە ئەنجام دەری شەڕەكە بوون، ئەحمەد دڵزار دەڵێت "ئەوانەی كە شەڕیان كرد، هەموویان تاوانبارن،نەدەبووایە بیكەن، بەڵام كردیان، دواتر ئەو نامەیە دۆزرایەوە كە بەعسیەكان لای خۆیان نوسیویان(ئێمە كارێكی وامان كرد،كەیەكێتیی موجریمی خائین تووش بكەین و نامەیەك بنوسین لەسەر شیوعیەكان و سەریشی گرت)كە ئەو كاغەزە دۆزرایەوە، ئەوانیش بینییان، دەركەوت كە بەعسییەكان فێڵیان كردووە ".

یەكێكی تر لە شایەت حاڵەكانی تری شەڕی پشت ئاشان لەبەرەی شیوعیەكان،(فریشتە خان)ە،ژنە پێشمەرگەیەكی شیوعی و سەرۆكی وەفدی ژنانی شیوعی بۆ گفتو گۆ كردن لەگەڵ(نەوشیروان مستەفا)دا،فریشتە خان سەرەتای قسەكانی بە باسكردنی بەرەی جوود دەست پێكردو وتی" ئەو كاتە بەرەی جوود پێكهاتبوو لە(پاسۆك و سۆسیالست و پارتی و شیوعی)و یەكێتیش بەرەیەكی دروست كردبوو لە(كۆمەڵەو خەتی گشتی و شۆڕش گێڕان)،بەرەی جوود هەرگیز لەگەڵ ڕووخانی هیچ حیزبێك نەبووەو ڕێزی هەموو حیزبێكیشیان دەگرت". فریشتە خان درێژە بە گێڕانەوەكەی دەدات و لەبارەی دەست پێكردنی شەڕی پشت ئاشان دەڵێت"ڕۆژی یەكی ئایار شەڕەكە بە گەرمی دەستی پێكردوو گەیشتە(ئاشقۆلكە)،ڕۆژی دووەم گەیشتە ئێمە،شەوی دووی ئایارلەگەڵ بانگی ئێوارە،

شمەرگەکانی یەکێتی گەیشتنە قڕناقا،بە دوو قۆڵ هاتن،یەکێکیان ڕووی لە مەکتەبی
سکەری بوو، ئەوی تر ڕووی لە پشت ئاشان بوو،تا شەویش داهات لەناو قڕناقاکەس
ەکوژرا، ئینجا پێ یان ووتین دەرگاکانتان دابخەن، یەك لەوانە کە بەکر پیرۆت
و،ووتی:سوێند بە کوردستانە کەس دەست لە دەرگای ئێوە نادات و دەرگاکانتان قوفڵ
ەن و بڕۆن، پاشان ئێمەیان بردە ماڵی کوێخا محەمەد ودایاننایین، ئەو ماڵە ٣٢ئافرەت و
داڵی سۆشیالستی لێ بوو، ئێمەش ٢٦ژن و منداڵ بووین، کە ئێمە یان بینی، گریان. ووتم
ەگرین هیچ نییەو پێموتن: دژواری نییە ئاسان نەبێت،پیاوی دەوێت هەراسان
بێت.ئێوارەی هەمان ڕۆژ،کوڕێك هات کوێی بوو،ناوی شێرکۆ بوو، وتی پورە فریشتە
ستا شەش کەس لێرە گوولە باران دەکەین سێ شیوعی و سێ سۆشیالست، منیش ووتم بێ
سی کاك نەوشیروان،گوولە بارانیان مەکەن،ڕاکاڵەکەم بدەنێ قسە لەگەڵ نەوشیروان
کەم،ووتی ئێمە خۆمان نەوشیروانین ودەیان کوژین. ئەو شەش کەسەیان هێناو لەبەر
میاندا ئاگرێکیان کردەوە بۆ ئەوەی ئێمە بیان بینین و گوللە بارانیان کرد، دواتر خۆیان
تیان هەر یەکەیان ٧٥ فیشەکمان لێ خەسار کردن، وتیان هەریەکەیان ٧٥ فیشەکمان لێ
سار کردن، گووللە بارانکردنی ئەو شەش کەسە بەشەو بوو،کات ژمێر ٩:٢٠خولەك بوو
ی ئەوە دەستیان، بەکوشتارکرد،بۆ دوایی لەمەکتەب عەسکەری شیوعی،٥کەسیان کوشت
لازم حامد بۆ خۆی، خۆی کوشت،کە ئێمە چوینە سەر کانی بۆ نوێژ،کەسەرکەوتینەوە
ەسمان بینی لەبەرزاییەکەوە کەدەیان وویست بچنە سەرەوە،لێیان دەدەن وگل بوونەوە
ڕوباری پشت ئاشان،هەندێك گەنج هاتبوونە سەردانی کەس و کاریان بۆ یادی یەکی
ار، پێشمەرگەش نەبوون و کوژران بەداخەوە ڕووداوێکی ناخۆش بوو، ئەو شەوە لە
انێکدا لە ڕادیۆ ووتی:دیلتان نەبێت، دیلتان نەبێت، دیلتان نەبێت. ..ئەمە نەوشیروان
،بە واتای هەرچی گوتتان، بیان کوژن،ئێمە زانیمان کاك کەریم و ئەحمەدی بانیخێلان
ەبو شوان گیران،وتم ژنینە سبەی لەگەڵم دێن ئێمە بە خۆپیشاندان
چینە(ئاشقۆڵلە)،تەنها بە نەوشیروان دەڵێم ئەو دێرە بگۆڕە وبڵێ:دیلتان هەبێت،ووتیان
ە هەموومان دێین، سبەی هەموویان ئامادە بوون کەهەموویان ٥٨کەس بووین،بەژن و
اڵەوە،دوو سەعات بە پێ ڕۆیشتن لە قڕناقەوە بۆ ئاشقۆڵکە،بینیمان ١٨ باریان لەچەك و
بەنرخ و ئیزاعەیان بارکرد کە هی حیزبی شیوعی بوو، خەڵکێکی زۆر هاتبوون بۆ
نەوەی تەرمەکانییان، ئەوانەی لای ڕانییەو قەڵادزێ هەبوو کوڕی کوژرابوو، هەبوو برای

یان مێردی کوژرا بوو.کە گەیشتین، نەوشیروان خۆی هات بۆ پێشوازیمان، نەوشیروان و
سامان و ئازاد حەمەد و کاك جەعفەرو کاك ڕۆستەم بەخێرهاتنیان کردین، لەسەر بانێك
بووین،نەوشیروان سێ چوار پایە هاتە خوارەوە لە قادرمەکان، ووتی:ئەزیەت مەخۆ ساحێبی
شەڕی خوێناویی، ئەویش ووتی:من شەڕی خوێناوییم کردووە ووتم: بەداخەوە کاك
نەوشیروان زەمانە هەر زوانا بێت....هەتا چەند ساڵێك با وابێت، ووتی پورە فریشتە
هەڕەشەمان لێ دەکەیت بە قەرز،ووتم: بە حازر پێت دەڵێم، ووتی: جارێ وەرن دانیشن، کە
چووین لە سەربانەکە دانیشتین، دەستمان کرد بە قسە لەگەڵیان، ووتم:کاك نەوشیروان ئەو
کارە کارێکی خراپ بوو کردتان، خۆزگە ئەو کارەتان نەکردباو نە دەبووا ییە ببێت، ووتی
دەبووایە ببێت، وتم: بەخوا نەدەبوو ببێت، چونکە دووژمن دڵی پێ ی خۆش دەبێت
ووتی:پورە فریشتە لەسەری مەڕۆ، دەبووایە ببێت، منیش ووتم: نابێت بزانین هۆکاروکەی
چییە؟ ووتم: ئێمە هێزی خێرو ئێوە هێزی خێر، لە ژێر دار

بە ڕووەکانی کوردستان لەگەڵ هەموو هێزەکانی دی، لوولەی تفەنگەکانمان ئاڕاستەی
سەدام حسێن بکردبا، باشتر نەبوو؟ووتم: هەڵت بکردبا باشتر نەبوو؟ ووتی: هەولێرو
سلێمانیشمان پێ دەگیرا،ووتم: ئەی بۆ وات نەکرد؟ ووتی: دەبوایە ئەو شەڕە ڕوویدات،
ووتی: بەلام دڵ تەزێن بوو، ووتم: وەڵلاهی قسە یەك دەکەم ئەگەرلێرە پەتم بۆ هەڵواسن،
وتی: پەت هەڵناواسین، ئازادیت، وتم: تۆ کەدەڵێیت دەبوایە ببێت، ئەوەبەندێکە لە
پێکهاتنتان، ووتی: ئەمە زۆرقورسە پەتت لەملی خۆت نزیککردەوە. وتم: پێکهات نتان
بەدەستەوەیە لەگەڵ حوکمەتی عێراقی. پێش شەڕ ئەوان چوو بوون بۆ دانوستان،
نەوشیروان وتی: تۆ بەهەڵە تێگەیشتویت، وانیە؟ وتم: ئەدی مەبەستتان چی بوو لەو شەڕە،
وتی: ئێوە بە پەت و گوریس قەندیلتان دابەشکرد لەسەرعرەبەکان، وتم: بەقوربان ئەو
قسەیە هەر ڕێی تێناچێت وابێت دواتر ووتی: پرسیارێکم هەیە:بۆچی ئێوە بە١٠تا١٢
سەعات لەدوای ئاشقۆلکە گیران، ئێمە دامان نابوو یەك مانگ شەڕتان لەگەڵدا بکەین و
زیانێکی زۆریش بدەین، ووتم: ژمارەتان چەند بوو، ووتی: توخوا ئەوە وەلامە، ووتم: تەنها
دەپرسم ژمارەتان چەند بوو، خۆ خرا پم نەوتوە، ووتی: دەپێت نالێم، ووتم: منیش
وەلامتان دەمەوە. یەکێکیان لەوێ بوو، ناوی حاکم ڕەحیم بوو، لە ژێر پەتی سێدارە ڕایکرد
بوو، ووتی قسەکەی زۆر یاساییە، دوو ووشەیە، وەلامی بدەرەوە. نەوشیروان ووتی:
ژمارەیەکی کەم بوو پێنج هەزار پێشمەرگەیەك بووین، منیش ووتم: کە زۆر هات قەواڵە

بەتاڵە،ئێمە لە ١٨ لیوا"پارێزگا"هەین، بەڵام لێرە هەموومان ٤٢٠ کەس بووین بە ئیزاعەو پیرو ژن و منداڵ و پێشمەرگە، ووتی: ئەی بۆ مەکتەبی عەسکەریتان لەوێ بوو؟ ووتم: پەنجا کەس بوون،پارێزگاریان لەو ژن و منداڵ و ئیزاعە یە دەکرد،ئەگەر نا(ناوچەمان)هەیە لە بالیسان و قەرەداغ و بادینان، بەڵام ٥٠٠٠ هەزار لە کوێ و ٤٢٠ کەس لەکوێ؟.

دەربارەی دکتۆرە ئەحلام کە لەشەڕی(پشت ئاشان)دا کوژرا،فریشتەخان شایەت حاڵی شیوعی ئەو ڕووداوە،بەم جۆرە دوا"ئەحلام دکتۆرا بوو،و دەستگیرانەکەشی هەر دکتۆرا بوو لە شاخ، زەماوەندییان دەکرد،کاتی ڕووداوەکە سکی هەبوو(حامیلە)، ئەو دکتۆرەیە لە سەر دۆشکە بوو، دەربارەی کوشتنەکەی بەنێو شیروان مستەفام وت:نەدەبواییە ئافرەتێکی سک پڕ بکوژن، ئەو کچە لە زانکۆ ڕایکردبوو، غەریبە بوو ووتی:دەزانیت لەسەر دۆشکەکەتان چەند برا دەری ئێمەی کوشت،بۆیە کوشتمان".

فریشتە خان،دەربارەی هەڵوێستی نەوشیروان مستەفا،دوای سەردانکردنی وەفدی ژیانی شیوعی بۆلای، دەڵێت"کە چوینە لای نەوشیروان مستەفا، پێم ووت:تەنها ئەو ووشەیە بگۆڕە کە وتتان دیلتان نەبێت، ئەگەر وانەکەن، کەس نامێنێت و پێم ووت تکادەکەم بڵێ با دیلتان هەبێت، لە شەوداو لە ڕێ ی بەخشینی ڕادیۆوە، ووتی: بادیل هەبێت و بە نەوشیروان مستەفام ووت: تۆ بیرو باوەڕت لەگەڵ ئێمە بوو، لەوانە بوو ئەگەر ئەوانی تر لە ئێمە بدەن، تۆ پشتمان بگریت، ووتی: من شیوعی ڕاستەقینەم، ئێوە تەحریفین".

دوای ڕووداوی پشت ئاشان،باروو دۆخی حیزبی شیوعی و پێشمەرگەکان بەکوێ گەیشتن؟، شایەت حاڵەکەی شیوعی بەم جۆرە لەم بارەیەوە دەدوێت" ئەو پێشمەرگانەی شویعی کەمانەوە، گەیشتنە کۆنەلاجانێ،تا گەیشتنە لای بارزانی و گرتک،دوای ئەوە ئێمە دەستبەسەر کراین، چوینە ئاشقۆلکە، داوا مانکرد شوێنێکمان بۆ دابین بکەن و بارگەیەکیان پێداین، لەوێ خواردنیان بۆ هێنایین، یەکێك لەگەڵیان هات خواردنی دابەش کرد لەناو ژنەکاندا، ناوی(سەیدئەمین) بوو ووتم: سەید ئەمین تۆ بۆ لێرەیت؟، ووتی: من(سەید ئەمین) نیم، ووتم:(تۆ ئەویت و لە کۆمەڵەی ئێرانی سەر بەجەماعەتی شێخ عیزەدین-یت، بەڵام ئەو هەر نکوڵی لێکرد، بیرم خستەوە لە سنە نانمان خوواردووە، کە خواردنەکەی داناو ژووە دەرەوە، ڕەنگی تێك چوو، ووتی: پورە فریشتە تا ئێرە وەرە، لەگەڵ ئافرەتێك چوومە دەرەوە ناوی(فەیرۆز) بوو، ووتم:شایەت بە"...

سەید ئەمین، ووتی: ناوم مەزرێنە من سەید ئەمینم، تکا دەکەم باسم مەکە، چی دەڵێیت بۆت دەکەم،تف لەو دوو ملیۆن دیناری عێراقی،کە ئەوانە بە دوو ملیۆن دیناری عێراقی کرابوون. ووتم: نەدەبووایە شەڕی برا کوژی بکەن لەگەڵمان، شتێکی خراپتان کرد،بەداخەوە کۆمەڵەی ئێران کرا بوون، ئەگینا ٥٠٠٠چەکدار چۆن لەو کاتەدا پەیدا بوون"..

فریشتە خان،دەربارەی ژمارەی کوژراوەکانی شەڕی پشت ئاشان، دەڵێت" بە چاوی خۆمان(٢٤) کەسمان بینی کە کوژران، بەلاّم دوای ووتیان هەموو کوژراوەکان(٧٢)کەس بوون، ڕۆژی دوای تر سەید ئەمین هاتەوە، ووتی: پورە فریشتە سبەینێ لەوانەیە بەشەڕ بڕۆین بەرەو بێتواتە و ئێوە لێرە بەجێ دەهێڵین، سەعات(٣)ی ئێوارە کاك نەوشیروان هاتە لامان، ووتم: کاك نەوشیروان دەڵێن سبەینێ دەچنە شەڕی بێتواتە و ئێمە لێرە بەجێ دەهێڵن، ووتی: کێ ئەوەی پێ ووتیت، دانیشت بوو هەستایە سەر چۆك، ووتم:سندالأن لێرە یارییان دەکردو دەییان ووت: سبەینێ دەچینە بێتواتەوواو وایان لێ دەکەین، ووتم: ئێمە لێرە بەجێ دێڵن، ووتی: بەڵێ؛دەبێت ئێوە لێرە بمێننەوە، ووتم: تنەنگەکانمان بدەنێ لەگەڵ سندوقێك فیشەکی موختارکوژ، ئێمە پێ ی ڕازین، چونکە منداڵمان لەگەڵێدایە، نەوشیروان ووتی نابێت سوێندێکەو خواردوومە لەگۆچان زیاتر، نابێت هیچتان پێ بێت، ووتم: ئەوەش خراپ نییە لە هەوراز پێ ی سەردەکەوین و لەنشێوی پێ ی دێینە خوارەوەو ئەگەر مارێك پێ ی بێتە ڕێگەکەمان پێ ی دەکوژین. نەوشیروان مستەفا ووتی: گاڵتە جاڕی نییە. ووتم: ئێستا(١٠٠٠)کەس لە پارتی بە ڕێگاوەن، وا دێن بۆ یارمەتیمان، نەوشیروان مستەفا دەستیان دەستی کردە دووربینەکەی ملی و سەیرێکی سەر شاخەکانی کردو ووتی کەس دیار نییە، بە نەوشیروانم ووتەوە دەبێت(عەدەم تەعرزێکمان) بۆ بنووسیتکە ئەوانە لەگەڵ ئێمەن و کەس دەستیان لێ نەدات،چونکە ئافرەتی گەنجیان لەگەڵ دایە، نەوشیروان مستەفا بەحاکم ئیبراهیمی ووت بۆی بنووسە، نا ووتم: وەڵلاهی بە دەستی خۆت نەینووسیت و ئیمزای نەکەیت، نامەوێت. نەوشیروان مستەفا کاغەزێکی بۆ نووسین و ئیمزایکردو ووتی: ئاگاداری خۆتان بن، بەلاّم تۆ بەخۆڕایی فریشتە نیت، یەکێك لە ناو ئێمە هەموو قسەیەکت بۆ دەهێنێت،ئەو کەسە کێ یە؟ ووتم: کەس نییە".

# تاوانەکانی نەوشیروان مستەفا لەناخی منی پێشمەرگەدا

ئەردەڵان ئیسماعیل عارف

## بەشی یەکەم

سەرەتا بۆ خۆناساندنم بە پێویستی دەزانم کەمێك لەبنەماڵەکەی خۆم بدوێم. باوکم کە ئیسماعیل عارف لە دایکەوە(شێخانی قەراخ) ن وباری گوزەرانیان مام ناوەندی بووە. لەباوکیەوە شارەزوورین و میرزا عارفی باپیرم کەسێکی دەست کوورت بووە و جگە لەوەی کاری سەرپێ ی کردووە بەهۆی ئەوەی چەند پشتێکی مەلالا بوون، خوێندەواری هەبووەو هەندێ جار کاغەزو عەریزەی بۆ خەڵك نوسیوەو خوێندۆتەوە، بەوەش گوزەرانی کردووە، هەربۆیە ناسراو بوو بە میرزا عارف. بنەماڵەی دایکم لە باوکەوە زۆربەی ماموری موڵك و دەوڵەمەندی سەردەمی خۆیان بوون. بنەماڵەکەمان بە هۆی جیاوازی چینایەتی و خەلیفەی ڕۆشنبیری جیاوازییان لە هۆشیاری سیاسیاندا تێکەڵەیەك بوون لە شۆڕشگێریسەرسەختی سەردەمەسەختەکان و کورد پەروەری سەردەمە بێ مەترسییەکان و خۆ پارێزی دەست بەکڵاوی خۆوە گرت و. بنەماڵەکەمان لە جلی کۆن و نوێ چەندین شەهیدمان بەگەلەکەمان بەخشیووە. دێرین ترینیان کە لامان ئاشکرایە(شێخ عبدالرزاق شێخ مەعروفی قەرەداخی)ی خاڵی باوکمە کە ئەفسەری عوسمانی بووەو بەهۆی هەڵوێستی کوردایەتی لە لایەن کەمالییەکانەوە ئیعدام کراوە.(ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە لە کتێبەکەیدا بەناوی شاری سلێمانی باسی کردووە).

خێزانەکەمان لەناو بنەماڵەکا نماندا ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لە خەبات و تێکۆشاندا، باوکم تەواوی ژیانی لە زیندان و شاخدا بەسەر بردووەو لە ناوەندی شەستەکاندا سکرتێری بارزانی و ماوەیەك ئەندامی مەکتەبی سیاسی پلرتی بووە. برا کورەگەم، پێشڕەو، لە ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرادا بووەو لە ساڵی ١٩٨٤دا کە ئەندام کەرتی ڕێکخستن بوو لە ناو شارداو کادێری پیشەیی کۆمەڵە بوو بەهۆی ناکۆکی سیاسیەوە واز لە کۆمەڵەو یەکێتی دەهێنێت و دەچێتە ئێران و پاش ئەوەی لە ئێران بە کارکردن و هەندێ قەرزی خزمان پارەی پێویست پەیدا دەکات و دەچێتە ئەوروپا و ئێستا نیشتە جێی بەلجیکایە. کامەرانی

برام كه له خۆم منداڵ تره لەتەمەنی ١٦ساڵیەوه پێشمەرگەی یەکێتی بوو. لەگەڵ شەهید ماموٚستا سەردارو نەورۆز، ناسراو بە(نەوەی سەموون) دەکەونە کە مینێکی(حیزبی سۆسیالست)ەوه بە ئەسیری دەگیردرێن، ئەوانیش تەعزیبێکی زۆریان دەدەن و چەندین جار بۆ ترساندنییان گۆڕی خۆیان پێ هەڵدەکەنن، پاش ئەوەی ماموٚستا سەردار لەبەردەم گۆڕەکەی خۆیدا شەهید ئەکەن، کامەرانی برام و نەورۆز لەگەڵ چەند دیلێکی سۆسیالست کەلای یەکێتی بوون، ئالۆ گۆڕ دەکرێن. ئیتر لەو کاتەوه کامەرانی برام تووشی حاڵەتێکی دەروونی خراپ بوو، پاش ئەوەی گەیاندمە سوید، ئەو بارە دەروونیەی وای لێ کردبوو نەتوانێت ژیانێکی ئاسایی بەسەر بەرێت و تووشی کۆمەڵێك گیرو گرفتبوو کەبەهۆیەوه نزیکەی ٢٤ساڵە له نەخۆشخانەیەکی دەرونیدا له سویددەژی، بە کورتی تەواوی خێزانەکەم لە شۆڕشی ئەیلولەوه تاکو ئەمڕۆ جگە لەترس و ڕاونان و برسێتی و بێ باوکی و بێ سەرپەرشتی هیچی ترمان بەنسیب نەبووه، بە تایبەتی پێش ئەوەی خۆمان بگەینە تەمەنێك کە کار بکەین ژیانێکی زۆر تاڵمان بە سەر بردووه. تەنانەت پێشڕەوی برام لە تەمەنی ٣ ساڵیدا بە هۆی کەمی ڤیتامین و موادی غزائی پێویست چەند مانگێك چاوی کوێر بووه. سەرباری ئەوەش لە لایەن هەندێ لە خزمە خۆپارێزەرەکا نمانەوه وەکو نەخۆشێکی ساری مامەڵەمان دەرکراو خۆیان لێ دوور دەخستینەوه نەوەك بەهۆی ئێمەو خۆیان و منداڵەکانیان تووشی نەخۆشی سیاسەت و پێشمەرگایەتی و سەریەشە ببن!..هەرسێ براکە کرێکار بوین،من کرێکاری شیش بەستن و پێشڕەوی برام کرێکاری خانوو، کامەرانی برام، بۆیاخ چی خانوو،بۆیە هەرسێکمان لە قوتابخانەی ئێواران دەمان خوێند. باوکیشمان پاش گەڕانەوەی لە ساڵی ١٩٨٧لە ئێران وەکو دەستەبەرێك نێردرا بۆ سەماوه.

خۆم لە تەمەنی ١٨ساڵیمەوه پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوه کردو لە زۆر بەی چالاکییەکانی و کەرتەکەی عمر عەرەبدا بەشدار بووم و جێگری فەرماندەی کەرت بووم و لە تەواوی شەڕەکانی ناوچەکەماندا بە پێ ی توانا بەشدار بووم و لەو کردارەی وەکو هاوڕێیەکی دێرینی چووم بۆ سەر لێدانی. کاك فەرهادی ڕێکخستن کە سەر پەرشتی زیندانەکەی دەکرد، پێ ی ڕاگەیاندم کە کەس نابێت چاوی پێ یان بکەوێت. منیش وەك گەنجێکی سەرکەش گوێم نەدایە قسەکانی و چووم بۆلایان. تاکو ئەوەی بە نەوشیروان گەیشتبۆوه من ناوچەکەم بەجێ هێشتبوو مۆڵەتی ئەوەی بۆ نەدەڕەخساند کە سوکایەتیم

پێ بکات. بەڵام ئەمەی کرد بوو بە ڕقێك بۆی دانابووم. پاش ئەوەی عمری فەرماندەی کەرتەمەمان گیرا، من وەکو جێگیری سالاری حاجی دەروێش لە تیپی پارێزگاری دانرام و پارێزگاری بارەگای مام جەلالمان دەکرد.کاك سالار یەکێك بوو لە فەرماندە سەربازییەکان و لەهەمان کاتدا کادرێکی هۆشیاری سیاسیش بوو.لە دوورو نزیکەوە لایەنگری ئالأی شۆڕش و مەلا بەختیار نەبوو. تەنها هەڵەیەك کە کردبووی غەزەبی نەوشیروانی بەسەردا باری بوو ئەوە بوو کە کتێبێکی بۆ مەلا بەختیار بە دەستی دوو پێشمەرگەدا کە ناویان ئەنوەر و بەهادین بوو، بۆ مەلا بەختیار ناردبوو تاکو لە زینداندا کاتی پێ بباتە سەر. وەستا لەتیف کە لایەنگرانی نەوشیروان بوو سەرپەرشتی ئەو زیندانەی دەکرد کە مەلا بەختیاری تیادابوو. هەواڵەکە بەنەوشیروان دەگەیەنێتەزوە و دەست بەجێ کاك سالار دەست بەسەر دەکرێت و دوو پێشمەرگەش دەخرێنە زیندانەوە.کاتێك ئەنوەرو بەهادین بەرەڵا کران چەکیان نەدانەوە و بە ڕسواکراوی دەسوڕانەوە بۆیە ناچار بوون بگەڕێننەوە و خۆیان تەسلیم بکەنەوەو خۆیان بدەنە بەر چارەنووسی نادیار. وەکووەفایەکی هاوسەنگەری چەند جارێك سەرم لە کاك سالاردا، ئەمەش خاڵێکی تری خستە سەر کێشەکانم بەرامبەر فەرمانە قەرەقووشیەکانی نەوشیروان مستەفا. کاکە نەوە لە کەشکۆڵەکەیدا باسی ئەوە دەکات کە سەرباری ئەوە لای کچانی بەغدی سەردەمی کوڕێنی ئەو {لوملازم لو مالازم}باوی بوو.بەڵام ئەم نەك هەر نەیدەویست ملازم بێت گاڵتەی بە تێکەڵەی فەیلەسوف جەنەڕاڵ و ﴿صاحب السیف و القلم﴾یش دەهات. هەرگیز نەی ویستوە﴿ئەهلی تفەنگ﴾ بێت و دەیویست پێ ی بڵێن﴿ئەهلی قەڵەم ﴾!. جائەگەر ئەهلی قەڵەم ئەم بەزمە بە مرسلو ناقل و قارئی کتێب بکات، وای بە حاڵی ئەم میللەتە ئەگەر ئەهلی تفەنگ بوویتایە !(پەنجەکان یەکتری دەشکێنن،لاپەڕەی ٢٩٠). بەحەق جەنەبتان نە ئەهلی قەلەمن نە ئەهلی سەیف، تەنها و تەنها ئەهلی کەشکۆڵ خەنجەرو تەوری فەقیر کوژی لە پشتی سەرەوەن ائەگەر ئەهلی قەڵەم ئاوا ڕەفتار بکات، شکرا اغاتی مالازم! پاش گیرانی کاك سالار کۆبوونەوەیەکیان بە کەرتەکەمان کرد بەسەر پەرشتی ئەوڕەحمان سیتەکی، سەرتیپی قارێزگاری،لەو کۆبوونەوەیەدا شەهید غەریب هەڵەدنی دانربەفەرماندەی کەرت،منیش وەك جێگری فەرماندەی کەرت دانرامەوە. بەڵام وەکو نارەزایی کۆبونەوەکەم لەبەر چاوی نزیکەی ٢٥پێشمەرگەدا بەجێ هێشت.پێویستە ئەو ڕاستیە بخەمە بەر چاو کەسەرباری ئەوەی کە شەهید غەریب هەڵڵەدنی کەسێکی زۆر بەرێزو دڵسۆزو شۆڕشگێڕبوو،بەڵام داخی ئەو

کرداره ناڕەواییه بەرامبه به کاك سالار له دڵم دەرنەچوو بوو. بۆیه ئاگاداری شەهید غەریب هەڵەدنیم کرد که جیگه له کاك سالار کەسی ترم بەفەرماندەی خۆم قبوڵ نییه و چەکم دانا. چەك دانانەکه هێند گرنگ نەبوو بۆ نەوشیروان و بابەتی ئەو بەلام ئەم ناڕەزایی دەربڕینه ئاشکراییەی پێ ی قووت نەدەدرا و هاته سەر حسابه ڕەشەکەم لای کاکه نەوه. داوای ئەوەم کرد که له ناوچه ئازادەکاندا بمێنمەوه و مۆڵەتی ئەوەم پێ بدەن. مەڵبەندی دوو بەو مەبەسته نامەی بۆ کردم(سەیری پاشکۆی ژمارە۱)پاش ماوەیەکی کەم مانەوەم له ناوچه ئازاد کراوەکان، چووم بۆ ئێران و نزیکەی سێ مانگ له بانه له ماڵی کەمال شێخه که فەرماندەی کەرت بوو مامەوه.بو بووم بەبار بەسەریانەوه،خۆشم ماوەیەکی ئەوەنده خۆر بوو پارەم نەدیبوو فلسی عێراقی و قڕانی ئێرانیم له یەکتری جیا نەدەکردەوه. بەڕێکەوت لەگەڵ جەلال ئاوکورتەیی تووشی عمری عەبەی مینه حەلێ بووم کوڕێکیان بەبێ ئیزنی ماڵەوەیان چوو بوو بۆ تاران به مەبەستی سەفەر بۆ ئەورووپا. کەوتبووه ئۆردوگای پەناهەندەی کەرەجەوه. وەعدی یەکی دەمانچەیەکیان داینێ که بڕۆین کوڕەکەیان بهێنینەوه، تاکو ئەویش وەکو خۆیان بکەن بەپێشمەرگە.منیش نەك بۆ تاران لەو هەلو مەرجەو بێ پارەو پولەیدا بەوەعدی دەمانچەیەك بۆ کبوڵیشیان بناردمایه یەك و دووم لێ نەدەکر. شتێکیانپارەی مەسرەف دامێ وئێمەش بەهۆی مامۆستا عەلی کەمالەوه که بەرپرسی پەیوەندییەکانی یەکێتی بوو له سەقز وەرەقەمان پەیدا کردو چووم بۆ کەرەج، کوڕەکەیانم دۆزییەوه و بەمجازەفەو کۆمەڵی سەریەشه گەیاندمانەوه بۆ سەر سنور. مەسەلەی دەمانچەکەش خرایه ئەمڕۆو سبەینێ کاتێ که ناچار سەرمان کردە سەریان بۆ هەقەکەی خۆمان. نەمزانی که ئەم کارەم لەسەر قورس دەکرێت.ئەوانیش ماڵیان ئاوابێت لای شێخ دارای حەفید شکاتیان لێ کردبووین و کردبوونیان به پیاوی ئیتلاعات!. کاك شێخ دارا بانگی کردین و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردین،به هێمنی و شێوازێکی جوان گوێی لێ گرتین، ئێمەش مەسەلەکەمان بۆ ڕوون کردەوه، ووتەکانمانی پەسەند کردو به ڕێزەوه ئیزنی داین. پاش ماوەیەك کاك قادری حاجی قادر ناردی بەدوامدا که دانیشتم و بگەڕێمەوه. لەلایەکەوه خاتری کاك قادرم زۆر لا بوو لەبەر ئەوەی کەسێکی زۆر بەڕێز بوو، وه بەتەنگ پێشمەرگەی دڵشکاوەوه دەهات و گوێ ی له سکالاکانیان دەگرت و لێیان تێدەگەیشت،لەلایەکی ترەوه بێ دەرامەتیەکەم زۆری بۆ هێنا بووم دەمزانی له پێشمەرگایەتیدا هەر هیچ نەبێت نانه سکەکەمان لەلایەن دێهاتەکانەوه دەدرێتێ. له مانگی

سێ ی ۱۹۸۸دا گەڕامەوە و چووم بۆ گوندی مەرگە،پاش چەند هەفتەیەك كاك ئازادی فەرماندەیی كەرتی تیپ كە ناسراو بوو بە(ئازاد عفريت) پێ ی ڕاگەیاندم كە جیهازی بۆ كراوە لەسەركردایەتییەوە داوایان كردووە. كەبەزووترین كات ئەردەڵانی ئیسماعیل عارف چەك بكەن و بە قۆڵ بەستراوی بیهێنن. ئازاد لێ ی پرسی ئایا هیچ لە خۆم شك دەبەم؟ منیش ووتم: تەنها شتێك لە خۆم شك ببەم ئەوەیە كە چەند جارێك سەرپێچی بچووكی فەرمانەكانی نەوشیروانم كردووەو سەرم لە عمر عەرەب داوە لە زینداندا(ئەو كاتە عمر گەڕابۆوە ناو ڕژێم)هەروەها سەرم لە سالاری حاجی دەرویش داوەو ناڕەزایم بەرامبەر زیندان كردنە ناڕاوەكەی دەربڕیووە پاش هەندێك دووام كاك ئازاد پێ ی وتم: من ئەمڕۆ نات گرم وەك ئەوەی تۆم نەبینیبێت، بڕۆ چارەیەك بۆ خۆت بكە!. لەوە دەچێت خراپیان بۆ تیا چاندبێت! منیش لە ترسی بڕیارە ترسناكەكان و ڕەقی و عەدالەتی ئیمامی نەوشیروان و زەبرو زەنگی شۆڕش گێرانە بەرامبەر پێشمەرگەی بێ كەس ملمنا بەرەو قەڵادزێ. لەوێ چوومە مالی پورێكم،پاشان جوابم نارد بۆ عمر عەرەب كە دەمەوێت خۆم تەسلیم بكەمەو دانیشم. عمر عەرەب وەڵامی بۆ ناردمەوەو كە مدیری ئەمن پێ ی ڕاگەیاندووە كە كار لە دەست ئەمدا نەماوە چونكە ماوەی لێ بوردن بەسەر چووە. عمر جوابی ئەوەشی بۆ ناردبوومەوە كەناوێرێ لای خۆی لەماڵەوە داڵدە بدات. داوای لێ كردبوو كە یان بگەڕێمەوە بۆ ناو پێشمەرگە یان لە شوێنێك خۆم بشارمەوەو چاوەڕێ ی لێبوردنێكی تر بكەم. پاشان جوابیان بۆ ناردم كە كارەكەمیان مەیسەر كردووەو واستەیان بۆ كردووم. لەبەر ئەوەی چەكم نەبردبۆوە. دەبوایە چەكیشت ببردایەتەوە، ئەوسا لێت دەگەڕان. بۆیە عمر كلاشینكۆفێكی هەرزان بەهای بۆ كڕیم تاكو تەسلیمی بكەمەوە. عمر هات بۆ قەڵادزێ بەدوامدا بردیانم تەسلیم بە ئەمنی بەغدایان كردم، پاش لێ كۆڵینەوە وەرەقەی(عدم تعرز)یان دامێ و گەڕامەوە بۆ سلێمانی.پاش ماوەیەك چووم بۆ سەربازی زۆری لێ نەبووم لە ئەمنی سلێمانییەوە داوایان كردبوو بگەڕێمەوە بۆ سلێملنی مراجعەی ئەمن بكەم،دڵنیا بم لەوەی كە دەیانەوێت چەكیان بۆ هەڵبگرم و هاوكاری خیانەت كارانە بكەم. پاش ئەوەی لە سەر داوای ئەمنی سلێمانی لە سەر بازی ئیزن یاندام، ڕاستەوخۆ بەدوای كاردا گەڕام و لەبری ئەوەی بچم بۆ ئەمن پاش چەند ڕۆژێك لە گەڕانەوەم بووم بە شاگردی بەقاڵ لای حمەی خورشیدو حمیدە سوری برای لە بەر بەلەدێكەی سلێمانیدا. كە حمید زانی پێشمەرگە بووم ڕێزی زۆری لێ دەگرتم و وەك شاگرد ڕەفتاری لەگەڵدا

نەدەکردم ببوینە هاوڕێ ی یەکتری. پاشان ئەمنی سلێمانی وازیان لێ نەدەهێنام و بەردەوا
بانگیان دەکردم بۆ ئەوەی کاریان لە گەڵدا بکەم کۆمەڵێك چەکداریان بۆ کۆبکەمەوە ببم بە
مەفرەزەی خاصە. هەرکاتێك بانگیان دەکردم حەمیدە سور یان قانیعی برای شەهید حمە
شکورم لەگەڵ خۆم دەبرد کە لە چایخانەیەکی نزیك چاوەڕوانم بکات نەوکو بم گرن تاکو
خەبەر بۆ عمر عەرەب ببەن و هەولێکم بۆ بدەن. چەند جارێك بە بیانوی فەقەرات و
نەخۆشی ماوەی هەفتەو دوو هەفتەیان دەدامێ.دوا جار هەڕەشەیەکی خەست و ڕوون و
ئاشکرایان لێکردم و پێیان ڕاگەیاندم کە ئەو هەموو{جەریمە تەخریبەی }من برامبەریان
کردوومە ناهێڵن ئاوا بێ مقابل بەسەرمەوە بڕوات. منیش ئاگادارم کردنەوەکە هەفتەیەکی
تر وەڵامێکیان دەدەمەوە کە بە دڵی خۆیان بێت پەیوەندیم بە هەندێ خزم و ئاشناوە
کردو لە ڕێگای ئەوانەوە زۆرێکیان لە هەولێر بۆ بەکرێ گرتین و پاش ئەوەی چەند هاوڕێ
و خزمێکی باوەڕ پێکراوم ڕاگەیاند کە پاش ڕۆیشتنمان وای بلاّو بکەنەوە کە عالی المقام لە
بەغداد دادەنیشێت !. بە نهێنی دایکم و خوشك و خێزانەکەم پێچایەوەو چوین بۆ
هەولێر؟، لەوێش ماوەیەك لە گەڕەکی مەنتکاوە مەختەفی بووم و دەگمەن دەهاتمە دەرەوە.
پاشانئاشناو ناسیاویمان لەگەڵ خەڵکیدا کردو هەویەیەکی تەزویری ئەسیرم پەیدا کرد. زۆر
خۆش حاڵ بووم بەوەی کە جورئەتی چوونە دەرەوەم دەرکرد تاکو لەسەر جادەکان دەست
گێڕی بکەم و نانە سکیەکە پەیدا بکەم. بەهەر حاڵ سێ ساڵ لە هەولێر بەمرەو مەژی
ژیانمان بەسەر برد. تاکو ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی ١٩٩١لە ڕاپەڕینەکەدا خۆم ئاشکرا کرد کە
تاقیکردنەوەی پێشمەرگایەتیم هەیە و لە زۆر بەی بەیەکدا دانەکاندا بەشداریم کرد و
بەپێی توانا ڕۆڵی خۆم بینی و ئەرکی سەرشانم بەجێ هێنا. لەوکاتانەدا کەلە کۆڵان و
شەقامەکانی هەولێر شێلم و شەربەت و چلورەو فانیلەی عەلاگەو گۆرەوی و. ..بەکورتی
هەرچی بخورایەو بخورایەتەوە،بمژرایەو بلێسرایەوە، بجورایەو قوت بدرایە، لەبەر بکرایەو
لەپێ کرایە، لەسەر بکرایەو لە دەست بکردایە،بە بەرا بکرایە دەمفرۆشت!. کەچی کاکە
نەوە دیعایەی بۆ خۆی کردبوو کە ئەردەڵان پیلانی کوشتنی دانا بووا.تێناگەم ئەم کابرایە
تەواوی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بە دوژمنی خۆی دەزانێت. پێشڕەوی برام چەندین نامەی لە
هەڤاڵانی ڕێکخستنییەوە کە نەبوونە پێشمەرگە لە ڕێگەی بەریدی ئێرانەوە بۆ چوو بوو
کە گوایە من هەوڵی کوشتنی نەوشیروان مستەفام داوە. ئەویش وەك ئەوەی پاشان بۆی
باسکردم کەوتبووە بارێکی دەرونی زۆر ناخۆشەوە. لە لایەکەوە بەهۆی ئەوەی کە پاش

دەرچوونی بۆ ئەورووپا کەسانێکی زۆر لە ڕێکخستن کە گیرا بوون بە فرسەتییان زانی بوو بە ڕاست و ناڕاست ئیعتیرافیان لەسەر ناوی ئەو کردبوو کە گووایە بەر پرسیان بووە، لای ڕژێم بە جۆرێك لە حەجمی خۆی زلتر کرا بوو کە حکومەتی عێراقی لە ڕێگای ئینتەر پۆڵەوە داوای هێنانەوەی کرد بوو. بەو بیانووەی گووایە تاوان بارێکی ناسیاسی و خەتەرناکە. بۆیە مەسەلەی وەرگرتنی پەناهەندەییەکەی معلق مابۆوە. لەلایەکی ترەوە هیچ هەواڵێکی دایکم و ئێمەی نەدەزانی. سەرباری

خەمی نەبونی ماڤی ئیقامەی ئازادو کارو خوێندنی خۆی شەرمەزاری بەناو {پلانگێڕی} منیشی بۆ زیاد بوو بوو.

زۆرجار بیرم دەکردەوە ئاخۆ بەچی تاوانبار کرابم، تۆ بڵێ ی نەوشیروان نیازی کوشتنمی هەبوایە؟ بەهەرحاڵ نازانم بەلام ئەوەی نەوشیروانی بناسیایە ئەوەندەی بێ ئامان بوو کە ئەگەر ئەو بانگی کرد بە قوڵ بەستراوی دەبووایە چارێکت بۆ خۆت بدۆزییایەوە یان یان خۆت دەرکردایە! دەڵێن لە نێوانی ئاژەڵی دارستانێك بلاودەبێتەوە کە ڕاوچیەك پەیدا بووە کە هەر نێچیرێك سێ گوونی هەبێت ڕاوی دەکات ! ڕێوی بەهەڵە داوان پەنا دەباتە بەر دارستانێکی تر. کاتێ شێری پاشا دەڵێت: جا خۆ تۆ تەنها دوو گوونت هەیەو لەمەترسیدا نەبوویت! ڕێویەکە دەڵێت: بەڵێ قوربان جەنابتان ڕاست ئەفەرموون بەلام ئەو ڕاووچیە لە پێشدا نێچیرەکە دەکوژێت.ئەوسا سەیر دەکات تا بزانێت دوو گوونی هەیە یان سیان! من باشبوو وەك ڕێوییەکە نەوشیروانم دەناسی، سەرباری ئەوە چەندین جار حسابم کرد بوون لە دووان زیاتر دەرنەچوون!.بەلام بەداخەوە زۆر کەس ئەم ڕاوچییەی نەدەناسی و توشی داوە کوشندەکانی دەبوو. کەسێکی وەکو فەرماندەی کەرت لە شارباژێر شەهیدی تێکۆشەر خەلیفەی عبدللە مارف بەوشێوەیە کەوتبووە دوای بڕیاری نەوشیروانەوە. کاتێ کەریمی برای خەلیفە عمری ڕەشە جووتە شەهید دەکات،شەهید خەلیفە هیچ لە خۆیدا شك نابات و خۆی بەگوناهبارو تاوانبار نازانێت خۆی ناشارێتەوە.نەوشیروان فەرمانی بە کەسێکی ژێر دەسەلاتی خۆی دابوو کەتۆڵەی شەهید عمری ڕەشە جووتە کەلەلایەن کەریمی برای خەلیفەوە شەهید کرا بوو خەلیفە بکوژنەوە!. خەڵکینە من نەوشیروان ناناسم! ئێوە خۆتان حکوم بدەن، ئەم کابرایە لە خێڵی هەرییەکە یان سورکییە؟ یان ڕەیس عەشیرەتی(شمر و البوب جاب)ە؟. لەوەش سەیرتر ئەوەیە پاش ٣ سەعات لە شەهید کردنی خەلیفە بروسکەیەکی تر لەلایەن نەوشیروانەوە دێت کە خەلیفە ئەکوژن و گوایە پەشیان

بۆتەوە، ئەو پرسیارەش کە نامەوێت ناوی بهێنم لە سەر ئەو بێنرخ سەیر کردنەی کە نەوشیروان بۆ ژیانی پێشمەرگە و فەرمانی لەسەر پێ بۆ ژیان و مردنی پێشمەرگە نار کردنی بە کوشتنی کەسێکی بێ گوناح تاکو ئێستا بە ناوتاوانبارترین و بێ ئامان ترین کەسی ناو یەکێتی دەزانێت.

نەوشیروان لە لاپەڕەی ١٨٣ی کەشکۆڵەکەدا لە باسی ملازم موحسینی دڕندەدا دەڵێت {چەند جارێك چوببووە سەر بەختیاری برام و ئەحمەدی مامە ڕەزام. جارێك ئەوەندەی لە ئەحمەد دابوو، گووێ یەکی کەڕ کرد بوو. هەڕەشەی لە بەختیار کرد بوو، کە ئەگەر لە سلێمانی چی تر پیاوی حکومەت بکوژرێ، ئەویش بەختیار ئەکوژێ}. بێگومان ئەم دەست درێژی و لێدان و هەڕەشانەی مولازم موحسینی تاوانبار لە تۆڵەی کرداری نەوشیروان بووە. بەلام با بێن و ئەحمەدی مامە ڕەزات و بەختیاری برات. کە هەردووکیان سوپاس بۆ خوا ساغ و سلامەتن لە پاڵ لاشە خوێناوییەکەی خەلیفە بێ گوناحدا دایان بنێین کە لە تۆڵەی کرداری براکەی ئاوات بەسەر هێناو بەراوردێکیان بکەین ئەوسا بەدڵنیاییەوە هەر هەمووومان دەڵێین:هەزار خۆزگەم بەکەڕ بوون!. هەزار خۆزگەم بە لاڵ بوون!. هەزار خۆزگەم بە هەڕەشە!. هەزار خۆزگوم بەڕاونان!. هەزار ڕەحمەت لە کفن دزا!.تۆش کاکە نەوە ئەو پرۆژەیەی گۆڕان کەمێك بواری دایت. بەراوردێکی مەوزوعیانەی کرداری خۆتی ڕیفرۆم خواز و کرداری مولازم موحسینی تاوانبارمان بۆ بکە و بە ڕاپۆرتێکی مفصل وەلامێکمان بۆ بنوسەرەوە، تاکو لە پەرلەماندا موناقەشەی بکەین!. هەر لەو سەردەمەدا کە لە هەولێر بووم خەبەرێکی پڕ ناسۆرو بەئازارم پێگەیشت کە فەرماندەی کەرت کاك سالاری حاجی دەروێش، پێشمەرگەی قارەمان و ڕەوشت بەرزو هۆشیار کە لەساڵی ١٩٧٣وە کۆمەڵە بووە، بە تاوانی پەیوەندی بە ڕژێمەوە گوللە باران کراوە. پاشان دەرکەوت کە کاك سالاری چاو نەترس لە سەردەمی ئەنفال و کیمیا باران کردنی هەڵەبجەدا بەسەرکردە فیرعەونەکانی وەکو نەوشیروانی ووتبووئەو بارەی بەسەر کوردستاندا هاتووە هەمووی ئەنجامی سیاسەتی هەڵەی ئێوەیە.

دەمەوێت بەو ڕەوشانە بڵێم کە واهیمەی ئەوەیان کردبوو یان بەئەنقەست بۆ دەرخستنی گەورەیی گرنگی خۆیان کە بەردەوام پلانیان لە دژ دەکرێت دیعایەی هەرزانیان بلاوکردبۆوە. ئەگەر من نیازی خیانەت و کاری خراپەم هەبوایە یەکەم، نەم دەگوێزایەوە بۆ هەولێرو خۆم نەدەخستە غەریبی و مەترسی گرتنمەوە، لە کاتێکدا لە و سەردەمانەدا

دەیان کەسی هەل پەرست بوو بوونەوە پیاوی ڕژێم بە پەرۆش و خۆش حاڵییەوە ئامادەی خیانەت کاری بوون بەلاَم خۆش بەختانە پاش ماوەیەکی کەم بەهۆی خەلکە بەشەرەفەکەی هەولێرەوە غەریبییمان پێوە دیار نەمابوو.

درهەم، دەیان ڕێکخستنی ناو شاری سلێمانی و پاشان هەولێرم دەناسی بە تایبەتی ئەوانەی کە بەهۆی تێکەلاَوییان لەگەلّ پێشڕەوی برامدا پێیان ئاشنا بوو بووم تاقە کەسێکیان خوێن لە لوتی نەهات و تووشی هیچ سەریەشەیەك نەبوون و خۆش بەختانە زۆربەیان لە ژیاندان. لە نمونەی ئەو کەسانەش(ئاسۆ ئیسماعیل ڕەشان،کە پاشان بووە جێگری وەزیری ئاوەدان کردنەوە. حەمە جەزای برای دلێری سەید مەجید،کە ئێستا وابزانم ئەندام مەلّبەندی سلێمانییە، خەلاَتی شێخ جەنابی برازای شەهید شەهاب،نوری حەمە علی کە کاتێ خۆی بەر پرسی سەرکردایەتی ناو شار بوو، مام ڕەزای معمیلی جگەرەو جبار ولّوبەیی و خوشکێکی شەهید ئارام و ئەحمەدی پۆلیس و ئاراسی وەستا ئەحمەدو مامۆستا حەمە علی، پێشڕەوی مامۆستا گهها کە بە نەخۆشی شێر بەنجە کۆچی دوای کرد، هەروەها زۆری تر). سێهەم، من تێناگوم بۆچی گوایە ڕژێم هێندە سور بوو لەسەر ئەوەی کەسێکی وەك نەوشیروان مستەفا لە ناو ببات؟ ئەگەر نەوشیروان مستەفاو نمونەی ئەو نەمێنن ئەی کێ هێندە چالاك و کارامە شەڕی برا کوژی بەناوی خەباتی چینایەتییەوە گەرم بکردایە؟ ئەی کێ پێشمەرگەی ناچار بە جاشێتی و دانیشتن و چۆن بۆ خاریج بکردایە؟ ئەی کەساتییە ناسراوەکانی لایەنەکانی تری بەپێشمەرگە بە ئیتغال کردن بکردایە؟ ئەی کێ پاشان بۆ شاردنەوەی بەلگەیی تاوانەکانی لە پشتی ملەوە ئەو پێشمەرگەیەی تەور کوژ بکردایە؟ئەی کێ بە باوکە جگەر سوتاوەکەی هەمان پێشمەرگە کە تەنها ووتبوی:{بۆچی بێ دادگایی کردن کوڕەکەمتان کووشتووە}بووتایە ئەگەر کوڕەکەتان زیندوو بێتەوە دووبارە ئەی کوژمەوە؟ ئەی کێ شۆڕش و خەباتە لە بەرچاوی پێشمەرگە ناشرین ناشرین بکردایە؟ دوای ڕاپەڕین کاك شۆڕش ئیسماعیل و کاك قادری حاجی عەلی داوایان لێکردم کە بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی،منیش بە پەرۆش و خۆش حاڵییەوە گەڕامەوە. بۆ ئەو مەبەستەش نامەیەکیان بۆ کردم کە ڕێگری نەکرێم، لەو کاتەدا بۆ گوێڕزانەوە بە ماڵەوە لە نێوان شارەکاندا دەبوایە مۆڵەتی ڕەسمی وەربگیردرێت.(سەیری پاشکۆی ژمارە٢).

هەندێك لە بەرپرسانی یەکێتی دەیانزانی کە هەمیشە کارەکانم بە دلّسۆزی ئەنجام داوە و جێ ی باوەڕ بووم و لەو سەردەمانەدا کە نەوشیروان بە دوای بەهانەدا دەگەڕاو تووشی

بەلایەکم بکات بۆ ماوەی نزیکەی سالێك بەرپرسی کەرتی پارێزگاری بارەگای مام جەلال بووم. بۆیە پاش گەڕانەوەم بەچەند ڕۆژێك لە هەولێر داوام لێ کرا کە بارەگایەك دابنێم و پارێزگاری رئێستگەی دەنگی عەلی کوردستانی بکەم. منیش لەسەر گردەکەی عەلی ناجی بارەگام داناو ماوەیەکی زۆر بەو پەڕی پەرۆشەوە کارەکانم دەکردو پارێزگاری ئێستەم بەکارێکی گرنگ پێویست دەزانی و کەسانێکی زۆرم لەکەس و کار و هاوڕێیانم کۆکردەوە بۆ کاری پێشمەرگایەتی، بۆ نمونە بەرزانی برام و هیوای زاوام و ئاری وەستا ئەحمەدو سادق و ئەکرەم و چەند کەسی تر.(سەیری پاشکۆی ژمارە٣). بەداخەوە بە هۆی ئەوەوە مۆلەتم نەدرا بەشداری لە گرتنی کەرکوك ئەو نەبەردییە مێژووییەدا بکەم. پاش ئەوەی هاتمەوە بۆ سلێمانی لێرەو لەوێ بەرگوێم دەکەوت کە گوایە من تاوان بارکرابووم بە پلانی کوشتنی نەوشیروان لە لایەن ڕژێمەوە. ئەوەی منی سەرسام کرد بوو ئەوە بوو چۆن منێك کە لە شاخ بەتاوانی ئەوەی ئیتلاعاتی ئێرانی بم ڕاونرامو چۆن ئەمە لەگەل پلانگێڕی بۆ ڕژێمیشدا یەك دەگرێتەوە.پیاوی دوو وولات کە هەردووکیان لە شەڕێکی خوێناوی هەشت سال دا بوون؟سالانێکی زۆر ئەم دوو شتە ناکۆك بەیەکەوە لە مێشکمدا دەزرنگایەوە. کاتێ کە هەندێ فیلمی دۆمکۆمێنتی ئەلمانیم دەبینی کە لە سەردەمی هیلتەری نازیدا بۆ تبریری کۆمەل کوژی جولەکان کە بەسەرمایا دار و خوێنمژی هەزاران لە لایەکەوە لە لایەکی ترەوە بەکۆمۆنیست تاوانبار دەرکران. ڕاستەوخۆ بەیادی تاوانبار کردنی خۆم بە جاسوسی ئێران و عێراق لە هەمان کاتدا بەیاد دەهاتەوە. کێ دەلێت نەوشیروان هێندە سەرسام نەبووە بەنازییەکان تا لە هەندێ مەسەلەدا یودیان لێ ببینێت؟ خۆ لە هەندێ لایەنەوە لە یەك چوونی لەگەل هیتلەریشدا هەیە. نەوشیروان وەك عیزەتی مەلا لە گۆڤاری جیهاندا باسی دەکات حەزی لە نان و تەماتە زۆرە، هیتلەریش تەنها میوەو سەوزە خۆر بووەو هەرگیز گۆشتی نەخواردووە. هیتلەر خۆی بە دۆستی کرێکاران و هەژارانی ئەلمانی دەزانی و زۆربەی هەژاران و کرێکارانی کرد بەسوتەمەنی جەنگەکانی. کاکە نەوەش بەهەمان شێوە خۆی بە دۆستی کرێکاران و هەژارانی کورد دەزانێ لەو شاخ و کێوە ئەیکردن بە گەرووی شەڕی ناوخۆدا. هیتلەر یاسابوو یاساش هیتلەر بوو، نەوشیروانیش یاسا بوو یاساش نەوشیروان بوو. بکوژو ببڕ خۆیان بوون ئەو بە حەجمی گەورەو ئەم بەحەجمی بچوك. هیتلەر چیرۆکێکی خۆشەویستی لەگەل ئیفا براوندا بۆ خۆی سازدابوو بەلام خۆشەویستی گەورەی تەنها خۆشەویستی ئەلمانیا بوو! نەوشیروانیش لە لاپەڕەی ١٩٤ی کەشکۆلەکەیدا

سیّ ی ۱۹۸۸دا گەڕامەوە و چووم بۆ گوندی مەرگە،پاش چەند هەفتەیەك كاك ئازادی فەرماندەیی كەرتی تیپ كە ناسراو بوو بە(ئازاد عفریت) پیّ ی ڕاگەیاندم كە جیهازی بۆ كراوە لەسەركردایەتییەوە داوایان كردووە. كەبەزووترین كات ئەردەڵانی ئیسماعیل عارف چەك بكەن و بە قۆڵ بەستراوی بیهێنن. ئازاد لیّ ی پرسی ئایا هیچ لە خۆم شك دەبەم؟ منیش ووتم: تەنها شتێك لە خۆم شك ببەم ئەوەیە كە چەند جارێك سەرپێچی بچووكی فەرمانەكانی نەوشیروانم كردووەو سەرم لە عمر عەرەب داوە لە زینداندا(ئەو كاتە عمر گەڕابۆوە ناو ڕژێم)هەروەها سەرم لە سالاری حاجی دەرویش داوەو ناڕەزایم بەرامبەر زیندان كردنە ناڕاوەكەی دەربڕیووە پاش هەندێك دووام كاك ئازاد پیّ ی وتم: من ئەمڕۆ نات گرم وەك ئەوەی تۆم نەبینیبێت، بڕۆ چارەیەك بۆ خۆت بكە!. لەوە دەچێت خراپیان بۆ تیا چاندبێت! منیش لە ترسی بڕیارە ترسناكەكان و ڕەقی و عەدالەتی ئیمامی نەوشیروان و زەبرو زەنگی شۆڕش گێرانە بەرامبەر پێشمەرگەی بیّ كەس ملمنا بەرەو قەلاّدزیّ. لەویّ چوومە مالی پورێكم،پاشان جوابم نارد بۆ عمر عەرەب كە دەمەوێت خۆم تەسلیم بكەمەو دانیشم. عمر عەرەب وەلاّمی بۆ ناردمەوەو كە مدیری ئەمن پیّ ی ڕاگەیاندووە كە كار لە دەست ئەمدا نەماوە چونكە ماوەی لیّ بوردن بەسەر چووە. عمر جوابی ئەوەشی بۆ ناردبوومەوە كەناوێریّ لای خۆی لە ماڵەوە داڵدە بدات. داوای لیّ كردبوو كە یان بگەڕێمەوە بۆ ناو پێشمەرگە یان لە شوێنێك خۆم بشارمەوەو چاوەڕیّ ی لێبوردنێكی تر بكەم. پاشان جوابیان بۆ ناردم كە كارەكەمیان مەیسەر كردووەو واستەیان بۆ كردووم. لەبەر ئەوەی چەكم نەبردبۆوە. دەبوایە چەكیشت ببردایەتەوە، ئەوسا لێت دەگەڕان. بۆیە عمر كلاّشینكۆفێكی هەرزان بەهای بۆ كڕیم تاكو تەسلیمی بكەمەوە. عر هات بۆ قەلاّدزیّ بەدوامدا بردیانم تەسلیم بە ئەمنی بەغدایان كردم، پاش لیّ كۆڵینەوە وەرەقەی(عدم تعرز)یان دامیّ و گەڕامەوە بۆ سلێمانی.پاش ماوەیەك چووم بۆ سەربازی زۆری لیّ نەبووم لە ئەمنی سلێمانییەوە داوایان كردبوو بگەڕێمەوە بۆ سلێملنی مراجعەی ئەمن بكەم،دڵنیا بم لەوەی كە دەیانەوێت چەكیان بۆ هەڵبگرم و هاوكاری خیانەت كارانە بكەم. پاش ئەوەی لە سەر داوای ئەمنی سلێمانی لە سەر بازی ئیزن یاندام، ڕاستەوخۆ بەدوای كاردا گەڕام و لەبری ئەوەی بچم بۆ ئەمن پاش چەند ڕۆژێك لە گەڕانەوەم بووم بە شاگردی بەقاڵ لای حمەی خورشیدو حمیدە سوری برای لە بەر بەلەدێكەی سلێمانیدا. كە حمید زانی پێشمەرگە بووم ڕێزی زۆری لیّ دەگرتم و وەك شاگرد ڕەفتاری لەگەڵدا

نەدەکردم ببوینە هاوڕێ ی یەکتری. پاشان ئەمنی سلێمانی وازیان لێ نەدەهێنام و بەردەوا بانگیان دەکردم بۆ ئەوەی کاریان لە گەڵدا بکەم کۆمەڵێك چەکداریان بۆ کۆبکەمەوە ببم بە مەفرەزەی خاصە. هەرکاتێك بانگیان دەکردم حەمیدە سور یان قانیعی برای شەهید حەم شکورم لەگەڵ خۆم دەبرد کە لە چایخانەیەکی نزیك چاوەڕوانم بکات نەوکو بم گرن تاکو خەبەر بۆ عمر عەرەب ببەن و هەولێکم بۆ بدەن. چەند جارێك بە بیانوی فەقەرات و نەخۆشی ماوەی هەفتەو دوو هەفتەیان دەدامێ.دوا جار هەڕەشەیەکی خەست و ڕوون و ئاشکرایان لێکردم و پێیان ڕاگەیاندم کە ئەو هەموو{جەریمە تەخریبەی }من برامبەریان کردوومە ناهێڵن ئاوا بێ مقابل بەسەرمەوە بڕوات. منیش ئاگادارم کردنەوەکە هەفتەیەکی تر وەڵامێکیان دەدەمەوە کە بە دڵی خۆیان بێت پەیوەندیم بە هەندێ خزم و ئاشناوە کردو لە ڕێگای ئەوانەوە زۆرێکیان لە هەولێر بۆ بەکرێ گرتین و پاش ئەوەی چەند هاوڕێ و خزمێکی باوەڕ پێکراوم ڕاگەیاند کە پاش ڕۆیشتنمان وای بلاّو بکەنەوە کە عالی المقام لە بەغداد دادەنیشێت !. بە نهێنی دایکم و خوشك و خێزانەکەم پێچایەوەو چوین بۆ هەولێر؟، لەوێش ماوەیەك لە گەڕەکی مەنتکاوە مەختەفی بووم و دەگمەن دەهاتمە دەرەوە. پاشانئاشناو ناسیاویمان لەگەڵ خەڵکیدا کردو هەویەیەکی تەزویری ئەسیرم پەیدا کرد. زۆر خۆش حاڵ بووم بەوەی کە جورئەتی چوونە دەرەوەم دەرکرد تاکو لەسەر جادەکان دەست گێڕی بکەم و نانە سکیەکە پەیدا بکەم. بەهەر حاڵ سێ ساڵ لە هەولێر بەمرەو مەژی ژیانمان بەسەر برد. تاکو ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی ١٩٩١لە ڕاپەڕینەکەدا خۆم ئاشکرا کرد کە تاقیکردنەوەی پێشمەرگایەتیم هەیە و لە زۆر بەی بەیەکدا دانەکاندا بەشداریم کرد و بەپێی توانا ڕۆڵی خۆم بینی و ئەرکی سەرشانم بەجێ هێنا. لەوکاتانەدا کەلە کۆڵاّن و شەقامەکانی هەولێر شێلم و شەربەت و چلورەو فانیلەی عەلاگەو گۆرەوی و. ..بەکورتی هەرچی بخورایەو بخورایەتەوە،بمژرایەو بلێسرایەوە، بجورایەو قوت بدرایە، لەبەر بکرایەو لەپێ کرایە، لەسەر بکرایەو لە دەست بکردایە،بە بەرا بکرایە دەمفرۆشت!. کەچی کاکە نەوە دیعایەی بۆ خۆی کردبوو کە ئەردەلاّن پیلانی کوشتنی دانا بووا.تێناگەم ئەم کابرایە تەواوی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بە دوژمنی خۆی دەزانێت. پێشڕەوی برام چەندین نامەی لە هەڤاڵانی ڕێکخستنییەوە کە نەبوونە پێشمەرگە لە ڕێگەی بەریدی ئێرانەوە بۆ چوو بوو کە گوایە من هەوڵی کوشتنی نەوشیروان مستەفام داوە. ئەویش وەك ئەوەی پاشان بۆی باسکردم کەوتبووە بارێکی دەرونی زۆر ناخۆشەوە. لە لایەکەوە بەهۆی ئەوەی کە پاش

دەرچوونی بۆ ئەورووپا کەسانێکی زۆر لە ڕێکخستن کە گیرا بوون بە فرسەتییان زانی بوو بە ڕاست و ناڕاست ئیعتیرافیان لەسەر ناوی ئەو کردبوو کە گووایە بەر پرسیان بووە، لای ڕژێم بە جۆرێك لە حەجمی خۆی زلتر کرا بوو کە حکومەتی عێراقی لە ڕێگای ئینتەر پۆڵەوە داوای هێنانەوەی کرد بوو. بەو بیانووەی گووایە تاوان بارێکی ناسیاسی و خەتەرناکە. بۆیە مەسەلەی وەرگرتنی پەناهەندەییەکەی معلق مابۆوە. لەلایەکی ترەوە هیچ هەواڵێکی دایکم و ئێمەی نەدەزانی. سەرباری

خەمی نەبونی ماف ئیقامەی ئازادو کارو خوێندنی خۆی شەرمەزاری بەناو {پلانگێڕی} منیشی بۆ زیاد بوو بوو.

زۆرجار بیرم دەکردەوە ئاخۆ بەچی تاوانبار کرابم، تۆ بڵێ ی نەوشیروان نیازی کوشتنمی هەبوایە؟ بەهەرحاڵ نازانم بەڵام ئەوەی نەوشیروانی بناسیایە ئەوەندەی بێ ئامان بوو کە ئەگەر ئەو بانگی کرد بە قۆڵ بەستراوی دەبووایە چارێکت بۆ خۆت بدۆزییایەوە یان یان خۆت دەرکردایە! دەڵێن لە نێوانی ئاژەڵی دارستانێك بڵاودەبێتەوە کە ڕاوچیەك پەیدا بووە کە هەر نێچیرێك سێ گوونی هەبێت ڕاوی دەکات ! ڕێوی بەهەڵە داوان پەنا دەباتە بەر دارستانێکی تر. کاتێ شێری پاشا دەڵێت: جا خۆ تۆ تەنها دوو گوونت هەیەو لەمەترسیدا نەبوویت! ڕێویەکە دەڵێت: بەڵێ قوربان جەنابتان ڕاست ئەفەرموون بەڵام ئەو ڕاووچیە لە پێشدا نێچیرەکە دەکوژێت.ئەوسا سەیر دەکات تا بزانێت دوو گوونی هەیە یان سیان! من باشبوو وەك ڕێوییەکە نەوشیروانم دەناسی، سەرباری ئەوە چەندین جار حسابم کرد بوون لە دووان زیاتر دەرنەچوون!.بەڵام بەداخەوە زۆر کەس ئەم ڕاوچییەی نەدەناسی و توشی داوە کوشندەکانی دەبوو. کەسێکی وەکو فەرماندەی کەرت لە شارباژێر شەهیدی تێکۆشەر خەلیفەی عبدلله مارف بەوشێوەیە کەوتبووە دوای بڕیاری نەوشیروانەوە. کاتێ کەریمی برای خەلیفە عمری ڕەشە جووتە شەهید دەکات،شەهید خەلیفە هیچ لە خۆیدا شك نابات و خۆی بەگوناهبارو تاوانبار نازانێت خۆی ناشارێتەوە.نەوشیروان فەرمانی بە کەسێکی ژێر دەسەڵاتی خۆی دابوو کەتۆڵەی شەهید عمری ڕەشە جووتە کەلەلایەن کەریمی برای خەلیفەوە شەهید کرا بوو خەلیفە بکوژنەوە!. خەڵکینە من نەوشیروان ناناسم! ئێوە خۆتان حکوم بدەن، ئەم کابرایە لە خێڵی هەرییەکە یان سورکییە؟ یان ڕەیس عەشیرەتی(شمر و البوب جاب)ە؟. لەوەش سەیرتر ئەوەیە پاش ٣ سەعات لە شەهید کردنی خەلیفە بروسکەیەکی تر لەلایەن نەوشیروانەوە دێت کە خەلیفە ئەکوژن و گوایە پەشیان

بۆتەوە، ئەو پرسیارەش کە نامەوێت ناوی بهێنم لە سەر ئەو بێنرخ سەیر کردنەی کە نەوشیروان بۆ ژیانی پێشمەرگە و فەرمانی لەسەر پێ بۆ ژیان و مردنی پێشمەرگە نالار کردنی بە کوشتنی کەسێکی بێ گوناح تاکو ئێستا بە ناوتاوانبارترین و بێ ئامان ترین کەسی ناو یەکێتی دەزانێت.

نەوشیروان لە لاپەڕەی ۱۸۳ای کەشکۆڵەکەدا لە باسی ملازم موحسینی دڕندەدا دەڵێت {چەند جارێك چوبووە سەر بەختیاری برام و ئەحمەدی مامە ڕەزام. جارێك ئەوەندەی لە ئەحمەد دابوو، گووێ یەکی کەڕ کرد بوو. هەڕەشەی لە بەختیار کرد بوو، کە ئەگەر لە سلێمانی چی تر پیاوی حکومەت بکوژرێ، ئەویش بەختیار ئەکوژێ}. بێگومان ئەم دەست درێژی و لێدان و هەڕەشانەی مولازم موحسینی تاوانبار لە تۆڵەی کرداری نەوشیروان بووە. بەلام با بێن و ئەحمەدی مامە ڕەزات و بەختیاری برات. کە هەردووکیان سوپاس بۆ خوا ساغ و سلامەتن لە پاڵ لاشە خوێناوییەکەی خەلیفە بێ گوناحدا دایان بنێن کە لە تۆڵەی کرداری براکەی ئاوات بەسەر هێناو بەراوردێکیان بکەین ئەوسا بەدڵنیاییەوە هەر هەمووومان دەڵێین:هەزار خۆزگەم بەکەڕ بوون!. هەزار خۆزگەم بە لاڵ بوون!. هەزار خۆزگەم بە هەڕەشە!. هەزار خۆزگوم بەڕاونان!. هەزار ڕەحمەت لە کفن دز!.تۆش کاکە نەوە ئەو پرۆژەیەی گۆڕان کەمێك بواری دایت. بەراوردێکی مەوزوعیانەی کرداری خۆتی ڕیفرۆم خواز و کرداری مولازم موحسینی تاوانبارمان بۆ بکە و بە ڕاپۆرتێکی مفصل وەلامێکمان بۆ بنوسەرەوە، تاکو لە پەڕلەماندا موناقەشەی بکەین!. هەر لەو سەردەمەدا کە لە هەولێر بووم خەبەرێکی پڕ ناسۆرو بەئازارم پێگەیشت کە فەرماندەی کەرت کاك سالاری حاجی دەروێش، پێشمەرگەی قارەمان و ڕەوشت بەرزو هۆشیار کە لەساڵی ۱۹۷۳ەوە کۆمەڵە بووە، بە تاوانی پەیوەندی بە ڕژێمەوە گوللە باران کراوە. پاشان دەرکەوت کە کاك سالاری چاو نەترس لە سەردەمی ئەنفال و کیمیا باران کردنی هەڵەبجەدا بەسەرکردە فیرعەونەکانی وەکو نەوشیروانی ووتبووئەو بارەی بەسەر کوردستاندا هاتووە هەمووی ئەنجامی سیاسەتی هەڵەی ئێوەیە.

دەمەوێت بەو ڕەوشانە بڵێم کە واهیمەی ئەوەیان کردبوو یان بەئەنقەست بۆ دەرخستنی گەورەیی گرنگی خۆیان کە بەردەوام پلانیان لە دژ دەکرێت دیعایەی هەرزانیان بلاوکردبۆوە. ئەگەر من نیازی خیانەت و کاری خراپەم هەبوایە یەکەم، نەم دەگوێزرایەوە بۆ هەولێرو خۆم نەدەخستە غەریبی و مەترسی گرتنمەوە، لە کاتێکدا لە و سەردەمانەدا

دەیان کەسی هەل پەرست بوو بوونەوە پیاوی ڕژێم بە پەرۆش و خۆش حاڵییەوە ئامادەی خیانەت کاری بوون بەڵام خۆش بەختانە پاش ماوەیەکی کەم بەهۆی خەڵکە بەشەرەفەکەی هەولێرەوە غەریبییمان پێوە دیار نەمابوو.

درهەم، دەیان ڕێکخستنی ناو شاری سلێمانی و پاشان هەولێرم دەناسی بە تایبەتی ئەوانەی کە بەهۆی تێکەڵاوییان لەگەڵ پێشڕەوی برامدا پێیان ئاشنا بوو بووم تاقە کەسێکیان خوێن لە لوتی نەهات و تووشی هیچ سەریەشەیەك نەبوون و خۆش بەختانە زۆربەیان لە ژیاندان. لە نمونەی ئەو کەسانەش(ئاسۆ ئیسماعیل ڕەشان،کە پاشان بووە جێگری وەزیری ئاوەدان کردنەوە. حەمە جەزای برای دلێری سەید مەجید،کە ئێستا وابزانم ئەندام مەڵبەندی سلێمانییە، خەلاتی شێخ جەنابی برازای شەهید شەهاب،نوری حەمە علی کە کاتێ خۆی بەر پرسی سەرکردایەتی ناو شار بوو، مام ڕەزای معمیلی جگەرەو جبار ولۆبەیی و خوشکێکی شەهید ئارام و ئەحمەدی پۆلیس و ئاراسی وەستا ئەحمەدو مامۆستا حەمە علی، پێشڕەوی مامۆستا گهها کە بە نەخۆشی شێر بەنجە کۆچی دوای کرد، هەروەها زۆری تر). سێهەم، من تێناگوم بۆچی گوایە ڕژێم هێندە سور بوو لەسەر ئەوەی کەسێکی وەك نەوشیروان مستەفا لە ناو ببات؟ ئەگەر نەوشیروان مستەفاو نمونەی ئەو نەمێنن ئەی کێ هێندە چالاك و کارامە شەڕی برا کوژی بەناوی خەباتی چینایەتییەوە گەرم بکردایە؟ ئەی کێ پێشمەرگەی ناچار بە جاشێتی و دانیشتن و چوّن بۆ خاریج بکردایە؟ ئەی کەساتییە ناسراوەکانی لایەنەکانی تری بەپێشمەرگە بە ئیتغال کردن بکردایە؟ ئەی کێ پاشان بۆ شاردنەوەی بەلگەیی تاوانەکانی لە پشتی ملەوە ئەو پێشمەرگەیەی تەور کوژ بکردایە؟ئەی کێ بە باوکە جگەر سوتاوەکەی هەمان پێشمەرگە کە تەنها ووتبوی:{بۆچی بێ دادگایی کردن کوڕەکەمتان کووشتووە}بووتایە ئەگەر کوڕەکەتان زیندوو بێتەوە دووبارە ئەی کوژمەوە؟ ئەی کێ شۆڕش و خەباتە لە بەرچاوی پێشمەرگە ناشرین ناشرین بکردایە؟ دوای ڕاپەڕین کاك شۆڕش ئیسماعیل و کاك قادری حاجی عەلی داوایان لێکردم کە بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی،منیش بە پەرۆش و خۆش حاڵییەوە گەڕامەوە. بۆ ئەو مەبەستەش نامەیەکیان بۆ کردم کە ڕێگری نەکرێم، لەو کاتەدا بۆ گوێزانەوە بە ماڵەوە لە نێوان شارەکاندا دەبوایە مۆڵەتی ڕەسمی وەربگیردرێت.(سەیری پاشکۆی ژمارە٢).

هەندێك لە بەرپرسانی یەکێتی دەیانزانی کە هەمیشە کارەکانم بە دڵسۆزی ئەنجام داوە و جێ ی باوەڕ بووم و لەو سەردەمانەدا کە نەوشیروان بە دوای بەهانەدا دەگەڕاو تووشی

بەلایەکم بکات بۆ ماوەی نزیکەی سالێك بەرپرسی کەرتی پارێزگاری بارەگای مام جەلال بووم. بۆیە پاش گەڕانەوەم بەچەند ڕۆژێك لە هەولێر داوام لێ کرا کە بارەگایەك دابنێم و پارێزگاری رئێستگەی دەنگی عەلی کوردستانی بکەم. منیش لەسەر گردەکەی عەلی ناجی بارەگام داناو ماوەیەکی زۆر بەو پەڕی پەرۆشەوە کارەکانم دەکردو پارێزگاری ئێستەم بەکارێکی گرنگ پێویست دەزانی و کەسانێکی زۆرم لەکەس و کار و هاوڕێیانم کۆکردەوە بۆ کاری پێشمەرگایەتی، بۆ نمونە بەرزانی برام و هیوای زاوام و ئاری وەستا ئەحمەدو سادق و ئەکرەم و چەند کەسی تر.(سەیری پاشکۆی ژمارە٣). بەداخەوە بە هۆی ئەوەوە مۆڵەتم نەدرا بەشداری لە گرتنی کەرکوك ئەو نەبەردییە مێژووییەدا بکەم. پاش ئەوەی هاتمەوە بۆ سلێمانی لێرەو لەوێ بەرگوێم دەکەوت کە گوایە من تاوان بارکرابووم بە پلانی کوشتنی نەوشیروان لە لایەن ڕژێمەوە. ئەوەی منی سەرسام کرد بوو ئەوە بوو چۆن منێك کە لە شاخ بەتاوانی ئەوەی ئیتلاعاتی ئێرانی بم ڕاونرامو چۆن ئەمە لەگەڵ پلانگێڕی بۆ ڕژێمیشدا یەك دەگرێتەوە.پیاوی دوو وولات کە هەردووکیان لە شەڕێکی خوێناوی هەشت ساڵ دا بوون؟سالانێکی زۆر ئەم دوو شتە ناکۆك بەیەکەوە لە مێشکمدا دەزرنگایەوە. کاتێ کە هەندێ فیلمی دۆمکۆمێنتی ئەڵمانیم دەبینی کە لە سەردەمی هیلتەری نازیدا بۆ تبریری کۆمەڵ کوژی جولەکان کە بەسەرمایا دار و خوێنمژی هەزاران لە لایەکەوە لە لایەکی ترەوە بەکۆمۆنیست تاوانبار دەرکران. ڕاستەوخۆ بەیادی تاوانبار کردنی خۆم بە جاسوسی ئێران و عێراق لە هەمان کاتدا بەیاد دەهاتەوە. کێ دەڵێت نەوشیروان هێندە سەرسام نەبووە بەنازییەکان تا لە هەندێ مەسەلەدا یودیان لێ ببینێت؟ خۆ لە هەندێ لایەنەوە لە یەك چوونی لەگەڵ هیتلەریشدا هەیە. نەوشیروان وەك عیزەتی مەلا لە گۆڤاری جیهاندا باسی دەکات حەزی لە نان و تەماتە زۆرە، هیتلەریش تەنها میوەو سەوزە خۆر بووەو هەرگیز گۆشتی نەخواردووە. هیتلەر خۆی بە دۆستی کرێکاران و هەژارانی ئەڵمانی دەزانی و زۆربەی هەژاران و کرێکارانی کرد بەسوتەمەنی جەنگەکانی. کاکە نەوەش بەهەمان شێوە خۆی بە دۆستی کرێکاران و هەژارانی کورد دەزانێ لەو شاخ و کێوە ئەیکردن بە گەرووی شەڕی ناوخۆدا. هیتلەر یاسابوو یاساش هیتلەر بوو، نەوشیروانیش یاسا بوو یاساش نەوشیروان بوو. بکوژو ببڕ خۆیان بوون ئەو بە حەجمی گەورەو ئەم بەحەجمی بچوك. هیتلەر چیرۆکێکی خۆشەویستی لەگەڵ ئیفا براوندا بۆ خۆی سازدابوو بەلام خۆشەویستی گەورەی تەنها خۆشەویستی ئەڵمانیا بوو! نەوشیروانیش لە لاپەڕەی ١٩٤ی کەشکۆڵەکەیدا

چیرۆکێکی خۆشەویستی بۆ خۆی دروست کردووە. دەستم شکێ،بەیانە زاڵمەکەی ١١ی ئازار لە یەکتری کردوون!. هیتلەر لە بەر دڵی ئیفا براون لەو دوو ڕۆژەدا خۆی دەکوژێت خۆیدەکوژێت زەماوەندی لەگەڵدادەکات !نەوشیروان بەتکاو پاڕانەوەو لەبەر دڵی برادەران لەڕێگا ی دەلالەوە ژن و ژنخوازیەکی عەشایەری دەکات. سەیرو عاجبایەتی لەوەدایە کەئەم کابرایە ژن هێنانیشی کردووە بەمنەت بەسەر خەڵکەوە. ئەشەمبیلا ژن هێنان هیچ منەت نیە و بۆ خۆشی و کامەرانیە !.کاتێك کە لە کێشەی پارتی و یەکێتیدا خوێندمەوە و بینم نەوشیروان مستەفا چون لە هاوسەرەکەی دواوە، ووتم خۆش بەحاڵی کچەکەی پێش بەیانیەکەی ئازار کە بەنسیبی ئەم ژن دووژمنە نەبوو. لە لاپەڕەی ١٠ادا نوسیویەتی {لە ئەنفالی ١ادا ماڵ و بارەگەکانمان داگیر کرا خێزانەکەم لە بەرگەلۆو لە گەڵ خۆم ئەژیان. دایکی منداڵەکانم لە ئۆتۆمبێل وەلگەڕابوو، ئەرکی قورسی من و هەموو مناڵەکانمی پێ هەڵنەسووڕا} .ئەگەر ئەم قسانە هی باپیرم بووایە کە بەڕۆژنامەی دەگوت قەزاتە دەمگوت قەیناکە!. ئەگەر قسەی کابرایەکی خێڵەکی بواییە جامانەو مشکی تێکەڵاو بکردایە هەر ئەمووت لە سەرچاو! ئەگەر قسەی موستەشارێك بوایە دەمووت،ێ مننا!. ئاخر تۆ کە بەناو دژی کۆنە پەرستی و نەرتی خێڵە کیت و پێشڕەوی گۆڕان و شۆڕشگێریت؟ بۆچی هەروەکو کەسێکی تقلیدی پیاو سالاریان خێڵەکی یان مستەشارێك دەدوێت؟ دایکی منداڵەکانم کێن؟ تۆ بڵێ ی ناوێکیان لێ نەنابێت؟ تا ئێستا لات شورەییە کە ناوەکەی ئاشکرا بکەیت؟ خۆ ماڵ ئاوەدان لە کەشکۆڵەکەتا چەند هەزار ناوێکیان هێناوە، تۆ بڵێ ی ناوی ئەو هێندە لە سەردەم زەحمەت بێت؟ ئەمەیان لە لایەك. بەلاّم بە چ ویژدانێکەوە باسی ئەوە دەکەیت کە سەرباری ئەو بەستەزمانە لە ئۆتۆمبێل وەلگەڕاەوە هێشتا ئەرکی قورسی تۆە منداڵەکانی بە سەرشانەوە بووە، با باس لە پیاو سالاری هاوکاری و خۆشەویستی هەر نەکەین تەنانەت ویژدانت چۆن ئەوەی لێ قبوڵ کردویت ئەرکی قورسی خۆت و منداڵەکانت بخەیتە سەر شانی بریندارێك؟ بۆ جەنابی نەوشیروان اغای مستەفای خانی ئەمین پاشا، بە تەنازوولت دەزانی هەر هیچ نەبێت ئەرکی خۆت بخەیتە سەر شانی خۆت؟ یان ڕەنگە لە بری دەست و قاچی ئەو مێشك و ویژدانی تۆ لە گەچ گیر درابێت؟ پاشان کەڵکی کاریشی پێوە نەما وەك ئەوەی خۆت نوسیوتە ڕەوانەی بەریتانیات کرد!بەڕاستی زۆرم پێیە بەلاّم نامەوێت لەوە زیاتر بڵێم. خوا فرسەتی بات. ئەگەر هاتوو خۆشت ئەم باسانەت نەخستایە سەر کاغەز بەدڵنیایەوە بەهەقی خۆم نەدەزانی لە پەیوەندی خێزانیت بدوێم. بەلاّم هێندە دەڵێم

بەحـەق ئـەو دوو کـچەی بـە{دایکـی نمـا} یـان ووتبـوو نەوشـیروان ڕقـی لـە ژنـە باشـیان ناسیبویت. عیزەتـی مـەلای هاوڕێـت لـە گۆڤـاری جیهانـدا نـا ڕاسـتەوخۆ باسـی ئـەم ڕق لـە ژنیەت دەکات و دەنوسێت {نەوشیروان ئـەو سـەرکردەیەی کـەیفی بـە تێکـەڵ بـوونی ژنـان نایەت}. بەڵام باسی ئەوە دەکات کی حـەزتان لـە نیسکێنەیە! منـیش بەشبەحاڵی خـۆم لـە پێشمەرگایەتیدا خوا نەی بڕێت نیسکێنەم زۆر خـواردوووە مـاڵی هـەژاران و جوتیـاران ئـاوا بێت بەڵام ئێستا خوا بە ناشکوری لێم نـەگریت. تـۆ ببیـنم و نیـسك نـەبینم. ژن و کـچیش دەشوبهێنم بە ژیان و جوانی و بۆنی خۆشی میسك. هەر بۆیـە بیـل مناسـەبە ئـەم بەیتـەی مەحویەکـەی لەمـەڕ خۆمانـت پێـشکەش دەکـەم کـە میـسك و نیـسکی زۆر دیالـە کتیکیانـە خستۆتە وەحدە و تچادهوە:

**مەئلوفە ژەوقی زاهید ئەوەندە بـەتامی نیسك بێگانـە مـاوە شـەممی لـە نەشـئەی خیتـامی میسك**

شەهید کردنی جوامێری سەرتیپ و هەڤاڵەکانی بە فەرمانی نەوشیروان

یەکێك لە تاوانەکانی تـری نەوشـیروان شـەهید کردنـی جوامێری سـەر تیپ و هـەڤاڵانی سـەلاح علی و حەمـەی شـێخ حەسـەن و زاهیر بـوو. جـوامێر یـەکێك بـوو لـە پێـشمەرگەو فەرماندە لە خۆبردوو سەرکەوتووەکانی یەکێتی. تەواوی تەمەنی لاوێتی خۆی بۆ شۆڕش و گەلەکەی تەرخان کردبوو. دەیان داستانی سەرسوڕهێنەری قارەمانانەی لە مێژووی خەباتی پێشمەرگەدا بۆ تۆمار کردووین. ئەوەی بەلایەوە هەرزان و بێ نرخ بوو تەنها خۆی و گیانی خۆی بوو بەرامبەر ئازادی گەلەکەی. نمونەیەکی زینـدووی لـە خۆبـووردووی ئـەوە بـوو کـە لەکاتی بەرەو پیرەوە چوونی نەبەردیەك لە ڕێگا مار پێوەی دەدەات،بەڵام تاکو ئەنجام دان و کۆتای شەڕەکە لای کەس ئاشکرای ناکات تاکو ئەمە نەبێتـە هـۆی ئـەوەی پێشمەرگەکان بـە هۆی ژەهراوی بوونی سەر تیپەکەیانـەوە تووشـی بـێ ورەیـی بـبن و کاریگـەری خراپیـان لـە سەر بکات. جوامێر سەرباری ئەوەی دوو برای شەهیدی شۆڕش بوو. خۆشی هێـشتا بێبکانـە بە پیری مەرگەوە دەچوو. لە شەڕی شاخی حەسەن بەگی پشتی ولاخلو کە من لە نزیکیەوە بـووم و بەشـدالای شەڕەکە بـووم و جـوامێر یـەکێك بـوو لەوانـەی سەرپەرشتی شـەڕەکەی دەکرد لە توانـای هـیچ قەڵەمێکدا نییـە قارەمـانی و لـە خۆبـووردی جوامێر وەسـف بکـات، نەبەردییەکانی جوامێر بە چەندین باس بە چەندین لاپـەڕە کۆتـای نایـەت، ئـەو قارەمانـە شایەنی ئەوەیە کە نەبەردییەکانی بە ووردی بنوسـرێتەوەو بکـرێن بـە فلیمـی سینەمایی و

ببنە جێگای شانازی گەلی کورد و ئیلهای شۆڕشگێڕانە بۆ تەواوی گەلانی ئازادی خوازی دوونیا.

سەلاح عەلی کە ناسراو بوو بە(سەلاح چاو زەق). ئەمیش کوڕی یەکێ لە هەژارەکانی گەلەکەمان بوو، بۆ دەرامەتی ژیان بوو بوو بە پۆلیس. لە ساڵی ١٩٨٠دا دوو چەکی ڕفاندو هاتە ڕیزی پێشمەرگەوە. لە پاش ماوەیەکی کەم بوو بەیەکێك لە پێشمەرگە قارەمانەکانی ناو تیپی ٤٧ی پیرە مەگروون. تەنها ئەوەندەی من ئاگادار بم جگە لە نەبەردییەکانی لە ڕێگای پەلامارەکانی شەو بۆ سەر دووژمن و شەڕە قورسەکان ١٢ ئیغتیالاتی ناو شاری بە ئەنجام گەیاند بوو. چەندین پیاو خراپ و سیخوڕی بە ڕۆژی ڕوناك لە شەقامەکانی سلێمانیدابە سزای میللەت گەیاند بوو. بەهۆی ئازایەتی و بە توانایی خۆیەوە بووە فەرماندەی مەفرەزە و پاشان جێگری فەرماندەی کەرتی ٥ی شەهید هاوڕێ جەبار هاوسەرو منداڵەکانی زۆر لە ناڕەحەتی و گوشاری ڕژێمدا بوون و بەردەوام لە خۆشاردنەوە و خۆ پارستندا بوون لە ڕژێم بۆیە دەیان وویست سەلاح بیان گوێزێتەوە بۆ ناوچە ئازاد کراوەکان. بەلام سەلاح هەمیشە ڕێگری ئەوەی دەکردو دەیووت: {ئەگەر خێزانەکەم بهێنمە دەرەوە ڕەنگە نەتوانم باشتر پێشمەرگایەتی بکەم. ئەبێ بڕوامان بەوە هەبێت کە ئێمە ڕۆژێك لە ڕۆژان چۆك بە دووژمن دادەین و دەگەڕێینەوە ناو خێزانەکەنمان}.

قوربانییەکی تری نەوشیروان مستەفا: حەمەی شێخ حەسەنی بازرگانە، با کەس بەهەڵەدا نەبەم شێخ حەسەن نەدووکانی بازرگانی هەبوو نە بازرگان بوو بەمانای خاوەن کۆمپانیا و تەندەری ملیۆنی. تەواوی سەرمایەکە ئەو تۆپە قوماشانە بوون کە لەسەر عەرەبانەیەکی دەستی دەیگێڕان و تەواوی سەرمایەکەی بەشی ئێوارە خوانێکی بەرپرسێکی مام ناوەندو {تێکۆشەرێك}ی ئەمڕۆی نەدەکرد. حەمەی شێخ حەسەن ساڵی ١٩٨٢له تەمەنی ١٦ساڵیدا پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە کرد بەهۆی منداڵکارییەکەوە هەر زوو نازناوی(حەمە بچکۆلی)بەسەردا بڕا،حەمە بچکۆل نمونەیەکی زیندووی دڵ گەورەیی و لە خۆبووردیی بوو لە پاڵ پێشمەرگە قارەمانەکانی کەرتی ٣ی ئەزمەڕو کەرتی ٥ی شەهید هاوڕێ جەباردا بەشداری دەیان ئیغتیالات و تەواوی شەڕو نەبەردییەکانی ئەو سنورەی کردووە و لە تەواوی شەڕەکانی قەیوان و ماوەتدا بەشدار بوو.

بەداخەوە دەربارەی شەهید زاهیر ئاگاداری پێویستم لە سەری نییەو لە نزیکی یەکتری نەبووین، بۆیە ناتوانم لە سەری بدوێم.

لەو ماوەیەدا کە خۆم تەسلیم کردبۆوە و شاگردی حەمیدە سوری بەقاڵ بووم، بەیانیەکیان کە خۆم ئامادە کرد بوو بچم بۆ سەرکار لە دەرگا درا، دایکی حەمەی شێخ حەسەن ناوەخت هاتە ژوورەوە. پاش بەخێرهاتنی و هەواڵ پرسین نامەیەکی دامێ و پێ ی ڕاگەیاندم کە حەمەو جوامێری سەریپ و هەڤاڵێکی چەك دابنێن. منیش نامەکەم خوێندەوە و بەلامەوە شتێکی غەریب نەبوو چونکە لەو سەردەمەدا دەیان و سەدان پێشمەرگە چەکیان دادەناو دەگەڕانەوە، کەمێکیان دەستیان دەدایە خراپەو زۆربەیان بێ خیانەت کردن دادەنیشتن. دایکی حەمە باسی ئەوەی دەکرد کە شێخ حەسەن ڕازی نییە کە بگەڕێتەوە. منیش ووتم،ڕاستە لێرە ژیان هەیە و ئیش و کارو کارەباو جێ ی گەرم هەیە،بەلاَم ئەگەر بتوانن بمێننەوە خۆیان ڕابگرن باشترە. ووتی ئەگەر دەتوانی قسە لەگەڵ شێخ حەسەن بکەیت. منیش پرسیم بۆچی نامەی بۆمن نەناردووە، ووتی تۆیان بە جێگەی متمانە زانیووە و ئەیانەوێ لەگەڵ عمر عەرەب قسە بکەیت کە هەوڵی لێ بوردنسان بۆ بدات.منیش کە چوومە بۆلای شێخ حەسەن و باسی مەسەلەکەمان کرد. شێخ حەسەن حەزی دەکرد حەمە بگەڕێتەوە، بەو مەرجەی وەکو من و نەوزادی عەبەی تەقی کە کاری کەباب چێتی دەکرد کارێك بدۆزێتەوە و توخنی عمر عەرەب نەکەوێت. منیش باسی وەزعی جیاوازی عومەرم بۆ کرد کە دووژمنایەتیەکی زۆری هەیە و بەبێ چەك ڕۆژێك لە ژیاندا نامێنێتەوە وەزعی ئێمەو ئەو جیاوازە. ئەوسا قەناعەتی کرد. سەرەتا نەم ئەزانی چۆن لەگەڵ عمر بدوێم،چونکە دەمزانی کە عمریش بۆ مانەوەی خۆی حەز دەکات کەسانی چاو نەترس و خاوەن تاقیکردنەوە بۆ پارستنی خۆی خاوەن تاقیکردنەوە بۆ پاراستنی خۆی لە نزیك بخاتەوە. بۆیە بەچاکم زانی لەگەڵ ئیبراهیمی وەستا حەسەن کە ئەویش زووتر پێشمەرگەی ٥٧ی سەرگرمە بوو. ماوەیەك بن لە بەر هەندێ هۆی تایبەتی چەکی دانابوو، هەروەها پێشڕەوی مامۆستا تەها کە دەمزانی پەیوەندی پەیوەندی ڕێکخراوەیی بە کۆمەڵەوە هەیە هەندێ ڕاوێژ بکەم. پێشڕەویش مەسەلەکەی بە باوکی و مامی(محمەد نوری تۆفیق)گەیاند بوو کە بەبێ ئەوەی من و براهیم ئاگادار بین هەروەها نەشمان دەزانی کە باوك و مامی پێشڕەو لە سەردەمی بەکرەجۆ و هاوڕێیەتیان لەگەڵ کاکە نەوەدا هەبووەو هەواڵەکە ڕاستەوخۆ بەنەوشیروان دەگەیەننەوە. سەرباری ئەوەش پێشڕەو هات بۆ لام و پێ ی ووتم کە بیری لە مەسەلەکە کردۆتەوەو واباشە کە تەسلیم ببنەوە. بەیەکەوە چوون بۆ لای عمر عەرەب و نامەیەکیان دایە دەستی. عمریش ووتی: ئەوەی

لەسەر منە پرسیارلە حکومەت بکەم بزانم چی دەڵێن. لە دائیرەی ئەمنی سلێمانی پێیان ڕاگەیاند بو، ئەگەر لەوێ کارێك بۆ حکومەت بکات، واتە واتە خیانەتێك بکەن ئەوسا لێیان دەبوورن من و پێشڕەوی مامۆستا تەها هەمان جوابمان بە دایکی حەمە ڕاگەیاند بوو پێشمان ڕاگەیاند کەپێ یان بڵێت وەزعەکە بۆ ئەوان لە بار نییەو واباشترە جارێ بمێننەوە. ئەوانیش نامەیەکی تریان نارد بۆوەو تیایدا نووسیبویان کە بەهیچ جۆرێك ئامادە نین دەستی خۆمان بەخوێنی نەك یەکێتی و لایەنەکانی تر تەنانەت بە خوێنی ئیسلامییەکان سور ناکەین.(ئەو کاتە ئیسلامییەکان زۆر ناخۆشەویست بوون و خوێنیان لای یەکێتی وەك شیری دایکیان حەلاڵ بوو!.). پاش ئەوەی من و پێشڕەوی مامۆستاو تەهاو برایمی وەستا حەسەن، نامەکەمان خوێندەوە، دەق و نەص بەیەکەوە وەلامەکەمان بە عمر ڕاگەیاند. ئیتر لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە چیان بە عمر ووتبوو نازانین. بێگومان نەوشیروانیش لە لایەن پێشڕەو یان کۆنە هەڤاڵەکانیانەوە واتە باوك و مامی پێشڕەو ئەم مەسەلەیەو وەلامەکەی جوامێرو ئامادەنەبونیان بۆ تاوان ئاگادار بووە. بەلام خۆ گرنگ کردن هەفتەیەکی نەخایاند کاکە نەوە جوامێرو هەڤاڵەکانی قۆڵ بەست کرد بوون. پاش لێکۆڵینەوەیەکی سەرپێ ی و کورت و بێ دادگایی بڕیاری ڕەمی کردنیان دەدات. لە شاخدا گەر چی تەنها دیموکراسیەتییان بۆ کوردستان پێ کەم بوو داوای دیموکراسییەتیان بۆ عێراق دەکرد!. بەلام ماڤی دیکتاتۆریەتیان لە شاخا بە خۆیان دەدا!. ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم یەکێ لە مەرجە گرنگەکانی دیموکراتیش جیا کردنەوەی دەسەلاتەکانە. بەلام نەك هەر دەسەلاتەکان وەك چێشتی مجەور تێکەڵ بەیەکتر دەکرا. تەنانەت سنور بۆ جیا کردنەوەی نێوان لێکۆڵینەوەو دادگا(ئەگەر هەبوایە)هێندەی موەکەی پردی سیراگ باریك بوو. زۆر جار شەق تێهەڵدانی گەلە کۆمەکی و تەعزیب دان و ئیهانە کردن و خۆڵ و دۆ بەسەردا کردن و خستنە حەوزی مزگەوعتەوە، ناودەنرا لێکۆڵینەوەو دانیشتنی چەند فەریکە حاکمێك و ڕاگەیاندنی حوکەکەش ناودەنرا دادگای کردن. هەندێ جار هەروەك چۆن مجمید دەبوو بە دکتۆر، هەر ئاواش قوتابی تازە دەرچووی یاسا، یان قوتابی وازهێنەر لە کۆلێژی یاسا بە هۆی ئاشکرا بوونیەوە لە ڕێکخستندا ناوی لێ دەنرا حاکم. ئیتر نازانم کاکە نەوەی جارانەو تەنها ئەو کاتە لە ناو شاخ و لە پشتی شاخ بووین و ئێستا لەبەر شاخ و لە شاردایـن،. دەنا کەسەکان هەرهەمان شتن. ئەو کاتە بۆچی خۆی پێشڕەو ی بێ یاسایی بۆ ئێستاش لێمان بووە بە حامورابی! لە ئەلمانیا تورك و ئێرانی زۆر هەن. ئێرانییەکان بە

پێچەوانەی تورکەکانەوە زۆربەیان وا پیشان دەدەن کە کەسانی کراوە بن و ڕەگەز پەرست نەبن. بۆیە تا ڕادەیەك دەکرێ دۆستایەتییان لە گەڵدا بکرێت. تورکەکان بە پێچەوانەوە زۆر فاشیستن و لەگەڵ یەکەم چاك و چۆنیدا کە دەزانن کوریت هەستت بریندار دەکەن و دەست بە حیکایەتە بێ سەرو بەر دەکەن کە کورد نییە، بۆیە تالێیان دوور بیت سەر ڕاحەتەتریت. لە نێوان تورك و ئێرانیەکی زۆری ئەڵمانیادا لە سەر کارەکەم هاوڕێتیم لەگەڵ ئێرانییەکاندا کەم تا زۆر هەیە. هەندێ جار کە نەفەرمان نابێت، لەگەڵ یەکتریدا دەکەوینە باس و خواسی سیاسیەوە ئەمانیش کە زۆریان بۆ دێت، دەڵێن(کرد از پشت کوه ێ مده) واتە(کوردی لە پشت شاخەکانەوە هاتووە) لە وەشدا مەبەستیان لە«وەحشیەت و لە یاسا دەرچوونی کوردە». بێگومان بەردەوام هەوڵم داوە بە شێوازی خۆیان و زیاتر وەڵامی ئەو تانەو تەشەرانەیان بە توندی بدەمەوە. بەڵام هەندێ جار کە بیر لە نەوشیروان دەکەمەوە، سەرباری ئەوەی دەرچووی کۆلێژی یاسایە بەخۆم دەڵێم خوا حەقە بە خۆڕایی ئەم ناو و ناتۆرەیان دوا خستوین! حەتمەن دوانی وەك نەوشیروانیان دیوە.

نەوشیروان مستەفا لە لاپەڕەی ١٨٦ی کەشکۆڵەکەیدا لە باسی مێژوویی ووشەی چەتەدا باسی ئەوە دەکات کە چەتە بە مانای پارتیزان بووەو،پیس کراوە. بۆیە ترسی خۆی دەردەبڕێت کە ووشەی پێشمەرگەش بە هۆی ڕاوڕووتەوە ئاوای بەسەر بێت. لەو باسەدا لە عبارەی«خارج عن القانون»دەدوێت! ئەی ئاخۆ ڕەمی کردنی پێشمەرگە بەبێ دادگای یاسای و فەرمانی فەردی دورچوون لە یاسا نییە؟. جگە لەوانەش لەڕێگای باوك و مامی پێشڕەوی مامۆستا تەهاوە باش ئاگادار بوون کە جوامێرو هەڤاڵەکانی نیازی هیچ خراپەیەکیان نەبوو.تەنها دەیان ویست دابنیشن.ئەی تۆ بۆچی حەق بۆخۆت دەدەیت هەرکاتێ شتێك بە دڵی تۆ نەبوو جانتاکەت دەدا بە شانی پێشمەرگەیەکدا تافرودگای تاران نەدەوەستایتەوە دەچوویت بۆ خاریج و لەبەر خاتری برادەران نەبووایە نەدەهاتیتەوە. ئەگەر ئەوانیش ئەو ئیمکانات و پاسپۆرتەی تۆیان لە باخەڵدا بوایە لەبری گەڕانەوەو چونەوە بەردەم دڕەندەترین ڕژێم و بەقاڵی و کەباب چێتی و عەرەبانە پاڵ پێوەنان، ڕاستەوخۆ دەچوون بۆ ڤێناو لەندەن. بەڵام تۆ تەنها بۆ ترساندنی خەڵکی و سەپاندنی ئارەزووە نەخۆشەکانی خۆت، بۆ هیچ تاوانێك کەمترین لێکدانەوە ناکەیت و هەروا بەسەر پێیەوە لە ژیان و مردنی ڕۆڵەی گەلەکەمان و تێکۆشەران بڕیاری ڕەمی و ئیعدام کردن و لە زیندان توند کردنت دەدات. تەنانەت تەنفیزکردنی ئیعدامەکەش بەو پەڕی سوکایەتی

پێکردنەوە لە بەر چاوتا ئەنجام دەدرا. کاتێ کە(گراف فۆن شتاوتنبێرگ)کە جەنەڕاڵێکی هیتلەر بوو، بۆمبای بۆ کوشتنی هیتلەر لە ژێر زەمینی کۆبوونەوەدا داناو پاشان هەوڵی کودەتایدا بەسەر هیتلەرداو سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. هیتلەر سەرباری ئەوەی کە ناسراوە بە دڕندەترین کەسی مێژووی مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی ئوسوڵی سەربازی بەمەراسیمێکی یاسایی بەهۆی ٧سەربازەوە لەیەك سانییەدا ٧گوللەیان ئاڕاستەی سەر دڵی کردو پاشان یەك فیشەکی میهرەبانیان(گلقه الرحمه) نا بەسەرییەوە. تەنانەت هەندێ لە جەنەڕاڵ و ئەفسەرانی هاوکاری فۆن شتاوتنبێرگ لەسەر داوای خۆیان ڕێگایان درا خۆیان بکوژن. بەڵام تۆ و ئەوانەی وەکو خۆت پەروەردەت کردون بەوپەڕی سوکایەتییەوە جوامێرو سەڵاحی حاجی عەلی و حەمەی شێخ حەسەن و زاهیریان گوللەباران کرد.سەڵاح و جوامێری قارەمان هێندە فیشەکیان پێوەنرا بوو کە نەدەناسرانەوە.تەنانەت کوڵەکەی خانوویەکی گڵیشیان بۆ سوکایەتی پێکردن بەسەردا ڕوخاندبوون. ئەگەر نکوڵیش لەم ڕاستیانە دەکەیت وەعدی شەرەف بێت وەکو وەفایەك بۆ هاوسەنگەرانی چەندین ساڵەم ئەگەر کەسوکاری شەهید جوامێرو سەڵاح ڕەزامەندی دەردەبڕن لەسەر مەسرەفی خۆم کە تەنها زەویەکم لە کوردستان و تەکسیەکم لە ئەڵمانیا هەیە بۆیان بفرۆشم و دووبارە لە مەزارە پیرۆزەکەیان دەریان دەهێننەوە و دەیاننێرنبۆ پشکنین تا بزانرێ چەند گوللویان پێوە نراوە و چەند شوێنی جەستەیان پێش شەهید کردن و دوای شەهید کردنیان شکێنراوە. سەیر ئەوەیە لە کەشکۆڵەکەیدا ئەیزانی زل و ماقول بە پارە نییە، لە لاپەڕەی ١٨٥دا نوسیویەتی و دەڵێت: ﴿بێگومان سوکایەتی بە مردن و گۆڕ تاوانێکی گەورەو ناشرینە. لەم کوردەواریدا ئەمەدا ئەمە بەکارێکی نزم دائەنرێت﴾.

جەنابی نەوشیروان. دڵنیابە لەوەی کەس چاوەڕوانی ئەوە لە تۆو نمونەی تۆ ناکات ببیتە(دایە تێرێزا) و(باوە دامیان)لە بەڤەیی و میهرەبانیدا. بەڵام ئەم گەلە زۆر لێکراوە هەرهیچ نەبێت ماڤی خۆیانە کەسێك سەرکردەیان بێت کە هەر هیچ نەبێت لە هیتلەرێکی دڕندەش بێ بەزەیی تر نەبێت بەرامبەر بەهاوسەنگەرانی. کاکە نەوەی لە یاسا لادەرو لە هەموو هەستێکی مرۆڤایەتی داماڵدراو هەر کەسێ لەهەر شوێنێك باسی یاسا تۆ بکات تۆ وا باشترە بێدەنگ و ئەو شوێنە بەجێ بهێڵیت. تۆ تەنانەت ئەوەی دەوروبەریش چەواشەکارانە پەروەردە کرد بوو بەرامبەر هاوسەنگەرەکانی خۆیان. بۆیە وەك و پێشمەرگەیەکی دێرین گەرچی ماڤی ئەوە بە خۆم نادەم وەك و تۆبەکەس بڵێم ﴿بڕۆ

کوردستان بەجێ بهێڵە﴾. بەڵام تەنها پێشنیارت بۆ دەکەم کە سەری خۆت هەڵبگریت و بۆ شەێنێك بچیت کە بێوپـژدانی و بـێ یاسـاییەکەت کاریگـەری لەسـەر کـەس نـەبێت. بۆیـە باشـترین شـوێن خـۆت هەڵیبـژێره قـوتبی سـەروو یـان خـوارو یـان دارسـتانەکانی ئامـەزۆنی بەڕازیل!. بیر هاتن لە بۆ ئەورووپای شارستانی مەڵبەنـدی حکومی یاسا نەکەیتـەوە!. ئێـره جێ ی تۆ تیانابێتەوه. بۆ بەدبەختی ئێرەو کوردستان زۆر ئاسان بۆتەوە. بۆیه هیوام وایـەو ڤێناو لەندەن نیوەی ڕێگات بن!. تۆ تازه جێگای هیچ هیواو ئاواتێك نەماوی. بۆیه تەنانـەت شایستەی ئەم بەیتەی مەحویەکەی لەمەڕ خۆمان کە دەڵێت:

**بۆگوم بوانی چۆڵی مەحەببەتی، خوا تەبشیری، والسلام و علی تابع الهدی**

لـە بـواری تـردا چـەندین تـاوانی تـری نەوشـیروان دەخەمـە ڕوو سـەبارەت بەکوشـتن و ڕاونانی تێکۆشەران و چەك کـردن و دەرکردنـی کادێرەکانی کۆمەڵە کە تـەنها لـە بیرو بـۆ چونەکانیاندا نا تەبا بوون لەگەڵ نەوشیروان مستەفا. هیوام وایه ئەم نوسینه ڕێگا کـەرەوە بێـت بـۆ پێـشمەرگە دێرینـەکان کـە لـە نزیکـەوە مامەڵـەیان لەگـەڵ نەوشـیروان مـستەفاو نمەنـەی ئـەودا کـردووەو ڕاسـتیەکانیان ئاشـکرا بکـەین، بێنـە مەیـدان و لـە بـری خـەباتی چەکدارانە خـەباتی قەڵـەم بگرینـە بـەرو ڕاسـتیەکان بخەینـە ڕووو. دەرخـستنی ڕاسـتیەکان نیشانەی وەفـاو دڵـسۆزییە بـۆ ئـەو شـەهیدانەی کـە بـەناڕەوا بوونـە سـوتەمەنی و قوربـانی شەڕی برا کوژی، بەهانـدانی ئەنـدازیاری شـەڕی براکوژی. وەفایـە بـۆ ئـەو قارەمانانـەی بـە ناڕەوا بە فەرمانی سەرپێ ی و دڕندانـەو نایاسـایی نەوشـیروان مـستەفا بـوون بـە قوربـانی. پێـشمەرگە قارەمانــەکانی داســتانەکانی قــەیوان و مــاوەت و هــەلاج و دابــان و گــەرمیان خۆشناوەتی و قەراخ و دەشتی هەولێرو پشدەر بادینانیان بە نەترسانە یەکێتییەکەی جمالی عەلی باپیر و مامە ڕیشەو سەید کەریم و سەلاحی موهەندیس و دەیان و سـەدان سـەرکردە و پێشمەرگەی تـری شـەهیدمان بپـارێزن و خـوێنی شـەهیدان بـەفیڕۆ نـەدەین و کوردسـتان نەدەینە دەست کەسانی لە یاسا دەرچوو. تا خۆشکەرانی ئاگرو ئـاژاوەگێڕی شـاخ جـەماوەری بەشەرەف و تێکۆشەری شارەکانیش زەرەرمەند نەکەن و هەموو بـەدەنگێك دژی ئیـنقلاب و پلانـەکانیان دژی جـەماوەرو خەڵکـە شۆڕشـگێڕەکان بوەسـتینەوە. بـێ باکانـە بڵـێین: بـەڵێ ئەمڕۆ سەردەمی قەڵەم و موراجەعەتە.

**ڕونکردنەوەیەك لە بنەماڵەی شەهید( وریای وەستا وەهاب )ەوە سەبارەت بەخەبات و شەهید کردنی**

لەم کاتەدا کە خەڵکی کوردستان دڵخۆش و سەرقاڵی پرۆسەی هەڵبژاردنن بۆ ئەوەی لایەنی زۆرینەی ژیانیان مسۆگەر بکەن لە ڕێگەیەکی شەرعی و دیموکراتییەوە، ڕوو دەکەنە سندوقەکانی دەنگدان. هەندێك بەناو ڕۆشنبیر کەوتونەتە بانگەشەی چەوت و ناڕاست بەرامبەر بە ڕووداوەکان و چەواشە کردنی ڕاستییەکان و باسکردنی هەندێك بابەتی نا مەسئولانە، کە تەنها دەبێتە تێکدانی پرۆسەکەو چاندنی ڕق و کینە لە نێوان تاکەکاندا. کە زیاترە لە چارەکە سەدەیەکە تێپەڕیوەو نازانن ئایا دەسکەوتی چاوچنۆکی و بەرژەوەندی تاکە کەسی، ئەوەندە دەهێنێت کە پرۆسەیەکی جوانی ئاوا کە لە هەرێمی کوردستاندا بەڕێوە دەچێت، بشێوێنن؟ لە کاتێکدا ئەم جۆرە قەڵەمانە تەنها بۆ چرکەیەك لەو ڕۆژە سەختانەدا ماندوو نەبوون و لەوانەشە لە خزمەتی دوژمنانی کوردستاندا قەڵەمەکانیان خاڵی کردبێتەوە. جا بۆیە ئێمە وەك بنەماڵەی شەهید وریا، خۆمان دژی هەموو بڵاوکردنەوەو ووژاندن و باسکردنێکین و هەرچی کەس و لایەنێك باسی بکات، ئێمە بەتوندی ڕەخنەی لێ دەگرین و کارەکەشی بە بازرگانی هەڵبژاردن دەزانین و نامانەوێت کەس برینمان بکولێنێتەوەو هەرچیەك کە ڕووی داوە، بەڕوداوێکی دڵتەزێنی کۆمەڵایەتی سیاسی دەزانین کە لە ژیانی ئێمەو ئەو مەسئولە نامەسئولانەدا، کە گەیاندیانە سەر ئێسقان. ئەمڕۆش داوا لە خەڵك دەکەن کە متمانەیان پێ بکەن.

لەو کارەساتەشدا، خۆیان بەبێ تاوان دەزانن شەهیدەکانیش بە تاوانبار دەزانن. لە هەمان کاتدا بە پێویستی دەزانین وەڵامی هەردوو گۆڤاری(لڤین)(هەڵبوون) لە دوو نوسینی جیاوازدا بدەینەوە.

١.ژمارە(٩٣)لڤین لە چاوپێکەوتنێکی سالار عزیزدا

کاك سالار عەزیز دەیەوێت خۆڵ بکاتە چاوی خوێنەرەوەو چەواشەی بکات. بۆ خۆی نازانێت کە زۆرینەی خەڵکی کوردستان لەو چاکتر دەزانن کە(وریا) کێ یەو بە پلانی کێ شەهید کراوەبۆ چیش؟

بۆیە ئەم بابەتە پێویست بە ماستاوی سیاسی ناکات بۆ یەکێك هەمیشە دژی یەك بوون و بە هیچ جۆرێکیش یەك ناگرنەوە. لە جیاتی ئەوەی کاتی خۆی بەو باسەوە بکوژێت، باشتر وایە بگەڕێیت بە شوێن چارەسەرێکی تردا بۆخۆی.

٢. له گۆڤاری(هەڵبوون)دا ژماره(٣٠)، ئێمه وەك یەك بنەماڵه دژی جوینەوەی کۆمەڵێك سەرچاوەو بۆیاخ کردن و دابەزاندێین،وەك له لاپەڕەی سێیەمی گۆڤاری هەڵبوون له لایەن ڕامیارەوە کراوە.

چونکه شەهید ووریا پێشمەرگەیەکی مولتەزیمی ڕێکخراوی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووەو جەلاد نەبووە.دژی هەموو بابەتێکی ئیرهابی بووە، هەر بۆیە بەو جۆرە شەهیدیان کرد. وەك خۆت دەڵێیت: ململانێکه شاهیده، بەلاّم دڵۆپێك بوو لەو دەریا خوێنەی، که لەشەڕی ناوخۆی نالەباردا ڕژاوەو هیچ پێویست ناکات ڕامیار باز بەسەر ڕێکەوتنامه ستراتیژیەکەی یەکێتی و پارتیدا بدات و ئەو لاپەڕە کۆنانه هەڵبداتەوەو ناوی هیچ کەسێکی ڕابردوو بخاته سەر ڕووپەڕی گۆڤارەکەیان بەرامبەر بەرژەوەندی تایبەتی. ڕابردووی شەڕی براکوژی لەگۆڕنرا،ئەوەتا یەکێتی و پارتی دەستلەملانێوبەیەکلیست دابەزیون و هیچ هێزێکلەیەکیان جیاناکاتەوە لەدوای یەکبەحر خوێن، ڕامیار لەبیری نەچێت ئەوکاته نەوشیروانیش لێپرسراوی دووەمی یەکێتی نیشتیمانی بووەهەتا دووساڵ لەمەو بەر.

پێویستەئەوەش بیر خۆمان بهێنینەوە کەیەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە بڕیاری مەکتەبی سیاسی لەساڵی(١٩٩٤)دا، پەشیمان بوونەوەی خۆیان لە کرداری تیرۆر کردنی شەهید ووریا بلاّو کردەوەو مەدالیای شۆڕشگێڕیان بە کێلەکەیدا هەڵواسی.

بۆیە بۆ جاری دووەم، دووبارەی دەکەینەوە دژی هەموو بلاّوکردنەوەو وروژاندنی مەلەڤی شەهید ووریاین و بە توندی ڕەخنەی خۆمان ئاڕاستەی هەموو ئەو لایەنە دەکەین کە ئەم بابەتە بلاّو دەکەنەوەو بە بازرگانندنی هەڵبژاردنی دەزانین.

## تاوانەکانی نەوشیروان مستەفا لەناخی منی پێشمەرگەدا

**ئەردەڵان ئیسماعیل عارف**

### بەشی دووەم

کاتێك کەووشەی گۆڕان و ڕیفۆرم و حکومی یاساو سبەی بەرگوێمان دەکەوێت ڕاستەوخۆ بیرمان بۆ دابڕین لە هەل و مەرجی ئەمڕۆ دەچێت و بیر لە سبەینێیەکی باشترو درەوشاوەتر دەکەینەوە. بەتایبەتی کەسانێك کە خۆشترین ساڵانی لاویان بەر برسێتی و نەبوونی سەرماو گەرماو ئەشکەنجەو سوکایەتی پێکردنی دوژمان و دڵەڕاوکێی ڕووبەڕووبونەوەی مەرگ بەسەر بردبێت لە کەسانی تر زووترو بە پەرۆش تر بەرەو گۆڕانکاری بۆ ژیانێکی باشترو ئازادو پڕ سەربەرزی دەچن.بۆیە کەسێکی وەك و من و خێزانەکەم و زۆر لە هاوسەنگەرانم گەر بڵێم نمونەیەکی لەبەر چاو قوربانییەکانی ناڕەوایی زوڵمی زۆری داگیر کەران و نابەرابەری کۆمەڵایەتی بوون تەواوی ژیانمان بەهیوای گۆڕان و هاتنەدی مافەکانی خۆم و گەلەکەم بوو زیادەڕۆییم نەکردووە هەربۆیە کاتێك ووشەی گۆڕان و سبەی دەبیستم وا هەست دەکەم جارێکی تر بەچاوی کراوەوە لە دایك دەبمەوە ئەو ژیانەی کە لەمنداڵیمەوە کە دۆزەخێکی سەر دنیا بووە بەرەو بەهەشتێکی کامەران و سەربەرزم دەبات بەڵام کاتێك دەیبیستم وا هەست دەکەم بانگەوازی گۆڕان و مژدەی سبەی لە چ دەنگێکی درۆ نازولاڵەوە دێت لەو خەوەشیرینەوە ڕادەپەڕم دەیان پرسیاری گوماناوی لەناخمدا سەر هەڵدەدەن و یەخەم دەگرن و دەنگی ئەو تێکۆشەرانەی هاوسەنگەرن قوربانییەکانی پاڵەوانی گۆڕان بە گوێمدا نەك دەچرپێنن بەڵکو دەقیژێنن ئێخەم ڕادەتەکێنن و دەڵێن: چاوەڕوانی و نەرمی مۆرڤ دۆستی کەمە گەر لە پەیامبەرێکی دڵ ڕەق و دڕندەوە بێت!.

چاوەڕوانی ڕوناکییەك مەکە گەر لەناخی دەیجورەوە بێت!. چاوەڕوانی دڵسۆزی لە دەرونێکی پڕ قینەوە مەکە کە خۆشی لە ئازاری کوشتنی دڵسۆزان ببینێت!.چاوەڕوانی حکومی یاسا لەکەسێك مەکە کە تەواوی ژیانی پێشێلکردنی یاسا مرۆڤاییەتییەکان بووبێت کاتێك ئەم لاپەڕانە پڕ دەکەمەوە لە خۆم دەپرسم بۆچی لەناخی خۆمەوە هێزێك پاڵم پێوە دەنێت کە ڕاستییەکانی گۆڕان و دروست کەری سبەی پڕ لەیاساو شارستانییەت

نەوشیروان مستەفا بخەمە سەر کاغەز تۆبڵێ ی نوسینەکەی منیش بچێتە ڕیزی کامپینەکانی هەڵبژاردن؟!. منێك کەنە اغام و نە کوێخا نەپایەیەکی بنەماڵەیەی بەرفراوانم هەیە کە دەورو بەرەکەم داوای دەنگم بکەن نەوزیرو نەگزیر نە بەرپرسێکی دەست ڕۆیشتووم کە بەرژەوەندییەکانی دەورو بەر بپارێزم نەخاوەنی کتێپ و ووتاری بەپێزم نەخاوەنی ماچستەرو دکتۆرام کە گوێ لەوتەکانم بەپەرۆشەوە بگیرێت نە بەرژەوەندییەکی تایبەتیم هەیە. لەتەواوی ژیانی پێشمەرگایەتیم دا تەنها تەنها تفەنگێکی بێ شەرم لە دوژمن خۆفرۆشان و دووگیرفانی بەتاڵ سکێکی برسی و وورەیەکی بەرزم هەبووە. زیادەڕۆیم نەکردووە ئەگەر بڵێم بەژمارەی تەواوی ووشە زل و بریقەدارو چەواشەکەرەکانی نوسینەکانی نەوشیروان مستەفا هەر لە گۆڤاری ڕزگارییەوە تاکو پەنجەکان یەکتری دەشکێنن هەتا لە کەناری دانوبەوە تا خڕی ناوەزەنگ، فیشەکم بەدووژمنانی گەلەکەمەوە نابێت. ڕەنگە بپرسن بۆ ناسۆریەکانم دەخەمە سەر کاغەز. دوور نییە بەهۆی ناوەکەمەوە کەسانێك بڵێن ئەرێ ئەوە کوڕی ئیسماعیل عارف پارتیی نییە؟ کوڕی ئەو پیاوە نییە کەتەواوی ژیانی دڵسۆزی پارتی و بارزانی بوو؟ کەواتە شتێکی ئاساییە کە دژی پێشڕەوو قارەمانی گۆڕان شتێك بنوسێت!. ئەوسا هێندە بەسە کەبەو کەسانە بڵێم سەرباری ڕێزی گەورەو بێپایانم بۆ خوالێخۆش بوو ئیسماعیل عارف کە هەرلەتەمەنی ٢٢ ساڵییەوە لەمەهاباتی یەکەم کۆماری کوردستان بەشداری لە خەبات و تێکۆشان بوو، پاشان ١١ ساڵی لە زیندانەکانی نوگرەسەلمان و ئەبوغرێب بەسەر برد. لە کاتێکدا لەو سەردەمەدا تەنها ئیمزاو برائەت نوسینێ بەس بوو بۆ ئازاد بوونی. بەلاَم هەرگیز سەری بۆ دوژمنان شۆڕ نەکرد. پاش زیندانیش تەواوی ژیانی بەشاخەوە بوو. بەلاَم جگە لەوەی کە باوکێکی ئۆرگانیم بووە هیچ پەیوەندی و نزیکیەکمان لەگەڵ یەکتریدا نەبووە. نەك لەبەر ئەوەی کەئەو پارتی بووەو من یەکێتی، نەك لەبەر ئەوەی ئەو باوکی دڵڕەق بووە، یان منداڵێکی بێوەفای بووم. بەڵکو لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، تا ئەوکاتەی پێشمەرگە بوو لەشاخەکان دامن منداڵێکم بووم لە شاردا بەبرسێتی و کەم دەرامەتی و بەخێزانێکی شەش کەسیەوە لە تاقە ژورێکی کرێدا گوزەرانمان بەسەر دەبرد. کاتێکیش ئەو تەمەن و سەختی زیندان و شاخەکان ناچاری کردبوو بگەڕێتەوەو لەشاردادابنیشێت و من لە شاخەکان دا پێشمەرگە بووم سنگم بەگوللەوە دەناو لە چەرمەسەرییەکانی شارەوە کەوتمە ئازارو ئەشکەنجەکانی شاخەوە! ئەو ئازارو ئەشکەنجانەی کە گەورەترین سەرمایەو

شانازییەکانمانن. من و باوکم تەنها شتێك کە هاوبەش بوو لە نێوانماندا گەرچی لە دوو سەنگەری جیاوازدا بووین ئەوە بوو کە بەهەردووکمان دەوترا پێشمەرگە داوای گۆڕانمان دەکردو چاومان بڕیبووە سبەیەکی درەوشاوەو ئازاد بۆ خۆمان و گەلەکەمان!. لە کاتێکدا ئەم باسە دەنوسم ووتەکانی نەوشیروان مستەفا وەکو ژوژن بەلەشمدا دەچن کاتێك لە باسی یەکێك لە ڕاکردنە تەکتیکیەکانی دا لە(کێشەی پارتی و یەکێتی،لاپەڕە ١٠)دا دەڵێت(وویستم ئیتر لە ژیانی سیاسی و گشتی بکشێمەوەو خەریکی ژیانی تایبەتی خۆم بم. منیش وەکو هەمووکەسێکی تر کە خێزانەکەی خۆمم خۆش دەوێ... هەلی سەفەرم بۆ ڕەخساو چرام وەرگرتەوەو چووم بۆ ئەوروپا)(وەك ئەوەی ئەو تەنها کەسێك بێت خێزانی هەبوبێت و خێزانەکەی خۆی خۆشویستبێت. نەخێر ئەو تەنها کەسێکە لەو جۆرەکەسانەی کە تەنهاخۆی دەبینی. ئەوەی جێگەی سەیرە دەم لە خۆشەویستی باوك ومندالْ دەدات ! ئەی وەلأمی باوکی ئەو پێشمەرگە قارەمانتنە چی دەداتەوە کە جگەر گۆشەکانیان بە فەرمانی بێدادگایی و دلڕەقی و قەرەقوشی نەوشیروان دڕندانە کوژران و گۆڕ وونکران؟ ئەی وەلأمی منداڵی ئەو پێشمەرگانە چی دەداتەوە کە باوکیان بەئەسیری خۆی تەسلیمی بەزەیی بەرامبەرەکەیان کردبوو بەزەردەخەنەیەکی گاڵتە جارییەوە بە چەکدارەکانی ئەوت:)بیان بەن بۆ پشتی گردەکە، بەتەما نەبن قەڵەویان کەین!.سەرکردەی تێکۆشەرو دیموکرات خواز ئەم هەموو شارستانی و حوکمی یاسایە چۆن ئاوا لە گورگێکی وەکو تۆوە لەپڕ سەریان هەڵدا؟! تۆبڵێ ی(نما) خۆشەویستەکەی کورت کە لە لەندەن دەیخوێند یان(چیا) ئازیزەکەی کە خوێندنی لە لەندەن تەواو کردو ئێستاش لە ئەمەریکا دەیخوێنێ و منیش بەهەزار دەردی سەر لە سێی ناوەندی زیاترم پێ تەواو نەکرا، ئەم دروشمانەیلن بە پۆستا بۆ نەناردبیت؟! یان ئێستای مۆدێلی حکومی یاساو شارستانیەتە!؟. یان ئێستا گوێ لە مارکسیم و ماویزم و کیم ئیل سونگ و کیم ئیل یونگ و پارتی پێشڕەوو زمبرو زەنگی شۆڕش گێڕانە ناگرێ؟ بۆیە ناچاریت کالأیەکی سەردەم و مۆدێلێکی نوێ بخەیتە بازاڕەوە! ئەم ووتانەی من مانای ئەوە نییە کە باوەڕم بە ناوەڕۆکی گۆڕان نییە بەلأم باوەڕی بەتۆ نییە. لەبەر ئەوەی دروشمی گورگ فرمێسکی تیمساحن!. ئەم نوسینەی من نەبەشێکی بچوکی کامپینی هەڵبژاردنەکانە، نەکێشەی بنەماڵەیی و پارتی و یەکێتی یە، نەقینێکی تایبەتیمە بەرامبەر بە تۆ. بەڵکو تەنها دەربڕینی هەست و وەفامە بۆ پێشمەرگە هاوسەنگەرەکانم کە بەفەرمانی تۆو بەهۆی دڕندەیی تۆوە شەهید کراون.کەسانێك کە لەباوك و دایك و خوشك

و برا دڵسۆزتر بووین بۆ یەکتری. ئەم نوسینە تەنها دەربڕینی وەفامەبۆ ڕاستی، بۆ ویژدانی خۆم، کەبەکەسانێکت بناسێنمکەچەواشەت کردون و دوای سەراب کەوتون. گەر چی تۆ وادەزانی ناحەزەکانت لە ژمارە نایەن و دەیان وسەدان دوژمنی وەهمیت بۆ خۆت دروست دەکرد و دروست دەکەیت. بەلام من هەرگیز نەمویستووە ئازارێکت پێ بگەیەنم بەڵکو بە پێچەوانەوە بەزەییم بەدەرونە لاوازەکەتاو بەزەییم پێتا دێتەوە، چونکە لەو ڕاستییە تێگەیشتووم کە تاوانباران خۆشیان قوربانی تاوانەکانی خۆیانن، گەر چی بەسەر خۆشیان دا نەهێنن. ئێوەمانان نەك خۆتان بە تاوانبار نازانن بەڵکو خۆتان بەلە خۆبووردوویەك لە قەڵەم دەدەن کە هەر کارێك دەکەن و تەنانەت هەر بەرپرسیاری و زەعامەتێکیش وەردەگرن لە پێناو کەسانی ترو لەبەر خاتری کەسانی تر بووە. کاتێ باس لە وەرگرتنی بەر پرسیاری کۆمەڵەکە دەکەن، دەیکەن بە منەت و دەڵێن باوەڕتان بە مارکسی و لینینی کۆمۆنیزم نەبوو(وەك ئەوەی خۆتان لە کە کەشکۆڵەکەتان دا، پەنجەکان یەکتری دەشکێنن٩نوسیوتانە. بەلام تەنها لە بەرخاتری داوای برادەران بەرپرسی(کۆمەڵەی مارکسی لینینی ڕزگاری کوردستان) تان گرتبووە ئەستۆ! هەر لەبەر خاتری داوای برادەرانیش لە ئەوروپا گەڕانەوە(کێشەی پارتی و یەکێتیەن لاپەڕە١٠). ئەترسم ئەگەر خوا تەمەنتان درێژ بکات ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو ڕاستیەش ئاشکرا بکەن کە ئەم دروشم و کالا نوێیانەش هەر لەبەر خاترانە و داوای برادەران بووە. لەنێو خاترو خۆتریەکان دا لە هەمووی گاڵتە جاڕ تر ئەوەیە کە دەڵێیت ژن هێنتنەکەشتان بەهۆی داوای برادەران و بۆ خاترو خاترکاری بووە!. تۆ کەسێکی وەك ئەوەی هاوڕێ چل ساڵیەکەت ڕەفعەتی مەلا زادە دەڵێتك نیسکێنەت بخەنە بەردەم دەیخۆیت !، حەزت لەنان و تەماتەیە!. کەیفت بە تێکەڵ بوونی ژنان نایەت!. دەیان سیفاتی تری خارق العادە دەتوانێت بیان نوسێتەوە! ڕەنگە هەناسەش لەبەر خاتری برادەران هەڵمژێت!. بەڕاستی ئەگەر لە نزیکەوە نەمناسیتایە نەمدەزانی بە چ پێغەمبەرێك بەراوردت بکەم!. هەر ژانێك کەلە تەنگانەدا، لە ڕۆژە سەختەکان ناچار بووندەست بە دەستە پوشێکەوە بگرن بۆ خۆ ڕزگار کردن و ژیانێکی باشتر کالاو سیفاتە مزەوەرە هەرزان بەهاکانی جەنابتیان بەخوێنی خۆیان لێدەکڕێت. دوور نییە ئەمڕۆش هەر بەو نرخەی جاران لە خشتەیان بەریت. هیوام وایە پاش تاقیکردنەوەیەکی دوورو درێژ ئێستا هۆشیارانەترو چاکراوەتر بڕیار لەسەر خۆت و کالاو بازاڕ دروشمەکانت بدەن، گەر چی دڵنیام ئەمڕۆ پێویستیمان بەو کالاو دروشمانەیەن بەلام لە بازاڕێکی پاك دا نەك

ئـەوەی تـۆ. ئێمەیـەکی پێـشمەرگەی{کـۆن} کـە لەترسـی سـوکایەتی پێکـردن و گاڵتـە جارِیەکانی تۆ خۆمان ناونا پێشمەرگەی دێرین(کاتێك هاتبونە لات و باسی پێـشمەرگەیەکی کۆنیـان کـرد بـوو، جـەنابتان ووتبـوی:{شـەرابی کـۆنم بیـستووە بـەڵام پێـشمەرگەی کـۆنم نەبیستووە}). من چ کارێکم بەم نوسینە هەبوو. ئەگەر ناسۆری ئـەو پێـشمەرگە قارەمـان و لە خۆبوردوانە نەبێت کە تۆ ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بویتـە هـۆی کوشـتنیان. ئـەوە تـەنها وویژدانمە کە داوام لێ دەکات ئـەو تاوانـە بخەمـە ڕوو کـە بەرامبـەر هاوسـەنگەرانم لەلایـەن تـۆوە ئـەنجام دراوە. ئێـستاش دەسـتت بـەدەمتا هێنـاوەو پێغەمبـەری گـۆڕان حکومی یاساو شارستانییەت هـەر خۆیـەتی. تـۆ کـە لەبـەر خـاتری خـاتران بەرپرسـی یەکـەمی کۆمەڵـەی ڕەنجـدەران بوویـت و لـە ڕەنجـدەرو زەحمـەت کێـشان دەدوایـت و لـە چینـەکانی خـوارەوەی کۆمــەڵ دەدوایــت. نوســینەکانت لــە ئەڵقــە ڕۆشــنبیرییەکانی شــاخ و شــاری کۆمەڵــدا دەخوێنرایەوەو دەبوایە وەکو مـەحفوزات لەبـەرمان بکردایـە. سـەری زمـان و ژێـری زمانـت دەرەبەگ و اغاو بنەماڵە بوو. تەحەدات ئەکەم ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بەفەرمانی تۆ کـوڕی یەکێك لەوانەی بە دوژمـنی چینایەتیت لەقەڵـەم دەدان خـوێن لـە لـوتی هاتبێـت. نـەخێر وەکو کەسە دەرون لاوازەکان بۆ ئەوەی گەورەیی خۆت دوبارەو دوبارە بەخۆت بسەلمێنێتەوە تـەنهاو تـەنها لـە نێـوان کـوڕی هـەژارو بێکەسـەکان و بنەماڵـەی نەناسـراو بـێ پلـەو پایـە قوربانییەکانی خۆت هەڵبژارد. هەنـدێ لـە قوربانییـەکانی دەرونـە نەخۆشـەکەت بەرامبـەر بـچوکترین هەڵـە خـەڵتانی خـوێن دەکـرد. هەنـدێکی تریانـت ئـاخود ئاسـا موزیانـە بـە ناڕاسـتەیەکدا دەبـرد کـە بکەونـە هەڵەیەکـەوەو لەسـەریان بکـەیت بـەماڵ و سـوکایەتییان پێبکەیت و چاوی خۆت لە خوێنیـان تێـر بکـەیت.مـن لێـرەدا نایـەم لـە تاوانـەکانی تـەواوی ژیانت بدوێم. ئەوە لە توانای منێکی پێشمەرگەی سادەدا نییە و بۆ قەڵەم و ویژدانی مێژوو نوسانی دادەنێم. لە بەشەکانی داهاتوودا تەنها لەو تاوانانە دەدوێم کە بەرامبەر بـە خـۆم و هاوسـەنگەرانی پێـشمەرگەم لەلایـەن تـۆوە ئـەنجام دراوەو لـە نزیکـەوە ئاگاداریم و بـۆ ئـەم دونیاو ئـەو دونیـا شایەتیم. دەیخەمـە بـەردەم خوێنـەرانتا بـزانن چ ڕابردوویـەکی دڕنـدەو خوێناویـت هەیـە بەرامبـەر پێـشمەرگەو ئـەوەی نـاوی هەسـت و خۆشەویـستییە، نـەك بـۆ هەژارو ڕەنجدەران تەنانەت بـۆ هـیچ مرۆڤێـك لـە تـۆدا نییـە. هـەرگیز نرخـی پێـشمەرگەی هەژارو چینە زۆر لێکراوەکان لە فەرهەنگی تۆدا نەبووە و پێ ی نامۆیت.

یەكەمین قوربانییەكانی تۆ كەلەنزیكەوە ئاگاداریم عمری كوڕی مام حەسەنی چاپچییە، عمر

بەهۆی ئەوەی كە باوكی پۆلیس بوو بۆ ماوەیەكی زۆر بە هۆی هەڵوێستی كوردانەی بۆ باشوری ئێراق دوور خرابۆوە. كاتێ كە گەڕابوونەوە كوردستان عمر كوردی باش نەدەزانی و بەنەریتی عەرەب جزداشەی لەبەر دەكرد بۆیە منداڵان ناویان لێ نابوو(عمر عەرەب). ئیتر ئەو ناوەی بەسەردا دابڕا. بنەماڵەكەیان لە بنەڕەتدا خەڵكی(ولاخلو)ی دۆڵی جافایەتین. ولاخلو یەكێكە لەو گوندانەی كە بەدڵسۆزی و بەتەنگەوە هاتنی پێشمەرگەو خزمەتیان بە شۆڕش ناسراون و هەرگیز كەسی سەر بەڕژێمیان تێدا هەڵنەكەوتووە. عمر بەهۆی دەسكورتی باوكییەوە هەر لە منداڵییەوە كرێكاری مەیدانەكە بوون منداڵێكی تەمەن پانزە ساڵی و كەمێك كورتە باڵای لاوازو شەرمن. دەگمەن وەستا قۆنتەرات چییەكان تێیان ڕادەبینی بتوانێ بەردی نەقاڕی لە گەرمای هاوینی سوتێنەر و كرێوەی سەرماو ڕەشەبا شومەكەی سلێمانیدا بتوانێت بخاتە سەرشان و بیداتە دەست وەستا. یان توانای ئەوەی هەبێت جەبلەی چیمەنتۆ بگرێتەوە. هەر بۆیە وەك ئەوەی خۆی دەیوتك ئەگەر لە هەفتەیەكدا سێ ڕۆژ بیانبردمایەتە سەر كار وام دەزانی هەموو دنیا هی خۆمە. بەلام ئەو جەستە لاوازە دڵی هێندەی بەردە نەقاڕیەكان و ئیرادەی هێندەی لوتكەی قەندیل بەرز بوو. ئەو قەندیلەی كە نەوشیروان لە بنارەكەی دا لە خانووە تایبەتییەكەی دا تەنها كتێبی دەخوێندەوە و هەندێ پێشمەرگەی دەخەساندو ناوتان دەنان مراسل و نانی ئامادەیان دەخستە بەردەست بەر پرسان. تۆی نەوشیروانیش یەكێك بوویت لەوانە كە ئەركە قورسەكەتان تەنها دەركردنی فەرمانی ناڕەوا بوو. ئەو بناری قەندیلەی كە شەهید بەكر دەیوت: پشتمان شكا ئەوەندەمان سندوقە مەشروب و جگەرە بۆكاك نەوشیروان گوێزایەوە. ڕەنگە شەهید بەكر بەهەڵەدا چووبێت و سندوقە تەماتەو خەیار بوبنن كە گوایە تۆی زاهید زۆرتان حەز لێیەتی!. عمر عەرەب سەرباری مەینەتییەكانی گوزەران و ئەركی خوشك و برا منداڵەكانی، چەندین ساڵ لەناو شاردا لە ڕیزی ڕێكخستنەكانی كۆمەڵەكەدا چالاك بوو. بەهۆی ئاستی كەمی خوێندەوارییەوە نەیتوانیبوو لە مەسەلە تیرۆرەكان و مەسەلە سیاسیە ئاڵۆزەكان دا قوڵ بێتەوە و ئێوە ئاسانە فەلسەفەی مۆدێرنی بیستبوو، نە دەیزانی فەلسەفەی پۆست مۆدێرن مانای چی. وەكو تۆش خوا شانسی ئەوەی نەدابوویە وەكو ئەوەی ڕەفعەتی مەلا ئەڵێت:{لە بنەماڵەیەكی ناسراوی ڕۆشنبیری شاری سلێمانی}

بێته دنیاوەو کتێبەکانی باوکی بخوێنێتەوە کە خواوەندی کتێبخانەیەکی گەورە بوبێت. لەو جۆرە بنەماڵانەی کە نەوشیروان خۆی لەسەردەمی بازاڕی گەرمی کۆمۆنیستەکەی دا لەو کتێبەکەی دا کە بەنوسینە ووردەکە ناسرا بوو ناوی نابوون{ووردە بۆ رژوای خۆ پارێز}.

عمر وەك و کوڕی تەواوی هەزارانی دونیا ئەرکەکانی لەبری نووسین و بیرکردنەوەو فەرمان دان هەر لە منداڵییەوە سنگ بە فیشەکەوەنان و کاری چەکداری بوو.لە ساڵی ١٩٨٠دا پاش ئاشکرا بوونی پەنا دەباتە بەر شاخ و دەچێتە ریزی پێشمەرگەوە. سەرەتا وەکو سەرجەم پێشمەرگەیەکی نوێ دەیکەنە حەماڵی گوللە ئار بی جی. پاش ئەوەی چەك وەردەگرێت بەهەوڵ و لە خۆبوردوییی خۆی دەکرێتە فەرمتندەی مەفرەزەو پاشان دەبێتە فەرماندەی کەرت. عمر تاکو ١٩٨٧ زۆر بەلەخۆبووردییەوە دەیان داستانی قارەمانانەی تۆمار کرد. ئەگەر کوڕی مام حەسەنێکی هەژار نەبووایەو لە بنەماڵە ناسراوەکان بووایەو لە بنەماڵە ناسراوەکان بوایە خوێندەوارێکی باشی هەبووایە دەبوایە پلەی سەرکردەیەکی سەربازی پێ بدرایە. خۆش بەختانە لە لەساڵی ١٩٨١وە تاکو ١٩٨٧هاوسەنگەری عمر عەرەب بووم. چیرۆکێکی ئازادی و لە خۆبوردوویی و دەست وەشاندنە بە زەبرەکانی لە ڕژێم لەتەواوی ناوچەکەدا دەنگی دابۆوە. هەرگیز لە یادم ناچێتەوە کە لە ناخی دڵەوە سوێندی دەخواردو دەیووت: بە گۆڕی کاك ئارام، ئەبێت ئیسراحەت لە پیاوانی ڕژێم ببڕم، وایان بەسەر بهێنم لە هیچ کات شوێنێکدا هەست بە ئاسودەیی نەکەن، ئەوەی شەو بۆم بکرێ بەکەرتەکەمەوە دەچمە سەریان، ئەوانەی خۆیان و ماڵەکانیان ترسنۆکانە قایم کردووەو بەشەو دەستم نایان گاتێ، ڕۆژی نیوەڕۆ بە سزای گەل و شۆڕشیان دەگەیەنم. بەدڵنیاییەوە عمر هەمیشە بەزیادەوە بەڵێنەکانی خۆی بەجێ دەهێناو لە شەڕی پارتی زانی و ئیغتیلاتی ڕۆژو ناوشاردا یەکێك بوو لەو داهێنەرانەی کە دەبوایە شێوازەکانی کاری بنوسرایەتەوەو بۆ نەوەکانی داهاتوو سودی لێ ببینرایە.

پێشمەرگەی دێرین و فەرماندەی کەرت سابیر کۆکەیی لە کتێبەکەی دا لاپەڕە ١٠٨و ١١١لە باسی هەرێمی چواردا لە عمر عەرەب دەیەوێت و دەڵێت: {پێشمەرگەیەکی قارەمان بەناوی عمر عەرەب لە ناو هەرێمەکەدا ناوبانگی ئازایەتی دەرکرد بوو خەڵکی سلێمانی بوو... عمر عەرەب بەدەیان چالاکی و نەبەردی نواند، حکومەتی هەراسان کرد بوو لە ناوچەی سلێمانی. لە دوایدا بوو بە قارەمانترین فەرماندەی کەرتی چوار} . عمر عەرەب هێندە بە وەفاو دڵسۆزی هاوسەنگەرەکانی بوو کە ژیانی خۆی بۆ مانەوەیان زۆر بەبێ نرخ

دادەنا،لەیەکێ لە نەبەردییەکان دا بەهۆی هەڵەیەکی سەربازیمانەوە کە ئەنجامی زانیاری هەڵە بوو،هێزی ڕژێم بەسەرماندا زاڵ بوو. عمر عەرەب پێنج فیشەکی بەرکەوتبوو توانای ئەوەی نەبوو بەڕێدا بڕوات و دوژمنیش شپرزەی کردبووین. کاتێ وویستمان عمر عەرەب بکەبنە کۆڵ بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی نەدەداین و داوای لێ دەکردین ئێمە خۆمان دەرکەین و ئەو دەمێنێتەوەو بەرگری دەکات تاکو ئێمە ڕزگاربین و تا لە توانای دا بێت فیشەکی پێبێت بەرگری هاتنە پێشەوەی دەکات. هیچ یەکێ لە پێشمەرگەکان ئەوەی لێ قبوڵ نەکردو من دام بەکۆڵم داو ڕزگارم کرد. ئەویش چەندین جار منی لە مەترسی مردن ڕزگار کردو تۆڵەی ئەوەی بۆ کردمەوەو قەرزاربارێشی کردم. یەکێك بوو لەو فەرماندانەی کە بۆ تۆڵە سەندنەوەی هاوسەنگەرانی باکی مەترسی و لێپرسینەوەی نەبوو. ئەو بەوەفاییەی وای لێکرد بوو کە تەنانەت هەندێ جار لە فەرمانی سەرو خۆشی یاخی بێت و بیانخاتە لاوە.لە ساڵی ١٩٨٤دا کاتێك یەکێتی لەگەڵ ڕژێم دا لە گفتو گۆدا بوو، ڕژێم لە هەرکوێیەك بلوایە نامەردانە دەستی لە پێشمەرگەو ڕێکخستەکانی یەکێتی دەوەشاند. یەکێ لەو پێشمەرگانە، بەکری حاجی فارس، کە بەپشت قایمی گفتو گۆ هاتبوە ناو شارەوە بۆ چارەسەری چاوی، نامەردانە شەهیدیان کرد بوو. شەهید بەکر یەکێك لە پێشمەرگەکانی کەرتەکەمان بوو. کەرتی ٥ی تیپی ٤٧ی پیرەمەگرون کە عمر عەرەب فەرماندەیی دەکرد. عمر هەمیشە لە کۆبوونەوەی کەرتدا پێ ی ڕادەگەیاندین کە پێویستە بەرامبەر هەر شەهیدێکمان ١٠ کەس لە پیاوەکانی ڕژێم بنێرین بۆ جەنەهەم. بێکانەو بێنرخ لە خوێنی گەلەکەمان نەڕوانن. لەیەکەم ڕۆژی پرسەی شەهید بەکردا لە ناوەندی پرسەکەدا چەند کەسێکی لێ هەڵبژاردین کە بریتی بوون لەسەلاح علی ناسراو بە(سەلاح چاو زەق). حەمەی شێخ حەسەن ناسراو بە(حمە بچکۆل). شەهاب ناسراو بە(کەریمە شەل)، و نەوزادی عەبەی تەقی، بەختیار ژن برای عمر عەرەب ومن. بەسەرپێیەوە ئەوەی بەبیر هێناینەوە کە پێویستە بە وەفا بین بەرامبەر بە هاوسەنگەرەکانمان نەهێڵین ڕژێم لە هیچ هەل و مەرجێکدا بە ئاسانی تاوانەکانی بەسەردا بڕوات. پێ ی ڕاگەیاندین کە دەبێت هەر ئێستا وانەیەك بدەین بە ڕژێم. ئێمەش ئامادەیی خۆمان دەربڕی و پێش ڕۆژئاوا بوون بە لاندکرۆزەرێکەوە چووینە سەر مۆڵگەی جەیشی شەعبی ناسراو بە مۆڵگەی تۆپیو عوسمان. پاش ئەوەی زۆر بە زیادەوە هەقی شەهید بەکر کرایەوە، لەهەمان هەفتەدا چەندین دەستی ترمان بەڕۆژی ڕوناك لە ڕژێم وەشاندو ڕژێممان شپرزە کرد.

نەوشیروان مستەفا لە بری ئەوەی ئەم دەست وەشاندنە وەکو وەرەقەیەك بەکاربهێنێت بۆ سنوردارەکانی تجاوەزەکانی ڕژێم بۆ سەر ڕێکەوتنی شەڕ ڕاگرتن و شەهید کردنی نامەردانەی پێشمەرگە، عمر عەرەب بانگ دەکات و لەبری ئەوەی بە شێوەی ئوسوڵی لە چوار چێوەیەکی یاسایی و ڕێزدا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکات و لایەنە باشەکان و خراپەکانی ئەو کارەو چالاکی و هۆکاری ئەو کارە سەر بەخۆیەی بخاتە دووتای تەرازووەوە، حساب بۆ دافعی عاتیفی مەسەلەکە بکات وەکو فرسەتێکی باش دەیقۆزێتەوە بۆ پیادە کردنی ڕەفتارە فەردی و اغا و کوێخا ئاساییەکانی و سوکایەتی زۆری پێدەکات و چەندین جار خوێڕی و سەرسەری دەکات و چەکی دەکات و لە فەرماندەیی کەرت لای دەبات. بەکورتی خۆی ووتەنی ترۆی دەکات. ترۆ!ووشە موفەزەلەکەی نەوشیروان مستەفا کە بەشانازییەوە خۆی لە(پەنجەکان یەکتری دەشکێننن لاپەڕەی١٩٧) دا باسی دەکات و دەڵێت: {ئەوانەی موخالەفەیان ئەکرد هەتا پلەیان بەرز تر بووایە سزاکەیان قورستر ئەبوو، ئەو کاتە ووشەی ترۆ} بلاو بووەوە. ئەم ووشەیەمان لە شیعرەکەی مەحوی وەرگرت بوو کە ئەڵێت: دنیا ترۆیە مەوەستە تیا ترۆ} دۆزینەوەو وەرگرتنی ئەم ووشەیە خۆ گرتنی کێوی بێستون نییە کە بەهەرەوەزی کردبێتان. نەوشیروانی ئەدەب دۆست!.، تۆیەك کە سەرچاوەکەی واباش شارەزایی بە دڵنیاییەوە یەکێکە لە شانازییەکانی جەنابتان. بەلام ئەی سەرکردەی {حەکیم} بۆچی لە دیوانی مەحویەکی سوفی و لە تەواوی شیعرە عیرفانییەکانیدا جگە لەم ووشەیە چاوەکانت هیچ یتری نەبینیوە؟ بە تایبەتی لە شیعرەکانی مەحویدا! کە لەئاستێکدان،(ئەحمەدی مەلا) گەر بەهەڵەدا نەچوبم لە زانکۆیەکی فەڕەنسا دکتۆرای تیا هێناوە، بۆچی هەندێ جار یاخود بڵێم زۆر جار لە بری ئەوەی چاویلکەی مۆدێرین و پۆست مۆدێرن بکەیتە چاو. بەهەستێکی بە نەرم ڕوانین لە پێشمەرگەو کەسانی خوار خۆت، لووت بە پەڕەی دیوانە شیعریەکان دادەهێنێت تا خوا بکات چاوەکانت بەسەر ووشەیەکی پڕ سوکایەتیدا بنیشێتەوەو حفظی بکەیت و کەسانی ژێر دەسەڵاتی پێ ڕسوا بکەیت؟. جەنەبتان لە باسی داهێنانی نەریتی بزێودا سەبارەت بە بارزانی دەڵێت:{مەلا مستەفا پیاوێکی جنێو فرۆش و دەم پیس بوو} ئێ خۆ جەنابتان گوایە وەکو بارزانی نین! خۆتان ووتەنی:مەلا مستەفا بە منداڵی نەخرا بووە بەر خوێندن. بەلام جەنابتان خوانە یبڕێ جگە لەوەی کتێبخانەکەی باوکی ڕەحمەتیتان ئەم دیوو ئەو دیوو کردووەو هەر لقەکانی ئەدەبە وەتاکو زمان و مێژوو جوگرافیاو یاساو زانستی سیاسەت فقەو

شەریعەوئیسلام ناسی سونی تەفسیری جلاالدین سید قوتب وشیعەی دوانزە ئیمامی و ئیسماعیلی و عەلەوی و عەرزی بەخزمەتتان بکەم فەلسەفەی کلاسیك و مۆدێرن و پۆست مۆدێرن کۆمۆنیزم بەگ بخی ئەڵمانی و فەرەنسی ڕووسی چینی و کوبی و کۆریایی شارەزان، تەنانەت لە باران و کشتوکاڵ و بەروبوومی کشتوکاڵی و جۆرەکانی ڕاو زۆر شارەزان لە خوا بەزیاد بێت ئێستا سۆسیال دیموکراتەکەش هاتۆتە بانی!. ئەی بۆ نوسینەکانت وەك ئەوەی بەهەڵەدا نەچوبم حمە سەعید حەسەن دەڵێت: کەشکۆڵ ئاسایە؟ بەڵام لە ووشەی سوکایەتی پێکردندا داهێنەریت؟ یان بە ئانقەست بە دوای ووشەو عیباراتێکی نزم دا لەیەکێ لە نایابترین دیوانی شاعیرەکانماندا دەگەڕایت تاکو بەرامبەر ئێمەی پێشمەرگە بەکاری بهێنێت و سوکایەتیمان پێ بکەیت. ئەی بۆچی ئەم نیو بەیتەت نەبینی کەمن بەڕاستگۆیانە دەڵێم، بەتایبەتی بەدوایدا گەڕاوم لە نێو شیعرەکانی هەمان مەحویدا کە پێشکەش بە تۆی بکەم و پڕ بەپێستی خۆتەو دەڵێت:{خودا بیدا ئەدەب(حرز الامان)} ێکە عەگییەی ڕەب { شیعرەکانی مەحوی هێندە پڕ مانان کە دڵنیا نیم مەبەستی لە چ جۆرە ئەدەبێکە، بەڵام من بەو هیوایەوە پێشکەشی تۆی دەکەم کە مەبەستی لە ئوسوڵ و ئەدەبی دوان و کۆمەڵایەتی بێت. کە کەسانێك هەن خراپترین کەرەستەی خاویان لە بەردەستدا بێت شتێکی باشی تیا هەڵدەهێنجن، بەڵام جەنابتان لەو دیوانە نایابەی مەحوی دا جگە لەووشەی {ترۆ} هیچیترتان هەڵنەهێنجاوە! تاکو پاش ئەوەی چەندین جار عمرتان بێڕەوشت و سەرسەری کرد تاکو بەشانازییەوە بڵێن ئاوا ترۆم کرد!. ئازایەتی نەبوو عمر عەرەبێکی هەژار و نمونەی ئەو لەبەر چاو هەڤاڵ و هاوسەنگەرەکانی دا ڕسوا بکەیت! خۆزگە جارێ دەمبیست کە بەتوانایەکت ئاوا ترۆ بکردایە!.

کاتێ کە عمر عەرەب کارێکی سەربەخۆی کردبوو باشتر نەبوو باشایەك لەو{خراپەیە} هەڵبهێنجێ و بەدوژمنی بفرۆشێتەوە. تاکو بزانن کە(السن و بالسن، والعین بالعین، والبادی و اظلم) مانای چی؟ خۆ جەنابتان وەستان لە بەکارهێنانی بنەمای السن و بالسن...دا بەرامبەر دوژمنانی وەهمی هاو زوبانتان! لە(کێشەی پارتی و یەکێتی، لاپەڕەی٧٢)دان عەبای شێخ الاسلام تان داوە بە شانتان دا و لەهەمان کاتدا بەپێ ی بنەمای(ڕینگۆم لا یتفاهم)ەکەی خۆت، هەڕەشەو گوڕەشە دەکەن و دەڵێن: ئەگینا بە پێ ی شەریعەتی ئیسلام؛(السن و بالسن، والعین و بالعین، والبادی واظلم) ئێمەش ڕەفتار دەکەین. ئەی بۆ ئەو کاتە بۆ ئاوا بەرامبەر ڕژێم ڕەفتارتان نەکرد؟ ڕەنگە وەڵامەکەتان ئەوە بێت کە هێشتا

له علم الحديپ دا نەگەیشتبوونە ئەو حەدیپە! نەخێر وەلامەکە ئەوەیە کە جەنابتان تەنها بەرامبەر بە هاوزبانەکانت سوود لەو بنەمایانە وەردەگریت کە بنەمای دوژمنان و زمانی ئەوانەو ئەوان باشتر تێدەگەن ئەگەر جورئەتت هەبووایە ئاڕاستەیان بکەیت. پاش ئەوەی یەکێتی لە ڕێککەوتنی ٨٤دا مایە پوچ و مایەوەو جگە لە لاوازی نیشان دان بەرامبەر بە ڕژێم و دۆڕانی سیاسی و جەماوەری لە دەست دانی چەندین دڵسۆزی گەلەکەمان بەدەستی نامەردانەی پیاوەکانی ڕژێم بێ تۆڵە سەندنەوەیان هیچی لەو گفتوگۆیانە بەدەست نەهێنا. دووبارە عمر عەرەب نەجمەکانی بەشان دا کرایەوەو شەرەفی پێشمەرگایەتی پێ بەخشرایەوە. ئەویش دووبارە وەك ئەوەی نە بای دیبێ نە بۆران دڵسۆزانە کەوتۆتە پەلاماردانی ڕژێم و دەیان نەبەردی تۆمار کردووە. بەلام ئەو کەسەی کە لەناو جەماوەردا خۆشەویست و ناودەرچوو بوایە دەکەوتە بەر غەزەبی نەوشیروان مستەفاو نمونەی ئەو دەبواییە تا ئەو کاتەی وەك مار پێوەی نەدات ڕزگاری نەبوایەو جۆرەها پلانی بۆ دروست بکرایە بۆ ڕسوا کردنی و چاو بەرەو ژێر کردنی. لێرەوە قەڵەم دەدەمەزو دەست پێشمەرگەی دێرین و فەرماندەی کەرت، سابیر کۆکەیی لە بەشی(شکاندنی مرۆڤی قارەمان) دا باسی ئەو بەسەر هات و سوکایەتی پێکردنە بکات کە بەسەر عمر عەرەبدا هێنرا:{لێپرسراوی ئەو سەردەمەی هێزەکەیان فاتیح شوانی بوو، چەند جارێك پیلان بۆ عمر عەرەب دادەنێن بەلام سەر ناگرێ، لەو گەڕانەدا بەهەلی دەزانن، عمر عەرەب و هاوڕێیەکی بەناو عسمان دەگرن و چەکیان دەکەن و قۆڵبەستیان دەکەن بە تۆمەتی(سواری یەکتری بوون). دوای گرتن و لێدان و ئیهانە کردنێکی زۆر هێنایانن بۆ لای ئێمە بۆ زیندانی شۆڕش. دادگای شۆڕش هات بۆ لێکۆڵینەوەیان. هەردووکیان ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ لێکۆڵینەوە پێش فەحس کردنیان، وە گوتیان ئەگەر لە فاحسدا ئەو تۆمەتە ڕاست دەرچوو ئێمە ئامادەین بۆ کوشتن. ئەگەر تۆمەتەکەش درۆ دەرچوو لە فاحسدا ماون ئەوەیە کە دەبێت چەند لێپرسراوێك کە ناویان دەدەین ئەوانیش فەحس بکرێن. بۆ ڕۆژی دوایی لەسەر داوای خۆیان و بڕیاری دادگای شۆڕش ناردران بۆ نەخۆشخانەی قوڵەهەرمێ. من و کاك فەرەیدون مستەفاو دوو پێشمەرگەی تر، عمر عەرەب و عسمانمان بە قۆڵ بەستراوی... بردە نەخۆشخانەی قوڵەهەرمێ بۆ فەحسی تایبەتی. دکتۆرێك تازە لە بەغداوە ڕای کرد بوو هاتبووە ناو زەنگ ناوی فواد بوو. دکتۆرێکی زۆر شارەزاو بەتوانا بوو. هەردووکیانمان بردە لای دکتۆر لەگەڵ کاغەزی دادگا ئەویش هەردووکیانی فاحس کردو لە

ئەنجامدا پاك دەرچوون و دكتۆر فواد كاغەزێكی نووسی و تیایا دیاری كرد كە ئەوان شتی وایان نەكردووەو لەو بارەیەوە پاكن. لەسەر دەمێكدا دكتۆر فواد بێ سەرو شوێنبوو هیچ دیار نەماو نەزانرا چی بەسەرهاتو بۆ كوێ چوو... هەردووكیانمان هێنایەوە بۆ زیندان. بەلاّم من لە ڕێگا بە عمر عەرەبم ووت تازە ناوت زڕا، بڕۆ بۆ لایەك خۆت بزركە. لەوەلاّمداووتی نەخێر هەر دەبێت ئیسپاتی بكەم كەمن بێئەدەب نیم بەلاّم بێ ئەدەبیم كرد بوومبە پێشمەرگەلای ئەمانە... ئەم قینە لەدڵی عمر عەرەب دەرنەچوو، هەركاتێك منی بدیبایا شەرم دەیگرت و زوو لای منی جێ دەهێشت. لە دواییا خۆی دایەوە دەست ڕژێم. سابیری كۆكەیی لاپەڕە١٠٨تا١١٠. لێرەدا ئەگەر ئەم تراجیدیایە لە مێشكی خۆمان دا وەكو فلیمێكی سینەمایی سەیر بكەن دەبێ ئاوا بیبینین؛ دووپێشمەرگەی قارەمانی لە خۆبووردو بە قۆڵی بەستراوەوە، لێدراو ئیهانەكراوو پەشۆكاو شپرزە، لە ناوچەی دۆڵی جافایەتی تاكو ناوزەنگی بناری قەندیل و لەوێوە بۆ قوڵە هەرمێ دوبارە بۆ ناوزەنگ دەبرێن كە نزیكەی سێ ڕۆژ ڕێگایە. لەو ماوەیەدا لە ڕێگاو دێهات و لە بارەگاكان دا ڕووبەڕوی سەدان و هەزاران پێشمەرگەی یەكێتی و لایەنەكانی ترو خەڵكی سیڤیلدەبنەوە. بەئامادەیی خۆیان پرسیار لە پاسەوانەكەنیان دەكرێت ئایا لەسەر چی گیراون؟ یان بە لایەنی كەمەوە هەریەكە پرسیار لە خۆی دەكات، هەریەكە زانیان تاوانەكەیان چیە دەكەونە تف لێكردن و جنێو پێدانیان یان تەنها بە بێدەنگی بەچاوێكی نزم و سوكەوە تێیان دەڕوانن. بێگومانم تێڕوانینی هەرتاكە كەسێك بۆ عمر ئارەقی شەرمەزاری بە ناوچەوانی دا هێناوەتە خوارەوەو جۆرە مردنێك بووە بۆی. بەتایەتی ئەوانەی كە دەیانناسین. لە كۆمەڵگاكەمان دا كە لە {خوا بەزیاد بێت}لە هەشتاكان دا هەزرەها جاشمان هەبوو. ئێستاش هەندێكیانلە ئاستی وەزیر یان لە پەڕلەماندان. بە داخەوە بەلای كەم كەسەوە شەرمەزاریەكی گەورەیە. بەلاّم تاوانبار كردن بەكارێكی ئاوا تا مردن دەبێت بە پەڵەی ڕەش بۆ ئەو كەسەو كەس و كاری تەنانەت منداڵ و نەوەكانی. كاتێك دەیان بەنە خەستەخانەی شۆڕش لە ڕاڕەوی خەستەخانەكەدا بەسەری شۆڕشەوە چاوەڕوانی دەكەن كە دكتۆر یەك بە دوای یەكدا پێش خۆیان بدات و بیان باتە ژوورەوە. لە بەردەمی دكتۆرو هاوكارەكانی و پاسەوانەكان دا شەرواڵیان لە پێ دادەكەنن و لەسشەر ئەژنۆ لە كۆمییان وورد دەبنەوە و دەیپشكنن كە ئایا شوێنەواری كاری خراپەی پێوە دیارە یان نا!. بەڕاستی عمر عەرەب كەسێكی ئارام و بەتەحەمول بوو، كە ئەوەش ئەنجامی بیرو باوەڕی بەرزی بوو

بە شۆڕش و خەبات. دەنا هەرکەسێکی تر بوایە سەرباری دڵسۆزی و فارەمانێتییەکەی ئەو سوکایەتییەی بەسەردا بهێنرایە پەلاماری چەکێکی دەداو تەڕو ووشکی بەیەکەوە دەسوتاند. داواکەی عمر کە ئەگەر پاك دەرچوو پێویستە هەندێ لە بەرپرسیارانیش بۆ کاری خراپ فاحس بکرێن، وەکو با بەلای گوێدا تێپەڕی. سوکایەتی کردن تەنها بەلای پێشمەرگەی هەژاردا براپوو نەك بەر پرسان. نازانم ئەو کاتە فارەمانی دادوەری، نەوشیروان مستەفا بۆچی نەیتوانی کارێك بۆ بەجێ گەیاندنی داواکەی عمر بکات؟. سابیر کۆکەیی بەشێکی بەسەر هاتەکانی عمری باس کردووەو وەکو من لە نزیکەوە ئاگاداری تەواوی ڕووداوەکانی دوای ئەو شکاندنەی نیە، بۆیە ڕەنگە کەوتبێتە ئەو باوەڕەوەی کە ئەم ڕووداوە هۆکاری گەڕانەوەی عمر بوبێت بۆ ناو ڕژێم. نەخێر عمر عەرەب سەرباری ئەو سوکایەتییە قورسە ناڕەوایە هێشتا سەنگەری خەبات و تێکۆشانی چۆڵ نەکردو وەك جاران دەستی کوشندەی لە پیاوەکانی ڕژێم دەوەشاندو هیچ گۆڕانکارییەکەی بەسەردا نەهاتبوو. بە پێچەوانەوە گۆڕان کاری بەسەر ئەوانەدا هاتبوو کە وایان دەزانی ئەم سوکایەتی پێکردنە ئامانجی خۆی پێکەوەو عمر وا لێدەکات ڕێگای خیانەت بگرێتە بەر. بۆیە هەمیشە بە چاوی گومانەوە تێیان دەڕوانی و حەزەریان لێ دەکرد. بە تایبەتی نەوشیروان مستەفا زیاتر لە جاران قینە بەرایەتی دەکردو بە نزم سەیری دەکرد بەڕادەیەك کە جارێك ڕاستەوخۆ بە نەوشیروانی ووت: کاك نەوشیروان دەزانم تۆ شتێکت بەرامبەرم مەن هەیە بەلام نازانم بۆچی و هەڵەکانی من چین؟!نەوشیروان مستەفا کە گوایە بەرەو ڕووەو کەسێکی ڕاستگۆیە بە کورتەیەکی لوت بەرزانەوە وەلامی دایەوە: شتی وا نییە، هیچ ڕقێکم لێت نییە!، ئەگەر ڕقم لێت بێت ناهێلم لە کوردستان دابنیشێت. وەك ئەوەی کوردستانی بە تاپۆی ڕەشی عسمانی لە حاجی ئەمینی ڕەحمەتی باپیرییەوە بۆی مابێتەوە!. ئەوەتا دەبیننچۆن بێگانە لەو جۆرە ڕەفتارو فەرمانانەی تۆمار کردووەو دەلێت:نەمبیستبوو کابرایەك هەیە ناوی مەلا بەختیارە ئێستاش ئەگەر ئەمێنێتەوە زۆر باشە، ئەشڕۆی خوا حافیزت بێت. لاپەڕەی ١٩٩ کەشکۆلەکە. دوو نمونەی تریشم لایە کە بیری نەوشیروان بخەمەوە. مامۆستا نەبەزو کاك کامەران ئەم دووانەش دوو کادیری چالاکی کۆمەڵە بوون. کاتێ کە هەندێ لە بۆچونەکانیان لەگەڵ جەنابیان یەك ناگرێتەوە، بانگیان دەکات و پێیان دەلێت: {کاکە ئێوە بەکەڵکی ئێرە ئێرە نایەن، خوا حافیزتان بێت بڕۆن بۆ خاریج.} مامۆستا نەبەزو کاك کامەران لە ساڵی ١٩٨٤وە بەو شێوەیە ئاوارە کران و ئێستا گەر بەهەڵەدا نەچووبم لە بۆن

دەژین. ڕاستە کوردستان موڵکی جەنابتان بوو!. ئێمەش کرێچی جەنابتان بووین!. بەلام بە خوێنی خۆمان کرێکەمان کرێکەمان دەخستە سەر حسابەکەت. تاکو چیا و نما لە لەندەن و ئەمەریکا بێ ناز ئەبن و باش پەروەردە بن. بۆ ئەوەی ئەولادەکانیشمان لە دوا ڕۆژدا لە خزمەتی ئەولادەکانتان دا بن! عمر سەرباری ئەوەی بەو پەڕی دلڕەقی و دڕندانەوە ڕەفتاری ناشرینی بەرامبەر کرا بوو بەلام هێشتا هەولی دەدا بیر لە تۆڵە کردنەوە نەکاتەوە. یەکێك لە پێشمەرگەکانی کەرتەکەی عمر کە بە علی سورو مامەلی ناسرابوو، ئێستا لە ئەلمانیا دەژی، عەلی سور پێشمەرگەیەکی ئازاو چاونەترسی کەرتەکە بوو. لە چاوپێکەوتنێك دا باسی ئەوەی بۆ کردم کە لەگەڵ عمردا دەبێت، ڕێکەوت پێشمەرگەیەکی پیشان دەدات کەلەو کاتەدا کە بوختانەکەی بۆ هەلبەسترا بوو زۆری لێدا بوو وە سوکایەتییەکی لە ڕادەبەدەری پێکردبوو. عەلی سوریش کە مندالکارو سەرکەش دەبێت، دەلێت: ئێستا کاتێکی لەبارە با ئێمەش کەمێ بەو بکەین. عمر بەو نارەزاییەوە پێی دەلێت: گەرچی تا مردن ئەو سوکایەتییە و لێدانەم لە یاد ناچێتەوە، بەلام ئەویش پێشمەرگەیەکە وەك تۆ هەرچییەکی پێ بلێین و چۆنی پەروەردە بکەن ئاوا ڕەفتار دەکات، گوناحبار و خراپە کار بەرپرسەکانن نەك ئەو.

عمر عەرەب لەوانە نەبوو کە بتوانێت خێزانەکەی بەئازادانە لە ناو شاردا بمێننەوە، بە تایبەتی پاش ئەوەی چاو قایمانە چەند کەسێکی سەر بە ڕژێمی کوشت ودەسەلات و نفوزێکی زۆریان هەبوو. تەنانەت هەلگری مەدالیای ئازایەتی سەدام حسێن بوون. ئەمەو چەند چالاکییەکی تری عمر دوژمنایەتی شەخسیشی خستە سەر باری خۆی و خێزانەکەی. بۆیە پاش ماوەیەکی زۆر لە خۆشاردنەوەو دالدەی خزم و کەس و کار ناچار بوون بگوێزنەوەبۆ ناوچە ئازاد کراوەکان و لە مێرگەپان داینان و خێمەیەکی بۆ هەلدان. ئەمەش کێشەی بەخێوکردنیانی بۆ عمر خولقاند. ئێمە خۆمان بەسەر مالی جوتیارانەوە دەژیاین. بەلام دەبوایە عمر خێزانەکەشی بە خێو بکات کە بەهۆی دوژمنایەتی ئەمەوە شاریان بە جێ هێشتبوو. تکاو پاڕانەوەی عمر بۆ یارمەتی زیاترو بەخێو کردنی خێزانەکەی تەنها ئاسنی سارد کوتین بوو. کەس خۆی بەخاوەنیان نەدەزانی. بەلام خێزانی زۆر لە بەر پرسەکان بە تێرو تەسەلی لە ناوچە ئازاد کراوەکان و ولاتانی دەوروبەردا لە ئەوروپا بێکێشە دەژیان. هەروەك چۆن کاك نەوشیروان لە کتێبەکەیدا زۆر بە ئاسانی باسی دەکات کە پاش ئەوەی خێزانەکەی تووشی کێشە بووە، دەلێت:{چیاو دایکم نارد بۆ ئەوروپا}.

جارێکی تریش هەروئاوا بە سادەیی دەڵێت: نماو دایکیم ڕەوانەی بەریتانیا کرد. هێندە بە ئاسان و سادەیی باسی سەفەری ئەوروپا دەکات، وەك ئەوەی لە سەرگەڵووەوەبۆ بەرگەڵوو ڕەوانەی کردبن. خۆ عمریش لە تۆ کەمتری بەر نەکەوتبوو!تراکتۆرێکی بۆ دایکی و باوکی و خوشك و براکانی گرت و لە خێمەکەی مێرگەپان ڕزگاری کردین و بێ سەریەشەی معامەلەی پاسپۆرتی دبلۆماسی و بەپێ ی ڤیزەو بە بێ ئەزێتی دابەزین و سەرکەوتنەوەی ترانزێت، ڕاستەوخۆ گوێزانیەوە بۆ گوندی گاپیلۆن! لەگەڵ ڕێزو حورمەتی گەورەم بۆ خەڵکی گوندی گاپیلۆن و تەواوی گوندە بەشەرەفەکانی کوردستان کە پشتیوانی گەورەی شۆڕش و خەبات بوون. بەلاّم ڕەنگە یەکێك گوندەکانی کوردستانی نەدیبێت و لە نەوشیروان مستەفا بپرسێت جیاوازی ڤێناو لەندەن و گاپیلۆن چییە؟ دوور نیە بڵێت جاخۆ گاپیلۆنیش خراپ نەبوو! شوقەی مۆدێرن و خانووی ڤێلایی بە دڵی خۆیانی تیا بوو!سەنتەرەکەشی گەر چی بچوك و خنجیلانە بوو بەلاّم تۆزێك لەوەی ڤێنا دەچووواتەنها نوقسانییەکی گاپیلۆن ئەوە بوو کە هۆڵی گونجاوی تیا نەبوو بۆ ڤێنەر دانس(سەمای ڤێنایی)وەکو لەندەنیش دیسکۆی لامباردا و چە چە چەی زۆر نەبوو!. بەزەم نەبێت ئۆپەراکەشی تۆن بوو بوو!.

باری گوزەرانی خێزانەکەی عمر گەیشتبووە ڕادەیەك کە ناچار بوون جار بە جار ئەو چەکانەی لە چالاکییەکاندا دەمانگرت یەکێکمان دەشاردەوە و دەمان دا بە عمر تاکو بیفرۆشێت و نانی دایك و باوك و خوشك و براکانی پێ دابین بکات. ئەم کارەشمان بەترس و لەرزو هەست کردن بەگوناح تاوانێکی گەورەوە ئەنجام دەدا دەمانزانی گەر ئاشکرابێت چ سوکایەتییەکمان بەسەردا دەهێنن و چ سزایەکی توند تیژ دەدرێن. ئەم چەك فرۆشتنەش هەمیشە بەردەوام نەدەکرا بەڵکو تەنها لەو کات و فرسەتانەدا بۆمان دەکرا کە تەنها ئەم چەند پێشمەرگەیە بوینایە کە باوەڕی تەواومان بەیەکتری هەبووە وە بوبوینە هاوڕێ ی گیانی بەگیانی یەکتری. ئەم بارە وای لە عمر کرد بوو کە بیری لە هەموو شتێکی باش و خراپ دەکردەوە بۆ بژێوی خێزانەکەی. ڕۆژێك عمر بانگی کردمە لاوە و ووتی: ئەردەلاّن ئێمە زۆرمان بۆ ئەمانە کرد بەلاّم ئەوەی قیمەتی بۆ دانەنێن ئێمەن. نیازم وایە شتێك بکەین کە دەسکەوتێکی بۆ خۆمان تیا بێت، تۆ دەڵێیت چی؟{گەر چی باسی شتەکەی بۆ نەکردبووم چییە، پێم ووت عمر چیمان لەدەست بێت بۆت دەکەین بەلاّم بیر لە شتی خراپ مەکەرەوە. با ئەو ناوو ئابڕووەی چەندین ساڵە بۆ خۆمان دروست کردووە لە دەستی

نەدەین}. عمر لەوە دەچو بڕیاری خۆی دابێت. خۆی و سەردار کە برایەکی منداڵکاری بوو، تازە چەکی هەڵگرتبوو لەگەڵ نەوزادی عەبەی تەقێ دا چوبونە سەر دکتۆر باقر ناوێك، کاتێك کە دکتۆر باقر پارەی نەدابوونێ و ترساندبویانو ئەزێتیان دابوو. کاتێ کەئەم کارە ئاشکرا بوو هەرسێکیان دەگیرێن و لەبەرگەڵو دەخرێنە زیندانەوە. منیش سەرباری ئەوەی کە کارەکەیانم بەلاوە خراپ بوو بەڵام بەبێوەفاییم لێیان نەپرسەوەو سەردانیان نەکەم. کاتێك چووم بۆ لایان عمر زۆر پەشیمان بوو لەو کارەی کردبووی، بەڵام زۆر بێزار بوو لەوەی کە لەگەڵ مامۆستا پشکۆدا(کە بەتاوانی ئاڵای شۆڕش زیندان بوو) لەگەڵ چەند جاشێك دا دایان نابوون. باسی ئەوەی دیکرد کە جاشەکان لە مان زیاترن و زۆر جار شەڕی پێ دەفرۆشن و ئیهانەی دەکەن. چونکە زۆر لەو جاشانە خۆی ڕفاندونی. پاش ئەوەی بەڕێوبەری زیندان هەستی بەوەزعەکە کردبوو عمر و براکەی و نەوزاد لە زیندان دەردەهێنێت و لە خێمەیەك دا دەست بەسەر لە چاوەڕێ ی هاتنەوەی نەوشیروان مستەفا دایدەنێن. چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کە نەوشیروان بڕیار بدات چ سزایەکیان بدرێت. کاتێ نەوشیروان مستەفا گەڕابۆوە و زانیبوی کە هێشتا لە زیندان دان فەرموبووی: {تا ئێستا پیاوێ نەبووە ڕەمیان بکات؟}. هەندێ پێشمەرگە هەواڵی پێگەیاندبوون کە نەوشیروان نیازی وایە ڕەمییان بکات. ئەوانیش شەوێك لەگەڵ غەریب کونجرینی دا کە ئەویش جێگری فەرماندەی تیپ بوو،لەو سەردەمەدا دەست بەسەر بوو. فرسەت دەهێنن و ڕادەکەن و خۆیان تەسلیم بە ڕژێم دەکەنەوە. لێرەدا کەس نییە نکوڵی لە هەڵەو تاوانی عمر بکات بەڵام ئەوەی جاران بەلامەوە مەسەلەیەکی ئاسایی بوو کە کەسێك تاوانێکی کرد لە ژێر هەل و مەرجێکدا بوبێت پێویستە سزای قورسی بدرێت و سەرکردەیەك مافی هەیە حکوم بەسەر ژیان و مردنی کەسێکدا بدات ئێستا بە جۆرێکی تەواو پێچەوانەو ئاڵۆز تەرەوە تێ ی دەڕوانم. لەو سەر زەمینەدا کە زادی باوك و باپیرو دەیان پشتمە نە پێش ڕاپەڕین و نەدوای ڕاپەڕین بواری ئەوەم بۆ نەڕەخسا بوو تۆزێك ڕەخنە گرانە لە ڕووداوەکان بڕوانم و کۆمەڵە پرسیارێك ئاراستەی خۆم و دەوروبەرم بکەم و بەوەلامێکی قانع کەر بگەم. کەسێکی وەك من کە نەزانکۆم خوێندووەو نە بواری خۆ ڕۆشنبیر کردنم بۆ ڕەخساوە تەنها پیشەم کرێکاری و پێشمەرگایەتی بووە. بۆیە ئەگەر بێ یاسایی یان یاسایی جەنگەڵم بەلاوە ئاسایی بوو بێت هەر ئەوەم دیبێت و هەر بەوە ئاشنا بوبم شتێکی غەریب نییە. بەلام کەسێکی وەك نەوشیروان مستەفا کە دەوروبەرەکەی پڕو پاگەندەی عەبقەری و(بیلا

تەشبیە) عەدالەتی ئیمام عمرو فەقیر دۆستی ئیمام عەلی بۆ دەکەن، بە چ مافێ لە سەر بنەمای کام دادگایە بە چ ویژدانێکەوە بەمۆرەو فیزو بەسەر پێییەوە بەلای زیندانەکەدا تێدەپەڕێت و دەڵێت:{تا ئێستاپیاوێنەبووە ڕەمیان بکات؟} . ئەگەر مرۆڤ لای تۆیەك دژ بەعەشایەر و خێڵەکی و بنەماو لە هەمان کاتدا ڕیفۆرم خوازو خواستیاری حکومی یاسا هێندە بێنرخ بێت وای بەحاڵی ئەو میللەتە بە دەست نەزانەکانەوە. چیو کێ شەرعیەتی داوا بە تۆ کە ڕۆڵی موحەقیق و حاکم و محامی و مدعی عام ببینێت؟ بڕوانامەکەت ئەو شەریعەتەی داویتی؟ ئەو بڕوانامەیەی کەلەبەر سەرقاڵی شەڕە جنێوەکانی ناو گۆڤارە ڕووزەردەکەی ڕزگاریت بە چەندین قۆناغ بە دەست هێنا؟ یان ئەو ماجستەرە وەهمیەی نەمسات؟ ئەو ماجستەرەی بڕوا ناکەم جگە لە بەهەڵەدا بردنێکی گۆڤاری جیهان شتێکی تر بێت. زۆر خۆشحاڵ دەبووم کە گۆڤاری جیهان و بەڕێزو نیاز محمەد، بە دواچونی زیاتر بکەن و ناونیشانی زانکۆ و ساڵی ماجستەرەکەتیان بلاوبکردایەتەوە.(سەیری گۆڤاری جیهان ژمارە٢٠١). نەمسا چەند سەعاتێکم لێوە دوورە بە دڵنیاییەوە دەچووم بۆ ئەوەی نسخەیەکی لێ کۆپی بکەم. خۆ ئەمەش خۆت ووتەنی پێشمەرگە نییە کۆن بووبێت و باوی نەمابێت و بخرێتە لاوە. بە دڵنیاییەوە لە ئەرشیفی زانکۆدا ماوەتەوە. ئەگەر واش نییە بۆ چیخۆت بێدەنگ کردووەو گۆڤاری جیهان بە درۆ ناخەیتەوە. یان تۆش بێدەنگییەکەی ئایە توولا خومەینیت هەڵبژاردووە، کاتێك کە موعجبینە کوێرەکانی لێی دەپرسن ئایا ئەو ئیمامی مەهدییە؟! هیچ وەلامێك ناداتەوە!. ئاخر ڕەفعەتی مەلا ئەم کابرایە هێشتا ماجستەرەکەی ساغ نەکراوەتەوە، ئیتر باسی دکتۆرای چی دەکەیت؟!. هەر خوا بیکات بابەتی دکتۆراکەی لەسەر مافی مرۆڤ و یاساکانی مافی مرۆڤ نەبوبێت! ئەگەر شتی والاسامح الله ڕوویدا بێت، دوور نییە ئومەتی موتەحیدە لە داخا هەرچی بانگەوازی مافی مرۆڤە بیخەنە سندوق و قاسەی کیلۆن دراوەوە و بالجماع ڕێزی قەرار دژی شۆڕشی فەڕەنسی دەربکەن. ڕەنگە کەسانێك دڕندەییەکەت و دڵە حاقیدەکەت نەناسێ ئەوەت لێ قبوڵ بکات کە بڵێ ی نیازی ئیعدام کردنی عمرم نەبوو. ئەگەر نیازی ئیعدامی عمر هاوکارەکانیشت نەبەبێت، ئەم ووتانەی تۆو ئەو ترساندنەی تۆ کە خۆی لە خۆی دا سوکایەتی کردنە بە ژیان و مردنی مرۆڤەوە هۆکاری ئەوە بوون کە عمرو هاوکارەکانی توشی خیانەت و خراپە کاری بکات. بەڵێ جەنابت لەو بوارە سادیستیانەدا مامۆستا بوویت. سەیر ئەوەیە دڕندەکاریەکانیشت بۆ گاڵتەو گەپ نوسیوەتەوە. ئەم جارە قەڵەم دەدەمەوە

دەست خۆت و بەشێك لەو كەشكۆڵەت كە ناوت لێناوە(پەنجەكان یەكتری دەشكێنن) بنوسەرەوە. لە لاپەڕەی ٣٠٤دا كەباسی شەهاب ناوێكی پێشمەرگە دەكەیت و پاش ئەوەی بە تێلایەكەوە ڕۆڵی موحەقێقێكی زیرەك وكارامەت دیوەو زانیوتە بلاوكەرەوەی نەخۆشی پێستی پێشمەرگەكان كێیە. عەبای حاكمی دەدەیت بە شانتاو دەڵێیت: {بڕیارم دا لە پێشمەرگایەتی دەری بكەم، بەلام پێش ئەوە نیوە گیانی بكەم... بانگم كردو زۆر لۆمەم كرد ووتم لەبەر ئەوەی تۆ ئەم تاوانەت كردووە، لەوانەیە خەڵكی تریش تۆش بكەیت. بڕیارمان داوە بتسوتێنین! بە تورەییەوە بە پێشمەرگەكانم ووت: بیبەن بیسوتێنن!} . گوایە بۆ ئەوەی جارێكی تر تاوانی ئاوا دووبارە نەكاتەوە لە هەمان لاپەڕەدا نەوشیروان دەڵێت: كابرا تا ماوەیەك وا یدەزانی بەڕاستی ئەیسوتێنن. ئەبێ نەوشیروان و جەلادەكانی چەندە قاقای پێكەنینیان لێدابێت و ترسی مەرگی ئەو پێشمەرگە بەستەزمانە دڵە ڕەشەكەتی خۆشحاڵ كرد بێت؟ بەلێ كاكی سەركردە ئەگەر بڵێیت ئەوەی عمریش هەرئاوا بۆ ڕابواردن و قاقای پێكەنینە سادستیەكانت بوبێت بە داخەوە ئەنجامەكەی هێندە گاڵتە بازاڕی نەكەوتەوە، بەڵكو بووە هۆی خیانەتی چوار پێشمەرگەی قارەمان و سوور كردنی دەستی ئەوانیش بوو بە خوێنی شەهید ئازادی سەر تیپ و چەندین تاوانی تر. ئەگەر دووبارە ووتەكانی نەوشیروان بخوێنینەوە تێبینی چەند ڕاستییەك دەكرێت؛ بڕیارم دا لە پێشمەرگایەتی دەری بكەم، بەلام پێش ئەوە نیوە گیانی بكەم... بانگم كردو زۆر لۆمەم كرد ووتم: لەبەر ئەوەی تۆ ئەم تاوانەت كردووە، لەوانەیە خەڵكی تریش تۆش بیكەیت. بڕیارمان داوا بتسوتێنین! تێبینی بكەن دەڵێت: دەری بكەم، نیوە گیانی بكەم(مەبەست لەوەیە بیتۆقێتم)، بانگم كرد، لۆمەم كرد،ووتم: تاكو ئێرە فۆڕمە ڕێزمانییەكان تاكن(مفرد).پاشان دەڵێت: بڕیارمان داوە بتسوتێنین! ئەمە دوو فۆڕمە بە كۆیە(جمع). ئەمەش نیشانەی ئەوەیە تا ئەوكاتەی تاوان لە ئازاردا نییەن جورئەتی هەیە بڵێت من تەنها ئەو كردارانەم كردو بەر پرسیارم لێ ی. دوای ئەوە دەنگێك لە ناخەوە بەنەوشیروان دەڵێت: لێرەوە ئیتر خەریكی بەئەنجام گەیاندنی تاوانیت! یان هێزی لاوازی و بێدەسەلاتی شەهاب وەكو منداڵێك وا لەنەوشیروان دەكات بسڵەمێتەوە!. ئیتر بۆ ئەوەی تاوانەكانی و ڕەفتارە دزێوەكانی بەرامبەر محاسەبەی خۆی لە خۆی سوك بكات دێت دابەشی دەكات بەسەر دەستەو كۆدا و فۆڕمی كۆ بەكاردەهێنێت!. لە نوسینەكانی دا چەندین نمونەی لەو جۆرە بەر چاو دەكەون. كاتێ ئەم ترساندنە ناڕەوایەی تۆم خوێندەوە ئەزیەتی زۆرم

نەکێشا بۆ تێگەیشتن لێ ی، پاش تەلەفۆن و موعد بە پیاسە چووم بۆ لای دکتۆرە ئەڵمانیەکەی خۆم کە ساڵانێکی دوورو درێژە دەیناسم کەسێك بوو کە هەر زوو زانی نەخۆشی پێستی دە ساڵەی من ئۆرگانی نییەو حاڵەی قەلەمی ساڵانی پێشمەرگایەتی و خۆشاردنەوەو دڵە ڕاوکێ و ناسەقامگیریم بووە. لەهەمان کاتدا شکور بۆ خوا ساری نەبوو تاکو هەڕەشەی بە زیندووی سوتاندم لێ بکەی وەکو کەنیسەکانی قرونی وسگا!. بەتایبەتی باسی ئەو لەش خۆرانەی لەمەڕ کەشکۆڵەکەی تۆم بۆ کرد کە زۆر بێزار کەرەو چارەسەرەکەی بەخۆ پاك ڕاگرتنی بەردەوام جل و بەرگی پاك و پێخەف بەردەوام و وەدەرمانێکی نە ناسراو دەبێت بە کورتی تەواوی ئەو سیفاتانەی تۆ نوسیوتە بۆم باسکرد. وەك ئەوەی باسی حاڵەتێکی زۆر ئاسایی و سادەم بۆ دەست بە جێ پێ ی ڕاگەیاندم کە ئەوە لە ئەنجامی(پارازیت)ێکەوە یە، کە نازانم بە کوردی چی پێدەوترێت، هێندە دەزانم گیانلەبەرێکە لە میکرۆب گەورەترە بەلاّم بە چاو نابینرێت. بۆیە من ناوی دەنێم(جانەوەر). منیش بەدوادا چونی زیاترم دەربارەی ئەو جانەوەرەو سیفاتەکانی دا کرد. هەروەك ئەوەی گۆڤاری جیهان بەدوا چونی جەنابتان و سیفاتەکانتانی کردووە.پاشان بۆم دەرکەوتئەو جانەوەرە لە جەنابتان زۆر بێگوناح ترە، ئەم بەد بەختە لە ئاژەڵدا دەژی و بە ئەڵمانی ناوی(کرێتس میلبێن)ە کاتێ ئەم جانەوەرە بۆ بەد بەختی شەهابی پێشمەرگە ڕێ ی لێ وون دەبێت یان بەێدفە(مەبەستم ێدفەو زەرورەکەی دیالێکتی مارکس نییە) دەچێتە سەر پێستی مرۆڤ و دەبێتە هۆی خورانێکی لە ڕادەبەدەر. بە تەبیعەتی خوشی زۆر زوو زیاد دەکات لەبەر ئەوەی نێرەو مێ یەکنیە یان لە خۆی دایە. بۆ نەگبەتی شەهابی بەستەزمانیش جانەوەرێکی زۆر بزێوە. بۆیە چارەسەرەکەی جگە لەخۆ پاك ڕاگرتن وەك ئەوەی کە جەنابتان باسی دەکەن بۆ ماعلوماتت(لەبەر ئەوەی عیزەتی مەلا دەڵێت جەنابتان زۆر موتابیعن)دەرمانەکەی کرێمێکە ناوی(ئێسکسوراکس)ەو لە موادی(کۆتامیتانوم) دروست کراوە. ئەو کەسەی کە دێتە گیانییەوە چەند ڕۆژێکی دەوێت کە هەست بە خواردن بکات و ڕاستەوخۆ هەست ناکات بەوەی لە گیانی دایە. تا ئەو کاتەی کە هەستی پێ دەکات بۆ چەندین کەسی نزیکی خۆی گوێزاوەتەوە. هەندێ جار نیشانەکانی کە خوران و سوربوونەوەیە ئەتجامی بە نینۆك و توند خوراندن، لە کەسی دووەم سێ یەمەوە سەر هەڵدەدات پێش ئەوەی نیشانەکانی لە کەسی یەکەم و سەرچاوە ئەسڵیەکەوە دەربکەوێت. بۆیە بەدڵنیاییەوە پێیان دەڵێم نەك بە(تەحاو محام) ێکی(تشریعی و حاکم و

مونەفیزو محامی و محقیق) ێکی عەبقەری وەکو جەنابتان تەنانەت بەتەواوی(ئێف بیّ ئا و کاژیّ بیّ و موسادنادۆزرێتەوەکەکیّ سەۆچاوەی یەکەم بووە. زۆرم تاکید لەوە کردەوە کابرای ئەلّمانی هەر سەری ڕادەوەشاند کە بەکوردییەکەی مانای ئەوەی مەحالّە لە دەستەیەك دا بتوانی بزانیت سەرچاوەو کەسی یەکەم کیّ بووە. یا سبع یّنایع و البخت الظایع! تەنها شتێك کە بەتۆ دەکرێت تەنها گالّتە جاری بە ژیان و مردنی خەلّکی ژێر دەسەلاّتت بووە. کاکە نەوە شتێکی زۆر غەریب نیە کە تۆ ئاوا گالّتە جاڕی بە ژیانت بکەیت چونکە مەرگت لە نزیکەوە نەدیوە! هەمیشە قایم کار خۆپارێز لە هەر شوێنێکدا هێزی پێشمەرگەو سەرکردایەتی نیشتەجیّ بوبێت هەمیشە خێمە یان خانووەکەی تۆ لە قلیم ترینو بەرزترین شوێندا دادەمەزرێندرا. تەحەدات دەکەم ناوی مەفرەزەیەك یان شەڕێکم بۆ بهێنە کە تۆ پێشڕەوی بوویت لە خەتەکانی دوواوە نەبوویت بۆیە ئەو ترسی مەرگە تەنها پێشمەرگە دەیناسیّ کە سەرباری تەجروبەو سەرباری شانازی بۆ خۆکردن دووبارەو دووبارە لەهەر شەڕو لە بەردییەکدا وەك بارێکی قورس سەر سنگی دەگرت وادەزانیّ هاوارو قیژان و هوتاف و شەڕە جنێوی ناو شەڕە دەستەو یەخەکان لە خۆشیدا بوون؟ یان بۆ ترساندنی دووژمننان؟ نەخێر تەنها بۆ ڕەواندنەوەی ترسی مەرگ بوو لە خۆمان بەلاّم ترسی مەرگ سەرباری وەسف نەکراو و سیحراوییەکەی نەی دەتوانی وویستی هیوای سەرکەوتنی ئێمەی پێشمەرگە ببەزێنێت بۆیە دوای هەر نەبەردییەك تامەزرۆی نەبەردییەکی تری ترسناك دەبوونەوە بەلاّم تۆ کە ئاوا بیّ باکانە کەسە لاوازەکانی ژێر دەسەلاّتت بۆ گالّتەجاڕی دەخستە مەرگەوە بەلگەی زیندووە کە هیچ کاتێك خۆی نەخستۆتە هەلوو مەرجێکەوە کە بەترسی مەرگ ئاشنا ببێت تاکو وانەی ئەوەدا بدات کە جارێکی تر نەیکەیتە مەزەو ڕابووادرن. ببورە!ببورە!! لە یادم نەبوو کە برادەران نەیان دەهێشت بچێتە شەڕەوە، دەننا جیڤارە لە چاو تا مێشکی ناو تەلّەیە! برادەران ناهەقیان نەبوو ئەگەر خوا نەخواستە وەك خۆت دەەلّێیت شتێکت بەسەر بهاتایا کۆمەلّە بیّ سەرپەرشت و پەرتەوازە دەبووون! تۆش خۆت وەتەنی گوێت نەدەدایە ئەبیّ یان نابێت ئەمە مەسەلەکەیە!. ئەمە نەم زانی بوو(شێخ زوبێریش)ت خوێندۆتەوە؟ ئاخر تۆ ماجستەرەکەت کە گوایە بەئەلّمانی نووسیووە نەکەس ووشەیەکی ئەلّمانی لیّ بیستوویت و نە سەرچاوەیەکی ئەلّمانی لەنووسینەکان دا بەکار هێناوە! انجلیزیە چۆن وا هاتە بانی؟((لاپەڕەی ئەم شێخ زوبێرەو ئەبیّ و نابێیە لە کەشکۆلّەکەدا بۆ نەدۆزرایەوە! قوڕ

بەسەر ئەوەی لەو کتێبەدا شتێکی لێ وون ببێت مەگەر حەزرەتی ڕەسول الله لە پشتی بێت ئەوسا ئەی دۆزێتەوە نەپەڕاوێز پەراوێزە، نە ڕووداوەکان زنجیرەیان هەیە نە تاریخ و جوگرافیا حسابی بۆ کراوە(لە کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی) ەوە ئەپەڕێتە سەر(کەرەکەی بکر پیرۆت) لەسەر کەرەکەوە(بۆ ئێران لە دوا قۆناغی ئینقیلابدا) دوای دانانی چەکی ئینقیلابیش ڕاستەوخۆ بۆ(گەنم لە داچەندنەوە تا هاڕین) هەر لێ ی گەڕێم و چاکی نەکەم با خراپ نەبێت))منێکی پێشمەرگەی سادەو نیمچە خوێندەوارێك وەکو یاسا خوێنێکی وەکو تۆ لە یاسا سەر دەر ناکەم.

تەنها ئەوە دەزانم کە لە حکوم دان بەسەر پێشمەرگەی هەژارو بێکەسدا خۆت بە تەنها یاسا دانەرو جێ بەجێ کەرو دادوەر بوویت بۆ مەهزەلەی زەمانەش ئێستا داوای جیا کردنەوەی ئەو دەسەڵاتانە دەکەیت لە یەکتری باشە کاکە نەوە لە چوار ساڵی ڕەبەقی کۆلێژی یاسادا تۆ بلێ ی گۆڤارە ڕوو زەردەکەی ڕزگاری و شەڕە جنێوەکانت بواری نەدایت یۆدیفەی ئەوو ووشە ئەساسییە بکەیت لە قانوندا کە بە ئەڵمانی پێ ی دەڵێن(پرۆپۆر سیۆنێل) بە کوردییەکەی مانای ئەوەی بەمنداڵی هاوڕێیەکمان زلیەکیی لێدابن زلەکەمان دەهاویشتەوە دەمان ووت:(حەق بە حەق) واتە ئەوەی پێت کردووم بەقەدەر ئەوەت پێ دەکەمەوە قسەکەم لێ هەڵنەگێڕیتەوە بیکەیت بە(ترۆ تۆڕ سیۆ نێلێ) ئەزانم زۆرت حەز لەوشەی(ترۆ) یە بەکورتییەکەی(حەق بەحەق) مانای ئەوەی ئەگەر سیارە مخالیف رابگیریت جەزاکەی ۳۰ئیرۆیە ئیهانەی پۆلیس ۲۰۰ئیرۆیە شەق وەشاندن و کەلەگایی بە پیی زەبری شەقامەکان جەزاکەی پارەیە یان چەند مانگیك زیندانی بەچەکەوە چونەسەر خەلکی لە نیوانی ٥ تا ٧ سال زیندانییە جا ئەگەر حاکمیك بەریکەوت دەرسی لای تۆ خویندبیت و بەراستی یان بۆ سوعبەت حکومی ئەبەدی ئەوکەسە بدات(بەداخەوە بۆ تۆ کە لیرە حکومی ئیعدام نەماوە)ئەوا بە تاکید دوا حکومی دەبیت حەتمەن لە یاساکانی عیراقیش دا هەر ئاوا بە جیاوازی کەم تا زۆرەوە جەزاکان(حەق بە حەق)دیاری کراون بەلام جەنابتان لەسەر بنەمای چ پیوانەیەك حکومی ئیعدامی عمر عەرەبتان بوو؟ ئاخر تۆ قەرەقوشی سەردەمی یان فیرعەونی پۆست مۆدیرنی؟ من نامەویت لە سیاسەت و ململانیکەت زیاتر تیبگەم دەمیکە تیگەیشتومە ئەوقە ناعەتەی کە سیاسەتی تۆ بۆ چییە بەکورتی بریتییە لە نیو بەیتە شیعرەی مەحویەکەی بالخی ی دۆلی ی خۆمان کەدەلیت((وەکو سەگ ئەم شەرووشۆرە لە سەر لاك)) بەلام ئەمەوی لە کەسایەتی ئالۆزی

خۆت تیبگەم و بزانم بەچی روویەکەوە سەرباری تاوانباری و نەخۆشییە دەرونیەکانت دەتەویت ببیت پیشرەوی ئەم گەلە بەسەزمانە؟. تۆ لەپیش هەمووکەسیکەوە تاوان باری بە موماره سەکردنی پیشەی دادوەر ی بەبی هیچ بنەماو شەریعەتیك و تاوانی کوشتنی ئەسیرو پیشمەرگە بەبی وجودی دادگای شەرعی یاسای. هەرکوشتنیك لە دەرەوەی جەنگ و بەیەکدادان دابیت بەبی دادگایی کردن، تاوانە؟ پاش ئەوەی چەکی خیانەتت کردە شانی عمر عرەب بۆ تۆلەکردنەوە لە تۆ کە ئەو سوکایەتییەشت بەسەردا هینا، چەندین جار کەمینی بۆ دانایت بەلام بەداخەوە کاك ئازاد کەوتە کەمینەکەوە قارەمانێکی خۆڕاگر بە دەستی قارەمانێکی تری ناچار کراو بە خیانەت شەهید کراو تۆی مارتن لۆتەری کورد گەیشتیتە ئەم ڕۆژەی پۆزی ڕیفۆرمیان بەسەردا لێدەدەیت لە کاتێکدا لەو دەشت و شاخە وەك عمر بەشیری سەدامێکی حەجمی بچوك ڕەفتار دەکرد ڕاستە عمر عەرەب وەکو فەرد خۆی بەر پرسیارە بەرامبەر هەڵەو تاوان و خیانەتەکانی بەلام وەکو پاڵ پێوەنەر بۆ ئەو تاوانانە تۆ بەر پرسی یەکەمی ئەخلاقیت و پێویستە لێکۆڵینەوەت لەگەڵدا بکرێت و بە دادگادا بدرێیت ئەگەر کەمترین عەدالەت لە کوردستاندا مابێت هەرگیز لە یادم ناچێت کە پاش چەك دانان و دانیشتنم چاوم بە عمر کەوتەوە زۆر بەداخەوە بوو بۆ شەهید کردنی ئازادی سەر تیپ و دەیوت خۆزگە هەر کرێکارەکەی جاران بوومایەو بەردو چیمەنتۆو دەستی دادەڕزاندم و بەلام نەبوومایە بە پێشمەرگە ئەم ڕۆژەم بەخووە نەبینیایە دەستم نەچووایە خوێنی پێشمەرگەوە بەردەوام بە ناسۆرەوە دەیووت: لە کەسی ناشارمەوە کە تەنها ئامانجی خیانەتەکەم تۆڵە کردنەوەیە لە نەوشیروان من تەنها بەتەمای ئەوە بووم تۆڵەی سوکایەتی پێکردنەکانم سەباب کاری ئەوەی چەکی خیانەتی پێ هەڵکردم و تۆڵە لە نەوشیروان بکەمەوە بەلام بەداخەوە ئازاد کەوتە کەمینەکەوە نەوشیروان مستەفا باش بزانە تەنانەت چەتەکاری و ڕاوو ڕوت و پیاو کوژی سەرجەم تاوانەکانی عمر تۆ هۆکاری بوویت ئەگەر خوا لە ڕێ ی دایکی و باوکییەوە خالقی جەسەدی عمر ببوبێت تۆ ڕێکخراوو ئسلوبەکانت خالقی کردارەکانی بوو عمر وەك هەورێکی هاتبووە بەر دەستان بەلام ئێوە لەبری نان ژەهرتان لێ دروست کرد لە بەشی داهاتوودا باسی ناچار کردنی خۆم لەلایەن نەوشیروانەوە بۆ چەکدادان و گەڕانەوەو خۆشاردنەوە لە ڕژێم و شەهید کردنی جوامێری سەرتیپ و سێ پێشمەرگەی تر دەکەم بەفەرمانی ناڕەوایی نەوشیروان مستەفا .

## نەوشیروان مستەفا: ئەو پیاوەی بە تەنها حیزبێکی سیاسییە پارتی تووشی فۆبیای نەوشیروان بووە

### باگراوند

پارتی دیموکراتی کوردستان هەر لە سەرەتای دروست بوونییەوە، لە سەر دوو جەمسەری ئایدۆلۆژی رۆیشتووە،لە لایەك نەتەوەییە راستڕەوەکان و لە لایەکی دیکەوە، چەپەکان. بە مانایەکی دی، فیکری و نەتەوەییە موحافیزکارو نەتەوەییەکی چەپ خواز، کە سالآنی دواترو دوایی سەرکەوتنی شۆڕشی ماوی لە چین بەتەواوەتی شکڵی گرت و لەناو ریزەکانی پارتیدا، وەکو جەمسەرێکی بەهێز دەرکەوت.

مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستان لە سەرەتای دروست بوونییەوە، شایەتی ململانێ ی توندی نێوان ئەم دوو هیچزە بووە، بەتایبەتی لە نێو ریزی سەرکردەکانیدا، تا ساڵی(١٩٦٤) کە بەتەواوەتی هەردوو سەنگەرەکە لە یەکتری جیا بوونەوە. سەنگەری نەتەوەییە تەقلیدییەکان بە سەرۆکایەتی بارزانی، کە پێیان دەوترێت باڵی مەلا مستەفا. سەنگەری نەتەوەییە چەپەکان بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم ئەحمەد، کە بە باڵی مەکتەبی سیاسی دەناسرێت. لەم رووانگەیەوە، دەتوانین بڵێین لێکترازانی باڵەکانی پارتی، هەر بەتەنها بالکترازان نەبوو لەسەر دەسەلآت، بەڵکو لە جەوهەردا لێکترازانی فیکریش بوو.

بۆیە دواتر باڵی مەکتەبی سیاسی دەبێتە هەوێنی دروستبوونی بزوتنەوەیەکی چەپی نەتەوەی، کە لەناو نوخبەیەکی گەنجی ئەو باڵەوە سەر هەڵدەدات، ئەویش دروستبونی کۆمەڵەو ـ دواتریش دروستبوونی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.

هەرچی باڵی بارزانییە، لەو مێژووەوە ئاراستەی ئایدۆلۆژی خۆی بە پێچەوانەی فیکری چەپەوە ئاراستە دەکات و بەتەواوەتی پشت دەکاتە ئایدۆلۆژیای چەپ، هەر ئەمەش وادەکات کە بارزانی سڵ نەکاتەوە پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی وەك ئەمەریکاو ئیسرائیل بکات.

هەرچی باڵە چەپەکەیە، لە ئاستی ناوخۆیدا تووشی لێکترازانێکی فیکری دەبێت، بەتایبەتی لە سالآنی هەشتادا ئەم جیاوازییە ناوەکییە بەتەواوەتی پەرە دەسەنێت، کاتێك گروپی ئالآی شۆڕش(کە بە عێراق چیەکانیش ناو دەبرێن) دەردەکەون. لە ئاستی

دەرەکیشدا، ئەم باڵە دەبێتە هاوپەیمانی دووژمنەکانی ئیسرائیل و دەچێتە ناو بەرەی یەکگرتووی عەرەبییەوە.

باڵی ڕاست ڕەوی نەتەوەیی، کە دەشێت بەناسیۆنالزمی موحافیز کاریش ناوی بنەیین، ڕێبەرایەتییەکەی بە تەواوەتی دەکەوێتە دەست بنەماڵەیەك و سەرۆکایەتیکردنی حیزب، لە چوارچێوەی ئەو بنەماڵەیەدا دەهێڵرێتەوەو سەرۆك بە تەنها ئاڕاستەی سیاسەتی حیزبەکە دەکات و ململانێکانی سەرۆکایەتیش، هەر لە نێو ئەندامانی ئەو خانەوایەدەدا دەمێنێتەوە.

ئێمە هەوڵ دەدەین لەم ڕاپۆرتە شیکارییەدا، خوێندنەوەی دیاردەو ململانێ نوێیەکانی ناو ئەم دوو جەمسەرەی جولانەوەی کوردی بکەین، کە لە ڕێگەی چەند ئاڕاستەو کارەکتەرێکی نوێوە، گوزارشت لە خۆیان دەکەن.

## نەوشیروان، ئەو پیاوەی بە تەنها حیزبێکی سیاسییە

گەورەترین هەڵە ئەوەیە کە پێمان وابێت ململانێکانی ئێستای ناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، لەسەر هەمان ئاڕاستەی ململانێکانی ڕابردوو دەڕوات، ڕاستە یەکێتی لە سەرەتای دروست بوونییەوە لە سێ باڵی سەرەکی پێکهاتووەو بەدرێژایی مێژووی خۆیشی ململانێ ی نێوان ئەم سێ جەمسەرە بەرامبەر بەیەك و تەنانەت هەر جەمسەرە لەناو خۆشیدا هەبووە. بەڵام لە ئەمڕۆدا گەمەکانی ناو یەکێتی بەو شێوازە دابەش نابن و ناخوێندرێنەوە،ئەوانەی وا بیر دەکەنەوە ئەو باڵەی ناڕازییە لەناو یەکێتیدا، بریتی یە لە خەتی کۆمەڵەو بەهۆی دروست بوونی ئەم باڵەوە، ئەگەری هاتنەدەرەوەو خۆ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵە لە ئارادایە، چونکە ئەو هێزەی پێ ی دەوترا کۆمەڵە، دەمێکە حەل بووە، لەسەر دەستی ئەندازیارێك کە پێ ی دەوترێت نەوشیروان مستەفاو جگە لەناوەکەی و مێژوویەکەی، ئەمڕۆ شتێك نەماوەتەوە ناوی کۆمەڵە بێت، ڕەنگە ئەمە ڕستەیەکی ئازاراوی بێت بۆ هەندێك لەو یەکێتیانەی کە تا ئێستاش. بە یادگارییەکانی کۆمەڵەوە دەژین.

ئەمڕۆ جەستەی یەکێتی نەخشەی سیاسی نوێ و دابەشبوونی دیکە بەخۆوە دەبینێت، بۆ ئەوەی لێ ی تێبگەین، پێویست بەوە دەکات بەدوای سروشتی ئەو هێزانە بگەڕێین، کەلەجەستەی سیاسی ئەو حیزبەدا گەمە دەکەن، بەتایەتی نەوشیروان مستەفا کە لایەنێکی سەرەکی گەمەیە.

ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت نەوشیروان مستەفا، هێزێکە تەنانەت فراوانترە لەو شتەی پێ ی دەڵێن باڵی ریفرۆم، چونکەدەشێتڕیفرۆم بەشێك بێت لەوهێزەفراوانەی ئەمڕۆی یەکێتی کەپێ ی دەوترێت نەوشیروان مستەفا، بەڵام نەوشیروانمستەفا بۆ خۆی بەشێك نییەلە ریفرۆم، تەنانەت وەکخۆی دەڵێت، پەیوەندی پێیانەوە نییە.

بەپێچەوانەی ڕای خەڵکەوە، کەپێ ی وایە لەوەدا کە نەوشیروان مستەفا خۆی ناکات بە خاوەنی ریفرۆم، ڕاشکاو نییە، دەکرێت تێگەیشتنێکی دیکە بۆ ئەم بابەتە بخەینە ڕوو.

نەوشیروان مستەفا هەربەتەنها جیاوازییەکی سیاسی یان پلانێکی تاکێتی و گلەیەکی کاتی نەیهێناوەتە دەرەوە، بەڵکو ئاراستەیەکی فیکری و سیاسی جیاوازیش هێناویەتە دەرەوە، کە پەیوەندی بە تێڕوانینی ئەوە هەیە بۆ سیاسەت کردن و بەڕێو بردن و پێکهاتەی ئەو ستافەی کە دەتوانن ئەو بەرنامە سیاسیەی هەیەتی، لەگەڵیدا پراکتیزەی بکەن.

لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین ئەگەر یەکێتی لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە چەپکی نەتەوەیی بێت، ئەوا دەکرێت نەوشیروان مستەفا بە ناسیۆنالیزمێکی رادیکاڵ دابنرێت، هاوشێوەی ئەو سەرکردە ناسیۆنالیزمە ڕادیکاڵانەی دونیا، کە پێ یان وایە بنیاتنای دەوڵەت و گەیشتن بەخواستە نەتەوەییەکان لەسەر هەموو بەهایەکەوەو ئەم بەهایەش، بەهانە دەدات بەدەستەوە بۆ قوربانیدان بەهەر شتێك کە پێویست بکات. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، لەڕووی سیاسیەوە جەخت لە عەقڵی سەرکردەو سەرۆکی ڕزگارکەر دەکاتەوە، لە ژێر ئاڵای پاراستنی بەها نەتەوەییەکاندا، بەڵام لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، جەخت لە دابەش کردنی ژیان و گوزەرانی خەڵك دەکاتەوەو گەشەی ئابووری دەهێنێتە کایەوە. بەڵام بەهانەی لە ناوچوونی دەسکەوتە نەتەوەییەکان و ڕێگری لە خواستی دوژمن، ڕێگە بە فرەیی سیاسی نادات و دەنگە جیاوازەکان کپ دەکاتەوە بە بەهانەی ئەوەی کە ئاژاوە لە وڵاتدا دروست دەبێت و خواستی نەتەوەیی و ئامانجی نەتەوەیی دەکەونە مەترسییەوە. ئەم عاقڵییەتە چاوی لە ڕابردوو نییەو پراگماتییانە کاردەکات، بەڵام خەونی مێژوویی هەیەو چاوی لە هەموو ئەو نەتەوانەیە کە سەرکردەی ڕزگار کەر ڕێڕەوی مێژوویەکەی گۆڕین.

گریمان بیر کردنەوەی نەوشیروان مستەفا بۆ سیاسەت بەم جۆرە بێت، بەڵام نابێت ئەو ڕاستییە لەبەر چاو نەگرێت، کە سیستمی نوێی جیهانی و سیستمی گلۆبان، ڕێگە بەو

جوڵە مێژووییەی گۆڕان نادات، کەنەتەوە سەرەتا بە حاڵەتی ژێر دەستی و پاشان قۆناغی شۆڕشی نەتەوەیی و پاشان دیکتاتۆرییەتی ناسیۆنالیزم و پاشان دەوڵەتی دیموکراتی بڕوات.

ڕاستە نەوشیروان مستەفا بۆخۆی کەسایەتییەکی بەهێزوو کاریگەرە، تەنانەت دەشێت بڵێین بەتاقی تەنها بۆخۆی باسێکی سیاسییە، بەبێ ئەوەی لە چوارچێوەی ڕێکخراوێکی سیاسیدا کاریگەری هەیە لەسەر باروو دۆخی ناوخۆیی، قورسایی ئەو پەیوەندییە نییە بەو دەزگا ئیعلامییەوە کە لەژێر ناوی ئەودا کاردەکات، بەڵکو قورسایی ئەو پەیوەندییە تەنها بە خۆی و کەسایەتی خۆیەوە هەیە، کە هەمووان وەك سەرۆك لێ ی دەڕوانن.

قودرەتی نەوشیروان مستەفا بۆ ناچارکردنی دەوروبەرەکەی و تەنانەت بەرامبەرەکانیشی، کە وەك سەرۆکێك تەماشای بکەن، ئەفسانەی نەوشیروانە هەر ئەوەشە ئەو شتەی کە پێ دەوترێت{سامی نەوشیروان} و هەموو لایەکی ترساندووە، ڕەنگە ئەمە هۆکاری سەرەکی بێت، کە جگە لە ڕیفرۆمییەکان، باڵی کۆسرەت ڕەسوڵ قبوڵیان بێت و تەنانەت بەشێکی زۆریش لەو سەرکردانەی کە لەسەر باڵی مام جەلال حیساب دەکرێن، لەهەوڵی نزیك بوونەوە لێ یو سافکردنی حیسباتی خۆیانن لەگەڵیدا.

گەورەترین هەڵە ئەو پرسیارەیە کە دەڵێت: ئایا نەوشیروان دێتەوە سەر شانۆی سیاسی؟ چونکە لە ڕاستیدا نەوشیروان لە تەختەکە دوورنەکەوتووەتەوە، بەڵکو ڕۆڵی خۆی لە چوارچێوەی شانۆکەدا گۆڕیوە، هەرچەندە نەوشیروان تا ئێستا ڕایدەگەیەنێت کە ئەو دانیشتووەو خەریکی بەڕێوبردنی کۆمپانیایەکی ئیعلامییە. بەڵام ئەم قسانەی بۆ هیچ کەسێك و لای هیچ گروپێکی سیاسی، جێگەی باوەڕ نییە. هەمووان لەو باوەڕەدان نزیك بێت یان دوور، زوو بێت یان درەنگ، نەوشیروان مستەفا دێتەوە مەیدان و وەك هێزێکی بەهێز خۆی بەیان دەکات.

ئەگەر شتی وا لەخەیاڵی نەوشیروانیشدا نەبێت، بەڵام بێدەنگییەکەی و چاودێریکردنی ووردی بارودۆخەکە لەلایەن ئەوەوە ئەو گومانەی لەلای هەموو لایەك دروست کردووە، کە ئەو ڕۆژە دێت نەوشیروان ئیعلانی مێژوویەکی نوێ دەکات. بەلای هەندێك کەسەوە، ئەو مێژووە دەکەوێتە نزیکترین کات لە دوای مەرگی تاڵەبانییەوە، ئەو کاتە سەری هەموو گوریسەکان دێنەوە دەستی نەوشیروان، ئەگەر بێت و مەیلی بێت ڕۆڵێکی لەو جۆرە ببینێت، ڕوودانی ئەم ئەگەرە زۆر نزیکە، بەمەرجێك نەوشیروان نەگەیشتبێتە ئەو بڕوایەی کە خۆری مێژووی ئەو، ئاوا بووەو ئەو دەرفەتە نوێیە نایگەیەنێتە خەونەکانی. چونکە

نەوشیروان مستەفا لە ژیانیدا ئەوەی سەلماندووە کە ئەوەی بۆ ئەو گرنگە. گەیشتن بە لوتکەی دەسەلاّت نییە، بەڵکو هاتنەدی خەونەکانێتی، ئەمەش زیاتر لەوەی وەسفێك بێت لە بارەی ئەوەوە، حەقیقەتێکە. چونکە ڕێگە لە نێوان خەونە حەقیقەکانی سەرکردەیەك و میللەتێکدان جیاوازی گەورەی هەبێت.

پارتی دیموکراتی کوردستان کە ئێستا گەورەترین پارتی کوردستانەو توانیویەتی یەکێتی بخاتە چوارچێوەی ستراتیژییەتی خۆیەوەو بچوکیان بکاتەوە. گەورەترین مەترسی ئایندەی نەوشیروان مستەفایە. لە ئێستاشدا بەوردی حیساب بۆ هەنگاوەکانی دەکەن، تەنانەت گەیشتووەتە ڕادەیەك پارتی توشی فۆبیای نەوشیروان بووە. بچوکترین خۆ پیشاندان، کەمترین نارەزایی، لەو پەڕی هەرێم ڕوو بدات، پێ ی وایە دەستی نەوشیروانی تیایە. بەلای پارتییەوە نەوشیروان مستەفا دیوار بەندی کۆتاییە لە پرۆسەی کۆنترۆڵ کردنی کوردستانداندان ئەگەر بێت و پارتی ئەم بەربەستەش ببڕێت، ئەوا کوردستان هی خۆیەتی. بەلاّم ئایا نەوشیروان مستەفا ئاسان دەبێت بۆ پارتی؟ بە پێ ی ئەو زانیاریانەی کە لەبەر دەستدان، پارتی بەهەموو شێوەیەك لە هەوڵی ئەودایە کە ئایندەی یەکێتی نەکەوێتە دەست نەوشیروان مستەفا، تەنانەت بەشێوازی تایبەتی خۆ پیشتگیری ئەم ستراتیژە دەکات و لەم پێناوەشدا سەرسەختترین نەیارەکانی دوێنێیدا، ئاشت بوونەتەوە موجامەلەیان دەکات و لەدوا هەڵبژاردنی یەکێتیشدا، پارتی ڕۆڵی هەبووەلە شکاندنەوەی یارییەکە بە زیانی نەوشیروان مستەفا.

پارتی ئێستا خۆی گەیشتۆتە ئەو بڕاوەیەی کە ڕاگرتنی بارودۆخی یەکێتی، بەم شێوەیەی ئێستا لە قازانجی ئەوەو دروست بوونی هەر لێکترازان و فەوزایەك لەناو یەکێتیدا، بە زیانی ئەو دەشکێتەوە، دیارە لەمەدا هەتا یەك ڕێگای لەپێشە بۆ ڕێگەگرتن لە بالاّ دەستی نەوشیروان مستەفا، ئەویش دەستگرتنە بەتەمەنی مام جەلالەوە، کەشتێکی نامومکینە.

تەنانەت پارتی لە هەوڵی ئەوەدایە خۆی بۆ ئەگەرەکانی دوای بالاّدەستی نەوشیروانیش ئامادە بکات، لە ڕێگەی ڕێکەوتنی پێشوەخت لەگەڵ ئەو هێزانەی کە ڕەنگە لە داهاتوودا ببنە هاوپەیمانی نەوشیروان.

هەرچی سەبارەت بە حیزبەکانی دیکەیە، بەتایبەتی ئیسلامییەکان، دوو دڵن لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو دیاردەیەی پێ ی دەوترێت نەوشیروان، لەلایەك دەترسن کە پارتی

ڕەنگە لە داهاتوودا لیستی هاوپەیمانەکانی لەسەر بنەمای نزیك و دووری لە نەوشیروانەوە دابنێت. لەلایەکی دیکەشەوە، لەبەر سیفاتێك کە لە خوودی نەوشیروان مستەفادا هەیە، ئەویش قبوڵنەکردنی هێزی دیکەیە وەك شەریك لە پرۆسەی سیاسی و تەنانەت ڕزگاری نیشتیمانیدا، بە تایبەتی کە نەوشیروان مستەفا سەرکردایەتیی هەموو ئەو شەڕانەی کردووە کە یەکێتی لە مێژووی خۆیدا بەرامبەر نەیارەکانی کردوویەتی. ڕەنگە ئەوە بەشێك بێت لە ڕابردوو، بەڵام پێویستە لەسەر نەوشیروان مستەفا لە ستراتیژە نوێیەکەیدا ئەگەر دەیەوێت یاریکەرێکی تەنیا بێت، گرەنتی پێشوەخت بدات کە لە پێناو ئامانجەکەیدا شەراکەت و هاوبەشی هێزەکانی دیکە قبوڵ دەکات.

دوو خاڵ کە زۆر یارمەتیدەرە بۆ نەوشیروان مستەفاو بۆ هەر هێزێکی تریش، کە بتوانێت وەك بەدیل دەربکەوێت،بارو دۆخی ناوخۆی هەرێمە لە ئاستی ناوەوەو دەرەوەیدا، لە ئاستی ناوخۆدا بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی تەقلیدی یەکێتی و پارتی شکستیان هێناوە لە پێشکەش کردنی نمونەیەکی جوانی حکومڕانی، کە تیایدا دادوەری کۆمەلایەتی و مافەکانی مرۆڤ و کەرامەتی مرۆڤی کورد پارێزراو بێت و شکستیان هێناوە لە پرۆسەی بنیاتنانەوەی ژێرخانی ئابووری و بوژاندنەوەی وڵات و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی هاوڵاتیان و دابینکردنی خزمەت گوزاری بۆیان، بەجۆرێك کە خەڵك لێ ی ڕازی بن. لەسەر ئاستی دەرەوەش شکستیان هێناوە لە گەیاندنی بارو دۆخی هەرێم بە سەقام گیری سیاسی دوور خستنەوەی مەترسییەکان لەسەری و داخوازی و مافە نەتەوەییەکانی هەرێم، کە بێگومان ئەگەر بەشێکی بەهۆی سیاسی پەیوەندی بە خراپی ئەدای سیاسی ئەوانەوە بووە.

خاڵێکی دیکەش، ئەجێندای سیاسی ئەمەریکایە کە بەئاشکرا لە چەندین شوێن ئەوەیان وتووە، کە ئەوان پشتگیری لە بوونی هێزێکی ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی دەکەن.

بەلام دوو خاڵی گرنگ ڕێگرن لەبەردەمیدا یەکەمیان پەیوەستە بە تێڕوانینی نەوشیروان مستەفاوە بۆ ئازادی و دیموکراسی و ڕای جیاواز، کە وای کردووە وەك سەرکردەیەکی لیبڕاڵ حساب نەکرێت و دڕدۆنگی لەلایەن بەشێکی خوێندەوارو ڕۆشنبیران دروست کردووە لە پشتگیری کردنی پرۆژە سیاسیەکەی.

خاڵی دووەمیش ئەوەیە: لەمڕۆدا سیاسەت کردەیەکی ڕۆمانسیانەی زەمەنی ڕۆمانی و یۆنانییەکان نیە، بەڵکو لە ئەمڕۆدا سیاسەت پشتی ئابووری و پارە بەڕێوە دەچێت کە

گومان لەم ڕووەوە، نەوشیروان مستەفا بە بەراورد بە پارتی و باڵەکانی دیکەی یەکێتی، زۆر لاوازەو تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، بە تەبەروعاتی مام جەلال دەژی.

هەرچەندە ئەو لەمەدا وەك خاوەن ماف پارە لە یەکێتی وەردەگرێت و کۆمپانیاکەی و پرۆژەکەی پێ دەژێنێت، بەڵام ئەمە خۆی لە خۆیدا گەورەترین گرفتی بەردەم پرۆژەکەیەتی.

## کێ ئاشەکە دەگێڕێت کۆسرەت ڕەسوڵ یان نەوشیروان مستەفا

هیچ هێزێك نییە باوەڕ بە نەوشیروان مستەفا بهێنێت دەست لەبیروڕاکانی خۆی هەلگرێت، ئەگەریش ڕککەوتنەکەی پارتی و یەکێتی هەڵبوەشێتەوە یان بەشێکی زۆری دەرگاکان بۆ نەوشیروان بکرێنەوە لەناو یەکێتیدا، ئەو لەسەرئەو باوەڕانە خۆی سوورە، کەدەبێت هەڵبژاردنەکانی ئەمجارە زۆر جیاوازبن و لیستی خۆی بخاتە بەردەم ئەو تاقی کردنەوەیە.

ڕەنگە ئەمە دواهەمبن وێزگە بێت بۆ نەوشیروان مستەفا کە بیەوێت دەنگ و هێزی خۆی تاقی بکاتەوە. بەدیوێکدا نەوشیروان پێ ی وایە گەڕانەوەی بۆ یەکێتی لە ئێستادا گەڕانەوەیە بۆ ناو ئەو فەزاییەی کە پڕە لە کارەساتی گەندەڵی و پێویستی بە چاك سازی هەیە، بۆیە چونە دەرەوەکەی تەنها وێزگەیەك نییە بۆ دوور خستنەوە لەو وێزگە پڕ لە نیگەرانییە کەناوی یەکێتییە، بەڵکو شانسێکەو لە دەرەوەی قودەری یەکێتی بوون نەوشیروان خۆی تێدا تاقی دەکاتەوە، لیستەکەی نەوشیروان ئەگەر تەنها وەزیفەی ئەوەبێت وێنەیەکی تری یەکێتی دەردەخات ئەمە ئەفسەرێکی هەڵەیە بۆ ئێستای ئەو پیاوەی لە دەرەوەی یەکێتی دەژیت و خۆی نابەستێتەوە بەحیزبەکەی خۆیەوەو ئەو فەزای حیزبەکەی بە دڵ نییە، بۆیە دوور کەوتنەوەی پێ باشترە لەمانەوە، خۆبەستنەوەکەشی تەنها نیگەرانییەك لە خودی یەکێتی، بەڵکو نیگەرانییە لەو سیستەمەی کە ڕێگەی ئەو و خەونەکانی ئەوی تێدا نابینێتەوە،هەر ئەمەشە وا دەکات لیستێکی هەبێت جگە لە لیستەکانی دی، دابەزاندنی ئەو لیستە بۆ نەوشیروان دابەزاندنی دوا هەنگاوی سیاسەتی لەناو گۆڕەپانەکەدا.

ڕەنگە لای نەوشیروان کۆمەڵێك وێزگەی شکست و هەڵسانەوە هەبێت، هەڵبژاردنی ئەمجارە یەکێکە لەو وێزگانە جارێکی تر بە ڕەنگێکی تر نەوشیروان دەهێنێتەوە ناو گۆڕشەپانەکە، بەڵام نەك بەو وێنانەی پێشتر بۆیان درووست کرابوو یان ئەو وێنانەی لە

ڕێگـەی حیزبەکەیـەوە خـۆی تـەحقیق دەکـرد، بـەڵکو بـە وێنەیـەکی تـرەوە کـە خـۆی نیگارکێشی وێنەکەیە،نـەك یـەکێتی نیگار کێشی بێـت، جیاوازییەکـەش لـەوەوە دەسـت پـێ دەکات کـە لیـستەکەی نەوشیـروان لـە بـری پڕۆژە،مانیفێـستی دەبێت،مانیفێـستەکەش داوای ژیان دەکات بۆ هاولاَتیانی کورد نـەك ئەو دروشمانـەی پـارتی و یـەکێتی لـە هەڵبژاردنەکانـدا بـۆ چاو بەسـتی خـەڵك بـەکاری دەهێـنن، وەك نمونـەی یـا کـەرکوك و خانـەقین"، ڕاسـتە گەڕانەوەی کەرکوك و خانەقین یەکێکە لە خاڵە جەوهەرییەکانی سیاسەتی کورد، بەلاَم پـێ دەچێت ئەمجارە ئەو درووشمە حیزبییانە نەبنـە دەرگایـەك بـۆ سەرنجڕاکێـشانی خـەڵك لـە لیـستەکەی نەوشیـروان مـستەفادا، بـەڵکو بیـەوێت لـە مانفێستەکەدا بانگـەوازی ئـەوە بکات هاولاَتییان پێویستییانبە ژیانەوە لە بـری دروشمـە کۆنـەکان دەبێـت ژیانیـان پـێ ببەخشین نەك حەماسەت.

ئێمە دڵنیـاین لیـستەکەی نەوشیـروان کۆمـەڵێك خـاڵی جیاوازی تێـدا دەبێـت کـە بـەهیچ شێوەیەك لەگەڵ لیستی پارتی و یەکێتی و حیزبـەکانی تـر یـەك ناگرێتـەوە، لەوانەیـە ئـەو خالاَنەی کاندیدێك بـۆ لیـستەکەی نەوشیـروان دیاری دەکـات هێنـدە دوور بـن لـە خاڵەکانی پارتی و یەکێتییەوە کە ئاسمان و ڕێسمان بێت. ئەکرێت بڵێی خاڵە جەوهەرییەکانی لیستی نەوشیروان بریتینلەوەی، کەسی کاندید کراو دەبێت مووچە خۆری حیزبـی نـەبێت، دەبێـت بڕوانامـە یـان شـارەزایی هـەبێت، دەبێـت پێـشتر پۆسـتی وەرنـەگرتبێت، دەبێـت بـە لایـەنی کەمەوە گەنـج بێت،ئەمانەو چەندین خـاڵی تـر کـەلێرە باسـی نـاکرێن دەبێتـە هـۆی ئـەوەی سەرنجی بەشێکی زۆری کۆمەڵگە کـە زیـاد ":لـە ملیۆنێـك و نیـوی " گەنجە بـۆ لیـستەکەی ڕابکێـشێت و شانـسی سـندوقەکانی دەنگـدان یـۆ خـۆی مـسۆگەر بکـات. جگـە لـەوەی لـە مانیفێستەکەدا حەتمەن دەست بۆ ئەو خاڵە ڕەشانە دەبرێت لە ڕابـردوودا لـە نـاو سیـستمی دەسەلاَتی کوردیدا بوونیان هەبووەو کار بکرێت بۆ لابردنیان.

پەیامی نەوشیروان مستەفا ئەمجارە لەم جۆرە پەیامەیە ئاوازەکـەی لـە هـی هـیچ کـام لـە پارتی و یەکێتی ناچێت، پارتییەکانیش ترسێکی زۆریـان لـەم هـەنگاوەی نەوشیـروان هەیـە، بۆیە هەمیشە چاودێری بچوکترین گۆڕانەکانی ناو یەکێتی دەکـەن. هـەنگاوەکانی ئـەمجارەی کۆسرەت ڕەسوڵیش هێندەی تر ئەو گۆڕەپانەی تووشی ئەو بومەلەرزەیە کرد کـە چاوەڕوان دەکرا ڕوویدات، هەڵوێستی کۆسرەت ڕەسوڵ لەسـەر خاڵـە ناکۆکـەکانی یـەکێتی هەڵوێـستێك بـوو هـەم جەسـورانە بـوو، هـەم جێگـەی نیگـەرانی بـوو لای بەشـێکی پـارتی و یـەکێتی.

پارتییەکان پێ یان وایە دوورکەوتنەوەی کۆسرەت ڕەسوڵ لەناو یەکێتی گوزەرێکی کوشندەیە لە بڕبڕەی پشتی تاڵەبانی، بۆیە ئەوەندە بەلایانەوە گرنگە کۆسرەت ڕەسوڵ لە ناو گەمەکەدا پشتی تاڵەبانی بگرێت ئەوەندە بە لایانەوە گرنگ نییە جەمسەرەکانی تره یەکێتی پشتی بگرن، چونکە پارتییەکان ململانێ هەڵبژاردنەکان لەناو هەولێردا دەبینن، پێ یان وایە سلێمانی یەکێتی تەحەکومی پێوە دەکات و دهۆك پارتی ئاراستەی دەکات، ئەوەی گرۆڕەپانەکە یەکلایی دەکاتەوە هەولێرە، هەولێریش لەسەرئاستی یەکێتی واتە کۆسرەت ڕسوڵ،چونکە بەشێکی زۆری هەولێرییەکان بەستراون بە کۆسرەتەوە، ئەوە کۆسرەت لەناو هەولێردا دەبێتە وزەی یەکێتی نەك یەکێتی بێت وزە بەکۆسرەت بدا لەشارەدا، لە دەستدانی ئەم شارەش بەنیسبەت پارتیەکانەوە لە دەستدانی بەشێکی جەستەی حیزبە. گەر دەرچونی کۆسرەت رسوڵ لەپشت تاڵەبانیەوە ببوایەتە ئەمرێکی واقعی، هەم ئاراستەی ڕێککەوتنەکەی پارتی و یەکێتی دەگۆڕا، هەم ئاراستەی سندوقەکانی دەنگدانیش دەگۆڕا، گەڕانەوەی کۆسرەت چەند بۆ تیمەکەی تاڵەبانی گرنگ بوو هێندەش بۆ پارتییەکان گرنگ بوو، ئەگەر کۆسرەت ڕەسوڵ ئەم جارە هاوپەیمانی لەگەڵ نەوشیروان بکردایەو پێکەوە لیستێکیان دابەزاندایە ئێمە دڵنیا دەبووین لەوەی پارتی ڕێککەوتنێکی لەگەڵ ئەو لیستە دەکرد نەك لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی، بەلاّم مانەوەی کۆسرەت لە ئەمجارەدا دیسان قەوانەکە وەك خۆی لێهاتەوە بۆ پارتی، بۆیە کاتێك تاڵەبانی خاڵەکانی کۆسرەت ڕەسوڵ و تیمی ڕیفۆرمی مەکتەبی سیاسی قبوڵ کرد ئاهێك بەخەونەکانی پارتیدا هاتەوە، هەنگاوەکەی کۆسرەت ڕەسوڵیش جگە لەوەی هەنگاوێکی جەرگ برانە بوو بۆ یەکێتی، دەرخستنی ئاستی هێزی خۆیشی بوو بۆ هەردوولا. دەبینین کاتێك نەوشیروان لە ناو یەکێتیدادەچێتەوە دەرەوە تەنها کۆمەڵێك لەو کادیرو هەودارانە دەبات لەگەڵ خۆی گورزی کوشندە ناگەیەننە بەر کەمەری یەکێتی، بەلاّم کاتێك کۆسرەت ڕەسوڵ کارتی بەهێزی خۆی بەرز دەکاتەوەو دەڵێت دەچمە دەرەوە، ٢١مەڵبەندو ١١ئەندامی سەرکردایەتی دەبنە ئەو لەشکرەی لە پشتییەوەن و بەو ئاراستەیەدا دەچن ئەو دەیەوێت، دەرخستنی ئەم هێزەش بۆ ئێستای یەکێتی کارتێکی کەمەر شکێنە، چونکە خانەوادەی تاڵەبانی بەهەموو شێوەییەك دەیانەوێت بڵێن یەکێتی هی ئێمەیە هی یەکێتییەکان نییە، ئەم مۆدێلی بیرکردنەوەو قسانە وا دەکات لە یەکێتییە بەهێزەکان کارتی خۆیان بەرز بکەنەوە تا دەری بخەن یەکێتی هی یەکێتییانە، نەك هی خانەوادەیەك.

ئەمـە یەکـەم جـارە بـەو شـێوە فراوانـە ئاسـتی سـەرکردایەتی یـەکێتی هەڕەشـەی دوورکەوتنەوە بکات، بەڵام ئەم کارەی تیمی مەکتەبی سیاسیو کۆسرەت ڕەسوڵ کردیان یەکێك بوو لەو دەروازە گرنگانەی دەکرێت بڵێت یەکێتی حیزبە، وەحدەی حیزبی لەناو یەکێتی دا بوونی هەیە، چونکە حیزب دەبێت ئاوا بێت، نەك هەموو کێشەکانی خۆی بخاتە ژێـر پـەردەوەو نەیانخاتـە دەرەوەی خـۆی. هـەروەها بەرزکردنـەوەی کـارتێکی زەردی وەك ئەوەی کۆسرەت ڕەسوڵ و تیمی ڕیفۆرمی مەکتەب سیاسی دەروازەیەکە دەتوانین بڵێین لەم دەروازەیەوە خەریکە لە کوردستان مۆدێلی حیزب درووست ببێت. ڕەنگە هەمان کێشە لە نێوان پارتی یان حیزبە ئیسلامییەکانیشدا هەبێت، وەلێ بەد بەختی ئەوەیە هیچ کام لەو حیزبانە ناتوانن لە ژێـر سـێبەری بیرکردنـەوە خێڵەکییەکانـدا سـەردەربهێنن بۆیـە هـەموو شتێك پەیوەستە بـە سـەرکردەوە، بـەڵام کارتـە زەردەکـەی ئـەمجارەی تیمـە نیگەرانەکـەی یەکێتی دەیەوێت بەهەموو قەیرانییەکانی خۆیەوە جۆرێکی تر لـە حیزبمـان پیشان بـدات، ئـەم جـۆرەی حیـزبیش دەبێتـەوە دەروازەیـەك بـۆ دەرخسـتنی کێشەکانی تـری نـاو حیزبـە کوردییەکان، ئەو کێشانەی بە متکراوی ماونەتەوەو دەرنەکەوتوون.

ئەو تیمەی باڵی ڕیفۆرمکە لەگـەڵ نەوشیروان مـستەفادا چونەتە دەرەوە هەمـشە پێیـان خۆشـەیەکێتی بـەرەو ئـەو ئاڕاسـتەیە بـچێت پرۆژەکـەی ئـەوان دەیگرێتـەوە، تیمەکـەی تاڵەبانیش واپیشان دەدەن یـەکێتی هـەر یەکێتییـە بەهێزەکەیـەو چوونی نەوشیروان هیچ کاریگـەری لەسـەر بـەهێزی ئـەم حیزبـە نییـە، لەهـەردوو حاڵەتەکـەدا هـەردوو بۆچونەکە تەندرووست نین، چونکە نەیەکێتی دەتوانێت ئەو یەکێتیە بێت نەوشیروان داوای دەکات،نـە یـەکێتی بـەبێ نەوشـیروان یەکێتییـەکی بـێ خەوشـە، جگـە لەمـەش لـە نێـوان ئـەم دوو جەمـسەرەدا کۆسـرەت ڕەسـوڵ بوومـە لەرزەیـەك بـوو هـیچ لایـەکمان باوەڕمـان نـەدەکرد دوورکەوتنەوەی ئەو جەمـسەرە لـە یـەکێتی ئـەو بوورکانـەی لێبکەوێتـەوە، بـەڵام نامەکـەی ئەمجارەی کۆسرەت ڕەسوڵ بەیەکێتی ووت: بـۆ یـەکلایی کردنـەوەی قەیرانـەکان تیمـی سـێ هەم کە جەمـسەرێکی گرنگـی کێـشەکانە بـوونی هەیـەو هـەرکاتێك بمانـەوێت قورسایەکەی دەردەخەین، ڕەنگە کۆسرەت ڕەسوڵ بـە بـەرز کردنـەوەی ئـەم کارتـە زەردە کۆمـەڵێك شتی کردبێـت، یەکـەم تـوانی قـودەری خـۆی لـەناو حیزبەکەیـدا دەردەخـات دووەم تیمەکـەی نەوشیروان جارێکی تـر بوونـەوە دۆسـتی هاوڕێکـە یـان، سێ هـەم دەسـەڵات لـە شـوێنێکەوە گواسـتەوە بـۆ هـەموو مەکتـەب سیاسـیەکان، چـوارەم ئاڕاسـتەی بیرکردنـەوەی تیمەکـەی

تاڵـەبانی لـە دۆڵێكـەوە گواسـتەوە بـۆ دۆڵێكـی دی. هەرچـەندە هەڕەشـەی دەسـت لـە كاركێشانەوە نـەبوو لـە خـودی یوكێتی، بـەڵكو هەڕەشـەی دەست لـە كاركێشانەوە بـوو لـە خانەوادەیـەك، یـان لـە تیمێـك كـە دەیـان وویـست ئیحتیكـاری یـەكێتی بكـەن، بـەلام خـاڵی گرنگیش لەگەڵ خۆی هێنا بۆ یەكێتییەكان.

ئەو خاڵانەش هەر سێ لا لەسەری ڕێككەوتووون بـریتین لـەو خاڵانـەی كـۆی پێكهاتـەكان دەگۆڕێت، دوورخستنـەوەی نەوشیروان لەناو یەكێتی هەم خەونی بەشێكی پارتییەكانە هـەم خەونی تیمەكەی تاڵەبانییە، بەتایبەتی ئەوانەیان بەردەوام قسە لەسـەر نەوشـیروان دەكـەن و عوقدەی كۆنیـان هەیـە لەگـەڵ ئـەم كاراكتـەرەداو ئـەمڕۆ بەشێوەیەكە دی دەری دەخـەن، بـەلام كۆسـرەت ڕەسـوڵ تیمـی ڕیفـۆرم ئـەمجارە توانیـان فەزایـەك دروسـت بكـەن كـە هـیچ هێزێك نییە بتوانێ كار بۆ ئەوە بكات نەوشیروان مستەفا لە نـاو یـەكێتی بكاتـە دەرەوە، لـە حاڵەتێكیشدا گـەر نەوشـیروان نەهێننـەوەو لیـستی خـۆی هـەبێت، لای یەكێتییـەكان ناكاتـە ئـەوەی بخرێتـە دەرەوەی یـەكێتی، بـەلام نەوشـیروان هـیچ بەلایـەوە گـرنـگ نییـە مەكتـەبی سیاسی یەكێتی لەسەرمانەوەو نەمانەوەی ئەو چ بڕیارێـك دەدەن، چونكە ئـەو پـێ ی وایـە سەرقالی یەكێكی ترەو ئەو خەونەی كە دەیەوێت لەم هەڵبژاردنەدا كاری پێ بكات گـرنگترە لە بڕیارەكانی مەكتەبی سیاسی یەكێتی.

خاڵێكی تری ڕێككەوتنەكە كە كەمكردنەوەی دەسەلاتی سێ ئاشووبەكەی نـاو یەكێتییـە، كەهـەر یـەك لـەو سـێ ئاشـوبە بـەردەوام كـار بـۆ ئـەوە دەكـەن لێكترازانـی نێـوان سـێ جەمـسەرەكەدا ڕووبـدات و ئـەوان بتـوانن لـەو لێكترازاتـەدا ببنـە جەمـسەر بۆیـە ئەگـەر تیمەكـەی نەوشـیروان لـە ئێـستادا نیگـەران بـن لـەوەی كۆسـرەت ڕەسـوڵ لـەناو یەكێتیـدا دەمێنێتەوە سەد هێندە ئەو سێ ئاشوورە نیگەرانن لەوەی ڕێككەوتنێكی لەو جۆرە لە نێوان تاڵەبانی و كۆسرەت ڕەسوڵدا ڕوویداوە.بەلام ئـەوەی بـەهێزی تاڵـەبانی و لـەم ڕووداوەدا دەر دەخـات ئـەو خاڵەیـە كەبەشـێكی زۆری یـەكێتی چـوونە دەرەوە و تاڵـەبانی ئامـادە نـەبوو تەنانـەت یـەك هـەنگاو كورسـیەكەی سـەرۆك كۆمـاری بـەجێبهێڵێت، ئـالێرەدا تێدەگـەین سەركردایەتی تاڵەبانی لە كاتی قەیرانەكانیدا جۆرێكە لەو سـەركردایەتی كردنـەی دەتـوانێ بەسەر قەیرانەكانیدا باز بدات.

یەكێك لەو خاڵە گرنگانەی لەو ڕێككەوتنەدا بەدی دەكرێت گەڕانـەوەی ئـابووری حیزبـە بۆ حیزب، واتە ئەو برە پارەیەی یەكێتی وەریدەگرێت دەبێت بگەڕێتەوە بۆ یەكێتتییەكان،

واتە لێرەوە تێدەگەین پێش وەم ڕێککەوتنەو بەکارهێننانی ئەم فشارەی کۆسرەت ڕەسوڵ و تیمی ڕیفۆرم بۆ سەر تاڵەبانی ئابووری حیزب لەدەست یەکێتییەکان نەبوو، بەڵکو یەکێتییەکانیش وەك هەموو هاولاتییەکی تری ئەم وڵاتە بەشیان دراوە، ئەوە یەکێتییەکان نەبوون تەحەکوم بە ئابووری حیزبەکەیانەوە بکەن، بەڵکو خانەوادەیەك بووەتە خەزێنەی حیزب، ئەگەر بوومەلەرزەکەی ئەمجارەی کۆسرەت ڕەسوڵ تیمی ڕیفۆرم گۆڕانێکی سەرتاسەری لە ناو پێکهاتەی حیزب دروست نەکرد بێت، توانی کۆمەڵێك گۆڕان لە بەشێکی تری حیزبدا دروست بکات، سەندنەوەی بودجەی حیزب لە دەست کۆمەڵێك کەس و ئاشکراکردنی ئەو بودجەیەو دانانی بەیەکێتییەکان گۆڕانە لە ژیانی ئێستای یەکێتی، دیاری کردنی دەسەلاتەکان بەشێوەیەکی یاسایی لەناو حیزبدا گۆڕانە، چونکە پێش ئەم بوومەلەرزەیە هیچ کام لە مەکتەب سیاسیەکان دەسەلاتیان نەك هەر دیار نەبوو، بەڵکو تیمەکەی تاڵەبانی دەیانتوانی هەموو شتێك بکەن، بەلام تیمەکانی تر هەقی ئەوەیان نەبووئەو شتانە بکەن، پاشان لەم فشارەی کۆسرەت ڕەسوڵ و تیمی ڕفۆرم مۆمی بەشێکی زۆری سێ ئاشووبەکەی تیمی تاڵەبانی کە لەناو یەکێتیدان کوژایەوە، ئیدی پێ دەچێت ئەوە ئەوان نەبن شەڕی تیمەکانی تر بکەن و هیچ لایەك نەبێت ڕێگەیان لێبگرێت و ئیدی ناتوانن پەلاماری تیمەکانی تر بدەن بەو ئاوازەی خۆیان دەیانەوێت، بەڵکو دیوارێکیان بۆ دروست کراوەدەبێت لە پشت دیوارەکانەوە شەڕبکەن نەك لە بەردەم دیوارەکەدا.

گەڕانەوەی ئەو یەکێتییە دەرکراوانەی کەتیمەکەی تاڵەبانیە ئەو شوناسەیان لێوەردەگرتنەوە یەکێکی ترە لەو خالانەی یەکێتی گەڕاندەوە بۆ یەکێتی گەڕاندەوە بۆ یەکێتییەکان و ئەو هەقەی لەتیمی تاڵەبانی سەندەوە بە پێ ی تەکەتولات شوناسی یەکێتی بوون بەسەر یەکێتییەکان دا دابەش نەکەن، بۆیە دەکرێت بڵێین فشارەکەی کۆسرەت ڕەسوڵ و تیمی ڕیفۆرم فشارێك بوو بۆ ئێستای یەکێتی لە جێگەی خۆیدا بوو، ئەگەر ئەم فشارە ڕووی نەدایە ئیدی یەکێتی بەرەو ئاقاری بنەماڵە بوون دەچوو، چونکە لەم دوایانەوە یەکێتی گەیشتبووەبنبەست و تیمێك یەکێتی بەڕێوەیان دەبردوو بەرەکە لە ژێر هەموو یەکێتییەکانی دەرەوەی ئەو تیمە دەرهاتبوو، ئەگەر ئەم جارە ماڵێك دروست کرا بێتو ناوی نرابێت یەکێتی و هەموو ڕەنگەکانی لەناو خۆیدا خۆی کۆکردبێتەوە لەو هەنگاوەوە دەست پێدەکات تیمی مەکتەب سیاسی هاویشتیان. بەڵام ئەگەرڕێککەوتنەکان تەنها دەنگی ڕاگەیاندن بێت و لەپشت ڕێککەوتنەکانەوە جارێکی دی ئاوازە کۆنەکان دووبارە بکرێنە

دوور نییە یەکێتی لەبەرگە بەهێزەکەی خۆی دابماڵرێت و هێزێکی دی شوێنی بگرێتەوە. گەورەترین مەترسیش لە بەردەم یەکێتیدائەوەیە گەر یەکێتی تۆسقاڵێك لاواز بێت هێزی سێهەمی کە ئیسلامیەکانن شوێنی دەگرنەوە گەر ئەم هێزە بەو باوەڕە کلاسیکییەی خۆیەوە بێت و ببێتە دووەم هێز ئیدی هیچ قودرەتێك نییە بالانسەکە بگۆڕێت، چونکە کۆمەڵگەی کوردی کۆمەڵگەیەکی تەقلیدیەو دەرکەوتنی هێزی تەقلیدی دەبێتە هۆی درەنگ کاڵ بوونەوەی، بۆیە گەر تیمەکانی یەکێتی تەنانەت هەوڵی سڕینەوەی یەکدی بدەن نابێت بەو ئاڕاستەیە بچن هەوڵی سڕینەوەی حیزبەکەیان بدەن، چونکە حیزبەکەیان بەهەموو خەوشوکانییەوە بوونی گرنگترە تانەبوونی، کاڵ بوونەوەی ئەو هێزە زەبەلاحەی یەکێتیش واتە مەترسی لەسەر بەشێکی ژیانی خەڵکی ئەم وولاتە.هەر ئەم مەترسیەشە وادەکات مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێم کەبۆ یەکەم جاری هەستمان کرد وەك سەرۆك هەرێم هەڵسو کەوت بکات لەگەڵ کێشەیەکی ناوخۆی کوردستان و هاتە ناو کێشەکانەوە داوای کرد بەو ئاڕاستەیەدا بچن چارەسەر بکرێت نەك پێکدادان ڕووبدات، چونکە مەسعود بارزانی دڵنیا بووە لەوەی کە گەرم لە گەمەدایە دۆڕاوێك بوونی هەبێت خەڵکە نەك بوونی باڵەکانی یەکێتی کاتێکیش ئەم لێکترازانە ڕوویداو یەکێتی کاڵبوویەوە ئیدی لە بری ئەوان دەبێت پارتی وەك هێزێکی گەورە لەگەڵ ئیسلامییەکان دابنیشێت و ڕێککەوتن بکات، ڕێککەوتن لەگەڵ ئەو هێزە کلاسیکییە کوشتنی خەونەکانی ئێستای پارتییەو گۆڕینی گوتاری سیاسییەتی، هەرچەندە هاتنە ناوەوەی مەسعود بارزانی لەم کاتەدا کارێکی پۆزەتیف بوو، هەستکردن بوو بە ترسێك لەناو دەسەلاتی کوردیدا، لەگەڵ ئەوەشدا دروستکردنەوەی ڕۆحێکی تری یەکێتی بوو بۆ یەکێتییەکان.

پرسیاری گرنگ لێرەدا ڕووبوڕوومان بێتەوە ئەوەیە، ئایا گەر نەوشیروان دوای ئەو هەموو کێشانە لیستی هەبێت ئەمجارە مەسعود بارزانی و حیزبەکەی هەڵوێستیان چی دەبێت بەرامبەر یەکێتی؟ وەك ڕوونکردنەوەکەی ئەمجارەی دەبێت یان دەستکاری کردنی ڕێککەوتنەکەی نێوان نێوان پارتی و یەکێتی کێیە؟ ئەی ئەگەر تاڵەبانی لەو ئیمزاییەی کردوویەتی بۆ کۆسرەت ڕەسوڵ و تیمی ڕیفۆرم لە هەنگانەوەکانی خۆی پەشیمان بۆیەوە ئەمجارە کێ و کێ یەك دەگرنەوە؟ کۆسرەت ڕەسوڵ و نەوشیروان یەك دەگرنەوە یان نەوشیروان و تاڵەبانی، هەریەك لەم سێ جەمسەرە گۆڕانکارییەك لە ڕێککەوتنەکەیاندا ڕوودەدات چی دەقەومێت؟ ئەی ئەگەر نیگەرانییەکانی کۆسرەت ڕەسوڵ نەڕەوێنینەوەو

دووركەوتنەوە لە یەكێتی كێ دەبێتە پاڵەوانی گۆڕەپانەكە؟ تاڵەبانی دوای پیشاندانی ئەم كارتە زەردەی ئەمجارە یەكێتی دەداتەوە دەست كام جەمسەرانە؟ ئایا خانەوادەی تاڵەبانی و تیمەكەی تاڵەبانی تەحەمولی جێبەجێ كردنی ئەو خاڵانە دەكەن تاڵەبانی ئیمزای لەسەر كردووە؟ لەم نێوانەدا ئیسلامییەكان خەون بەچی یەوە دەبینن؟ ئەی ئەگەر تاڵەبانی هەموو خاڵەكانی جێ بەجێ كرد یەكێتی بەهێز دەبێت و دەبێتە حیزبێكی دی؟ یان ئاژاوەكان زیاتر دەبن و كۆتای بەم قەیرانە نایەت؟ ئەوە كێ یە بەدەرچوونی لە یەكێتی، یەكێتی تووشی ئیفلیجی دەكات كۆسرەت ڕەسوڵە یان نەوشیروان؟ یان هەردووكیان؟ تاڵەبانی چی دەكات تاكو تەرازووەكان بەهاوسەنگی بهێڵێتەوە؟ دەست لە بەهێزی تیمەكەی خۆی هەڵدەگرێت یان هەوڵی ئاشتكردنەوەی كۆسرەت ڕەسوڵ و نەوشیروان مستەفا دەدات؟ كام لەم هێزانە خاوەنی ڕاستەقینەی یەكێتییە؟ ئەوە كێ یەكێتی خۆش دەوێت و پێ بە بەرژەوەندییەكانی خۆیدا دەنێت؟ دوای نەكەڕانەوەی نەوشیروان بۆ ناو حیزب و دابەزینی بە لیستی خۆی، ڕێككەوتنەكەی پارتی و یەكێتی چەند یەكێتی لاواز دەكات لەبەر دەم داواكانی پارتیدا؟ دوای هەڵبژاردنەكان كامە كارەكتەری یەكێتییە پۆستی حكومەت دەگرێتە دەست و سەر بەكام تیمە؟ ئەمانە هەموو ئەو پرسیارانەن لەم نزیكانە وەڵامەكانیان بەكردەوە دەدرێنەوە، ئێمە بۆ وەڵامی هەریەك لەم پرسیارانە نادەینەوە چاوەڕێ ی دەكەین ڕووداوەكانی بەردەمان وەڵامیان بدەنەوە تاكو بزانین دوو ناپلیۆنەكەی ناو یەكێتی چۆن سواری ئەسپەكان دەبن و كامەیان لە گۆڕەپانەكەدادەكەوێتە پێش ئەویتر، لەبەرامبەر ئەمانیش حیزبە هاوپەیمانەكەیان چیدەكات، بۆ ڕاگرتنی ئەو هاوسەنگییەو ئیسلامییەكان چۆن سوود لەو درزە دەبین و بە چ شێوەیەك خۆیان دەخرێنە ناو درزەكانەوەو هەڵبژاردنی ئەمجارە كێ دەكاتە حاكمی وڵات.

## كێ گۆڵ دەكات نەوشیروان یان ئیسلامییەكان

نەوشیروان مستەفا دەڵێت" من گۆڵ كەر نیم و بەتەماش نیم گۆڵ لە هیچ كەس بكەم "، چونە دەرەوەكەی ئەمجارەی نەوشیروان هیچ لە جارەكانی تر ناچێت، ئەو نەخشەیەی نەوشیروان مستەفا پەیڕەوی دەكات نەخشەیەكە تا ئێستە بۆ هیچ لایەك ڕوون نییە هەنگاوەكانی بەرەو كوێ دەچن و كۆتاییەكەی بەچی دەكات، گەر سەركەوتنێك هەبێت لە بۆچونە دەرەوەكەی ئەمجارەی نەوشیرواندا تەنها لەوێدایە ڕێگەكانی ڕوون نییەو بۆ كەسیشی ڕوون نەكردۆتەوە سەرقاڵی چییە، دەكرێت بڵێین نەخشەكەیە تەنها لە مێشكی

خۆیدایە هیچ کاریگەرییەکی دەوروبەر نابێتە هۆی شێواندنی نەخشەکەی ناومێشکی، چونکە دڵنیایە گەر نەخشەکەی بە شێوەیەکەی شەفافانە ڕوون بکاتەوە هەنگاوەکانی دیاری بکات ئیدی نەیارەکانی دەکەونە خۆیان و هەوڵی ئیفلیجکردنی هەنگاوەکانی دەدەن..

نەوشیروان مستەفا دەڵێت" من گۆڵکەر نیم و بەتەماش نیم گۆڵ لە هیچ کەس بکەم"، چوونە دەرەوەکەی ئەمجارەی نەوشیروان هیچ لە جارەکانی تر ناچێت، ئەو نەخشەیەی نەوشیروان مستەفا پەیڕەوی دەکات نەخشەکە تا ئێستا بۆ هیچ لایەك ڕوون نییە هەنگاوەکانی بەرەو کوێ دەچن و کۆتاییەکەی بەچیدەگات، گەر سەرکەوتنێك هەبێت لە چوونە دەرەوەکەی ئەمجارەی نەوشیروان دا تەنها لەوێ دایە ڕێگاکانی ڕوون نییەو بۆ کەسیشی ڕوون نەکردۆتەوە سەرقاڵی چییە، دەکرێت بڵێین نەخشەیەکە تەنها لە مێشکی خۆیدایەو هیچ کاریگەرییەکەی دەوروبەر نابێتە هۆی شێواندنی نەخشەکەی ناو مێشکی، چونکە دڵنیایە گەر نەخشەکەی بەشێوەیەکی شەفافانە ڕوون بکاتەوە هەنگانەوەکانی دیاری بکات ئیدی نەیارەکانی دەکەونە خۆیان و هەوڵی ئیفلیج کردنی هەنگاوەکانی دەدەن، یەکێك لەمەکتەب سیاسیەکانی یەکێتی پێ ی وایە" زۆربەی ئەندامانی مەکتەب سیاسی یەکێتی بەباڵی ڕیفۆرمی مەکتەب سیاسیشەوە هێشتانازانن نەوشیروان چی دەکات و سەرقاڵی چییە"، ئەگەر بۆ بەرپرسانی یەکێتی ڕوون نەبێت هەنگاوی ئەمجارەی نەوشیروان چ ئاڕاستەیەك دەگرێتە بەر حەتمەن بۆ حیزب و لایەنەکانی تر زەحمەتترە بزانن نەوشیروان چی لەنەخشەکەی ئەمجارەیدایە.بەباوەڕی زۆرێك لە تیمەکەی نەوشیروان ئەوانەی کە لەگەڵی چونەتە دەرەوە و لەدەوری کۆبوونەتەوە هێشتا ئەوانیش نازانن نەوشیروان بەرەوکوێیان دەبات، تەنها ئەوەندە نەبێت لە ڕووی باوەڕەوە لە گەڵین و گرنگ نییە ڕێگەکەیان لە کوێدا کۆتای دێت گرنگ ئەوەیە. هەنگاوەکانی نەوشیروانیان پێباشترە لە هەنگاوی ئەوانی دی.

بڕێکی تر دەڵێن تەنها چەند کەسێك دەزانن ئەجێندانی ئەمجارەی نەوشیروان چییە، ڕەنگە یەکێك لەو چەند کەسەی لەم نەخشەیە تێبگات و کۆتاییەکەی بزانێت خودی تاڵەبانی بێت، بەلاّم نەوشیروان دەڵێت" تیمی ڕیفۆرم هەر ئەمانە نین کە لەگەڵمن، بەڵکو کەسانێکن لە شوێنەکانی ترەوە کاردەکەن"، ئەم قسەیەی نەوشیروان بەو مانایە دێت ئەم جارە دەست بۆ شوێنە دوورەکانیش دەبات و تاڵەبانیش هیچ نکوڵییەك لە هەنگاوەکانی نەوشیروان ناکات و نابێتە ڕێگر لەبەردەمیدا تاکو نەخشەکەی جێبەجێ بکات.

تاڵەبانی و نەوشیروان جیاواز لەوەی دووکارەکتەری سیاسین لەژێر دەواری حیزبێکدا کۆبوونەتەوە دوو هاوڕێی دێرینیشن، گرنگترین شتێك لەنێوان ئەم دوو هاوڕێیەدا تێبینی دەکرێت هەر لە ئێستاوە زۆر جار ململانێ ی دەسەلات و بیروبۆچونەکان لەیەکتری دوورخستۆتەوە، بەلام هەرگیز هیچکامیان نەبۆتە هۆی بیمارکردنی ئەویتریان، دوو تایپن بە بەردەوامی یەکتری دەپارێزن و دژی یەکتریشن، دوو مۆدێلی هاوڕێن کە زەحمەتە بتوانن پشت لە یەکتری بکەن و زەحمەتە بشتوانن پێکەوە تاسەر بژین، لەنێوان ئەم دوو هاوڕێیەدا بەدەیان کەس تێکەوتوون و لە ململانێکانیاندا کەوتونەتە ناو ئەو چاڵەوە کە پێیان وابووە شەڕی ئەو دوو هاوڕێیە شەڕێکی ڕاستەقینەیەو یەکلای کەرەوەیە، بەلام جوانییەك لەنێوان هاوڕێیەتی ئەم دوو کەسە بەسروشت جیاوازەدا دەبینرێت، ئەویش ئەوەیە خاڵی کۆتاییان نییە، بەڵکو هەمیشە لە خاڵی کۆتاییەوە جارێکی تر دەست پێ دەکەنەوە، ڕەنگە نەوشیروان لەو تایپە بێت هەمیشە ڕۆحێکی باخیانەو جیاوازی هەیە، هەرکاتێکیش بەرامبەرەکەی قبوڵ نەکات لێ ی دوور دەکەوێتەوە، هەر دوورکەوتنەوەیەکیشی شانسێك بووە بۆ بەهێزکردنی هاوڕێ کۆنەکەی کە تاڵەبانییە. چونە دەرەوەکانی تری نەوشیروان ئەو چونە دەرەوانە بوو پشتی هاوڕێکەی بەهێز بکات، واتە ئەگەر پێشووتر نەوشیروان چووبێتە دەرەوە بۆ ئەوە چووە دەسەلاتی هاوڕێکەی بەهێز تر بکات و ببێتە دینەمۆیەك بۆ جوڵانەوەی ڕۆحی حزبەکەی کە هاوڕێیەکی سەرپەرشتی دەکات.دەشتوانین بڵێین بە دیوێکی تردا هەر لە سەرەتای شەستەکانەوە تاکو ئێستە ئەم دوو هاوڕێ یە خەونیان بە کورسیەکانی یەکدییەوە بینیووە، بەلام پێ دەچێت ئەمجارەیان چوونە دەرەوەیەك بێت کەمێك جیاواز بێت لەوانەی پێشوو. یەکێتییەکی دێرین گوتی" دڵنیام لەوەی لەوەتەی کاك نەوشیروان هەیە چاوەڕێ ی کردووە تاڵەبانی نەمێنێت و بچێتە شوێنەکەی، بەلام سەیر لەوەدایە چەندین فرسەتی بۆ هەڵکەوت جێ بەجێ ی نەکردتا بچێتە شوێنەکەی"، لە قسەی ئەم یەکێتییەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە نەوشیروان هیچ کات نایەوێت لە پێش چاوی هاوڕێیەکییەوە بچێتە سەرکورسیەکەی و دەیەوێت ئەو حورمەتەی بگرێت دوای هاوڕێکەی نەخشەکانی جێ بەجێ بکات نەك لەسەردەمی بوونی هاوڕێکەیدا، بۆیە وەك مەسیحێك خۆی هەڵگرتووە بۆ دوای تاڵەبانی تاکو هەم بۆ هاوڕێکەی بسەلمێنێ حزب بۆ ئەوە هەم وێنەکانی خۆی لە پێش چاوی بەرامبەرەکەی نەشێوێنێ.

گەر لە ڕووی شکڵەوە تەماشاکەین لەمڕۆی نەوشیروان هێزێکە لەناو هێزێکی تردا، هەرچۆن بەرپرسە باڵاکانی وڵات هەریەکەو لە جێگەی خۆیەوە هێزو ڕاگەیاندن و خەڵکیان لە دەرەوری خۆیان کۆکردۆتەوە بەهەمان شێوەش نەوشیروان خاوەنی تەلەفیزۆن، ڕۆژنامە، سایت، دەزگای ڕاپرسی، چاپخانەیەو لەگەڵ ئەمەشدا هێزی بوونە مەرجەع بۆ بەشێکی یەکێتییەکان، واتە هەنگاوی یەکەمی دروستکردنی دیوارێکی بەهێز لەدەوری خۆی بۆ ئەوەی بتوانێت لەکاتی خۆیدا سودی لێوەببینێت، ئەو هەنگاوانەی کەسێکی سیلسی خۆی بۆ ئامادە دەکات بۆ کاتی هەڵبژاردن لە ئێستەدا لەلای نەوشیروان هەموویان بەشێوەیەکی باش دەبینرێن.

هەنگاوی دووەمی نەوشیروان دوای چوارمانگی دی دەست پێ دەکات، ئەویش ئەوکاتەی هەڵبژاردن نزیک دەبێتەوە، ڕەنگە ڕێککەوتنێك هەبێت لە نێوان تاڵەبانی و نەوشیرواندا بۆ کاتی هەڵبژاردنەکان، خەر چۆن ڕێککەوتن ئیدی لە ڕێگەی ڕۆژنامەوە هێرش نەکەنە سەر یەکدی و کۆتای بەشەڕی سەر ڕۆژنامەکان بهێنن و شەڕەکە بگوازنەوە بۆ دانیشتنەکانی نێوانیان، بەهەمان شێوەش دوور نییە بەر لە هەڵبژاردن ڕێککەوتنێکی تر ئەنجام بدەن.

لێرەدا دەبێت بپرسین ئایا لە هەڵبژاردنی مانگی پێنجی ئەمساڵ نەوشیروان مستەفا چی دەکات؟ دەچێتەوە ناو یەکێتی یان لە شوێنی خۆی دەمێنێت؟ ئەگەر بچێتەوە ناو یەکێتی چەند خەڵك تووڕە دەکات لە خۆی و چۆن پرۆژەکانی پەکیان دەکەوێت؟ گەر نەچێتەوە خۆی وەك کەسێك لیستی دەبێت بۆ هەڵبژاردن؟ گەر لیستی هەبوو دەنگەکانی ئەو کاریگەری لەسەر پارتی و یەکێت ناکەن؟ ئەی ئەگەر خۆی هەڵنەبژارد نابێتە هۆی ئەوەی ئەو تووڕە بوونەی خەڵك دەرهەق بە پارتی و یەکێتی هەیەتی لە شانسی ئیسلامییەکان بکشێتەوە؟ لە نێوان پارتی و یەکێتی ولیستی ئیسلامیەکاندا نەوشیروان چی دەکات؟ ئەی ئەگەر خۆی هەڵبژاردو دەنگی ئیسلامییەکانی کوشت پاشان چی دەکات؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن بەم نزیکانە دەبێت نەوشیروان وەڵامیان بداتەوە ئەویش بەکردەوە نەك بەووتار.

لە ناوەڕاستی مانگی پێنج دا هەڵبژاردنی پەرلەمان و پارێزگاکان لە سەرتاسەری کوردستاندا دەست پێ دەکات، پارتی و یەکێتی بەیەك لیست دادەبەزن وە بڕیاریشە یەکگرتوی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی و زەحمەت کێشان و سۆشیالیستیش بەیەك لیست دادەبەزن، کە ئەم چوار حزبەفکرەیەك کۆی نەکردۆتەوەو بەرژەوەندی بووەتە هۆی

کۆکردنەوەیان نەك بیرکردنەوەیەك، بەڵکو هەریەکەیان بەرەو ئاڕاستەیەك بیر دەکاتەوە کە زۆر پێچەوانەی ئەویتریانەو زۆرجار دژی یەکدیشن، تەنها شتێك کۆی کردبنەوە سوود وەرگرتنە لەو توڕەبوونەی خەڵك دەرهەق بە پارتی و یەکێتی دەیانەوێت ئەم بۆشاییانە پڕ بکەنەوەو خۆیان بخەنە سەر دەسەڵات، پاشان لیستی ئۆپۆزسیۆن هەیە کە کۆمەڵێك کەس لەئەورووپاوە سەرپەرشتی دەکەن، ئەم لیستەش لیستێکی بەهێز نییەو توانای گۆڕینی ئاڕاستەی سندوقەکانی نییە، دەکرێت بڵێین لە نێوان ئەمانە هەموویدا نەوشیروان مستەفاش هەیە.

ئەگەر نەوشیروان وەك لیستێك بێتە ناوهەڵبژاردنەکانەوە بە دیوێکدا بۆ پارتی و یەکێتی باشەو بەدیوێکیشدا زیان لە دەنگدانی ئەوان دەدات، ڕاستە بۆ ماوەیەکی کەم نەوشیروان بە چونە دەرەوەکەی توانی هەموو ئەو یەکێتییە توڕانە کۆبکاتەوەو جارێکی تر بەرگێکی یەکێتی بوونیان بکاتەوە بەر، بەڵام بۆ هەڵبژاردنەکان ئەم بەرگە ئاڕاستەیەکی تر وەردەگرێت، هەڵبژاردنی نەوشیروان لە سنوری سلێمانی کۆکردنەوەی ئەو دەنگانەیە کە تووڕەن لە یەکێتی، واتە بەم دیوەدا لە سنوری سلێمانی کوتەکێك بەر لیستەکەی پارتی و یەکێتی دەکەوێت، گەر بەشێوەیەکی تر کار بکات و بتوانێت بەو لیستەی خۆی فەزایەك دروست بکات دەنگی خەڵکی یاخی و توڕەی لە پارتی و یەکێتی بەرەو ئاڕاستەی خۆی ببات، ئەمە هەم شانسە بۆ نەوشیروان و هەم شانسە بۆ پارتی و یەکێتی، چونکە ئەو دەنگانە گەر لیستێکی جیاواز لە پارتی و یەکێتی نەبێت دەنگی پێ بدەن ئەوا دەنگ بەلیستی ئیسلامییەکان دەدەن و ئاڕاستەی سندوقەکان بەرەو شانسی ئیسلامییەکان دەڕوات، بەڵام ئایا نەوشیروان دەتوانێت ئەمکارە بکات؟ بەر لەهەموو شتێك گەر نەوشیروان بیەوێت لیستی هەبێت ئیدی دەبێت لەم دەرفەتەدا کورسیەکەی خۆی جێ بهێڵێت و کەمێك لە شاری سلێمانی دووربکەوێتەوەو هەوڵی ئاشت کردنەوەی شارەکانی تر بدات لەگەڵ خۆیدا، ئەگینا خەونی نەوشیروان تەنها لە سلێمانیدا بێت خەونێکی کاڵەو شارەکانی تر پێچەوانەکەی وەردەگرن، ڕەنگە بۆ نەوشیروان ئاسان بێت لە سلێمانی دەنگ کۆ بکاتەوە، چونکە سروشتی ئەو شارە سروشتێکە لەگەڵ ئەو لیستانە کۆدەبێتەوە ئازادی زیاتری بدەنێ و ئەو لیستانەی قبوڵە سلێمانیان لەهەموو شتێك خۆشتر دەوێت، کەئەمەش لای نەوشیروان دەست دەکەوێت بۆ سلێمانی، بەڵام سەنگی مەحەلەکەی دەنگدانیش لە هەولێرو ناوچەکانی ترە نەك سلێمانی چونکە قورسایی ئیسلامییەکان کەوتۆتە ناو ئەو شارانەی نەریت پارێزن، گەر نەوشیروان بتوانێت لەم هەڵبژاردنەدا دەنگە توڕەکان لە بری ئەوە

بچنه سەر سندوقی ئیسلامییەکان بیانباتە سەر سندوقەکانی خۆی ئەوا توانیویەتی جایکی تر پارتی و یەکێتی بەهێز بکاتەوەو حیزبەکەی خۆی بکاتەوە حزبێکی دەسەلاتدار، چەنکە دەنگدان بەنەوشیروان لەهەموو حالەتێکدا دەنگدانە بەیەکێتی، گەر ئەمەی نەکردو وەك ئێستە بەوێنەی چاودێرێك دانیشت سەیری ڕووداوەکانی کرد ئەوا بالانسی ئیسلامییەکان زیاد دەبێت و سندوقەکانی دەنگدان بۆ ئەوان دەبێتە جێگەی دلخۆشی و نەوشیروانیش لە ئەرکێکی خۆی، خۆی خانەنشین کردووە، گەر بەوشێوەیەش کاری کردلەبری بردنی دونگی ئیسلامییەکان دەنگی پارتی و یەکێتی برد جارێکی دی شانسی ئیسلامییەکان بەرز دەکاتەوە؟ واتە ئەرکی ئەم لەم کاتەدا لە ئەرکی هەموو لیستەکانی تر قورسترو وردترە. بۆیە ترسی گەورەی ئیسلامییەکان لەم هەلبژاردنەدا تەنها لیستی ئۆپۆزسیۆنە، ئەوان دەیانەوێت سوود لە تووڕەبوونی خەلك ببینن بۆ هەلبژاردن، گەر لیستی ئۆپۆزسیۆن بوونی هەبێت ئەوا کاری ئیسلامییەکان لاوازتر دەبێت و ئەو دەنگانەی ئەوان بەتەمان بیبەن بۆ خۆیان ڕوو لە لیستی ئۆپۆزسیۆندەکەن، لەهەموو حالەتێکدا بێدەنگی نەوشیروان لە هەلبژاردنەکاندا کارێکی مەترسیدارە، نەوشیروان خۆی دەلێت " ئەمەی من دەیکەم ئەمەیە ئیشی من"، بەلام ڕاستییەکەی ئەوە ئیشی نەوشیرون نییە، بەلکو ئەوە ئیشێکی بچوکە لەو ئیشانەی، کە دەبێت بیانکات، مادام توانی خەلکە تووڕەکەی یەکێتی زیندوو بکاتەوە دەشتوانێت جارێکی تر لەڕێ ی هەلبژاردنەوە لیستی پارتی و یەکێتی بەرز بکاتەوەو ئەو خەلکە بهێنێتەوە سندوقی دەنگدان کەلە حزبەکەی تووڕە بوون، چ بەهاتنەوەی بۆ ناو یەکێتی بێت چ بەخۆ هەلبژاردنی، پێچەوانەی ئەم چوار حزبە زۆر لەیەك دوورە کە دەبنە بارێکی قورسبەسەر حزبەکەی نەوشیروان و حزبە هاوپەیمانەکەی.

## پرۆژەکانی تالەبانی و ڕاکێشانی بەرەکە

ئەو پرۆژەیەی تالەبانی دوو خوێندنەوەی بۆ دەکرێت، یەکێکیان دەبێتە ئەو خالەی لەکاتی هەلبژاردنەکاندا زۆرترین قسەی لەسەر بکرێت وەخەلکی پێوە سەرقال بکرێت تا سندوقەکانی دەنگدان یەکلایی دەبنەوە پاشان پرۆژەکە دەمرێت، خالی دووهەمیان تالەبانی و وەزیفەکەی نەوشیروان دەگوازێتەوە بۆ ناو یەکێتی و لەبری نەوشیروان خۆی دەبێتە پالەوانی ڕیفۆرم لەناو حزبدا، تیمەکەی نەوشیروانیش بەهەموو شێوەیەك پشتی پرۆژەکە دەگرنبۆ ئەوەی بیکەنە ئەمەرێکی واقیعی و ڕیفۆرمێك لەناو حزبدا دەست پێ بکات، بەلام ڕاستییەکەی ئەوەیە قەت ڕوونادات و ئەو پرۆژەیە نابێتە ئەمری واقیع، بەلکو تەنها دوو هاوڕێکە وەك جاران پشتگیری یەکدی دەکەن و لەسەر میتۆدی یەکتری سەرقالی

بەهێزکردنی بیرو باوەڕەکانی خۆیانن، هەمووشمان باش دەزانین تاڵەبانی هەرگیز نەوشیروان ناگۆڕێتەوە بەو مەکتەب سیاسیانەی کەشەڕی نەوشیروانیان دەکرد گەر لە هەڵبژاردندا ئاراستەکان بەرەو ئەو شوێنە نەچوون دوو هاوڕێکە ببنە هاوکاری یەکدی هەڵبەتە لێکترازانی یەکجارەکی ڕوویداوە، وەلێ زۆر زەحمەتە بتوانین ئەو لێکترازانە لەیەکدی قبوڵ بکەن.

بەڵکو دوو داینەمۆن هەریەکەو لە شوێنی خۆیەوە کار بۆئەوی تر دەکات و پێکەوەش حیزبەکەیان ڕۆحێکی تری دەدەنێ، ڕیفۆرمیش لەناو یەکێتی دا بنەمایەکی فیکری نییەو جۆرێکە لەو ڕیفۆرمەی لەسەر پایەی تاکە کەس بنیات نراوە پێیان وایە گەر تاکە کەسەکان بگۆڕێن ڕیفۆرم دەستی پێکردووە و دەسەڵاتەکانیش کەم بکرێنەوە حزب ڕێڕەوی خۆی گرتۆتە بەر، لەکاتێکدا هەریەك لەو کەسانەی پڕۆژە بڵاودەکەنەوە باس لە ڕیفۆرم دەکەن خۆیان ئامادە نین بچوکترین دەسەڵاتی خۆیان کەم بکەنەوە بۆ بەرامبەرەکەیان و دەیانەوێت ڕیفۆرم لە ئاستی خوار دەسەڵات خۆیانەوە دەست پێ بکات نەك لە خودی خۆیانەوە. لەسەر وەختی هەڵبژاردنەکاندا ئەوە گرنگ نییە کێ ڕیفۆرم دەکات و کێ دژیەتی، ئەوەی گرنگە سندوقەکانی دەنگدان کێ دەکەنە حاکمی ئەم وڵاتەو کامانەن ئەو لیستانەی دەتوانن ئاراستەی بەڕێوبردنی حکومەت لە گەندەڵی و بێ سیستەمییە ڕزگار بکات، یاگەر یەکێتی و پارتی جارێکی تر بوونەوە حاکم هەمان قەوانی بەڵکو بەخراپتریشەوە ڕوو لەکوردستان ناکاتەوە؟ ئەی ئەگەر سندوقەکانی دەنگدان لە بەرژەوەندی ئەوان نەشکایەوە چ ئافاتێك دێتە ڕێگەکان؟ شەڕ کردن لەگەڵ براوەدا یان قبوڵ کردنی بەرامبەرەکە؟ گەر ئیسلامییەکان بچنە سەر حکوم چی ڕوودەدات؟ وڵات بەرەو ئاراستەی مەدەنییەت دەڕوات یان دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەکانی ڕابردوو؟ پڕۆژەکانی تاڵەبانی هیچ ئومێدێك دەدات بە خەڵك تا حکومەت و حزب لەیەك دوور بخرێنەوە هەریەکەو لە شوێنی خۆی دەسەڵاتی بۆ دیاری بکرێت؟ ئەی ئەگەر بەم پڕۆژەیە جێ بەجێ نەکرا نەوشیروان لە بەدیلی ئەمەدا چی دەکات؟ دادەنیشێت یان هەنگاوی تر دەهاوێت؟ ئایا داواکارییەکانی نەوشیروان و تیمەکەی لە یەکێتی کۆتاییان دێت یان وەك داواکارییەکانی کوردە هەرگیز تەواو نابن؟ ئەگەر نەوشیروان توانی نزیکەی"١١" کورسی ببات چی دەکات؟ کە زۆرێك لە ڕیفۆرمەکان باوەڕیان وایە ئەو ڕێژەیە لە کورسیەکان بۆ تیمەکەی نەوشیروان دەبن لە هەڵبژاردنەکاندا؟ ئەمانە هەموو ئەو پرسیارانەن لە مانگی پێنج وەڵامەکانیمان دەست دەکەوێت.

## هاوسەرگیری سیاسی لەمەلا مستەفاوە تا مەلا بەختیار

## ڕاپۆرتی" هێمن باقر

نزیکترین هاوسەرگیری سیاسی لە مێژووی نوێ ی کوردستاندا، لە مەلای مستەفای بارزانیدا دەردەکەوێت، کاتێک کچی یەکێك لە سەرۆك هۆزەکانی عەشیرەتی زێباری دەهێنێت بەناوی( **حەمایل خان** ) کە کچی مەحمود اغای زرێبارییەو دایکی کاك مەسعودەو هەتا ئێستاش لە ژیاندا ماوە مەبەستی سەرەکی مەلا مستەفا لەم ژن هێنانە، کۆتای هێنان بووە بەو شەڕو ناکۆکییەی کە لەنێوان عەشیرەتی زێباری و بارزانیدا هەبوو.

بە پێ ی سەرچاوە مێژووییەکان، جێگیر بوونی عەشیرەتی بارزان لە ناوچەی بادینانـدا مێژوویەکی زۆر دوورو درێژی نییە، پێشتر ئەو ناوچەیە بە دەستی اغاکانی زێبارەوە بووە. کاتێك بارزانییەکان دەچنە ناوچەکەو نفوزی ئاینینی خۆیان دەکەنە گەڕ، وەکو شێخێکی ئاینی لە هەموو ناوچەکەدا پەیڕەوانی تایبەت بە خۆیان دروست دەکەن و پێگەی ئاینی و عەشایەریی خۆیان لە ناوچەکەدا بەهێز دەکەن، کەپێشتر لەژێر کۆنترۆڵی اغا زێبارییەکاندا بووە.

شێخەکانی بارزان، بەتایبەتی شێخ محەمەدی باوکی مەلا مەلا مستەفاو شێخ عبدالسلامی برا گەورەی، یەکەم کارێك کە کردویانە، مولکیەتی تایبەتی زەویوزاریان هەڵوەشاندووەتەوەو دابەشیان کردووە بەسەر خەڵکیدا، بەم جۆرەش ئەم تەریقەتە ئاینییەی شێخەکانی بارازان لە بەرژەوەندی خاوەن موڵك و ئاغاکاندا نەبووەو زیاتر لایەنگیری چینی هەژارانی کردووە.ئەم بارودۆخە لە لایەن ئاغاکانی زێبارەوە جێگەی قبوڵ نەبووەو نەیانتوانیوە تەحەمولی ئەو بارودۆخە بکەن، سەرئەنجام شەڕی گەورەو خوێناوی لە نێوانیاندا دروست بووە کە بەدەست بەسەردا گرتنی ئاکرێ و دەوروبەری لەلایەن بارزانییەکانەوە کۆتایی پێهاتووەو سەر ئەنجامیش بارزان لە زێبارجیا کرایەوەو خرایە سەر قەزای ئاکرێ.

ئەم ناکۆکییەی نێوان زێباری و بارزانییەکان لە سەردەمی شێخ ئەحمەددا بەوە هێور کرایەوە کە فارس اغای زێباری کچی خۆی دایە شێخ ئەحمەدو هەر ئەوەش پلەو پایەی شێخ ئەحمەدی لە چاو براکانی دیکەدا بەرزتر کردۆتەوە.

بەڵام نزیك بوونەوەیەی شێخ ئەحمەد كە زیاتر وەك و پیاوی تەریقەت و شێخی ئاینی كاریدە كرد، نەیتوانی كۆتایی یەكجارەكی بەو ناكۆكییە بهێنێت. تەنانەت لەو كاتەدا كە حكومەتی عێراقی هەڵیكوتاوەتە سەر ناوچەی بارزان، زۆر جار زێبارییەكان لەم هەڵمەتانەدا هاوكاری حكومەتیان كردووە.

جارێكی دیكە لە سەردەمی دەسەڵات و دەركەوتنی مەلامستەفای بارزانیدا، هاوسەرگیری لە نێوان دوو هێۆزەدا ڕوویدا، كاتێك ژنی سێ یەمی لەم هۆزە هێنا، ئەمجارە مەلا مستەفا كچی محمود اغای زێباری مارە كد، بەم نزیك بوونەوەیە مەلا مستەفای بارزانی توانی هەنگاوی گرنگ بنێتبە مەبەستی مسۆگەر كردنی پشتگیری زێبارییەكان و كۆتاییهێنان بە ناكۆكی نێوانیان. بەڵام هێشتا نەی توانی متمانەی هەموو زێبارییەكان پێكەوە مسۆگەر بكات، بەڵكو لە ئەنجامی ئەمەدا زێبارییەكان بوونە دوو بەشەوە: بەشێكیان كە بنەماڵەی محمود اغا بوو دایەنە پاڵ شۆڕش. بەڵام بنەماڵەی ئەحمەد اغای برام بەم هاوسەرییە سیاسیە ڕازی نەبوون و جارێكی دیكە یاخی بوونەوە.

بەلای كەسێكی وەكو ئەحمەد اغای زێبارییەوە هەرگیز جێگەی قبوڵ نەبووە كە زێبارییەكان پێگەی بەهێزی عەشایەریی خۆیان چۆڵ بكەن بۆ عەشرەتێكی تازە پەیدابووی وەكو بارزانییەكان، هەر لەبەر ئەوەش بوو دواجار ئەم بەشەی زێبارییەكان دایانە پاڵ حكومەت و دواتریش هەر لەسەر ئەم پشتگیرییە، ئەرشەد زێباری لە حكومەتی عێراقیدا بوو بە وەزیری دەوڵەت و لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١و لێبووردنی گشتی بەرەی كوردستانی بۆ ئەوانەی كە لەگەڵ حكومەتدا بوون، ئەرشەد زێباری نەگەڕایەوەو بەم لێبوردنە گشتییە ڕازی نەبوو، هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت لەدەرەوەی شۆڕش ماوەتەوە.

شەڕی نێوان زێباری و بارزانییەكان بە شێوەیەك لە شێوەكان شەڕی نێوان سیستەمێكی ئاینی وەك و تەریقەتی نەقشبەندی و سیستەمێكی كۆمەڵایەتی وەك و ئاغایەتییە،كە دواجار بەسەركەوتنی شێخە نەقشبەندییەكانی بارزان كۆتایی پێ دێت بەتایبەتی دوای ئەوەی توانیان پشتگیری زۆربەی عەشیرەتەكانی دەوروبەری بەدەست بهێنن، ڕەنگە لەمەو دوا نەرمو نیانی شێخەكانی بارزان لەگەڵ خەڵكیدا لەچاو مامەلەی اغاكانی زێباریدا هۆكارێكی گرنگی ئەوە بووبێت كە ئەو هۆزانە پشتگیری بارزانییەكان بكەن نەك زێبارییەكان بەر لە دروست بوونی پارتی دیموكراتی كوردستان لەساڵی ١٩٤٦، چەند ریكخراویكی سیاسی لە كوردوستاندا هەبون، لەوانە ؛ حیزبی ژ. ك بەسەرۆكایەتی ئیبراهیم

ئەحمەد، حیزبی رزگاری کە پێك هاتبون لە چەند کەسێك لەوانە سالح یوسفی، علی مەهدی، رەشید قادرو نوری محمد ئەمین. ریکخراوی شۆرش لەو کەسایەتییانە پێك هاتبون کە بیرو بۆ چونی چەپیان هەبوو نزیك بوون لە حیزبی شیوعی عیراقییەوە، لەوانە ؛ سالح حەیدەری، جەمال حەیدەری نعلی عبدوللا، جگە ئەههیئەتی ئازادی کە لە هەندیك لە ئەفسەرەکانی ناو حیزبی هیوا پێکهاتبوون و مەلا مستەفا سەرۆکایەتی دەکرد، ئەم گروپە دوای رۆیشتنی مەلا مستەفا لە عێراق پوکایەوە.

هەموو ئەمانە لە سەر میراتی حیزبی هیوا دروست ببون کە بریتی بوون لە چەند ئەفسەرێکی سوپا بە سەرۆکایەتی رەفیق حیلمی.

کاتێك مەلا مستەفا لە کۆماری مهابادا دەبێتە وەزیری بەرگری، هەمزە عبدالله دەنێرێتەوە بۆ کوردستانی باشوور بۆ ئەوەی لەگەڵ رەمزە نەتەوەییەکانی دیکەدا کۆببێتەوەو لقی عێراقی پارتی دیموکراتی کوردستان دابمەزرێنن، سەرەنجام لە ١٦ی ئابی ساڵی ١٩٤٦دا پارتی دیموکراتی کوردستان لە یەکگرتنی هەردوو رێکخراوی رزگاری و شۆرش دروست بوو، دواتریش ژ.ك چووە ناوییەوە، هەمزە عبدالله ش بوو بەیەکەمین سکرتێری حیزب.

هەمزە عبدالله خەڵکی کوردستانی باکوورە، لە چلەکانی سەدەی رابردوودا لەگەڵ مەلا مستەفادا تێکەڵاوی شۆرش بووەو دوو کچی خوشکەزای لەگەڵدا دەبێت کە تەمەنیان لە ١٢ساڵ زیاتر نابێت. بەهۆی چالاکی سیاسیەوە، نزیکایەتی لە نێوان ئیبراهیم ئەحمەد و هەمزە عبدالله دا دروست دەبێت، ئەم نزیکاییەتییە سەرەنجام بە ژنبەژنێکی سیاسی لە نێوان هەمزەو عبدالله و ئیبراهیم ئەحمەددا کۆتایی دێت کە ئیبراهیم ئەحمەد خوشکی خۆی دەداتە هەمزە عبدالله و ئەویش ئەویش خوشکەزاکەی کە گەلاوێژ خانی دایکی هێرۆ خانە دەداتە ئیبراهیم ئەحمەد کە لەو کاتەدا تەمەنی تەنها ١٣ساڵ دەبێت. هاوسەرگیری نێوان ئیبراهیم ئەحمەدو هەمزە عبدالله گرنگیی گەورەی هەبوو لە بەهێز کردنی پارتیدا، چونکە هەمزە کە باڵی چەپی و پارتی و ئیبراهیم ئەحمەد کە باڵی نەتەوەیی بوو، پێکەوە لە چوار چێوەی ئەو حیزبە نوێیەدا کاریان کرد کە پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. ئەگەر چی تا ئەو کاتەش ئیبراهیم ئەحمەد حیزبەکەی خۆی(ژ.ك) هەڵنەوەشاندبوویەوە، بەڵام لەناو پارتی دیموکراتی کوردستاندا بوو.

ئەم خزمایەتی و نزیك بوونەوەیەی نێوان ئیبراهیم ئەحمەد و هەمزە عبداللە، زۆر ناخایەنێت و سەرئەنجام لە كۆنگرەی یەكەمی پارتی لە ساڵی ١٩٥٠دا كاتێك هەمزە عەبداللە بە سكرتێری پارتی هەڵدەبژێردرێتەوە، ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ هەمزە عبداللە دا نێوانیان تێكدەچێت و ئیبراهیم ئەحمەد لە پارتی زویر دەبێت.

لە سەرەتای دروست بوونی پارتییەوە لە ساڵی ١٩٤٦ كە مەلا مستەفای تێدا ئامادە نەبووە، تاكو دوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ كە مەلا مستەفا لە یەكێتی سۆڤێتەوە بە ڕێگەی قاهیرەدا دەگەڕێتەوە بەغدا، بە درێژایی ئەو دوانزە ساڵە مەلا مستەفا سەرۆكی فەخری پارتی بووە بەبێ ئەوی بوونی هەبێت. هەمزە عبدوللە كە كەسی نزیكی بارزانی بووەو لەسەر ڕاسپاردەی ئەویش پارتی دیموكراتی كوردستانی دامەزراند، لەبەر ئەوەی هەمزە بۆ خۆی چەپ بوو ونزیكایەتی لەگەڵ شیوعییەكاندا هەبوو، لەو ماوەیەی كە هەمزە سكرتێری پارتی بوو، شیوعییەكان بەتەواوی كۆنترۆڵی پارتی دیموكراتی كوردستانییان كرد بوو، ئەم حاڵەتە بە مەلا مستەفا قبوڵ نەكراو سەرەنجام ساڵی ١٩٥٩ ژمارەیەك چەكداری ناردە سەر مەكتەبی سیاسی پارتی لە بەغداو داگیر كردو هەمزە عبداللە ش رایكردو دواتریش لە حیزب دەركراو لە دوای ئەوەش بە تەواوەتی وازی لە لە كاری حیزبی هێنا.

ئەوەی لێرەدا تێبینی دەكرێت، پێدەچێت ئەم كارەی مەلا مستەفا بە هاوكاری و پلانی ئیبراهیم ئەحمەد بوبێت، چونكە لە دوای دەركردنی هەمزە عبداللە وە، مەلا مستەفا، ئیبراهیم ئەحمەدی هێنایەوەو كردی بە سكرتێری پارتی. دیارە ناكۆكی نێوان هەمزە عبداللە ئیبراهیم ئەحمەد ناكۆكی بووە لەسەر دەسەڵات، سەرەڕای ئەوەی لە ڕووی ئایدۆلۆژیشەوە جیاوازی لە نێوانیاندا هەبوو، كاتێك مەلا مستەفا غەزەبی خۆی لە هەمزە عبداللە گرت، دەرگا لە بەردەم ئیبراهیم ئەحمەد دا كرایەوە بۆ ئەوەی ببێت بە سكرتێری پارتی.

بەڵام نێوانی خۆشی و مەلا مستەفاو ئیبراهیم ئەحمەد دا زۆری نەخایەندو ناكۆكی نێوانیان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبوو تا ئەوە بوو سالی ١٩٦٤ ئەو ناكۆكییانە بەیەك جاری تەقینەوەو پارتی بووە دوو باڵ: باڵی مەكتەبی سیاسی بە سەرۆكایەتی ئیبراهیم ئەحمەد و باڵی سەركردایەتی بە سەرۆكایەتیی مەلا مستەفا.

هەرچی سەبارەت بە مام جەلالە، سالی ١٩٤٧ وەتە ئەندامی پارتی کە تەمەنی ١٤ساڵ بووە، ساڵی ١٩٥١ لە کۆنگرەی دووەمی پارتیدا هەڵبژێردرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، لە کاتێکدا تەمەنی ١٨ ساڵ بوو.

مام جەلال لە سەرەتادا لەم کێشمە کێشمەی نێوان مەکتەبی سیاسی و ئیبراهیم ئەحمەد بەبێ لایەنی ، مەلا مستەفاش لە بەر ئەوەی متمانەی زۆری بوو، دەیویست ئیبراهیم ئەحمەد لە سکرتێری حیزب لاببات و ئەو لە جێگەی دابنێت. بەڵام هەر زوو هەستی بەو مەترسییە کرد بوو کە لەناو پارتیدا سەقفی خواستەکانی دیاری کراوەو بە سەرۆکایەتی ئەو حیزبە بۆ بنەماڵە قۆرخکراوە، بە ئاراستەی باڵی مەکتەبی سیاسیدا خۆی یەك لایی کردەوە.

ئەگەر چی دوور کەوتنەوە لە مەلا مستەفا بۆ مام جەلال، کارێکی ئاسان نەبوو، بە تایبەتی ئەگەر ئەو ڕاستییە بزانن کە مام جەلال لە هەرەتی لاوییەوە سەرسامییەکی لە ڕادەبەدەرەی هەبووە بە مەلا مستەفا، تەنانەت بەسەرۆکایەتی وەفدی قوتابیانی دەچێتە یەکێتی سۆڤیەت و لەوێ بۆ یەکەم جار بارزانی دەبینێت، لە خۆشیدا دەست دەکات بە گریان. ئەم خۆشەویستیەش لە لای مەلا مستەفاش بەهەما شێوە بووە، تەنانەت زۆر جار لە ناو خێزانەکەیدا ووتویەتی"جەلال کوڕی خۆمانە".

دەرکەوتنی تالەبانی لە کاری سیاسیدا، هەرچەندە لە سەرەتای لاوییەوە بوو. بەڵام ئەزمونی ڕاستەقینەی ئەو سەرەتاکانی شۆڕشی ئەیلول بوو لە ساڵی١٩٦١، کە بەشی زۆری ناوچەکانی کوردستان گەڕا، بە تایبەتی ناوچە سۆرانییەکان و خەڵکی ناوچەکانی هاندا بۆ بەشداری کردن لە شۆڕش. لە مەشدا شێوازی بەهێزی ووتار دانی ئەو کاریگەری هەبوو، سەرەڕای ئەوەی کە تاڵەبانی سەرکردەیەکی سەربازی بوو، چونکە ساڵی١٩٥٩ لە ڕیزی سوپای عێراقیدا لێپرسراوی کەتیبەی تۆپخانە بووە.

چونی مام جەلال بۆ ناو باڵی سیاسی،کاریگەری هەبوو لەسەر بەهێز بوونی ئەو باڵە، ئەویش لەبەر ئەوەی مام جەلال سەرکردەیەکی مەیدانی بوو،هەروەها پەیوەندییەکی فراوانی لەگەڵ سەرۆك هۆزو کادیرو پێشمەرگەدا هەبوو لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا، بە پێچەوانەی ئیبراهیم ئەحمەدەوە کە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی سنورداربووە، هەر لەبەر ئەوەش بوو لە دوای جیا بوونەوەوە، هەرچەندە ئیبراهیم ئەحمەد

کەسی یەکەمی باڵەکە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا باڵەکە بە"ئیبراهیمی" ناسرابەڵکو بەباڵی" جەلالی ناسرا، ئەمەش ئاماژە بوو بۆ کاریگەری کەسێتی تاڵەبانی لە ناو ئەو باڵەدا.

هەروەها تاڵەبانی کەسێتییەکی سیاسی و سەربازی گرنگ بوو، لە کاتێکدا ئیبراهیم ئەحمەد تەنها کەسێتییەکی سیاسی هەبوو، تەنانەت هیچ جۆرە چالاکییەکی سەربازی نازانرێت کە ئیبراهیم ئەحمەد بەشداری تێدا کردبێت.

کاتێك باڵی مەکتەبی سیاسی لە پارتی جیا بۆوە، ئەمە بە مانای ئەوە بوو باڵی مەلایی دەستی لە ناوچەی سۆران بەردەبێت و دەبێتە دەبێتە حیزبێکی بادینی، بۆ پڕ کردنەوەی ئەم بۆ شاییە، مەلا مستەفا لە ماوەیەکی نزیك یەك لە دوای یەکدا لە ناوچەی سلێمانی، کچی لە دوو بنەماڵەی گەورەی سلێمانی بۆ دووان لە کوڕەکانی هێنا، یەکەمیان کچێك بوو لە بنەماڵەی حمە اغای سلێمانی بۆ ئیدریسی کوڕی بەناوی(نازدار) کە دەکاتە دایکی نێچیرڤان بارزانی و ئێستا لە ژیاندا نەماوە.

بنەماڵەی حمە اغا یەکێك بوون لە دیارترین بنەماڵەی سلێمانی و یەکێك بووە لە دەوڵەمەندو سەرمایە دارەکانی سەردەمی خۆی کە خاوەنی موڵکێکی زۆر بووە لە سلێمانیدا مەلا مستەفا لە ناوەڕاستی ساڵانی سییەکاندا کە لە سلێمانی بووە، ناسیویەتی و پەیوەندیی لە نێوانیاندا دروست بووە، لە پشت هەڵبژاردنی ئەم بنەماڵەیەوە لەلایەن بارزانییەوە سەرەڕای ناسراوییەکەیان، هۆکارێکی گرنگی دیکە هەبوو، ئەویش ناکۆکی توندی نێوان ئیبراهیم ئەحمەدو حەمە اغا بوو، چونکە کاتی خۆی ئیبراهیم ئەحمەد خەڵکی سلێمانی هاندا دژی خاوەن موڵکەکانی سلێمانی و لەسەر ئەوەش لە لایەن چەکدارەکانی حەمە اغاوە تەقەی لێدەکرێت وبریندار دەکرێت، هەر لەبەر ئەوەش سلێمانی بەجێ هێشت و لە کەرکوك نیشتەجێ بوو.

دووەمیشیان، کچێك بوو لە بنەماڵەی میرزا سابیری پێنجوێن بۆ سابیری کوڕی مەلا مستەفا بە ناوی(سەبری) و هەتا ئێستاش لە ژیاندا ماوە. ئەوەی تێبینی دەکرێت؛ مەبەست لەم کارەی مەلا مستەفا، دۆزینەوەی ئەڵقەیەك بووە کە باڵەکەی ببەستێتەوەبە ناوچەیەکی گرنگی وەکو سلێمانییەوە لە مەشدا سەرکەوتوو بوو.

ڕەنگە وویستبێتی ئەو تێڕوانینە لابەرێت کە لەسەری هەبووەو تۆمەتبار کراوە بەوەی کە ئاسۆی بیرکردنەوەی لە چوار دەوری خێڵەکەی دەسوڕێتەوەو تەنها خەڵکی بادینانیی لەگەلیدایە.

لەبەرامبەر ئەم هەوڵەی مەلا مستەفادا، ئیبراهیم ئەحمەد بێ کاردانەوە نەبوو. ئەوە بوو ساڵی١٩٦٩ کاتێك بارەگای سەرەکییان لەبەکرە جۆ بوو، ئیبراهیم ئەحمد بیری لە بەهێز کردنی پەیوەندییەکانی نێوان خۆی و مام جەلال کردەوە. هەر بۆ ئەم مەبەستەش بۆخۆی پێشنیاری ئەوەی بۆ تاڵەبانی کرد کە کچە گەورەکەی(هێرۆ خان) مارە بکات. هەندێك کەس، لەوانە؛ هەژار موکریانی، کەلای ئەم باڵە جێگەی متمانە نییە، ئاماژە بەوە دەکەن کە هێرۆ خان لەو کاتەدا بەو هاوسەرییە ڕازیی نەبووەو نەیویستووە شوو بە مام جەلال بکات، بەڵام جەخت کردنەوەی باوکی لەسەر ئەنجام دانی ئەو کارە لە کۆتاییدا ڕازیی کردووە. بەم پێیەش هاوسەری نێوان تاڵەبانی و هێرۆ خان سەفقەیەك بووە بۆ بەهێز کردنی باڵی جەلالی و نزیك کەوتنەوەی زیاتری ئیبراهیم ئەحمەد وتاڵەبانی، هەروەك دەتوانرێت ئەم هاوسەرییەی نێوان تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد بە سەفقەیەك لێکبدرێتەوە کە بریتییە لە پشتگیری تاڵەبانی لە ئیبراهیم ئەحمەدو هەڵبژاردنی بەسەر مەلا مستەفادا، لەبەرامبەر خەڵاتێکی گران بەها کە بەخشینی کچەکەیەتی بە مام جەلال، ڕەنگە ئەمەشیان نەبێت، بەڵکو ئیبراهیم ئەحمەد کاریگەر بووبێت بە زیرەکی و لێهاتوویی مام جەلال و وویستبێتی خەلیفەیەك بۆ دوای خۆی دروست بکات و بەلای ئیبراهیم ئەحمەدیشەوە ئەو کەسە تاڵەبانی بووە، هەر بۆیە لە دوای ئەوەوە ئیبراهیم ئەحمەدواز لە کاری سیاسی دەهێنێت و دادەنیشێت.

ئەم هاوسەرگیرییەی نێوان مام جەلال و کچی ئیبراهیم ئەحمەد لە زۆر ڕووەوە لە هاوسەرگیری نێوان سەدام حسێن وکچی خەیروڵا توفاح دەچێت کە تێیدا خەیروڵا توفاح ئیبراهیم ئەحمەد وەك تیۆریزە کەر بۆ فیکری زاراوەکانییاندەردەکەون. لە ماوەی ساڵانی ١٩٧٠ و دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا دیسانەوە لە نێوان دامەزرێنەرو کادیرە دیارەکانی ئەو کۆمەڵەیەدا جۆرێك لە هاوسەر گیری سیاسی دەبینرێت. بە تایبەتی هاوسەر گیری نێوان ڕوناکی شێخ جەناب لەگەڵ مەلا بەختیاردا، شێخ جەناب کوری شێخ نوری شیخساڵح و برای شەهابە،بۆخۆی یەکێکە لە دامەزرێنەرەکانی کۆمەڵە. هەندێك لەو باوەڕەدان کە نزیك بوونەوەی مەلابەختیار لەم بنەماڵە گرنگەی سلێمانی، کاریگەری گەورەی هەبووە لە دەرکەوتن و هاتنە پێشەوەیدا لە ڕیزەکانی کۆمەڵەداو هەر ئەوەش بە هۆکار دەزانن بۆ بوونی بەیەکێك لەو بەر پرسانەی بۆ هەرێمەکان دیاری کراووە.

هەروەها دەکرێت هاوسەرگیری نێوان هەریەك لە ئەرسەلان بایز لەگەڵ بنەماڵەی حەفیدو نەوشیروان مستەفاو حمە تۆفیق ڕەحیم و حەمەی مەلا قادرو محمود محەمەد بە جۆرێك لە جۆرەکانی هاوسەر گیری سیاسی بخوێنرێتەوە کە تیایدا نزیك بوونەوەی سیاسیانەی بنەماڵەکان ئامانجی لە پێشینە بووە.

هەروەها هاوسەرگیری ناوخۆیی نێوان بنەماڵەی بارزانی کە تیایدا مەسعود بارزانی کچی خۆی دەداتە برازاکەی(نێچیرڤان)، دیسانەوە هاوسەرگیرییەکی سیاسیە. کە ئامانجی لێ ی پاراستنی یەکێتی بنەماڵەکەیە، بەتایبەتی کە نێچیرڤان کوڕی ئیدریس بارزانی یەکێك لە ڕەمزە دیارەکانی بنەماڵەیەو قورسایی گەورەی هەیە لە بنەماڵەکەدا. هەڵبژاردنی نێچیرڤان وەکو زاوا، بەمانای کردنەوەی نێچیرڤانە بەیەکێك لە کوڕەکانی خۆی. بە مەبەستی ڕیکرتن لە هەر تەکەتول و ناکۆکییەك لە نێو ئەندامانی ئەو بنەماڵەیەدا، هەرچەندە منداڵ نەبوونی نێچیرڤان لەم ژنەی کە کچی مەسعود بارزانییە، دیسانەوە جێگەی دروست بوونی دڵە ڕاوکێ و ئەگەری کێشەیە لە نێو بنەماڵەدا، بە تایبەتی ئەگەر نێچیرڤان ئەوە قبوڵ نەکات منداڵی نەبێت.

بە بڕوای هەندێك کەس ئەم بابەتە ڕەنگە لە ئێستادا بیت یان داهاتوو کێشەیەك لە نێو ئەو بنەماڵیەدا بخوڵقێنێت. بە تایبەتی ئەگەر ڕەزامەندی نەدرێت بە ژنهێنانەوەی نێچیرڤان.

دەبێت ئەوەش لە بەر چاو بگرین هەندێك جار شکست هێنانی ئەو هاوسەرگیریانە بە شێوەیەکی زۆر قورس دەکشێتەوە لەسەر پەیوەندییە سیاسیەکانی نێوان هەردوو بنەماڵە.

بۆ نمونە؛ شکست هێنانی پەیوەندی هاوسەر گیری نێوان ژن براکەی د. بەرهەم و مالی ئیبراهیم ئەحمەد زۆر بە خراپی شکایەوە بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان ئەو دوو بنەماڵەیەدا کە بەر لەوەی پەیوەندییەکانییان گەرموو گوڕ بووەو هەتا ئێستاش هەست بەو ساردییە دەکرێت کە دوور نییە لە ئلیندەدا د. بەرهەم باجی ئەم کێشەیە نەدات.

لە مێژووی نزیکیشدا هاوسەرگیری نێوان بنەماڵەی تاڵەبانی و مەلا بەختیار نمونەیەکی زیندووی ئەو هاوسەرگیرییە سیاسییەیە، کاتێك مەلا بەختیار کچەکەی دەداتە کوڕە گەورەکەی تاڵەبانی، هەرچەندە دەوترێت ژنە پێشینەکەی کە ڕوناکی شێخ جەنابە، دەستی لەم پشودانەدا هەبووە. بەڵام دوا جار بە قازانجێکی زۆر بۆ مەلا بەختیار شکایەوە کە بووە هۆی بەهێز کردنی پێگەی سیاسی ئەو لە ناو حیزبدا. بەو پێیەی چی تر پشتیوانێکی

بەهێزی پەیدا کرد لەناو حیزبدا کە ئەویش خودی تاڵەبانی و دواتریش هێرۆ خان کوڕە گەورەکەیەتی. بەتایبەتی ئەگەر ئەوە لەبەر چاو بگرینکە مەلا بەختیار پێشترو لە ساڵی ١٩٨٦بە قورسی باجی بێ پشتیوانی دابوو لەناو یەکێتییدا.

مەلا بەختیار بەهۆی ئەم هاوسەرگیریەوە بەتەنها نەبووە کارگێری مەکتەبی سیاسی یەکێتی، بەڵکو بوویە یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەی تاڵەبانی، ئەمەش بە ڕوونی لە کاتی نەخۆش کەوتنی تاڵەبانیدا ڕوویدا، کاتێك تەواوی ئەندامانی خێزانی تاڵەبانی لەدەوری یەکتری کۆبوونەوە لە عەممان و مەلا بەختیاریش یەکێك بوو لەوانەی کە وەکو یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵە حساب کرا. ئەمەش بۆ کەسێکی وەکو مەلا بەختیار زۆر گرنگە، بە تایبەتی ئەگەر بزانین کە ئەو لەلایەن چەند جەمسەرێکی یەکێتییەوە دژایەتی دەکرێت.

## لەساڵی ١٩٦٦ وەکو باڵی جەلالی لەگەڵ حوکومەت ڕێککەوتین چەکمان هەڵگرت و چووینە سەر بارزان و بارزانییەکانمان دەگرت.

***گفتوگۆی هەردی مەهدی وهیمدادحەمید***

### بەشی یەکەم

حەریکە دەبیتە شایەتحاڵێکی ڕوداوەکانی سی چارەکەی سەدەی رابردووی کوردوستان و عیراق لە سییەکانی سەدەی رابردوودا لەدایك بووە لە گەنجیتییەوە پییەکی چووەتە ناو سیاسەت و پیکەی تری لەناو تویژینەوە میژوویی و دەرونییەکانیدایە بەپەروەردەیەك ی ئیسلامیانەو لە ریکخستنەکانی ئیخوانو لموسلیمینەوە دنیای حیزبایەتی و سیاسی و دەستپیدەکات و بە((چەپ )) یکی دنیادیدە خەریکە ژیانی خۆی تەواو دەکات ئەو(د. عبدولستار تاهیر شەریف)لە پەنجاکانەوە تا ئەمرۆ چەندین پۆستی وەرگرتووە لە ناوەراستی حەفتا کانیشدا لە سەردەمی رژیمی بەعس ۆبووەتە وەزیری نیشتەجیبون ئەو سیاسییەکی نەوەی پیشووە و لە ئیستاشدا بە هەلویستە سیاسییەکانیدا لە ململانیدایە جیاوازی ئەو سیاسییە هاوتەمەنەکانی لە وەدایە کە ئەو ژیانی سیاسی بی سلکردنەوە بە هیزی و لاوازییەکانییەوە بە جورئەتەوە دەخاتە روو تەنانەت لە خالە لاوازەکان و شکستە کانیشدا خاوەنی پاساوی بە هیزو بروا پیهینەرە لە کاتی مالئاوایشدا دوا پەیامی ئەوەبوو چاوپیکەوتنەکە ((بەبی دەستکاریکردن )) دیربەدیری بلاوبکریتەوە بەپرسیاری سەرەتای ژیانی سیاسیت دەستی پیکرد؟ وەلامی لڤین ی دایەوە

**عبدولستار تاهیر شەریف:** لە سالی ١٩٥٠ خویندکاری ناوەندی بووم چومە ریزی ئیخوانولموسلیمینەوە کە ئەوکات لە کەرکوك چالاکییان زۆر بوو سەرەتای کاری سیاسیم لە گەل ئیخوانولوسلیمینەوە بوو لە ریگەی مامۆستایەکمەوە تیکەلیان بووم کۆمەلیك گەنج بووین لە هاوریکانم د. موحسین عبدولحەمید کە بەم دواییە سەرۆکی حیزبی ئیسلامی بوو عەباس علی عەتا سەرۆکی زانکۆیە دیارە ئیمە لە سەر ریبازی حەسەن بەننا بووین ئەوکات سەید قوتب سجن بوو ئەو دەورەی نەبوو لە ئیخوانولوسلیمین ماینەوە وەکو کوردیك عەقیدەم ئیسلامی بوو بروام بەنەتەوەپەروەری نەبوو دواتر دوای ئەوەی پانزە جوزئی قورئانم لەبەر کردوو لەبارەی دابەزاندنی قورئان و هاتنی ئاینی ئیسلامەوە شتم

خویندەوە هەندیك گومانم پەیدا کرد یەکیك لەوانە قەزی ئەنفال بوو بڕوام وابوو ئەنفل چ وەك قورئان و چ وەك جیبەجیکردن کە دەچوون مال و مولك و کچی خەلکیان دەهینا پیموابوو مومکین نییە خودا وابکات لە سالی ١٩٥٧لە ئیخوانولموسلیمین وازمان هینا جەلال عبدولرەحمان یش کاریگەری لەسەر دروستکردنی بیری نەتەوایەتی من هەبوو کە ئەوکات لە ریداربووم لەسالی ١٩٥٥((جەلال عبدولرحمان )) بەریوبەری قوتابخانەبوو و منیش مامۆستا بووم من ئیخوانولموسلیمین بووم ئەویش پارت ی بوو دوا ی شۆرشی ١٤ای تەمووزی ١٩٥٨یش ئیمە کۆمەلیك بووین وەك عبدوللانەجیم سەراج کەلە شۆرشدا ناوی میرزا شوان بوو ئەحمەد هەرزانی ململانی کەوتەنیوان شیوعی و پارتییەوە ئەوەبوو مەلا عبدوولا ئیسماعیل(مەلا ماتۆر )لەگەل مەلا عبدوللای جوتیاران هاتن و داوای لیستی ناوی پارتییەکانیان لیکردین وتمان ئیمە پارتی نین وتیان چۆە ئیوە پارتی نین و ئەمەش دەکەن؟ ئیتر دوا ی ئەوە لیژنەی محەلی کۆبووەوەو ئیمەیان کرد بە ئەندامی پارتی من و عبدوللا نەجیم و ئەحمەد رەئوف لیژنەیەکی ریکخراومان پیك هیناو دستمتنکرد بە چالاکی چالاکیمان زۆربوو خەلکیکی زۆرمان لە دەوری پارتی کۆکردەوە ململانیش هەر هەبوو لە سالی ١٩٥٨بووم بەبەرپرسی لیژنەی محەلی شوان لە کۆتای سالی ١٩٥٩ دا منیان گرت بە تۆمەتی ناردن ی جوتیاربۆ کەرکوك لە روداوەکانی ئەو سالەی کەرکوکدا کەواش نەبوو چوار سال حکوم درام سالی یەکەم لە زیندانی بەغداد مامەوە و ماوەکەی تریشی لە زیندانی کووت بووم تا لیبوردنە گشتییەکەی عەبدولکریم قاسم لە کۆتای ١٩٦٢کە هەموو زیندانییەکان ئازاد کران پاشان بۆ ماوەی سالیك لەلایەن پۆلیسەوە چاودیری کرام دەبوو بەیانیان و ئیواران بچم بۆ بنکەی پۆلیس ئیمام قاسم ئیمزابکەم لە سالی ١٩٦٣کە عەبدولسەلام و بەعسییەکان هاتنەوە سەرحوکم دیارە مەلا مستەفا لە گەلیاندا ریکەوتبوو ئیمەش وەکو پارتییەکان پالپشتی بەعسییەکانمان کرد چونکە دژی عبدولکریم قاسم بووین کە کودەتاکە بوو من دەچووم بۆ ئیمزاکردن لەوکاتە کوریك هەبوو ناوی ئەحمەدبوو لە ئەمن بوو بە پاسکیلیکەوەهات و پییوتم فەرمانی دەستگیرکردنت بۆ دەرچووە خۆت بشارەوە دواتر بەیارمەتی پۆلیسکی خانەنشین بەناوی(سمە گۆج)دەریکردم دواتریش چوومە بنکەی شەهید مەئمون لە گوندی خلە گەروو بوومە کادیر لە ناوچەی شوانی سەرخاسە کە دوانزە کادیری هەبوو لە کۆتای ١٩٦٣گواستیانمەوە بۆ خانەقین دوای ئەوەی حەمە حسین کوردەی بەرپرسی لیژنەی محەلی خانەقین دوو کاکەیی کوشتبوو و هەردوو

کاکییەکەش پارتی بوون ئەوەیان تەجمید کردوو منیان خستە شوینەکەی لیژنەی محلی خانەقین سەر بە بەغدا بوو کە لقی پینجیان پیدەوت واتە بووم بە ئەندامی لقی پینجی پارتی دیوکراتی کوردوستان لە مانگی نیسانی ١٩٦٤دا بریاردرا کۆنفرانس لە ماوەت ببەسریت زیاتر لە ٨٠کەس ئەندامی ئەو کۆنفرانسەبوون بە کۆی دەنگ مەلامستەفامان لە دەسەلاتە لە دەسەلاتەکانی(تجرید) درانی ئەوەی ئۆپۆزسیۆن بوو دکتۆر فوئاد بەیتەری بوو ئەو وتی با هەموومان بچینەوە لای مەلا مستەفا و کۆببینەوە علی عبدولا و نوری شاوەیس لە هەمووکەس توندرەوتر بوون و یەکیك لە هۆکارەکان بوون بۆ ئەوەی ئیمە هەلویستمان لەماوەت بەو جۆرەبیت کەچی دوایش هەرئەوان گەرانەوە واتە پیاوی ئینتیهازی و فرسەتی بوون ئەوان وەزعەکەیان لە بەرچاوو بوو لە ناو ململانیکەدا بوون ئیمەیان خراپ تیگەیاند مەحزەری کۆنفرانس من و مەلا عبدوللا ئیسماعیل دەماننوسی ئیمەی ئەندامانی کۆنفرانس هۆشیاری سیاسی تەواومان نەبوو نەماندەتوانی کیشە نیو دەولەتییەکان دیاری بکەین ئەو دووبەرەکییە بوە هۆ ی هەلگیرساندنی شەری ناوخۆ لە نیوان جەناحی مەکتەبی سیاسی و جەناحی بارزانی جەناحی بارزانی هیزیکی گەورەیان هینایە سەربەمۆ کە نوری مەلا مارف(نوری کەلەشیر)سەرکردایەتی دەکرد بە زیل و سوپای عیراقییەوە جەماعەتی ئیمە کشانەوە و بۆ ئیران چوون بەلام من نەچووم و گەرامەوە کەرکوك لە سالی ١٩٦٤ کە دووبەرەکی بوو مەلا مستەفا لەگەل حکومەت ریککەوت و حکومەت هاوکاری دەکرد

**لڤین: ناکۆکیتان لەگەل بارزانیدا چی بوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** ناکۆکییەکە لە سەر بەیانەکەی ١٩٦٤بوو لەگەل عبدولسەلام عارف ریککەوت لە ئیزگەوە وتی(ارجع الی اعمالکم الحره الکریمه الشریفه )) بە عەبدولسەلامی وت(المومن موتمین المسلم الموتمن )) واتە ئەمە موئتەمەنەو بەقسەی بکەن دیارە ئەو دووبەرەکییە بوو گەرامەوە بۆ بەغداو لە ئیران مانەوە دواتر ریکخستنی نهینییان لە کەرکووك دانا

**لڤین: هۆکاری ئەو دارنینەی مەلامستەفا لە دەسەلاتەکانی ئەوەبوو کە جەناحی مەکتەبی سیاسی رازیی نەبوو بە ریکەوتن لەگەل عبدولسەلامدا؟**

**عبدولستار تاهیر:** عەبدولسەلام عارف لەگەل مەلا مستەفا ریکەوتبوو بەبی ئەوەی لیژنەی مەرکەزی و مەکتەبی سیاسی ئاگادار بکاتەوە مەکتەبی سیاسی چوونە لای مەلا مستەفاو پیانوت ریکەوتنەکە لەسەر چی ئەساسیکە؟ ئیدارەی محەلی و سوپا دەگەریتەوە

پیمانوت لانیکەم سی چوار بەندی نهینی هەیە بۆ ئەوەی بە خەلکی بلیین پیمانوت ئەمەی تۆ کردوتە هیچ نییە ئاشبەتالە قبولی نەکرد وتی: ئەوەی رازی دەبیت باشە ئەوەی رازی نابیت لییدەدەم

**لڤین: ئەوی ئەو قسەیە راستە کە دەلین شیخ ئەحمەد بارزانی هیچ پایەیەکی لە حیزبدا نەبوو بەلام بەیانیکی دەرکردبوو؟**

**عەبدولستار تاهیر:** شیخ ئەحمد لە سەردەمی عبدولکریم قاسمدا لە گەل سووپادا ریککەوت هەموو سوپاکە لە بادینان کشانەوە هیرشیان کردە سەر قەندیل و چەمی ریزان و ئیمەش بۆ قەلادزی رامانکرد بەلام دواتر عبدولسەلام لەگەل ئەحمد حەسەن بەکردا تیکچون مقاوەمە شەعبیان هەبوو و لە یەکتریان دا سوپا لەو ناکۆکییەدا بیلایەن بوو مام جەلال لە قەلادزی هاتە لام وت ی بگەریرەوە بۆ کەرکوك و شەریکەی نەوت بگرن سوپا حەقی نییە منیش وتم شەریکەی نەوت بەچی بگرین؟ ئیمە قازیفەیەکمان نییە وتیشم کویخا جەباری گورگەریی سەرخاسە بووتە جاش دەچین دەیگرین لەگەل مەرکەزەکەی ریداردا ئیمە چووین جاشەکانی گورگەیی مان گرت بەلام لە گرتنی مەرکەزەکەی ریداردا سەرنەکەوتین ئەمەیان شیخ ئەحمەد کردی کە ببووە جاش بەلام ئەوەی ١٩٦٤پەیوەندی بە شیخ ئەحمەدەوە نەبوو

**لڤین: ئەوەی شیخ ئەحمەد هۆکارەکەی چی بوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** شیخ ئەحمەد نەیدەویست بارزان قەسفبکریت و تیکبچیت بۆیە بەیانەکەی دەرکرد

**لڤین: بی پرسی مەلامستەفا ئەمەی کرد؟**

**عبدولستار تاهیر:** شیخ ئەحمەد پیویستی بەوە نەبوو لە مەلا مستەفا بپرسیت و مەلا مستەفا لەسەر دەم دەچووە لای شیخ ئەحمەد ئەو خودانی بارزان بوو ئەو دووبەرەکییەی ئیمە لەگەل مەلا مستەفا دا لەسەر ریکەوتنیك بوو کە لەگەل عەبدولسەلام کردی ئیمە بەیانمان دەرکرد برادەرانی ئیمە لە ئیران حەبیب محەمەد کەریم یان دەرکر بە سکرتیری پارتی نامەیەکی بۆ شەمسەدین موفتی نووسی لە ئیران تیایدا دەلیت مەلا مستەفا ئەمەی کردووە

**لڤین: پیش ئەوەی ببیت بە سکرتیروا دەلیت؟**

**عەبدولستار تاهیر:** کە سکرتیربوو وایوت دەشلیت ئەمانە ئینسانی باش بوون((واتە جەناحی مەکتەبی سیاسی)رۆشنبیری بوون لە کۆتایشدا دەلیت(( وبارك الله بهذا زعيم الحرب الشريف )) و هیچیشیان لینەکرد شەمسەدین موفتی ئەم نامەیەی بە ئیبراهیم ئەحمەد دابوو ئەویش لە خەبات بلاویکردەوەو منیش لە کتیبەکەمدا بلاومکردەوە

**لڤین: واتە سکرتیری پارتیش بوو دژی مەلا مستەفا قسەیدەکرد؟**

**بدولستار تاهیر:** ئەمەی بەدزییەوە نوسیبوو نەیزانی دەگاتەوە دەستی حەبیب کابرایەکی ئینتیهازی بوو

**لڤین هیچیان لە حەبیب کرد؟**

**عبدولستار تاهیر:** هیچان نەکرد بارزانییەکان دەیانزانی ئەم هیچی پیناکریت چونکە نفوزی نەبوو بۆیە هیچیان لینەکرد ئەم دووبەرەکییە لە نیوان ئیمەو مەلا مستەفا تا ١١ی ئازار بەردەوام بوو هەتا ربەیانی ١١ی ئازاریش من سکرتیری فەرعی کەرکوك بووم لە جەناحی مەکتەبی سیاسی کە پیاندەوت(جەلالی)لەوکاتەی کە من سکرتیری فەرعی کەرکوك بووم کۆنگرەی جەوتی کەلار مان بەست

**لڤین: لونیوان سالی ١٩٦٤-١٩٧٠ دابرانیکی زۆر لەنیوان هەردوو جەناحەکەدا هەیە هەروەکو ئیبراهیم ئەحمەد دەلیت بە ئیمەیان دەوت جاش و بە ئەوانیان دەوت باش لایەنگیریی ئیوە بۆ حکومەت لەسەر چ ئەساسیك بوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** بە پیی ریکەوتن بوو لە سالی ١٩٦٦پیش ئەوەی ئیمە لەگەل حکومەتدا ریبکەوین دانوستان لە نیوان مەلامستەفا و حکومەتدا هەبوو حکومەت لەگەل ئەواندا رینەکەوت و لەگەل ئیمەدا ریککەوت ئیمە ریککەوتین بەلامەرکەزیی

**لڤین: ئەی ئەگەر ئەوان ریکبکەوتنایە بە پیچەوانەوە دەبوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** بە هەمانشیوە دەبوو لەو رووداوەدا ئیمە لەگەل حکومەتدا چەکمان هەلگرت و چوینە ناوچەی بارزان و بارزانیمان دەرگرت و لیماندەدان شەرمان لەگەلدا دەکردن ئەمە واقیعەکەبوو کە نەدەبوو وامانبکردایە

**لیڤین: واتە بەهەلەیەکی سیاسی دەزانیت؟**

**عبدولستار تاهیر:** سەرچل دەلیت((دووکەس دەیتوانی شەری جیهانی نەبیت بەلام ئەم قسەیە نابیت تازە شەری جیهانی روویدا ))

**لڤین: لەوکاتەدا پۆستەکەت چی بوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** سکرتیری لقی کەرکوك بووم پیش دەرچونی بەیان ی ١١ای ئازاریش قایمقامی کۆیەبووم لەسەر میلاکی جەناحی مەکتەبی سیاسی ,٥٠٠چەکدارم لەگەلدابوو لە یەککاتدا سی بەرپرسیاریم هەبوو((حیزب و حکومەت و پیشمەرگە )) ئیمە ئەو ناوچانەمان هەمووی بەدەستەوەبوو تا قەلادزی بابەکر لە رانیە قایمقام بوو مەلا مستەفا هیچ شوینیکی بۆ نەمابووەوە من بی حیمایە لە کۆیەوە بۆ قەلادزی دەچووم

**لڤین: لەسالی ١٩٦٨مەلا مستەفا لەگەل بەعسدا ریکدەکەویتەوە واتە لەگەل ئەحمەد حەسەن بەکردا پیشتریش لەگەل تەها یەحیادا لەوکاتەدا کە تەها محیدین دەبیتە وەزیر لە بەرامبەردا موحسین دزەیی و ئیحسان شیرزاد دەکشینەوە دەتوانیت وردەکایی ئەم رووداوانە روونبکەیتەوە؟**

**عبدولستار تاهیر:** ئەوەی من باسی دەکەم رووداوەکانی سالەکانی ١٩٦٩ ـ ١٩٧٠ ن لەوکاتەدا مام جەلال قائیدی پیشمەرگە بوو غروریك گرتی هەندیك لە غرورییەکانی وەك لە ناوچەی خانەقین عبدلرەحمان جیهان بەخش هەبوو سەرۆك جاش بوو مام جەلال بەر تۆپی دا تۆپ هی حکومەت بوو ئیمە دەننا بە سەرۆك جاشەکانەوە بە ئەفسەرەکانی دەوت پینج مانگی تر چاوەریبکەن بزانە دەتان هیلم لە بەکرەجۆ زیندانی دانابوو رەئیس حەمەدەمین پاریزگارەی هەولیرو ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بوو لە جەناحی مەکتەبی سیاسی مامۆستایەکی کەرکگوکی گرتووبوو لەمالی خۆی لە ئاودەستخانە زیندانی کردبوو هەلسوکەوتەکانی ئیمە بەعسی ترساند بەعس وتی هەر لەگەل مەلا مستەفادا ریبکەوین باشترە ئەمانە ئەگەر دەستیان بروات رۆشنبیرن ئەم شتانە قبولناکەن بۆ یە لەوکاتەدا دانوستانی نهینی لە نیوان مەلا مستەفاو حکومەتدا هەبوو هەرلەم کاتەشدا لەگەل ئیمەدا لە ژیرەوە مفاوەزاتیان دەکرد هەندیکجار دەگەیشتنە ئەوەی لەگەل مەلا مستەفادا ریکنەکەون بە ئیمەیان دەوت لەگەل ئیوەدا ریکدەکەوین کە قائیقامی کۆیە بووم چووم بۆلا ی خالیدعەبدولحەلیم ی پاریزگای هەولیریش ١١ای ئازار ئەو بەمنی وت سبەینی ئیمە ریکدەکەوین لەگەل مەلامستەفاداو بەیانیك بەناوی ١١ای ئازارەوە دەردەکەین کە وایوت من گەراومەوە مقەری هەولیر تەلەفۆنم بۆ بەغداد کرد بۆ مام جەل تا ئاگاداربن ئەو لەوی نەبوو کاك ئیبراهیم لەوی بوو وتی شتی وانییە ئیمە سبەی دووسبەی لەگەل حکومەتدا

ریکدەکەوین وتم کاك ئیبراهیم وەرە کەرکوك من لەمالی عەباسی وەلی بابەتەکەم بۆ گیرانەوە ئەوەبوو ١١ی ئازار بەیانەکە دەرچوو و لەگەل مەلا مستەفادا ریکەوتین

**لڤین: جەناحی مەکتەبی سیاسی ئاگاداری ئەو ریککەوتنە نەبوون؟**

**عبدولستار تاهیر:** ئاگادارنەبوون رۆژی ١٠ی مانگ من ئاشکرامکرد لە کۆنگرەی قیادەی قوتری نوێ حیزبیی بەعس باسی ئەوەیان کردووە کە بۆچی لەگەل مەلامستەفادا ریککەوتن و لەگەل جەناحی مەکتەبی سیاسیدا ریکنەکەوتن دەلیت مەلا مستەفا کاربایەکی عەشایرە هەمووکات دەتوانریت چەك بکریت بەلام جەناحی مەکتەبی سیاسی رۆشنبیرن ناتوانریت لەگەلیاندا وابکریت ئەم بەیانە کەدەرچوو ئەوان دەستیان گرت بەسەر هەمووشتیکدا ئیمە جیمان نەبوەوە لە قایمقامی کۆیەوە کردیانمەوە بە مامۆستا لە ئیمام قاسم و مووچەی مامۆستاییەکەشمان لە ٥٠دینارەوە کرد بە ٣٦دینار مەلامستەفا وتی نابیت لە کەرکوکیش بیت ئەوەبوو گواستیانمەوە بۆ بەغدا

**لڤین ئاشنایەتیت لەگەل مەلامستەفادا هەبوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** هەرگیز پەیوەندیم لەگەل مەلا مستەفادا نەبووە یەکجار لەسالی ١٩٥٩منی بینیوە ئیتر یەکترمان هەر نەبینیوە کە ئیمە لیماندا وەکو جەناحی مەکتەبی سیاس ی مام جەلال لە شارع فەلەستین خولیکی کادیرانی کردەوە لەوکاتەدا فاخیر بارزانی لە هاتوو چۆدابوو بۆ ئەوەی ئیمەو بارزانی ریکبکاتەوە

**لڤین: لە پارتیدا چ پۆستیکی هەبوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** ئەمین قیادییان بوو

**لڤین: ئەی دانوستانەکەی ئیوەو مەلا مستەفا بەکوی گەیشت؟**

**عەبدولستار تاهیر:** کە مفاوەزاتەکە لە نیوان ئیمەو مەلا مستەفا دا کرا مەلامستەفا وتی: نابیت ئیوە بەناوی پارتییەوە مفاوەزات بکەن و دەبیت ناوی حیزبەکەتان بگۆرن لەوکاتەدا لەکەلار کۆنگرەمان بەست و بریارماندا ناوی حیزبەکەمان بگۆرین بە شۆرشگیری کوردوستان((الثوری الكردستانیة)لیژنەیەکی مەرکەزی تازەمان هەلبژارد بۆ ئەوەی مفاوەزبکەین و ئەگەر مەلا مستەفا ریکنەکەوت ئەوا حیزبەکە هەر بەردەوام دەبیت و ئەگەر ریکیشکەوت حیزبەکە حەلبکەین

**لڤین: قیادەی حیزبەکە چۆن بوو؟**

**عبدولستارتاهیر:** بەهەمان قیادەی پیشوترەوە کە ئامادەبوو بۆ مفاوەزات

**لڤین: تۆ پۆستەکەت چی بوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** بەرپرسی لقی کەرکوك بووم پالیوراوی مام جەلال بووم بۆ ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بەلام قبولم نەبوو وتم نایکەم

**لڤین: بۆچی قبولت نەبوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** باوەرم بە قیادەکە نەبوو لە کۆنگرەکەشدا وەفدیکمان پیکهینا لە مام جەلال و علی عەسکەری و چەند کەسیکی تر بۆ لای مەلا مستەفا بۆ ئەوەی ناوی حیزبەکە حەلبکەین بە((الثوری الكردستانیية )) و دوای سالیك کۆنگرە ببەسریت و سیەکی مەکتەب سیاسی بۆ ئیمە بیت و لیژنەی مەرکەزی بە هەلبژاردن دەبیت و هەموو ئافرەتان و قوتابیان قیادەکانیان سییەکیان بۆ ئیمە بیت و لە ماوەی سالیکدا ئەمە تەواوبیت کۆنگرە دەبەستین و مەلا مستەفاش سەرۆکمان بیت رازی بووین بەم چارەسەرەو بەیانیکمان دەرکردوو حیزبیکی شۆرشگیریمان حەلکرد من لە کاك ئیبراهیمم پرسی ئەگەر ئەوان دوای سالیك پەشیمانبونەوە چی بکەین؟ وت ی ئیوەی تیکۆشەر دەتوانین کۆنگرە ببەستین و حیزبەکە دروستبکەنەوە

**لڤین: ریککەوتنەکە لەکوی بوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** لە مەکتەبی سیاسی بوو لە گەلالە

**لڤین: ئەم قسەیەی ئیبراهیم ئەحمەد بە نوسین بوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** بە تەسجیل ولە مەحزەریشدا ئەوە نوسراوە و بلاویشمکردۆتەوە ئەوەبوو پیش سالەکە دەستکرا بە گرتنمان و ماجید رۆستەم یان کوشت و چەند کەسیان گرتین

**لڤین: ماجدرۆستەم پۆستەکەی چی بوو؟**

**عبدولستار تاهیر:** ئامر هیزی بالی مەکتەب ی سیاسی

**لڤین: خالەکانی تری ریککەوتنەکەتان چی بون؟**

**عبدولستار تاهیر:** یەکیك لە مەرجەکانیشمان ئەوە بوو مام جەلال و علی عەسکەری و عمر دەبابە لە قەسریك لە گەلالە دابنیشن و نابیت بچن بۆ هیچ شوینیك بۆ ئەوەی چالاکیمان نەبیت ئەمەشمان قبولکردوو بەداخەوە وتم نەدەبوو بەمە رازی ببین چونکە

قیادەکانی خۆمانمان لەوی حیجزکردبوو ئەوان لە گەلالە بوون کە دەستکرا بەگرتنی ئیمە من قایمقامی چەمچەمال بووم چوم بۆلا ی مام جەلال ئیبراهیم ئەحمدو ئەوانی تریش لەوی بوون وتم ئەوا سال تەواو بوو کۆنگرەی پارتی نەبەسترا و دەستکراوە بە گرتنمان و کوشتنمان ئیمەش ئەمە قبول لاناکەین و ئەو قسەیەی ئیبراهیم ئەحمەدم پیوتنەوە مام جەلال وتی شیخ ستار ئیوە حیزبەکە زیندووبکەنەوە مەلا مستەفا من دەکوژیت وتیشی ئەگەر ئیوە بتوانن من دەربکەنە دەرەوە بۆ لوبنان حیزبەکە زیندووبکەنەوە ئیمەش لە ریگەی شیخ جەباری برامەوە کە لە عیلاقاتی حیزبی بەعسدابوو لە ریی ئەوەوە ئیمە توانیمان علی رەزا ئەلکەوازی کە بەعسییەکی کورد بوو ئەوکاتیش سەعدون شاکر بەرپرسی عیلاقات بوو پاسپۆرتی مام جەلال و هیرۆمان دەرکردو بە ناوی نەخۆشییەوە هاتە بەغدادو بی ئاگاداری مەلا مستەفا ناردمان بۆ بەیروت کە ئەو رۆیشت بۆ بەیروت ئیمە بەیانی زیندوکردنەوەی حیزبەکەمان دەرکردوو دەستمان کرددوە بە چالاکی یەکەم کەس محمد حەسەن برزۆ یان کوشت فەیلی بوو کاتی خۆی ئەندامی حیزبی هیوابوو جەماعەتی سامی عەبدولرەحمان بە سەیارەی سامی کە ئەوکات وەزیربوو دەریان کردوو لە ناو بەغداد کوشتیان و بکوژەکەشیان رزگار کرد دوای ئەم رووداوە ئیمە چالاکیمان زۆربوو وەکو حیزبی شۆرشگیری کوردوستانی و قیادەی مەرکە زیمان هەلبژارد مەلا ماتۆریش ئیتیفاقی کرد من بووم بە سکرتیر ئەویش قبولی نەبوو ئەوانی تریش وەکو بابەکرپشدەری و مەلا عەبدوللای کانیمارانی و کۆمەلیکی باشی ترمان لەگەلدابوو مام جەلال مەکتوبیکی بە مامۆستا عەبدولرەحمانی زەبیحی دا(ئەندامی مەکتەبی سیاسی شۆرشگیری کۆن بوو)بۆ ناردم نوسیبوی و دەلیت کە ئەمە بە دەستت گەیشت حەزدەکەم بییت سەرم لیبدەیت و لەسەر ئیتیفاقی پیشوومان بۆ زیندوکردنەوەی حیزبەکە وەرە بۆ ئیرە(**بەیروت**) و دیوانیکی تازەی جەواهیری یشم بۆ بینە لە(فندق الشیخ)دیارە ئەوکات من قایمقامی بەعقوبە بووم چۆن دەبیت برۆم بۆلای ئەو و سەدام نەزانیت چووم بۆلا ی سەدام و وتم مام جەلال نامەی بۆ ناردووم و نازانم چی دەلیت من سەرپشکم؟ سەدام نەی دەزانی مام جەلال دەچیتە لای مەلا مستەفا وتی تۆ خۆت عیراقیت برۆ بزانە چی دەویت ئەوکات وەرەوە قسەی لیدەکەین منیش چووم بۆ لای مامجەلال وتی دەبیت ئەو حیزبە حەلبکەن. وتیشی سانزە ئەندامی لیژنەی مەرکەزیتان هەیە ئەگەر دەترسن لە هەر ولاتیکی ئەوروپا بتانەویت لجوئتان بۆ وەردەگرین و حیزبەکە حەلبکەن و ئەمەش داوای مەلا مستەفایە مام

جەلال کەوتی حیزبەکە حلبکەن حیزبەکە لەلایەن مەلا مستەفاوە نامەیەکی بۆ نوسیم بۆ ئیدریس و مەسعود تییدا دەلیت: ئەوا فلان و فیسار لە شۆرشگیری کوردوستانی دین بۆ لاتان لە گەلالە بۆ مفاوەزات ئیمە لیرە لە گەلیاندا ریکەوتوین بۆ بەیانی دواتر مام جەلال، عەزیز شیخ رەزا ی لەگەل خۆیدا هینا کە بەرپرسیکی سەر بە مەلا مستەفا بوو لە بەیروت ی پیکەوە دانیشتین عەزیز شیخ رەزا قسەی حەلەق و مەلەقی دەکرد و وتی شیخ ستار شۆرش دەیتوانی تۆ بکوژیت وتم شۆرش کییە؟ وتی بارزانی منیش وتم من حسابی بۆ ناکەم و من لەسالی ١٩٦٤ەوە هەتا ئیستا دژی بارزانیم ئەگەر بیتوانیایە دەیکوشتم بەلام من ئیستا دەتوانم تۆ بکوژم دەمانچەیەکم پیبوو بە مام جەلالیشم وت زۆر عەیبە بۆتۆ کە دەکەویتە دوای مندالیکی وا لوسکە ئیمە تۆ بەقائیدی خۆمان دەزانین مام جەلال وتی نامەکەت پییە دەمەویت تیبینی بنوسم دەم زانی دەیەویت نامەکەم لیبسەنیتەوە چونکە زانی من ریناکەوم دەیویست ئەو بەلگەیە بەمن نەدا منیش وتم نامەکەم ناردۆتەوە ریکنەکەوتین و گەرامەوە بۆ بەغدا کۆپییەکی نامەکەم برد بۆ سەدام و نامەیەکیشم بۆ نوسی سەدام باوەری نەدەکرد

**لڤین: بۆچی چویتەوە بۆلای سەدام؟**

**عبدولستار تاهیر:** بۆ ئەوەی گفتو گۆکەی بۆ بگیرمەوە چونکە من قایمقام بووم بە ئاگاداری ئەو بۆلای مام جەلال چووبووم وتم مام جەلال دەلیت بزوتنەوەی کوردی بی زەعامەتی مەلا مستەفا رزگارینابیت و شەر لە گەلالە نابیت و لە کەرکووک دەبیت(**مام جەلال لە گفتوگۆکانیدا وای پیوتم**)منیش بە مام جەلالم وت شەر لە کەرکووک نابیت و لەپشتی گەلالەوە دەبیت دوای دەستپیکردنەوەی شەریش مانگیکی پینەچوو مام جەلال لەگەل مەلا مستەفادا تیکیدایەوە و لەژیرەوە کۆمەلیان دروست کرد ئیمە ماینەوە لە چالاکی خۆمان و بەردەوامبووین

## مام جەلال سالی ١٩٨٤هات بۆمفاوەزات لەگەل سەدامدا ولەسەر داوای ئەومەزبەحەی پشتئاشانی شیوعیەکانی سازکرد

**گفتوگۆی هەردی مەهدی وهیمدادحەمید**

**بەشی دووەم**

**لەبەشی دووەمی ئەم گفتوگۆیەدا عەبدولستارشەریف** لەسەرچەندویستگەیەکی تری گرنگی ژیانی سیاسی دەوەستیت و ئەوتۆمەتە رەت دەکاتەوە کە پییوایە حیزبی سەوری موخابەرات دروستیکردبیت وباسلە عوبیدوللای کوری بارزانی دەکات کەپیکەوە وەزیر بون لە حوکمەتی بە عسدا هەروەها هۆکاری هەلاتنی لەبەغداو هاتنی بۆکوردوستان دەکاتودیوی ناوەوەی(**مەزبەحەی پشتئاشان**)یش دەخاتە روو راشکاوانە بۆچونی خۆی لەسەر شۆرشی کوردی دەلیت وپییوایە(شۆرش نەبووە)و(بازرگانی کردن بووە )

**ڤین :راستە دەوتریت حیزبی سەوری حیزبیکە بە ئیعازی بەعس و موخابەرات دروست بووە؟**

**عەبدولستارتاهیر:** حیزبی بەعس وموخابەرات ئاگایان لەمەنەبووە. ئەم حیزبە هەرئەوحیزبەبووە کەبۆمفاوەزات لەگەل مەلامستەفادا دروستمانکردبوو کەلەیەکیك لەمەرجەکانی ئەوەبوو دوای سالیك کۆنگرەببەستریت دوای ئەوەی مەلامستەفا ئیمەی پەراویز خست ئیمە حیزبەکەمان دروست کردووە من ومەلا ماتۆر(مەلا عەبدولائیسماعیل وماموستا عولەما(**عەبدولرحمانی زەبیحی** )چوین بۆلای نازم گزال ی بەریوبەری ئەمن مەلامستەفاش لەبەغداپینج وەزیری هەبوو پیش ئەوەی ئیمە حیزبەکەزیندووبکەینەوە ماموستاعولەمادەیوت منلەگەلتانا ئیشناکەم ئەگەربەعس ریکەوتنم لەگەلدانەکات ئیمەش چوین ئەوەمان بەنازم گزال وتئەویش وتی لەگەل کی ریکەوتن بکەین ئیوە کین؟دوای زیندوکردنەوەی حیزب داوامان لیبکەن بۆریکەوتن لەبەرئەوە ماموستا عولەما لەگەلماندانەهات ئیمە بەیانی زیندوکردنەوەکەمان دەرکرد

**ڤین: ئەمە پیلان نەبوو بۆ دروست کردنەوەی حیزبەکە؟**

**عەبدولستارتاهیر:** نازم گزال هیچ یارمەتییەکی نەداین و پییوتین ئیوە جاری هیچنین دوای دەرکردنی بەیانەکە چووم بۆلای سەدام وتم ئەوان محمد برزۆیان کوشتووە پینج

وەزیریـان هەیـە خەلکیـشمان لیـدەکوژن کابرایـەك تـەنها جامانـەی سـووری لەسـەربیت دەتوانیـت کلاشـینکۆف هـەلبگریت ئیمـە چـی بکـەین؟ ئـەو وتـی ئیمـەناتوانین هـیچ بۆئیوەبکـەین و نـاتوانین لەسـەر ئیـوە بـەیانی ١١ی ئـازار تیکبـدەین بـەلام ئیمـە لـە ١١ی ئازاریشدا لەگەل مەلا مستەفاریکەوتین بۆئەوەی بناغەیەکی دیموکراتی دابنیین ئیمە پییان دەلـیین ئـەو کۆمەلـە کـەحیزبیان دروسـتکردووە ململانیـی سیاسـی بکـەنی نـەك کوشـتن و ئیمەش تەنها یەك شتتان بۆدەکەین ئەویش ئەوەیە کەناتانگرین لەوکاتەی کەئـەوان دەلـین ئەو حیزبە موخابەرات دروستیکردووە ئەوان پینج وەزیریـان هـەبووە و چەکداریان لـەناو بەغدادا هەبووە بەعس زۆرجار ویستویەتی ئیمە لەگەلیاندا مەفرەزە دابنیین ئیمە قبولمان نەبووە ئیمە چەکارمان نیەبووە هەتا ئەوانەی کە حیمایەی خۆم بون ئەوکاتـەی وەزیربـووم هـەموی هـەموی خزموکەسـوکاری خـۆم بـون بـە پـۆلیس تـەعینم کردبـون نـەك پیشمەرگەوجاش من بووم بەئەندامی بەرەی لیژنەی بالای وەتەنی کەریم ئەحمەدو عـەزیز محمد سـکرتیری حیزبـی شـیویعی وموکـەرەم تالـەبانیش بەشداربوون واتـە تـەنها ئیمـە لـە جەبهەدا نەبووین شیویعیشمان لەگەلـدابوو ئەگەرجاشـیتی یـە خۆئـەبیت شیویعیش جاش بیت من بووم بەوەزیربەناوی سەورەی کوردوستانییەوە نەك بەناویکی ترەوە

**لڤـین: کەتۆسـکرتیری حیزبـی سـەوریبویت مـام جـەلال ئیـبراهیم ئەحمـەد رازی بـوون بەوسکرتیرییەی تۆ؟ عەبدولستار تاهیر:** ئەوان رایـان کـرد ئیـبراهیم ئەحمـەد چوبۆلەندەن کەمن بوم بەوەزیر موسیبەتە کە ریکەوتنی جەزائیربوو لەسالی ١٩٧٥

**لڤین: وەزیرەکانی تر کی بون؟**

**عەبدولستار تاهیر:** عوبیدوللا،مەلاماتۆر، هاشم عەقراوی وعەزیز عـەقراوی عوبیـدوللا کوری مەلامستەفابووپیشتر عەبدوللە سور پالیوراو بوو بۆ وەزیـری نیـشتە جیبـون ئیمـە کەچوین بۆ سویندخواردن ئەودەترسا برایەکی لەشاخ بوو نامەیەکی بۆ سەدام نوسی و وتی من نەشتەرگەری فەقەراتم هەیە لەوانەیە سەرکەوتونەبم ئەگەرلیم ببوریت نابم بە وەزیـر سەدام وتی ئـەوە ترساوە لەوکاتانـەدا عوبیدوللاجـەلالی بـرام دەبینیـت و دەلیـت ئـەوە چـی دەکـەیت لـیرە عوبیـدوللا هەرلەسـەرەتاوە لەگـەل مـستەفادا تیکیـدابوو مەلامـستەفا نـەی دەویست لەدوای خۆی عوبیدوللاببیت بەشت جونکە لە حەمایل خان نـەبوو حـەمایل خـان موسەیتەر بووبەسەریدا

**لڤین: ئەی چۆن بوویەوەزیر؟**

**عەبدولستار تاهیر:** دوای ئەوەی لەشۆرش رایکردبوویەعس هینایانەوە بۆبەغداد کەئیمە چوین بۆ سویندخواردن ئەوئاگای لینەبوو شیخ جەلالی برام پیدەلیت شیخ ستارومەلاماتۆر وابون بەوەزیر ئەویش تەلەفون دەکات بۆ نائیب حەداد کەبرادەری بوو دەلیت بمنیرنەوە بۆجەزائیر(پیشتربەعس هینابوویەوە)لەبەرئەوەی نامکەن بەوەزیر ئیمەدانیشتبوین لای سەدام نائیب حەداد تەلەفونی بۆکردو وتی عوبیدوللادەلیت ئەگەرنەمکەن بە وەزیر دەگەریمەوە بۆ جەزائیر سەدامیش وتی بینیره شوینی شاخرمان بۆدروست بووە واتە بۆجیگەکەی عەبدوللا وادانرابو عەبدوللاسوورببیت بە وەزیری نیشتەجیبوون سەدام لایدامە لاوە وتی عوبیدوللا دەست نادات بۆ وەزیری نیشتە جیبوون تۆ ئەوپۆستە وەربگرە کە پیشتروادانرابو ببم بە وەزیری دەولەت هەرچەندە وتم پیم ناکریت سکرتیری حیزبیك و وەزیریکیپۆستداربم وتی بە تۆدەکریت ویارمەتیشت دەدەین من بوم بە وەزیری نیشتەجیبوون و عوبیدوللاش بو بە وەزیری دەولەت

**لڤین:واتە موخابەرات حیزبی سەوری دروست نەکردووە؟**

**عەبدولستارتاهیر:** موخابەرات حیزبەکەی ئیمەی دروست نەکردووە بەلام لەناوخەلکی ئیمەدا هەن کراون بە موخابەرات لە گەل ئەوەشدا ژمارەی ئەوانەی حیزبی سەوری کە بوونەتە ئەمن وموخابەرات لە سەدایەکی ئەوانەی یەکیتی وپارتی نین بەم دواییانە دەرکەوت ئەمن وموخابەرات نەبون لە پلینیۆمی یەکیتیشدا لیبوردنیان بۆ دەرکردن هەیان بووە وەزیربووە پییوەندی بە موخابەراتەوە هەبووە هەیانبوە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بووە پەیوەندی پییانەوە هەبووە ئیمەهیچ شتیکمان بە دزییەوە نەکردووە ئیمە هەرگیز سەربە ئەمن نەبوین وهەلویستیشمان هەیە باشترین بەلگەش بۆهەلویستەکانی حیزبی سەوری ئەوەیە هەموو وەزیرەکانی تر چواردەسال وەزیربوون من تەنها سی سال و دوومانك وەزیربووم چونکە رازی نەبوون لە هەلسوکەوتم لەسالی ١٩٩٥سەدام بریاری دا من(خگف)بکەن ئەگەر ئاشکرا بوون بلین هەلەبون ئەگەرئاشکراش نەبوون ئەوا ال دارە الحکم لەناوم ببەن ئەوەبو رامکردوو هتم بۆ کوردوستان

**لڤین:چۆن هاتیت؟**

**عولستارتاهیر:** پەیوەندیم بە کاك کۆسرەتەوەکرد لە ٢٣ی ١١ی١٩٩٥هاتم لەوماوەیەی چالاکی سەوریمان هەبوو موخابەرات وئەمنیمان تیکدابوو هەندیکیانم دەزانی ولامدان هەول هەبوو حیزبەکەم ئیحتیوا بکەن وکردیشیان من لە سالی ١٩٨٤لەحیزب دەستم لە کارکیشایەوە

**لڤین::لەوکاتەدا چەندحیزبی کوردی هەبوون؟**

**عەبدولستارتاهیر:** حەرەکەی تەقەدوم، پارتی دیموکراتی، سەوری کوردوستانی

**لڤین: بابچینەوەسەرباسی عوبیدوللا،ئەوکاتەی بووبەوەزیر مەوقیفی پارتی وبارزانی چی بوو؟**

**عەبدەلستارتاهیر:** پیش ئەوەی عوبیدوللاببیتە وەزیریش مەلامستەفا ئەمری کوشتنی دەرکر دبوو

**لڤین: ململانیی نیوان مەلامستەفاو عوبیدوللالەکەیەوەدەستپیکرد؟**

**عبدولستارتاهیر:** لەنزیکی **سالی** ١٩٦٢ ەوەدەستپیکرد عوبیدوللا لە رووداوەکانی سالی ١٩٦٤عەتفی زیاتر لەگەل جەناحی مەکتەبی سیاسدا هەبوو

**لڤین: کەعوبیدوللا هەلات بەرەوکوی چوو؟**

**عەبدولستار تاهیر:** یەکەمجارهاتە بەغدادواترناردیانە جەزائیر چونکە مەلامستەفاپینج وەزیری هەبوو:ئەگەرلەوی بووایە دەیان کوشت

**لڤین: راستە دەلین حیزبی سەوری لە دوای سالی ١٩٧٥وەلەلایەن بە عسەوە تەحجیمکراوئەندامانی کەمکرانەوە؟**

**عەبدولستارتاهیر:** دوای ئەوەی شۆرش نەما ئەوان وتیان نابیت ئافرەتان و قوتابیان و گەراوەکان(عائیدون) ریکبخەن وببنە ئەندام لە حزبەکانتاندا پۆلیسی خانەنشین و سۆپای خانەنشین نەدومیەکیان ریکخستو چون بۆلای سەرۆکی پەرلەمانی ئەوکاتە سالی ١٩٨٣ سەعید هاشم و ئەوان دانیشتبون ئەوان قسە یان نەدەکرد وتم ئوستاز سەعیدی دوینی چوومبۆ گۆرستان لە کەرکوك فاتیحایەکم داداو داواملیکردن بگەرینەوەناوحیزب وتی تۆ گالتەمان پی دەکەیت وتم گالتەت بۆپیدەکەم ئیوە دەلین ئیوە حیزبین و چالاکیتان نیە وتم دەتوانین قوتابیان ریکبخەین؟ وتی نەخیر وتم دەتوانین ئافرەتان و کۆمەلەی

جوتیاران و پۆلیسی خانەنشینی ریکبخەین؟وتی نەخروتم ناتوانین عائیدونیش ریکبخەین. لە خەیری مردووهیچ ماوە ریکی خەین؟وتی رەحمەت عەلەیك ئەشهەدوبیللا راستدەکەیت ئەوبریارەش کەبەعس دای لەبەر حیزبی سەوری نەبوە لەبەر حیزبی شیویعی بووخۆ نابیت بلیین ئەوبریارە شیوعی دەگریتەوە حیزبی سەوری ناگریتەوە سەدام رای وابو هەموکەنداویك سەرچاوەکانی ببریت وشکدەبیت من شەخسی خۆم هەتا راشم کردووە هیچ بیرم لە وە نەکردۆتەوەپەیوەندی بە شۆرشەوە بکەم چونکە باوەرم بەوشۆرشە نەبوە دوای ١٩٦٤و١٩٧٠بۆم دەرکەوت ئەمانە شۆرش ناکەن بازرگانی دەکەن

**لڤین: چی بو وای لە تۆکرد شۆرش بە شۆرش کردن نەزانی بە بازرگانی بزانیت؟**

**عەبدولستار تاهیر:** بۆ نمونە ئەگەر پارتی لە گەل حوکمە تدا ریبکەویت ئەوا دەیانوت حوکمەت نیشتیمانییە ئەگەر ریشنە کەوتنایە حوکمەت نیشتیمانی نیە ١١ی‌ئازار هەندیك شتیتیدابووبەلام ریکەوتنەکەی ١٩٦٤هیچی تیدانە بوو لامەرکەزییە کۆنەکە لە ریکەوتنەکەی ١٩٦٤باشتربوو بۆچی ئەو لە گەل نوری کەلەشیربە عەقیدو موقەدەم وسەیارەی ئیڤاوە مل بنیت ئەو نیشتیمانی بیت و من جاش بم؟ یان تۆ وەزیرت داناوە و بەنیازی حوکمی زاتیت لە کوردوستاندا دەزگاکانی حوکمی زاتیت لە کوی بوو هەموئەودییانە تۆپباران دەکران ولییان دەدان و دەروخان پارەکانیان دزیبون تۆهاتویت کوردوستان ئاوەدان بکەیتەوە یان پارە وەر بگریت کیشەکە کیشەی کورد نەبوو مام جەلال دوای ئەوەی یەکیتی لەناو کۆمەلدا دروست کرد ئەندامی کۆمەلەی خویندەواری نییە ئاخر چۆن دەبیت ئەندامی حیزبیکی مارکسی لینینی خویندەواری نەبیت لە بەر ئەوە باوەرم بە شۆرشە کە نەبووە چونکە دەمزانی شۆرشەکە پەیوەندی لە گەل بە عسدا هەیە بۆ نمونە مام جەلال سالی ١٩٨٤هات مفاوەزات لەگەل سەدامدا بکات سەدام پیوت تۆنوینەری کوردنیت پارتی وشیویعی هەن بۆیە گەرایەوە لەسەر داوای سەدام مەزبەحەکەی پشتئاشانی شیویعی یە کانی سازکرد مام جەلال داوای لیکرا خۆی تەصیفیە بکات وپاشان بۆمفاوەزات بیت مام جەلال قەیناکە دوبەرەکی لەگەل مەسعودا هەبوو من خۆم هەرگیز لە خەتی مەسعود نەبوم هەتائیستا بە لام بۆچی مام جەلال سوپای ئیرانی دەهینیت بۆ تەق تەق بۆئەوەی لە دیموکرات بدەن من چۆن باوەرم بە قیادەیەکی واهەبیت کە یەکیکی وە کومام جەلال کەلە پەنجاکانەوە دەی ناسم کە سیکی تیکۆشەرە لە تە لەفیزیۆن دەربچیت و بلیت قەزا سە ربە خۆیە کەچی هەر مام جەلالە دەلیت رازینیم سولتان هاشم لە سیدارە بدریت دەشلیت من

رازی نیم هیچ زابتیکی عیراقی ئیعدام بکریت واته ئەو ئافرەتانەی ئیمە ئیسغتیساب کران کی ئیسغتیسابی کردن؟نابیت ئەو زابتانەش ئیعدام بکرین مام جەلال بۆئەوەی فەرشە سورەکەی لە ژیر پیی دەر نەچیت رای وایە نابیت زابتیکی عیراقی ئیعدام بکریت من ئە مە بکەم بە جاش و خائین لە قە لەم نادریم؟ لە سالی ١٩٩٥لە زانکۆی سلیمانی کۆریکم گیرا کەسیك لی پرسیم(زانیم مارکسییە )ئەگەر جەنابت نیشتیمانی بوویت بۆپیشتر نەهاتیت وتم ئەگەم من نە هاتووم وەزیفە وەربگرم تەنها مامۆستایە کی زانکۆم دەبیت مەمنون بیت کە دەرس بە مندالەکانی تۆ دەلیمەوە

دووەم ئیوە هیچیشتان لەو ٧٥٠,٠٠٠کوردەی بغدا دلسۆزتر نین سییەم من لە ترسا رام کردوە نیشتیمان پەر وەری نەی هیناوم من رۆحی خۆم دەپاریزم کە وەزعم خراپ بوو کورەکە م نارد بۆلای مام جەلال وتم وەزعم خراپە بانەم کوژن ئەوەبو کاك کۆسرەت دوسی کەسی نارد لە گەلیاندا دەرژوم

**لڤین: تۆلە وەزارەت وازت هینا یان دەرکرایت:**

**عبدولستار تاهیر:** من لە سالی ١٩٧٧ لە وەزیری دەرکرام بە رونی هۆکارەکانیشیان پیوتم

**عەبدولستارتاهیر شەریف: چیم لیدەکەن؟ عومری پیرە مەریکم ماوە با بمکوژن**

ئەوەی خوینەرلەم بەشەدادەی خوینیتەوە دواوشەی بۆچونی. د.عەبدول ستارتاهیرشەریفە کە لەریکەوتی ٢٠٠٨/٣/٥لەشاری کەرکوك و لەروداویکی نادیاردا تیرۆرکرائەم روداوە لەژیر هەربیانویەکدا بیت کاریکی نامرۆڤانەیە

**لڤین:هۆکاری وازهینانت لە پۆستی وەزیری چی بوو؟**

**عەبدولستارتاهیر:** پییانوتم تۆلەسەر راگواستن رازی نیت وباسی ئەوەش دەکەیت کەکەرکوك بەشیکە لە کوردوستان و لەشوینیکیش وتوتە ئیمە نەوەی سەلاحەدینی ئەیوبین ولە کتیبە کەتدا بالی جەلالی بە نیشتیمانی دەزانیت کەواتە هیشتا عەتفت بۆ ئەوبالە هەیە

**لڤین: ئەی وەزیرەکانی تر هەلویستیان هەبوو؟**

**عەبدولستار تاهیر:** هاشم ئەمن بوو لەبەعسدا ئەندامی شوعبە بوو دەتوانیت بلییت عەزیز عەقراوی شیت بوو هەموو حیمایەکانی عەزیز عەقراوی عەرەب بوون ولە

موخابەراتیش بون مەلا ماتۆر خراپەی دەربارەی کوردنەکردووە راپۆرتی نەدەنوسی بەلام هاشم راپۆرتی لە سەرمن دەنوسی

**لڤین: عوبیدوللا بۆ ماوەی چەند وەزیربوو؟**

**عەبدولستارتاهیر: ماوەکەی کەم بوو لە گەل بارزگانیەکاندا ئیعدامیان کرد**

**لڤین: سالی چەندبوو ولەسەر چی بوو؟**

**عەبدولستار تاهیر:** سالی ١٩٨٣بوو ئەوەبوو مەسعود لەگەل سەدامدا مفاوەزاتیان دەست پیکردووە تا لەگەل عیراقدا شەری ئیران بکەن بەلام ئەوان ئیران پارەو چەکی پیدان ودژی بەعس هاوکاری زۆری کردن بەعسیش بەمە تورەبوو ٣٨ لە بارزانیەکانی ئیعدام کرد لەناویاندا شیخ عسمان وخالیدی کوری ولوقمان و سابیروعوبیدوللای کوری مەلا مستەفا.

**لڤین: دەوتریت ئەوگۆرانەی بارزانی پەیوەندی ژیربەژیریان لە گەل ئیدریسدا هەبووە؟**

**عەبدول ستار تاهیر:** ئەبەدەن گەورەترین دوژمنیان بوون مەسعودو ئەوانیش پییان ناخۆش بوو کە ئیعدام کران

**لڤین: هیچ بیرە وەرییەکت لە گەلەل عوبیدوللا دا هەیە ئەوبیتاقە تیی خۆی لە بنەمالەی بارزانی چۆن باسدەکرد؟**

**عەبدولستارتاهیر:** من هاتوچوی شیخ عسمان و عوبیدوللام دەکرد ئەو هەرلە سەرەتاوە عەتفی بەلای جەناحی مەکتەبی سیاسیدا هەبووە جگە لەوەی لە لایەن بنە مالەوە ئیهانە کرابوو ئەوکورەگەورەی مەلا مستەفابوو بەلام هیچ مەنسە بیکی لە ناو پارتیدانەبوو هەموو مەنسەبەکانی دابوو بە ئیدریسو مەسعود

**لڤین: ئەوکاتەی کە ئیعدام کران لوقمان وسابیر و عوبیدولا پۆستەکانیان چی بوو؟**

**عەبدولستارتاهیر::** تەنها لە بەغدا دادەنیشتن هیچ پۆستیان نەبوو جگە لە عیمادی کوریشیخ عسمان کەبوویەئەندامی شوعبە شیخ عوسمان کوری شیخ ئەحمد بوو واتە برازای مەلا مستە فابوو

**لڤین: لە هەشتاکانا چالاکی سیاسیتان چی بوو؟**

**عەبدولستار تاهیر:** دوای دەست کیشانەوەم لە حیزب ئیترلە کاری سیاسی کشامەوە وئەندامی هەیئەی مەجلیسی مەجمەعی کوردی وئەندامی مەجلیسی عیراقی بووم وئەندامی مەرکەزی یەکیتی ئەدیبانی عیراق بووم سەدام لە سالی ١٩٨٤نامەی بۆکاروباری

باكور نوسيبوو ودەليت لە سەرۆكی جەمعیەتی سەقافەو یەكیتی ئەدیبان وسەرۆكی قاموسی محەلی لایبدەن بەلام لە مەجلیسی(سن المتقامن )مامەوە چونكە مئەمەیان جیهانی بوو بە دەستخەتی خۆی ئەم نامە یەی نوسیوە برادەریكیش كە ئەندامی قیادەی قوتری بوو پیشانیدام هەر لەوكاتەدا لە زانكۆ وانە بیژبووم بە ناونیشانیش(نەك وەزیفە) لە دیوانی سەروكایەتی راویژكاربووم ئیمە كۆمەلیك بووین هەربۆ ئەوەی پەیوەندیمان هەبیت كردیانین بە راویژكارتەنهامو چەكەمان وەر دەگرت دوای ئەوە ئیتر من پیلانی ئەوەم دانا كەچۆن دەربچم وهەر لە هەشتاكاندا مەنعی سەفەرم لی كرا

**ڤین: ئەوكاتەی تۆهاتیت بۆ كوردوستان وهەتائیستاش پەیوەندیت لە گەل كام حیزبدا هەی**

**عە بدولستار تاهیر:** وەیكو شەخسی پەیو ە؟ مندیم لە گەل هەندیك برادەری پارتییا هە یە وهەمو برادەرانی یەكیتیش برادەرمنبەلام وەكو حیزپەیوەندیم لە گەل كەسیاندا نییەو ئاراستەی فكریشم زیاتر بە لای یەكیتیدایە

**ڤین: ئەی ئەوكاتەی لەناو پارتیدابوویت؟**

**عەبدولستار تاهیر:** تادووبەرەكی ١٩٦٤من مەلامستەفام بە زەعیم زانیوە لەدوای ئەوش چەپ بووم وتائیستاش هەرچەپم

**ڤین: كاتیك كۆمەلە دامەزرا هیچ پەیوەندی یەكیان پیوە كردی؟**

**عەبدولستار تاهیر:** نەخر پەیوەندییان نەكردووە چونكە مام جەلال هەرلە سەرەتاوە دەی زانی من لەو ئاراستە یەی كۆمەلەنیم هەتا جاریك لە كۆبونەوەیەك بەمام جەلالم وت تۆ لە سۆڤییەتمان دەكەیت و چینیش هیچ پایەو پیشكەوتنیكی نیە تۆ هەركەو سەلكەماوی یەكت بەسنگییەوە ناوە چین هیچ نفوسیكی نییە تۆ ئیمە لیرە دەفەوتینیت ئاخر مام جەلال ئیمەی بردە سەر سەفارەتی چینی ووتاریكی داو سۆڤییەتی كردە دوژمنمان منیش ماوی نەبووم مام جەلالیش دەی زانی من لەو خەتەنیم لەراستیشدا ئاراستەكەی من راست بو چونكە دوایش مام جەلال خۆی لەوپەری چەپەوە هاتە ئەوپەری راست هەستا سۆشیال دیموكراتی دانا كە نەریخستن وشانەو هیچی تیا نامینیت

**ڤین: لەبارەی مستە شارو جاشەكانەوە دەلین چی؟** لیرەولەوی ئەو تۆمەتەش ئاراستەی ئیوە دەكریت

**عبدولستار تاهیر:** جاری پیناسەی جاشم بۆبکە یەکەم. ئەوەیە دەبیت بەرامبەر میلەت چەك هەلبگریت من چەکم هەل نەگرتووە تەنها لە کاتی چالاکییەکان نەبی ئەویش هەمووان بوین دووەم من دەپرسم من بوم ئالای کوردوستانم لە سەر پەرلەمان داگرت وئالای عیراقم دانا لایان مەسعود بەرزانی وپارتی؟ ئەوەم لە نەوەدوشەش بەچاوی خۆم بینی ئەوکات لە هەولیربووم خۆم شاردبووە بۆکەس باسی ئەوە ناکات؟ من چووم حەرەس جمهوریم هینایە هەولیر بۆباسی ئەوە ناکەن؟ من ئەو قسانەی دەیکەم واقیعە کە دەلیم ئەوکات مەلامستەفا وتویەتی(ارجعوا الی اعمالکم حره شریفه)مانای وایەپیشتر پیشمەرگە کارەکەی نەحوربووە نەکەریم بووە نەشەریف بووە من ئەمانەم وتووە لە چیانمدانەترساوم سییەم. لە شەستو چوارەوە کە لە مەلامستەفا جیابوینەوە دووبەرەکی هەبوو ئیتر نەچوومەوە لای ئەوو پارتی تائیستا بەلام مام جەلال دەجار چووەوە لەم دواییانەشدا چووە سەر مەزاری مەلا مستەفا کردی بە پیخەمبەر خالیکی تریش ئەوەیە من لە دوای مردنی مەلامستەفاوە ئیتر قسەم پی نەوتووە چونکە ئیتر ئەوکۆتای پی هات من هیچ یەك لەم قسانەم نەکردووە

**لڤین: پەیوەندیت لە گەل بالی ریفۆردا چۆنە هەلویستت بەرامبەریان چییە؟**

**عەبدولستار تاهیر:** من لە گەل نەوشیروان برادەرم ئینجابابۆنوکتە باشتیکتان بۆبگیرمەوە دوای ئەوەی لە ناو هەلبژاردنەکانی ناو یەکیتیدا سەرنەکەوت لەگەل سەفینی مەلا قەرە چوومی بۆلای هەندیك تیبینی ورەخنەم لەسەر کەرکوك هەبوو پیم وت کاك نەوشیروان مەسەلەی چاك سازییەکە ریفۆرم گەیشتە کوی؟بەپیکە نینەوە وتی شیخ ستار گەیشتە سەرفرازی(مەبەستی دەفتەرە دۆلار سەرف کردن و پارە خەرج کردن بوو) وتیشی: وەلا ئەومان کردەوهیچی ترمان نەکردەوە. بەلام نەوشیبروان بەهەمو ئیجابیو سلبیاتییەکەوە لەناو سەرکردایەتی یەکیتیدا،رۆشنبیرە، نوسەرو خاوەن فیکرەو فایلی نییەو موختابەرات نییە،ئەو ژیانی لەناوحیزبیکدا نابیت کە هەمووی فایلە، لە بەر ئەوە ناهیلن، ئەمە سیفاتی ئەو پیاوەیە,

**لڤین: لەکاتی خۆی وەك لە کتیبەکانیشدا ئاماژەت پیداوە، بالیکی شیوعی دەستی بەسەر پارتیدا گرتبوولە ناکۆکیدا بوو ئەی ئیستا پارتی چون دەبینیت چ بۆ شیوعیەکانی ناوی کە لە ئیستادا دەستیان بەسەر راگەیاندنەکانیدا گرتووە، چ بۆ ململانی ناو سەرکردەکانی ئەو حیزبە؟**

**عەبدولستار تاهیر**: من رای شەخسی خۆم وایە، کەهیچ لایەنیك ناتوانیت دەست بەسەر پارتیدا بگریت تا بنەماڵە هەبیت. بەلام ترسناك ترین شت بۆ بنە ماڵە، دووبەرەکی ناوخۆیانە، ئەگەر لەناوبەنەماڵەکەتیك نەچن، شیوعییەکانی ناو راگەیاندنی پارتی هەزار کەس یش بن، بە شەورۆیك لایان دەدەن، مەگەر خۆیان نایانەویت. ئیستا بنەماڵەکە تارادەیەك ململانیکەی دەرکەوتووەوەو هەیە، وەك بیستانیك کالەك وایە زەردبوو بیت، گەر بش پرسیت بۆ ململانی هەیە، ئەوە هی ئەوەیە پارەوسولتە کە زۆرە.جگە لەوەش با بپرسین لە دنیادا بوە لە سەدا چلە نۆی نەوتی خۆت بدەیت بە کۆمپانیا؟با قسە یە کیش بۆ دز بکەین، حسین شهرستانی لەمەدا راست دەکات، ئەمەش بۆ پارە وایان کردووە، هەر پارەکەش وایکردووە ململانیکەیان زیادبکات.

**لڤین: ئەرشەد زیباری وبنەماڵەکەی ئیستا حیزبیکی تازەیان دروست کردووە، ئیوە ئەم سیناریۆو کارانەی ئەرشەد چۆن دەبینن؟**

**عەبدولستار تاهیر**: ئەوە هەر مەسەلەی جاشایەتییەکەویە، من ئەرشەد لە نزیکەوە دەناسم ئەمانە پیاوی حزب نین و خائین و جاشن بەرامبەر میلەتەکەیان هەرکەس پارەی زیاتریان بداتی بۆی دەکەن. ئەو ئەزمونەی ئیستا(کە فیدرالیەتە)گەورەیە ئەوان بۆ روخاندنی ئەو ئەزموونە دروست کراون وولاتانی عەرەبیش دروستی کردون

**لڤین: : بە گیرانەوەی ئەم میژووە، لە هەرەشەی لایەنەکان ناترسین؟**

**عبدولستار تاهیر**: لەچی بترسم؟من لە ژیانمدا چەند سیاسەتیکم هەیە، یەکەم. بەمەبەست لەکەس ناترسم. دووەم، هەمیشە بۆپیشەوە دەرۆم و ناگەریمەوە. سییەم،من عومری پیرە مەریکم ماوە، تائیستا کۆلم نەدابیت، کۆل نادەم، بابم کوژن و چوارەم. ئەوەی دەی گیرمەوە ئامادەم لە بەردەم دادگادا هەمووی بسە لمینم

راپۆرتی ئیبراهیم ئیسماعیل لە بەغدادی

کوردبونی سەرۆك کۆمار بۆ عیراق بەردەوام ئەو پرسیارەیە کەلای زۆربەی لیستە عەرەبیەکان دەخریتە روو گەرچی لەوانەیە ئیجابیاتی مام جەلال لە سەر پرۆسەی سیاسی وبارودۆخی عیراق کەم نەبیت بەلام هیشتا زۆر لایەن هەن پییان قوت نەدریت سەرۆك کۆمار کوردبیت یان رەنگە تیبینیان هەبیت لە سەر ئەدای لە بە ریوبردنی کارەکانی و بە بی لایەنی دەزانن ورەخنەی لی بگرن بەوەی وەکو سەرۆکی هەمووعیراقیەکان بە یەکسانی

مامە لە ناکات یان پیان وابیت یەکیك لە هۆکارەکانی دابرانی عیراق لە ولاتانی عەرەب بریتی بیت لەوەی کە سەرۆك کۆمار کەسایەتییەکی کوردی یە نەك عەرەبی رەنگە بانگەشەکانی ئیبراهیم جەعفەری کە پیداگری لە سەر ئەوە کرد کەپیویستە سەرۆك کۆمار بدریت بە کەسایەتی یەکی عەرەبی وبەتایبەتی سونی بەو بیانووەی کە ئەو پۆستە سیادیە ئەگەر بدریت بە کەسایەتی یەکی عەرەبی سونە ئەوا زیاتر دەبیتە خۆشکردنی پەیوەندی لەگەل وولاتانی عەرەبی. حەیدەر مەلا وتەبیژی رەسمی بەناوی بەرەی دیالۆگی نیشتمانی لەم بارەیەوە ئاماژە بەوە دەکات کە تیبینی تەنها لەسەر فەخامەتی سەرۆك کۆمار نییە بەلکو تیبینی لەسەر زۆربەی سەرکردەکانی هەردوو حیزبەکە هەیە چونکە ئەوان لە چوار چیوەیەکی حیزبی و نەتەوەییەوە کاردەکەن نەك لە روانگەی بەر ژەوەندیی گەلی عیراق بە گشتی مەلا دەلیت سەر کردەی پارتە کوردیەکان زۆربەیان نەك هەمویان وابیر دەکەنەوە بەلام هەشیانە هەستی نیشتیمانییان هەیە وەکو دکتۆر مەحمود عسمان و دکتۆر بەرهەم سالح کە هەلویستی نیشتیمانی وئیجابیان هەبووە

نوینەرەکەی بەرەی دیالۆگ سەبارەت بە سەرۆك کۆمار پیی وایە رۆلیکی زۆربەرچاوی هەبووە لە ئەزمەی تایەفی لە عیراقدا هەولی داوە ریزی نیشتیمانی دووکەرت بکات وەکو هەولیك بۆ بەدەست هینانی دەسکەوتە حیزبییەکان ئەونەی توانیوە خۆی وەك سەرۆك کۆماری عیراق نیشان بدات نە لەسەرئاستی ناو خۆیی و نەلەسەرئاستی هەریمی وعەرەبیش " حەیدەر مەلا نیگەرانە بەرامبەرچالاکی دووفاقیانەی مام جەلال بۆیە دەلیت "مام جەلال کاتیك لە گەل شیعە دادەنیشیت وەك کورد دەویت ودەلیت ئیمە لەگەل ئیوەین و کەلەگەل سونەش دەبیت وەك سونە قسەدەکات.تەنانەت سیاسەت مەدارانی ئەمەریکا کە هاتونەتە عیراق ئەم تیبینیانەیان دابین کردووە، بۆنمونە پۆل بریمەر لە یاداشتەکانی خۆیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە هەلویستەکانی لەروانگەی حیزبی وکوردی تەسکەوە کاریان کردووە نەك لە روانگەیەکی عیراقی گشتگیرەوە "سەبارەت بە ریکخستنی ئەوکۆبونەوانەش کە سەرۆك کۆمار سازیکردووە بۆلیك نزیککردنەوەی بۆ چونی لایەنە جیاوازەکان حەیدەر مەلا وتی ئەوهەولانەی کە بەم دواییەدا داویەتی لە راستیدا تۆخکردنەوەی پرۆژەی تایەفی و شۆفینی بووە. لە زەمەنیکدا یەکیك بووە لە وانەی کە بانگەشەی کردبۆ ئەو ریکەوتنەی کە بە چوار قۆلی ناوبرد لە لایەن هیچ لایەنیکی ناو خۆی و دەرەکی دەست خۆشی لی نەکرا بە لکو زیاتر پرۆژەی تایەفی و جوت خوازی تۆخ کردەوە "ئەو زیاتر لە سەر قسەکانی

سوربو، تەنانەت قسەی لە پلانیك كرد بۆ دابەش كردنی عیراق لەو بارەیەوە حەیدەر دەلیت ئە جیندایەكی زۆر روون هەیە كە لە لایەن هەردوو حیزبی كوردیەوە بە ریوە دەبریت كە پرۆژەی جوداخوازی دوا ئامانجیانە كە كاری بۆدەكەن بەلام لەبەر ئەوەی ئەوان دەزانن كە هاوكیشە ئیقلیمیەكان ریگەی ئەمەیان پینادات لەبەر بوونی ولاتانی سوریاو توركیا و ئیران هەربۆیە كاردەكەن بۆئەوەی عیراق دابەش بكەن بەسەر دووبەشی سوننە لەناوەراست وشیعە لەباشوور كاتیكیش ئەمەكرا ئەوە خۆیان دەتوانن ببنە خاوەنی باكوری عیراق لە چوارچیوەی پرۆچەی دابەشكردنی عیراق بەلام پەرلەمانتار عمر جبوری لە لیستی عەرەبی سەربەخۆ كە پاش پاشە كشە كردنی چەند پەرلەمانتاریك لە هەردوولیستی بەرەی تەوافوق وبەرەی دیالۆگی نیشتیمانی دروست بووەئاماژەی بەوە كرد كە ئەو پۆستە پۆستیكی تەشریفیە و دەبیت سەرۆك كومار لە شوینیكی ولاتدابیت رەچاوی ئەوە بكات كە ئەو سەرۆك كۆماری عیراقە بەلام سەرۆك كۆماری ئیستای عیراق لە پشوەكاندا دە چیتە شاری سلیمانی لەدیدارەكانیداو لەپشتیەوە ئالای عیراق بەدی ناكریت لە كاتیكدا هیشتا یاسایەكی نوی پەسەند نەكراوە بۆ ئالای نوی عیراقی لە هەمان كاتدا رەخنەی لەوە گرت كە مام جەلال زۆرجار لە وتارو لیدوانەكانیدا عەرەبی سوونەوشیعە بەكاردەهینیت لە كاتیكدا ئەم دابەش كردنەی عەرەب بۆ سووننە شیاو نییە لەلایەن سەرۆك كۆمارەوە بووەتریت چونكە زیاتر تایە فیەت و دابە شبونی كۆمەلگای عەرەبی تۆختردەكاتەوە

حەیدەر مەلابەرەی دیالۆگ مام جەلال كاتیك لە گەل شیعە دادەنیشیت وەك كورد ئەدویت ودەلیت ئیمە لە گەل ئیوەین كە لە گەل سوونە قسەدەكات تەنانەت سیاسەتمەدارانی ئەمەریكا كە هاتونەتە عیراق ئەم تیبینیانەیان دیاری كردووەبەلام حیزبی فەزیلەی ئیسلامی كە حیزبیكی شیعیەو لە دوای روخانی رژیمە وە لە سەر گۆرەپانی سیاسی عیراق دەركەوت و خاوەنی نفوزیكی سیاسیە لە شەقامی شیعیدا فەزیلە بە پیچەوانەی بەرەكانی تر رازییە لە سەرۆك كۆمار ئەوان بە گشتی لە مامەلە كانی مام جەلال رازین و پییانوایە لەو دانیشتنانەی كە لە گەلیان كردووە هەستیان بەوە كردووە كە ئەو سەرۆكی هەموانەو بیلایەنانە مامە لە دەكات تەنانەت لە كاتی جیابونەوەیان لە لیستی ئیتیلاف و لە كاتی كیشەكانی شاری بەسرە وەكو پیویست گوی بۆ گرتوون هەردووپەرلەمانتار حەسەن شەمەری و باسم شەریف بەرپرس لەوحیزبە پییان وابوو مام

جەلال توانیویەتی وەك سەرۆك كۆماری هەموو عیراقیەكان مامەلە بكات بەلام سەبارەت بە نوینەرایەتی كردنی عیراق لە ولاتانی عەرەبدا پییان وایە كیشەكە لەم بوارەدا كەمیك ئالۆزەورەنگە لە لایەك ولاتانی عەرەبی نەیانەویت مامەلە لەگەل عیراقی نوی بكەن لە لایە كی تریشەوە كەمتەرخەمی هەبیت لە دەولەتی نوی عیراق بەگشتی تائیستا وەكو پیویست هەولی نەداوە لەگەل ئەو ولاتانە بگریتەوە بەلام ئەوەشیان نەشاردۆتەوەكە بۆچونیك هەیە پیی وایە یەكیك لە هۆكارەكان ئەوەیە كە سەرۆك كۆماری عیراق كوردە و ئەگەر كەسایەتییەكی عەرەبی لەو پۆستەدا بوایە ئەوا لەوانەیە پەیوەندییەكان باشتربونایە بەلام پیدەچیت زەقترین خالی ناكۆكی حیزبی فەزیلە لە گەل سەرۆك بریتی بیت لە پیكهینانی هەریمی فیدرالی لە باشوور و ناوەراستی عیراق ئەمەش لەبەر ئەوەی پییان وایە كە لەوبارەدا لەوانەیە شەریكی ناوخۆ رووبدات هەربۆیە لەگەل ئەوەن كەلەدەستوردا عیراق سیستمیكی فیدرالی بیت بەلام جاری زۆر زووە هەریمی باشوور پیك بیت بەتایبەتیش كە ئەو ناوچەیە خاوەنی سامانیكی زۆری نەوتە بەلكو لە ئیستادا لامەركەزیەتی ئیداری پاریزگاكان چارە سەریكی باشترە پەرلەمانتار خالید شوانی لە لیستی هاوپەیمانی كوردوستانی ئاماچە بەوە دەكات كە سەرۆك كۆمار سیاسەت مەداریكی عیراقی كوردییە ئەتوانین بلیین لەسەر ئاستی ناوخۆی عیراق و ناوچەكەش جیدەستی دیارەو بۆچونەكانی بە هەند وەردەگیریت توانیویەتی وەك سەرۆك كۆماری عیراق مامەلە بكاتو هاوسەنگی راگرتووە لە نیوان پیكهاتە نەتەوەی و ئاینییە جیاوازەكان وپارسەنگی نیوان سوننە وشیعە وئیسلامی وعەلمانیەتی پاراستوە ناوبراو پیشی وایە هەموو لیستە پەرلەمانییەكان حەسەن شەممەری - حیزبی فەزیلە ئەو سەرۆكی هەموانە وبیلایەنانەمامەلە دەكات تەنانەت لەكاتی جیابونەوەشمان لە لیستی ئیئتیلاف لەكاتی كیشەكانی شاری بەسرە وەكو پیویست گوی بۆ گرتووین بە وانەش كە زۆر توند رەون وخاوەنی فیكریكی شۆڤینین لە ئەدای سەرۆك كۆمار رازین و تا ئیستا رەخنەیەكی ئەوتۆیان لینەگرتووە وئەوشیوازی تەوافوقی دەگریتەبەر سەبارەت بەو داوا نارەسمیەی لە ناو ئارادایە بەوەی پۆستی سەرۆك كۆمار بدریتە كەسایە تییەكی عەرەبی سوننە شوانی ئاماژەی بە وە كرد سەرۆك كۆمار بەریكەیەكی دەستوری بۆتە سەرۆك كۆمارو لابردنیشی هەردەبیت بەپیی بیت و لە رووی یاساییەوە كەس بۆی نییە ئەوداوایە بكات لەلایەكی ترەوە كورسی سەرۆكایەتی پیویستی بە سەرۆك تالەبانی یە نەك تالەبانی پیویستی بەكورسی سەرۆكایەتی بیت لایەنە سیاسییەكان

دەبێت مەمنونی ئەوبن سەرۆك كۆماربێت چونكە هەروەك سستانی وەسفی كردووە ئەوسەمامی ئە مانی یەكپارچەی عیراقە ئەوپەرلەمان تارە كوردە هەلویستی كوردیشی بەوە رونكردەوەكە ئامادەنییە تەنازول بكات لە پۆستی سەرۆك كۆماری سەلیم عەبدوللا . بەرەی تەوافق ئەو سیفەتە باشەی كە لە سەرۆك كۆماردا بە دەردەكەویت ئەوەیە كە كەتوانیویەتی لە چوارچیوەی ئەو دەردەچیت كە نوینەرایەتی لیستیك بكات بۆ بازنەیەكی گەورەتر

بەلام دەربارەی نارەزای هەندیك لایەنی سیاسی بە تایبەت لایەنە شیعەكان سەبارەت بە زیادكردنی دەسەلاتەكانی سەرۆك كۆمار ناوبراو ئەوەی خستە روو ئەم خالە پەیوەندی بە شیوازی حوكمرانی و ولاتەوە هەیە كە سیستمی پەرلەمانییەو لە هەموو ولاتانی جیهانیش لەم سیستە مەدا دە سەلاتی سەرۆك زیاترە لە گەل ئە مەشدا ئیمە پشتیوانی ئەوە دەكەین كە دەسە لاتی سەرۆك كۆمار زیاد بكریت تاكو قیادە یەكی جەماعی بۆ ولات دروست ببیت بەلام بە پیی ئەو قورساییەی كە سەرۆك مام جەلال هەیەتی رۆلی بەرچاوی هەیە لە بریارە سیاسییە كاندا بەلام سەلیم عەبد ولا وتە بیژی رەسمی بەرەی تەوافق ئامازەی بەوە كرد سەرۆك كۆمار بە پیی ئەودەسەلاتەی كە لە دەستو پیی دراوە كارەكانی ئەنجام داوە هەندیكجاریش بۆ چارە سەری هەندیك تەنگەژەی سیاسی راستەو خۆ سەرۆك كۆمار تەداخولی كردووە ئەو سیفەتە باشەی لە سەرۆك كۆماردا بە دەردەكەویت ئەوەیە كە توانیویەتی لە چوارچیوەی ئەوە دەرچیت كە نوینەرایەتی لیستیك بكات بۆ بازنە یەكی گەورەتر وتە بیژەكەی بەرەی تەوافق پیی وایە دەبیت دەسەلاتی سەرۆك كۆمار زیاد بكریت ئیتر لە هەرنەتەوەیەك بیت ئەمەش بۆی زیاتر رۆلی هەبیت نەك تەنها وەك پۆستیكی تەشریفی بمینیتەوە ئەگەرچی هەندیك جار دەنگۆی ئەوە لە ئارادایە سوننەكان داوای پۆستی سەرۆك كۆمار بكەن بەلام سەلیم عەبدولا لە بەرەی تەوافوق ئەوەی رەتكردەوە كە ئەوانئیازی ئەوەیان هەبیت كەسیكی سوننی پۆستی سەرۆك كۆمار بگریتە دەست چونكە ئەم مە سەلەیە دەوەستیتە سەر تەوافوقاتی سیاسی هەلویستی لیستی عیراقییە لە هەلویستی سەرجەم لایەنەكان زیاترپیداگری پیوە دیارە ئەوان نیگەرانن لەوەی لەوەی كە كورد پۆستی سەرۆك كۆماری هەیە پەرلەمانتار عالیە نسەیف جاسم لە لیستی عیراقییە ئەوەی خستە روو بەوپیەی عیراق بەشیكە لە ئۆمەی عەرەبی وولاتیكی عەرەبییە هەربۆیە دەبیت سەرۆك كۆماریش كەسایەتییەكی عەرەبی بیت هەروەها

نیگەرانی دەربری بەرامبەر ئەدای سەرۆك كۆمار ئاماژەی بەوە شكرد لە بەرئەوەی سیستمی سیاسی ولات پەرلەمانییە هەربۆیە سەرۆك كۆمار رۆلیكی كەمی هەیەو لە هەمان كاتیشدا ئەودیدارانەی كە ئەنجامی دەدات زیاتر تایبەتە بە كوردەوە وئەوەمان پی گەیشتوە لە زۆریك لە پییوەندیانەی كەپی هەلدەستیت هەول دەدات بۆ بەدیهینانی بەرژەوەندی كورد پیش بەدیهینانی بەرژەوەندی عیراق وەكو ولات عالیە جەختی كردەوە لە سەر ئەوە ی دەبیت سەرۆك كۆمار كەسیكی عەرەب بیت و دەسەلاتی زیاتری بدریتی تاوەكو بتوانیت رۆلی زیاتری هەبیت هاوكات ئوسامە نجیفی لە لیستی عیراقیە هەمان شیوەی عالیە نسەیفی هاولیستی نیگەران بوو ئەو ئەوەی خستە روومام جەلالسەرۆكی حیزبەوبەردەوام بەرگری بەرژەوەندییەكانی ئەو حیزبە دەكات خالیكی دیكەی نجیفی لەسەر مام جەلال ئەوەیە كە زیاتر هەستی تایفی تۆخ دەكاتەوە و عەرەب دەكات بە دووبەشەوە كە ئەوانیش بریتین لە سوننەو شیعە لە كاتیكدا ئەم جۆرە گوتارە ئوسامە نجیفی لیستی عیراقییە مام جەلال زیاتر هەستی تایەفی تۆخ دەكاتەوە وعەرب دەكات بە دوبەشەوە كە ئەوانیش بریتین لە سوننە و شیعە لە كاتیكدائەم جۆرە گوتارە سوودبە بەرژەوەندی عیراق ناگەیەنیت وەكو سەرۆكی عیراقیش رۆلیكی ناتەواو و نیگەتیفی هەیە سوود بە بەرژەوەندی عیراق ناگەیەنیت وەكو سەرۆكی عیراق رۆلیكی ناتەواو نیگەتیفی هەیە رەوتی سەدر ئەگەرچی ئەگەرچی لە زۆربەی پرۆسە سیاسیەكان خۆیان بە خەدرلیكراو پەراویزی پرۆسەی سیاسی وەسفدەكەن ورەخنەو گازندەیان لە حوكمەتی عیراقی هەیە بەلام بە پیچەوانەی رای هەندی لیستی دیكە وە رایان بەرامبەر بە سەرۆك جیاوازە حەسەن شەنشەل سەركردەی بالا لە لیستی رەوتی سەدر ئاماژە بەوە دەكات سەرۆك كۆمار ئەدای زۆرباش بووە تەنها سەركردەیەكی كوردی نیە بەلكو سەركردەی هەموو عیراقیەكان بووە لە دانیشتنەكانی ئەنجومەنی بالای سیاسی بۆ ئاسایشی نیشتمانی هەلویستەكانی عیراقیانەوە بوومبەلام سەبارەت بە زیادكردنی دەسەلاتی سەرۆك كۆمار زیاد بكریت لە بەر ئەوەی سیستمی پەرلەمانی مەگەر سیستمیفەرمان رەواییەكە بگۆریت بۆ كۆماری ئەوەشی خستە رووكە هەلویستەكانی بەرامبەر رەوتی سەدری باشبوە بەتایبەت لەوكاتانەدا كە توشی رووبەرووبونەوە و تەنگژە هاتووە لەگەل حیزبی دەعوە و ئەنجومەنی بالای ئیسلامی.

## لڤین :نهێنیەکانی ژیانی جەبار فەرمان بلاو دەکاتەوە ناکۆکیەکانی نیوان تاڵە بانی و جەبار فەرمان وشتی تریش

### دیداری هاوری کاوە ـ تایبەت بە لڤین

پاش مانگو نیوێك چاوەروانی پاش چەندین تەلە فونی یەك لە دوای یەك دواجار بریاری دا چاوپیکەوتنەکە بکات سەبیحە شیخ محمد فریاد لەخانەقین لە دایك بووە وخیزانی ئەندمی مەکتەبی و فەرماندەی سەربازی یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان(جەبار فەرمان )لا سەبیحە لەسالی ١٩٤٩لە شاری خانەقین لە دایك بووە ئامادەی وسەرەتای لەشاری خانەقین تەواوکردووە پاشان کۆلیژی ئادابی بەشی زمانی کوردی لە شاری بەغداد تەواو کردووە ماوەیەکی کەم وەك مامۆستا لە شاری ئاکری وانەی وتۆتەوە پاش ئەوەی شۆرشی ئەیلول دەستپیدەکات لەسالی ١٩٧٤لە گەل جەبار فەرمانی میردیدا دەچیتە ریزەکانی شۆرشی ئەیلوولەوەسەرەتای ناسینی سەبیحە خان وجەبارفەرمان بە هۆی خزمایەتییەوە بو بووە خوشکیکی جەبار فەرمان خیزانی برای سەبیحەخانەو بە هۆی ئەوەوە نزیك بوونەوە روودەدات لە نیوان ئەو دووانەدا سەبیحە خان سەبارەت بەو سەرەتایانە وتی بە هۆی خزمایەتییەوە هاتوو چوی زۆر لە نیوانماندا هەبوو بەلام لیتان ناشارمەوە ئیمە بە خۆشەویستی ژیانی هاوسەریمان دروست کرد لە پۆلی یەکی زانکۆ بوم لە زانکۆ خەلکی سلیمانی وتەواوی شارەکانی ترمان لەگەلدابوو سەرەتا جەبار فەرمان م بینی هەستمکرد کەسیکە خاوەن ئایدۆلۆژیاو قسەی خۆیەتی کوریکی بە شە خسییەت بوو ئەوکات پەیمانگای مامۆستایانی تەواوکردبوو ئەو کە هەندیك لە کەسوکاری ئیمەی نیگەران کردبوو لە هاوسەر گیری من لە گەل جەباردا جیاوازی پلەی خویندەواری بوو خەلکی دەیان وت چۆن دەبیت یەکیك زانکۆ تەواوبکات شوبکات بە یەکیك دەرچووی پەیمانگابیت من گویم بەم قسانەنەدا ئیمە یەکتریمان خۆشدەویست ناکۆکی لە نیوان بۆچونی خیزانەکەمدا هەبوو بەرامبەر بەو شووکردنە هەلسوکەوتی جەبار فەرمان پیاوانە دەهاتە پیش چاوم نەمن بەوم دەوت خۆشم دەوییت نە ئەو بەمنی دەوت بەلام بەهەلسوکەوتی هەردوکمانەوە خۆشەویستی بەرامبەر یەکتری زۆردیاربوو سەبیحەخان سەبارەت بە هەلویستی جەبار

فەرمان لەو خۆشەویستیەیان وتی هەمیشە جەبار فەرمان دەیوت من هەرگیز ناتوانم خیانەت لە مالیك بکەم کە هاموشۆی بکەم کولتوری کوردی زۆربە هیز بوو لای جەبار فەرمان زۆرپابەندی رەوشت بوو ئەوکاتە تەمەنی من ۱۸سال دەبوو تەمەنی جەباریش ۲۰سال بوو پەیمانگای تەواوکردبوو رۆژیکیان جەبار فەرمان هات بۆ زانکۆ پییوتم حەزدەکەم یەك مو حازەرە نەچیتە چوورەوە وتی حەزدەکەم قسەت لە گەلدابکەم بە شیوازیکی زۆر جوان و پر لە شەرمەوە پییوتم من تۆم پەسەندەو حەزدەکە م ببیتە هاوسەرم گەر بە خیانەتی نەزانیت چونکە من زۆر هاموشۆی ئیوەم کردووە بۆیە وادەلیم ئەوکاتە جەبار فەرمان ئەندمی کۆمەلە بوو کەسیکی هیمن وسیاسی بوو وتی من حەزدەکەم پیمبلی گەر رازیت دەچمە لای کەسوکارت و داوای دەستی تۆ دەکەم من کە وەلامدایەوە کە رازیم بەلام بەسەروسیمای جەبار فەرمان ـ ەوە شتیك دیاربوو دەیویست بیلی نەیتوانی وجورئەتی نەکرد نامەیەکی بۆمن نوسیبوکە زیاتر هەست ونەستی خۆی تیدا رونکردبووە بەرامبەر بە من وەك خۆشەویستیك بەلام نەی توانی نامەکەم بداتی ئەوەش زیاتر لەبەر غیرەتی نەفسی هەردوکمان بوو کە ئەوکات لە زانکۆ بووم جەبار خۆشی کەسیکی بە هەست بوو نەیدەویست کاریك بکات لیی رازینەبی هەرچۆنیك بیت کاغەزەکەی دەرهیناو پەرەگرافیکم لی خویندەو نوسرابوومن جەبار فەرمانم ئەگەر مامۆستابم یاخود قوتابی زانکۆبمیاخود سەربازبم من هەر جەبار فەرمانم لەوکاتەوە بۆم دەرکەوت ئەم کەسایەتییە کەپیی دەوتریت جەبار فەرمان کەسایەتییەکە زۆر بڕوای بەخۆی هەیە لە نامەکەدا چەندجار ناوی خۆی دووبارە کردبووە چەندجار نامەکەم خویندەوە بەلام هەرچەند بیرم لەورستەیە دەکردەوە کە نوسیبووی من جەبار فەرمانم زۆر سەرنج وهەستی داگیر دەکردم سەبیحە خان پاش وەرگرتنی نامەکەوچوانەکەی لە گەل جەبار فەرمان دا دەچیتەوە بەشی ناوخۆیی و لای هاوری کچەکانی باسی ئەو روداوەیان بۆدەکات هاوریکانیشی هەر هەموویان پییان باش دەبیت ئەم دوانە بۆیەکتری بن چیانی خیزانی دروستبکەنسەبیحە خان دەلیت هەموویان ئەو هەنگاوە پەسەند دەکرد لە سەر بنەمای ئەوەی جەبار کەسی خۆمانەو رەوشت بەرزە پیشتر جەبار فەرمان لە گەل هاورییەکدا بەناوی ئیبراهیم کوریکی زۆرباشبوو(هەرچەندە لەم دواییانە هەلویستی وەکو جاران نەمابوو)جەبار بە ئیبراهیمی وتبوو سەرکەوتنم بەدەست هینا ئەوگۆرانییەی عسمان عەلی وتبوو کەدەلیت کچی جورئەت لە کوییبینم نامەی گیرفانم دەربینم جەبار فەرمان

بەردەوام ئەو گۆرانییەی وتبوەوە بە یادی ئەو نامەیەی کەدابوی بەمن و بەسەر کەوتنیکی گەورەی لە قەلەمدابوو سەبیحە دەلیت لەبیشانسی مندا ئەوسی چوار سالە کەسوکارم بە هەموشیوازیك جەبار فەرمانیان رەتدەکردەو رازینەدەبون شویپیبکەم منیش پیم دەوتن کورەکە عەیبی نییە خویندەوارە مامۆستایە گەر وەکو بنەمالەیش بەدلتان نییە بۆچی کچی ئەوانمان خواستووە و بوکمانە؟ زووبەزوو براکەم بەو وشانەئاگاداردەکردەوە کە جەبار خزمی ئیوە یە ئیتر بۆچی ئیوە وادچی دەوەستنەوە؟ من سەرم سورمابوو بۆچی دەیانەویت لە نیوان من وجەبار فەرماندا کۆسپ دروست بکەن بەلام دواجار هەر خۆشەویستییەکەی ئیمە سەرکەوت دوای بەیان نامەی ١١ی ئازار جەبار فەرمان لە گەرەکی(الثورة )ی بەغدد دەبیت بە مامۆستا ئیوارانیش لە زانکۆ دەخویخویندو خەریکی کاری سیایی وریکخستنیش بوو پاش ئەوەی شۆرش دەست پی دەکاتەوە جەبار فەرمان دەرواتە دەرەوە بۆ ناو شۆرش و لەناوچەی ئاکری دەبیت دواتر سەبیحە خان نقلدەبیت بۆ موسل ئەوکات ئاکری دەکەویتە ناو بازنەی دەسەلاتی شۆرشی ئەیلولەوە ئەوکاتە من مامۆستا بوم جەبار فەرمان خۆی بۆ نەگیرابوو هاتبوە هەولیر وهەوالی منی پرسیبوو دواتریش خۆی گەیاندە موسل برادەریك هاتەلام وتی جەبار هاتووە زۆر بەلامەوە سەیر بوو هەرلەوکاتەوە زانیم گیانی جەربەزەیی موخابەرات لای جەبار فەرمان هەیە ئەو هەموویگەیەی بریبوو لە کاتیکدا کۆمەلەبوو کاری نهینیشی دەکرد هیچی پینەبوو تەنانەت دەمانچەش لە مالیك دانیشتبوو کە چووم بینیم سەرم سورما وتم ئەمە چۆن گەیشتویتە ئیرە دواتر جەبار فەرمان بیرۆکەی چونە ناو شۆرش دەخاتە بەردەم سەبیحەخان ودەلیت بابچینە دەرەوە ئەوکات دووبرای سەبیحەخانیش بەناوەکانی ئیسماعیل و سەلاحیش دەبنە پیشمەرگەی ئەیلول پیش چونە دەرەوە چیانی سەبیحە خان خراپ دەبیت بەلام کە دووموچەی سەرەتای مامۆستای وەردەگریت لە گەل جەبارفەرماندا دەچنە ناو شۆرشی ئەیلول سەبیحە خان بۆ ئاماژەکردن بە ئازایەتی جەبار فەرمان رووداویك دەگیریتەوە ئاوات عەبدولغەفور لەم ماوە یەدا چاوپیکەوتنیکیان لە گەلدا کردو باسی بەسەرهاتیکی خۆی کرد ئەو ئوکاتە تەمەنی پانزە سال بووە و مالیان لە نزیکی مالی جەبارببووە لە خانەقین ئاوات عەبدولغەفور لەسجن رادەکات حوکمەت بە شوین ئاواتدا دەگەریت جەبار فەرمان شوینی ئاوات دەزانیت و هەوالی بۆ دەنیریت کە ئایا دەیەویت دەریبکەن بۆدەرەوە؟ئاوات دیتەوە بۆمالەوە و بەسەر دیوارەکەدا خۆی هەلدەداتە ئەو دیو

که تەماشادەکات جەبار فەرمان لەودیو دیوارەکەوە پاسکیلیکی راگرتووە بۆ ئاوات ئاوات عەبدولغەفور پاسکیلەکە لیدەخوریت وجەبار فەرمانیش بە دوایدا رادەکات ئە منەکان پییان دەزانن و بەدوایاندا دەرۆن و زۆرجاریش تەقەیان لیدەکەن بەلام خۆش بەختانە بەرناکەون و چەند کیلۆ مەتر دەبرن و دووردەکەونەوە عەلی ئەکبەر بە لە دورەوە ئەسپیك رادەگریت هەتا دورتریان بخاتەوە و بیانگەیەنیتە ناوچەیەکی ئەمینتر علی ئەکبەر بە تاکتیکی جەبار فەرمان لەگەل ئەمنەکان ریدەکەویت ودەلیت من ئەو ناوچانەتان هەرهەمووی بۆ دەگەریم بەلام ناویرم بچمە ناوباخەکەوە سەبیحەخان دەلیت سەیرکە بەو منداڵییە کە تەمەنی ١٥ساڵە توانیبەتی پیلانیکی ئاوادابنیت ئەوە سەرەتایەك بووە بۆ دەرکەوتنی مرۆڤیکی سەرکردە مرۆڤیك لەو تەمەنەدا بتوانیت موجازەفەی وابکات چۆننابیتە سەرکردە سەبارەت بەهەلسوکەوتی جەبار فەرمان بەدریچای چیانی هاوسەریتی سەبیحەخان ئاوا باسی لیوە دەکات وەکو مام جەلال دەلیت خالی زۆر جوان و هەلویستی زۆرجوامیرانەی هەبووە ویەکیك لە سیفەتە جوانەکانی ئەوە بووە کەخاوەنی قسەی خۆی بوو گەر کیشەیەکیشمان هەبوایە دوای تەواوبوونی کیشەکە دەی گووت باسی مەکەن هەمووشتیك تەواوهیچم بیرنەماوە هەرکاتیك بیوتایە تەواو من بروام پیدەکرد سیفەتیکی تری جەبارفەرمان راستگۆییە ئەوهەرگیز درۆی نەدەزانی هەرچی بکردایە نەی دەشاردەوە دەیگوت کردوومە سەبیحەخان دەلیت زۆرجار پیمدەگوت جەبار زۆرشت هەیە حەزدەکەم بلییت نەمکردووە ئەویش دەیوت ناتوانم من حەز لە درۆناکەم درۆم پیناکریت جەبار فەرمان هیچ شتیك لە سەبیحە نەشاردووەتەوە پیم دەوت ئەوشتانە باس مەکە با خەفەتیان پی نەخۆم بەلام ئەودەیوت من هیچ ناشارمەوە زۆر رقی لە درۆ بوو زۆرقارەمان بوو سلینە دەکردەوە دوژمنی ئەو درۆوپیاوی درۆزن بوو پەیمانی هەرشتیکی بدایە بە منالە کان و بۆهەر شتیك بوایە بووایە بۆی دەکردن من دەم وت پەیمان مەدە ئەودەیوت خەمت نەبیت جیبە جیی دەکەم سیفەتیکی تری ئەو بەلای سەبیحەخانەوە دلفراوانی بووە جەبار فەرمان هیچ کاتیك حیسابی گیرفانی خۆی نەدەزانی زۆر جار پیمدەوت گیرفانت بکە بە دووبەشەوە بەشیکی بۆ خۆت وبەشیکی بۆ خۆت وەلامی دەدامەوە دەیوت نانابی جەبار فەرمانئەوکاتەی پیخۆشبوو کە خواردنم دروست دەکرد و بە بی هاوریکانی نەی دەتوانی بیخوات هەمیشە دەیوت من بە تەنها نانم بۆ ناخوری باهاوریکانم بیخۆن ئینجا من دەیخۆم هەرکەسی دەستکەوتایە دەیهینایەوە دەچووبرادەرانی برادەرانی

راگەیاندنی بانگدەکرد کاك ئەرسەلان بایزو سەعدون فەیلی وئەوانی بانگدەکرد بۆ نان خواردن جەبار فەرمان لەگەل پیردا پیرو لەگەل منداڵیشدا منداڵ بوو ئەوکاتانەی جەبارفەرمان دەرۆیشت بۆشەروو مەفرەزە دەرکردن لەکاتی پیشمەرگایەتیدا سەبیحەخان بەتەنها دەمایەوە هەرگیز ترسی ئەوەم نەبوو نەگەریتەوە چونکە پیشمەرگەیەکی ئازادبوو لە هەموو شتیکیش زیاتر گرنگی دەدا بە دەمانچە و تفە نگە کەی پیش دەرچون جوان پاکی دەکردنەوە ئینجا دەرۆیشت هەمیشە بنیشتی پیبوو مەتارەی ئاوی پیبوو(لەوقسانەدابووسەبیحەخان دەستی کرد بەگریان و وتی هەتا ئیستا یەك لەت بنیشتی جەبار فەرمانم لاماوە وا لە جانتاکەمدایە)سەبیحەخان دەیوت کە دەچوو بۆ مەفرەزە خۆی جوان دەشت و خۆی دەگۆری پیمدەوت ئاگات لە خۆت بیت ئەودەیوت خەمتنەبیت ئیستا گویت لە تەپلی سەرکەوتن دەبیت سەبیحەخان لە دووشەردا لەگەل جەبار فەرماندا رۆیشتۆتە مەیدانی شەر دوای شەهیدبونی مولازم سەید کەریم و مامەریشە لە شەری دابانـدا لەگەلیدابووم کەدەیوت گویت لەتەپلی سەرکەوتن دەبیت هەروادەرچوو برواتان هەبیت چەند چوبیت بۆ شەر هەرگیز دلم لینە ترساوە سالی ١٩٨٧بووچوومە قەرەداغ سەیردەکەم لەوی لەگەل جەماعەتیکدا وەستاوە وتم ئەری چیدەکەن جەبار وتی قەرەداغ دەگرم منیش وتم جەبار قەرەداغ ناحییەیەکی گەورەیە چۆن دەتوانیت بیگریت؟ ئیمە لە گوندی نەوتی بوین زۆری پینەچووهاتەوە وتی قەرەداغمان گرت و دوو دەبابەشمان گرتوە دکتۆریکیش بەناوی ئیخلاس خزمان بوو لەوی گیرابوو ئەویشی ئازاد کردبوو ئیخلاسی لە گەل خۆی هینابوو دوودەبابەشی گرتبوو(جیهازیکرد بۆ سەرکردایەتی بۆمام جەلال بۆ ئەوەی هەوالی گرتنی قەرەداغی پیبگەیەنیت لەو کاتەدا مام جەلال خەوتبوو جەبار فەرمانیش وتبوی هەلیبسینن بۆم وتی مامە قەرەداغ گیرا مام جەلال لەوکاتەدا خەوالوبوو سەبیحی باس لەوە دەکات کەە جەبار فەرمان کاتیك دەچووبۆشەر زۆری پیخۆش بوو چون بۆشەر لەلای زۆر سادەبوو ئەوەی زۆر سەبیحەخانی نیگەران کردووە ئەوەبوو کە جەبار فەرمان جیاوازی نەکردووە لەنیوان کەسەکاندا هەمیشە بەجەبار فەرمانم دەوت ئینسانەکان سی جۆرن هەیە زۆرباشە ریزی لیبگرە مام ناوەندییە خەلکیکیش هەیە هەل پەرستە ئەمانە هەر یەکەیان بە گویرەی خۆیان ریزیانبگرە بەلام جەبار فەرمان قەناعەتی بەوقسانە نەدەهات و هەرهەمویانی بە یەك چاو سەیر دەکرد ریزی هەرهەمویانی دەگرت ئەوەی من لە پرسەکەیدا وتم کە دەبیت ئینسانەکان جیابکرینەوە هەمووی هاتەدی

زۆرکەس جەبار فەرمان ژنی بۆ هینا مالی بۆ کردن هاوکاری کردن(حەزناکەم ناویان بهینم)ئەوکەسانەی جەبار فەرمان هاوکاری کردن وریزی زۆری لیگرتن تەنانەت بۆپرسەکەشی نەهاتن سەبیحەخان دووبارەی کردووە و وتی زۆرجار بە جەبارم دەوت زۆرکەس هەیە ئەودلپاکیەت ئیستغلالدەکات ئەو ئەم قسیەی زۆرپیناخۆش بوو لە پرسەکەدا دکتۆر بەرهەم هاتبوو پیموت ئەوخەلکە زۆر هیلاك بوون(بەتایبەت خەلکی سلیمانی )هەرگیز بروام نەدەکرد خەلکی سلیمانی ئاوای بۆبکەن ئیمە لەسالی ١٩٦٦وە خانەقینمان جیهیشتووە حەزم لە ناوچە گەری نییە من وام هەست دەکرد خەلکی خانەقین بە پەرۆشتربن بۆ جەبار فەرمان بەلام خەلکی سلیمانی زۆر بە پەرۆشتر بوون ئیستا واهەست دەکەم خەلکی سلیمانیم من قەرزاری ئەم میلەتەم سەبیحەخان ماوەی دوومانگە بەردەوام دەگری زۆرجارعیماد ئەحمەدو خیزانەکەی سەردانی دەکەن بۆ دلنەوایکردنی بەلام ئەو هەر لەگریان ناکەویت بەردەوام فرمیسکەکان میوانی رومەتەکانیەتی یەکەم مندالی جەبار فەرمان وسەبیحەخان لەپاش هەرەس لە ١٩٧٥/٦/٢٥ بوو ئەوکاتە حالیان زۆر خراپ بووە زوو زوو دەیوت من بوم بوپیاو چونکە مندالم هەیە ئەوکچەمان بوو جەبار زۆردلی پی خۆش بوو بەردەوام دەیخستە تەشتیك ئاوەوە خۆی شیری دەدایە و خزمەتی دەکردو تەمەنی کچەکەمان چل رۆژی نەخایاندجەبار فەرمان زیندانی کرا لەوکاتەدا لەلایەن گروپی خالە شەهاب وشەهیدجەعفەرو ئەنوەر زۆراب ـ دوە ئیعترافیان لەسەر کرابوو ئەوان لە سیدارەدران ئەمانیش کەکۆمەلیکی تربوون(سەعدون فەیلی و کاك ئیبراهیم و کاك عبدولا و کاك ئەرسەلان وکاك فەرەیدون عبدولقادرو کاك عەلی بچکۆل وکاك عسمان نانەوا )ئەمانەش شەش سال حوکم دران چوار سالیان تەواوکردوسالی ١٩٧٩کە سەدام هاتەسەر حوکم لیبوردنی گشتی دەرکردووئازادکران سەبارەت بەوەی کەجەبار فەرمان لەناو خەلکیدا ناسراوە کە زۆر زالووبیویژدان بووەو خەلك دەلی جەبار فەرمان پیاویکی سەربازی و توندوتیژبووەو جیاوازی نەکردووە لەنیوان رەش وسپیدا سەبیحەخان وتی جەبار فەرمان پیاویکی کوردبوو خاوەن مەبدە ئبوو هەمیشە دەیگوت گەربزانم براکەی خۆم پیاویکی خراپە یان خائینە یان جاسووسە بەدەستی خۆم دەیکوژم زۆرجار جەبار فەرمان دەیوت من یەك تاقە کورم هەیە زۆرم خۆشدەویت گەربمەویت گیانی خۆمی پیشکەش دەکەم گەربشمەویت ئیستا دەی کوژم سەبیحەخان بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی وتی ئەوکورەمان تازە بووبوو هەمووماڵەکەمان پربوو لەمیوان نانمان دانابوو بەلام خەریکی کورەکەبووین

هاواریلیکردین و وتی بۆ نایەن بەلای میوانەکانەوە بەوخوایە نەیەن ئەوکورە دەکوژم بەلام سەبیحەخان لە دۆخیکی تریشدا جەبار فەرمانی بینیوە دەیان جار جەبار فەرمانم بینیوە گریاوە فرمیسك بەچاویدا هاتۆتەخوارەوە بە کول گریاوە زۆرجار بۆمندالیکی هەژار دەگریا لەم ماوەی دواییەدا کەمندالەکانی لیدووركەوتبووە دەیگوت کەمندالیکی قوتابخانە دەبینم دەیان جار خۆم دەکەم بەقوربانیان ئەو زۆرسەیربوو تەنهابەچاوەکانی سەیری مندالەکانی بکردایە هەرهەمویان زیرەیان دەکردبەمەرجیك هیچ لەمندالەکان بەدەستی جەبار لیدانیان نەخواردووە ئەوهەندیکجار زۆرنەرمیش دەبوو لەم دواییەدا کەهات بۆ ئەوروپا بە کچە گەورەکەی دەگوت من چی بکەم زۆرتوندم زۆردلرەقم چی بکەم باشە؟ لە دوورەوە خەلك زۆر بەتوندی و وشك دەیانبینی ئەولەنزیکەوە وانەبوو بەلام لەسەر بیرو باوەری خۆی بۆ شۆرش ئامادەبوو هەمووشتیك بکات تەوەرەکەی دەستی جەبار لەناو خەلکدا باسیکی زۆربەربلاوە ئەوتەوەرە وەك سیبەری کەسیەتی جەبار وایە سامیکی تایبەتی بۆ هەمووئەوکەسانە هەیە کە رۆژیك لە رۆژان بەر گورزی هیزە سەربازییەکانی یەکیتی کەوتون سەبیحەخان لەوبارەیەوە وتی من زۆرم بەلاوە سەیرە بۆچی ئەوتەوەرە وا بەسەریدا ساغبووەوەو لە سەری رۆیشت وەختی خۆی لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە بریاری کوشتنی کەسیك دەرچووبو درابوویە دەستی کەرتەکەی جەبار فەرمان(ئەوکەسەی کەبریاربوو بکوژریت ئەندامی ریکخستنی کۆمەلەبوو و سەبیحە ناویناهینیت)ئەوکاتە من مندالی سیهەمم ببوو لە سلیمانی بیستم و گویملیدەبوو هەرکەباسی تەوەرەکەی دەستی جەبار دەکەن منیش زۆر ترسام و حەپەسابووم براژنم مندالی بوبو دیاریم بۆ ناردبوو بۆی ناردمەوە ناچار چومە هەلەدن زۆرقسەی ناخۆشیان بۆکردم سەبارەت بەکوشتنی ئەوکورە خەریك بوو شیت دەبووم هاوارم کرد جەبار زوو وەلامبدەرەوە راستیم پیبلی گەرپیم نەلییت دەرۆم بەلام شەهید غەریب هەلەدنی ویەکیکی تریان سویندیان بۆخواردم کە ئەوتەوەری باسی لیوە دەکری لە بنچینەوە راست نییەو ئەوکەسەی کەکوژراوە خەتمائیل بووە بە بریاری مەکتەبی سیاسی بەبی ئازاردان کوژراوە هەتا ئەمرۆش ئەو تەوەرە بووەتەویردی سەرزمانی خەلکی و ئیستاش من نازانم بۆچی ئەوە دروستبوو هەر ئەوکاتە چوومە لای کاك نەوشیروان دواتر لە راگەیاندندا بلاوکرایەوە کە بەبریاری مەکتەبی سیاسی(٠٠٠٠)کوژراوە سەبیحەخان وتی تەنانەت لەپرۆسەکەشدا باسی ئەوە نەکراوە بەلام دواجار دەرکەوت ئەوکارە وانەبوە وبە بریاری مەکتەبی سیاسی کراوەو ئەو تەوەرەش

کەباسی لیوە دەکریت لە راستییەوە دوورە چونکە جەبار بەتەنها نەبووە چەندین کەسی ترکەرتەکەشی لە گەلدابووە سەبارەت بەوەی دوای چەند سالیك جەبار پەشیمان بووەتەوە لەوکارە یاخود نا سەبیحەخان وتی ئەوە فەرمانی جەبار فەرمان نەبووە فەرمانی مەکتەبی سیاسی بوو جەبار فەرمان هیچ دەسەلاتیکی نەبووە ولە تۆمەتیش کە جەبارفەرمانی پی تاوان بارکراوە دلنیام کەوانییەو دورە لە راستییەوە جەبار فەرمان زۆر حەزی لە کتیبەکانی ماوتسی تۆنگ و ستالین بوو ئەو سەری لە داستانەکانی جیڤارا دەسورما کتیبی شیعری زۆر دەخویندەوە شیعرەکانی لەبەردەکردوو زۆرینەی ئەو شیعرانەی کەدەردەچوون دەیخویندەوە تەنانەت تەفسیری شیعرەکانی دەکرد سەبیحەخان دەلیت زۆرجارویەنەی پیاویکی کوردی قارەمانی بدیایە شیکاریکی وای بۆ کەسایەتی دەکرد حەزت دەکرد گویی لیبگریت و حەز لە شۆرش وکوردایەتی بکەیت زۆرجار شیعری دەنوسی وپەخشانیشی دەنوسی لەم رۆچانەدا ئەرسەلان بایز هات دووپارچە شیعری لام بوو داواملیکرد بۆمبلاوبکاتەوە سەبیحەخان جاریکیتریش گەرایەوە لای سەرقالیەکانی جەبار فەرمان و وتی زۆرجار سی چوار وەزارەتی بەدەستەوە بوو فریای خویندنەوە نەدەکەوت وەزارەتی ناوخۆو شارەوانی وفەرماندەی بیجگە لەوە هەرکەسیك هاتبیتە بەردەرگا پیشوازی لیکردووە و گویی لە هەموو کەس دەگرت کارەکانی هیندە زۆربون نەدە پەرژایە سەرئەوەی فریای هەموویان بکەویت ناچار بە تەلەفون دەیکرد جەبار فەرمان شەر خواز نەبوو ئاشتی خوازبوو ناچربوو شەری ناوخۆ بکات ئەوە بریاری مەکتەبی سیاسی بوو سەبیحەخان وتی حەزی لە شەرنەبوومەجبوربووە بیکات — شەری هەشتاکانی حەز لینەبوو ئەوکاتە ئیمە لە خری ناوزەنگ بوین لە هۆلی خالە شەهاب مام جەلال ئاهەنگیکی بۆکردین ئەوکاتە سالی ١٩٨١ ـ ١٩٨٢ بوو ئاهەنگیکی سەری سالی بۆ کردین ئەوکاتە ملازم عمروکاك نەوشیروان لە شەرەکان دەگەرانەوە جەبارفەرمان بۆ شەری ناوخۆ و بەشداری کردنی دوای تیپەربوونی بە ماوە یەك دەیوت ئەوروداو هەلویستانە بۆ وەختی خۆی پیویست دەبوو بکرایە سەبیحەخان پییوایە جەبارفەرمان ئامادەبووە هەموشتیك بۆ یەکیتی بکات سەبیحەخان دەیوت جەبار زۆرجار دەیوت یەك تاقە کورم هەیە گەر یەکیتی داواملیبکات ئەوتاقەکورەم بکوژم دەیکوژم بە دەربرینی سەبیحە خان یەکیتی نیشتیمانی چووبووە خوینیەوە چوار مانگ لە ئەلمانیا گیری خواردبوو زوو زوو دەیوت زۆر عەیبە بۆمن لە ناو جیگادا بخەوم و برادەرەکانملەلای رایات شەربکەن ئەوکات یەکیتی شکستیخواردبوو قادری حاجی عەلی

وعەبدولا بۆر سەرپەرشتییان دەکرد ئەوکاتە ستور لەسەرهەموو برادەرانی جەبار فەرمان داخرابوو تورکیا ریگەی داخستبو زووبەزوو جەبارفەرمانیان دەوت وەزعی یەکیتی زۆر خراپە با زوبگەرییەنەوە میش بە برادەرەکانیم دەوت بۆچی وازیان لیناهینن هەردەتانەویت بە کوشتی بدەن ئەوکاتە عەندنانی حەمەی میناوشیخ جەعفەرو مەحمود سەنگاوی و مام رۆستەم و جەبارفەرمانیش سنوریان لە سەر داخرابوو مام جەلال ریگایەکی دۆزییەوەولە ئیرانەوە گەرانەوە سەبیحەخان چرکە ساتەکانی گەرانەوەی جەبار فەرمان دەگیریتەوە و دەلیت لە کاتی گەرانەوەیدا سەبیحەپەیمان بی هەردووپیکانم بقلیشن و خوینم تیکەلی زەوی بی جاریکی تر ناگەریمەوە من چۆن دەتوانم لە ئەوروپابمو برادەرانم سنگیان بە گولەوە بیت ئەوکاتە سالی ١٩٩٤ بوو ئەوباس لە دلسۆزی جەبار فەرمان بۆ برادەرەکانی دەکات وئاشکرایدەکات کەبەتایبەتی لەگەل عمر ی سەید عەلی دا نیوانیان زۆر خۆشبووە هەریەکیك لەبرادەرەکانی بکەوتنایە تە تەنگانەوە بە زوترین کات فریایان دەگەوت جەبار فەرمان دەیگوت ئامادەم رۆحی خۆم بۆ برادەرەکانم بفرۆشم کاك نەوشیروان هەرچییەکی داوابکردایە لە جەبار فەرمان بۆی جیبەجی دەکرد جەبار فەرمان مام جەلالی زۆر زۆر خۆشدەویست مام جەلالیش جەباری زۆر خۆشدەویست لە کاتی دەنگدانی مەکتەبی سیاسیدا هەر شتیکی بەدل نەبوبیت دەنگیپینەداوە ئەوکاتەی دکتۆر بەرهەم کرایە سەرۆکی حوکمەت جەبار دەنگی پینەدابوو پیوتبوو بەرهەم لەتۆ مستەهەفترهەیە مام جەلال جەباری زۆر خۆشدەویست لەبەرئەوەی رووبەرووقسەوبۆچونی خۆی دیاری دەکرد حەزی لە دووروی نەبوو سەبیحە باس لەرووداویك دەکات کە لە نیوان مام جەلالو جەبار فەرماندا روویداوە سالی ١٩٩١ دوای تەواوبونی شەرەکەی ئەزمەر جەبار لە قەلاچولان شوینیك بۆخۆی خۆشدەکات و شوینی مام جەلال ناخۆشتر دەبی لە شوینەکەی جەبار مام جەلال نامەیەك دەنوسیت و دەلیت شوینەکەتم بۆ چۆلبکە جەبار فەرمان زۆر نارەحەت دەبیت وکەمیك ساردی دەکەویتە نیوانیانەوە جەبار فەرمان دەکەویت بەرقداودەلیت چۆلی ناکەمبەلام پاش ماوەیەك دلی باش دەبیت و دەرواتە دەری سەبیحەخان جەختی لەوە کردەوە جەبار فەرمان بەوهەموو توندییەی خۆیەوە گەر بەنەرمی داوای لیبکردایە هەرشتیك بووایە بۆی دەکردیت بەلام بە عینادی بوایە ئامادەبوو هەزار کەس بکوژی و ئەو شتە نەکات جەبار خاوەن بریاری خۆی بوو راستگۆبوو بویربوو زۆر بە ئیرادەبوو گەربریاری بدایە بەرزترین شاخ بگری دەبوایە بگیرایە سەبیحەخان جەختی لەوە کردەوە

کەئەو لەسالی ١٩٧٤ەوە کەشووی کردووە بەجەبار فەرمان بروناکات بەهەرهەمووی ١٢سال لەگەلیدا ژیابیت چونکە ژیانی ئەو یان پیشمەرگایەتی بووە یان ریکخستن یان زیندانی سالی پاربوو کاك نەوشیروان پییوتم سەبیحە بە هەمووی چەند سال من لە گەل شوعلەی خیزانمدابووم لە سالی ١٩٨١ەوە هەتا سالی پار کاك نەوشیروان وخیزانەکەی بە ئیعترافی کاك نەوشیروان خۆی تەنها حەوت سال پیکەوە بون **سەبیحەخان وتی** ئەوکاتەی من شووم کرد بەجەبار بەهەرهەموی ١١مانگ پیکەوەبوین پاشان زیندان کراو چوار سال لەمن دورکەوتەوەو دواتریش ژیانمان هەروابوو باوەرناکەم بەدریژای شۆرش توانیبیتمان یادی هاوسەرگیری بکەینەوە یان کردبیتمان جەبار فەرمان کە ئازادبوو سالی ١٩٨٠بووە پیشمەرگە منیش سالی ١٩٨١ بوومە پیشمەرگە چوومەشاخ هەتا کاتی پرۆسەی ئەنفال زۆر بەکەمی یەکتریمان ىبینیوە دوای ئەنفالەکانیش زۆربەکەمی یەکتریمان بینیوە لە دوای راپەرینیشەوە سەبیحەخان سالی یەك جار جەبار فەرمانی بینیوە چونکە ئەوان لە ئەلمانیا بوون سالی یەك جار سەری لیداون خیزانی جەبار فەرمان پاش ١٢سال کەلە ئەلمانیادەبن لەسالی ٢٠٠٣بە یەکجاری دەگەرینەوە کوردوستان سەبارەت بە نازناوی فیلە تەن کەبووبووە نازناوی جەبار فەرمان **سەبیحەخان** ئاشکرای کرد ئەونازناوە مام جەلال لیناوە ئەوەش لەکاتی شەری بیواتە دابوو کاتیك پیشمەرگەکانی چەك وتەقەمەنییان پینەمابوو مام جەلال بە جەبارفەرمانی وت فیلە تەنلەماوەی بیست وچوار کات ژمیردا دەبیت چەکو تەقەمەنی فریای پیشمەرگە بخەیت جەبار فەرمانیش نەی هیشت بیست وچوار سەعات تیپەریت و لەماوەیەکی کەمترداهاوکاری پیگەیاندن لەو رۆژەوە پیی دەلین(فیلە تەن) ئەوکاتە پیشمەرگەکانی یەکیتی نیشتیمانی چالاکییان زۆر بووبوو حوکمەت لە ریگەی چارەنوسەکانیەوە هەولی دەرمان خواردووکردنی هەندیك لە سەرکردەکانی دەدا وەکو ئەورووداوەی بەسەر مستەفا چاورەش وئەواندا هات و دایکی مستەفا چاورەشی تیدا شەهید بوو بیستونی مەلا عمرو چەندین کەسی تریش زەرەر مەندبوون سەبیحەخان سەبارەت بەو سەردەمە وتی جەبار فەرمان زوو زوو ئاگاداری دەکردمەوەو دەیوت هەر خواردنیکمان بۆهات(پاقلاوەبیت یان هەرشتیکی تر بیت مەی خۆن) چونکە ئەو گومانی هەبوو بەلام لەلایەن ریکخستنەکانەوە یان کەسوکاری خۆمانەوەخواردنمان بۆبهاتایە جیاوابوو زۆر وریابوو گومانی لە زۆر شت دەکرد لەدوای راپەرینەکەشەوە چەندین جار خەلکیان ناردووە بۆ ئەوەی زیانی پیبگەیەننخۆی بۆی گیرامەوە کە منالیکی گرتووەو دەرمانی پیبووە بەلام

منداڵەکەی ئازاد کردووە بەوەشدا زانیبویان ئەودەرمانە ژەهری تیدایە دابوویان بەمریشکیك کەخواردبووی دەست بەجێ کشتبوی سەبیحەخان زۆر بەلایەوە سەیربوو کەجەبار رلە سەدەها شەردا بەشداری کردوە بەلام بریندار نەبوە جاریکیان برادەریکی شەروالەکەی جەبار فەرمانی هینابوەوەهەرهەمووی کون کون بوبو ئەو زۆربەلایەوە سەیربوو کەچۆن بەر لەشی نەکەوتووە برادەرەکەی گومانیان لیی هەبووە کە گوللە بەندی پی بوبیت سەبیحەخان گەرایەوە سەرمام جەلال ووتی زۆر زۆر جەباری خۆشدەویستمام جەلال بروای تەواوی بە جەبار هەبووکە هەرگیز خیانەتی لیناکات سەبارەت بە شەری سالی ٢٠٠٠ی کورتەك کەلە ٢٠٠٠/١٢/١٥دژی پەکەکەو جەبار فەرمان فەرماندەی ئەو شەری دەکردسەبیحەخان وتی ئەکاتە جەبار فەرمان تەندروستی تەواونەبوو دکتۆر ئومید برای دکتۆر نەوزاد وتی هەستمکردوە قاچی جەبار فەرمان تەواو نییە سەبیحەخان پیی سەیربوو سەرکردایەتی ئەوشەرەیان بە جەبارفەرمان سپاردوە چونکە بە گویرەی ئاماژەکانی ئیمەو دکتۆر جەبارفەرمان لەسالی ١٩٩٨ەوە نەخۆشبوە سەبیحەخانوتی سالی ١٩٩٩لەمانگی پینج دا خۆمو منداڵەکانم گەراینەوە ئیمە گولو دیاریمان بۆ هینابوو بە خەیالی خۆمان وامان دەزانی چاوەروانمان دەکاتکە هاتینەوە وتیان چۆتەئیران بۆ پشکنینی تەندروستی و چاوەرییە ئیوەش بچن بۆلای زۆرم بەلاوە سەیربوو کە گەیشتمە لای پیموت جەبار ئەوە چیتە نەخۆشیت؟ جەبار بە تورەییەکەوە وەلامی دامەوە وتی کەی من نەخۆشم دەلاچۆ؟ ئەوهەستی کردبوو نەخۆشە بەلام راینەدەگەیاند جەبار فەرمان زۆر خۆش دەینوسی بەوەدا کەناتوانیت بەباشی بنوسیت وبەرەو تیکچون دەچیت زانیبووی نەخۆشە سەرەتا هاوسەنگی تیکچوو حەزی نەدەکرد لای کەس باسی نەخۆشییەکەی بکات تەنانەت بەبرادەرەکانیشی نەوتبو لەئەلمانیا هاوری خەجۆ لە مالمان بوو دکتۆربەرهەم تەلەفۆنی بۆجەبار کرد جەبار پیوت کاك بەرهەم نەخۆشم و نەخۆشییەکەشم ترسناکە وچارەسەری نییە من هەتا ئەوکاتە نەم زانیبوو **سەبیحەخان وتی** دکتۆریکی چینی هەبوو دەرزی دەکوتا لەلەشی نەخۆش شیوازیکی تەندروستی چینییە پیموت ئەگەر برۆیت بۆ چین و ئەوشیوازە تاقیبکەیتەوە زۆرباشە ئەوەی ئەوکارەی دەکرد دکتۆریك بوو ناوی سەلاح بوو ئەودکتۆرە خەلکی کەرکوکەو ژنەکەی چینییە وەرگیرانی بۆدەکرد دواتر وایان لیدەکرد کەبچیت بۆ چین من پیموتن پەیمانم دەدەنی چاکیبکەنەوە؟ ئەوانیش وتیان نا چونکە نەخۆشییەکەی ترسناکە بەلام دەتوانین نەخۆشییەکەی رابگرین گەرنەی بەین

بۆچین بۆ چارەسەر ماوەیەکی تر تۆش ومندالەکانیشت ناناسیتەوە ئەورۆچەی تەرمەکەی ئیبراهیم ئەحمەدیان هینایەوە بۆسلیمانی لە تەلەفزیۆنەکاندا دەریدەخات کەچەندینجار جەبار ئەیەویت تەوقە لەگەل مام جەلال بکات بەلام مام جەلال تەوقەی لەگەل ناکات سەبیحەخان وتی منیش لە تەلەفیزیۆندا بینیم زۆرم بەلاوە سەیربوو چونکە مام جەلال خۆی جەباری هەلبژاردبۆ ئەوەی سەرپەرشتی هینانەوەی تەرمەکەبکات لەبەرئەوەی جەبار لە ئیران ریزیکی زۆری هەبوو ئەورۆژە زۆر سەیربوو جەبار ئوتومبیلەکەی خۆی دابوو بە کافیە خان و دادەهیرۆ من زۆر بەلامەوە سەیربوو مام جەلال تەوقەی لەگەلدا نەکردئەوتەوقەی لە گەل ئیرانییەکان کرد من هەتاکو ئەمرۆش برواناکەم مام جەلال بە عەمدی ئەوکارەی کردبیت چونکە ئەویش جەباری زۆر خۆشەویست هیچ جۆرە عاجزییەکیان نەبوو مام جەلال خۆی جەباری ناردووەئیتر چۆن تەوقەی لەگەل ناکات سەبیحەخان سەرسورمانی خۆی بۆ ئەورووداوە نیشانداو باوەریشی وابوو راگەیاندنەکان زۆر گەورەیان کردووە چونکە چەندینجار لە تەلە فیزیۆنەکاندا لییان دابووە وە ئەو وتی پاش گەرانەوەیان لە مەراسیمەکە ئامۆژنی جەبار بۆی گیرامەوە وتی جەبار تاوەکو دوانزەو یەکی شەو لەسەربان و باخەکەدا پیاسەی دەکردو زۆر پییتیکچووبوو من پیم سەیرە کەچۆن توشی جەلدەی دل نەبووە هەندیك خەلکیش لەوبروایەدان کە ئەو رووداوە کاریگەری راستەوخۆی هەبووە لەسەر نەخۆشییەکەی جەبار فەرمان هیندەنیگەرانی ئەورووداوە دەبیت کە مام جەلال تەووقەی لە گەلداناکات هەوال دەنیریت بۆ هەموکەنالەکان پییان دەلیت ئەو دیمەنە پیشانمەدەن تەنانەت هەرەشەشیان لیدەکات بەلام بەردەوام کەنالەکان ئەو دیمەنە لیدەدەن و کاریگەرییەکی زۆری کردبوە سەر دەرونی جەبار سەبیحەخان وتی کاریگەری ئەو روداوە تەوقەنەکردنی مام جەلال لەگەلیدا هیندە کاری لەسەر دەرونی جەبار کردبوو هیندەی پینەچوو دەستی لەکار کیشایەوە تەرمەکەی لەمانگی پینجی ٢٠٠٠داهاتەوە جەبار لەمانگی شەشی هەمان سالدا دەستی لەکار کیشایەوە جەبار پۆستی زۆربوو ماوەیەك وەزیربوو ماوەیەك جیگری فەرماندەی گشتی بووە یەکەمین جار بووەتە پیشمەرگە دواتر بووە بە رابەری سیاسی لە هەریمی چوار پاشان بووە بە بەرپرسی کەرتی ریکخستنی چۆمان ورانیە پاشان بووە بەبەرپرسی ریکخستن لە هەلەدن پاشان بوە بەبەرپرسی مەلبەند ئەو لەهەموبوارەکاندا رۆلی دەگیرا سالی ١٩٩٣ وەزیری پیشمەرگەبوو رۆژیکیان بانگی کردم وتی سەبیحە چۆن دەم بینی منیش وتم هەر

له سەرەتاوە جەبار رفەرمانی لە سی ئابدا کردیانە وەزیری ناوخۆ بەوەکالەت وەزیری پەروەردەو لە ئەشریفەکەشیدا خویندومەتەوە بەرەسمی جیگری کۆسرەت بووە وەکو سەرۆکی حوکمەت ماوەیەك کافییەخان هاتبوە دەرەوەوتی جەبار فەرمانم ئبە وەکالەت کردووە بەوەزیری گەوشتوگوزار جەبار فەرمان هەمووپۆستەکانی بەلاوە ئاسان بوو پیاویکە بوو بروای بەخۆی هەبووە سەبارەت بەدەنگۆی دەرمانخواردووکردنی جەبار فەرمان کەلە هەندیك دەزگای راگەیاندندا بلاوکرایەوە سەبیحەخان وتی برواناکەم ئەونەخۆشییە لە خۆیەوە دروست بووبیت کەتەماشام دەکرد دەمگوت ئەوە نەخۆشی نییە زۆر کەس دەیان وت ئەوە نەخۆشی پیرییە برواتان هەبیت نەتان دەناسییەوە پیست وئیسقاتی پیکەوە بوو وەکو ئەوزە وابوو دوای پینج سال مردوویەك لە قەبر بینیتە دەرەوە زۆر لاواز بووبوو زیاتر لە سی سال و نیو کەسی نە دەناسییەوە شیر پەنجە هەرگیز وانییە دەیان وت مۆخی سەری پوچەل بووە سەبارەت بەوەی کە دەستیك لە پشت ئەو نەخۆشییەوە هەبیت سەبیحەخان وتی من گومانم لە دەولەتی تورکیا هەیە چونکە لە شەری ۱۹۹۷ داجەبار بۆی گیرامەوە دەیوت من بۆ کوی دەچووم فرۆکەکان بەدوامەوە بوون بۆردومانی ئەوناوچەیەیان دەکرد کەمنی لیبووم جەبار کەبۆی دەگیرامەوە خۆی بەلایەوە سەیربوو چۆن دوای چەندچرکەیەك جیگەکەم دەگوازمەوە ئەوفرۆکانە چۆن دەگەنە سەرم سەبیحەخان جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی دوای ئەوشەرانە سالی ۱۹۹۸داوای جەبار فەرمانیان کرد وەکو وەفدی مفاوەزات بچیت بۆ تورکیا پاش گەرانەوەی لە تورکیا نەخۆشییەکەی هیواش هیواش لیدەر دەکەوت ئەو بەتورەییەکەوە وتی هەر رۆژیك ئەوکەسەی جەبار فەرمانی دەرمان خواردووکردووە بیدۆزمەوە دەیدەمە دادگا ئەو جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە تورکیا جەبارفەرمانی دەرمانخواردووکردووە سەبیحە خان وتی پیاوی ئاسای ناتوانیت ئەوکارە بکات ئەم ژەهرە وەکو ژەهرەکەی مستەفا چاورەش و د محمودو د شوانییە یەکسەر دەربکەویت ئەم ژەهرەی دراوە بە جەبار فەرمان کاریگەری دریژ خایەنی هەبووە دەرمان خواردووکردنی شۆرش ئیسماعیل یەکسەر دەرکەوت سەبیحەخان شتیکی تری ئاشکراکردو وتی جەبار فەرمان پیوتم شتیکیان داومەتی بەدریژای رۆژگار ی داهاتووکاریگەریم لیدەکات منیش وتم بۆچی؟ وتی چونکە من دەزانم گەر شتیکیان دابی بەمن لە ماوەی دووسی مانگی رابردوودا گەر کورت خایەن بیت دەیدۆزمەوە دەزانم هامووشۆی کویم کردووە سەبیحەخان وتی زووزوو جەبارفەرمان پییدەوتم دەرمان خواردووکراوم بەلام پی عەیب

بوو باسی بکات من نازانم بۆچی پیی عەیب بوو کاریگەری ئەوژەهرە وردە وردە دەردەکەوت هەرچی قژی پیوە مابوو وەری شۆفیری بیرچووبووەوە خویندن و نوسینی بیرچووەوەو وایلیهات کەسی نەدەناسیەوە دریژەی پیدا نەخۆشی نییە لە دنیادا والە نەخۆشەکەبکات کەس نەناسیتەوە تەمەنی دایکم ۹۸سالەو هەمووکەسیکیش دەناسیتەوە جەبار فەرمان زووزوو بە دایکمی وت گەر تۆبمریت گەورەترین مەراسیمت بۆدەکەم بەلام ئیستا دایکم بۆ جەبار دەگری سەبیحەخان جاریکی تر جەختی لەوەکردەوە کەتەواوی پشکنینەکانیان لایەو دەیسەلمینیت هەمووجەستەی جەبار فەرمان لەناوەوە ساغ بووە وتەنها میشکی پوکابوەوە لە کۆتای سالەکانی ۱۹۹۰ـ۱۹۹۱کەمیك فشاری خوینی هەبوو رۆژی نیو لەت حەبی دەخوارد گورچیلە کانی تەواو بووبو جگەری شەکرەی نەبوو هەر هەمووی تەواوبوو زووزوو قسەم بۆ جەبار دەکرد باسی یادەوەرییەکۆنەکانم بۆدەکرد هیچ تینەدەگەیشت ناچار دەچومەباخەکەو دەگریام قاچو دەست وچاوو هەستەکانی هەمووی وەستابوو زیاتر لە سی سال ونیوو بوو نەماندەهیشت کەس بیبینی ورەی خەلکمان بەرز دەکردەوە تاوەکو قلەو بوو باشبوو بەلام کەلاوازبوو ئیتر شاردمانەوە نانی نەدەخوارد بەلام لەهەمووی سەیرتر رۆژیك نانی خوارد زۆرمان بەلاوە سەیربوو دوای ئەوە بۆ دوو رۆژ هیچی نەخوارد رۆژیك پیش مەرگی دووکەوچکی خوارد زۆر کۆکی وتمان زمانە بچکۆلەیەتی رقی زۆر لە ئاوو بوو کەئاوی دەخواردەوە بۆ ماوەی دە دەقیقە هەر دەکۆکی کاتی مردنیشی کەم پیاوم دیوە نەگری هەتا لە ژیانمدابم وەك چۆن هەمووسالیك یادی ئیمام حسین دەکریتەوە من نەك هەمووسالیك هەمووچرکەیەك یادی دەکەمەوە خۆم دەکوژم لەبەرخاتری مندالەکانیش نەبوایە دووەم رۆژ خۆم دەکوشت ئیتر دەمخەنە جەهەنەم یان ناوئاگرەوە یان هەرچییەك دەبی بابیبت سەبیحەخان بەقولپی گریانەوە وتی من ئەوپیاوە کەناوی جەبار فەرمانە زۆرزۆرم خۆشدەویست لەدوای ئەو ژیانم بۆچییە سەبیحەخان زۆر نارەحەتەو بەردەوام چەندبارەی دەکاتەوە ودەلی رەنگە خۆم بکوژم ژیان و یادەوەری و خۆشی وناخۆشییەکانم قەلایەکم لە پشتەوە بوو ناوی جەبار فەرمان بوو سەبیحەخان دەیوت خەلك زۆر پروپاگەندەیان بۆ کردوین کەلەدەرەوەی ولات بووین وتویانە لە ڤیلادا دەژین بڕواتان هەبی وانەبووە و لە سلیمانیش لەم خانووە زیاتر هیچی ترمان نییە کاتیك تەماشای ژوورەکەی جەبار فەرمانیشمان کرد ژووریکی سادە هیشتا قەلەویرەکەی لەوی مابوو کەزیاتر لە سی سال ونیو لەسەری بوو لەدوای مردنی جەبار

فەرمان سەبیحەخان وتی هەمووکەسیك دلنەوای کردووم هەموو بەرپرسەکان هاوکارییان کردووین برواتان هەبیت سەرۆك کۆماری هیچ ولاتیك ئەوەی بۆ نەکراوە شەوانیش دەورمان قەرەبالغە کاتی نەخۆشییەکەشی زۆر هاوکارییان کردووین سەردانیا کردین بەلام ئەم سی سال ونیوەی دوای نەمان دەهیشت کەس بیبینیت قاچەکانی وەکو ئەم تەختەیەی لیهاتبوو کەس حەزی نەدەکرد سەیریبکات سەبیحەخان وتی لەکاتی نەخۆشییەکەیدا ئەوەی بەجەرگنەبوایە نەیدەتوانی ببینیت کاك عمری سەید علی کاك عیماد ئەحمدوو شیردل حەویزی و مولازم عمر دەیبینی بەلام مام جەلال سەردانی نەکردلەماوەی نەخۆشییەکەیدا بۆ خۆم دووجار چووم بۆلای مام جەلال مام جەلال وتی چیت ئەوی منیش وتم هیچم ناوی بەس تکام وایە ئەومدالیایەی پیشکەشی برادەرانت کردووە پیشکەشی جەبار فەرمانیشی بکەیت ئەورۆژە جەبار فەرمان نەچووبوو کەبرادەرەکانی مەدالیای ریزلینانیان وەر گرتبوو ئەو رۆژە چووبووژنی بۆبرادەریکی هینابوو بەلام دوای کاك عمری سەید علی هات مەدالیاکەی کرد بەسنگی جەبار فەرمانەوە هیچ جۆرە عاجزییەك لە نیوان مام جەلال و جەبار فەرماندا نەبوو سەبارەت بە نەخۆشییەکەی و گەران بەدوای چارەسەردا سەبیحەخان وتی چوینە ئەمەریکا بردوومانەتە چین لە سالی(٢٠٠٠-٢٠٠٢) ئەوکاتە کەمیك باشبوو دکتۆربەرهەموو دکتۆر نەجمەدین ئەوکاتە لە ئەمەریکابوون دکتۆر نەجمەدین راپۆرتی دا بە مەکتەبی سیاسی کە نەخۆشییەکەی جەبار فەرمان ترسناکەو چارەسەری نییە ئیمە ئەوکات نەمان زانیبوو من گلەیم زۆر لە کاك عمری سەید علی و مولازم عمروو عیماد ئەحمەد کرد کەبۆچی پییان نەوتوم کەنەخۆشییەکەی خراپەو پاشان دووجار چوین بۆ چین و سی جار چوو بۆلەندەن وئەلمانیا لەچاکترین نەخۆشخانە پشکنینی بۆ کرا بردمان بۆ ئاخن هایدلبیرگ بۆ میونش بۆ بۆن وتیان لەنەرویج چارەسەری هەیە بەرلەوەش چووبۆ سوید سەبارەت بە ژەهر خواردوکردن و لەوەی ئایا لەو ولاتانەی کەبراوە بۆچارەسەرکردن تاچەند هۆشییان پیدابوو سەبیحەخان وتی جاریك لە ئەلمانیا وتیان پشکنینەکەی زۆر گرانەو ١٠,٠٠٠یۆرۆی تیدەچیت و١٠٠جۆر ژەهر هەیە ئیمە دەتوانین تەنها پشکنینی ١٠-١٢جۆر لەو پشکنینانەی بۆبکەین پیشیان وتین ئەگەر دەرەنجامی پشکنینەکە دەربچی کە ژەهرە هیندەی تر لایەنی سایکۆلۆژیی تیکدەچی لەبەرئەوە وازیلیبهینن چونکە چارەسەریشی نابیت ئەوکات جەبار دەهات ودەچوو ئیمە زۆرمان پیخۆش بوو ئەوپشکنینە بکات بەلام جەبار فەرمان نەیکرد جەبار فەرمان

وسەبیحەخان سی منداڵیان هەیە(دووکچ و کوریك)یەکەمیان ١٩٨٠لەدایك بووە سێهەمیشیان کورەوتەمەنی ١٨ساڵە سەبیحە وتی پارتی دیموکراتی کوردوستان پرسەنامەی بۆ ناردووین بەڵام یەکیتی ئافرەتان هاتوونەتە پرسەکەو دەڵین مەسعودبارزانی و نیچرڤان بارزانی پرسە نامەیان ناردووە بۆمەکتەبی سیاسی من هیچم پینە گەیشتووە **سەبیحەخان وتی** جەبار فەرمان لەسەرەتای ژیانیدا پیاویکی ئاینی توند رەوبوو زۆربرواى بەوتەکانی ئیمامی عەلی بووموسوڵمانیکی توندرەوبوو تاوەکووبووبەئەندامیکی کۆمەڵە سەبیحەخان وجەبار فەرمان هەردووکیان شیعەن بەڵام هەمیشە جەبار فەرمان بە سەبیحەخانی وتووە هەرگیز لەناو گوندەکاندا مەڵی ئیمە شیعەین لەبەر بەرژەوەندی نەتەوەی بوو وایدەوت و هەلویستی وابوو .

## ئارام، سەرکردە تەنیاکەی کۆمەڵە

### راپۆرتی هێمن باقر و هیمداد حمید

کورە رەشتاڵەکەی حاجی حان بارودۆخ تابڵێی خراپ بوو، هێشتاساڵێك بەسەر نسکۆی ۱۹۷۵ دا تیچنە پەریبوو خەڵکی دەرونیان پرلەخەم ودەرونیان پر لەگریان بوو هێشتا شۆکی نسکۆخەڵکی بەرنەدا بوو لەولاشەوە رێکخستنەکانی کۆمەڵە ئاشکرابوبون وسەرکردەکانی لەزینداندا بوون بەڵام بۆ نوخبەیەکی زۆر کەم هێشتا هیوایەك هەبوو رۆژانە چەندینکەس لەوانەی کەهێشتا تروسکاییەکی هەڵگیرسانەوەی شۆرشیان لەیمابوو بەنهێنی خۆییاندەکرد بەکۆڵانە تەنگەکانی گەرەکی حاجی حانداو لەژوریچکی درێژکۆلەی بچوکی خانوویەکی گەورەدا دیداریان لەگەل کوریکی رەشتالەی لاوازدا دەکرد کە چاویلکەیەکی گەورەو جلیکی کوردی تارادەیەك کۆنی لەبەردابوو ئەوەی بەباوەری لاواز بەشۆرشەوە دەچووە ژوورەوە بەباوەریکی پتەو بە کۆلنەدان وخەباتەوە دەهاتە دەرەوە ئەوکەسەش(**ئارام**) ی سەرکردە بوو کە هیشتا نەچووبوە سییەکانی تەمەنییەوە ئارام ناوی تەواوی(**شاسوار جەلال سەعید غەنی** )یە لەمانگی ۱۱ی۱۹٤۷لە گەرەکی حاجیانی سلیمانی لەدایك بووە بنەماڵەکەیان لەبنەرەتدا لەشیخانی بەرزنجەیە خویندنی سەرەتای لەسلیمانی وماوەت ناوەندی لە چوارتاو ئامادەی لە سلیمانی تەواوکردووە ئەوسەرەتا لە کۆلیژی ئەندازیاری وەردەگیریت بەلام بەهۆی لاوازی چاویەوە لە پشکنینەکە دەرناچیت بۆیە بەناچاری دایدەبەزینیت بۆ کۆلیژی بازرگانی ئارام کوری بچوکی خیزانیکە کە سەروکارو ئاشنایەتییان لەگەل سیاسەتدا هەیە بەتایبەتی خالی وبراگەورەکەی کەلەنیو پارتی دیموکراتدابووە لەم نیوەندەدا ئارام بەفکری خالی سەرسام دەبیت کە فکری چەپەو لەوێوە دەست دەکات بە خویندنەوەی ئەدیبایەتی چەپ کەفکری باوی ساتەوەختی گەورەبوون و نەشومان کردنی ئەوەبووە وەك گەنجیك دواتریش هەمووتەمەنی خۆی بۆبلاوکردنەوەی ئەو فیکرە تەرخان دەکات ئارام لەپۆلی شەشەمی سەرەتای دەبیت کە شۆرشی ۱۹۵۸رووددەدات و ئەو رۆژە وەك جەژن سەرکەوتن بەریدەکات دواتر ئارام دەچیتە ناو یەکیتی لاوانی دیموکراتی کوردوستانەوە لەگەل دابەشبوونی پارتی بەسەربالی جەلالی و مەلاییدا ئاراملەنیوبالی جەلالیدا خۆی

دەبینیتـەوە ولـە نیـو ئەوبالـەدا دەبیتـە ئەنـدامی سـكرتاریەتی یـەكیتی لاوانـی دیمـوكراتی كوردوستان لەوماوەیەشدا لە بەغدابەشداری لـە ئەلقـەی دیراسییەكانی مـام جـەلال دەكات كەلەسەر فیكری چەپ و مایوزم دەیان لیتەوە سالانی كۆتـای شەسـتەكان سـالانی خـەملین و دەركەوتنی گروپیكی فیكـری چـەپ بـوو لـە نیـو خـەتی بـالی مەكتـەبی سیاسـیدا بەتایبـەت ئەوانـەی كـە لـە دەوری رۆژنامـەی(رزگـاری)كۆبـبونـەوە لەوانـە نـەوشـیروان مسـتەفا و شـازاد سائیب و محمد سابیر و محمودی مەلا عیزەت هەروەها گروپیكی دی كـە لـە خالـە شـەهاب و فوئاد قەرەداغی وفازلی مەلا محمود پیكهاتبوو ئەمە جگـە لـە چـەندین كـادیری پیشكەوتوو لە ریزی قوتابیان و لاواندا كە بەفیكری چەپ سەرسام بوون بـەلام ریكخـراو نـەبوون ئیـدی فیكری چەپ لە ناو بالی مەكتەبی سیاسیدا ئەوەند بەهیزبوو كە ئەگەر حیزبەكە بۆ خـۆی لــە ســالی ١٩٧٠دا هەلنەوەشــایەتەوە ئــەوا حیزبیكــی نــوی لی جیــادەبووەوە بەتایبــەتی لەبەرئەوەی گەنجەكان برایم ئەحمەدو علی عەسكەری وعمر دەبابەیان قبـول نـەبوو بـەلام مام جەلال هەر لەسەرەتاوە لەگەل چالاكی ئەم گروپە چەپانەدا بووە وهـانی داون تەنانـەت دەوتریـت تالـەبانی لــە بــەیانی دامەزرانــدنی كۆمەلــە بەشـداربووە كــە لەبەغـدا لــەمالی فەرەیدون عەبدولقادردا بـەریوە چووە ئـارام لـەریگای خالـە شـەهابەوە بانگدەكریت بۆنـاو كۆمەلە ئیدی لەو رۆژەوە ئارام وەك كادریكی دیـاری كۆمەلـە رۆلی گـرنگ دەگیریـت لـە سـەر پیخـستنی ئــەم ریكخــراوە نهینییــەدا دوای بــەیان نامــەی ١١ی ئــازار و تیكەلبونــەوەی هەردووبالەكـەی پـارتی ئـارام دەبیتـە ئەنـدامی سـكرتاریەتی یـەكیتی لاوانـی دیمـوكراتی كوردوستان و دواتریش دەبیتە لیپرسـراوی بەشـی رونـاكبیری وراگەیانـدن بـەلام لـەناو ئـەم ریكخراوەدا شانبە شانی هاریكانی لەپیگـەكانی دیكـەی پارتیـدا سـەرقالی ریكخـستنی نهینـی دەبیت بۆ ریكخراوە نویكەیان كەكۆمەلـەبوو لەبەرئـەوەی فیكـری ماركـسی لـەو سـەردەمەدا لـەبرەودابوو پـارتی هەسـتی بـە مەترسـییەكانی ئـەم ریكخـستنە نهینییـە كردبـوو لەگـەل ئەوەشدا كەپارتی دەنگی ریكخستنیكی نهینی لەناو ریزەكانیـدا دەبیـست بـەلام لەبەرئـەوەی ئەم ریكخستنە رەنگی نەبوو نەیدەتوانی هـیچ شـتیك بـسەلمینیت كەسـالی ١٩٧٤بـەیان نامـەی ئـازار هەلوەشـایەوە ئـارام لـە چـۆمان بـووە بەریوبـەری دارایـی ئەمانـەی عـامی داد كەسـالح یوسفی لیپرسراوی بوو لەسالی ١٩٧٥و دواوی بەیانامەی جەزائیرونسكۆی شۆرش ئارام لـەریزی ئەو دەنگانەدا بوو كـە داوای بـەرگری دەكـرد كـەئاش بـەتالیش كـرا ئـارام گـەرایـەوە ناوشـار لەگەل هاوریكانی دەستیان كردە دروستكردنی ریكخستنی نهینی لەناوشاردا لە ١٩٧٥/٥/٢٢لـە

دەرەوەی ولات بەیان نامەی دامەزراندنی یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان بلاوکرایەوە بریاری هەلگیرساندنەوەی شۆرش درا لالەم ساتە وەختەدا کۆمەلە بەهیزترین ریکخستنی ناوخۆبوو کە یەکیتی دەیتوانی پشتی پیببەستیت و لەم رووەشەوە ئالوگۆری نامە لەنیوان سەرکردەکانی کۆمەلەو دامەزرینەرانی یەکیتیدا(بەتایبەتی مام جەلال)هەبووە بەلام دەستگیرکردنی ئەندامیکی کۆمەلە بەناوی ئەنوەر زۆراب لە ١٩٧٥/٨/٢٨بەنامەیەکی مام جەلالەوە سەرەتای ئاشکرابوون و هەلاتنی ریکخراوە نهینییەکەی کۆمەلەبوو لەناو شاردا ئیتر دەستگیرکردن و دانپیانانەکان تادەهات زیاتر دەبون خۆشاردنەوەو هەلاتنی ئەندامە دیارەکانی کۆمەلە زیاتر بوون لەم سەروبەندەدا سەرکردەکانی کۆمەلە(خالە شەهاب وجەعفەروفەرەیدون عەبدولقادر) وچەندکەسیکی تر هەلاتن بۆ ئیرانیان هەلبچارد بەلام ئارام وچەندین هاوریەکی دیکەی سووبوون لەسەرئەوەی بەنهینی دریژبە خەبات بدەن لەناوشاردا لەسەر ئەم جیاوازییەش سەرەتای کیشەکان لەنیوان خالە شەهاب و ئارامدا بەزەقی دەردەکەوت هەربۆیە خالە شەهابوو هاوریکانی چوونە دەرەوە و مەشخەلی سەرکردایەتییان بە کۆمەلیکی دیکە سپارد نەك ئارام وهاوریکانی لەوانە ئەرسەلان بایز لە هەولیر ئەبووشەهاب لەسلیمانی ئازاد هەورامی لەکەرکوك بەلام ئەم گروپە نەیان توانی ئەم کارە بکەن جگە لە ئازاد هەورامی ئەوانی تر هەلاتن سەرکردەکانی کۆمەلە لە ئیران خۆیان تەسلیم بەئیران کرد بۆئەوەی وەکو پەناهەندە وەریانبگریت لابەلام ئیران تەسلیمی عیراقی کردنەوە ئەوەی کەتائیستا پرسیارە لەسەر ئەو سەرکردانەی کۆمەلە کە هەلنەهاتنیان بووە کاتیك تەسلیم بە حوکمەتی عیراقی کراونەتەوە چونکە لە گوندی بناوە سوتەی سنوری ئیرانەوە تا پینجوین دوو پۆلیسیان لە گەلدابوو کە تفەنگی شەست تیریان پیبوو لە کاتیکدا ئەوان ژمارەیان هەشت کەس بووە رەنگە ریگای راکردن هیندە ئەستەم نەبووبیت بەلام پیدەچیت ویستی خۆ تەسلیمکردنەوەیان لە دەربازبوون گەورەتر بوبیت لەدوای گیرانی خالە شەهاب و هاوریکانی لە ١٩٧٥/٩/٢٣لەیەکەم رۆژی سالی نویدا تەسلیم بە عیراق کرانەوە لە ١٩٧٦/١١/٢١لەناو گیراوەکانی کۆمەلەدا خالە شەهاب و جەعفەر و ئەنوەر لەسیدارە دران و ژمارەیەکی دیکەشیان بۆیان کرایە زیندان و دوای بەردران کەلەنیو ئەوانەدا ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەلەش هەبوو کەکۆمەلە دامەزرا نەوشیروان مستەفا لە ئەوروپابوو مام جەلالیش پاش بەیان نامەی ١١ئازار عیراقی بەجیهیشت دەبیت هەر

لەسەرەتاوە ئەو وینەیەمان لەبەرچاوبیت کە کۆمەڵەش بۆخۆی لە دووگروپی جیاواز پیك هاتبوو یەکەمیان نەوشیروان مستەفا و مەحمودی مەلا عیزەت وشازاد سائیب و محمد سابیر گروپی دووەم پیکهاتبوون لە شەهاب و فازلی مەلا محمود وفوئاد قەرەداغی گروپی یەکەم حەزیان بەوە کردووە کە مام جەلالیان لە گەل نەبیت بەلام گروپی دووەم حەزیان بەوە کردووە کەمام جەلالیان لەگەل بیت دواتر ئەو گروپیە بوونە سەرەکی کەمام جەلالیان لەگەلدابوو هەربۆیە فوئاد قەرەداغی رۆیشت و فازلی مەلا مەحمودیش دەچیتە حیزبی کۆمسیۆنی عیراقەوە نەوشیروان مستەفا لە یاداشتەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئارام لە گروپەکەی ئەواندا بووە

## ئارام وبەستنەوەی ئەلقە پچراوەکانی کۆمەلە

سالی ۱۹۷٦کۆمەلە بەباروددۆخیکی دژواردا تیپەری چونکە لەلایەك سەرکردەکانی لە زیندان بوون لەلایەکی دیکەشەوە سەرەداوی ریکخستنەکانیان ئاشکرابوو و ئەو سەرکردە مەیدانییانەش کەسەر کردایەتی کۆمەلە لە جیگەی خۆیان دایاننابوو لەوانە ئەرسەلان بایز بۆ هەولیر ئەبوو شەهاب بۆ سلیمانی ئازاد هەورامی بۆ کەرکوك جگە لە ئازاد هەورامی ئەوانی تر هەلاتبوون ئاراستەی کاری کۆمەلەیان نادیار تر کردبوو ئالەم باروودۆخەدا ئارام توانی ئەلقە پچراوەکانی کۆمەلە پیکەوە گریبداتەوە جاریکی دی هەیکەلی ریکخستنی کۆمەلە بنیات بنیتەوە جگە لەوەش کۆمەلە بەفیعلی سەرکردایەتی نەمابوو هەربۆیە لە کۆتاییەکانی سالی ۱۹۷۵ئارام راسپیردرا کە راپۆرتیك ئامادەبکات لەسەر رەوشی کۆمەلە ئەو راپۆرتە لە میژووی کۆمەلەدا بە(راپۆرتی شوبات)دەناسریت کە ئارام نەك هەر رەخنەی توند لە هەلەی هاوریکانی دەگریت(دەستەی دامەزرینەر)بەلکوو ریرەوی کۆمەلەش لە رووی فیکرییەوە لە ماویزمەوە بەرەو مارکسیزم دەگۆریت دەکریت ئەمەش بەسەرەتای جیاوازی نیوان مام جەلال کە بلاوکەرەوەی بیری ماویزم وئارام دابنریت کە جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە نمونەی ماویزم نمونەی مارکسیزمی راستەقینە نییە ئەمەش بەمانای ئەوەدیت کە ئارام هەر لە سەرەتای دەسەلات گرتنە دەستییەوە لەناو کۆمەلەدا کاری بۆ ئەوە کردووە کە کۆمەلە هەژموونی مام جەلال رزگار بکات بۆیە هەر لەیەکەم کۆبوونەوەی کادیرە ناوەندییەکانی کۆمەلەدا کە بە سەرپەرشتی ئارام بەریوە چووە سەرکردایەتییەکی نوی بۆ کۆمەلە دیاریکرا بەناوی(کۆمیتەی هەریمەکان)کە ئەمانەبوون سالار عەزیز بۆسلیمانی ئازاد هەورامی بۆ کەرکوك عەبدولرەزاق بۆ هەولیر و مەلا بەختیار بۆ خانەقین

لەو کۆبونەوەیەدا بەبی ئەوەی هەلبـژاردن هیچ کەسیك دیاریبکریـت بۆسـکرتیری کۆمەلـە هەموان کۆك بون لەسەرئەوەی کە ئارام کەسی یەکەمی کۆمەلـەبیت بەوپییـەی ئەنـدازیاری هەمووئەونەخــشانە بــوو کــە کۆمەلــەیان گەیانــدبووە ئەوقۆناغــە ئیــدی لــەو رۆژەوە هەمووشـتیکی کۆمەلـە بـووە ئـارام و بۆچـونەکانی ئـارام بـەناو ریکخـستنە نهینییـەکانی کۆمەلـەدا بلاوبووبـوەوە لەسـرودەکانی کۆمەلـەدا لەگـەل لینینـدا پیکـەوە ناویـان دەهـات قسەیەکی زۆرهەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئایـا سـەرکردەکانی کۆمەلـە لـە زینـدانـدا بـەم سـەر کردایە تییە نوییە رازی بون یان نا؟ لەمرۆوە زیاتر لە بۆچونیك هەیـە بـەلام نزیکترینیـان لە راستییەوە ئەوەیە کە ئەم سەرکردایەتییە نوییە پیش دەسگیرکردنیش لەگەل دەسـتەی دامەزرینەر کیشەی فیکری وتیروانینـی سیاسیان هـەبووە هـەروەها دواتـریش کـە ژمارەیـەك لە سەرکردە زیندانییەکانی کۆمەلـە ئـازاد دەبـن دەکەونـە ململانـی تونـدەوە لەگـەل گروپـە کەی ئارام کە دواتر بە(گروپی سجن ناسران )لە مانگی ۱۰سالی ۱۹۷٦ئارام چووە شاخ و شاری بەجیهیشت بەلام پیشتر چەند مەفرەزەیەکی کۆمەلە لە ناوچە جیاجیاکانی کوردوسـتان لـە دەرەوە بون ئەم مەفرەزانە لەلایـەن سالار عـەزیزەوە سەرپەرشـتی دەکـران و پـەیرەویکیان هەبوو بـەناوی پـەیرەوی(دەسـتە چـەکدارەکان کەلەلایـەن شـەهید ئـارام و سـالار عـەزیزەوە نوسرابوو

**بیئومیدبوون لە مام جەلال**

لـەماوەی سـالی ۱۹۷٦دا کۆمەلـە بەتـەواوی رەگـی داکوتـا تادەهـات ژمـارەی مـەفرەزەکان لـە دەرەوە زیاتردەبوون لەناو شاریش ریکخستنەکانی سەرەرای تۆکمەییان فراوانتر دەبوون بەم شیوەیە ئارام تـوانی کۆمەلـە لـەو قەیرانـە رزگـار بکـات کەبـە هـۆی ئاشـکرابونی ریکخـستنە نهینییەکانــەوە تیبگـەیتوو ئیـدی کۆمەلـەبوو بـەهیزیکی گـەورە هـەم حوکمـەت سـلی لی دەکــردەوە هــەم لەدەریــشەوە ناوبــانگی دەرکردبــوو لــەمانگی شەشــی ۱۹۷٦بریــاری هەلگیرسـاندنەوەی شـۆرش لەلایـەن مـام جـەلال ودەسـتەی دامەزرینـەری یەکیتییـەوە بـە هەماهەنگی لەگەل ریکخستنەکانی ناوەوە کەدەتوانریت بوتریت گرنگترینان کۆمەلـەبوو درا لەم ماوەیەدا مامخ جەلال نامەی بۆ سەرکردەکانی کۆمەلەو سەرکردەکانی تـری وەکـو عـەلی عەسکەری سەرۆك خیل و ئاغاو شیخ وکەسایە تییەکان دەنوسی ومژدەی هەلگیرساندنەوەی شۆرشی پیدەدان و داوای لیدەکردن بەشداری شۆرش بکەن ئارام کـە سـەرەتا دۆلی جافایـەتی و دواتریش قەرەداغی کردە شوینی سەرکردایەتی کۆمەلە لـە ریگـەی هەنـدیك سەرچـاوەی

خۆیەو بەشیك لە مانایەی بەدەست كەوت كەمام جەلال بۆ ئاغاو سەرۆك خیلەكانی نوسیبوو بەپی هەندیك كەسی نزیك ئارام لەو نامانە تیگەیشت كەمام جەلال ماركسی نییەو بیرو بۆ چونیشیان دەربارەی چۆنیتی شۆرش و ئیدارەكردنی زۆرلە یەكترییەوە جیاوازە ئەمەش سەرەتای بیئومیدبونی ئارام لە مام جەلال چونكە ئارام چاوی لە شۆرشیك بوو كە شۆرشگیرەكانی پشت ئەستور بن بە فیكرو باوەر بەلام تالەبانی چاوی لە خەلكی گشتی بوو بە جوتیاروو دەرەبەگ و شیخ ومەلا وە كە ئارام لەگەل ئەوەدانەبوو بەبروای ئارام ئەوەی دەیتوانی شۆرش بكات تەنها جوتیارو كریكار نەك ئاغاو سەروك خیلەكان بەشیكی تری نیگەرانییەكانی ئارام لەمام جەلال بانگكردنی بالی بزوتنەوە سۆسیالست و علی عەسكەری بوو بۆ ریزی یەكیتی كەلەنیو خیلەكاندا وبەبی بەرنامە خەلكیكی زۆری لە خۆی كۆكردبووەوە كاتیكیش مام جەلال لە ١٩٧٧/٧/٢٠گەرایەوە كوردوستان یەكەم پیكهەلپژان لەنیو مام و وەفدەكەی كۆمەلە رووی دا كە بۆ پیشوازی و بەخیر هاتنەوەی چووبوون ئارام تیگەیشتبوو لەوەی مام جەلال لەهەموو ئەو بەلین و نامانەی پیشوی پەشیمان بووەتەوە كە بۆ ئارامی نوسی بوو وتبوی(گەر كۆمەلە ماسی بیت ئەوا یەكیتی بۆی وەكو دەریایە)ئەوانەی كەلە ئارامەوە نزیك بوون ئاماژە بەوە دەكەن كە ئارام حەزی بەهاتنەوەی مام جەلال نەبووە بەلكو وتویەتی لەدەرەوە با نوینەری كورد بیت بەلام ئەگەر بیتەوە شۆرشەكەمان لی تیكدەدات

## ئارام و دردۆنگبون لە دۆستەكانی

دوای ئەوە لەبرادۆست هەندیك ناكۆكی دەكەویتە نیوان تالەبانی و چەند كادریكی دۆمەلەوە ئەندامیكی كۆمەلە نامەیەك بۆ شەهید ئارام دەنوسیت لە قەرەداغ و ئەوەی بۆ رون دەكاتەوە كەمام جەلال ریز لە كۆمەلە ناگریت و ئەگەر تۆش بییتە ئەوناچەیە ئیحترامت ناگریت هەرچەندە هەتا ئیستا بەتەواوی نەزانراوە كە بۆچی شەهید ئارام بەشداری یەكەم دانیشتنی سەركردایەتی یەكیتی نەكردووە لەوساتەوەختەدا ئەستیرەی هیچ كەسیك بەهیندەی ئارام درەوشاوە نەبوو هیچ گروپیكیش بەهیندەی كۆمەلە بەهیز نەبوو رەنگە بەشیكی ئەم نەچوونەی شەهید ئارام پەیوەندی بەوەوە هەبووبیت كەویستبیتی بەقورسای خۆی وبەپاراستنی ناسنامەی ریكخراوە كەیەوە كە كۆمەلە بەشداری ئەو ریكخراوە نوییەوەبكات كەپیی دەوتریت(یەكیتی نیشتیمانی كوردوستان)بەلگەش بۆ ئەمە ئەوەیە كە هەتاوەكو لەژیاندامابوو پاریزگاری لە

ریکخستنانەی کۆمەڵەکرد کە لەسەر وەختی ئاڵۆزترین روداوەکانی ئەورۆژگارەدا بناغەکەی دارشتبوو نەوشیروان مستەفاش لە کتیبی(خولانەوە لەناو بازنەدا)ئاماژە بۆ ئەوەدەکات کە هۆکاری نەچونی ئارام بۆ ئەو کۆبونەوەیە ئەونامەیەبووکە لەلایەن پیشمەرگەیەکی کۆمەڵەوە بۆ ئارام دەنوسریت تیایدا باس لەوە دەکریت کەمام جەلال ریزی ئەندامانی کۆمەڵە ناگریت نەوشیروان مستەفا ئەوەش دەڵیت(دواتر دەرکەوت ئەوکەسە پەیوەندی بەرژیمەوە هەبووە)هەرچەندە ئەو پیشمەرگەیە کەناوی(نەریمان)بوو دواتر لەلایەن سەرکردایەتییەوە بە تۆمەتی جاسوسی بریاری کوشتنی بۆ دەرچوو کوژرا لەگەڵ ئەوەشدا هەندیک سەرچاوەی ئاگاداری ناو کۆمەڵە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەو پیشمەرگەیە هیچ پەیوەندییەکی بە بەعسەوە نەبووە چونکە ئەگەر ئەوکەسی بەعسی بووایە ناوی ژمارەیەکی زۆر لەریکخستنەکانی کۆمەڵەی لەناو شار لەلابوو دەیتوانی هەموویان تەسلیم بکات بەبروای ئەو سەرچاوانە ئەوە تەنها تۆمەتیک بوو بۆ ئەو پیشمەرگەیان دروست کردبوو بۆ ئەوەی تۆڵەی ئەو نامە نوسینەی لیبکەنەوە کەکاتی خۆی بۆ ئارامی نوسیبوو بەهۆی ئەوەوە ئارام لە سەرکردایەتی یەکیتی دردۆنگ ببوو نەچووە لایان لەگەڵ ئەوەشدا پیدەچیت نوسینی ئەو نامەیە کاریگەری لەسەر هەبووبیت کە بەترسەوە مامەڵە لەگەڵ چوونی بۆ ناوچەی سەرکردایەتی بکات جگە لەو جیاوازییە فیکریە زۆرانەی کەلەگەڵ تالە بانیدا هەیبووئەم هەلویستەو چەندین هەلویستی تری لەمشیوەیە هیلکاری سەرکردەیەک دەکیشن ئامادەنییە کەمترین سازش لەسەر بیرو باوەری بکات

## پەیوەندی نیوان ئارام و عەلی عەسکەری

هیچ کات پەیوەنی نیوان ئارام و علی عەسکەری خۆش نەبوە لەسەر هەمووشتیک لەگەڵ یەکتری جیاوازبوون هەرلەبەر ئەوەشە چەند دین جار ناکۆکی توند بەنیوانیاندا چووە بەتایبەتی کە ئارام جەختی لەسەر پەروەردەی پیشمەرگەو دامەزراوی کەم وپوختی دەکردەوە بۆنمونە ئەگەر کەسیک بیویستایە بیتە ریزەکانی کۆمەڵەوە دەبوو کەفیلیکی هەبیت یان زۆرجار ئەنجامدانی چالاکییەک دەبوو پەساپۆرتی داخل بوونی ئەوکەسەی بۆسنوری کۆمەڵە بەلام علی عەسکەری بەخۆی و گۆچانەکەی دەستییەوە لەماوەی هەفتەیەکدا بەهیندەی ئەو خەڵکی لە خۆی کۆدەکردەوە ئارامیش ئەم زۆری و بۆرییەی پی خۆش نەبوو ئارام هەمیشە دەیوت شۆرش بەم خەلکانە ناکریت هەروەها تیروانینی

بزوتنـەوەی سۆسیالیـست بەرامبـەر قیادە موقەتـە تونـد نـەبوو علی عەسـکەریش لـە هـەر جیگەیەکدا قسەی دەکرد ئاماژەی بەوە دا کە ئەوانیش هاوخـەباتن بەپیـچەوانەی ئارامـەوە کـە هەلویـستی تونـدی بەرامبـەر قیـادە موەقـەت هـەبوو ئـەوەی لـەم نیوەنـدەدا جیگـای سەرسورمانە ئەوەیە پاشتر عەلی عەسکەری بە(چەکی مەزنی)ئەوان کوژرا کە ناکۆکی نیوان ئارام وعەلی عەسکەرییان قولتر کردەوە

## ئارام عیراقی بوویان کوردوستانی؟

هەرچەندە گفتوگۆی عیراقـچی و کوردوسـتانی لـەناو کۆمەلـەدا بـۆ دوای شـەهید ئـارام و سـەرەتای سـالانی هەشـتاو ململانـی بـالی ئـارام و بـالی سـجن دەگەریتـەوە بـەلام دەکریـت لـــەتیروانین و نوســـینەکانی شـــەهید ئارامـــەوە بەتایبـــەتی نوســـینەکانی رۆژنامـــەی هاوکاری(کەبەناوی سوارەو لە گۆشەی هەرهەفتەی باسیك بلاویدەکردنـەوە)و بـەیان نامـەی شوبات و رۆژنامـەی ئـالای شـۆرش سـەرەداوی کۆمـەلیك راسـتی بدۆزینـەوە ئەگـەر بـە نـاو نوسین و فیکری ئارامدا بگـەریین چـەندین وتـارو پـەرەگراف و دیـر دەدۆزینـەوە کـە بـۆنی عیراقـچی یـان کوردوسـتانی لیبیـت بـەلام چـەند راسـتییەك هـەن ئـەوە دەسـەلمینن ئـارام گەورەتر لە کوردوستان بیری کردۆتەوە لەوانە گۆرینی ریبازی کۆمەلە لەسالی ١٩٧٦لـە رووی فیکرییەوە لە(ماوی) یەوە بۆ(مارکسیزم) کە یەکەمیان جـەخت لەسـەر سیـستمی ئیشتراکی دەکاتەوە بەو جۆرەی لەگـەل هەلومـەرجی ئـەو ولاتـەدا دەگونجیـت و دووەمیـشیان جـەخت لەســەر ئــەوە دەکاتــەوە کــە سۆســیالیزم شۆرشــیکی حــەتمیی بــان نەتەوەییــە هــەروەها لەژمارەی(١)ی ئالای شۆرشدا کە ئەیلولی ١٩٧٥دەرچـوو ئـارام دەنوسیت(سـەبارەت بـەوەی کـە شۆرشـەکەمان بریتینییـە لەبزوتنەوەیـەکی نەتـەوەی تەسـکی گـەلی کـوردی بـەلکو شۆرشـی دیموکراتی گەلی عیراقە وەلە کوردوستانەوە بەهۆی تەقینەوەی ناکۆکییەکانەوە هەروەها لـە سایەی باش هەل کەوتنی خـاکی کوردوسـتان دەسـتیپیکردەوە بـۆ ئـەوەی بـە عەمـەلی ئەمـە جیبەجی بکریت پیویستە بەپیی ئەو واقیعە نەخشە بۆ مەسەلەی بەرەی یەککرتووی گـەل بشکینین

## ئارام سیاسییەکی بەهیزو عەسکەرییەکی لاواز

ئـارام سـەرکردەیەکی خـاکی بقـوو سیاسـییەکی بـەهیزوو دووربـین و عەسـکەرییەکی لاوازبوو هەلکەوتەی جەستەی وتوانای بینینی یارمەتیدەرنەبوو بۆ ئـەوەی پیـشمەرگەیەکی شەرکەربیت سەرەرای ئەوەش رایەریکی رۆحسوك و خۆشەویـست بـوو هەمیـشە تفـەنگیکی

لەشاندابوو بەبی ئەوەی بەباشچی بزانیت تەقەی پێ بکات بەلام هیچ کات ترس لە چاوانیدا نەبوو ئارام وەکو زۆربەی سەرکردەکانی تری بزوتنەوەی چەپ لەدنیادا کەسیکی سادەو ساکار بوو لەگەل ئەوەی کەسیکی نهینی پاریزوو کەم دووبوو بەلام ئەم سیفەتە وای لینەکردبوو بەقسە خۆش و نوکتەباز نەناسریت دەتوانریت بەیەکیك لە رادیکالترین سەرکردە کوردەکانی شۆرش دابنریت زۆر بە دەگمن تورە دەبوو وکەسایەتییەکی هیمنی هەبوو زۆرجار بە پیشمەرگەو کادیرەکانی کۆمەلەی دەوت شۆرش واتە خۆراگری

## شەهیدبونی ئارام

ئەو سەرەرای ئەوەی کەکەسی یەکەمی کۆمەلەبوو زۆرجار بە تەنیا یان لەگەل هاورییەکیدا بۆ گەران دەچوو ئەو هەمیشە لەکاتی تەنگانەدا بۆ شۆخی بەزمانی هەولیرییان دەوت(کاران لە پیاوان دەقەومیت)کە هاوریکانیشی لەمەترسی سەر چلییەکانی ئاگاداریان دەکردەوە بە خوین ساردییەوە دەیوت(گوی مەدەیە) هەرچۆنیك بیت شانازییە بۆ کۆمەلە کە سەرکردەکەی بەتاقی تەنها لە گوندیکی دورە دەست بەبی پاسەوان و گردی پاریزگاری لەنیوە رۆی ۱۹۷۹/۱/۳۱دا لە گوندی تەنگیسەری قەرەداغ لەروداویکدا کە لە دیمەنیکی فلیمیکی هۆلیوود دەچیت کاتیك تیشکی هەتاوەکە بەر تفەنگەکەی ئارام دەکەویت لەلایەن جاشەکانی قالە فەرەجەوە دەبینریت وسەرکردە ژیروو خۆشەویست و کەمیك ئینکارەکەی کۆمەلە شەهید دەکەن

## تاڵەبانی دووەم

### راپۆرتی شیکاری هیمن باقر

لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی رابـردوودا مـەلیك حەسـەینی شـای ئـوردن بـۆ چارەسـەری تەندروستی رەوانەی نەخۆشخانەی مایۆ کلیبیك کـرا بـەلام بـاری تەندروستی شـای ئـۆردن لەوە خراپ تربوو کە بتوانیت سوود لەوچارە سەرە تەندروستییە وەر بگریت

خەلیفە زاهید بن سـولتان پادشـای ئیمـاراتیش لـەکاتی نـەخۆش کەوتنیـدا لـەم نـەخۆش خانەیـەدا بـەردەوام بـەدوای چارەسـەردا دەگـەرا مـایۆ کلینیـك یـەکیك لـە گـەورەترین نەخۆشـخانەکانی دونیایـەو سـالی ١٨٨٣لەلایـەن دکتـۆر ولیـام جـەیمس مـایۆ دروسـتکراوە و دەکەویتە رۆجستیری مینو ستاو بەنەخۆشـخانەی سـەرۆکەکانی دونیـا دادەنریت بـۆ نمونـە هەریەك لە رۆنالد ریگان جۆن کەنـدی فـۆرد لـەناو سـەرۆکەکانی ئەمـەریکاو بەشـیکی زۆری سەرکردەی ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراسـت لـەکاتی نەخۆشـیدا سـەردانی ئـەم نەخۆشـخانەیان کـردووە ئیـوارەی رۆژی یـەك شـەمە ٢٠٠٧٥/٢١/تالـەبانی بـە فرۆکەیـەکی تایبـەت گەیـشتە نەخۆشخانەی بەناوبانگی مایۆ کلینك و بووە تازەترین میـوانی گرنگـی ئـەو نەخۆشـخانەیە تالەبانی کە لە ٢٠٠٧/٥/٢٠بەیاوەری وەفدیکی هاوری کە کۆسـرەت رەسـولی جیگـری سـەروکی هەریم و جیگری خۆی لەحیزبدا هاورییەتی دەکرد لە فرۆکە خانەی سلیمانی رایگەیاند کە گەشتەکەی بۆ ئەمەریکا دوورە لە هـەموو کـۆرو کۆبونـەوەیـەك بەلکوبۆدابەزانـدنی کـیش و وەرگرتنـی پـشووە بـە مەبەسـتی حەوانـەوە سەرچـاوەکانی یـەکیتی نیـشتیمانیش بـە رۆژنامەنوسـانیان راگەیانـد گەشـتەکەی تالـەبانی سیاسـی نییـەو سـی هەفتـە دەخایـەنیت وبریاریشە لەوماوەیەدا ١٥کیلۆ لە کیشی کەمبکات

### مایۆ کلینیك نەخۆشخانەی سەرۆکەکان

سەرچاوەیەك لەنەخۆشخانەی مـایۆ کلینـك بەسـایتی گـۆلـف نیـوزی ئەمـەریکی راگەیانـد تالە بانی بۆ پشکنینی ورد هاتووە و بریارە کۆمەلیك پشکنینی یەکلەدواییەکی بۆ بکریت

١٠رۆژ دوای گەیـشتنی تالـەبانی کـۆتـای بەسـەر جـەم پـشکنینەکانی هـات و قـسەکەری نەخۆشخانەی مایۆ کلینك رۆژی چوار شـەمە بـە رۆژنامـە نوسـانی راگەیانـد تالـەبانی هـیچ

نەخۆشییەکی نەماوە وکۆتای بەپشکنینەکانی هاتووە قسەکەرەکەی نەخۆشخانەی مایۆ کلینك هیچ ژمارەیەکی نەدا بەدابەزینی کیشی تالەبانی کەبریاربوو ١٥کیلۆ کەم بکات بەشی لاوازکردن یەکیکە لەبەشەسەرەکییەکانی نەخۆشخانەکەو چەندین ریگەی پیشکەوتوو بەکاردەهینن بۆ دابەزاندنی کیش هەرچەندە تالەبانی دوای ١٠رۆژ لەونبونی لە چاوی میدیاکان بەهەمان حالەتی جەستەیی جارانەوە کەوتە بەرچاو بەبی هەست کردن بەهیچ گۆرانکارییەك تیایدا سەرچاوە نزیکەکان لە تالەبانی ئاماژە بەوە دەکەن کە لەلایەن پزیشکەکانی بەشی لاوازکردنی نەخۆشخانەی مایۆکلینکەوە بەرنامەیەکی رجیمکردنی بۆ دانراوە بە ئەندازەیەك کەلەماوەی سالیکدا ٤٠کیلۆ کەم بکات وئەوسەرچاوانە ئاماژەشیان بەوەکرد کەتالەبانی پابەندە بەبەرنامەی رجیمکردنەکەوە تالەبانی بەر لەگەشتەکەی لە فرۆکەخانەی سلیمانی بە زەردەخەنەوە بە رۆژنامەنوسانی راگەیاند یکەباری تەندروستی جیگیرە بەلام ئازاد جوندیانی بەرپرسی مەکتەبی راگەیاندنی یەکیتی سەرەرای ئاماژە دان بە جیگیری باری تەندروستی تالەبانی ئەوەی نەشاردەوە کە بەم دواییانە تالەبانی لەبەغداد توشی ماندووبوون هاتووە ئاژانسی ئەسۆ شەیتدپیریس ئاماژەی بەوەدا کەلە دوا سەردانی تۆنیبلیر بۆ بەغداو کۆنگرەی رۆژنامەوانی لەگەل سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیرانی عیراق تالەبانی رەنگزەردوو نەخۆش هاتۆتە بەرچاوو هەروەها بە شیوەیەکی توندیش وەلامی رۆژنامەنوسانی یدایەوە هەلچونی پیەو دیاربوو. د.محمدقادر خۆشناو پزیشکی تایبەتی تالەبانی هاوسەفەری لەکاتی نەخۆشی جاری یەکەمدا ئاماژەی بەوەدا کەلەبەرئەوەی زیاتر لەمانگیکە تالەبانی نەبینیوە ناتوانیت لەوبارەیەوە قسەبکات تالەبانی لەتەمەنی ٧٤سالیدایەوبەناوبانگە بەوەی کەگرنگی زۆرۆ بەخواردن دەدات پەسەندترین خواردن بەلایەوە سەروپی وقەرەخەرمانە کەدووخواردنی تایبەتی کوردەواریانەیەو بەئەندازەیەکی زۆریش چەورن چەندسەرچاوەیەکی رۆژنامەوانی ئاماژە بەوەدەکەن کەبەم دواییانە خەلیلزادی بالیۆزی پیشوی ئەمەریکا لەعیراق و بالیۆزی تازەی ئەمەریکا لەنەتەوەیەکگرتووەکانی فیری سەروپی کردووە تالەبانی سەرەرای زۆربونی کیشی یسیاسییەکە ئەکتیف و چالاکە لەسەرئاستی جیهانی عیراقی بە دبلۆماتیکی گەورەی دونیا دادەنریت و بەبەردەوامی لەکۆرو کۆبوونەوەی بەردەوامیدایە بەبی گویدان بەماندووی لەمانگی شوباتی ئەمسالدا بەهۆی ماندووبونی زۆرەوە تالەبانی بەخیرای گەیەنرایە نەخۆشخانەی مەلیك حسەنی پزیشکی لەعەمانی پایتەختی ئوردن و دوای ١٧رۆژ

لەچاودێری وردی پزشیکی ئەنجامدانی قەستەرەی دل باری تەندروستی گەرایەوە حالەتی جێگیری و لەکەرنەڤالیکی جەماوەری گەورەدا لە هەزاران کەس لەپێشوازی بوون گەرایەوە سلێمانی هەرلەوپێشوازییە سۆز ئامێزەدا بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا لەبەرچاوی میدیاکاندا فرمێسک لە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە تالەبانی لەسەرئاستی عیراق بەجۆکەری سیاسی پێکەوەبەستنی نەیارەکان دادەنرێت لەمانگی نیسانی سالی ٢٠٠٥وەکویەکەم کورد بووە سەرۆك کۆماری عیراقی فیدرال و لە ٢٣نیسانی سالی ٢٠٠٦دا لەلایەن پەرلەمانی عیراقەوە بەسەرۆك کۆمار هەلبژێردرا بەپێچەوانەی لیدوانە فەرمییەکانەوە کەئاماژەیان بۆ ئەوە دەکردگەشتەکەی تالەبانی بۆ ئەمەریکا سیاسی نابێت ئێوارەی رۆژی ی٥/٣١ تالەبانی چاوی بە جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمەریکا کەوت دەرۆژ دوای ئەو دیدارە و بەرلەتەواوبونی کاتی راگەیەنراوی گەشتەکە کەتەنها ١٤رۆژی تێپەراندبوو لەکۆی ٢١رۆژ تالەبانی گەیشتەوە هەرێمی کوردوستان کۆبونەوەی چروپری مەکتەبی سیاسی یەکێتی وبەدوای ئەوەشدا کۆبونەوەی چری سەرکردایەتی کورد دەستی پێ کرد بەبروای چاودێرانی سیاسی هاتنەوەی تالەبانی وتێکچونی بەرنامەی گەشتەکەی ودانیشتنی چروپری سەرکردایەتی کورد پەیوەندی بەو دیدارەی نێوان تالەبانی وبۆشەوە هەیە رەنگە لەو کۆبونەوەیەدا لائاماژە بەپیلانێکی نوێی کۆشکی سپی کرابێت سەبارەت بەباروودۆخی عیراق کەکاریگەری هەیە بۆسەر هەرێمی کوردوستان لەوانە پرسی کەرکوك و مادەی ١٤٠ی دەستورکەبەپێ لیدوانی سەرچاوەیەکی تایبەت ئەمەریکا دوای دواخستنی قۆناغ بەقۆناغی مادەی ١٤٠ی کردووە بەجۆرێك هەرقۆناغەی سێ مانگ دەخایەنێت هەرچەندەتائێستا لیدوانی رەسمی سەرکردایەتی کورد سووربونی خۆی لەسەر جێبەجێکردنی ئەومادەیە دووپات ئەکاتەوە لەکاتی خۆیدا بەلام لەهەمان کاتدا لێکۆلینەوە لەقبولکردنی ئەوپێشنیارەدەکات کەلەلایەن حوکمەتی ئەمەریکی وحوکمەتی عیراقییەوە خراوەتە بەردەستی بەجۆرێك بە کەمترین زیان لێی دەربچێت و هەمووئاماژەکانیش بۆ ئەوە دەچن کە لە دواجاردا کورد بەناچاری بەدواخستنی کاتی ئەومادە دەستورییە رازیی دەبێت چونکە فشارێکی نێودەولەتی هەمەلایەنە لەسەری هەیە رەنگە پێشنیاری کورد لەدواجاردا رازیبون بێت بە درێژکردنەوەی ماوەی جێبە جێکردنە بۆ سێ مانگ یان زیاتر بەمەرجێك پرسی کەرکوك نەبرێتە نەتەوە یەکگرتووەکان وەك ئەوەی لە ئەجێندای خەلیلزاد دا ئاماژەی پێکراوە ژمارەیەك لە ئەندام پەرلەمانە کوردەکان لەئەنجومەنی نیشتیمانی عیراق لەگەل ئەو

رایـەدان کـەرازیبن بـە دریژکردنـەوەی مـاوەی دریژکردنـەوەی مـادەی ١٤٠بەمـەرجیك ناوچەکانی تری دەرەوەی کەرکوك لەوانە مەخمور وشیخان و خانـەقینی کـەناکۆکی لەسـەر نییە بگەرینرینەوە سەر هەریمی کوردوستان سەفارەکەی سـەرۆك کۆمـار هاوزەمانـە لەگـەل جموجۆلە فراوانەکەی قوباد تالەبانی نوینەری حوکمەتی هەریمی کوردوستان لـە ئەمـەریکا قوبـاد تەمـەنی ٢٩سـالە کـوری بـچوکی تالـە بانییـە خوینـدنی زانکـۆی لـە ئەمـەریکا تـەواو کردووە لەسالی ٢٠٠١-٢٠٠٣نوینەری یەکیتی بووە لە ئەمەریکا و دوای یەکگرتنـەوەی هـەردوو ئیدارەکەی هەریمی کوردوستان لە ٢٠٠٦/١٠/١٠بەشیوەیەکی فەرمی بۆتە نوینـەری حوکمـەتی هـەریمی کوردوسـتان لـەو ولاتـە کەباراگاکـەی دەکەویتـە واشـنتۆن نزیـك لـە کۆشـکی سـپی هەرچەند دوای راگەیاندنی قوباد تالەبانی بە نوینەری حوکمەتی هەریم لەلایەن وتەبیـژی حوکمەتی هەریمەوە هەمان رۆژ بالیۆز خانەی ئەمەریکا لەبەغداد ئاماژەی بـەوەدا کـەقوباد تالـەبانی هاولاتییـەکی ئاساییە خـاوەنی رەگەزنامـەی ئەمەریکییـە و حوکمـەتی ئەمـەریکا نوینەرایەتی دبلۆملتی تەنها لەگەل حوکمەتی بەغدا بەفـەرمی دەناسـیت سـەرەرای ئـەوەش چـالاکی و لیهـاتووی قوبـاد تالـەبانی بەهەمووئەوانـەی تیپەرانـد و لـەناودلی حوکمـەتی ئەمەریکاوە دەستی بە چالاکییەکانی کرد بەجۆریك ئیستا هیچ میدیایـەکی ئەمـەریکی سل لەوەناکاتەوەو کەقوباد تالەبانی وەك نوینـەری فـەرمی حوکمـەتی هـەریم بناسـینیت قوبـاد تالـەبانی کـەدەتوانریت بەتالـەبانی دووەم ناوببریـت هەنووکـە سـەرقالی دروسـتکردنی لۆبییەکی کوردییە لە ئەمەریکا بەمەبەستی دروستکردنی کاریگەری لەسەر بریاری سیاسـی لـە ئەمـەریکا هاوشـیوەی لۆبییـە گـەورەکانی دونیـا لەوانـە لـۆبیی جولەکـە(ئیبـاك) و٠(پەیمانگای جولەکە بۆکاروباری ئاسایشی نەتەوە

تالـەبانی دووەم کەپـشتگیری تـەواوەتی حوکمـەتی هـەریمی کوردوسـتانی هەیـە لەهـەولی ئەوەدایـە کـەبریاری سیاسـی ئەمـەریکا بـەجۆریك ئاراسـتە بکـات کـە لەگـەل خواسـت و داواکارییـەکانی کـورددا بگونجینیـت لـە رۆژ هـەلاتی ناوەرسـتدا بـە پیـی راپـۆرتیکی رۆژنامەوانی واشنتۆن پۆست لەهەنگاوی یەکەمی دروست کردنـی ئـەم لۆبییـەدا سـی ملیـۆن دۆلار تـەرخان کـراوە کەبـەبری ٤٠٠٠٠کوردی نیشتەجیی ئەمـەریکا بەشـداری بکـەن تییـدا لەئاسـت وپیـشەی جیـاوازدا کەبەبەشـیکی کارەکـەیان هەولدانـە بۆدروسـت کردنـی دۆسـت وهاوکار لەنیوکەسایەتی و ریکخراو گروپە گرنگەکانی ئەمەریکادا لەناو ئیدارەی ئەمـەریکی و کۆنگریس و زانکۆو پەیمانگاکانی لیکۆلینەوەدا

هەروەها بەشیکی دیکەی کاری ئەم لۆبییە کوردییە بریتی دەبیت لە دروست کردنی کاریگەری رای گیشتی لە ریگەی بەکارهینانی میدیاکانی ئەمەریکاوە کە پەیامەکەی بریتییە لەوەی کەبەرای گشتی ئەمەریکا بلیت بەپیچەوانەی عیراقەوە سیاسەتی ئەمەریکی لەباکوری عیراق سەرکەوتنی بەدەست هیناوە لە دامەزراندنی هەریمیکی نمونەی شارستانی لەسەرتەرزی دیموکراتی ئەمەریکی ئەورویی لەناوچەکەدا هەرچەندە لەوانەیە راپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا ونەتەوە یەکگرتووەکان و ریکخراوی لیبوردنی نیودەولەتی لەسەر رەوشی مافەکانی مرۆڤ لە هەریمی کوردوستاندا لەم رووە وە قوباد تالەبانی ئیحراجبکەن

تالەبانی دووەم: بەپیچەوانەی باوکییەوەو لە سیاسەتدا پەیرەوی شیوازیك دەکات کەدەوتریت بەشیوازی ئەمەریکی بۆسیاسەت ناوبریت کە بەستنەوەی پەیوەندییەکانە بەبەرژەوەندی قوول و هاوبەشەوە بەتایبەتی بەرژەوەندی ئابووری ئەمەش تەرزیکی نوییە لەسیاسەتی کوردیدا بەتایبەتی کەپیشتر تالەبانی وبەرزانی کاریان لەسەر ئەوە دەکرد لەریگەی پیشاندانی مەزلومیەتی کوردەوە سەرنجی سیاسیەکانی ئەمەریکاو ئەوروپا بۆکیشەی کورد رابشکینن بەلام قوباد تالەبانی دەیەویت بەرژەوەندی ئابوری بخاتە بەردەستی ئەمەریکیەکان پەیوەندی کوردی ئەمەریکی بارگاوی بەکۆمەلیك بەرژەوەندی ئابووری ستراتیژی بکات تاوەکو پەیوەندییەکان توندتروو قولتربکات ئەگەر مانەوەشی زیاتر بکات بۆ نمونە هانی کۆمپانیا گەورەکانی ئەمەریکا دەدات بۆ بەشداری کردن سەرمایەی گوزاریی نەوتدا لە هەریمی کوردوستاندا هەروەها هاتنی گروپەکانی فشاری ئەمەریکا دەدات بۆ دۆزینەوەی بەرژەوەندییەکانیان لەکوردوستاندا لەم سەروبەندەدا گروپی(باربو جریفس ئاند روجەروز) پشتیوانی لەو داوایەی کورد دەکات بۆ گیرانەوەی بری ١,٤٠٠,٠٠٠دولار لەبەشە داهاتی نەوت بەرامبەر بە خۆراك بۆ هەریمی کوردوستان بۆ ئەوەی لە ریگەی کۆمپانیاکانی ئاوەدان کردنەوەی ئەمەریکاوە لە کوردوستاندا خەرجبکریت ئەم بریارە پارەیە هەتا ئیستا لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەستی بەسەردا گیراوە هەروەها هانی کۆمپانیاکانی ئەمەریکا دەدات کە لە بوژاندنەوەی کەرتی گەشتیاری لە هەریمی کوردوستاندا بەشداری بکەن ئەمە جگە لە دروست کردنی زانکۆی ئەمەریکی کەبریارە سالی داهاتوو لە هەریمی کوردوستان بکریتەوە سەرەرای ئەوەیکەتوانی هیلی(نەمسا - کوردوستان)بخاتەکار کەدەستکەوتیکی سیاسی وئابووری بوو بۆ هەریمی

کوردوستان دبلۆماسیەتی تالەبانی دووەم لەسەر ئەو بنەمایە کار دەکات کە بەرژەوەندی بخاتە بەردەم ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ پاریزگاری و دەست بەردارنەبوون لە هەریمی کوردوستان هەر لەم سەرو بەندەشدا قوبات تالەبانی رایگەیاند کە کورد پیشوازی لە دامەزراندنی بنکەیەکی سەربازی هەمیشەی ئەمەریکی دەکات لە هەریمی کوردوستاندا

هاوسەرەکەی قوباد جوولەکەیە ناوی شیری گراهام ەولەبنەرەتدا ئیتالییە رەگەزنامەی ئەمەریکی هەیەو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کاردەکات پیدەچیت هاوکاریکی گرنگی قوباد بیت لە کارە نوییەکەیدا ئەمەش هۆکارە بۆئەوەی لەگەل کەمی تەمەنیدا وەك دبلۆماتیکی گرنگ لەناوەندی سیاسی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دەربکەویت بە هۆی پەیوەندی فراوان و توندوتۆلی لەگەل کەسایەتی و ریکخراو سەنتەروو کۆمپانیا گەورەکانی ئەمەریکاداو لە هەولی کۆکردنەوی زۆرترین لەبەرپرسان و بازرگانەکانی ئەمەریکایە بۆ ریزی ئەندامیتی لۆبی کوردی

هەر چەندە تالەبانی دووەم بە داکۆکیکەری بەهیزی سیاسەتی بۆش دەناسریت لە ئەمەریکادا بەلام پەیوەندی فراوانی هەیە لەگەل کاندیدو سیناتۆرە کۆماری و دیموکراتەکاندا و بەم دواییانەش لەگەل چوار لەوانەدا کۆبۆتەوە لەوانە هیلاری کلینتۆن کاندیدی دیموکراتەکان بۆ سەرۆکایەتی ئەمەریکا لاو سیناتۆری کۆماری ماك کین و سام بروبناك و سیناتۆری دیموکراتی جۆزیف بایدن بەپی زانبارییەکان ئەو مەلەفەی کە لۆبی کوردی جەختی لەسەر دەکات مەلەفی هەریمی کوردوستانە بە ئامانجی بواردانی حوکمەتی هەریم بە جوولەی دبلۆماتی زیاتروو پەیرەوکردن لە نیمچە سەربە خۆیەك لەگەل مامەلەکردن لەگەل هەریمی کوردوستاندا لاهەروەها لەسەر ئاستی عیراقیش جەخت لەسەر عیراقی فیدرالی دیموکرات دەکات کە تیایدا پیگەی حوکمەتی هەریم پاریزراوبیت وەك هەریمیکی فیدرالی نیمچە سەربەخۆ هەروەك جەخت لەسەر پیویستی مانەوەی هیزەکانی ئەمەریکا دەکات لەعیراق بەمەبەستی تەواوکردنی ئەو ئەرکەی کە پیی هاتوون راپۆرتەکەی واشنتۆن پۆست ئاماژە بەوەدەکات هەرچەندە قوباد بۆخۆی سەرۆکایەتی ئەو لۆبییە نوییەدەکات بەناوی لۆبیی کوردی بەلام ىلەم کارەدا لیکۆلەرەوەی یاسای لە بالیوزخانەی ئیسرائیلی لە واشنتۆن سەرپەرشتی هەندیك کارەکانی دەکات بەتایبەتی بەدواداچونی کارەکانی ئەم لۆبییە لەناو حوکمەت و ئیرادەی ئەمەریکیدا .

# ئایا مەلا بەختیار یارییەکە دەباتەوە؟

هیمداد حەمیدی

دەربارەی ئەوپیشنیارەی مەلا بەختیار بۆ رووبەرووبونەوەی لەگەل نەوشیروان مستەفادا لەسەر شاشەی تەلە فیزیۆن دوای ئەوەی نەوشیروان لەزنجیرە وتاریکدا رەخنەی لە ئەدای سیاسی حیزب وحوکمەت نادادی کۆمەلایەتی گرت ئاوات شیخ جەناب بە(لڤین) ی وت(پیشنیارەکەی کاك بەختیار بەشارستانی نازانم بەتایبەتی دەستپیکی وتارەکەی لام سەیربوو پیشنیاری وابکات ئەگەر لە رۆژنامەی(چاودیر) دا نەمبینییایە دەموت کاری ئەو نییە بەکارهینانی(کاك بەریز جەناب)ئیمتیازەکەی ئەوەندەی بۆ بەکار هینەرەکەیەتی ئەوەندە بەکار هینراو نییە تالی دووربگریتەوە لەو وتارەدا کە بەناونیشانی(نەوشیروان مستەفا با رووبەرووقسە بکەین)لە رۆژنامەی چاودیریدا بلاوی کردەوە مەلابەختیار ئاماژەی بەوە دا کە لەوکاتەوەی بۆ یەکەم جار نەوشیروان مستەفای بینیبووە هەمیشە(کاك بەریز جەناب)ی لەگەل ناوەکەیدا بەکار هیناوە بەلام لەبەرئەوەی ئەو لیرەو لەوی بە(زەڤی ورەڤی)ناوی خۆی و هەڤالەکانی دەهینیت بۆیە ئیتر ئەویش بەو زمانە لە گەلیدا دەدویت بەلام سەرەتایترین زانیارییەکانی ناو ریکخستنی حیزبی ئەوە پیشان دەدەن کەئەم وشانە خۆی لە بنەرەتدا لادانە لە ئەدەبیات و بەشیکە لەکلتوری کۆمەلایەتی بەتایبەتی بۆ حیزبیکی سۆسیال دیموکرات بەکارهینانیان جیگەی نەنگییە چەند مانگی رابردوو بۆ یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان کاتیکی پر لە هەلویستی ناکاوو دەنگهەلبرین بوو چونکە زۆریك لە کارەکتەرە سەرەکییەکانی یەکیتی بیدەنگییان شکاندوو لەبارەی کیشە ناو خۆییەکانی یەکیتییەوە بۆچوونی خۆیان خست روو دیارترینیشیان مەلا بەختیار بوو

خانەڤینییەکی بی پشت وپەنا

مەلا بەختیار کارگیری مەکتەبی سیاسی یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان و وتە بیژی مەکتەبی سیاسی وبەرپرسی مەکتەبی ریکخراوە دیموکراتییەکان و سەرپەرشتیاری مەکتەبی پەیوەندییەکانی دەرەوەی یەکیتی و سەرۆکی لیژنەی ئۆلۆمپی کوردوستان و خاوەنی ئیمتیازوو بەریوبەری بەرپرسی رۆژنامەی(چاودیر)و سەرپەرشتیاری گشتی

فیستیڤالی گەلاویژە کە سالانە بنکەی ئەدەبی و رووناکبیری گەلاویژ سازیدەکات ئیستالەهەمووکات زیاتر لە هەولی قۆرخکردن و دەسەلاتسالاریدایە لەناو یەکیتیدا

مەلا بەختیار ناوی تەواوی(حیکمەت محمد کەریم)ە لە ١٩٥٤/٨/٢٠لەشاری خانەقین لە دایك بووە سالی ١٩٧٠چۆتە ریکخستنەکانی(کۆمەلە ی مارکسیی لینینی کوردوستانەوە)لەسالی ١٩٧٤دا بەشداری شۆرشی ئەیلولی کردووە دوای هەرەس هینانی شۆرشی ئەیلوول دوو بۆ چونی جیاواز لە مەر(بەرەنگاریکردن)و(بەرەنگاری نەکردن)لەنیو ریکخستنەکانی کۆمەلە سەری هەلدا لەگەل گەرانەوەی ریکخستنەکانی کۆمەلەشدا بۆناو شارەکان دوای دەستگیرکردنی ئەندامان و سەرکردەکانی کۆمەلە لەریگەی ئەو سەرەداوانەوە کە لەگرتنی ئەنوەر زۆراب و دەستبەسەراگرتنی نهینیەکانی کۆمەلەوە دەست رژیم کەوتن ئەم ریکخراوە رووبەرووی تەنگژیەکی گەورە بووەوە جگەلەوەی هەلاتنی سەرکردە مەیدانییەکانی کۆمەلە کە سەرکردایەتی کۆمەلە داینابوو لەوانە ئەرسەلان بایز بۆ هەولیر ئەبووشەهاب بۆ سلیمانی دۆخی کۆمەلەیان بردە قۆناغیکی پر کیشەوە لەلایەکی تریشەوە دەستگیرکردنی سەرکردەکانی ئاسۆی کاری کۆمەلەیان نادیارتر کردبوو

### کۆمەلەو هەلگیرسانەوەی شۆرش

ئالەوکاتەدا لابیرۆکەی دروست کردنی کۆمیتەی هەریمەکان هاتەکایەوە سەرچاوەبەکی نزیك لە مەلا بەختیارەوە جەختی لەوە دەکردەوە کە مەلا بەختیار خۆی بە خاوەنی ئەم بیرۆکەیە دەزانیت مەلا بەختیار لەو نوسینەیدا کەبۆ سالیادی شەهید ئارام ی نوسیوە لەبارەی سەرەتاکانی دروست بونی کۆمیتەکەوە دەلیت(( لەگەل سالار عەزیز تەکبیرمان کرد ریکخستن دروست بکینەوە)) من سەفەری کەرکوکم کرد بۆ لای ئازاد هەورامی پیکەوە چووین بۆ هەولیر بۆلای عەبدولرەزاق ژوانگەی کۆبونەوەمان لە سلیمانی دانا بۆ ئەم کارانەش وارام یەکیك بوو لەوانەی بەهۆی توانای فیکری وسیاسی ریکخراوەییەوە شانی دایە بەر راپەراندنی ئەرکەکان )) دواتر ئەم گروپە دەسەلاتی بالای کۆمەلەی بەدەستەوە گرت و ریبەرایەتی کۆمەلەو هیزە چەکدارەکانیان کرد بەکردەوە

لەوکۆمیتەیەدا هەریەك لە عەبدولرەزاق(هەریمی هەولیر) ئازاد هەورامی ٠هەریمی کەرکووك سالار عەزیز(هریمی سلیمانی )مەلا بەختیار(هەریمی بەغداو خانەقین)بەبقەرپرسی کۆمیتەکان دیاری کران و(ئارامیش وەکو لیوەشاوترین هاوریی کۆمەلە دوای رۆشتنی سەرکردایەتی کۆمەلە بانگ کرا)) بەم شیوەیەش ئارام بووبە

لیپرسراوی کۆمیتەی هەریمەکان کاری کۆمیتەی هەریمەکان کۆکردنەوی ئەو ئەندامانەبوو کەخۆیان شاردبووەوە ئاشکرا نەبووبون پەیوەندییشیان لەگەڵیاندا دروست کرد جگە لەوەی پەیوەندیان بە چەند ئەفسەروو پیشمەرگەیەکەوە کردوو داوای چوونە شاخیان لیکردن پەیوەندی کردن لەگەڵ دەستەی دامەزرینەری یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان کاریکی تری ئەم کۆمیتەیەبوو سالی ١٩٧٦رەگەکانی ریکخستنەکانی کۆمەلە بەتەواوی بەکوردوستاندا شۆربوبونەوە لەرووی چۆنیەتی بەرەو تۆکمەبوون لەرووی چەندایەتیشەوە بەرەوفراوان بوون دەچوون دوای ئەوەی دەستەی دامەزرینەری یەکیتی بەکۆمەکی ریکخستنەکانی ناوەوە((کەکومەلە ریکخراوترینیان بوو )) بریاری لاهەلگیرساندنی شۆرش دەدات ئەندنمان و لایەن گرانی کۆمەلە ئامادە باش دەکرین بەلام لەگەڵ رگەرانەوەی دەستەی دامەزرینەردا هەر زوو جیاوازییەکانی نیوان مام جەلال و ئارام وردە وردە دەرکەوتن بەوەی ئارام بۆی دەرکەوتبوو کەمام جەلال بروای بە خەلکی گشتییە بۆسەرکوتنی شۆرش هەرچی ئارام پیوابوو تەنها جوتیارو کریکاران دەتوانن سەرپیخەرانی شۆرش بن

**کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەلە سەرەتاکانی دەرکەوتنی ململانیی نەوشیروان و مەلا بەختیار**

دوای شەهیدبوونی ئارام ململانیی هیلە جیاوازەکانی کۆمەلە تا دەهات تۆخ تر دەبووەوە تالە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەلەدا لەسالی ١٩٨١خرانە سەر سفرەی گفتوگۆ لەو کۆنفرانسەدا گروپی نەوشیروان و گروپی زیندان((فەرەیدون عەبدولقادروهاوریکانی )) جەختیان لەسەر کوردوستان بونی کۆمەلە دەکردەوە لایەنگری قرتاندنی پاشگری عیراق بوون بەلام بەشیك لەوگروپەی خۆیان بە میرات گری کۆمیتەی هەریمەکان و فیکری ئارام دەزانی(مەلا بەختیارو سالار عەزیزوو جەعفەر)جەختیان لەسەر قولکردنەوەی فیکری مارکسیزم پاراستنی سەربەخۆی کۆمەلەو نەتواندنەوەی لەبۆتەی یەکیتیدا و دریژە پیدانی سەر خەتە فیکری سیاسیەکەی ریبازی ئارام دەزانی پییان وابوو بازنەی پەیوەندییەکانی کۆمەلە لەکایەی بزوتنەوەی نیشتیمانیدا دەبیت سنوری یەکیتی ببەزینیت و واوە تر بکشیت بەپی گیرانەوەی پشکۆ نەجمەدین لە کۆنفرانسدا ٠٠ دیلکردنی نەوشیروان مستەفا لەلایەن هیزەکانی سۆسیالیستەوە یەکیك بوو لە کیشە سەختەکان و لەبەرگری ناکۆکییە شەخسییەکاندا نیشان دەدرا کورتییەکەی سالار و مەلا بەختیار لەو سەروبەندەدا لیپرسراویەتی هیزەکانی یەکیتییان لە شارباژیردا بەدەستەوەبوو بەجۆریك مامەلەیان لەتەك کیشەو رووداوەکاندا کردووە کەبەرەو لەناوبردن ئیعدام کردنی نەوشیروان سەر

بکیشیت پیدەچیت ئەو دوورترین و یەکەمین رووبەرووبونەوەی راستەوخۆی نەوشیروان مستەفاو مەلا بەختیار بیت

پشکۆ هەرلەکتیبی(ئەزموون وياد )) ئەوەش دەلیت((ئازاد بوون و هاتنە شاخی گروپی زیندان بەکۆمەل بەجۆریك مەترسی لەسەردەسەلاتی ئەوان دروستکردبوو کەناس نامەی فیکری ئارامیان لە گیرفاندابوو ئەمانیش بەپی سەرەتاکانی گەمەی دەسەلات سەرسەختانە خەباتیان دەکردو داکۆکییان لە ریبازوو بۆچون و پیگەی خۆیان دەکرد مەلا بەختیاریش ئەوکات لەژیر کاری گەری ئارامدابوو پیان وابوو کۆمەلە دەبیت عیراقی بیت کەدواتر لە کۆنفرانسەکانی کۆمەلەدا درزی جیاوازی بۆ چوونەکانیان گەورەتر دەبیت بەتایبەت کە دوای ئەوەی نەوشیروان مستەفا بوو بە سکرتیری کۆمەلە وەکو دەوتریت بروای بە چەك و داس نەبووە نەوشیروان خۆشی ئاماژە بەوەدەکات کەتوشی((خیبە الامل )) ببوولییان نەوشیروان لە کتیبی((لەکەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ )) دا ئەم بۆ چونانەی بە ئاشکرای دەربریوە

## ئالای شۆرش و دابران لە یەکیتی

بەهۆی ئەو دابەش بوونە فیکری یەی لەگەل دەرکەوتنی ئارامدا جەستەی کۆمەلەی تەنی جیاوازییەکان ئاراستەی شەخسی وململانی توندیان وەرگرت مەلابەختیارو سالار و جەعفەر لەژیر کاریگەری بیری شیوعییەتدا دوای هاوخەباتیان لەنیوان گەلانی عیراقدا دەکرد ئەم گروپە خۆیان بەجینشینی ئارام دەزانی بەلام گروپی نەوشیروان و زیندان لەژیر کاریگەری بیری نا سیۆنالیزمی کوردیدا بوون لەبەرئەوەی نەوشیروان مستەفا کەسی یەکەمی کۆمەلە بوو تا دەهات گروپەکەی ترسی جیگەنەوەبوونیان لەناو کۆمەلەدا تیا دروستبوو لیرەوە وردە وردە ریکخستنیك لەناوکۆمەلەدا دەرکەوت کە بە ئالای شۆرش ناسران و مەلا بەختیاریش وەکو سەرپەرشتیاری ئەم ریکخستنە دەرکەوت ئەوکات سالار عەزیز مامۆستا جەعفەر لە سەرکردایەتی کۆمەلە نەمابوون بەلام لە دامەزرینەرانی ئالای شۆرش بوون دواتر ئەم رەوتە نوییە کۆبونەوەیەکی ١٢کەسی دەکەن دیار ترینی بەشدارانی ئەم کۆبوونەوەیە مەلا بەختیار ئاسۆ عەلی رووناك شیخ جەناب پشکۆ نەجمەدین عیماد ئەحمەدوو شیخ علی بوون هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی مەلا بەختیار بکەن بەنوینەری خۆیان بۆ کۆبونەوە لە گەل مام جەلال و نەوشیروان مستەفاو فەرەیدوون عەبدولقادر نوینەری ئەم ریکخراوە نوییە((مەلا بەختیار )) ئەوەیان پیرادەگەیەنیت لە کۆمە لە

جیابونەتەوە بەلام لە چوارچیوەی یەکیتیدا دریژە بەکاری حیزبایەتی دەدەن بە پیی زانیارییەکانی((لڤین )) مام جەلال هەر لەویدا رەزامەندی نیشان دەدات و بەلینی هەموو جۆرە هاوکارییەکیان پیدەدا بەلام لە هەلویستیکی تەمومژاوی و پرئالۆزیدا تالەبانی بریاری گرتنی مەلا بەختیاروو سەرکردەکانی تری ئالای شۆرش دەدات هەرچەندە دەوتریت هاوکاری ئەم بریارەی مام جەلال ئەوە بووە مەلا بەختیار پەیوەندی ژیربەژیری لەگەل پارتیدا هەبووە و هەولی دروستکردنی حیزبی داوە بەلام تائیستا بەلگەی سەلماندنی ئەم بۆچوونە نییە ئەوە بوو مەلا بەختیار دەستگیرکراو ماوەی ٣سال رلەزینداندا لە گوندی یاخسەمەر مایەوە لەوماوەیەدا جاریك هەولی راکردنی داو دواتر دەستگیرکرایەوە ئەوەش یەکیك لە شەوەکانی زستانی سالی ١٩٨٦دا روویدا کاتیك هەموو پیشمەرگەکان سەرقالی سەیرکردنی یاری ئۆلۆمپی بوون ئەوشەوە یاری لەبەرژەوەندی هەلبژاردەی ئینگلتەراو مەلا بەختیار بوو پیدەچیت هەر ئەوە خۆشەویستی یاری لەلای مەلا بەختیار زیاد کردبیت و ئیستاش هەرچی یاری ئۆلۆمپی کوردوستانە لەژیر نوکی قەلەمە سەوزەکەی ئەوەوە نەخشە ریژ دەکریت

### چوونە ناو زەحمەت کیشان پیچیك بۆ ناو یەکیتی

بۆ مەلا بەختیار دوای راپەرین هەروەکو سەردەمی شاخ قۆناخیکی پر هەلکشان و داکشانی ئەستیرەی سیاسەتی مەلا بەختیار دوای راپەرین دەسبەرداری ئەو ریکخراوە نابیت کەناوی(ئالای شۆرش )ە ئەم ریکخراوە لەمانگی ١٢ی ١٩٩٢لە کۆنفرانسی یەکەمدا مەلا بەختیار وەکو سکرتیری هەلبژاردوسەرکردایەتییەکی هەلبژیردراو ناوەکەشی بۆ کۆمەلەی سۆسیالیستی کوردوستان گۆرا بەلام هەرزوو ئەم ریکخراوە((بیئاسۆی سیاسی دیار نەبوونی هیلی سیاسی دیاریکراو نەبونی ئیمکانیاتی مادی )) پەلکیشی بەردەم باوەشی حیزبیکی تری دەکەن کە حیزبی زەحمەت کیشانی کوردوستانە

چاودیریکی سیاسی باسی لەوە کرد بردنی ریکخراوەکە و توتندنەوەی لەناو زەحمەت کیشاندا لەلایەن مەلا بەختیارەوە پیچیك بوو بۆ ئەوەی خۆی بچیتە ناو یەکیتییەوە بە هۆی ئەو دریژایەتی کردنە زۆرەی کەپشتر لەلایەن یەکیتییەوە بەرامبەری کرابوو کەسیکی ئاگا دار لەو رووداوانەش بە((لڤین )) ی ووت((مەلا بەختیار دەیوت بەهیچ شیوەیەك ناچمە ناو یە کیتیەوە )) لەو رووەوە جەختی لەوە دەکردەوە کەئەو((ئەخیر کەس )) دەبیت بۆ چوونە ناو یەکیتی بەلام مەلا بەختیار باش لەوە تیگەیشت بوو بۆ ئەوەی ببیت

بە کەسیکی کاریگەروو خاوەن پیگە دەبیت یەکیتی بیت ولەناو یەکیتیشدا دەبیت لە باڵەکەی تاڵەبانی بیت ئەو لەهەمووکەس زیاتر باجی ئەو جیابوونەوەیەی دا ئەو بەهۆی ئاڵای شۆرشەوە دەستی بە ئاگریدا چزا کە پیناچیت کە تا ماوە کاری وادووبارەبکاتەوە ئیستا مەلا بەختیار لە هەرئەندامیکی تری مەکتەبی سیاسی یەکیتی زیاتر بەباس کردنی ریفۆرم و چاکسازی تەنگەنەفەس دەبیت هەر ئەوەشە وا لەئاوات شیخ جەناب دەکات لە چاوپیکە وتنیکی پشووی((لڤین )) دا بلیت((کۆمەلەو یەکیتی لەلوتکەی خۆشەویستی جەماوەرو سەرکەوتندابوون ئیمە لەگەل کاك بەختیار رەخنەمان هەبوو کەچی ئیستا بەپیچەوانەیەو ئەستەمەخەلك باسی ئەوشتانە بکات

## تاڵەبانی، مەلابەختیارو ئەرسەلان بایز بیدەنگ دەکات

بەلای مام جەلالەوە چوونە دەرەوەی ئەم جارەی نەوشیروان مستەفا لە یەکیتی جیاوازییەکی زۆر نەبوو بایەخیکی ئەو تۆشی پینەدا بولام تاڵەبانی ئیستا دەزانی هاتنەدەرەوەی ئەمجارەی نەوشیروان تەنها((تۆران )) نەبووە چونکە لەگەل چوونە دەرەوەیدا کۆمپانیایەکی راگەیاندنی دامەزراندوو ئەمجارەیان لەبری بیدەنگی بەوتارە رەخنەییەکانی لەبارەی حیزبوو گۆران و چاکسازی و نادادی کۆمەلایەتییەوە یەکیتی توشی ئەو لەرزە توند کردووە کەلەناو جەستەی یەکیتی دادەگریت جگە لەوەی هاتنە دەرەوەکەشی نەك کۆتای بەباڵی ریفۆرم نەهینا بەلکو گروپی تریشی لە یەکیتی جیاکردەوە هەنوکە باڵی ریفۆرم لە بوژانەوەدایە بەپیی زانیارییەکانیش تاڵەبانی داوای لە ریفۆرمەکانی مەکتەبی سیاسی کردووە زانیارییەکانی مەکتەبی سیاسی نەبەنە دەرەوە بەلینی هاوکاری کردنیشی پیدان لە بەرامبەردا عمری سەید علی و ریفۆرمەکانی تر داوای بەستنی کۆنگرەو کۆتایهینان بە هەیمەنەی مەلا بەختیاریان لەتاڵەبانی کردووە

هەربەپی زانیارییەکانی((لڤین )) ئیستا تاڵەبانی((ریوییەکەی خۆرهەلاتی ناوەراست )) بۆ پاك کردنەوەی یەکیتی لە قوراوی باڵەکانی بەدوای کونە دەرزیی چارەسەردا دەگەریت هەر بۆ ئەم مەبەستەش مەلا بەختیاری لەوەلامدانەوەی نەوشیروان مستەفاو باڵی ریفۆرم وەستاندووە ئەرسەلان بایزیشی لەکار راگرتووە کە ئیشکردنە لەسەر ریکخستنەکان بۆ وەدەرنانی ریفۆرمییەکان کاردانەوەی ئەم دۆخە ئیستا بەسەر ئەندمان و بەرپرسانی هەردوو باڵەکەوە دەبینریت بەجۆریك هەردوولایان خۆیان دوورە پەریز گرتووە لەسەر قسەکردن لەسەر یەکتری

## بەرهەم سالح و مەلا بەختیار و بالی ریفۆرم

ئەگەرچی بەرهەم سالح و مەلا بەختیار هەردەکیان لەسەربالی تالەبانی حیساب دەکرین بەلام سیاسەت و چونیەتی مامەلە کردنیان لەبەرامبەر بالی ریفۆرم و خودی نەشیروان مستەفادا تەواو لەیەکەوە دوورە بەرهەم سالح تا ئیستا هیچ لیدوانیکی زبری بەرامبەر بالی ریفۆرم ونەوشیروان مستەفا نەداوە وکاریکی نەکردوە بەرپرسانی ئەم بالە دلگران بکات جگە لەوەی هەلەکانیشی بۆ هیور کردنەوەی بار گرژییەکانی نیوان هەردووبالەکە بەردەوامە هەرچی مەلا بەختیار بەپیچەوانەوە رەفتاری کردوە لیدوانی داوە شیوازی مامەلەکردنی بەرهەم سالح بەم شیوەیە بۆ ئەوە دەگەریتەوە کە دەزانیت تەمەنی تالەبانی ئەونەی بەبەرەوە نەماوە و بۆدوای تالەبانیش هەرگیز پۆستی سکرتیری بەو رەوانابینریت چونکە ئەو جگە لەوەی پەسەند کراوی زۆریك لە مەکتەب ساسی و سەرکردایەتی نییە لەگەل ئەوەشدا ئیستا خانەوادەی تالەبانی خۆشیان لی نایەت لەم رووەشەوە چەند جاریك بەمام جەلالی وتووە دیاری نەکردنی جیگرەوە و دووجیگری یەکیتی بەرەو پارچە پارچەبوون دەبات بەلام مەلا بەختیار لەکەشیکی تری سیاسیدایەو دلنیایە لەوەی کە ئەگەر نەوشیروان بگەریتەوە مائاوای پیدەکریت لە یەکیتی

کۆتای یارییەکە چاودیرانی سیاسی پییان وایە گەمە سیاسیەکانی مەلابەختیار لەم سی ئەنجامە بەدەرنییە

لیپرسراوی دەستەی کار گیری مەکتەبی سیاسی

ئەمەش لەکاتیکدا دەبیت ئەگەر هاتوو کۆنگرەی داهاتوی یەکیتی کۆنگرەی پاکسازی بیت لە ئەندامان و لایەن گرانی بالی ریفۆرم کەبە هەلکردنی گلۆپی سەوز لەلایەن مامەوە دەکریت ئەوکاتە بیئومید دەبیت لە گەرانەوەی نەوشیروان مستەفا ئەم ئەگەرە کاتیك لە واقیع دەچەسپیت کە. دفوئاد مەعسوم بەلینەکەی جیبەجی بکات بۆ وازهینان لە مەکتەبی سیاسی لە کۆنگرەی داهاتووداو. د.کەمال فوئادیش ـ ئیستانەخۆشەو یاریزانیکی موسابی گۆرەپانەکەیەو دەستە بەرداری پۆستی لیپرسراوی دەستەی کارگیری مەکتەبی سیاسی بیت چاودیری سیاسی ئەوەی روون کردەوە لە حالەتیکی وادا مەلا بە ختیار هەژموونی بەسەر یەکیتییەوە کەم دەبیتەوە((چونکە مەلا بەختیار زیاتر هەولی پۆستی داوەو کاری لەسەر تەکەتولیکی تایبەت بەخۆی نەکردووە )) ئەوچاودیرە سیاسییە دەیوت((هیزی مەلابەختیار لەمەکتەبی ریکخراوەکاندایە کە(٢٠٠٠٠) ئەندامی هەیە )) چاودیریکی تری

سیاسی جەختی لەوە دەکردەوە کەبە((دارنینی لە پۆستی مەکتەبی ریکخراوەکان مەلا بەختیار دەچیتە میژووەو

خەونە دیرینەکانی مەلا بەختیار((سکرتیری ))

ئەمەش لەکاتیکدا دەبیت کەنەوشیروان مستەفا نەگەریتەوە کۆسرەت رەسولیش بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە دەستبەرداری یەکیتی ببیت بەوپییەش ئەم بالە لەدوای کۆسرەتەوە کەسیکی تر نییە جیگەکەی کۆسرەت رەسولی پیپربکاتەوە کەسیکیشی نییە بۆ جیگەکەی تالەبانی چانسی مەلا بەختیار خراپی نەهیناوە لەوەدا بەبەراورد بە بەرهەم سالح لەبەر دل شیرین ترە لەنیوو خانەوادەی تالەبانیدا ئەمەش رەنگە هۆکارەکەی پەیوەندی بەو زەواجەوە هەبیت کەلەنیوان خانەوادەی تالەبانی و خانەوادەی مەلا بەختیاردا هەیە بەتایبەتی ئەگەروەکو نوینەری بنەمالە قبولبکریت لەمبارەیەوە چاودیریکی سیاسی وتی((دورنییە هەمووبالەکانی ناو یەکیتی قبولی بکەن وبۆماوەیەکی کاتی بکریت بە سکرتیر تا ئەوکاتەی بەتەواوی قوباد ئامادە دەبیت نمونەی ئەم جۆرە دەستبەسەراگرتنانەش لەمیژوودا زۆرن

**سکرتیری سەری دەخوات**

مام جەلال هەمیشە کار لەسەر راگرتنی بالانسی کارەکتەرەکانی ناو حیزبەکەی دەکاتتابەئاسانی بتوانیت بیانجولینیت و ئاراستەیان بکات تالەبانی لەم رووە وە بە ئەزموونیکی سەرنجراکیشەوە گەمە دەکات هەولە سەرکەوتووەکانی لە قووت کردنەوەی جەبار فەرمان و کۆسرەت رەسوول لەبەرامبەر نەوشیروان مستەفادا لەدوای کۆنگرەی یەکەمەوە وهینانەوەی فەرەیدوون عەبدولقادر وملازم عمریش بۆ ناو موکتەبی سیاسی بۆ کەم کردنەوەی دەسەلاتی جەبار فەرمان وکۆسرەت رەسول هەر بۆ ئەو مەبەستەبوون بەلام هەریەك لەو دووبەرپرسە((جەبار فەرمان و کۆسرەت رەسول )) ئیتر لەوە دەرچووبون کەئەمان((فەرەیدون و ملازم عمر )) ریگەیان پیبگرن جەبار فەرمان و کۆسرەت رەسول بوون بە دووبالی تیژوو بەبی تالەبانی کەسیان نەیان دەتوانی ئاسان بالی ئەوی تریان بقرتینن ئەوەبوو کاتیك ترسی لەت بوونی یەکیتی دروستبوو تالەبانی کۆسرەت رەسولی کردە براوە بۆ مەلا بەختیاریش رەنگە دۆخەکە جیاواز نەبیت وئەو خەونەی کە مەلا بەختیار دەمیکە سەری بۆی دەخوریت دوورنییە سەری خۆی بخوات.

## دوای تۆمەت بار کردنی لەلایەن یەکیتی و پارتییەوە نەوشیروان مستەفا ئەرشیفی دەزگای زانیاری بەکار دەهینیت بۆ وەلام دانەوە

**لڤین**

بەر لەوەی لەلایەن کۆمسیۆنی بالاوە دەرگای پروپاگەندەی هەلبژاردن بکریتەوە بەسەرەتایەکی پرلە توندوتیژیەوە شەری راگەیاندنی هەلبژاردنەکان دەستیپیکرد سەرەتای ئەوهەلمەتەش لەلایەن یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان و پارتی دیموکراتی کوردوستانەوە لەئاستی کادیرانی وەسەتیدا لەوپەری توندیدا دەبینریت بەتایبەتی بەرانبەر نەوشیروان مستەفاو لیستەکەی

**لڤین:** لەمانگی رابردودا لەگەل تۆمارکردنی ناوی لیستەکاندا نەوشیروان مستەفا هەمووڵایەکی تووشی موفاجەئەکرد کاتیك وەکو یەکەم کیانی سیاسی بەناوی لیستی گۆرانەوە بەدروشمی مۆمیکی گر پرتەقالی و کەلەسەر رووتەختیکی مۆر نەخشینراوە ناوی لیستەکەی لەکۆمسیۆنی هەلبژاردنەکان تۆمارکرد هەروەکو مەلا بەختیار وتەبیژی مەکتەبی سیاسی یەکیتی بەرۆژنامەی((**ئەلحەیاتی** )) وت لیستی نەوشیروان مستەفا بەلای یەکیتییەوە موفاجەئەبوو سەرەرای توندی ئەو هەلمەتە راگەیاندنانەی کەبەم دواییانەدا راستەخۆ دەکریتە سەر نەوشیروان مستەفا و ئەوانەی لەگەلیدان لەم رووەوە کەنالەکانی راگەیاندنی پارتی بەتایبەت زاگرۆز تیڤی پشکی شیری بەردەکەویت لەسەر زاری چەند بەرپرس و وکادریکی راگەیاندنی خۆی و یەکیتی نەوشیروان مستەفایان بە((**پیاوکوژ**)) و هەلگیرسینەری شەری ناوخۆو تیکدانی ئەزمونی سەرۆکی هەریمی کوردوستان و ئاژاوەگیری تەنانەت وەسفکردنی هاوریکانی راستە خۆ بەوشەی((د)) تۆمەت بارکرد بەلام لەبەرامبەر ئەم هەلمەتە نوییە ریکخراوەی راگەیاندنی یەکیتی وپارتییەوە هەتا ئیستا نەوشیروان مستەفا و دەزگا ئیعلامییەکەی وەلامیکیان دەرنەبریووە ناشزانریت کە بیدەنگییان لەبەرانبەر ئەم بارودۆخە بە کوی دەگات؟

**ئایا نەوشیروان مستەفا وەلامدەداتەوە؟**

هەرچەندەتائیستا نەوشیروان مستەفا بیدەنگی هەلبژاردووە لەبەرانبەر ئەو هیرشانەی کەدەکرینە سەری بەتایبەتی ئەوانەی کەپەیوەندیان بە میژووی سیاسی رابردووی ئەوەوە هەیە لەناو یەکیتیدا

تەنانەت لەم هاوکیشەیەدا لەپیناو ناشرین کردنی نەوشیرواندا بەبی ئەوەی بەخۆی بوزانیت خەریکی هەلدانەوەو وەسفکردنی میژووی ناشرین کردنی خۆیەتی کەئەوکاتە هەم نەوشیروان مستەفا هەم تالەبانی وئەوامەی تریش پشکی شیریان لەوناشرینییانە بەردەکەویت

یەکیك لەوبابەتانەی کەچاوەری دەکریت وەکو بانگەشەی هەلبژاردن بەرانبەر بەنەوشیروان مستەفا بەکاربیت تۆمەت بارکردنیەتی بەکوشتنی ناوخۆی و ناو یەکیتی وشەری نیوان یەکیتی وحیزبەکانی دیکە لە شاخو شاروو بەرپرسیاریتی لیژنەکانی ئیغتیالات لەناو شارەکاندا ئەگەر ئەم بابەتە لەباسکردنیەوە وەکو بابەتی گشتی وردببیتەوە بۆناودیاری کردنی رووداوەکان بەناونیشانی وردەوە ئەوکاتە شەری پروباگەندەی هەلبژاردن دەکەویتە قۆناغیکی دیکوە کەئەستەمە تەنیا لە شەری سارددا خۆی بگریتەوە ئەمەش تەنیا لەبەر یەکیك هۆی سادە کەپەیوەندی بەخودی نەشیروان مستەفاوە هەیە ئەویش ئەوەیە کە نەوشیروان مستەفا پیاویکی وردو دیکۆمینتارییەو خاوەنی ئەرشیفیکی دەولەمەندی شۆرشە کەئەگەر بییەویت بەکاریبهینیت کارتی وای تیدایە کە دەتوانی ئاگر لە خەباتی رابردوویان بەربدات بۆ هەتا هەتایە میژوویان بخاتە ژیر پرسیارەوە جگە لەمانە نەوشیروان مستەفا هەتا ئەم دواییانە لەریگەی دۆستەنزیکەکانی خۆیەوە ئەرشیفیکی دەولەمەندی دەزگای زانیاریشی لەبەر دەستدایە بەلام نازانریت کەی نەوشیروان مستەفا ناچار دەبیت دەست بۆئەم ئەرشیفە نهینییە دەبات و لەبەرانبەر نەیارەکانیدا کاتەکانی ئاشکرا دەکات؟

جگە لەمانە ئیستا نزیکەکانی ئەودەلین ئەگەر بریاربیت نەوشیروان مستەفا خاوەنی هەمووشەرەکانی یەکیتی بیت و ئەو میژووە هەموی لەسەر ئەو حیساب بیت کەواتە شەهیدەکانی یەکیتی هەموویان دەبنە مولکی ئەو چونکە لەسەر فەرمانی ئەو بەشداری شەریان کردووە لەشەردا کوژراون بەپیی نوسینیك کەلەسایتی((چاودیری )) مەلا بەختیاری

کارگێری مەکتەبی سیاسی یەکێتیدا بلاوکراوەتەوە ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر پێویست بکات ئەو راستیانە بەخەلك دەلێن کەچۆن نەشیروان مستەفا لەشەری(( **پشت ئاشان** )) دا حەفتا کەسی لە شیوعەییەکان کوشتووە بەلام نزیکەکانی نەشیروان ئاماژە بەوە دەکەن بەلگەی ڤیدیۆی وزیندانی لەبەر دەستدایە کەئیوارەی پیش ئەورۆژە مام جەلال لەگوندی((**قولە هەرمی** )) بە راوەشاندنی گۆچاکەیەوە فەرمانیکرد کە(( **بچن تەفروتونایان بکەن** )) سەبارەت بە شەرەکانی ناوخۆی نیوان یەکیتی وپارتی و ریککەوتننامەکان نەوشیروان لە ئەرشیفەکەیدا ئەوەندەی بەلگە لەبەردەستدایە لەسەر دییوی ناووەی **رووداوەکانی ئەوماوەیە هەموولایەك توشی شۆك دەكات بەلام ئایا شەرەكەی دەگاتە ئاستی وتنی هەمووشتیك؟** ئەمە ئەو پرسیارەیە کەدەبیت جاریك رەچاوبکەین

**کی دەبیتە کاندیدی نەوشیروان مستەفا؟؟**

قورسترین تاقی کردنەوە لەم قۆناغەدا لەبەردەم نەوشیروان مستەفادا دیاری کردنی لیستی پالیوراوەکانیەتی رەنگە هەر ئەمەش ئایندەی خۆی و رەوتەکەی بەلایەکدا بخات ئەمەش لەبەرئەوەی ئەوئاراستەیەی کەئەو سەرۆکایەتی دەکات ئاراستەیەکی فرە جەمسەروو جۆراو جۆرە کەدەبیت رەچاوی بکات بەتایبەتیش لەبەرئەوەی ئەم لیستە خۆی لە چەند گروپیکی جیاجیا پیکدیت کە بەشیکیان نەوشیروان مستەفاو کۆمپانیاکەیەتی ئەوانەی راستەخۆ لەگەل خۆیدا هاتنەدەرەوە کاریان لەگەل کرد بەشیکی دیکەیان چوار ئەندام مەکتەب سیاسییەکەی بالی ریفۆرمن کە بیگومان دەبیت ئەوانیش رکاندیدی خۆیان هەبیت بەشیکی دیکەشیان ئەو ئەندام سەرکرداریەتی وکادیرە حیزبییانەی کە هەتائیستا لەناویەکیتیدا ماون بەلام لەگەل ئاراستەی نەوشیروان مستەفادان و رەنگە لە ساتەوەختی هەلبژاردندا بەتەواوی خۆیان یەکلا بکەنەوە بەشیکی دیکەیان گروپی(( رەگ )) ە کەبیگومان دەیانەویت نوینەریان هەبیت لەو لیستەدا ئاراستەیەکی دیکەش ئەو نوخبە رۆشنبیرییەیە کەباوەریان بە پرۆژەکەی نەوشیروان مستە فاهەیە وەکو پرۆژەیەکی سیاسی گۆراخواز ئەوانیش دەیانەویت نوینەرایەتی خۆیان جیاوازبیت لەو دەموچاوە سیاسی و عەسکەریانەی کە وەکو کاندیدی ئەم بالە دیاری دەکرین هەربۆیە تائیستا نەوشیروان مستەفا نەیتوانیوە بریاری یەکلاکەرەوە لەم بابەتە بدات و رای خۆی لەسەر کاندیدەکانی کە بۆ هەلبژاردن لەشارو قەزاو ناحیەکان پیکهینان و بدات بەلام لەگەل ئەمانەشدا چاوەری

دەكريت كەتەنيا يەك كەس كەبرياری كۆتای دياری كردنی كەسەكانی لەلابيت ئەويش خودی نەوشيروان خۆيەتی ئەويش لەبەر يەك خالی گرنگ كە دواتاقيكردنەوەی ژيانی سياسی خۆيەتی هەربۆيە دەبيت خۆی تەحەمولی ئەنجامەكەی بكات

## خۆكانديد كردن

لەم سەروبەندەدا ئەوەی كە تيبينيدەكريت دياردەی خۆكانديد كردنە لەلايەن خەلككنيكەوە يان كەسانيكی نزيكی خۆيانەوە كەوا دەردەخەن لەلايەن نەوشيروان مستەفاوە دياريكراون وەكو كانديدی ليستەكەی لەراستيدا بنەمای راست و دروستی نييە هەنديك لەمانە لەوانە كە حەزدەكەن لەريگەی ئەم بانگەشانەوە ناوی خۆيان بدەن بە گوی نەوشيروان مستەفادا هەنديكی ديكەشيان مەبەستيان ليی خۆدەرنەخستنە بەلام لە هەموو مەترسيدارتر بەشيك لەمانە مەبەستيانە لە ريگەی بلاوكردنەوەی ئەم بانگەشانەوە خۆيان بخەنە مەزدای نيوان بالەكانەوە هەتاكوو خەتی گشتی بە نرخيكی زياتر بيانكريتەوە بەهەر حال ئەو كەسەی كەدواجار دەبيتە پاليوراوی ليستەكەی نەوشيروان دەبيت كەسيك بيت بەتەواوی بەری دلی نەوشيروان مستەفا بگريت و ئەو بۆ خۆی پەسەنديبكات

## ئايا نەوشيروان دەنگ دەهينيت؟

بەپيی زانيارييەكانی لقين نەوشيروان مستەفا بە دوو كيانی سياسی جياواز بەشداريكردووە هەركييانيكيان(٧٥٠) ئيمزای بۆ كۆكردۆتەوە مەبەستی نەوشيروان مستەفا لەم كارە ئەوەيە كە ئەگەر كۆمسيۆن ليستە فەرمييەكەی نەوشيروانی بە هەر بيانويەك رەتكردەوە ئەوا بەليستی دووەمی(( **كەليستی سيبەرە** )) بەشداری دەكات بەم شيوەيەش خۆی لە تەلزگەی كۆمسيۆن رزگاردەكات ئەگەر هەردوو ليستەكەش بيكيشە دەرچون ئەوا لەكاتی راگەياندنی هاوپەيمانی نيوان كيانە سياسييەكاندا هەردووليستەكە لەژير يەك ناودا كۆدەبنەوە نەوشيروان مستەفا ئاراستەكەی هەرچەندە ددان بەوەدا دەنين كە لە رووی ريكخستنەوە لەناو ريكخستنەكانی يەكيتيدا لەسليمانی لاوازن بەلام پييان وايە لەرووی جەماوەرييەوە لەسليمانی بەهيزن و دەتوانن دەنگی خەلكی نارازی و بی لايەن و تەنانەت ئۆرگانەكانی خوارەوەی ريكخستنی يەكيتی بهينن بەتايبەتی لەرووی سۆزدارييەوە هيشتا بنكەی ريكخستنی يەكيتی سۆزداريی خۆی بۆ نەوشيروان مستەفا لەدەستنەداوە لەحالەتی دابەزينی پارتی و يەكيتيدا بەيەك ليست لەبەرئەوەی ژمارەی كورسييەكانی يەكيتی مسۆگەرن هيچ دوور نييە بنكەی جەماوەری يەكيتی كە تارادەيەكی زۆر بيزارە لە كوتلەبازی ناو حيزبەكە دەنگی خۆيان بە قازانجی نەوشيروان مستەفا بخەنە سندوقی

دەنگدانــەوە بــەم پییــە چـاوەروان دەکریـت لیـستی گـۆران بتوانیـت زۆرینــەی دەنگــەکانی پاریزگـای سلیمانی بـۆ خـۆی مـسۆگەربکات بـەلام ئـەوەی رویـداوە ئایا یـەکیتی وپـارتی بـە ئەنجامــەکانی رازیــدەبن؟ ئایــا ریکــەوتنی ســتراتیژی لــەنیوان یــەکیتی وپارتیــدا هەلنەوەشیتەوە؟ پارتی وەکو تاکتیکیکی سیاسی سەیری ئەم بابەتە ناکات؟

## چۆن پارتی رازییوو کورسییەکان لەگەل یەکیتی بەشبکات؟

لەدوای ئەوە چەند بەرپرسیکی پارتی رایان گەیاند کەمەرج نییـە کورسـییەکان لـەنیوان یەکیتی وپارتیـدا وەکـو یـەك دابەشبکرین چونکە نەوشیروان مـستەفا دەنگـەکانی یـەکیتی دەبـات یــەکیتی نیــشتیمانی کوردوســتان لەســەر زاری وتــە بیــژی رەسمییــەوە بــەخیرای بەرپرچی ئەم لیدوانەیان دایەوە هیندەی نەمابوو لیستی هاوبەشی یەکیتی وپارتی بـەر لـە هەلبژاردن یەکبخات بـەلام دوای کۆبونەوەیـەکی نیـوان تالـەبانی و بـارزانی ئـەم مەسـەلەیە یــەکلای کرایــەوە تالــەبانی رایگەیانــد کــەبریارییان داوە کەبەیــەك لیــست بەشــداری هەلبژاردنــەکان دەکــەن بــەلام لەپــشت ئــەم ریکەتنــە نهینییــەك هەیــە کەتائیــستا پــارتی ویــەکیتی باســیان نــەکردوە رەنگــە وروژانــدنی ئەوپرســیارەی( **پــارتی چــۆن رازی بــوو کورسییەکانی لەگەل یەکیتی بەش بکات؟**) لـەوەلامی راستەقینە نزیکمانبکاتـەوە بەتایبـەتی دەوتریـت کەتالـەبانی بەمەکتـەبی سیاسـی وتـووە ئەگـەر بەتـەنیاش بیـت لەگـەل پارتیـدا ریدەکەویت

رەنگە لەپشت ئەم ریکەوتنەوە بـەلینیکی جینتلمـانی لـەنیوان یـەکیتی وپارتیـدا هـەبیت کەلەدوای هەلبژاردن یەکیتی دەسـتبەرداری پۆسـتی سـەرۆکی حوکمـەت و سـەرۆکی هـەریم دەبیـت و ئـەو دوو پۆسـتە دەداتـە پـارتی ئەگەرچـی پۆسـتەکانی خـۆی لـە بەغـدا ئەگـەری لەدەستدانیان زۆر نزیکە

## یەکیتی دەمانچەوکۆمپیوتەر دابەش دەکات

بەم دواییە یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان لەولاتی کرواتیا(٥) هەزار دەمانـچەو(٥)هـەزار سەعاتی لەسەر بەشە بودجەی سلیمانی کریـوە بـەنیازە لـەکاتی هەلبژاردنـدا وەکـوو دیـاری هەلبـژاردن دابەشـیان بکـات هـەروەها یـەکیتی لەسـەر ئاسـتیکی بـالای هەلمـەتی هەلبـژاردن دەستپیکردوە لەم رەوشـەوە لـەماوەی تـەنیا یـەك مانگدا زیاتر لەچـەند جاریـك تالـەبانی وئەندامانی مەکتەبی سیاسی ئەو پرۆژەیان پیشیلکردووە کەبۆخۆی بۆجیاکردنەوەی حیزب لەحوکمـەت پیـشکەشی کـردووە چـونکە چـەند جاریـك خوینـدکاران و فـەرمان بـەران و مامۆستایانی زانکۆی بۆ کۆبونەوەی حیزب بانگکردوە دەوامی فەرمیشی بۆ وەستنراوە.

## گۆچانەکەی تاڵەبانی لەهێمای باوەڕ بە خۆبوونەوە بۆهێمای سازشکردن

**هێمن باقر**

گۆچان لەمێژووی سیاسی تاڵەبانیدا هەڵگرتنی چەندین ئەرکی جیاواز بووە هەرلەقۆناغێکی تێکۆشانی تاڵەبانیدا گۆچان ئەرکێکی هەبووە لەهێمای شۆڕشگێڕییەوە تا هێمای زەبروزەنگ و دواتریش سازشکردن

یەکەم دەرکوتنەوەی تاڵەبانی لەدوای شکستی شۆڕشی ئەیلول و دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردوستان بەجلە کوردییە خاکییەکەی بەری جامانە رەشەکەی سەری و گۆچانەکەی دەستییەوە بوو تاڵەبانی لەدوای دروستبونی یەکێتی هاتەوە نەلەفرۆکەخانەی نێودەوڵەتی دابەزی نەگاردی پاسەوانی بەدواوەبوو تاڵەبانی کەگەڕایەوە وڵات نە قات و بۆینباخی ئەوروپی پۆشیبوو نەلەسەیارەی مۆدیل بەرز دابەزی ئەوکە هاتەوە بەخۆی وگۆچانەکەیەوە لە کوێستانەکانی قەندیلەوە هاتەخوارەوە هەڵگرتنی گۆچان لەو ساتەوەختەدا بۆ تاڵەبانی نیشانەی پشت بەخۆبەستن بووە بۆ تاڵەبانی چونکە لەو سەفەرەیدا تاڵەبانی تەنیا بەگۆچانەکەی دەستییەوە سەفەری ڕێی هات ونەهاتی نێوان سێ دەوڵەتی گرتەبەروو بەبێ سوود وەرگرتن لە ئوتومبێل ولاخی سواری چیاو دەشت و رووبارەکانی بڕی و لە سوریاوە گەیشتەوە چیای قەندیل لەکوردوستان دەۆرکەتنی تاڵەبانی بەگۆچانێکی دارینی شوانکارەوە لەوساتەوەختەدا بۆ خۆی بەشێك بوو لە کاریزماو بەشێك بوو لەکەسێتی تاڵەبانی شۆڕشگێڕی خاکی نێو چینی زەحمەتکێشی کۆمەڵگەیەوە هەم دەیسەلماند تاڵەبانی کەسایەتییەکی بەهێزی باوەر بەخۆیە ڕاستە ئەوکاتەی کە تاڵەبانی هاتۆتەوە کۆمەڵەو شانە چەکدارەکانی ڕێکخستوبووەوە چەندهێزێکی پێشمەرگەی دروست کردبوو بەلام شۆڕشی ڕاستەقینە ئەوکاتە دەستی پێکردکە سەرکردە کاریزماکە بەخۆی و گۆچانەکەی دەستییەوە بەوپەری باوەر بە خۆبوونەوە خۆی کردەوە بەوڵاتدا ئێمە نازانین تاڵەبانی ئوگۆچانەی ماوە یان نا؟ بەلام دەزانین ئەو گۆچانە بەشێکە لەمێژووی یەکێتی و بەشێکیشە لەمێژووی شەخسی خودی تاڵەبانی چونکە خاوەنی مێژوویەکی جیاوازی کەسێتی تاڵەبانییە

تالەبانی بەم گۆچانەوە وەك سەركردەیەكی سادە هەژاردۆست باوەربەخۆ بیپشت وپەنا ئازا چالاك نزیك لەپیشمەرگەو جەماوەرەوە دەردەكەویت ئەوانەی تالەبانی لەنزیكەوە دەناسن ئاماژە بۆئەوەدەكەن كە گۆچان لەمیژووی سیاسی تالەبانیدا زۆربەی جار ئامادەیی هەبووە

لەسەردەمیكی باشتردا بەتایبەتی سالانی هەشتا ئیدی گۆچان لەلای تالەبانی ئەركیكی دیكەی هەبووە ئەویش بەكارهینانی بوو لە تەمیكردنی ئەوانەی لەبریارەكانی خۆی حیزب دەردەچون هەندیك جار ئەولیدزانە بەجۆریك بووە كەدەست وسەریشی شكاندووە لەمەشدا تالەبانی دەستیتەپاراستووە لەبەكارهینانیدا بەرانبەر ئەندامانی ئاستە بالاكانی حیزب تەنانەت تا مەكتەبی سیاسیش ئیدی لەمەوبەدوا گۆچان لای تالەبانی سیفەتیكی دیكەی وەرگرت كەلەئامرازی ئیدارەكردنی حیزب بوو واتە ئیدارەكردنی حیزب لەریگەی گۆچانەوە

بەم هۆیەشەوە گۆچانەكەی تالەبانی ئەركە سەرەتاییەكەی لەدەستدەداو وەكو رەمزی بەكارهینانی توندوتیژی هاتە ئەژمار ئیدی دەبوو هەموان بەوریاییەوە مامەلەبكەن بۆئەوەی خۆیان لەگۆچانەكەی تالەبانی بپاریزن كە بە هەمووهیزی خۆیەوە لە كاتی ئاسایی ونائاسای لەهەمووشوینیكدا دەیوەشاند

گۆچانەكەی تالەبانی لەم سەردەمەدا رۆلیكی ئیجگار گەورەی بینی لەكپكردنەوەی ئودەنگەنەیارانەی كەلەناو حیزبدا دروستبووبون ئەگەر گۆچانەكەی تالەبانی نەبوایە رەنگە هەرزوو چەند ەختەتیكی ئایدۆلۆژی جیاواز یەكیتییان لەتبكردایە

لەم سەردەمەدا تالەبانی لەریگەی گۆچانەكەیەوە بیدەنگییەكی گەورەی دروست كرد لەناو كۆبونەوەكانی مەكتەبی سیاسی وكۆبونەوە حیزبییەكانی دیكەدا بەجۆریك ئیتر زۆركەس زاتی دەربرینی رای راستەقینەی خۆی نەبووە لە بەردەم تالەبانیدا

تالەبانی بە خۆی وگۆچانەكەیەوە رۆلی باوكیكی توورەی دەبینیت كەلەپیناوی پاراستنی خیزانەكەیدا توندوتیژییەكی رادە بەدەر بەكاردەهینیت راستە یەكیتی لەبنەماداو بەپیی پرەنسیب هیزیكی فرە مینبەری فرە ئایدۆلۆژیی دیموكرات بوو بەلام گۆچانەكەی تالەبانی بەرەبەرە ئەم هیزە گۆری بۆ هیزیكی یەكرەنگ و یەكدەنگ و یەكئایدۆلۆژیا ئەوگۆچانە هەموو رەنگەكانی دیكەی سرینەوە تەنیا(**یەكیتی ناو یەكیتی**)نەبیت ئیدی ئەم سیفەتە لەسەردەمیكی دواتردا تالەبانی بەخۆی و گۆچانەكەیەوە كردە دیكتاتۆربەسەر تەواوی

جەستەی حیزبەکەیەوە بەپێچەوانەی ئەم سیفەتەوە تالەبانی لەدەرەوەی حیزبەکەی نمونەی دیموکراسی وگیانی لیبوردن وقولکردنی بەرانبەرە تەنانەت لە پۆستە سیادییەکەیدا لەبەغدا سیفەتی لیبوردەی ئەو وەکو سەرۆك کۆماریك و رادەی دیموکراسی بوون و سنگفراوانیی ئەو دووژمنەکانیشی سوودیان لیوەر گرتوە ئەو لەدەرەوەی حیزبەکەیدا خاوەنی هەمووسیفەتیکە بەلام هەرگیز نەیتوانیوە بەرانبەر هاوحیزبییەکانی خۆی بەم جۆرە رەفتاربکات بەجۆریك ئەگەر تالەبانی بۆ خۆشی ریگە بدات کەس زاتی قسەکردنی نەبوو تەنانەت لەو کۆبوونەوانەشدا کەتالەبانی بواری هەلسورانی گۆچانەکەی نەبووە لەکاتی قسەکردنی ئەوانەدا کەبەدلی ئەونەبوو لەبری گۆچانەکەی قسەیەکی سویری وەهای هاویشتووە کەلەئازاری

گۆچانەکەی زیاتر بووە

ئەمەش وایکردوە ئەوانەی لیینزیکن نەویرن رای خۆیان بلین بەلکو زۆرکات نەشیان توانیوە راستییەکانی پیبلین بۆنمونە ئەوکەسانەی لەگەلینی تەنانەت ئەورووداوانەشی لیدەشارنەوە کەناخۆشن وتالەبانی پیان بیزار دەبیت ئەونوسینانەی لیدەشارنەوە کە رەخنەدەگرن و لەبری ئەوە هەمیشە ئەونوسینانەی دەخەنەبەردەست کە پیداهەلدان و ستایشیدەکەن ئەوکاتیك کەلە زانیارییەکانی بەردەستییەوە دەروانیتە ولات دەبینیت دنیا شامی شەریفەو هەموولایەك ستایشدەکەن لەکاتیکدا ئەگەرئەو گۆچانە بهیلیت ئەوا هۆکارەکانی دەتوانن وینەیەکی دیکەی بارودۆخەکەی نیشانبدەن

ئیستاش کەتالەبانی تەمەنی نزیکەی ٧٥سالە گۆچانەکەی دەستی گۆریوە بە گالۆکیکی ئەستوور ئەگەر گۆچانەکەی دەستی لەسەرەتادا رەمزی بە هیزوو باوەری بەهیزی ئەو بووبیت بە شۆرشەکەی ئەوا ئیستا گالۆکەکەی دەستی رەمزی پیربوون و لاوازبونی ئەو و لەدەستدانی متمانەیە بەئایندە گۆچانەکەی دەستی تالەبانی یارمەتیدەدات بۆ ئەوەی هەنگاوەکانی خیراتر بۆ پیشەوە بنیت بەلام گالۆکەکەی دەستی کەزیاتر خۆی داوە بەسەریدا هۆکاریکە بۆ ئەوەی لەسەرپی بیهیلیتەوە ئەوەی گرنگە ئەوەیە جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنیوان تالەبانی و سەردەمی گۆچان و تالەبانیی سەردەمی گالۆکدا کەشایانی تیبینکردنە تالەبانی لەسەردەمی گۆچاندا تالەبانییەکی یاخی پر لەهیواو ئاوات و هیزەو داوای گۆران دەکات بەلام تالەبانی سەردەمی گالۆك تالەبانییەکە کەلەسەر کورسی سەرۆك کۆمار دانیشتووەو لەبری گۆران خەریکی پاریزگاریکردنە گۆچانەکەی تالەبانی لەسەرەتای

شۆرشی نویدا نیشانەی گۆرانکاری بوو بەلام گالۆکەکەی تالەبانی لەئیستادا نیشانەی بەرگریکردنە تالەبانی لەسەردەمی گۆچاندا بەخۆی وبەرگە خاکییەکەیەوە هاتەناوپیشمەرگەو لەنزیکەوە لەگەلیان بووبەلام تالەبانیی و سەردەمی گالۆك دوورە لە خەلکەوە هەست بەئازارەکانیان ناکات رۆلی گۆچان لەم ناوەندانەدا خاکیکردنەوەی تالەبانی بوو وەکو کوریکی چینی هەژاری میللەت وەلی رۆلی گالۆك لەم نیوەندەدا دورخستنەوەیەتی لە خەلك وەکو ئاغا و دەرەبەگیکی دوور لەخەلك تالەبانی لەسەردەمی گۆچاندا بی پشت و پەناو بە پشت بەستن بە میللەتەکەی بەپیچەوانەی خواستی هەموو دنیاوە دەستی دایەوە شۆرش و دروشمی(**یان کوردوستان یان نەمان**)و(**یان کەرکوك وخانەقین یان تاماوین ئەجەنگین**)ی هەلبری کەچی تالەبانی لەسەردەمی گالۆکدا هەر رۆژە لەولاتیکی دژە کورد لیدوانیکی نەخوازراو دەدات رۆژیك لەتورکیا دەلیت(**سەربەخۆی خەیالی ناوشیعرە**)و رۆژیك لە کەرکوك داوادەکات((**کەرکوك شاریکی تەوافوقی بیت** )) رۆلی گۆچان لەم نیوەدا رۆلیکی پۆزەتیفەو زیاتر وەکو هیزی بروابەخۆبون ومتمانەو پشتبەخۆبەستن دەردەکەویت وەلی رۆلی گالۆك رۆلیکی نیگەتیفەو زیاتر وەکو نیشانەی پشت بەستن بەوانی تروو لەدەستدانی متمانە بە میللەت دەردەکەویت تالەبانی لەسەردەمی گۆچاندا شۆرشگیریکە دەتوانیت داستانی گەورە تۆماربکات دەتوانیت شۆرش میللەتیك لەدوای هەرەس زیندوبکاتەوە دەتوانیت سەرپەرشتی راپەرین بکات دەتوانیت کوردوو کیشەکەی بگەیەنیتە گەورەترین مەحفەلی دنیا وەلی تالەبانی لەسەردەمی گالۆکدا لاواز و نەخوازراو رۆلی خۆی نیشاندەدا لەکاتیکدا هەمووکوردی تورکیا داوای لیدەکەن نەچیت بۆ تورکیا ئەوبەگالۆکیکەوە پیشی عەبدولا گیول دەکەویت وسەردانی گۆری ئەتاتورك دەکات لەکاتیکدا هەموو کوردیك لە ناخەوە رقی لە رەفسەنجانی دەبیتەوە ئەو بەگالۆکیکەوە دوایدەکەویت و بە(( **نیعمەتیکی خوا** )) وەسفیدەکات رۆلی گۆچان لەم نیوەندەدا نیشانەی کەسیتی بەهیزی تالەبانییە بەلام رۆلی گالۆك نیشانەی خۆبەدەستەوەدان و سازیشکردنی تالەبانییە تالەبانی بەخۆی و گۆچانەکەیەوە کە دەرکەوت ئومیدی شۆرشی لەناو کوردی هەر چوار پارچەکەی کوردوستاند دروست کرد چونکە دەرکەوتنی ئەو لەرۆچیکدابوو کەکورد لەهەر چوار پارچەکە نووزەیەکی لاوازی مابوو وەلی لەم رۆدا تالەبانی بەخۆی و گالۆکەکەیەوە کاتیك بەپیچەوانەی هەستی گشتیی مرۆڤی کوردەوە لیدوان دەدات خەریکی بیئومیدکردنی مرۆڤی کوردە نەك لە چوارپارچە بەلکوولوهەمووجیهاندا.

## من جەلال تالەبانیم هینایە ناو کایەی سیاسییەوە

**فەرمان عبدالرزاق**

لەدوادیداردا لەگەل(لڤین)کەبەر لەمردنی لەگەلیدا سازکراوە فاتیح رەسول ئەندامی مەکتەبی سیاسی پیشوی حیزبی شیوعی کوردوستان ئاماژە بەوەدەکات کەئەو جەلال تالەبانیی هیناوەتە ناو کایەی سیاسییەوەو ئەوەش دەلیت کەنەوشیروان مستەفا بەهۆی کارە توندرەوییەکانیەوە کە لە رابردوودا ئەنجامی داون ناتوانیت لە پرۆژەکانی داهاتویدا سەرکەوتوبیت و لە هەمان کاتیشدا دەلیت حیزبی شیویعی کوردوستان هەرچی زووە دەبیت واز لە پاشکۆیەتی بهینیت

فاتیح رەسول وەکویەکیك لەبەشداربوانی رووداوی(قرناقەوپشتئاشان)و کارەکتەریکی رووداوەکە ئاماژەبەوەدەکات کە دەستدریژییەکی زۆرکراوەتە کەرامەتی مرۆڤ و یەکیتیش بە بەرپرساری یەکەمی رووداوەکە ناودەبات((بەبروای من هیزە نیشتیمانییەکانی وەك یەکیتی و شیوعی وپارتی هەوالگیری ئیرانی و هەوالگیری عیراق گشتیان بەرپرسیاربون لەوکارەساتەو رۆلیان هەبووە ئیمە یەکەم دەستەبوین کەبەفری قەندیلمان شکاندوو ریگامان کردەوە ئەوەی کە زۆر شتیکی ناخۆش و نارەوا بوو بریارە کاك نەوشیروان مستەفا بووکە هاوریی خۆمە ژمارەیەکی زۆری زیدانی کوژران کەشتیکی زۆرنارەواو نابەجیبووهەروەها دەستدریژییەکی زۆرکرایە سەر کەرامەتی مرۆڤ بەرپرسیاری یەکەمی ئەوکارەساتە یەکیتیی نیشتیمانییە دوژمنەکان گشتیان دەستیان هەبووە حیزبی شیوعیش راکیشرایە ناو ئەم زەلکاوەوە ئەویش بەرپرسیاریتی هەیە لەم رووداوە

ئەورای وایە کەحیزبی شیویعی دەتوانیت خۆی لەو روداوە دەرباز بکات و ئاویزانی شەرنەبیت بەبروای من دەتوانرا ئەوە روونەدات چونکە ئەوشەرە نەخوا دروستیکرد نەلەخۆیەوە رویدا کۆمەلیك وردەشت کۆبونەوە سەریەك ئەوەی لیکەوتەوە دەبوایە حیزبی شیوعی زوو پەیی بەم وردە شتانە ببردایەو رانەکیشرابا ناو ئەو شەرەوە من وتوومە ئەگەر ئەوکات کاك محمد عەزیز سەرکردایەتی شاخی حیزبی بکردایە ئەو رووداوە رووی نەئەدا وەکودەزانین ئەوکاتە کەریم ئەحمەد سەرکردایەتی دەکرد یوسف حەنا قەشە کەئیستا پارتییە ئەوکات یوسف سەرپەرشتیاری بەتالیۆنی ٣١ی حیزبی شیویعی عیراقی بوو

لەبالیسان بروسکەیەکی کرد دەلی لە گوندی(بالوکاوە)ی نزیك بالیسان پارتیی ویەکیتی بەشەر هاتوون ئایا هەلویستت چییە؟ بەوسیفەتەی من سکرتیری هەریم بووم بروسکەکەیان بۆناردم سەیرم کرد ئەوکات هەریم ئەحمەدو عەبدولرەزاق سافی و سلیمان یوسف و باقر ئیبراهیم وابزانم عمر عارف رشیخیشیان لەگەل بوو ئەوان پیاسەیان دەکرد منیش سەلامم لیکردن وتم شتیکی واهەیە پیویستە چاومان لەکتیبخانەو قوتابخانەی حیزبی وهیزەکانمان و چاپخانەکەمان بیت پیویستە هەولبدەین بۆ ئەوەی هەمانە لە دەستمان نەچیت کاك کەریم هاواریکردو لیمتورەبوو وتی(ئیمە دەزانین پینج یەك هەیە ))

من مەبەستم ئەوەبوو کەپارتی دۆستی ئیمەیە پارتی ئەوکات مەکتەب سیاسی لە راژان بوو هیزی بنەرەتیشی لەبادینان ولەسەر سنووربوو کاك کەریم لەناو ئەم برادەرانە وتی مەلی سی یەك بلی پینج یەك دوای من وەلامیان دانەوە وتیان(نسقوا لعمل جبهوی مع جود) یەکسەر هیزی ۳۱ی ئازاری حیزبی شیوعی بەبریاری یوسف حەنان هیرشیکردە سەر هیزەکانی یەکیتی وپیشمەرگەکانی یەکیتیش چوونە سەر شاخی(دەلەشیر)لەپشتی بالیسان پاشان مام جەلال تالەبانی توورەبوو وتی((تۆلە بەسەبرە ئەمما بەزەبرە)فاتیح رەسول باسی رۆلی ناوبژیوانی شیوعی لەنیوان پارتە سیاسییە کوردوستانییەکان بەتایبەت لەنیوان یەکیتی و پارتی حیزبی دیموکرات دەکات و دەلیت((ئیمە لە سەرەتای ۱۹۷۹دا چووینە شاخ و دەربەدەربوین و پەراگەندەبوین خۆشمان ئامادەنەکردبوو بۆ ئەم بارە ئیمە سی ئەندامی مەکتەبی سیاسی کەوتینە((ناوزەنگ)من و مەلا ئەحمەد بانیخیلانی و خوالیخۆشبوو تۆماس یەکیتی نیشتیمانی بەتایبەت مام جەلال وعمر شیخ مووس وفوئاد مەعسووم ئەوانە زۆربەگەرمی پیشوازی ئیمەیان کرد هەرچەندە بەرنامەی ئەم شوینەشمان نەبوو بەلکووریکەوت بوو چونکە ئەو شوینە نزیك بوو سەرەتا زۆر پشتیان گرتین و هەرزووبوهۆی ئەوەی کەوا ئیمە لەوان نزیك بوین هەستمان کرد خالی سەرەکی جیاوازی لەنیوان ئیمەوە ئەوان لەسەر شۆرش و ئایندەی عیراق و برایەتی کوردوو عەرب و لەسەر داواکارییەکان بوو تەنیا جیاوازیمان لەسەر قیادەی موەقەتەوە بنەمالەی خوالیخۆشبوو مەلا مستەفای بەرزانی بوو ئیمە رۆژی یەکەم لەگەل ئەوبوین پیویستە برادەرانی یەکیتی لەم رووەوە بەخۆیاندا بچنەوە بەلام ئەوان بەکوشتنی دکتۆرخالید سەعیدو علی عەسکەری و ئەوکارەساتانە زۆر دلیان بریندا بووبوو ئیمە بەردەوام گفتوگۆمان دەکرد و دەمان وت ئیستاش پارتی رۆلی ماوە کتیبیکیان بەناوە((اتحاد وگنی لماژا)) دەرکرد تییدا زۆربەتوندی

هێرشیان بردە سەر بنەماڵەی بارازانی وقیادەی مۆقەتە.ئیمەش بەرگریمان لیکردن ئەوە تاکە خاڵی جیاوازیمان بوو

پاشان(قاسملو) ش کەهات لەگەڵ ئەوانیش هەوڵماندەدا حیزبی(دیموکرات)یش هەڵویستیان نەرم بوو ئەیان وت ئەگەرپارتی هاوکاری هیزی ئیران نەکەن ئامادەین بۆ هاوکاری من خۆم لە لیژنەی پەیوەندییەکان بووم زوو زوو دەچوومە راژان و زوو زوو دەچومە لای دکتۆر(قاسملو) زۆر کاری باشمان کردن بۆ نمونە مەفرەزەی ئەحمەد کەشخە کە مەفرەزەیەکی پارتی بوو دوای ئەوەی کەوا یەکیتی گرتی و ئازاریان دا من ئەوکات هەوڵمدا ئەوانەم رزگارکردن و رەوانەی لای سەرکردایەتی پارتیم کردنەوە ئەوە بوو کاك مەسعود سوپاس نامەیەکی ئاراستەکردم ئیمە جگە لە تەبای هیچ مەبەستیکی دیکەمان نەبوو هەتا کاتیك لە مارتی ١٩٧٩جیابونەوە لە یەکیتی پەیدابوو برادەرانی بزوتنەوە((رەسول مەمەندو قادر جەباری و. د.مەحمود) وئەوان ئینشیقاقیان کرد کەجیابونەوەی نیوانی یەکیتی و ئەوان زۆر گرژبوو ئیمە بەردەوام هەولی میانە گیریمان دەدا لەنیوانیاندا هیچ مەبەستیکیشمان نەبوو جگەلەوەی دەمان ویست کاروانی بزوتنەوە ی رزگاریخواز ی کورد سەرکەوتوو یەکگرتووبیت دەربارەی هاوسۆزی زیاتری حیزبی شیوعی لەگەڵ پارتیدا وتی بەبروای من بۆ ئەوە دەگەریتەوە لە دوای کودەتای شواتی ١٩٦٣مەکتەبی سیاسی کۆن لە خانەقینەوە تا تەق تەق وکۆیە هەڵویستیان زۆر خراپ بوو بەرانبەر بەحیزبی شیوعی خەڵکیان دەگرتن و ئازاریاندەدان بە پیچەوانەوە لە دەشتی کۆیە تا زاخۆ لەژیر کۆنترۆلی مەلا مستەفای خوالیخۆشبوو بوو یارمەتی ئیمەیان دەدا پەیتا پەیتا ئەم پەیوەندیە بەهیز دەبوو بۆ نمونە کاتیك حەمە ئاغای میرگە سوور ئامر هیزی سەفین بوو فاخیری کوری ئەندامی سەکردایەتی لیوای ئیمەبوو ئەوکات ئەوە بۆمان دەرفەت بوو ئەوە سەرەتای یەکەم بوو لە رووی فیکرییەوە لایەنی دووەم لەناو یەکیتی باڵی کۆمەلە بوو کەنەوشیروان سکرتیریان بوو لە سەرەتای کارکگردنیان بەناوی((عجبە مارکسیە)خۆیان بەمارکسی دەزانی خۆیان وادادەنا کەدەبی ببنەوە جیگرەوەی حیزبی شیوعی ئەمە فاکتەری دووەم بوو لایەنی سیەم پەیوەندی تایبەتی بوو کەوا کاریگەری هەبوو

من ١٩٧٩ــ١٩٨٦دەچومە راژان لەگەل برادەران لەگەڵ وەفدی حیزب بەهۆی ئەوەی مەکتەبی سیاسی کاك مەسعودو خوالیخۆشبوو ئیدریس بارزانی و کاك علی عەبدولا و رۆژ لانوری شاوەیس و فەلەکەدین کاکەی و فازل مەتنی بوو ئەوانە گشتیان حەزیان بەبرایەتی

و دۆستایەتی ئیمە دەکرد بەپیچەوانەوە لەناو یەکیتینیشتیمانی هیلی کادیرەکانی سەرکردایەتی کۆمەلە زۆر توند رەو بوون و نارازیبوون لە هەلویستی ئیمە ئەوان وایاندەزانی ئیمە دەمانەویت پارتی بژیینینەوە بەلام لە راستیدا وانەبوو

دەربارەی هەولەکانی نەشیروان مستەفا ی سکرتیری ئەوسای کۆمەلە

ئەوبرواى وایە کە کارە توندرەوەکانی رابردووی دەبنە ریگر لەبەردەم کارەکانیدا کاك نەوشیروان تیکۆشەرەو قوربانیداوە بەبروای من بەهۆی توندرەوییەکانییەوە بەتایبەت ئەوماوەیەی کەلە شاخ بووە هەندیسك هەلویستی بەرانبەر بەگیراوەکان زۆر یارمەتی نادات لە سەرکەوتنی لەژیانـدا دەربارەی ئەوەی کەزۆرجار نوسینەوەی میژووی سیاسی دەستنیشانی ئەوەدەکات کە رووداوی ناسۆر لە گۆرەپانی خەباتی چەکداریی حیزبیدا شیوعی هۆکاربووە بۆ زیادبونی تەنگژەو کیشەکان لەبارەیەوە وتی

ئەم قسەیە هیچ بنەمایەکی نییە ئیمە لەبەرئەوەی بەشداری لە شۆرشی ئەیلولدا بکەین دوای هەلگیرساندنی شۆرشی ئەیلول بە هەموو توانا هەولی کوژاندنەوەی ئاگرمان دەدا و هەولمان دەدا شۆرش لە گەل عەبدولکریم قاسم تەفاهومبکات شیعاری((السلم فی کردستان)مان بەرزکردەوە لە سالی ١٩٦١دەیەها گەنجمان چون بۆ بەندینخانە بە هۆی بەرگریمان لەکورد شیویعیەکان لەگشت شوینیك لەزیندا نەکان لیان دەدرا کە لەسەریاکردن جوین بە مەلا مستەفای خوالیخۆشبوو بدەن بەلام ئەوان وەکو پیاوان دەوەستان و هیچیان نەدەوت بەلام دەیان کەسی دیکەیان دەگرت نەك هەر ئامادە بوون جوین بەمەلا مستەفا بدەن بەلکوو دەبونە خۆفرۆش و جاسوسیش هەلویستی شیویعیەکان لەم لایەنەوە پاکترین هەلویستە ومیژوو شایەتی ئەو راستییە یە بەلام بەهۆی پیلانی شۆفینیستی عەرەب وپیلانی ئەمەریکاو حوکمەتە عەرەبییەکانەوە عبدول کەریم قاسم لەناوبرا بەمەش زۆربەی گەورە بەرحیزبییەکانی شیوعی کەوت و سەدان ئەندامیان لیکوژران ئیمە چەند کەسیك لەگەل کاك محمد و عەبدولکریم ئەحمەدو تۆماس و چەند کەسیکی دیکە ئەمانە گەیشتنە شاخ و نەکەوتنەبەر دەستیان فاتیح رەسول دەربارەی پەیوەندییەکانی نیوان خۆی مام جەلال دواو ئامـاژە بەوەش دەکات کە ئەم تالەبانی هیناوەتە کایەی سیاسییەوە مام جەلال هاوریی مندالیمە من توانیم مام جەلال رابکیشم بۆ کاری سیاسی مام جەلال بەهۆی منەوە هاتە ناو سیاسەت و خۆشی ئەوەی وتووە مام جەلال ئیستاش برادەرمە بەلام رۆژیك

له رۆژان بەناحەق پشتیوانم لە هیچ هەلویستیکی نەمام جەلال و نەکەسیکی تر نـەکردووە لە ژیانیشم هیچ بەیان نامەیەکمان بەیەکەوە دەرنەکردووە

بەوپییەی کەمن لەمام جەلال وبەشیکی سەرکردایەتی یەکیتی نزیك بومـەوە کەتیایانـدا هەیە خزمیشمە ئەوە کاریگەری دەبیت لەسەر پەیوەندی هەمیشەش ئـەو پەیوەندییـەم بـۆ بەرژەوەندی گشتی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد بەکارهیناوە بۆ نوکتە ئەوە دەلیم سالی ٢٠٠٤چوومە سلیمانی دوای ئـەوەی کـە(بەهائـەدین نـوری)کتیبیکـی نوسـییەوە بـەم((شـەلم کویرم کەس نابویرم)لە سەرکردایەتی حیزبی شیوعی کـەوتووە لەسـەر منـیش کـە رۆحمـی پیکـردووم نوسـیویەتی((کنـا نـسمیەت برفیـق جـلالی بلجنـە مرکزیـە)ئەوکاتـەی لەسـلیمانی بووم لە ٢٠٠٤مام جەلال داوەتیکردم من بە مام جەلال م وت کە ئەمرۆ لەسلیمانی چوومەتە لای هاوری بەهائەدین نوری گەرام بچم پییبلیم کاك بەهائەدین تۆمانگانە ٢٤٠٠٠دیناراەمـام جەلال وەردەگریت من رەفیقی مام جەلالم یان کـەتۆ تائیـستا مـن پـولیکم لیوەرنـەگرتووە؟ مام جەلال توورە بوو یەکسەر وتـی بەقـەبری دایکـم مانگانـە ١٥٠٠٠دینـاری پیـدەدەم فـاتیح بەرەی نیوان حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی بەدەستکەوت دەزانیت و شانازیش دەکات کـە بـە شـداری تیـدا کـردووە بـی پـیچ وپـەنا منـیش یـەکیك بـووم لەوانـەی پەسـەندم کـرد بـە دەستکەوتیـشی دەزانم لـەناو ئیمـەش سـتراتیژیەتی حیزبـی شـیوعی ئـەوەبوو ئیمـە پیمـان وابوو کە حیزبی شیوعی وبەعس ئەو بەرەی مۆرکردبەپشت گـیری هیـزی چـەپیی جیهـانی سـۆڤیەت پـارتیش بیتـە نـاو بەرەکـەوە لەلایـەك حیزبـی شـیوعی کـەهیزی چـەپ و هیـزی ئیـشتیراکی لەگەلدایـە لەلایـەکی تـر کـوردی لەگـەل بیـت و پـارتی لەگـەلبیت بـە هیـزی پیـشمەرگە ئەوسـەردەمە لەوانەیـە بـەم دووهیـزە بتـوانین تۆزیـك لەسەرشـیتی بـەعس کەمبکەینەوە بەلام بەداخەوە برادەرانی پارتی نەهاتن

میژووئـەوەی سـەلماند کـە ئـەو بەرەیـە نـەك ىهـەر دەسـتکەوت نـەبوو بۆکـورد بـەلکوو زیانیـشی لیکـرد فـاتیح رەسـول لـەم بارەیـەوە وتـی راسـتە میـژووی ئیـسپانی ئـەوەی کـرد کەهەلەبوو ئەو هەلەیەش بە پلی سەرەکی دەگەریتەوە بۆ فاشیەت و دیکتاتۆریەتی حیزبـی بەعس هەروەها بۆ پیلانی ولاتانی دراوسی بەتایبەت ئیران و تورکیـا مـن بـۆ میـژوو دەلـیم ئەکات ئەندمی لیژنەی مەرکەزی بووم بەرپرسی ریکخستنی حیزب بـووم رۆژیـك لـە رۆژان لەبیرۆکـەی حیزبـی شـیوعی نـەبووە کـە دژایـەتی پـارتی وبـارزانی بکـەین هەرکەشـیش ئـەوەبلیت درۆدەکـات بـەلام کـاروانی سیاسـیش وایکـرد بـەعس ئـەو شـیوەیە وەربگریـت

وپارتیش بەبریارەکانی ئیران و کیسنجەر بروایکرد شتەکە شیوەیەکی دی وەرگرت ئەوەش لە ئیرادەی ئیمەدا نەبوو سەبارەت بەبەشداری کردنی پارتی لەوبارەیەدا وتی ئەوپرسیارە لەکاك علی عەبدولا بکەن ئەمە بابەتیکی زۆرگرنگە دەتوانم وەلامتبدەمەوە بەلام من ئەو حەقە بەخۆم نادەم ئەگەر پارتی بەشداری بکردایە خەتی فاشی کە خەتەکەی سەدام حسین بوو لەناو حیزبی بەعس سەرنەدەکەوت دواتر باسی ناکۆکییەکانی خۆی لەگەل سەرکردایەتی شیوعیدا کردوو وتی هەتا دوای مانگی ئابی سالی ١٩٩٦من لەکۆبونەوەی حیزب بەشداریم کردوە ئابونەشم داوە بەلام زنجیرەیەك لەکاری نارەوای حیزبی شیوعیم بینی کەلەگەل بۆ چونی من نەدەگونجا بۆ نمونە هەلبژاردنەکانی ١٩٩٢ئەو شیوەی کەحیزبی شیوعی چونەناو هەلبژاردن من لەگەلی نەبووم یان کیشەی حیزبی شیوعی کوردوستانی وئەوەی روویدا کەدوای بووە کاری سەربەخۆ من دوای ١٩٩٦/٨/٣١زۆر زۆرم پیناخۆش بوو کەبرادەرانی حیزبی شیوعی لەهەولیر بەشداری حوکمەتیان کرد من ئەوکات لە سوید بووم رای من وابوو کەیان بەشداری نەکەن یان کەدەشیکەن لەسلیمانی بیکەن چ جیاوازییەکیان هەیە؟ هەردوولا یەك نین؟ ئیستاش من هەرخۆمم تەجمیدکردووە پەیوەندیم لەگەل گشت کەسیکی چەپ و دیموکراتی هەیە بەلام بەبروای من شیوازی کارکردنیان زانایانە نییە بەبروای من حیزبی شیوعی کوردستان هەتا ئیستا پاشکۆیە وەك لیژنەی هەریمی کەلەسەرەتای پەنجاکان ناوی لیژنەی لقەکان بوو ئیستاش بەهەمان شیوەیە من لەگەل شیوەی کارکردنیاندا نیم پیویست بوو لە زووەوە خۆیان لەو پاشکۆیە رزگاربکەن فاتح رەسول باس لەراپۆرتەکەی مایکل رۆبن دەکات و بەگلۆپی سوری دادەنیت بۆ سەرکردایەتی کورد بەداخەوە دەلیم ئەگەر ئەودووحیزبە لە عەقلیەتی تەسکی حیزبایەتی رزگاریان ببوایە شتی باشتر دەکرا تائیستا کیشەی حیزبایەتی تەسك وبەرژەوەندی تەسك زیانی بە دۆسیەی کورد گەیاندوە هەروەها دوای ئەوەی کە پیاوە ئەمەریکییەکە(مایکل رۆبن )لا لەسەر گەندەلی کوردوستان نووسی بەبروای من ئەوە گلۆپی سورە واتا هۆشیاربن مەسەلەکە پرمەترسییە بۆیە پیویستە سەرکردایەتی سیاسی کورد پیداچونەوەیەکی بنەرەتی تەواو لە گشت کارەکانیدا بکات کەئەمە چاونەترسی و ددانپیدانان و بویری دەویت ئەگەربیکەن خزمەتی خۆیان و میللەتەکەیان دەکەن ئەگەرنەیکەن گرانتر دەوەستیت لە سەریان ئومیدەوارم سەرکردایەتی کورد پیداچونەوەیەکی تەواو بەخۆیدا بکات دەربارەی گەندەلی دەربارەی یار ی کردن بەمولکی دەولەت کەبەهەزاران دۆنم زەویی دەولەت پەرتان پەرتانی پیکرا .

## کەمەلا بەختیارمان دەستگیرکرد بە ئەبوو شەهابم وت بیکە بەدیاری دەستی خۆت و بیدەرەوە بەمام جەلال

**دیداری ئەحمد میرەو هیمن باقر**

**شـــیخ کامیـــل شـــیخ قـــادر** تەمـــەن ٥٦ســـال لیپرســـراوی پیـــشووتری مەکتـــەبی سیاسی(ی.ن.ك)لەسالی لا١٩٧٩ەوە پەیوەنـدی بـە یەکیتییـەوە کـردوە دواتـر بۆمـاوەی ١٤سـال لەنەمسا ژیاوەو ئیستا راویژکارە لە وەزارەتی شەهیدان و کاروباری ئەنفالکراوان شیخ کامیل دەیەویت ژیانی پیشمەرگایەتی وەك خـۆی بگیریتـەوە شکست وسـەرکەوتنەکانی بەیەکـەوە باس بکات چونکە ئەو باش دەزانیت کە ئەو ژیانەتـەنها خۆشـی وسـەرکەوتن نـەبووە بـەلکو گـەلیك نەهامـەتی و شکـستی تیـدابوە شـیخ کامیـل پەیوەنـدی کردنـی بەکۆمەلـەوەی رەنجدەرانەوە

ئـەو دەلیـت لەسـالی ١٩٧٩پەیوەنـدیم بـە یەکیتییـەوە کـردوو سـالی ١٩٨١چومەشاخ چـونکە لەناوشار ئەرکی دەستنیشانکردنـی ئەو کەسانەم لەئەستۆبوو کەدژی بزوتنـەوەی کوردایـەتی بـوون دوای ئاشـکرابونم ناچار بـووم چومەوە شاخ سـەرەتا چـوومە قـەراخ و دواتـر چـومە بارەگاکـانی سـەرکردایەتی لـە قاسمـە رەش ماوەیـەك لـەوی مامـەوە بـۆ ئـەوەی هەسـت جیاوازییەکانی نیوان ژیانی شاخ و شاربکەم

### یەکیتیی و سەرەتای سالاتی هەشتا

**شـیخ کامیـل** دەلیـت یـەکیتی هەرلەسـەرەتاوە وەك نیمچەبەرەیەك لـەدایك بـووە بـەلام چـەتریك بـوو توانیبـووی هـەموویکخراوەکان کۆبکاتـەوە ئـەو دەمـە کۆمەلـە گـەورەترین ریکخراوو بوو کە خەباتیدەکرد بەجۆریك لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا وینـەی نـەبوو کۆمەلـە گـەورەترین بـالی یـەکیتیی بـوو هەرچـەندە شۆرشـگیرانیش ناوەنـدی خۆیـان هـەبووە وبەشـیوەیەکی جـەماوەری کاریـان دەکـرد ئەوکاتـە جیـاوازی بیرکردنـەوەمان هـەبوو هەریەکەمان ریکخستنی خۆمان هەبوو کۆمەلەو شۆرشگیران و هیلی گشتی کـە مـام جـەلال سەرپەرەشتی دەکـرد کۆمەلـە لـەرووی فیکـری و راگەیانـدن و فیداکارییـەوە لـە هـەموان

بەهێزتربوو مەکتەبی عەسکەری لەژێر دەستدابوو مولازم عمر سەرپەرشتیدەکردو ئەندامی باڵەکانی تری تیدابوو زۆربەی سەرکردایەتی ئەوکاتە کۆمەڵەبون

## پەیوەندی یەکێتیی وحیزبەکانی تر

**شیخ کامیل قادر** دەڵیت پەیوەندییەکان لەوکاتەدا زۆرباشبون هەرچەندە ناتوانم بڵیم سەدلەسەد کۆك وتەبابوون لە سایەی یەکێتیدا حیزبەکانی وەك بزوتنەوەی ئیسلامی و حیزبی بەعسی یەساری دەیان توانی بارەگایان هەبیت و مام جەلال بەردەوام بانگەوازی ئەوەی دەکرد کەدەبیت ناوچە رزگارکراوەکان بکەینە دەروازەیەك بۆ خەباتی هەمووریکخراو حیزبییە کوردوستانیی و عیراقییەکان کەباوەریان بەرزگاری کورد هەیە بەلام سەرجەم ناکۆکییەکانی ئەوکاتە لەسەر دەسەلات و بەرژەوەندی بووە چونکە نەبووە کەبیرۆکەیەك مەبەستی خزمەتکردن بووبیت وذایەتی کرابیت بەداخەوە لەوکاتەدا شەروپیکدادانی سەربازیی و پیشمەرگانەروویانداووە بە جۆریك هەرلایەك پیشمەرگەیەکی لەولا بکوشتایە بەسەرکەوتنی دەزانی من هۆکارەکەی بۆنەبونی عەقلیەتی سیاسی دەگیرمەوە کە بیر لەئایندە بکەنەوە لە قۆناخەدا تەواوی ناوچەکانی سلیمانی و گەرمییان و هەولیر لەژێر دەستی یەکێتیدابوون پارتی تەنها لەناوچەی بادینان بوو چونکە ئەوان دوای شکستی ئەیلول کەوتنە ئیرانەوە

## ناکۆکی یەکێتی وحیزبەکانی تر

**شیخ کامیل** بەمجۆرەباس لەو ناکۆکییانەدەکات ناکۆکییەکانی یەکیتی ئەوکاتە لەگەل حسك و بزوتنەوەی ئیسلامیدابوو هەروەها کاتیك مەفرەزەیەکی یەکێتیی دەچووە ناوچەی بادینان لەلایەن پارتییەوە لییدەدراو وەك کارەساتی هەکاری ئەگەر مەفرەزەیەکی پارتیش بهاتایە ناوچەکانی سنوری یەکێتیی لییدەدرا بگرە بەشوین یەکتریشدا دەگەران وەك وتم شەرەکان لەسەر دەسەلات و سنورو گومرك بوون

## یەکێتیی وحیزبی شیوعی

**شیخ کامیل** دەربارەی ناکۆکییەکانی نیوان یەکێتیی و حیزبی شیوعی دەڵیت حیزبی شیوعی ئەوکات وەکوحیزبیکی عیراقی کاریدەکرد و یەکێتیی لە کۆنفرانسی یەك و دوودا کوردوستانیبونی خۆی راگەیاندبوو ئەمەبووە هۆی جیاوازی ئایدیاو بیرو بۆچونەکان و ململانیکانی بەرەو پیشەوە برد ئەگەر ئیمە وەکو یەکێتی وکۆمەلە بیرکردنەوەکانمان

موتوربه بكردایه رەنگه ناكۆكییەكان بچوكتردەربكەوتنایه من ئاگاداری رووداوی پشتئاشان بۆ یه قسەی لەباره وه ناكەم

**یەكیتی و ململانیی ناو باڵەكان**

**شیخ كامیل** لەم بارەیەوەدەڵیت هەر لەسەرەتاوه كۆمەڵه دووباڵی هەبوو ب ەتایبەت ئەوكاتەی كەكۆمەڵیك لە هاورییان لە كۆنفرانسی دوودا ئەوەیان ئاشكراكرد كەبیركردنەوەیەكی تایبەتیان بەرانبەر بەعیراق هەیه بەلام بانگەشەكانی ئەوانەی ئید یعای ئاڵای شۆرشیان دەكرد دەیگیرمەوه بۆ دەسەلات و پلەو پایەی شەخسی ململانیی ئەوكاته زۆر قولبوو تەنانەت لەناو تیپەكانیشدا ململانی هەبوو بۆ نمونه ئیمه تیپی ٥٧ بوین و تیپی ٥٥لەوبەرمانەوەبوو ئەگەر بچوینایه لەسنوری ئەواندا چالاكیمان بكردایه ئەوا ئەوان پیان ناخۆش بوو ئیمەش بەهەمان شیوه دەتوانم بلیم لەسالانی هەشتاكاندا دەستەگەری هەبوو هەركەس لەرووی نەفسیەوه خۆی جیاكردوبوەوه دەستەیەك عەتفیان بۆ كاك نەوشیروان هەبو دەستەیەكی تر بۆ مام جەلال و دەستەیەكی تر بۆ كاك سالاروو یەكیكی تر بۆ دكتۆر فوئاد

**یەكیتیی وئاڵا ی شۆرش**

**شیخ كامیل قەرەداخی** سەبارەت بە ناكۆكییەكانی نیوان ئاڵای شۆرش و یەكیتی دەلیت ناكۆكییەكان زەق نەبون و نەگەیشتبوونه قۆناغی دابران و پیكدادانو یەكتر كوشتن بەلام ترسناك ترین دیارده ئەوەبوو كه ئاڵای شۆرش بە یەكجاری لە یەكیتیی داببریت لەسالی ١٩٨٦كۆمەڵیك لەوبرایانە خۆیان دور خستەوه لەخەبات وەكو مامۆستا پشكۆو شەهید بابەتایەر كەدانیشتبون و كاریان لەگەل لاهیزی پیشمەرگه نەدەكرد ئاڵای شۆرش و پارتی بارەگایان له یەكتره وه نزیك بوو هەركاتیك بۆیان هەلبكەوتایه لە یەكیتی جیادەبونەوه لەسنوری مەلبەندی یەكدا لەناوچەی قەرەداغ كۆمەڵیك كادیریان هەبوو كەبۆخۆیان كاریان دەكرد هەربۆیه لەلایەن مەلبەندی یەكەوه مەلا بەختیار گیرا و ناردیان بۆ ناوچەی سەركردایەتی ئەوان دەیان ویست جیاببنەوه نەك كودەتابكەن ئەوان لییان دەبیسترا كه دەیان وت بۆچی مام جەلال بۆی حەلال بوو لەپارتی جیاببیتەوه بۆچی ئیمەبۆمان نییه له یەكیتی جیاببینەوە؟ هەرچەنده ئاگاداری پەیوەندی نیوان ئاڵای شۆرش و پارتی نیم بەلام لەیەكتر نزیكبونەوەكه ئاشكرابوو

**چیرۆكی گرتنی مەلا بەختیار**

**شیخ کامیل** دەلیت نامەویت وشەیەکی درۆ لەقسەکانمدا هەبیت و ئەم قسانەشم بۆ شکاندن نییەو نامەویت لیکدانەوەی هەلە بۆ ئەم قسان بکریت لەیەکیك لە رۆژەکانی سالی ١٩٨٦دا سەعات ٢شەوبوو کاك حاکم شوان هات بۆلاموو نامەیەکی مامجەلالی کەتیایدا دەلیت مەلا بەختیار لە زیندان رایکردووە بۆیە هیمەتیك بکەن بۆ گرتنەوەی ئەو شەوەی کەرایکردبوو هەرئەو شەوەش نامەکەم بۆهات مەلا بەختیار لە یاخسەمەر زیندانی بوو ئەوکاتە ئەبووشەهاب چاودیری ئەو زیندانەی دەکرد زیندانەکە تەنها ژووریك بوو تایبەت بوو بەوکەسانەی کەوا مەترسی ئەوەیان لیدەکریت زیان بەشۆرش بگەیەنن لەبیرمە ئەوشەوەی کەمەلا بەختیار رایکردبوو یاری ئۆلمپی هەبوو هەموو پیشمەرگەکان سەرقالی سەیرکردنی یاری بوون ئەمەی بەهەل زانیبوو رای کردبوو کاتیك یارییەکە تەواو بووبوو ئینجا پیشمەرگەکان پیان زانیبوو بۆیە دوای ئەوەی نامەکەی مام جەلالم ب ەدەست گەیشت سەعات ٢شەو کەمینم بەهەموو لایەکدا دەرکرد لە دۆلەرووتوە هەتا کانی بەردینەو ئەوناوچانەی پیادەرۆبوون لەپیرە مەگرون و سورداش تامن ئەم کارەم کرد رۆژ بوەوە و ئەبو شەهابیش ها تە لام وتی مەلا بەختیار لەدەستی من رایکردووە بەلکووهاوکاریم بکەی بۆ گرتنەوەی منیش گوتم ئەگەربیت و ئەمشەو لەم ناچەیە دەرنەچوبیت وەعتدان دەدەمی کە شەوی داهاتوو بیگرمەوە ئەو رۆژە کەوتمە گەران بەناو پیشمەرگەکانی خۆم و هەمووپیشمەرگەکانی تردا توانیم لەبیست قۆلەوە مەفرەزە دروست بکەم بۆ گرتنەوەی مەلابەختیار لەوکاتەشدا ئەوبریارە هەبوو ئەگەربیت و هەولی خۆقوتار کردن بدات بکوژریت عەسر مەفرەزەکانم نارد بۆشوینەکانی خۆیان بۆمالی عمری کاکەولا لەمیرگەپان لەوی لەمالی ئەوان شایی بوو منیش لامدا چایەکم خواردەوە عمریش دوستم بوو شتەکەم تیگەیاند من بەمەفرەزەکانم وت لەهەرلایەکەوە بینیتان هەولی گرتنەوەی بدەن تا کوشتن لەکاتژمیر ١٢,٢٠دەقیقە لەیەکیك لەکەمینەکانی خوار خۆمەوە مەلا بەختیاریان گرت کاتیك رۆیشتم مەلا بەختیار پیی وتم ئەگەر دەشم کوژن ئیهانەم مەکەن من سەرکردەتانم نانە رەقم لەگیرفاندایە فیعلەن نانە رەقی لەگیرفاندابوو لەهەمان کاتدا ٢٥دیناری ئەوکاتەی لەگیرفاندابوو پرسیارم لیکردوو بەلینم پیدا کەنەی کوژم ئەوەشم بەباش دەزانی کەنە کوژریت تاهۆکاری گرتنەکەی وئاشکرابیت و بزانریت کی دەستی لە مەسەلەکەداهەیە؟ جەنابی مام جەلالیش ئەوەی لاباش بوو لیکۆلینەوەی لەگەلدابکریت چونکە ئەوکاتە بارودۆخەکە ناسك بوو کۆمەلیك پیشمەرگە لەدەشتی رانیە تەسلیم بەرژیم ببونەوە

لەوەدەترساین کە حوکمەتی بەعس بەرەیەك لەدژی هیزی پیشمەرگە دروست بکات ئەو شەوە مەلابەختیارمان هینایە قزلەر چوینەمالی کاك حەمە جەزای هونەرمەندو داوای ئەوەی کرد کە بچیتەدەرەوە کاتیك چوەوە دەرەوە هاتەوە بەپاسەوانەکانم وت بچنە شوینەکەی کاتیك رۆیشتن کلیلیکیان هینایەوە وتم ئەم کلیلە چییە؟ وتی ئەمە کلیلی زیندانەکەیەو بۆیان دروست کردووم تائیستاش دەرنەکەوت کی ئەوکارەی بۆکردوە دوای ئەوە؟ ناردم بە شوین کاك ئەبوو شەهابدا وتم مەلا بەختیار لەدەستی تۆ رایکردوە دەیدەمەوە دەستی تۆ و بیکەرە دیاریی دەستیی خۆت و بیبەرەوە بۆ لای مام جەلال پاشان کرایەوە هەمان زیندان لە یاخسەمەر مام جەلال منی نارد بۆ لای کاك بەختیار بۆ لیکۆلینەوە ئەودانی بەوەدانا کە دەیانەویت کەبەهەمووشیوەیەك جیاببنەوە هیندەی من تیگەیشتم کە ئەوان نەك جیابونەوە بەلکودەیان ویست زالببن بەسەر کۆمەلەو یەکیتیدا ئەوە لەزیندان مایەوە هەتا دوای ئەنفالەکان لە سالی ١٩٨٦ەوە تا ١٩٨٩لەسەربریاری مام جەلال ئازاد کرا بەلام بەمەرج بەمەرجی ئەوەی لەناو یەکیتیدا بمینیتەوە و دژایەتی یەکیتی نەکات

**مەلا بەختیار** دەیویست بەرەو سلیمانی رابکات من لە لیکۆلینەیەکدا هیچم بۆ دەرنەکەوت سەبارەت بە پەیوەندی پارتی و ئالای شۆرش چونکە لیکۆلینەوەکەی من تایبەت نەبوو بەومەسەلەیە تەنها تایبەت بوو کەبەوەی کەبەرەو کوی دەرۆیشت و رینیشاندەرەکانی کی بون؟ مەلا بەختیار جاریکی تریش گیرابوو لەلایەن شەهید شەوکەتی حاجی موشیر ەوە لەناوچەی قەراخ ئەمەش هەر لەسەر حالەتی جیابونەوە بوو.

ئەگەر حیزب حیزب بیت بەگرتنی کەسیك کۆتای نایەت دیارە ئەوە فکرە نەبووە حیزب و ریکخراونەبوە ئیستا هاورییانی ئالای شۆرش لەناو یەکیتیدا خەبات دەکەن و پلەو پایەیان هەیە ململانی لەئارادانییە ئەمرۆ مام جەلال پشگیرییەکی گەورەی کاك مەلا بەختیار دەکات چەند پۆستیکی گەورەی سیاسیی شیپیداوە دەتوانم بلیم دەسەلاتی یەکەمە لەناو یەکیتیدا ئەوەی کەوتمان هەمووی راستە بەلام مەلا بەختیار یش کەسیکی چالاك وئیش کەرە

**نەوشیروان مستەفاو ئالای شۆرش**

**شیخ کامیل دەلیت:** کاك نەشیروان هەمیشە بەهەلویستیکی سیاسیەوە دەچوویە ناو شتەکانەوە لەگەل ئالای شۆرشداو ئالای شۆرشیش زیاتر ناکۆکییەکانی قولتر دەکردەوە ئەو

بیروڕای کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی جیگیر کردبوو لە کوردوستاندا دەتوانم بلیم کاك نەوشیروان لەگەل زۆرکەسدا توندبوو چونکە ئەو یەکیك بوو لەوکەسانەی دەرکی بە بابەتە سیاسییەکان دەکردوو لەشاخیش کەسیك بووە دژ بەگەندەڵی حەزی بە ڕەوشتبەرزی و جوانی ودەستپاکی پیشمەرگە دەکردوو دەیویست شۆرش لەریگای ریکخراویکی توندوتۆلی وەك کۆمەلەوە دریژە بخایەنیت وکاربکات ئەو سەردەمانەی کەچوومە دەرەوە راستە مام جەلال سکرتیری گشتی بوو بەلام ئەوەی زیاتر کاری لەبەر دەرۆیشت ودەسەلاتی زیاتری هەبوو کاك نەوشیروان بوو

## ئالای شۆرش و حوکمەتی عیراق شیخ کامیل لەمبارەیەوە بە مجۆرە دەدویت

بیگومان سروشتی خەباتی ئەوسەردەمە وابووە تاکە شۆرش کەلەسەر پیی خۆی وەستابیت شۆرشی نویی گەلەکەمان بوو ئاشکرابوو کەهیچ لایەن و ریکخراویك بەبی هاوکاری حوکمەت ناتوانیت دروست ببیت ئالای شۆرش بەئاشکرا مام جەلال و کاك نەوشیروان و کاك فەرەیدون یان دەکرد یەکیتی حەزی نەدەکرد ئەوان لەیەکیتی جیاببنەوە لەلایەکی ترەوە ئەو چالاکییەی کەلە شەقامی مەولەوی کرا بۆ کوشتنی پاریزگاری سلیمانی مەلا بەختیار دەوری کەمی نەبوو. سەرەتا وەك کەسیکی عەسکەری ودواتر وەك سیاسی. یەکیك بوو لە هاوری نزیکەکانی شەهید ئارام. شەهید ئارام یەکیك بوو لەهەرە گەورەکانی ناو یەکیتیی بەحوکمی ئەوەی خەلکی لەناو شاردا دەناسیی و ئەو سەردەمەش پیشمەرگە کەم بوو، ئەمانە پال پشتبون بۆ ئەوی ئالای شۆرش ئەوکاربکات

## سالی ١٩٨٣بەفەرمانی پارتی پانزە هەزار دینارم دا بەئالای شۆڕش بۆ جیاکردنەوەیان لە یەکیتی، ئەگەر ئەو پلانە سەری بگرتایە یەکیتی شەش کەسی نەدەمایەوە

**دیداری ئەحمەدووهیمن ویاسین**

**لەتیفی حاجی فەرەج** یەکیکە لەسەرکردە مەیدانییە سەربازییەکانی یەکیتی نیشتیمانی، وەکو خۆی دەلیت ٢٣سال لەناو پارتیو دەزگای پاراستن کاری کردو بۆ١٣سالیش دەچیت هاتۆتە ناو یەکیتی نیشتیمانی کوردوستانەوە، کەپارتی بووە کەسی نزیك و باوەرپیکراوی ئیدریس بارزانی و مەسعود بارزانی بووە، ئیستاش لە هەمووکەس زیاتر نزیکە لە مام جەلال ـ ەوە، حالی حازر راویژکاری تالەبانییە لەوەزارەتی ناوخۆی عیراق.

**لەتیفی حاجی فەرەج** لەنزیکەوە ئاگاداری بریارە سیاسییەکان و کیشەی ناوخۆی حیزبەکانەو لەهەمووشت گرنگتر ئەوەیە بەراشکاوی دەست دەخاتە سەر کیشەکانوو بی پەردە باس لفە شتەکان دەکات، بەر لە راپەرین، **لەتیفی حاجی فەرەج** بەرپرسی ریکخستنی ناوشاری سلیمانیی پارتیو بەرپرسی پاراستنی سلیمانی پارتیوو بەرپرسی دەزگای پەیرەوانی ریبازی بارزانی بووە کەسەربە کاك مەسعود بووە. بۆخۆی ئاماژە بۆ ئەوەدەکات کەلەسالی ١٩٨٣نوینەری پارتی بووە بۆجیاکردنەوەی ئالای شۆڕش لەیەکیتی بەسەرۆکایەتی مەلا بەختیار، لەم بارەیەوە دەلیت: بەفەرمانی پارتی پانزەهەزاردیناری ئەوسەردەمەو ئامیریکی چاپی فۆتۆ کۆپیم پیدان و گەردونی برای شەهید بیستون بۆی بردن بۆبەری قەرەداخ.

ئەو وتی سەعاتی سفرمان دانابوو بۆ راگەیاندنی جیابونەوەی ئالای شۆڕش لەیەکیتی ئەگەر ئەوپلانە سەری بگرتایە، هەرئەوکاتە بالیکی بەهیز لەیەکیتی جیادەبووەوە یەکیتی شەکەسی نەدەمایەوە بەلام بەهۆی ئەوەی من نەمتوانی ئەو بروسکەیەی کەپیم بوو لەکاتی خۆیدا بیگەیەنمە مەلابەختیار پلانەکە هەلوەشایەوە و لەلایەن کاك جەبارفەرمان و ئەوانەوە مەلا بەختیار دەستگیر کرا

هەرچەندە لەدوای روداوەکانی سالی ١٩٩٦ەوە چوتە ریزی یەکیتی نیشتیمانییەوە بەلام بەخیرای توانی جیگای خۆی لەنیوو ئەوحیزبەدا بکاتەوە وببیتە جیگای متمانەی

سەرکردایەتی ئەوحیزبە بەتایبەتی کەسی یەکەمی حیزب کەخودی تالەبانییە لەگەڵ ئەوەی بەبەردەوامی جەخت لەوە دەکاتەوە کەئەوبالی هیچ کەس نییەو کوتلەبازی ناکات بەلام بۆ چونەکانی واپیشان دەدات کە کەسینزیکی تالەبانی بیت لەبەرئەوەی لەتیفی حاجی فەرەج یەکیك بووە لەبەشدارانی پلینۆم لڤین بەهەڵی زانی کە دیداریکی لەگەلدابکات و چەندین پرسیاری ئاراستە بکات لەوانە ناکۆکییەکان لەکاتی پلینۆم و دوای پلینۆمدا هەروەها بابەتی فایلدارەکانی ناویەکیتی و بالادەستی بنەماڵەی تالەبانی بەسەردارایی و سیاسەتی یەکیتیدا

**لڤین: لە پلینۆمەوە دەستپیدەکەین، خەلکی**

**بەگشتیی و کاردانی یەکیتیی پییان وایە پلینۆم نەیتوانیوە سەرکەوتن بەدەستبهینیت؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** پلینۆم لەسەر بنەمای ئەوە دروست بووە کە تەکەتول نەمینیت تەکەتول بوو یەکیتی کردبوو بەچەند پارچەیەکەوە کوتلەیەکیان سەر بەکاك کۆسرەت بوو کوتلەیەکیتر سەربە کاك نەوشیروان بوو کوتلەیەکیش سەربە مام جەلال بوو ئیمەش هەلبچاردنی ئەم جارە((**من و کاك حامیدی حاجی غالی و مەحمودسەنگاوی وعەتا سەراوی** )) دابەش بووین بەسەر ناوچەکانی هەلبژاردندا بۆ ئەوەی هیمنی هەلبژاردنەکان بپاریزین بەلام لەلایەن هەندیك برادەرەوە کە زۆربەتوندی ئیشی بۆ تەکەتولی خۆی دەکرد زەختمان لەسەربوو ئیمەش سەردانی هەموو ناوچەکانمان کرد هەمووکەس ئاگادارە کەبالی گشتی لە هەلبژاردنەکاندا کەبالی مام جەلالە سەرکەوتنی بەدەستهینا هەرچەندە مام جەلال نەتەکەتولی هەبووە ونەتەکەتولیشی کردووەو ئەو حەزبەپاراستنی یەکیتی وناو یەکیتی دەکات بەلام لەم دواییانەدا کەلەبەغدابوو برادەران ئیمزایان کۆکردبوەوە دژی مام جەلال ئیتر شتەکە قورستربوو بۆ ئەو خۆتان دەزانن لە هەموو هەلبژاردنیکدا فیل لە یەکتری دەکریت ئیتر ئەنجامەکەی ئەوە بوو جەنابی کاك نەوشیروان کە دەیویست چاکسازی بکات و گەندەلی نەهیلیت لە حیزب و حوکمەتدا سەرکەوتنی بەدەستنەهینا ئەوەبووکاك نەوشیروان کشایەوە دوای ئەوە بەمەبەستی پاراستنی یەکیتی پیویست بوو پلینۆم رابگەیەنن بۆ پرکردنەوەی بۆشاییەکان پلینۆم دەسەلاتی ئەوەی هەیە ٣/٢ی سەرکردایەتی بگۆریت بەلام ئەمجارە بۆ ئەوەنەبوو بەلکووبۆ چەند شتیکی تربوو لەوانە تاوتوی بابەتی فایلەکانی چەند ئەندامیکی سەرکردایەتی یەکیتی لیژنەیەك پیکهات بە سەرپەرشتی. د.کەمال و جەمال ئاغاو چەند کەسیکی تر لەپلینۆمدا رایەك دروستبووکەئەوکەسانە

هەستن وباسی خۆیان بکەن چیان کردوەوە چیان نەکردوە هەموو ئەوانە برادەرمانن ئەگەر شتیکی واشیان کردبیت دیارە بۆپاراستنی مال و مندال وکەسوکاریان ئەوکارەیان کردوە ئیتر ئیمە دەبینین لەومەسەلانەدا هەندیك کەس خۆراگرەو هەندیك کەسی دیکەش دەروخی لەشۆرشدا چەندکەسیك هەن ناروخین و خۆراگرن وەکو کاك شەهاب و هاوریکانی کەئیعدام کران بەلام دیارە ئەم برادەرانەی تر نەیانتوانیوە خۆراگربن من پیموایە هۆکاری باسکردنی فایلەکان دەگەریتەوە بۆ تەکەتولەکانی ناو یەکیتی کەدەیان نوسیت یەکتری بشکینن ئەمجارە لە پلینۆمدا مام جەلال بۆ ئەوەی یەکریزی حیزب بپاریزیت لیبوردنیکی راگەیاند چونکە ئەوشتە راستنەبووە لیژنەی لیکۆلینەوەش هەیە ئەگەر شتیکی وا هەبیت با بمینیتەوە تا کاتی کۆنگرەو لەویدا ئیعلانبکریت، بەلام. بەهەرحالّ مام جەلال دووربینەونەیویست بارو دۆخی ناوحیزبەکەتێك بچێت، لەوەیەبرادەرێك هەڵەیەکی کردبێت، دیارەکۆمەلێك لابرادەری دیکەش عادزدەبن و لێی دووردەکەونەوە، یەکێتی نیشتمانی دووژمنی زۆرەو دوژمنەکانی هەموو لەسەنگەردابوون بۆی، ئەوەتاخۆتان دەبینن لەکەناڵەکانەوە چەندەبەخراپ باسی یەکێتی دەکرێت. . دوای ئەوەی مام جەلال وتارەکەی خوێندەوە لێبووردنی ئەوبرادەرانە خرایەناو دەنگ دا نەوەو ئەوەش لەدەسەلاتی پلینۆمە کەلە یەکێك خۆش بێت یان نا، ڕاستەهەندێك ناڕەزاییی هەبوو کەهەندێك برادەر هەستان و وتیان، ئێمە برامان شەهید بووەو لەئەنجامی ئەمانەوەبووە کەئەوان شەهید بوون.

من حەزدەکەم شتێکی حەقیقەتتان بۆبگێڕمەوەلە فایلەکانی شوعبەی موخابەراتی کەرکووك کەئێمە چووین فایلەکانمان هێنا، خەڵکی تێدابووەدەڵێت فلاّنی کوڕی فلاّن دووگەنجی بەگرت داوەو ئیعدامکراون و(١٢٠) دیناریش بەخشیشی وەرگرتووە، دیارەحەقەئەمەبگیرێت و لەسێدارەبدرێت، ئەم برادەرانەی کەباس دەکرێن فایلیان هەیە، شتێکی مەلوسنییە کەشتێکی وایان کردبێت ، بەلاّم زیاترخۆتان دەزانن کەیەکێتی دوژمنی زۆرەو ئەوانەی لەیەکێتی لایان داوە یان ئەوا نەی لەئەوروپابوون، هەندێ شت دەنوسرا زیاتربۆشکاندنی ئەوبرادەرانەبوو،

**لڤین: دەوترێت پلینۆم ئیعرانی سەرکەوتنی کوتلەی تالەبانی بووە؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** کوتلەکان هەمووی یەکێتین، بەلاّم دیارە کۆمەڵێك خەڵك ئەم کوتلەو کوتلەبازییەیان دروست کرد بۆئەوەی پێی بچنەپێشەوە، ئێستە زۆرکەس هەیە

وەزیرەیـان سـەرکردایەتییە، یـان بەرپرسـی مەڵبەنـدە، ئەگەرکوتلەنەبووایـە نەدەچـووە پێشەوە، بەحەقی خۆی نەچووەتەپێشەوە، لەبەرئەوە مـام جـەلال چارە سـەری حیزبەکـەی بەوشـێوەیەکرد، خۆشـتان دەزانـن مـام جـەلال تەمـەنیکی دوورو دریـژی هینـاوە نایـەویت لەئیستادا حیزبەکەی ئینشیقاقی تیبکەویت راپۆرتەکەی مام جـەلال راپـۆرتیکی زۆر خـراپ نەبوو زۆرباش بوو بۆئـەو رۆژە دەبوایـە راپۆرتەکـە وابوایـە دەبوایـە راپۆرتەکـە بـارودۆخی یـەکیتی بپاریزیـت ئیـستاش بـارودۆخی یـەکیتی بەرەوباشـتر دەروات کادرەکـان بەخۆیانـدا دەچنەوە ئەو تەکەتولەش بۆ خۆی ژەهریکی کوشـندەیە و پیویـستە لەناوبـچیت ومـن خـۆم ئایندەیەکی باش دەبینـم رەنگە لەکۆنگرەدا ئەگەر مانگی دە بگیریت کۆتاییبیت و لەوانەیە سەرکردایەتی باشتر بیتە پیشەوە

**لڤین: بۆ لە پلینۆمدا ئەنجامی لیژنـەی لیکۆلینـەوەی فایلـەکان نەخرانـە روو لەکاتیکـدا لیژنەی لیکۆلینەوە**

**لەفایلەکانی خۆیان ئامادەبوون لەویدا؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** خرایە روو بەلام بەتیکرای دەنگ عەفووکران لەوکاتەدا مام جەلال داوای عەفوی بۆ کاك شالاوی علـی عەسـکەریش کـردوو بەوهۆیـەوە جـەمال ئاغـا توورەبـوو چووە دەرەوە بـەلام دوای هینایانـەوە بۆنـاو هۆلەکـە د.کـەمال فوئـاد یـش وتـی مـن پاشـگەز نابمەوە لە لیکۆلینەوەکە دیـارە ئـەوانیش بیتاقـەت بـوون لـەوەی کەپرسـیاریان پینـەکرابوو چونکە دەبوو ئەوان سزای فایلدارەکان بدەن نـەك پلینۆم بەلام بەهەرحال ئەوەی کرابوو بۆ پاراستنی حیزب بوو لە ئینشیقاق و دووبەرەکی و دوورکەوتنەوە لە حیزب

**لڤین: دەوتـریت زۆربەی ئەوانەی کەفایلیان هەیە لە سەرکردایەتی لە کوتلەی تـالـەبانین و سوربونی مام جەلالیش بۆ لیبوردن لە فایلدارەکان هەربۆ ئەوەی دەگەریتەوە؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** ئەوانەی کەباس کران یەکیتین کوتلەی مام جەلال نین مام جـەلال وەك باوکیك وایە و لە واقیعیشدا هیچان کوتلەی ئەونین

**لڤین: بەلام کەسیکی وەکو سەعدی ئەحمد پیرە پـالیوراوی کوتلـەی ئـەوبوو بـۆ بەرپرسـی مەلبەندی هەولیر؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** کاك سـەعدی ئەحمـەد پیرە پیـاویکی بەتوانایـە تـوانی جیدەسـتی خۆی دەرخـات لـەم چـەند سالەی دوایـدا بـەلام کـاك سـەعدی دیـارە نـاکۆکی هـەبوە لەگـەل

برادەرەکانیدا کە سەرەنجام ئەوەشیان بۆ دروست کرد خۆتان دەزانن ئەوەی لەمام جەلال نزیك بیت ئەوانی دیکە دیعایەی بۆ دەکەن ئەوەی لەکاك کۆسرەت نزیکبیت ئەوانی دیکە دیعایەی بۆدەکەن لەبەرئەوە چ کاك سەعدی و چ کاك ئاسۆ ئەلمانی و چ کاك مستەفا چاورەش یان کاك شالاو هەمویان بیتاوانن من ئیستاش داوادەکەم ئەگەر بەلگەیەك یان شتیکی مەلوس هەیە کە ئەوان شتیکیا کردوە بابخریتە روو من ئیستا بەلگەم لایە کە خەلك ئەنفالی کردووەو ئیستاش لەناوماندا دەژین و بگرە حیزب یارمەتییان دەدا لەبەرئەوە بەرای من باشتر وایە پەرەیەکی سپی هەلبدریتەوە من ترسی ئەوەم هەیە ئەگەر سبەینی شتیك لەم ناوچەیەدا رووبدات کۆمەلیك فایلی تریش لەودیوەوە دەربکەویت موخابەراتی سوریمان هەیە لەوانەیە خەلکیك موخابەراتی تورکی یان ئیرانی بیت ، ئەوشتانەی من لە شوعبەی ئستخباراتابینیم وای لیکردووم بلیم کورد هەمووی سەربەحکومەت بووە، ئەم هەموو فەردەیەی کەمن هینامەوە لەو شوینە هەم وی ناوی جاسوس بوو، وای لیهات تاقەت مان نەما سەیربکەین، ئەو خەلکە دوای را پەرین چ پیویست دەکات پەیوەندی بە حکومەتەوە بکات، ئەوانەی دوای راپەرین پەیوەندییان بەحکومەتەوەکردووە، هەرئەوانەن کەپیشترسەربەحکومەت بوون.

**لڤین: ئایا پاینۆم دەسەلاتی لیخۆشبو ونی فایل دارەکانی هەیە لەکاتیکدائیمە پەرلەمان و دادگامان هەیە. ئەمانەئەگەرخیانەتیان کرد بیت، خیانەتییان لەگەلی کورد کردووە، بۆچی یەکیتی ئەم داد گاییکردنە ناداتەدەستی حکومەت؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** هەرحیزبەو تایبە تمەندیی خۆی هەیە، ئەگەریەکیتی فایلی هەبوویت ئەوا هەمووحیزبەکانی تریش فایلیان هەیە. من وەك وتم یەکیتی دووژمنی زۆرە، لەوا نەیە پەلەش کرابیت لەوەی کەمیك زووباسی فایلەکانیان کرد، دەبوایە لیکۆلینەوەی لەسەربرایە، پاشان ئیعلان بکرایە نەکو ناوزراندنی تیابیت. بەلام منپیت دەلیم ئەگریەکیك خیانەت لەکورد بکات، حەقە پەرلەمانی کوردستان لیژنەی هەبیت و لیکۆلینەوەی لەگەل بکات، وابزانم ئیستاپەرلەمان بۆخۆی لیژنەی هەیە، بەلام بۆچی ئەولیژنەیە بۆبەوکارە هەلنەساوە؟ پەرلەمانی کوردستان ئەگەربەلگەی لایە ئیستاش دەتوانیت فایلەکان بانگ بکات، بەلام ئایادەکریت لەم کاتەدا کەکاتی نزیکبوونەوەی پارتی ویەکیتییە ئەم کارەبکەین؟ من بڕوام وا یە هەکەسیك لەوا نەی کەفایلی هەیە لەناخی خۆیدا ئەوەندەخۆی دەخواتەوە هەتاتوشی نەخۆشی دەبیت و لیدەبیتەوە. ئەوەی فایلی

هەیەو ناوی بلاو کراوەتەوە بۆخۆی خۆی دەناسێت ودەزانێت کەخائین بووەو فایلی هەبووەو خۆی باش دەزانێت بایبی چەندە، لەبەرئەوە ناوزڕاندنی ئە وبرادەرا نە ڕست بێت وڕاست نەبێت تازە لەناو میلەتەکەداشکان.

**لڤین: دەوترێت مام جەلال لیستی تایبەتی خۆی هەبووە و ویستویەتی کوڕەکانی خۆی بەرێتە پێشەوە، بەلام بۆی نەکراوە، ئایامام جەلال بەدوای شێوازێکی پارتییانە دەگەڕێت بۆ یەکێتی؟؟؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** مام جەلال لەوەگەورەترە کەئەوکارا نەبکات نەکوتلەی هەیەو نەلیستی هەبووە، مام جەلال پیاوێکی خۆشەویستە لەناو یەکێتیدا، خوا ئەوەبگرێت کەدەیەوێت بێتاقەتی بکات، مام جەلال تەمەنێکە هەیەو حەق نییە وا مامەڵەی لەگەڵبکرێت. ......... کاتێك شارۆن لەکۆبونەوەدا جەڵدەلێیدا، وەزعی ئیسرائیل تێکچوو، کاتێك مەلا مستەفا کۆچی دوایی کرد، کاك ئیدریس و

کاك مسعود پێگەیشتن و حیزبەکەیان گرتەدەست، بەلام مام جەلال خەلیفەی نییە.

**لڤین: ئیستا خەلکی ناو یەکیتی دەپرسیت ئایا لەدوای مام جەلالەوە کەسیکی دیکە هەیە جلەوی یەکیتی بگریتەدەست؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** ئیستا نەخر لەم حالەتەدا نەخیر کەسیك نییە جیگەی بگریتەوە هەرچەندە ئیستا مام یجەلال تەندروستی باشە لەم رۆژانەدا د. محمدخۆشناو چوو فەحسی کردبوو وتی مام جەلال هیچی نییەوە ئیستاش بۆکس لە هەریەکیکمان بات دەمانخات ئەوبرادەرانە هەموویان بۆحۆیان نەخۆشن ومام جەلال هیچی نییە لەدوای پلینۆم رق وکینە لەناو کوتلەکاندا لادروستبوە دەبیت ئەم رق و کینەیە لەم کۆنگرەیەدا نەمینیت

**لڤین: لەکۆنگرەدا مام جەلال سکرتێرییەکەی مسۆگەرە؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** ئەوە مام جەلال خۆی دەتوانیت بریاربدات بەلام پیموایە مام جەلال ئەگەر لەسەرکورسییەك دابنیشیت و تۆپەلیکیشی مابیتەوە وەکو رەمزیك بۆ یەکیتی گرنگە هیچ کەسیك تامی مام جەلال نادات

**لڤین: مام جەلال ئەجیندایەکی هەیە بۆ ئەوەی کورەکانی خۆیبینیتە پیشەوە؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:**ئەگەر سەیری رۆژهەلاتی ناوەراست بکەی هەموو ئەوسەرۆکو حیزب و ئەو سەرۆك کۆمارانە کورەکانی خۆی دەهیننە پیشەوە ئەمەش لەبەرئەوەی

کەسیقەی پییەتی کاك قوباد نوینەری یەکیتییە لە ئەمەریکا لەهەر جیگایەکدا بیت بە جوهدی خۆی گەیشتووە پیی شاناز خان لەوانەیە خەلك وابزانیت ئافرەتیکی سادەیە شانازخان کەسیکی هەلکەوتووە لەبەریتانیا ئیش بۆ کورد دەکات ئەگەر ببیتە سەرکردایەتی حەقی خۆیەتی باشە ئەگەر کاك قوبادیان کاك باڤیل یان شانازخان بروانامەی هەبیت لیرە بیت بە وەزیر یان سەرکردایەتی قەیدی چییە؟

**لڤین: یەکیتی خۆی بەهیزیکی شاری دەزانیت، بەلام بۆچی ئەم بنەمالە پیبوونەی تیادا زالدەبیت؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** باشەبۆچی کەسوکاری مام جەلال بۆیان نەبیت ئیش بگرنەدەست لەکاتیکدا ئەوان زۆربەیان پیشمەرگە بوون بۆ نمونە شیخ حەمەسالح کە برازای مام جەلالە یان ئاراس شیخ جەنگی پیشمەرگە بووە پاڤیل و قوباد پیشمەرگە بوون

**لڤین: دەوتریت دارایی یەکیتیی لە دەستی بنەمالەی تالەبانیدا نەك دەزگایەکی تۆکمەو شەفاف و ئەوان بە ئارەزووی خۆیان تەسەروفاتی پیوە دەکەن؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** هەموو حیزبیك بۆ ئەوەی ئیدامە بە حیزبەکەی بدات دەبیت داهاتیکی هەبیت یەکیتی نیشتیمانی بۆ خۆی داهاتی هەیە هیرۆ خان هەرچی پەیدا دەکات هەرچی دەست دەکەویت لە کوردوستاندا کە کەنالیکی جیهانییە سەرفیدەکات

**لڤین: ئەگەر پارەی یەکیتی نییە هیرۆ خان پارەی لە کوییوو؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** هەرریکلامی کوردوستان بەسە کەوەریدەگریت ئەم کوردساتەی کەدانراوە زمانحالی یەکیتی نیشتیمانییە لەوانەیە دارایی گشتی داهاتیکی بۆ دانابیت ئیرادەی گشتی یەك کەس دەیبات بەریوە کە دلیری سەید مەجیدە پارەی یەکیتی نیشتیمانی لە دەستی ئەودایە پیاویکی پاکەو زۆر دەست بەپارەوە دەگریت پارە بەفیرۆ نادات جیگای متمانەی مام جەلال و هەموو حیزبیشە راستە یەکیتی هەندی پرۆژەی هەیە لە ناوەوە دەرەوە بەلام نەمام جەلال و نەهیرۆخان نەقوبادوو نەپاڤیل و پیویستیان بە پارە نییە چونکە ئەوان هەریەکەیان ئیشی خۆیان دەکەن بەبنەمالەش هەمووحیزبەکان لەوە چونە تەدەرلە مالی مام جەلال کۆمەلیك خەلکی خاوەن برزانامەو زمانزان دروستبوە دەتوانن ئیشبکەن ئەمە بنەمالەی پینا وتریت

**لڤین: لەدوای وازهێنانی بەشیکی زۆری سەرکردە چالاکەکانی یەکیتی لە سلیمانی دەوتریت سلیمانی وازی لە یەکیتی هیناوە؟**

**لەتیفی حاجی فەرەج:** ئەو برادەرانەی کەباسیان دەکەن هەمووتەمەنی خۆیان لەو شۆرشەدا سەرفکردووە

کاتی ئەوەهاتووەو پشویەك بدەن لەم دواییانەشدا کەتەکوتولەکان زەقبونوە ئەمان حەزیان نەکردووە بچنە پال هیچ تەکەتولیك ئیستاش ئەوانە سەردانی مام جەلال دەکەن وکیشەیان نییە ئەوانەی باسی سلیمانی و هەولیری دەکەن مام جەلال((**د.بەرهەم** ))ی هیناوەتە پیشەوە کەخەلکی سلیمانییە سلیمانییەکان نەکشاونەتەوە لە یەکیتی ئەوبرادەرانە ئیشی تریان هەلبژاردوە

## میراتی پیاوەنەخۆشەکە دابەشدەکریت بۆ ئەم راپۆرتە : گفتوگۆ لەگەل کەسی نزیکی هەمووبالەکان کراوە

### راپۆرتی هیمن باقر

نەخۆش کەوتنی تالەبانی لەگەلخۆیدا بابەتگەلیکی زۆری ورووژاند هەندیك کەس ئەو نەخۆشییەی تالەبانی یان بەنەخۆشکەوتنی یەکیتی چواند بەشیرپەنجەی تەکەتول هەندیکی دیکەش سەردەمی نەخۆش کەوتنی تالەبانی یان بەجۆریك لە جۆرەگانبەسەردەمی((پیاوە نەخۆشەکە))ی دەولەتی عوسمانی وەسفکرد کەلەدوای ساتەکانی تەمەنیدا گیرۆدەی بوو بەراوردەکە هەرلەو روانگەیەوە نییە کەدووجەستەی مەعنەوی روولەلاوازبوونی گەورەدەکەن بەلکووئەوەشە کەکۆمەلیك میراتگر کاتژمیری سفری دابەش کردنی تالەبانی دەکەن بەهەمان شیوەی ئەو میرات گرانەی کەچاوەری میراتی دەولەتی عسمانی بوون

بەپیچەوانەی هەمووپیشبینییەکانەوە تالەبانی چاك بوەوەو گەرایەوە دۆخی جارانی بەجۆریك رەنگە مەرگی تالەبانی بۆ چەند کەسیکی دیکەش دوابکەویت لەگەل ئەوەشدا چاك بونەوەی تالەبانی بەمانای چاك بونەوەی یەکیتی نەهات هەروەها دەرگاشی لەسەر ئەوپرسیارە دانەخست کەدوای تالەبانی کی جیگەی سکرتیری گشتی دەگریتەوە؟ ئیستا جموجۆلەکان لەناویەکیتیدا بەو ئاراستەیەن لەسەر تەختەی شەترەنجەکە سی یاریکەر دەبینرین بەلام دواجار تەنها یەکیك لەوانەی چانسی چوونە پیشەوەی دەبیت هەنوکە یارییەکە کورتبووەتەوە لەنیوان نەوشیروان مستەفاو کۆسرەت رەسول و علی بەرهەم سالح سەرەرای ئەوەی کە کوتلەی چوارەمیش بەکالی دەبینریت کەبریتییە لەبنەمالەی تالەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد بەلام دەشیت هەرلەسەرەتاوە لەناو یارییەکاندا ئەمەیان بهینیە دەرەوە لەو پییەی هیشتا یاریزانیکی پینەگەیشتووی گۆرەپانەکەن بەلام هەرگیز نابیت ئەوە لەیادبکەن کەرەنگە کوتلەی چوارەم رۆلی یەکلاکەرەوە بگریت لەم مەسەلەیەدا

نەوشیروان مستەفا ئەمین لەدایك بوی شاری سلیمانییە لەسالی ١٩٤٤ ە، پەیوەندییەکانی لەگەل تالەبانیدا لەسەرەتای شەستەکانی سەدجەی رابردووەوە دەستپیدەکات ئەوکاتەی تالەبانی لیپرسراوی لقی سلیمانی پارتیبوە نەوشیروان لەسەرەتاکانی کاری سیاسیدا دەچیتە

ناو بالی مەکتەبی سیاسی ولەسالی ١٩٦٩دا دەبیتە سەرنوسەری گۆڤاری رزگاری کە زمانحالی بالی مەکتەبی سیاسی بووە پاشان کۆلیژی ماف((حقوق)) لە زانکۆی بەغداد تەواودەکات و لەسەرەتای سالانی حەفتای سەدەی رابردوودا بۆتەواوکردنی خویندن دەچیتە ئەوروپاو لە نەمسا دەگیرسیتەوە بروانامەی ماستەر لەسیاسەتی نیودەولەتیدا بەدەست دەهینیت و دەبیتە خویندکاری دکتۆرا بەلام سالی ١٩٧٥بۆ نەوشیروان سالی وەل گەرا ن بوو لە خویندنەوە بۆ سیاسەت کردن چەنکە لەم سالەدا تالەبانی لەریی نامەیەکەوە پیشنیاری دامەزراندنی پارتیکی سیاسی و سەرهەلدانەوەی شۆرشی بۆ دەکات نەوشیروان مستەفا وەك ئەوەی چاوەریی نامەیەکی لەو جۆرەبیت وازلە خویندنی دکتۆرا دەهینیت و بەرە شام بەریدەکەویت بەشداری یەکەم کۆبونەوەی دامەزراندنی یەکیتی دەکات

نەوشیروان یانزە سالە بەلام تالەبانی هەمیشە وەکو هاورییەکی نزیك سەیردەکات ئەم هاورییەتییەش بەدەر نەبوو لەکارتیکردن وکاریگەری دوولایەنە بەجۆریك هەندیك کەس نەوشیروان مستەفا بە تیۆریزەکەری بیری جەلالیەت دادەنین زیاتر لەوەی وەك سەرکردەیەکی کۆمەلە سەیربکەن نەوشیروان بۆخۆی لەیاداشتەکانیدا ئەوە ناشاریتەوە کەدلسۆزیی ووەفایەکی گەورەی هەبوو بۆ تالەبانی هەروەك نابیت ئەوە لەبیربکەین کەخودی نەوشیروان بانگیشتکراوی تالەبانییە بۆ سەر سفرەی یەکیتی

بەدریژای میژووی ١٥ سالەی یەکیتی لە١٩٧٦ـ١٩٩١ هەمیشە نەوشیروان مستەفا لەبەرەی جەلالیەت بووە لەبەرامبەر ئەوجیابوونەوانەی کە روویداوە لەسەرەتای هاتنەوەیدا بۆ کوردوستان لەسەر خەتی گشتی حساب بووە بەلام لەدوای شەهیدبوونی((ئارام)ەوە لەناو کادیرە پیشکەوتوەکانی کۆمەلەدا کەسیك نەبوو بتوانیت جیگەی سکرتیری بگریتەوە یان بە دیویکی تردا کادیرە پیشکەوتوەکانی کۆمەلە لەناو خۆیاندا رینەکەوتن لەسەر هەلبژاردنی سکرتیریك بەلام هەموویان کۆك بون جیگای(ئارام)بە کاك نەوشیروان پربکەنەوە چونکە لەو سەردەمەدا رەمزیکی دیار بوو خوینەواریکی دیکەی وەکو ئەو لەناو کۆمەلەدا بونی نەبوو بەمجۆرە نەوشیروان بووە خاوەنی گەورەترین بالی پیکهینەری یەکیتی وتەنانەت رابەرایەتی یەکیتیشی گرتەدەست لەگەل ئەوەشدا دەشیت بوتریت نەوشیروان پراکتیزەریکی فیکری تالەبانی بوە لە ئاستە لۆکالییەکەیدا بۆناو پیشمەرگەو ریکخستنەکان دەوتریت تالەبانی هیچ کات بەرەنگاری نەوشیروان نەبووە لەوەی کە

تەرحەفیکرییەکانی خۆی لەناو یەکیتیدا بلاوبکاتەوە و جیبەجیان بکات چونکە دواجار هەستی بەوەکردوە کەفیکری نەوشیروان لەمندالدانی فیکری خۆیەوە سەرچاوەیگرتوە

بەلام یەکەمین بەرکەوتن لە نیوان تالەبانیو نەوشیروانیدا لەدوای راپەرینەوە روودەدات کاتیك یەکیتی رووبەرووی ئەزموونی ئیدارەکردنی ولات و هاوبەشی و ریکەوتن دەبیتەوە لەگەل پارتیدا هەندیك ئەمە بۆ ئەوە دەگیرنەوە کە تالەبانی ئەزمونی لەگەل ئیدارەکردندا زیاتر بووە لە نەوشیروان کە لە شۆرشی تەموزەوە دەستپیدەکات ئەوەی نەشیروان نەیتوانی قوبولیبکات ئەو راستییەبوو کەلە ئەزمونی حوکمداریدا بەرژەوەندی زال دەبیت بەسەر بەهاکانی شاخدا بەواتایەکی کە دەشیت کەسەکان لە دەوری بەرژەوەندییەکان کۆببنەوە و حیزبیش ئەرکی ئەوەیە ئیدارەی بەرژەوەندی یە جیاوازەکان بکات لەدوای ئەوەوە نەوشیروان ودەبیت لەسەر گۆرەپانی سیاسی و لە دەرەوەی ولات خەریکی نوسینی چەند کتیبیك دەبیت و تا سالی ۱۹۹۹دەرناکەویتەوە کاتیك گەرایەوە یەکیتی لەشەری ناوخۆدا جەستەی شەلالی خوین ببوو هاتنەوەی ئەمجارەی نەوشیروانیش دیسان لەسەر داوای تالەبانی دەبیت ئەوەی تیبیمی دەکریت لە ژیانی نەوشیرواندا ئەوەیە کەسایەتی بەهیزوو کاریگەر بووە لە بەرامبەر تالەبانیدا و ناچاری کردووە ریزیبگریت وهەندیك جاریش سلی لیبکاتەوە بەلام ئەوەی تالەبانی نەیتوانیوە بە شیوازە تایبەتەکەی خۆی کە تورەبوون و قسەی زبرو هندیك جاریش لیدانە بەنەوشیروانی بکات لەریگای نازی هاورییەتییەوە پییکردووە بۆنمونە هەمووئەوجارانەی کەتۆراوەو دوورکەوتۆتەوە بەقسەیەکی تالەبانی گەراوەتەوە هەتا ئیستاشی لەگەلبیت لە هەندیك رەفتاری تالەبانی بیزارە بەلام وەکو هاوری و سکرتیر نەیتوانیوە دەستبەردانی تەواوەتی تالەبانی ببیت

نەوشیروان مستەفا لەسالی ۱۹۹۲لە کوردوستان دور دەکەویتەوە بەلام رەمزیکیتر لەناویەکیتیدا دەردەکەویت ئەویش کۆسرەت رەسول علی یە ئەوەی چانسی دەرکەوتنی زیاتر کرد هەلبژاردنی بوو بەسەرۆکی دووەمین کابینەی حوکمەتی هەریمی کوردوستان ئەمە جگە لەوەی وەکو سەرکردەیەکی سەربازی ئازا لەپرۆسەی راپەرین و رزگارکردنی رانیەو هەولیردا رۆلی گەورەی گیرا

کۆسرەت رەسول. سوودی لە پیگە سیاسیی و حوکمیەکەی بینی بۆ ئەوەی زۆرترین کەس لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە لەمەشیاندا کەسیتی کۆمەلایەتی خۆی رۆلی گرنگی هەبوو گەورەترین سیفەتی کۆسرەت رەسول هیزی راکیشانی ئەوە بۆ کەسایە تییە کۆمەلایەتیی و

هۆزوو خیله جیاوازەکانی کوردوستان دابینکردنی ژیان و بەر ژەوەندییان هەروەها هەولیدا ژیان و بەرژەوەندی تویژیکی گەورەی خەلکی کوردوستان ببەستیتەوە بە خۆیەوە لەمەشدا سودی لەپارە بەردەستی بینی وەکو سەرۆکی حوکمەتی هەریم هەرچەندە کۆسرەت رەسول بەقوتابییەکی قوتابخانەکەی نەوشروان دادەنریت چونکە لەسەر داوای ئەو هاتۆتە دەرەوە سالی ١٩٨٤یش لەسەر پیشنیاری ئەو بۆ سەرکردایەتی هەلبژیردراوە بەلام کاتیك سالی ١٩٩٩نەوشیروان گەرایەوە سلیمانی بینی لەلایەن قوتابیە هەولیرییەکەی دوینیوە کە خۆی بە کەمتر نەدەزانی لەبەرامبەر ئەودا سلیمانی داگیرکراوە ئەمەش ئەو هەستەی لەلای نەوشیروان مستەفا دروستکرد کەدەبیت سلیمانی ئازاد بکریت لیرەشەوە دەستیکردە سلیمانچیتی تەنانەت تاسالی ٢٠٠١کاتیك مام جەلال د.بەرهەم ی گیرایەوە بۆ کوردوستان نەوشیروان مستەفا پشگیرییکرد بەو پییەی سلیمانییەك دیتەوە سلیمانی رزگاردەکات بەلام ئەو پیشبینییە وەکو خۆی دەرنەچوو بەتایبەتی لەبەرئەوەی د.بەرهەم رای وابوو کەسلیمانی دەبیت و بۆ هەمووکوردوستان بیت بەپیچەوانەی نەوشیروان مستەفاکەرای وابوو دەبیت بەر لەهەمووشتیك سلیمانی بۆ خزمەتی سلیمانی بیت دەشیت ئەوە بەخالی سەرەتای ناکۆکییەکانی نیوان د.بەرهەم و نەوشیروان مستەفا دابنریت

یەکیتی لەبنەماوە ٠هیزیکی نیمچە بەرییەو لە دروستبونی سی بالی جیاوازەوە پیکهاتووە لەبەرئەوەی بەدریژای میژووی ٣١سالەی پیویستی بەوەبوو کیشە ناوخۆییەکانی خۆی بنیریتەدەرەوەی جەستەی حیزبەکە هەربۆیەش دەبینین شەر بەرامبەر هیزەکانی دیکە بەشیکی گەورەی میژووی یەکیتی پیکدەهینیت بەپیچەوانەوە لەوکاتانەی ئاشتی هەبووە و بارودۆخ جیگیربووە ململانی و ناکۆکی گەورە لەناوخودی یەکیتیدا سەریهەلداوە هەربۆیە یەکیتی پیویستی بەوە هەبووە بۆ دوور خستنەوەی ئەم ناکۆکییە لەناوەوەی خۆی ناکۆکییەکان ئاراستەی دەرەوە بکات بەو پییەی هەمیشە لەوکاتانەی کە یەکیتی رووبەرووی مەترسی گەورە بۆتەوە و توشی تەنگژەی سیاسی بووە یەکیتی وەکو هیزیکی یەککرتوو تۆکمە و هاوبیرووباوەر دەرکەوتووە لەژیر رۆشنایی ئەم تەفسیرەدا دەشیت بلیین بارودۆخی جیگیری ئەم چەندسالەی هەریمی کوردوستان ململانیکانی یەکیتی زەقکردووەتەوە تا ئاستی تەقینەوەی ئیجگاری رەنگە یەکیتی لەمەدوا پیویستی بە تەنگژەیەکی قوول یان موفاجەئەیەکی چاوەروان نەکراو خراپ یان کارەساتیکی گەورە هەبیت بۆ ئەوەی یەکیبخاتەوە

نوسینی نامەکە. لەلایەن ژمارەیەك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسییەوە ململانێکانی ناو یەکێتی بردە قۆناغێکی ترەوە کەتیایدا داوای شەفافیەتی زیاتریان لەکاروباری حیزبی و داراییدا کردبوو هەروەها جەختیان کردبووەو لەسەردانی سنورێك بۆ سەلاحیەتەکانی سکرتێری گشتی ئەم نامەیە کەدواتر لەمیدیاکاندا بلاو کراوەیە نەفسی نوسینی نەوشیروان مستەفا بەسەریدا زالبوو بەلام دەوترێت پێشنیاری نارەزایەتییەکە لەلایەن کۆسرەت رەسولەوە بووە ئەم یاداشتی نارەزاییە بەرهەم سالح یش ئیمزای کرد

بالی نەوشیروان هەریەکە لە کۆسرەت رەسول و بەرهەم سالح بەوە تۆمەت باردەکەن کەلە ئیمزاکردنی ئەو بەیان نامەیە کشاونەوە بیبەلین دەرچوون لە ئاستی ئەوهاوپەیمانیەتەدا کەلە سەرەتا ریکەوتبوون

کۆسرەت رەسول ئیمزاکردنی ئەو بەیان نامەیەی تەنها وەکو کارتێکی فشار لە بەرامبەر تالەبانیدا بەکار هیناوە بۆ ئەوەی ئاماژەیەکی پیبدات کە دەتوانێت دژی بوەستێت یان لانیکەم هێزی خۆی نیشانبدات هەروەکو دەوترێت مام جەلال زیرەك بوو لە گەمارۆدانی ئەو بابەتەدا سەرەرای ئەوەی لەرووکەشدا هیچ تورەییەکی دەرنەبری بەرامبەر ئەوانەی کە ئیمزایان لەدژی کرد بەلام بە ئاراستەیەکی دیکەدا کەوتە پەرتکردن و بلاوە پیکردنیان بۆ نمونە بەزوویی د.بەرهەم سالحی لە گەمە هینایە دەرەوە هەروەها کۆسرەت رەسولی رازیکرد لەکشانەوە هاوپەیمانییەتەکەی لەگەل نەوشیرواندا لەمەشدا سەرکەوتووبوو بەبروای هەندیك هەرلەسەرەتاوە گرەوی نەوشیروان لەسور کۆسرەت رەسول گرەویکی دۆراوبووە چونکە لە بنەرەتدا کۆسرەت باوەری بەپرۆژەی ریفۆرم نەبوو بەلکو ئەو پیویستی بە هاوپەیمانییەك هەبوو کەنرخی کرینەوەی لەلای مام جەلال زیاتر بکات و لەمەشدا سەرکەوتووبوو

ئەوەی مایەوە لە گەمەکەدا لەبەرامبەر مام جەلال تەنها نەوشیروان مستەفابوو مام جەلال کەوتە شەن و کەوکردنی داواکارییەکانی ئەو لەسەر بنەمای پێشنیارەکانی ئەو چەند هەنگاویکی نا لەوانە هەلبژاردنی ریکخستن و بەستنی پلینۆم هەلبژاردنەکان لە کۆتاییەکانی سالی رابردوودا لەباروودۆخیکی توندوتیژوو پر گیرەو کیشمەی توندا ئەنجام دران و بەهەر نرخیك بوو تالەبانی و کۆسرەت رەسول بەبراوەی لەگەمەکەدا هاتنەدەرەوە ئەوەی کە دۆراوی یەکەم وکۆتای گەمەکەبوو کوتلەی نەوشیروان مستەفابوو هەرچەندە ئەوان گلەی توندیان هەیە لەوەی کە هەلبژاردنەکە لەژیر کاریگەری هەرەشەو پارەدا

بەریوە چووە سەرەنجام نەوشیروان مستەفا بریاری هاتنەدەرەوی لە یەکیتیدا راگەیاند لەگەل چەندکەسیك لەهاوکارەکانی هاتە دەرەوە لەگەل ئەوەشدا قورساییەکی گەورە لەسەر سەرکردە سیاسی و سەربازییانەی لەگەلیدابون لەحیزبدا مانەوە

هەرچەندە نەوشیروان رایگەیاند یکەئەو سەرقال دەبیت بەکۆمپانیایەکی راگەیاندنەوە بەلام بەلای هەندیکەوە ئەو هاتنەدەرەوەیە بەجۆریك لە فشارو خۆریکحستنەوە دەزانن بۆ دەستبەسەراگرتنی تەواوەتی یەکیتیی و کۆنترولکردنی بەتایبەت ئەگەر ئەو راستیە لەبەرچاوبگرین کەنەوشیروان هەرگیز نەیتوانیوە بەتەواوەتی لەسیاسەت داببریت و ئەو جارانەش کەدابراوە سەرەنجام گەراوەتەوە بەلام رەنگە گەرانهەوەی ئەم جارەی نەوشیروان مستەفا ئاسایی نەبیت و ئەگەر ئەو فرسەتەی بۆ هەلبکەویت گۆرانی گەورە لەناو یەکیتیدا دروستبکات بەر لەتەواوبونی رۆلی وەك سەرکردەیەکی سیاسیی

ئیستا دەتوانین بلیین یەکیتی بەهەمان شیوەی دروستبونی لەسی بالی سەرەکی پیکدیت لەبەرچاوگرتنی ئەوەی دابەش بونی ئەم جارە بە دەوری رەمزدایە نەك بەرنامەی سیاسیی هەریەك لەو رەمزانەش لەوانە کەچاویان لەئایندەی یەکیتی و بەدیاریکراویش لەسەر سکرتیری داهاتووی یەکیتییە جگە لەوەی ماوەیەکی دورو دریژ سکرتیری کۆمەلە بووە لە ماوەی سالانی ١٩٧٩ـ ١٩٩١ سەرکردەوبریاربەدەستی فیعلی یەکیتی بووە ئەوانەی لە نەوشیروانەوە نزیکن بەشیکی هەرە زۆریان کادیری کۆمەلەبوون بەلام ئەمە بەمانای ئەوە نایەت کەلەئیستادا هەموو کۆمەلە لە زەمیلەی ئەودابیت بۆ نمونە کۆسرەت رەسول بۆخۆی لەسەرەتادا لەسەر کۆمەلە حساب بووە و ماوەیەکیش لیپرسراوی ریکخستنە نهینییەکانی خویندکاران بووە لە شاری هەولیر هەروەها مەلا بەختیارو ئەرسەلان بایز کەلە ئیستادا بەبالی تالەبانی دادەنرین پیشتر کادیری پیشکەوتوو وبگرە لەسەرکردەکانی کۆمەلەبوون سەرەرای ئەوەش نەوشیروان مستەفا بەشیك لە فەرماندە سەربازییەکانی لەگەلیدایە کە رەنگە هاوتایان نزیك بیت لەنیوەی هیزی سەربازی یەکیتییەوە خالی لاوازی ئەم بالە ئەوەیە کەدوودەزگای گەورەی لەبەردەستدا نییە ئەویش پارەو زانیارییەکە لەدەستی بنەمالەی تالەبانیدایە هەرچەندە دەبیت ئاماژە بەوە بکریت کە نەوشیروان ئەر شیفستیکی وردەو لەم رووەشەوە سوودی لەئەرشیفی خۆی حیزب و ئەو سەردەمەی وەرگرتووە کەلەژیر سەرپەرشتی دۆستە نزیکەکانی بووە

چانسی نەوشیروان مستەفا بۆ سکرتیری گشتی چانسیکی بەهیزترە لە هەمووکەسیك لەبەر چەند تایبەت مەندییەك کەلە خودی ئەم کەسایەتییەدا هەیە

ئەویش ئەوی کەهەر لەبنەرەتەوە دووجەمسەری گرنگ لەناویەکیتیدا قبولیانە ئەوانیش بریتین لەسەربازییەکانی ناو یەکیتی بەوپییەی کۆنترین سەرکردەی یەکیتییەو ئەزموونیان لەگەلیدا هەیە هەروەها خویندەوارو رۆشنبیرەکانی ناویەکیتی کەوەکو رۆژنامەنوسو تیۆریزەکەریکی سیاسی سەیریدەکەن کە ئاشنایەتی لەگەل قەلەم ونوسیندا هەیە نەوشیروان پیاویکی ستراتیژییە بەلام دبلۆماسی نییە لەنیوان هیچ و هەموویدا یەکیکیان هەلدەبژیریت سەرکردەیەکی خاکییەو ژیانیکی سادەی هەیە کەمتر حساب بۆ ریکپۆشی ئەتەکیتی سیاسی دەکات دەتوانریت بوتریت هەتا ئیستاش پیشمەرگەیە لەبەرئەوەی پۆستی وەرنەگرتووە تۆمەتبار نییە بەگەندەلی و بەفیرۆدانی پارە هەر ئەمەشە وازمانی لال کردوە بتوانیت لەسەر هەمووکەس قسەبکات بەلام ئەمە بەمانای ئەوەنییە ئەوانەی لەدوری ئەون هەمان سیفەتیان هەبیت وادەدەکەویت لەلایەن سەرکردەکانی تری یەکیتییەوە تەنها رەمزیك بیت کە قبولی ئەوەبکەن ببیتە براگەورەیان خاوەنی کوتلەیەکی ئاگرینە بە جۆریك هەستدەکریت هیشتا حەماسیەتی چەپ بەسەریاندا زالە نەوشیروان مستەفا کەسیکی رەق وتوند تیژە لەگەل کادیرەکاندا هەرلەبەر ئەوەشە زۆرجار سلی لیدەکەنەوە هەمان سیفەت کەلەتالەبانیدا هەیە بەلام وەکوتالەبانی قسە خۆش و نوکتەباز نییە عەیبی گەورەی ئەوەیە تەنها دەتوانیت لەگەل ئەوانەدا هەلبکات لە خۆیەوە نزیکن یان لەگەلیدا دەگونجین بەپیچەوانەی تالەبانییەوە کە دەتوانیت لەگەل هەمووکەس هەلبکات و لەدەوری خۆی کۆیان بکاتەوە تەنانەت ئەوانەش کە رۆژیك لەرۆژان دژایەتی راستەوخۆیان کردوە پیدەچیت بەرهەم سالح لەم سیفەتەدا نزیکتربیت لەتالەبانییەوە تاوەکو نەوشیروان نەوشیروان تەمەنی ٦٣سالەو ١١سال لەتالەبانی بچوکترە و١٦سالیش لە بەرهەم سالح گەورەترە کیشەی گەورە لەبەردەم چانسی سکرتیرییەکەیدا ئەوەیە زەمەن لەبەرژەوەندیدا نییە بەتایبەتی کە رەنگە تەمەنی تالەبانی چەند سالیکی تر بخایەنیت وەکو دەوتریت نەوشیروان چاوەریی قۆناغی دوای تالەباتی دەکات بۆ ئەوەی دەستبخاتە ناو یەکیتییەوە جاریکی دیکە سەرلەنوی دایبریژیتەوە هەندیك کەس هاتنەدەرەوە لەحیزب بە دجۆریك لیکی دەدەنەوە کەخۆ تەرخان کردنیەتی بۆ ئەم کارە ئەوەی چانسی نەوشیروان مستەفا زیاتر دەکات لەم قۆناغەدا بۆسکرتیری گشتی ئەوەیە

کەتەواوی سەرکردایەتی کادیرە مامناوەندییەکانی یەکیتی هەنووکە لەگەڵ گرییەکی دەرونی گەورەدا دەژین ئەویش گریی بچوکبونەوە و لاوازبونە لەبەرامبەر پارتیدا بەلای هەندیکەوە نەوشیروان ئەوکەسەیە کەدەتوانیت یەکیتیی لەم بارودۆخە دەربهینیت ولەم گری دەرونییە رزگاریانبکات و سەنگ و قورسایی یەکیتی لە بەرامبەر پارتیدا بگریتەوە نەوشیروان گوی لە پیشنیاری دەوروبەری دەگریت بەلام بریاری کۆتای تەنها لای خۆیەتی یەکیك لە گەورەترین کیشەکانی نوشیروان مستەفا ئەوەیە زیاتر وەکو سەرکردەی سلیمانی دەناسریت تاوەکو کوردوستان بەتایبەتی لەم سالانەی دوایدا سلیمانچیتی زیاتری پیوە دەبینریت بەم خالەش لە هیرۆ خان و بنەمالەی ئیبراهیم ئەحمەدی نزیکدەکاتەوە هەرچەندە هەندیك کەس پییان وابوو کەدوا وتاری هیرۆخان لە گۆڤاری خاکدا وەلامیکی توند بووە بۆ نەوشیروان مستەفا سەبارەت بەوقسانەی لەسەر داها تو سەرمایەی ئەو بنەمالەیە کردوویەتی نابیت ئەوەش لەیادبکەین کە ئەم بالە لەکەرکوکیشدا کوتلەیەکی بەهیزی هەیە هەچی سەبارەت بەکۆسرەت رەسول عەلییە بەرلەوەی وەکو سەرکردەیەکی سیاسیی بناسریت سەرکردەیەکی سەربازیی ومەیدانی بووە لە چەندین شەری حیزبیی ونەتەوەیدا هاوشانی پیشمەرگە لە سەنگەردابووە وئازایەتی گەورەی پیشانداوەو زۆرجاریش بردنەوەی مسۆگەر کردووە ئەم سیفەتەش لەناو جەماوەری یەکیتیدا خۆشەویستی کردووە بلاو بونەوەی بەناو عەشایەرو سەرۆك خیلەکاندا لەهەمووسەرکردەکانی تر زیاترە هونەری راکیشانی تویژە جیاجیاکانی هەیە تەنانەت لەناو رۆشنبیران و نوخبەکانی کۆمەلگاشدا جیی خۆی کردۆتەوە بەتایبەتی لەناو زانکۆکاندا کە سالانیکی دریژ بریاری یەکلایی لەلابووە بۆ دابەشکردنی پۆستە ئیدارییەکانی زانکۆ

قورسایی جەماوەری کۆسرەت لەشاری هەلیرە بەجۆریك هەتا ئیستاشی لەگەلدابیت هەندیك لەکۆمیتەکانی ئەوشارە خۆیان بە کۆسرەتی دەزانن نەك جەلالی هەندیك جار قورسایی جەماوەری کۆسرەت رەسول زیاتربوە لەقورسایی جەماوەری پارتی لە هەولیردا کۆسرەت رەسول پیاویکی ستراتیژی نییە بەلام سەرکردەیەکی واقیعی مەیدانییە خاوەنی ئەزمونیکی زۆرە لەپیشبینیکردندا زیرەکە خاوەنی سامانیکی تایبەتی وهەیمەنەیەکی جەماوەرییە زیاتر لەوسەرکردانەدەچیت کە ئەگەر زەمەنی دەرکەوتنی ٣٠سال بەر لەئیستابوایە دەیتوانی کۆنترۆلی ککوردوستان بکات لەبەرژەوەندی خۆی بەلام تیپەربونی زەمەن و گۆرانی گەورەی میژووی ناوچەکە لە بەرژەوەندی ئەودانەبووە لەگەل

هەمووئەوانەشـدا كۆسـرەت لـەناو حیزبـدا بەئەنـدازیاری موئامـەرە دادەنریـت ئـەوەی راستەوخۆ بەرامبەر كەسیك بۆی نەكریت ناراستەوخۆ چەندقاتی بەرامبـەر دەكاتـە وە بـۆ دەرەوەی یەكیتیش پەیوەندی ژیربەژیری لەگەل چەندین سـەركردەو ئەنـدامانی مەكتـەبی سیاسـیی حیزبـەكانی دیكـەدا هەیـە بـەم پییـەش ئەنـدازیاری تەكـەتول وناكۆكییـە ناوخۆییـەكانی نـاو حیزبـە بـچوكەكان و گـۆرینی سـەنگەریان لەبەرژەوەنـدی یەكیتیـدا دادەنریت كۆسرەت رەسول ركەسیكی پراگماتیكییە جولـەی بـەگویرەی بەرژەوەندییـەكانی خۆیـەتی بـەلام كیـشەی گـەورەی ئەوەیـە بەشـیكی زۆری ئەوانـەی لـە دەوری كۆبونەتـەوە پراگماتی بیردەكەنەوە هەرلەبەر ئەوەشە هەندیك جار كۆسرەت رەسـول دەوتریـت((دابـەش دوو) بەتایبەتی كە پۆسی سەرۆكی حوكمەتی لەدەستدا نەما بەرەبەرە هەندیك لەو كـادیرە ناوەندییانەی لەگەلیدابون دەچنە كوتلەكانی ترەوە بیركردنەوەی كۆسرەت رەسـول جیـاوازە لە شیوازی بیركردنەوەی نەوشیروان مستەفا چەنكە زیـاتر لەئیـستادا دەژی نـەك لـە ئاینـدە تەركیز لەسـەر ئـەنجام دەكـات نـەك ریگاكـانی گەیـشتن بـە ئـەنجام هەرچـەندە ئـەو تیپـەی لەگـەل كۆسـرەت رەسـولدای ە بەبـەراورد بەكوتلـەكانی تـر زۆر گەورەنییـە بـەلام بەچـاكی دەتوانیت یاری پیبكات قورسایی لەنیو سەركردایەتیدا لاوازە بەلام لەنیو كادیری ناوەنـدیـدا قورساییەكی گەورە هەیـە ئاسـتەنگی گـەورەی بـەردەم كۆسـرەت رەسـول نەخۆشـییەكەیەتی وەكو جاران بواری بەریوبردنی ململانیكانی نادات نزیكی كۆسرەت لە دوو بالەكـەی دیكـەوە هیچ شتیك دیاری ناكات جگە لە بەرژەوەندییەكانی لەحالـەتی كتـوپروو هەلبـژاردنی پـیش وەختدا چانسی سكرتیری یەكیتی هەیە لەنیو هیزی پیشمەرگەدا لایەنگیرو قورسایی هەیـە هەرچـەنـدە كۆسرەت بە هەولیرچـی دەناسـریت بـەلام دەتـوانین بلـیین قورسـایی لـەدەرەوەی مەركەزی سلیمانیشدا هەیە بەتایبەتی لەناوچەكانی گەرمیان وشارە زوورو رانیەو قـەلادزی ئەگەر نەوشیروان ببیتە سكرتیری یەكیتیی واپیدەچیت كۆسـرەت رەسـول وبالـەكانی قبـولی بكـەن بـەلام هـەرگیز سـكرتیری د. بەرهـەم قبـول ناكـەن بەپیـچەوانەوە بـەلای بـالی نەوشیروانەوە كە رەگی سلیمانچیتیان تیدایە بەرهەم قولترە تاوەكو كۆسـرەت رەسـول دیـارە وەكو سكرتیری نا بەلكو وەكو یەكیك لەسەركردەكانی یەكیتیی ململانیكانی نیـوان بەرهـەم سالح و نەوشیروان مستەفا زەقترە لە ململانیكانی نیوان بەرهەم و كۆسـرەت رەسـول چـونكە بەرهەم سالح نایەویت لەم كاتەدا كیشەی كۆسرەت رەسول بـۆ خـۆی دروسـت بكـات بەرهـەم سالح كوری نازداری تالەبانییە بەجۆریك هەندیك جار بـە كـوری بنەمالـە دادەنریـت بـەلام

لەگـەل هیرۆخـان نیـوانی بـاش نییـە هەرلەبەرئەوەشـە هیرۆخـان بـە بـاوەڕنیکی خراپـی د.بەرهەم دادەتریت بەرهەم سالح لەدایکبوی سالی ١٩٦٠ ە سالی ١٩٧٧پەیوەندی بە یەکیتییەوە کردوە سالی ١٩٧٩چۆتە بەریتانیاو ماستەری لە ئەندازیاری شارستانیی و دکتـۆرای لـە ئامـارو کۆمپیوتەردا هەیە لە زانکۆکانی لیڤـەر پـول و کـاردیف بـۆ یەکـەم جار مـام جـەلال لەسالی ١٩٨٧بینیویەتی پـی سەرسـام بـوە داوایلیکـردوە بـچیتە ئەمـەریکا مەکتـەبی پەیوەندیـەکانی یـەکیتیی لـەو ولاتـە بەریوەبـەریت سـالی ١٩٩٢مـام جـەلال هینایـەوە بـۆ کوردوسـتان کـردی بەئەنـدامی سـەرکردایەتی ئەوکاتـە تەمـەنی ٣٢سـال بـوو هەرچـەندە مـام جـەلال خـۆی بەداریژەری پەیوەندی نیوان یەکیتیی و ئەمـەریکا دادەنریـت بـەلام د.بەرهـەم تـوانی پـەرە بەو پەیوەندییانە بدات و ببیتە ئەلقەی پەیوەندی نیوان تالـەبانی و ئەمەریکییـەکان جگـە لەوە توانی تیروانینەکانی تالەبانی لەسـەر ئەمـەریکا بگۆریت و بەپیـچەوانەشەوە هـەروەها توانی لەسەر بنەمای ئەو پەیوەندییانە سیاسەت بکات و بـەرگریش لەتالـەبانی بکات لـەلای ئەمەریکییەکان بەتایبەتی کە تالـەبانی پیشتر لـە تیروانینـی ئەمـەریکادا وەکو هاوپـەیمانی ئیران حیسابی بۆ کرابوو

د.بەرهەم پەروەردەکراوی ناوەندی سیاسی و دیپلۆماتییەکانی ئەمەریکایە شارەزای زۆری ئەتەکیتی سیاسیە کەسیکی ریکپۆش و زمانزان و رەوانـە لەقسەکردندا دەتوانیـت بـەخیرای سەرسـامی لـەس ەر بەرامبـەر دروسـتبکات هەرچـەندە بـالی تالـەبانی بۆخـۆی لـە چـەند کوتلەیەکی بچوکتری ناتەبا پیکدیت بـەلام بەشـیوەیەکی گشتی د.بەرهـەم لـەنیو ئەوبالـەدا دیارترین رەمزە کەبتوانیت جیگەی تالەبانی بگریتەوە لەگەل ئەوەشدا لە ناکۆکی تونددایە لەگـەل چـەند کەسـیکی نیـو بالەکـە ئـەوەی یارمـەتی سـەرکەوتنی بەرهـەم سـالح دەدات لەململانیکانـدا پشگیری بـی مـەرجی تالەبانییـە بـە جۆریـك هەسـت دەکریـت تالـەبانی بـە هیواشی ئامادەی دەکات بۆ ئەوەی جیگەی خـۆی بگریتـەوە دەتوانریـت بوتریـت نەوشـیروان مستەفا و د. بەرهەم هـەردوکیان دریـژە پیـدەری جـەلالین بـەلام جیـاوای نیوانیـان ئەوەیـە لەفیکریـدا جەلالییـەو لەپراکتیکـدا خۆیـەتی لەکاتیکـدا د. بەرهـەم فیکـری پـەرەپیـدراوی تالەبانییە بەرەنگ و بۆ ی خۆیەوە لەگەل شیوازی جەلالیانە لە پراکتیکدا لەلای نەوشیروان جەلالیەت لە میژووی خۆیدا هەلگری چەندین سەرکەوتن و شکاندنە لەبەرئەوە موحـافیزە کارترە لە پابەند بوون بەفیکری جەلالیەتەوە لـە کاتیکـدا د.بەرهـەم ئـەم ئەزمونـەی نییـە لەبەرئەوە رادیکالترە لە گۆران لەم تـەرزە بیر کردنەوەیەدا بۆ نمونە. لەدوای پرۆسـەی ئـازاد

کردنی عیراقەوە نەوشیروان مستەفا دەچیتە بەغداو لە لیژنەی نوسینەوی دەستوردا بەشداری دەکات بەلام کۆپییەکی محەلی جەلالییە لەبەرئەوە بەرگەی دەمەقالی شیعەکان ناگریت دەگەریتەوە کوردوستان لەکاتیکدا د.بەرهەم لەسەر ئاستی عیراقدا سیاسەت دەکات و دەتوانیت هەموولایەکیش لە خۆ ی رازیبکات هەمان سیفەتیش لە تالەبانیدا هەیە

هەروەها لەدوا پرۆژەی بەرهەم سالح کەوەکو جیگری سکرتیری گشتی پیشکەسی مەکتەبی سیاسیی کردووە ئاماژەی بەوەکردووە کە یەکیتیی لەپینج دەزگا بکشیتەوە ئەوانیش دەزگاکانی پیشمەرگە. زانیاری. زانکۆ. ریکخراوە دیموکراتییەکا ن و بازار(ئابوری )ە ئەمەش رەنگە کاریکی رادیکالی بیت و بەئاسانی قبولنەکریت لەلایەن ئەندامانی دیکەی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایسەتییەوە

دوای ئەوەی نەوشیروان لە حیزب کشایەوە مام جەلال بەخیرای ئەو بۆ شاییەی پرکردەوە کاتیك هەریەکە لە کۆسرەت رەسول و بەرهەم سالحی وەکو جیگری سکرتیری دەستنیشانکرد لەدوای ئەوە وە جموجولەکانی د.بەرهەم لەناو حیزبدا رووی لە زیاد بون کردووە هەندیك پیان وایە ئەمە ئاماژەی خۆ ئامادەکردنی ئەوە بۆ قۆناغی دوای تالەبانی بەلام هەندیکی دیکە واسەیر دەکەن کە ئەو جموجولە بۆ تەعادو لەگەل نەوشیروان و کۆسرەت رەسولدا هەندیك لەو باوەرەدان زۆرینەی سەربازییەکانی ناو یەکیتی بەوە رازیی نابن د.بەرهەم ببیتە سکرتیری گشتی لاچونکە کەسیکە میژووی شاخی نییە بەشیوەیەکی سروشتیش نەهاتۆتە ریزی سەرکردایەتی یەکیتییەوە لەگەل ئەوەشدا پیدەچیت سەرکردە سەربازییەکانی نزیکی مام جەلال قبولی بکەن چونکە ریزیان دەگریت و پارەشیان دەداتی و هەندیك جاریش کەلوپەلی سەربازی بۆ پەیدا کردون لەگەل ئ ەوەشدا دەبیت ئەوە لەبەرچاو بگرین خۆشەویستی مام جەلال بەلای سەربازەکانییەوە لە ئازایەتی مام جەلالەوە نایەت لە شەردا بەلکو لە زامانزانی و سیاسەتوانی و زیرەکی مام جەلالەوە دیت کە د. بەرهەم دارای ئەم سیفاتانەیە

سەرە رای ئ ەوی لەم قۆناغەدا چانسی سکرتیری گشتی بۆ نەوشیروان مستەفا زیاترە لەگەل ئەوەشدا هەندیك وادەبینن ئایندەی یەکیتی بۆ د. بەرهەم دەبیت ئەگەرچی رەنگە ئەوە چەندقۆناغیکی دیکە بخایەنیت

گرفتی سەرەکی د. بەرهەم ئەوەیە کە لە ناو بالی مام جەلالدا هەمویان پیی رازیی نین هەربۆ یە لە بەرژەوەندییەتی لەم بارودۆخەدا بیر لە سکرتیری گشتی نەکاتەوە بەلکو واباشترە خۆی هەلبگریت بۆ قۆناغی دوای دوای تالەبانی

هەرچی سەبارەت بە کوتلەی چوارەمەوە لەلایەن هیرۆخان خیزانی تالەبانی و کچی ئیبراهیم ئەحمد بەریوە دەچیت کیشەی هیرۆخان کیشەی دایکیکە کە لە ئاییندەی کورەکانی دەترسیت و دەیەویت لەنیو هاوکیشەکاندا جیگەیەك بۆ ئەوان بکاتەوە جگە لەمەش پیویستی بەوە هەیە بەجۆریك بجولیتەوە کەلە ئاییندەی یەکیتیدا بەرژەوەندی و ریزی ئەو دوو بنەمالەیە دەستەبەربکات هەرچەندە پیناچیت لە ئاییندەی نزیکدا سکرتیرلەدەستی ئەم بنەمالەیەدا بمینیتەوە بەلام دەبیت ئەوە لەبەرچاوبگریت کە رەنگە رۆلی یەکلاکەرەوە بگیرن لەدیاری کردنی سکرتیری ئاییندەی یەکیتیدا بەوپییەی سی دەزگای گرنگ لەدەستی ئەم بنەمالەیەدایە ئەوانیش پارەیە کەلای هیرۆخان دژەتیرۆر(زانیاری)ە کە لای پاڤیلە و مەکتەبی ئەمەریکا یە کە لەلای قوبادە سەرەرای هەندیك ناکۆکی چانمس نەوشیروان بۆ دەستەبەرکردنی رەزامەندی ئەم بنەمالەیە و بەتایبەت هیرۆخان لە هەمووکەس زیاترە بەوپییەی هەردوکیان ئیش لەسەر سلیمانچیتی دەکەن لەلایە ك و لەلایەکی دیکەشەوە هیرۆخان سەرەرای ناکۆکی کۆمەلایەتییان لەگەل بنەمالەی د. بەرهەمدا نیگەرانیشە لەو بایەخپیدانە زۆرەی مام جەلال و پیوایە د.بەرهەم هەرەشەیە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەو بنەمالەیە لەداهاتوودا سەبارەت ب ە کۆسرەت رەسولیش رەنگە هەولیرچیتیی و سلیمانچیتی خالی دوور خستنەوەیان بیت لە یەکتری سەرە رای ئ ەوە کۆسرەت رەسول ئارەزووی پەیداکردنی هەژمونی خۆ ی دەکات بەسەر سەرکردایەتیدا ئەمەش بەلای هیرۆخانەوە دەرهینانی یەکیتییە لەژیر دەستی سلیمانی بەگشتی و بنەمالە بەتایبەتی

## پەنجەکان یەکتریان شکاند

### راپۆرت هیمن باقر

دوای ٣١سال ململانیی ئاشکراو نهینی نیو بالەکانی یەکیتی دواجار پەنجەکان یەکتریان شکاند سیانریۆکان دووبارەن ئەوەی کە بەتەنها تازەیە ئەو دەزگا راگەیاندنەیە کەپیدەوتریت کۆمپانیای ووشە

هەرچەندە تائیستا لیدوانی رەسمی بەرپرسانی ئەو دەزگایە دوورلەهەلچون و توندوتیژین بەلام بەپی گفتووگۆی نارەسمی رەمزەکانی ناو ئەم کۆمپانیایە پیناچیت لەقۆناخی بانگەوازی نهینیدا بیهیلیتەوە

لەراستیدا کەس ناتوانیت تەنها وەکو کۆمپانیایەکی راگەیاندن سەیری ئەم دامەزراویە بکات بەلکوزیاتر وەکو گروپیکی سیاسی دیتە بەرچاو کە دەیانەویت لەریگای راگەیاندنەوە سیاسەت بکەن

هەندیك لەبەرپرسانی ئەو دەزگایە ئەوەناشارنەوە کەجیابونەوەی ئەوان جیابونەوەیەکی فیکری سیاسییە بەتایبەتی کاتیك لە هەرەمی ئەم کۆمپانیایەدا جیگە لە نەوشیروان مستەفا کەسایەتیەکانی وەك قادری حاجی علی سالار عەزیز حەمە تۆفیق رەحیم بابەکر درەیی و روشدی عەزیز دەبینرین ئەمەش ئاماژەی ئەوەیە کە ئەم پرۆژەیە لە جەوهەریدا پرۆژەی بالی کۆمەلەی رەنجدەرانی ناو یەکیتییە دوای ئەوەی شکستیانهینا لەوەی کۆنترۆلی بریاری سیاسی ئیداری حیزبەکەبکەن لە شیوەی دیکەدا خۆیان یەکدەخەنەوە هەرچەندە ئەم بالە و سەرکردایەتییەکەی ئەمجارە لەسەر شیوازیکی نوی یاریدەکەن کەرەنگە شیوازیکی سەرنجراکیش و کاریگەربیت

لەکاتیکدا ئەم بالە بلندگۆی راستەقینەی خۆی جیادەکاتەوە لەوێوە وتاری خۆی ئاراستەی جەماوەر دەکات لەهەمان کاتیشدا قورساییەکی گەورەی لەناو حوکمەتی هەریم و یەکیتیشدا بەجیهیشتوە سادەترین هەلە ئەوەیە پیمان وابیت کەنەوشیروان مستەفا دەستبەرداری هاوریکانی بوە لەوەش سادەتر ئەوەیە هەستبکەین هاوریکان دەستبەرداری سەرکردە رەمزییەکەی خۆیان بون بەتایبەتی گروپیك کە باگراوندی فیکری چەپیان هەیە کە یەکیك لە گەورەترین کاریگەریەکان لەسەر مرۆڤ رەنگە عاقلیەتی ئۆرگانیزەکان

ریکخستن بیت ئیستا ئەوە بەرونی دەبینریت کە پەیوەندی نیوان نەوشیروان مستەفاو هاوریکانی لە حیزب و حوکمەت توندوتۆل و چروپرترە بەم پییە ئەم گرۆوپە گەورەترین گروپی سیاسییە کە لەناو حوکمەت و حیز ب و تەنانەت پیشمەرگەشدا خاوەنی پیگەی خۆیەتی بەلام ئایا هیزەکان ریگەی ئەوە دەدەن ئەم سیناریۆیە هەروا بەئاسانی بچیتە پیشەوە بەتایبەتی کە نەوشیروان مستەفا لەناو یەکیتیشدا کۆمەلیك جەمسەر لە دژی کاردەکەن لەوان مەکتەبی ریکخستن و راگەیاندن و ریکخراوە دیموکراتییەکان و بەشیك لە سەرکردە سەربازییەکانی نزیکی مام جەلال لە بەرامبەردا یەکیتی بە کوتلەی تالەبانی و کۆسرەت رەسولەوە خەریکی خۆریکخستنەوەو پرکردنەوەی ئەوبۆشاییانەن کە بەجیهیشتنی نەوشیروان مستەفاو هاوریکانی دروستیان کردووە لەبەرامبەریشەوە دەنگۆی ئەوەهەیە کە بالی کۆمەلە لەپال پرۆژەی ئیعلامیەکاندا خەریکی ریکخستنەوەی نهینین ئەم ئەرکەش بۆ ئەوبالە کاریکی قورس نییە لەبەرئەوەی وەك دەوتریت لەماوەی تیکەلاوبونی لە گەڵ یەکێتیدا ئەم بالە ریکخستنی سەربەخۆ ی خۆی پاراستوە بەلگەش ئەوزنجیرە هەرەمییە بوو کە لە هەلبژاردنەکانی کۆتای سالەکانی رابردودا هەر ئەندامیکی سادەی دەبەستەوە بە کۆتای زنجیرەی هەرەمەکەوە لە ریگەی چەند ئەلقەیەکی دیکەوە هەرلەئیستاوە پارتی نیگەرانی دایگرتووە بەرامبەر ئەم پرۆژەیەی نەوشیروان ئەوەش بە حوکمی ئەو پیشینە میژووەی کە ئەو حیزبە لەگەل کەسیکی وەك نەوشیروان هەیان بوە کەتوندترین بۆ چونیان هەبوە بەرامبەریان لەکاتی شەروو تەنانەت لە دانوستانەکانیشدا رەمزی سازشنەکردن بووە بەرامبەریان لەهەمووگرنگترئەوەیە کە ئەم گروپە سیاسییەی لەبەرئەوەی راستەوخۆ بەشدارنییە لە دەسەلاتدا دەستکرایەوە کە رەخنە توندەکانی ئاراستەی حیزب و حوکمەتیش بکات

ئەمەش لەلایەکەوە دەبیتە بەرەکی ئۆپۆزسیۆن لەکوردوستاندا کەتوانای کۆکردنەوەی جەماوەری نارازی هەبیت لەلایەکی دیکەشەوە ئامادەش دەبیت لە قۆناغیکی دیاری کراودا بەهەموو قورساییەکی خۆیەوە بەشداری دەسەلات بکات

بەم پییەش نەوشیروان مستەفا لەهەلبژاردنی شیوازی جیابونەوەوەیدا هەنگاویکی عاقلانەی هەلبژارد لەلایەکەوە تالەبانی ناچارکرد بە پشگیری ماددیی مەعنەوی دەزگای ئیعلامییەکەی و لەلایەکی دیکەشەوە بالەکەی لەناو حکومەت و حزبەکەشیدا لەدەستنەدا ئەگەر لەم سیناریۆیەدا نوشیروان سەرکەوتوبیت ئەوا زیرەکانەتر کارەکە بتوانیت لەسەر

پاشماوەكانی جەستەیەكی پیر لە رووی فیكری و سیاسیەوە حیزبیكی نوی و ئۆپۆزسیۆنیكی راستەقینە دروست بكات

بەرپرسانی ئەم پرۆژەیە ئەگەری ئەوە رەتناكەنەوە كەلە داهاتودا ببنە هیزیكی سیاسیی بەتایبەتی ئەر لەوەدا سەركەوت وبن كە شەقامی كوردی بەلای خۆیاندا رابكیشن

ئیستاشی لەگەلدابیت رای گشتی ناو پارتی دیموكراتی كوردوستان لەسەر ئەوە كۆكە كە ئەم جیابونەوەیە بە گەمەیەكی دیكەی یەكیتی دادەنیت بۆ هەلـژینی نارەزای جەماوەرو كۆكردنەوەی ئەو جەماوەرەی كە بەهۆی دروستبونی جیاوازی نیوان خەلكو دەسەلاتەوە لە حیزبەكان بیزاربوون و دووركەوتنەوە

پیدەچیت پارتی دیموكراتی كوردوستان لە هەموو لایەك زیاتر چاودیری ئەم جموجولە نوییەی نەوشیروان مستەفا بكات بەتایبەتی كاتیك رایان گەیاند كە ئەوان هیلی سوریان نییە هەرلەبەر ئەوەشە رەنگە پارتی وەلامی توندی هەبیت بەرامبەر هەر لیدانیكیان لەلایەن دەزگاكانی راگەیاندنی كۆمپانیای وشەوە لەگەل ئەوەشدا پیدەچیت لەم سەرەتایەوە كۆمپانیای وشە نەرمی بنوینیت لە مامەلەكردنی بەرامبەر بابەتە هەستیارەكان و لەم رووەشەوە پاشەكشە بە هەلویستەكانیان دەبینریت بۆ نمونە: ناوی سایتەكەیان لە(**زەرگەتە**)كەبەمانای(**پیوەدان**)دیت گۆری بۆ ناویكی تر هەروەها بەرپرسانی دەزگاكە باس لەوە دەكەنە كە ئەوان باس لە گەندەلی ناكەن وەكو حالەت و كەسەكان بەلكو وەكو سیستەم و بە شیوەیەكی گشتی باسی دەكەن ئەمەش رەنگە پەیوەندی بە وە وە هەبیت كە ئەم كۆمپانییایە بیەویت لەم سەرەتایەوە دوا لە نیچرڤان بارزانی سەرۆكی حكومەت بكات بارەگایەك بۆ دەزگا راگەیاندنەكەیان دابینبكات لە هەولیر لەلایەنی پارتیشەوە هەروەكو چۆن ئامادە باشی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم دەزگایە كراوە لە هەمان كاتیشدا خۆیان بۆئەوە ئامادەكردووە كە بەجۆریك لەجۆرەكان پەیوەندی و هاوكاری لە نیوان ئەوان و ئەم كۆمپانیایە دروستببیت بەتایبەتی خودی بنەمالەی بەرزانی كە خۆیان زیاتر وەكو دامەزراوەیەك وەسفدەكەن كەتوانای قبولكردنی دەیان دەزگای جیاوازیان هەیە

لەوانەشە سیناریۆكە هەلبگەریتەوە پارتی و یەكیتی پیكەوە تەوافوق بكەن لەسەر نەمانی ئەم دەزگایە بەتایبەتی كاتیك ئاراستەی رەخنە گرتن تیایدا بەجۆریك بیت كە پارتی تەنگەتاو بكات ئەوكاتە رەنگە بارزانی داوای ریكەوتنیكی جینتلمانانەلە تالەبانی بكات بۆ كۆتای هینان بەو سەرئیشەیە

بەپێی شیکردنەوەی پارتی قورسایی ئەم دەزگا ڕاگەیاندنە بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر شاری سلێمانی و دەوروبەری دەبێت بەو پێیەی ڕەمزەکانی ئەو دەزگایە بەشێوەیەکی گشتی خەلکی سلێمانینن و قورسای ئەو باڵەش هەر لەوییە بەم پێیەش ڕەنگە پارتی حەزبکات لەبەرامبەر دوورکەوتنەوە و جیابونەوەی یەکجارییان لە یەکێتی هاوکارییان بکات چەنکە هاتنەدەرەوەی ڕاستەقینەی ئەم باڵە کەوتنی باڵیکی کاریگەری ناو یەکێتییە بەلام بۆدەزگایەك کە نزیکایەتی فیکری سیاسیی لە یەکێتییەوە هەیە و تا ئیستاشی لەگەلدابێت دارایی دەزگاکەو مووچەی کارمەندانیان لەلای خودی یەکێتیی نیشتمانیەوە دەدرێت پێناچێت پشتهەلکردن و رووکردنە حیزبێکی دیکە هەروا کاریکی ئاسان بێت بەتایبەتی تالەبانی ئەزموونیکی دوورودرێژی هەیە لە ئیرادەکردنی جیاوازەکانیدا ڕەنگە پیلانی تالەبانی ئەوەبێت کە یەکێتی بەکەمترین زیان لە جیابونەوەی لە باڵی نەوشیروان مستەفا دەربچێت بەوەی پشتگیری مادییان بکات وەکو هێزیك لە دەرەوەی یەکێتی کاری خۆیان بکەن بەلام لەکاتی پێویسدا نزیك بن لە یەکێتییەوە

بەرپرسانی دەزگاکە ئاماژە بەوەدەکەن کە یەکێتی ناچارە ئیدارەی ماددیی دەزگاکەیان بکات ئەگەرنا ئەوەدەبێت چاوەڕیی ئەوەبێت کە دەزگاکە بکەویتە دەستی لایەنیکی تر

بەنیسبەت یەکگرتووی ئیسلامییەوە کەخۆی بە هێزی سێیەم و ئۆپۆزسۆنی کوردوستان دەزانێت لە چەند ڕوانگەیەکی جیاوازەوە سەیری ئەم دەزگا نوییە دەکات لەوانە جیاکردنەوەی مینبەری ئیعلامی لەلایەن باڵ و ڕەمزە جیاوازەکانی ناو یەکێتییەوە کەبەرامبەر هەریەکەیان هەلویستی جیاو تیروانینی جیاوازی هەیە پێدەچێت یەکگرتووی ئیسلامی گەیشتبێتە ئەو باوەڕەی کە دروستکردنی ئەم کۆمپانیایە لەلایەن نەوشیروانەوە هەبەتەنها جیاکردنەوەی مینبەر نییە بەلکوو جیابونە وەیەکی قولتروو توندوتیژترە یەکگرتووی ئیسلامی پێخۆشە کەلە دەرەوەی پارتی و یەکێتی کەنالیکی دیکەی بەهێز دروستبێت کە قسە بکات و ڕەخنە بگرێت بەو پێیەی کە بواری قسە کردن و ڕەخنەگرتنی ئەویش فراوانتر دەبێت یان لانیکەم هەلویستەکانی وەکو هەلویستی ئۆپۆزسیۆن دەناسرێت نەك وەکو دەست و جولاندنی دەرەکی لەم ڕووەشەوە پێویستی بە هاوکاریك هەیە بەم ئاراستەیە کاربکات لەگەل ئەوەشدا نابێت یەکگرتووی ئیسلامی ئەوە لەبەر چاونەگرێت کە ڕەنگە دەرکەوتنی ئەم باڵە نوییە لە قازانجی ئەونەبێت وەکو هێزیك کەخۆی بە ئۆپۆزسیۆن هێزی سێیەم دەزانێت لە کۆمەلگاداو پێدەچێت بە زووی جێگای ئەوە

بگريتەوە ئەگەر يەكگرتوو لەسەر ئەم سياسەتەى ئيستاى بمينيتەوە كە قاچيكى لەناو دەسەلاتەوە قاچەكەى ديكەى لەدەرەوەى دەسەلاتە هەرچۆنيك بيت بۆ يەكگرتووى ئيسلامى خالى ليكنزيكبونەوى زياترە لە خالە جياوازەكانى لەگەل ئەم گروپەداو لەم روانگەيەشەوە ئەگەرى هاوكار ى لەنيوانياندا زياترە تاوەكو دژايەتى بەلام نابيت ئەوە لەبەر چاونەگرين هەم يەكگرتوولەباگراوندى چەپى ئەم بالە حەزەرى هەيەو هەم ئەوانيش رەنگە حەز بە بەهيزبونى رەوتى ئيسلامى نەكەن ئەمەش ئەوە يەك لاى دەكاتەوە كە ئايا مامەلەى ئەم دووهيزە لەگەل يەكتر مامەلەيەكى سياسى دەبيت يان فيكرى لەسەر ئاستى چەپەكانى كوردوستانيش خويندنەوەى تايبەتى دەكريت بۆ ئەم دەزگايە بەشيوەيەكى گشتى ئەمان خۆشحالن كەلەم فەوزا سياسيەى كوردوستاندا هيزيكى كاريگەرى چەپ دروست ببيت بەتايبەتى بەبرواى ئەوان لە حيزبەكانى كوردوستاندا بنەماى فيكريان نەماوە هەرئەمەشە كە خۆشحالى لاى چەپەكانى كوردوستان بە وانەشەوە كەلەناو حيزبەكانى ديكەن دروستكردووە بەلام پيناچيت ئەمە بەماناى ئەوەبيت كە هەموو چەپەكان بەرەو ئەوە برۆن لە دەورى ئەم هيزە كۆببنەوە چونكە بەدريژاى ميژووى چەپ لەكوردوستاندا هيچ كاتيك هەموويان لەژير چەترى يەك حيزبدا كۆنەبوونەتەوە لەگەل ئەوەشدا راستە بالى نەوشيروان مستەفا وەكو باليكى چەپ ناسراوە بەلام وەكو خۆى دەليت رۆژيك لە رۆژان ئەو باوەرى بەفيكرە چەپ نەبوە ئەوانەى لە نەوشيروان مستەفاوە نزيكن باس لەوەدەكەن كە بەكارهينانى فيكرى چەپ لە لايان نەوشيروانەوە وەكو هۆكاريك بووە بۆ كۆكردنەوەى جەماوەر بەو پييەى فيكريكە تواناى كۆكردنەوە و ريكخستنى هەيە لەدەرەوەى خۆى

سەرەراى ئەوەش بەدريژاى ميژووى يەكيتى نەوشيروان مستەفا چەقۆيەكى تيژبووە لەسەر ملى چەپەكانى دەرەوەى يەكيتى لەم رووەشەوە زەبرى كوشندەى پيگەياندون

ئيستا نەوشيروان لەسەرەتاى ريگايەكدايەو هەمووهەولى خۆى و هاوريكانى چر كردۆتەوە بۆ سەرپيخستنى دەزگا ئيعلامييەكەى كەپيك ديت لە سايتيكى ئەنتەرنيت و رۆژنامەوگۆڤارو راديۆو تەلەفزيۆن رۆژنامەوانەكان كەژمارەيان ٤٥كەس دەبوو لە هۆليكى ئەو بينايەدا كە دەكەويتەسەر گردەكەى زەرگەتە خەريكى راهينانى بەردەوامن

**قادرى حاجى على:** ئەندامى مەكتەبى سياسى يەكيتى و دامەزرينەرى دەزگاى زانيارى كە پينج سال پيش ئيستا وازى لە يەكيتى هينا ئيستا بەريوبەرى گشتى دەزگاكەيەو

حەمەتۆفیق رەحیم بەرپرسی بەشی لیکۆلینەوە و روشدی عەزیزی وەزیری پیشووی دادو راویژکاری یاسایی و محمدعارف کە بەپۆستی وەزیر خانەنشین کراوە بەریوبەری ئیداریی دەزگاکەیە

لە بینای دووەمی دەزگاکەش کە دەکەویتە پشت مەکتەبی سیاسی یەکیتییەوە لەبەختیاری بابەکردرەیی بەرپرسی بەشی دامەزراندن و پەیوەندییەکان سەر قالی کۆکردنەوەی رۆژنامەوانە نوییەکانە لەسەرو هەموشیانەوە نەوشیروان مستەفا وەکو سەر پەرشتیارو خاوەنی کۆمپانیاکە دەبینریت بەلام هیشتا ئەنجومەنی بەریوبردن لە هەیکەلی ئیداری ئەم کۆمپانیایەدا دیا نییە

جگە لەو ناوانە لەنیو رەمزە دیارەکانی کۆمپانیاکەدا سالار عەزیز کە لەدوای شەهید بونی ئارام سکرتیری یەکەمی کۆمەلی رەنجدەران بوە دەبینریت هەرچەندە تائیستا لە نیو هەیکەلی ئیداری دەزگاکەدا پۆستیکی دیاری نییە

بەرپرسانی دەزگاکە ئاماژە بەوەدەکەن کە لەپیش مانگی ئازاردا سایتە نوییەکەیان دەکەویتە کار بۆ رۆژنامەکەشیان سەرەرای ئەوەی کە سەردار عەبدوللا بەشیوەیەکی رەسمی دەستنیشان کراوە بەلام پیدەچیت هەتا هینانی چاپخانەیەکی نوی دەرنەچیت ئیستا دەزگاکە چاوەری خالی سەرەتی دەستپیکردن، بەلام لە دوودلی و رارای گەورەدان و لەوە دەترسن کەخالی دەستپیکیان لەئاستی چاوەروانیەکانی جەماوەردا نەبی

## یەکیتی لەنیوان شەری دەرکردن و ئینشیقاق بونیکی هەمیشەیدا

جیابونەوەی کوتلەیەك لەنیو یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان و دروستبونی ململانی لەنیوان هەردوو خەتی گشتی و ریفۆرم لەسەرەتای دەرکەوتنیەوە تائیستا، کیشەی نیو خۆی لەنیو یەکیتیدا دروست کردووە کەهەندیك جار ئەمە کاردانەوەیەکی سلبی گەورەی هەبوە لەسەر بەرپرس و پلە دارەکانی سەر بە بالی ریفۆرم کەرووبەرووی دەکردن و لەنان برین بونەتەوە لەلایەن دەسەلاتدارانی بالی گشتی و هەندیك جاریش دەبنە چاودیریك بۆ ئەوەی کە زۆربەی کادیران و ئەندامانی خۆیان بخەنەژیر ـ لیکۆلینەوە تاکو ئەگەر لایەن گری بۆ خەتی گشتی دەربکەویت، بەهەمان شیوەی کادیرانی تر دەربکریت.

پاش دروست بونی ناکۆکی هەردوولا، ریکابەرییەکی هەمیشەی کەوتە نیوان هەردوولاوە، تەنانەت کاردانەوەشی لەسەر خەلکی کوردوستان بەجی هیشتوە بەرامبەر بە لایەنگریکردن

لەیەکێك لەم دوو کوتلەیەیەی نێو یەکێتیی، بەلام ئەم کێشانە بەمەترسیەکی پرکێشە ئەژمار دەکریت و پێناچێت کۆتای هەلبژاردنەکانی هەریمیش کۆتای بەم سیناریۆیەی بالی گشتی و بالی ریفۆرم بهێنیت، چونکە یەکێتی لەسەرەتاوە پێگەی جەماوەریکی زۆری هەبووە لەکوردوستان، ئێستا ئەوکورسیانەی کە هەی بووە بەشیکی زۆری لەکیس بچیت، ئەوە نیگەرانییەکی گەورە دروست دەکات لەلایەن بالی گشتییەوەو بەشیکی زۆری جەماوەری لەکیس دەچیت و پایەو هەیبەتی دەسەلاتی وەکو جاران نامینیت، تەنانەت بەشیکی زۆر لەناوچەکانی کوردوستان لەبەر نارەزای و نیگەران بونیان، زۆربەی کەمتەرخەمیەکانی حکومەت دەخەنەوە ئەستۆ ی حیزب و پیان وایە حیزب هۆکاریکە بۆ ئەوەی کە حکومەت لە رووی ئەدائی کارکردنەوە جیاواز بیت زۆر جاریش لە چەند ناوچەیەکی جیاوازدا کاردانەوەش بەرامبەر بەم حیزبانە هەبوە هەندیك جار لایەن گۆران و پالپشتیکەرانی ریفۆرم بەشیوەی جیاواز چی بەنهێنی بیت یان بە ئاشکرا پشگیری خۆیان بۆ گۆران و چاکسازی دەر دەبرن کە ئەمە هیچ کات لەگەل خواست و ئیرادەی یەکیتیدا ناگونجیت

## یەکێتی لەنیوان گومان و ئینشیقاق بووندا

هەموو ئەو هۆکارانەی کەبوونە هۆی ئەوەی کەلایەنگرانی ریفۆرم پێگەو جەماوەریکی زۆریان بۆخۆیان کۆبکەنەوەو ببنە لایەنیکی رکابەری بەهێزی بالی گشتی وایکرد یەکێتی بەدوای ریگە چارەیەکی تردا بگەریت بیر لە هەولی نوی بکاتەوە گەر ئەویش دەرکردنی کادیرانی یەکیتیە لە کۆمیتەو مەلبەندەکاندا تەنانەت لەبەر مەترسی دروستبون کادیرانی یەکیتی ناتوانن خۆیان یەکلای بکەنەوە چونکە هەرجاریك یەکلایکردنەوە لەلایەن کادریکی یەکیتییەوە کرابیت ئەوا کاردانەوەیەکی سلبی راستەو خۆی هەبوە لەسەر دەرکردنی لەدام و دەزگاکانی ژیر دەسەلاتی بالی ریفۆرمدا یان کۆمیتەو مەلبەندەکانی یەکیتی بەم کارەشەوە نەوەستاوە هەمیشە چاودیری خستۆتەسەر ئەو کەسانەی کە کادیری یەکیتین چونکە بەگومانە لییان نەوەکو بەشیوەیەکی نهێنی کار بۆ کوتلەی نەوشیروان مستەفابکەن لەژیر دەسەلاتی یەکیتیدا بەلام زۆرجار ئەم بەد گومانییەی یەکیتی زۆریك لەکادیرانی لەئۆرگاکانیان دوورخستۆتەوە ئەگەر لەسەر کەم تەرخەمیش بیتبالی نەوشیروان کراوە بەبەهانە ناچار ئەم کەسانەش داویانەتە پال کوتلەی ریفۆرم و بەم کردەوانەش

بۆشاییەکی گەورە دروست دەبێت لەجێگەکانیان چونکە ناتوانرێت هەروابە ئایانی ئەو بۆشاییانەی یەکێتی پڕبکرێتەوە لەماوەیەکی کوتدا کەببێتە جێگەی ڕەزامەندی و ڕاکیشانی خەلك بۆ نێو ئۆرگانە جیاوازەکانی یەکێتی نیشتمانی بەلام لەگەل نزیکبونەوەی وادەی هەلبژاردنەکاندا ئەم کاردانەوەیە زۆر زیاتر بوە لەئاستی دەرکردنی مانگەکانی ڕابردوو بۆیە پێدەچێت ئینشیقاقیکی گەورە لەمەلبەندو کۆمیتەکانی یەکێتیی پەیدا ببێت

## ئاگاداربیەکانی بالی گشتی بۆسەر ریفۆرم

یەکێتی لەبەرامبەر ئەم جۆرە کارکردنە نهێنیانەی کەبۆ نەوشیروان مستەفاو لیستەکەی دەکرێت بەشوەیەکی ڕەسمی کاربەدەستانی سەربالی ریفۆرم ئاگادار دەکاتەوە تاکو خۆیان یەکلای بکەنەوە و کۆتا بڕیاری خۆیان بدەن لەبارەی لایەنگرانی بۆ کام لایەو دەنگ بۆکێ دەدەن یان سەرەڕای ئەمە ئەو گومانە هەمیشەییەی یەکێتی وای کردووە لەکار بەدەستانی سەربەبالەکانی خۆشیان بەگومان بن و هەمیشە ئاگاداریان بکەنەوە کەمەلبەندیان کۆمیتەکانی یەکێتی دلنیا بکاتەوە لەسەر ئیشکردنیان لەگەل کام لایەدا ئەگەرنا بەهەمان شێوە نان بڕاو دەبن دوای ئەوەی کەلە کەنالە سەربەخۆکەی نەوشیروان دەبینرێت چەندین کەس خۆیان بۆ نەوشیروان و لیستەکەی دووپات دەکەنەوە بەشێکیان هەمان ئەو کەسانەن کەئێستا بە هۆ ی دەرکردنیانەوە یان ئاگادارکردنەوەیان لەلایەن بالی گشتیەوە دەرکراون

## یەکێتی دەیەوێت فزولەکان لاببات

سەرەڕای هەمووئەمانە زۆرێك لە کادیرانی یەکێتی ڕووبەڕووی فشارە هەمیشەییەکی یەکێتی دەبنەوە بۆیە ئەویش لەهەولی ئەوەدایە ئەوکەسانەی کەوەکو سیخور یان جاسوس یان فزول لەناو یەکێتیدا دەردەکەون بەیەکجارەکی دەربکرێن بەپێی ئەو هەوالانەی کەلەنێو ئۆرگاکانی یەکێتیدا دزەی کردوە ئەوکەسانەی کە هەوالی یەکێتیی و بالی گشتی بباتەوە دەرەوە بەفزول دەناسرێت ودواتر ئەم کەسانە دەردەکرێن و وەرناگیرێن تەنانەت بەهۆی پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەل کادیرێکی سەربەبالی ریفۆرم کادیرێکی یەکێتی لەسەر وەزیفە حیزبییەکەی لابرا بۆیە لەبەر ئەم هۆکارانە زۆربەی کادیرانی سەربەبالی گشتی لەبەردەکرێن و نان بڕین پەیوەندییەکانیان لەگەل دۆست و ناسراوەکانی ریفۆرمدا بڕیووە

## کرین لەبەرامبەر هینانەوەدا

زۆریك لەبەرپرسەکانی یەکیتیی کەپلەی ئیداری حکومەتیان هەیە سەربەبالی ریفۆرمن دەرکردنی ئەم جۆرە کەسانە زیانیکی زۆرلەداهاتوی یەکیتیی دەدات جاریکی تر هینانە کایەی ئەم جۆرە کەسانە لەمەودایەکی نزیکدا هەروا ئاسان نییە بۆ نمونە ٩٣ئەفسەری سەربە وەزارەتی ناوخۆ بەبیانوی ئەوەی کە ریفۆرمن لەگەل ئەوەی کە زۆریك لەوکەسانە خولەکانی خویندنی سەربازییان بینیوە بەلام دەرکراون لەگەل ئەمانەدا ئیستا یەکیتی پیشبینی چەند حالەتیکی کردووە ئەویش ئەو کەسانەی کە پلەکانیان بەئاسانی کەسیان لە جیگە دانانریت و پیویستی بەراهینان و کاتیکی زۆر هەیە و شارەزاییەکی زۆری پیویستە بەتایبەت بەرپرسەکانی سەر سنوری فەرماندەی بەشیکیان سەر بەبالی ریفۆرمن کە کاردانەوەی دەکردن و پلە لیسەندنەوە لەم جۆرە کەسانە کەمە چونکە ئەگەر بەرامبەر ئەم کەسانەش ئەو کارانە بکریت و کەسانی نەشارەزاو نەشیاو لەجیگەی ئەو کەسانە دابنریت کە سەردەمیکی زۆریان بریوە لەم جۆرە کارانەدا پاریزگاری و بەرگری کردن لە سنوری هەریم بەرەو لاوازی دەچیت بۆیە چەندین بەرپرسی یەکیتی لەم جۆرە هینراوەتەوە ناو بالەکانی یەکیتیی و هەندیکیشیان بە وەرگرتنی پارەو بەخشیش بالی ریفۆرمیان بەجیهیشتوە

## کەسایەتیو بنەمالە دەچنە لای نەوشیروان مستەفا

بەرامبەر بەدەربرینی پشتیوانی بۆ لیستەکەی نەوشیروان، زۆرێك لەکەسایەتی و بنەماڵەی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دەچنە گردەکەو لەوێوە خۆشحاڵی خۆیان بۆلیستی نەوشیروان دەردەبڕن و لەوڕگەیەشەوە پشتیوانی بنەماڵەکان بۆلیستی گۆڕان و نەوشیروان مەترسییەکی گەورە بۆداهاتووی هەڵبژاردنەکانی هەرێم دەردەخات بەرامبەربەکمکردنەوەی بەشێکی زۆرلەدەنگەکانی یەکێتی، چونکەهەندێك ناوچە پەیوەندی کۆمەڵایەتییان زۆربەهێزە، ئەمەش هەلێك دەبێت بۆ ئەوەی کەڕیفۆرم رێژەیەکی باشی دەنگی ناوچەکانی کوردستان لەهەڵ بژاردندا لەلایەن کەسایەتییە ناودارەکان وبنەماڵەکانەوە بەدەست بهێنێت.

## نوێنەرەکانی گۆڕان و بەدوای بەرژەوەندیدا

لیستی گۆڕان لیستی نەوشیروان مستەفایەو لیستی لێپێچینەوەیە لەگەڵ گەندەڵکاران وئەنجامدانی چاکسازی وگۆڕان لەهەرێمدا، بەتایبەت ئۆرگانەکانی یەکێتی کاروباری ئیدارییە، بەڵام ئێستازۆرێك بەناوی لیستی گۆڕان وگردەکە دەچنەگووندەکان و سەردانی هەندێك ناوچەدەکەن بەرامبەربەئەنجامدانی چەندین کاری گرنگ بۆیان ، بەڵام ئەم جۆ رەکەسانە هیچ کاتێك نەبوونەتە جێگەی دڵخۆشی بۆخەڵکی ناوچەکە، چونکە ئەم جۆرەکەسانە هەندێکییان مێژوویەکی پاکیانییە لەگەڵ ئەوەی کە نەوشیروان مستەفا خۆی لەگەڵ ئەمەدا کۆك نییە کەکەسانێکی گەندەڵ لەناو لیستە کەیدا بن وەك بەشوەیە کەخۆی بانگەشەی بۆدەکات، بۆیەزۆرێك لەوکەسانەی باسکران دەیانەوێت لەرێگەی هەڵبژاردنەوە دژایەتی هەردوولیستی کوردستانی و لیستی گۆڕان بکەنە پردێك بۆپەڕینەوەی بەرژەوەندییەکانیان ، تاکو بتوا نن ئەمەبکەنە هەلێك و قازانجێکی مادی و پلەیەکی مەعنەوییان هەبێت لەپۆستی حیزب یان حکومەتدا.

## لیستی گۆڕان لەنێوان گۆڕان و نەگۆڕانیدا

دژایەتی لیستی گۆڕان دژی گەندەڵکاران و بڵاو بونەوەی وشەی ڕیفۆرم بەسەرزاری خەڵکی کوردستانەوە بۆتەوشەیەك کەبەووشەیە بێت سەرتاپا گۆڕانەکان باڵ بەسەرهەموو شتێکدادەکێشێت، بەڵام ئایائەم گۆڕانە بەپێی ویست وئیدارەو بەرژەوەندییەکانی نەوشیروان مستەفایە یان خەڵك، چونکە زۆرێك لەبەرپرس و کەسانی جیاواز هەن لەناو(**ریفۆرم**)دا کەزۆربەیان فایلیان هەیەو هەندێکیشیان بەژداری گەندەڵیان کردووە، بەڵام لەبەرامبەرئەمەشدا هەمیشە ڕیفۆرم بووەتە ئەووشەیەی گەندەڵکاران سزادەدا ت وئەوکەسانەی کەرپوولەکۆمپانییای وشەدەکن، بەکەسانی پاك و بێگەرد لەقەڵەم دەدرێن، هەرلەبەرئەمەشە زۆرجارخەڵکی کوردستان دوودڵ دەبن بەرامبەر بەپشتگیری کردن بەیەکێك لەم دوباڵەی ناو یەکێتی، چونکەپێیان وا یە پێشترئەمانە هەرئەوکەسانەبوون کەلەناو دەسەڵاتدا بوون، بەڵام ئایا ئەمان دەتوانن گۆڕان بکەن، یان تەنیا دژایەتی باڵی گشتی وبەدەست هێنانی کوورسییە بۆبەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان.

## دیاری و بەخشیەکانی یەکێتی ونییەتی خەڵك

لەم ماوەیەی ڕابردوودا چەندین سەرۆك هۆزو کەسایەتی ناسراو ، دەمانچەو ئۆتۆمبیلیان پێگەیشتووە لەلایەن باڵی گشتییەوە وەکو دیارییەك بۆمانەوەی ئەوکەسانەی کەهەرلەناو باڵی گشتیدابوون و ئێستاش لەناو هەمان خەتدان بۆئەوەی ئەوسەرۆك هۆزانە بتوانن کۆنترۆڵی ناوچەکانی خۆیان لەدەست نەدەن و دەنگەکانی یەکێتی بۆخۆیان قۆرخ بکەن، بەلاَم ئەوکەسانەی کەچاوەڕێی ئەوەن کەپشکێکی ئەم بەرژەوەندییانەیان بەربکەوێت، لەچاوەڕوانی ئەوەشدان لەباڵی ڕیفۆرم یان گشتی خۆی بکات بەناو ماڵەکانیاندا، بۆئەوەی بتوانن سود لەم هەلەوەربگرن، بەلاَم لەبەرئەوەی نەوشیروان وەکو کوتلەیەك خۆی دەرخست و چووەگردەکەو لەوێ کۆمپانیای وشەی بنیات ناو لەڕووی ئابوورییەوە توانایەکی ئابووری بەهێزنییە، بۆیەهەرلەم ڕێگەیەوە دەتوانرێت چەندین کەس بکڕێت و دەنگەکان ببەنەناو یەکێتی و باڵی گشتی.

لەبەرامبەرهەموو ئەمانەدا تەبادوولێك لەنێوان هەردوولادارِوی داوە لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا چەندین کەس تەنیابێ کارو کاسپی کەوتوون ، ئەمەش بەهۆی شەڕی ساردی نێوان نەوشیروان و باڵی گشتی واتە یەکێتی نیشتمانی کوردستان. .

## ریفۆرم بارەگادادەمەزرێنێت

بۆزیاتر ئاشنابون و تێکەلاَو بونی خەڵك لەگەڵباڵی ڕیفۆرمدا، کەسانی سەربەنەوشیروان مستەفا لەچەند ناوچەیەکی جیاواز بارەگا بۆباڵی ڕیفۆرم دروستدەکەن و هەندێك جارلەلایەن خەڵکی تایبەتییەوە ئامادەباشی ئەوە ڕاگەیەنراوە کەخانووی خۆیان پێشکەش بەنوێنەرانی نەوشیروان مستەفا بکەن بۆئەوەی بتوانن وەکو کۆمیتەو ررێکخستنەکانی یەکێتی بەرگری لە تێکەلاَو بوونی هاولاَتیلن وبونی دەسەلاَتی کوتلەکی نەوشیروان مستەفا لەوناوچانەدا بسەلێنن، ئێستاش جموجولێکی بەردەوامی ڕیفۆرم لەناوچەجیاوازەکانی کوردستان بەردەوامە بۆلاوازکردنی کارو چالاکییەکانی یەکێتی بەهۆی دامەزراندنی بارەگاکانی ریفۆرم لەناو مالاَندا و کارکردنی کادیرانی ڕیفۆرم لەم بارەگایانەدادەتوانن باشتر چالاکییەکانییان ئەنجام بدەن ، ئەمەنیشانەیە بۆئەوەی کە ڕیفۆرم وەکو رکابەرێکی بەهێز ی یەکێتی و هەڵوەشاندنەوەی بینای یەکێتی کاردەکات تاکو لەورێگەوە یەکێتی ستراتیژییەتی دەسەلاَتی لەدەست بدات. .

## گەرانەوە بۆ بیرەوەریەکان

**بزاو( علی حەمە سالح ـ فەرەیدون ئەحمد )**

هەفتەی رابردووجەلال تالەبانی سەرۆل کۆمار ی عیراق بۆ بەشداربون لە کۆبونەوەیەکی چوار رقۆلی لەنیو میسرو یەمەن سوودان و عیراق گەیشتە قاهیرە دەمو دەست لەگەل گەیشتنی سەرۆك کۆماری عیراق کۆبونەوەی چوار قۆل ی دەستی پیی کرد هاوکات سەردانی مام جەلال وکۆبونەوەی لوتکەی هەر چوار ولات چالاکییەکانی پالەوانیەتی وەرزشی عەرەب لە قاهیرە بەریوە چوو تالەبانی بە هاورییەتی شەرکردەو پادشاکانی دیکەی عەرەب ئامادەی ریورەسمی ئاهەنگی کردنەوەی ئ ە پالەوانیەتە بوو ریورەسم بەهاتنەناوەی شاندی وەرزشی ولاتانی عەرەب کرایەوە لەگەل گەیشتنی شاندی عیراق بۆ ناو یاریگە مام جەلال لە شوینی خۆی هەستایە سەرپی و بەبەرز کردنەوەی هەردوو دەست سلاوی سۆزوو وەفاداریی سەرۆکی پیشکەش بە شاندی ولاتی کرد جۆش و خرۆشی مام جەلال بەگەیشتنی شاندەکە و هاتنی ناوی عیراق پتر جەماوەری ئامادەبووی هەژاند و یاریگە بوو بەیەك پارچە چەپلە ریزان ئەم هەلسوکەوتەی مام جەلال کە لەفەرهەنگی سەرکردەکانی ولاتانی عەرەبدا نامۆیە جۆرە شیرزەییەکی بۆ ئەوان دروست کرد جولەو ئاوردانەوەو نزیکبونەوە و قسەی ژیر لیوانی ئەو سەرکردە عەرەبانە دەیان ئاماژەی لیدە خویندرایەوە کەزیاتر بە لای نیگەرانی و نارەحەتیدا دەچوو دیمەنی تالەبانی لەناو یاریگەی نیودەولەتی قاهیرەدا وەك دەیان دیمەنی تری سیاسی عیراق لە رەوتی رووداوە سیاسییەکانی ناوچەکە دیاردەی تازەو نائاساین لە ژیانی سیاسی ئەو ولاتانەدا ئەگەرچی لەوکاتەوەی تالەبانی بوەتە سەرۆك کۆمار سەردانی چەندین ولاتانی عەرەبی کردووە بەلام سەردانی ئەم جارەی سەرۆك کۆماری

عیراق جیا لە سەردانەکانی دیکە وەلامدانەوەی چەندین پرسیارە کە لەهەر یەکەم رۆژی وەرگرتنی ئەم پۆستە لەلایەن تالەبانییەوە لە سەکۆکانی راگەیاندن و سیاسەتەوە دەخرینە روو هەرکەس و بەستایلی ئەو دەشتاییەی لیی دەخوری کەلە ئاسۆی ئەوانەوە دیارە کۆبونەوەی ئەم جارەی تالەبانی لەگەل سەرۆکی سی دەولەت کە میراتگری پەیامی شۆڤینیەتی عرووبەن خودی تالەبانیش لەدیمانەیەکی لەگەل کەنالیکی ئاسمانی میسری

ئاماژەی بەو لایەنەدا کە قاهیرە پایتەختی عرووبەیەو گرنگە لەویوە ولاتانی عەرەب لەگرفتەکانی عیراق تیبگەن لەوکاتەوە تالەبانی پۆسی سەرۆك کۆمار ی عیراقی وەرگرتووە سادەترین لیدوان و هەلویست و پرۆتۆکۆلی سیاسی دەبیتە جیی سەرنج و بەدواداچونی سیاسی و پرسیار و وەلام و پەرچەکرداری فراوان و بەدواداچونی زۆر بەدوای خۆیدا دینی ئەو کە سەرۆك کۆماری عیراقە لە چەندین لاوە مەست و حەیرانە کەباس لە ناسنامەی عەرەببونی عیراق دەکات لە چەندین سەنگەرەوە دەبیتە جی تیرو توانج و ئامانج لە لایەك خودی عەرەب بەتایبەتی ناوەندی رادیکالە ناسیونالیست و ئیسلامییەکان نیشانەی سەر سورمان دەخەنە سەر قسەکانیی و بەگومانەوە سەیری هەلویستەکەی دەکەن لە جیاتی هەلویستی راستەقینەو ستراتیژی بەتاکتیك و مانۆری لیك دەدەنەوە کە ئەو هەلویستانەی تالەبانی رەهەندی شاراوەیان لە دواوەبیت وەك دەمامکی داگیرکردن ولەت لەتکردنی عیراق دەیخویننەوە لەلایەکی دیکەوە کەتالەبانی نوینەری کوردە لە هاوسەنگی لایەنە سیاسیەکانی عیراق هەمیشە هەلویست و لیدوانەکانی بۆتە جیی رەخنەو توتنجی ناوەندە سیاسیەکانی کورد پیان وایە هەناسەی ئاخاوتنەکانی تالەبانی لە قاهیرە و دیمەشق و خەرتومیش بەهەناسەی سەرگەلوو بەرگەلو بیت و لەو بۆنانەدا بەجلی کوردییەوە بەشداربیت بەبروای ئەم لایەنەش ئەگەر سەنگی سیاسیانەی یکورد نەبوایە لە هاوکیشەی سیاسیی ئەمرۆی عیراقدا هەرگیز سوننەیەکی شەرکات و شیعەیەکی چپایش بەهیچ شیوەیەك قبول ناکەن تالەبانی بیتە سەرۆك کۆماری بەشیك لە عیراقی عروبە ئیبراهیم جەعفەری و لەیس کوبە کە دوو سیاسەتکار ی دوای روخاندنی سەدامن داوایان کردووە پۆستی سەرۆك کۆماری لە تالەبانی بسەندریتەوە بدریتە یەکیکی سوننە چونکە عیراق بەشیکە لە جیهانی عەرەب نابی سەرکۆمارەکەشی کورد یان غەیرە عەرەب بیت لەلا ی سییەمیش ئەمەریکییەکان سەرۆك کۆمار وەك فەرمانبەریکی بالیۆزخانەی خۆیان دەبینن کە نابی چوارچیوەی سنوری ئەو هیلانە ببەزینی کە ئەوان دیارییان کردووە جا راگرتنی هاوسەنگی لەنیو ئەم ئەم ئاراستە لیك ئالاوانە کاریکی سەختە بۆ تالەبانی بەشیك لەو تیرو توانجەش پیوەندی بە ئیرەیی هەند ناوەندی عەرەبی و غیراقیەوە هەیە بەرامبەر چالاکیەکانی سەرۆك کۆمار بەبروای هەندیك سەرۆك کۆماری پۆستیکی سیمبۆلیکە تالەبانی سییەکی سیمبۆلیکەیە بەلام ئەوان تا ئاستیك بی ئاگان کە سەرۆك کۆماری عیراق بەزەبری پیگەی سیاسی دیپلۆ ماسیەتی خۆی توانیویەتی هاوسەنگی بالانسە سیاسیەکان

راست بکاتەوە شێرازەی پەیوەندیەکانی عێراق لەسەر ئاستی دەرەوە رابگیریت بۆ نمونە شانشینی سعودیە ئامادەی خۆی نیشاندا کە پیشوازی تالەبانی بکات وەك سەرۆکی شاندی عێراق بەلام ئەو گەرموگوڕییەی بەرامبەر بە مالیکی نیشان نەدا هەرئەمەش وای کرد خەلکێك لە دەستوپیوەندەکانی مالیکی ئیرەییان بە هەلسوکەوتی تالەبانی بیت و نیشانەی پرسیار بخەنە سەر ئەو پرۆتۆکۆلانەی لە کۆشکی کۆمار بەڕیوەدەچیت و رەخنە لە تالەبانی بگرن و نەریتی نامۆ بروانن هەندی ریوشوین و پرۆتۆکۆلی سەرۆك کۆمارو پرسیار بکەن کە چۆن دەبی سەرۆك کۆمار دوای تواوبونی کۆبونەوە لەگەل وەزیریکی عێراقی کۆنگرەی رۆژنامەنوسی ببەستی بەبی ئەو لایەنە لەبەرچاو بگرن کەتایبەت مەندی کەسایەتی سیاسی ئەو لە تەواوی سەرکردەکانی تر عێراق جیاوازە ئەو کەلەنەوەی سەرکردە گەلیکی وەك یاسر عەرەفاتە لە سیبەریکی ئەزمونیکی شۆرشگیرییەوە گەیشتۆتە ئەم پلەیە ناکری لەگەل یەکیکی وەك عەدنان پاچەچی بخریتە تای تەرازووەوە کە لە دامینی تەلارەبەرزەکانی دوبەی هاتۆتەناو کەش و هەوای سیاسی بۆ یە هەندیك جار ئەگەر مام جەلال وەزیریکی عێراقیش دوای کۆبونەوە کۆنگرەی رۆژنامەوانی ببەستیت ئەوا هەندیك هاوکیشە و پابەندبوونی سیاسی وای لیدەکات گوی بە پرۆتۆکۆلی نەدات وکۆنگرەی رۆنامەنوسی ببەستیت یەکیك لەو سەروەریانەی تالەبانیش لەماوەی سەرۆك کۆماریدا بۆ خۆی تۆماری کرد بەتال کردنەوەی پیرۆزی ئەو سیمبۆلیکەیە کە پیشتر لەنیو رژیمە عەرەبەکاندا باو بوو.

## تالەبانی و میسر پەیوەندییەکی دیرین

بەشیك لەو لیدوانە سۆز ئامیزانەی تالەبانی بەرامبەر بەمیسردا بۆ ئەو بیرەوەریانە دەگیریتەوە کە پیشتر هەیبووە ئەو کەلەسالانی ١٩٧٣ـ١٩٧٤ لە میسر ژیاوە ئاشنایەتییەکی قولی کلتورو ژیانی کۆمەلایەتی ئەوان هەیە بۆ یە لەبۆ نەیەکی ئاوادا ئەو هەست و سۆزە تیکەل بەلیدوانی سیاسی وادەکات کە رەنگ بیت بۆ جەمسەریکی نیو هاو کیشەی ئیستای سیاسی عێراق ئاسان نەبی هەرسی بکات تالەبانی لەسالی ١٩٥٧دا سەردانی سووریاو لەپیشەوە مۆسکۆی کردووە لەم سەفەرەیدا توانییویەتی رەزامەندی حکومەتی میسری وەربگریت بۆ کردنەوەی ئیستگەیەکی کوردی لە قاهیرە

دەگونجێت ئەمە سەرەتای پەیوەندییەکانی تاڵەبانی و میسربێت لە ساڵی ١٩٦٣دا جارێکی دیکە سەردانی میسر دەکاتەوەو چاوی بە سەرۆك جەماڵ عەبدولناسر دەکەوێت و لەگەڵیدا باس لە کێشەی کورد دەکات

تاڵەبانی لەبارەی ئەم سەردانەی دەڵێت لەساڵی ١٩٦٣دا شەرەفی ئەوەم پێ برا لەگەڵ سەرۆکی نەمر جەمال عبدولناسردا وتوویژ بکەم بۆ رونکردنەوەی راستییەکان دەربارەی مەسەلەی کورد دۆزینەوەی چارە سەریکی دادوەرانە بۆ مەسەلەی کورد لە باوەشی نەتەوەی عەرەبدا و بەهاوکاری لەگەڵ بزوتنەوە نەتەوەییەکاندا

## پێشنیازیکی تاڵەبانی بۆ یەکێتی عەرەب لەساڵی ١٩٦٣دا

کاتێك میسر ویستی یەکێتییەکی عەرەب لەنێوان عێراق و میسرو سوریا دروست بکات تاڵەبانی پێشنیاریکی گرنگ دەخاتە بەردەم عبدولناسر تا کوردوستانیش بتوانێت بەشداری ئەو یەکێتییە بکات

دکتۆر جەمال ئەتاسی کە یەکێك بووە لە سەرکردە ناسریەکانی نزیك لە سەرۆکی ئەوکاتی میسرەوە لەم بارەیەوە دەگێڕێتەوەهەندێك لە سەرکردەکانی کورد لەگەڵ وەفدی عێراقدا بوون کەلە سەرویانەوە جەلال تاڵەبانی بوو لەمیانەی وتوویژەکانی یەکگرتن کەبەریوە دەچوو جەلال تاڵەبانی ئەم بۆچونەی خستە روو ئەگەر ئێوە دەتانەوێت یەکێتییەکی کۆماری بۆ یەکگرتنی میسرو عێراق و سوریا دروست بکەن داواکاری ئێمەش وەك نیشتیمان پەروەرانی کورد ئەوەیە کە حوکمیکی زاتیمان هەبێت لەناوچە کوردییەکاندا لە چوار چێوەی یەکگرتنە سی لایەنییەکەدا ئەگەریش دەتانەوێت بەشێوەیەك کۆماری عەرەبی بێت ئێمەش دەمانەوێت ناوچەی کوردی هەرێمی چوارەم بێت لەناو هەرێمەکانی ئەم کۆمارەدا واتە عێراق و سوریاو میسر وکوردوستان دکتۆر ئەتاسی درێژە بەباسەکەی دەدات و دەڵێت سەرۆك عبدولناسر بەم پێشنیازە خۆش حاڵ بوو هەرلەکاتەوە تاڵەبانی و براکانی پەیوەندییەکی باشیان هەبوە لەگەڵ میسری عبدولناسردا بەلام پرۆژەی یەکگرتنەکە شکستی هینا نە بەشێوەی یەکێتییەکی چەند کۆمایی و نە بەشێوەی کۆماریکی عەرەبی دونیای نەبینی.

## سەردانی میسر و گلەیییەکان لە تاڵەبانی

ئاژانسی دەنگوباسی سعوودیە لەبارەی ئەم سەردانەی دواییەی تاڵەبانییەوە بۆ میسر دەنوسیت جلال تاڵەبانی سەرۆك كۆماری عیراق داوای لەعەرەب كرد عیراق بەتەنیا جێ نەهێلن لەم بارو دۆخەدا تا هاولاتیان عیراق هەست بە عەرەبایەتی خۆیان بكەن عەرەب رۆلێكی گەورەتر ببینن لە ولاتەكەیاندا.

بە پێی رۆژنامەی شەرقلئەوسەتیش سەرۆكی عیراق گوتویەتی هەر كارێك كە پارتی كریكارانی كوردوستان دژبە توركیا لە خاكی عیراقەوە بكات دژ بەگەلی عیراقە لە توركیا حوكمەتێكی دیموكراتی هەلبژێراو هەیە كەدەستكەوتێكی زۆری هەیە ئەم دەستكەوتانەش لە بەرژەوەندی گەلی توركدایە بەهەموو تاكەكانیەوە هەروەها لەبەرژەوەندی گەلی عیراق و نەتەوەی عەرەب و ئیسلامیدایە .

## نرخاندنی رۆلی تاڵەبانی لە پۆستی سەرۆكایەتیدا

ئەوكاتەی تاڵەبانی وەك نوێنەری كورد بۆ پۆستی سەرۆكۆماری عیراق دەستنیشان كرا هودەل حوسینی لە رۆژنامەی ئەلحەیات خوێندنەوەیەكی بۆ ئەو هەنگاوەی كورد كرد بەبروای نوسەری ناو براو هەلبژاردنی تاڵەبانی بۆ ئەو پۆستە حیكمەتی وردی سەركردایەتی سیاسی كورد دەگەیەنیت كە ئەو قۆناغە بە ویستگەیەكی كاتی و تاكتیكئامیز لە رەوتی سیاسی عیراق دادەنریت تاڵەبانیش كە قولاییەكی سیاسی لە نیوەندی ولاتانی ناوچەكەدا هەیە دەتوانیت ئەو هەنگاوە ستراتیژییە لەبەرچاوی ئەوان بشاریتەوە كە بارزانی لەسەر ئاستی نەتەوەی بەهەمانگی لەگەل ئەمریكاییەكاندا كاری بۆ دەكات جا **لیرەدا پرسیاری هەرە زەق ئەوەی ئایا: تاڵەبانی تا چەند لە جیبەجی كردنی ئەم تاكتیكە سەركەوتوبووە؟**

خودی سەرۆك كۆمار لە چاوپیكەوتنێكی تەلەفزیۆنی لەگەل كەنالیكی میسریدا وەلامی ئەو پرسیارەی لەسەر ئاستی عیراق داوەتەوە تاڵەبانی قسەیەكی علی سیستانی بە نمونە دینیتەوە كەلە پەیامیدا گوتبوی تاڵەبانی(**صمام الامان**)ی عیراقە ئەم قسەییەی علی سیستانی دان پیدانانیكی گرنگە بۆ توانای تاڵەبانی لەراگرتنی ئەو هاوسەنگییانە پیشتر ئامازەیان پی درا ئەو كاردانەوەیەی لە پەراویزی لیدان و هەلویستەكانی تاڵەبانی دینە

ئاراوه له هەلومەجی ئەمڕۆی عیراقدا كه بـه قۆنـاغیكی هەسـتیاردا تیپـەر دەبیـت دیاردەی ئاسـایی و تەنـدروسـتن بـەلام هیـشتا دەكریـت دوور لـه هەلـچون و دەمارگـژی نەتـەوەیی و حیزبی كار بۆ خاوكردنەوەی ریتمی ئـەو لیدوانانـه بكریـت زۆرجـار زیـاد رۆشـتنی تالـەبانی لەسەر پرس و بابەتەكان له لیدوانه رۆژنامەوانییەكاندا جۆره لیلیـەك دەخاتـه سـەر دیـوی كردارییانەی تالەبانی كه ئەركیكی نەتـەوەیی لـه بەغـدا رادەپـەرینی و ئەمـەش هەسـتی رای گشتیی كورد بریندار دەكات كەدەلیت دەولەتی كوردی خـەیالی شاعیرانەیه لەلایـەكی تـرەوه تارادەیـەك بـەكردەوه سـەلماندوویەتی چـەتری كۆكردنـەوەی هەموولایەنـەكانی عیراقـه لـه بەغداد بەلام بەتۆمەت باركردنی مالیكی كەناتوانیت گەرەكیكی بەغدا كۆنترۆل بكات جۆره دل ئیشانیك له نیو لایەنی شیعەدا جی دەهیلیت به هـەموو دیویكدا سـەركەوتن و شكستی تالـەبانی بەشـیوەیەكی دژوارو سـەخت سـەركەوتن و شكستی هـەموو كورده شـەن وكـەوی رۆلەكەش ئەو رۆژه دەردەكەویت كەتالەبانی كۆشكی كۆماری جیدەهیلیت.

## کۆسرەت رەسول علی دوای نەشتەرگەری

**بزاو( علی حەمە صالح )**

دوای نەشتەرگەرییەکی سەرکەوتوو لە واشنتۆن هەفتەی رابردوو کۆسرەت رەسوول علی جیگری سەرۆکی هەریم و جیگری سکرتیری گشتی یەکیتی گەرایەوە کوردوستان لە ریورەسمی پیشوازیدا کۆسرەت رەسوول وتاریکی پیشکەش کرد جگە لەلایەنی تەندروستی خۆی ئاماژەی بە چەند چالاکییەکی خۆی دا لە واشنتۆن کە ئاماژەن بۆ ئامادەی ئەو بۆ فراوان بونی رۆلە سیاسیەکەی چ لەسەرۆکایەتی هەریم و حکومەت یانیش لەسەر ئاستی یەکیتی لەم بەدوادا چوونە هەول دەدەین هەندیك لایەنی ژیانی کۆسرەت رەسوول و رابردوو پیگەی جەماوەری و داهاتووی سیاسی بخەینە بەرچاو بەدواداچوون و قسەکردن لەسەر کۆسرەت رەسوول علی قسەکردنە لەسەر پیگە و کاریگەرییەکی بەهیزی لە ناو یەکیتی و حکومەتدا دوای گەرانەوەی کۆسرەت رەسوول علی لە ئەمەریکا تەواوی هاوکیشە سیاسیەکانی نیو یەکیتی و دەسەلاتی سەرکردایەتی کورد لە ئایندەو ماهییەتی کۆسرەت رەسوول علی خۆشی بە شیوەیەکی تر گۆرانی بەسەردا دیت بەهیزبوونی پیگەی کۆسرەت رەسول و وەرگرتنی چەندین پۆستیکی گرنگی حیزبی و حکومی لەماوەیەکی کورتدا لە ئەنجامی خەباتیکی کەمتر(**مەبەست کاتە**)لەچەندین بەرپرسی تری یەکیتی بەشیکە لە ئامانجی ئەم لیکۆلینەوە بەدواداچونە یەکیکی تر لە مەبەستی ئەم بەدواداچونە هەولدانە بۆ خستنە رووی ئەو فاکتەرانەی کە کۆسرەت رەسولی پی گەیشتە ئەو دەسەلاتە خستنە رووی ئەو هەنگاوە نوییانەش کە کۆسرەت دەیەویت بەهۆیانەوە بگاتە ترۆپك

## پیگەیشتنیکی خیرا

لەسەرەتاکانی سالی ١٩٨٤دا کاتیك یەکیتی سەرقالی گفتو گۆکردن بوو لەگە ل حکوموتی عیراق کۆسرەت رەسول هیشتا لەهەولیربوو ئەوکات لە ریکخستنەکانی ناو شاری کۆمەلەی رەنجدەراندا کاری دەکرد نەوشیروان مستەفا لە گفتوگۆکانی نیوان بەعس و یەکیتی رەوشی ئەوکاتی ناوخۆی کوردوستانماندووەبیت بۆ پشودان دیتە هەولیر کۆسرەت رەسول مالەکەی خۆی بۆ چۆل دەکات ئەمە سەرەتای لیك نزیکبوونەوەی دەبیت لەگەل نەوشیروان دواتر بەیەکەوە سەردانی شارەکانی مووسل دهۆکیش دەکەن ئەم نزیکبونەوەیەش دەبیتە

**هەوینی ئەوەی کۆسرەت لەمانگی ٧ی سالی ١٩٨٤دا لە سییەمین کۆنفرانسی کۆمەلەدا لە هەواری گانی سیو لە بناری پیرەمەگروون کە بەئامادەبوونی ٢٩٩ئەندام بەسترا بەئەندامی**
سەرکردایەتی هەالبژیردارا و عمر فەتاحیش کە هەر لە ریکخستنی ناو شاری کۆمەلەدا کاری دەکردبوو بەئەندامی یەدەگی سەرکردایەتی کەتا ئەوکات لە ریکخستنی شارەکاندا کاریان دەکرد لە دوای ئەوەش کۆسرەت رەسول هەولی دەدا لە رووی چالاکی پیشمەرگایەتیشەوە قورسایی خۆی لە ناو جەماوەری یەکیتیدا بیسە پینیت و پیگەی خۆی بەهیز بکات لە سالی ١٩٨٨دا کە دەسەلات و هیزی یە کیتی لە هەموو کاتەکانی تەمەنی ئەم حیزبە زیاتر دەبیت کۆسرەت رەسوول هیشتا نەگەیشتوبوە مەکتەبی سیاسی مەکتەبی سیاسی یەکیتیی ئەوکات بەرزترین دەسەلاتی بریاردانی ئەم حیزبە بوو کە پیك هاتبوو لە جەلال تالەبانی سکرتیری یەکیتیی و نوینەری شۆرشگیران د. فوئاد مەعسوم و نازم عمر بوون نوینەری کۆمەلەش نەوشیروان مستەفا و فەرەیدون عبدلقادربوون

کۆمیتەی سەرکردایەتیش کە ئەوکات بەرزترین دەسەلاتی بریاردانی سیاسی ناو حیزب وو لە ١٤ ئەندامی هەمیشەیی و(٥) ئەندامی یەدەگ پیك هاتبوو نوینەرانی کۆمەلە لە کۆمیتەی سەرکردایەتی ٧ کەسی هەمیشەی بوون کە کۆسرەت رەسوول یەکیکیان بوو لەگەل سی ئەندامی یەدەگ نوینەرانی شۆرش گیرانیش ٧هەمیشەی و ٢یەدەگ بوون کۆسرەت رەسوول وەك ئەوەی کە خۆی کاری بۆ دەکرد توانی لە ناوچەکانی هەولیر و دەوروبەریدا پیگەی خۆی بەهیز بکات لە سالی١٩٨٨یشدا وەك بەرپرسی مەلبەندی سیی هەولیر دەرکەوت کە بارەگاکەیان لە سماقوولی بوو ئەوکات یەکیتی تەنیا چوار مەلبەندی هەبوو مەلبەندی یەك لە سلیمانی و مەلبەندی دوو لە کەرکوك و مەلبەندی سیی لە هەولیر و مەلبەندی چوار لە دهۆك بەلام مەلبەندی دهۆك لاوازترین مەلبەندی یەکیتی بوو تەنانەت یەکیتی لە دهۆك هیندە بیی کادبر بوو لە ناوچەکانی ترەوە کادیرو بەرپرسانی بۆ دهۆك دەنارد لە دوای ئاشتبونەوەی یەکیتیش لە گەل(جود) بەگشتی و پارتی بەتایبەتیٗ دوای سالی ١٩٨٦ ەوە کۆسرەت رەسوول توانی پیگەی جەماوەری خۆی زیاتر بەهیو بکات

پاش رابەرین سەردەمی زێرینی کۆسرەت رەسوول

کوردوستانییەکان لە سەرووی هەموویانەوە کۆسرەت رەسوول هاتە ناوو شارەوە بەلام بەم شیوەیە خۆی نمایش کرد کە خەلکی وای هەست دەکرد کۆسرەت خاوەنی راپەرینە ئەمە سەرەتایەکی بەهیزبوو بۆ ئەوی کۆسرەت لەناو هەولیردا ببیتە کەسیکی جەماوەری دواتر بوو بە ئەندام پەرلەمان و لەگەل ئەوەشدا دەسەلاتیکی حیزبی فراوانی هەبوو توانی ئەو دەسەلاتە لە رووی کۆمەلایەتی و داراییەوە بە شیوەیەك بەکاربهینیت سەرنجی خەلکی هەولیر رابکیشیت کە داوای یارمەتی لی دەکرا بەوپەری دەسەلا ت بلاوی بەبی هیچ بەرامبەریك یارمەتی هاو ولاتیانی ئەم شارەی دەدا کار گەیشتە رادەیەك هیندەی ناوی کۆسرەت رەسوول لە هەولیردا دەگوترایەوە هیندە ووشەی یەکیتیی بەکار نەدەهات دوای ئەوەش کەبووە سەرۆکی حکومەت بەبی ئینتیمای حیزبی خەلکی هەولیر جۆرە خۆشەویستییەکیان بەرامبەر کۆسرەت رەسوول هەبوو لە گەریەکەمی شەری ناوخۆدا رۆلی ئاشتیی خوازانەی بینی بەلام لە گەرەکانی دیکەی شەردا ئیدی دوای بەو تەبایی و متمانەیەی نیوان پارتیی و یەکیتی هات کار گەیشتە ئەو رادەیەی گۆرینی سەرۆکی ئیدارەی سلیمانی ببی بەداخوازییەکی پارتی لە دانیشتنەکانی ئاشتیدا

لەو سالانەی کە کۆسرەت رەسوول سەرۆکی حکومەت بوو لە سلیمانی هەولیرچیتییەکی زۆر بە هزی دەکرد دەرگاکان لەبەردەم کۆسرەت رەسوولدا زیاتر دەکرانەوە بوو بەسەرۆکی حکومەت توانی سوود لەم پۆستە ببینیت بۆ بەهیزکردنی پیگە جەماوەریەکەی کار گەیشتە ئاستیك کەتالەبانی بوو بە سەرۆك کۆمار لەبری وینەی تالەبانی لە هەولیردا وینەی کۆسرەت رەسوول بەرز دەکرایەوە.

## دەرگاکان لە کرانەوەدا

## کۆسرەت رەسوول وەك بالیکی بەهیزی یەکیتیی

کۆسرەت رەسوول لە رووی هیزی جەماوەرییەوە توانی لەماوەیەکی زۆر کورتدا بە خیرای بگاتە لووتکە کاتیك لە ریکخستنەکانی شاردا کاری دەکرد مەلا بەختیار هیزیکی

## گرنگی سەربازی یەکیتی بوو بە تیپەربوونی کات هیزی سەربازی دەبیتە دووهیل کۆسرەتی و جەباری دواجار کۆسرەت رەسوول لە کیبرکیدا جەبار فەرمان جیدەهیلیت ئەگەر رونتر

بروانین ئەوکاتەی فرەیدون عبدوولقادر سەرۆکایەتی شاندەکانی مەکتەبی سیاسی دەکرد بۆ گفتوو گۆکانی یەکیتی کۆسرەت رەسول ئەو ناوە ناسراو نەبووە بەلام ئیستا کۆسرەت دوای مام جەلال کەسی ژمارەیەکی یەکیتییە فەرەیدونیش لە مالەوەیە پینج عمر (**عمر عەزیز، عمر عبدوللا، عمر مستەفا، عمر شیخ موس، عمری سەید علی** )وەك سەرکردەو داتمەزرینەری یەکیتی کاریان کردوو داینەمۆی یەکیتی بوون ئیستا جگە لە عمری سەید علی ئەوانی تر لە رووی ئەرك و پلەی حیزبییەوە هیچ پیگەو کاریگەرییەکیان نەماوە کۆسرەتیش بەرەو لوتکەی یەکیتی دەروات ئەگەر چی کۆسرەت لە ریگەی ریکخراوەکەی نەوشیروانەوە دەگاتە ئەو ئاستەی ئیستای بەلام بەتیپەربوونی کات کۆسرەتیش وەك نەوشیروان دەبیت بەهیزوو بەدەنگ و کەسایەتییەکی جەماوەری وەك بالیکی بەهیز لە نیو یەکیتیدا دەردەکەویت تایبەت مەندی و قورسای کۆسرەت رەسوول جیاوازە لەبالی تالەبانی و نەوشیروان مستەفا بەلام بالی کۆسرەت لەناو جەماوەرەوە دیتە نیو ئەندامانی حیزب و پاشان کۆمیتەو مەلبەندەکان ئینجا کۆمیتەی سەرکردایەتی تا ئیستاش نەگەیشتۆتە مەکتەبی سیاسی لە کاتی هەلبژاردنەکانی یەکیتیدا ئەمە زیاتر رەنگ دەداتەوە کۆسرەت بەوپەری دوور بینییەوە سەیری ئایندە دەکات هەر ئەم دووربینەشە وای کردووە لە ریگەی جەماوەرەوە کار بکات بۆ گەیشتنە دەسەلات نەك لە ریگەی سەرکردایەتییەوە چونکە ئەو پیی وایە ئەو هیزی لە ریگەی سەرکردایەتییەوە دەستەبەر دەبیت هیزیکە زوو ئاوادەبیت بەبەراورد لەگەل بنکەی جەماوەری و هیزی جەماوەر

یەکیتی لە ئیستادا بەهیچ شیوەیەك ناتوانیت دەسبەرداری سەنگ و جەماوەری کۆسرەت رەسوول ببیت ئەوان لە هەولیر پیویستیان بە هیزە بەتایبەتیش کە دەبینن چالاکترین و فراوانترین لقی پارتی لە هەولیردایە پایتەخت سیمای پارتی گرتووە تاکە هیوایەکی یەکیتی کە ئەکەر شیوەیەك لە شیوەکان ئەم هاوسەنگییەی بۆ بکەریتەوە کۆسرەت رەسوول بەشی هەرە زۆری هەژموونی یەکیتی لە هەولیردا لەریگەی کەنالی کۆسرەت رەسوولەوەیە هەر لەم

## ڕۆیشتنی نەوشیروان مستەفا پێگەیەکی نوێی

نەوشیروان مستەفا کەیەکیتی جی هیشت جیگری سکرتیربوو بەرۆیشتنی ئەو پیگەی حیزبی کۆسرەت بەهیزتربوو کۆسرەت بوو بەجیگری یەکەمی تالەبانی زۆربەی کاتەکان لە بەغدایەو کۆسرەت خۆی سەر پەرشتی کۆبوونەوەکانی مەکتەبی سیاسی دەکات جیگری دووەمی تالەبانیش کە د.بەرهەم سالحە ئەویش لیرە نییەو گۆرەپانەکە لە ژیر هەنگاوەکانی کۆسرەتدایە ماوەی تالەبانی لە سەرۆك کۆمایدا ماوەیەکی زیرینە بۆ کۆسرەت تا بتوانیت زیاتر پیگەو هیزی خۆی پتەو بکات لە ئیستاشدا کە تالەبانی هیندەی دەیەویت وەك سەرۆکی ولاتیك و سەرکردەیەکی عیراقی هەنگاو بنیت لیدوان بدات کەمتر بیر لە سکرتیری گشتیی یەکیتیی نیشتیمانی کوردوستان دەکاتەوە ئەمەش دەرفەتیکی زیرینە بۆ کۆسرەت رە سوول کە زیاتر بونی خۆی لە یەکیتیدا بە هیز بکات هەربۆیە ئاراستەی وتارەکانی تۆخکردنەوەی هەناسەیەکی نەتەوەیی لە خۆ گرتووە ئەو بۆ شاییەی لەم دواییانەدا لە سیاسەتی یەکیتی هەستی پیی کرا کۆسرەت دەیەویت بەباسکردنی دەسکەوتە نەتەوەیی و پیداگرتن لە سەر ریفراندۆمی کەرکووك و پتەوکردنی پەیوەندی لەگەل سەرۆکایەتی هەریم تۆختر بکاتەوە

## کۆسرەت و بیرکردنەوەکانی پارتی

بەبی ئەوەی بمانەویت هەرکاتیك باس لە هەنگاویکی هەرکام لەم حیزبانە بکەین(یەکیتیی و پارتی)بەناچاری دەکەوینە نیوو باسیکەوە کە حیزبی بەرامبەریش تییدا مانیفیست دەبیت لە رابردوو ئیستاشدا ژیانی خەلك بەتەواوەتی وابەستەی ژیانی ئەم دوو حیزبە بووە بۆ یە ئەمیش وادەکات زۆربەی نوسین و لیکۆلینەوەکان لەم چوار چیوەیەدا بخولینەوە کاتیك حیزب حەزی لە ئاهەنگ بوو دەبیت هەموان پەرۆی رەنگاو رەنگ و وینەی سەرکردەکان هەلبکەین کاتیك حیزب حەزی لە دەسەلات و کۆرسی زیاتر بیت دەبی هەموان قوربانی بدەین مرۆڤی کورد هیندەی وابەستەی ژیان و چارەنوسی حیزبییەوە بووە هیندە وابەستەی کاری حکومی نییە ئەگەر حکوومەت هیچ پیداویستییەك دابین

هۆی لە دەسچونی ئەوەی دەستیش کەوتووە ئەمەش دیاردەیەکە بەتەنیا لە سەر کوردوستان جیبەجیی نابیت بەلکو نەخۆشییەکە زۆربەی سیستمە سیاسییەکانی رۆژهەلات پیوەی دەنالینن

پارتی لە رابردوودا بوون و هیوی کۆسرەتی نەدەویست بەتایبەتی لە هەولیردا هەموو بەربەستیکی دەخستە بەردەم نزیککەوتنەوەی کۆسرەت لە جەماوەرەکەی هەربۆیە جۆرە نەیارییەکی بەرامبەر بەبونی کۆسرەت رەسوول وەك جیگری سەرۆکی هەریم هەبوو بەلام ئەنجامەکان وادەرنەچوون سەرچاوە ئاگادار کەرەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کەلەباش نزیکبونەوەی کۆسرەت رەسوول لە مەسعود بارزانی هاوکیشەکان گۆران و کەسی هەرە گونجاو وحالی لە هەلویستەکانی بارزانی کۆسرەت رە سووله هەربۆیە لە کاتی نەشتەرگەرییەکەشیدا هەریەك لە مسعود بارزانی و نیچریڤان بارزانی وەك دووحەمحۆری گەورەی کۆسرەت رەسوول دەرکەوتن و لە واشنتن سەردانیان کرد

## وینەی کۆسرەت لە ئایندەی یەکیتیدا

ئەگەرچی بەشیکی خەلك لە هەلویستە سیاسییەکانی تالەبانی نیگەرانن بەلام پیوەستبونی تالەبانی بە هەندی پرۆتۆکۆلی سیاسی لە سەر ئاستی سەرۆك کۆماردا ئەو چوارچیوەیەی لی تسك بووەتەوە کە وەك سکرتیری یەکیتی هەندی هەلویستی نەتەوەی دەربریت راستکردنەوەی پارسەنگی یەکیتی لەم رووەوە دەکەویتەئەستۆی کۆسرەت رەسوول بۆ ئاشتکردنەوەی دلی ئەو خەلکەی کە بە هەلویستەکانی تالەبانی دلیان ئیشاوە کە ئەمەش تا رادەیەك هەلی خۆگەرمکردنەوەی بەر لە یاری بۆ کۆسرەت رەسوول دینیتە پیش کە لە رووی دەستەبەری بونی چەند خەسلەتیکی کاریزماییەوە ببی بە شایستەترین جینشین بۆ تالەبانی

تالەبانی دەمیکە بیری لەوە کردۆتەوە کە لە پاش خۆی ئەم کەلینە دروست نەبیت کە یەکیتی پیی پەرتەوازە ببیت پیگەیاندنی د. بەرهەم سالح لە قوتابخانەکانی ئەمەریکاوە و هینانەوەی و راگەیاندنی لەگەل خۆیدا لەکاتی گەشتە نیودەولە تییەکانیدا ئەو بیرەی تالەبانی رونتر دەکاتەوە ئەگەرچی بەرهەم سالح قوتابی ئەمەریکاییەکانە بەلام لە سەروو ئەمانەشەوە کۆمەلیك دەرگای تر هەن لەبەردەم کۆسرەتدا کە چانسی سکرتیری گستی بۆ

## ئەمەریکا گەورەترین ویستگەی کۆسرەت

ئەگەرچی کۆسرەت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سەردانی ئەمەریکای کردبوو بەلام هەندی لایەن هەن لەم سەردانەی کە ئامازەی قوولن بۆ داهاتووی کۆسرەت رەسوول ئەو لە نەخۆشخانەیەك نەشتەرگەری بۆکرا کە بەنەخۆشخانەی سەرکردەو پاشاو کەسایەتییە نیودەولەتییەکان دانراوە قورسای خۆی هەیە لە نیو دامەزراوە نیودەولەتییەکانی ئەمەریکا مەلا مستەفا تا دوا رۆژی ژیانی لەوی سەرپەرشتی دەکرا شا حوسینی شای ئوردن و یاسر عەرەفاتیش بەهەمان شیوە ئەوانەی لەو نەخۆشخانەیەدا هەلی چارەسەرکردن و سەرپەرشتی تەندروستیان پی دەدری لە ناو تۆمارەکانی ئەمەریکادا دەبنە ژمارە ویرای ئیمتیازوو ماف ئەرك و لیپرسراوییەتیشیان دەکەویتە ئەستۆ بەرامبەر بەنەخشە و بەرنامەکانی ئەمەریکا کە پیشتر کۆسرەت رەسوول ئەو قولاییەی نەبوو لەگەل ئەم سەردانەو چاو پیکەوتنەکانی ئەویی سەرە داوەکانی ئاشکرابوون هەر ئەمەش بوو وای کرد لە کاتی گەیشتنەوەی بۆ کوردوستان بیاندرکینی و ئاشکرایان بکات بۆ نمونە ئامازەی بەریکەوتنیکی نهینی نیوان ئەمەریکاو عیراق کرد لەبارەی هەریمی کوردوستانەوە کە رەنگ بیت بۆ ئاشکراکردنی زووبیت کۆسرەت رەسوول لەنەخۆشخانەیەك نەشتەرگەری بۆ کرا نەخۆشخانەی سەرکردەکانە ئەو سەرکردەو سەرۆك و پاشایانەی کە هیلە سوورەکانی ئەمەریکان نەبەزاندووە لەم نەخۆشخانەیەدا چارەسەریان بۆ دەکریت لیرەدا کۆسرەت وەك سەرکردە مامەلەی لەگەل کراوە پاشان کۆسرەت رەسوول لەگەل چەندین کەسایەتی ئەمەریکادا گفتوگۆ دەکات کە جیگەی بایەخی ئەمەریکان لەگەل تالەبانی چاویان بە بۆش کەوتووە دوای ئەمەش گفتوگۆ لەگەل جیگری بۆشدا لە بارەی کۆمەلیك پرسی هونەرەکەی دەکات داوای هاوکاری دروستبونی پەیوەندی فەرمی دەکات وەك خۆی دەبیژیت ئەمەریکا تایبەت مەندییەکی جیاوازتر بەکوردوستان دەدات بەبەراورد لەگەل ناوچەکانی تری عیراقدا کۆسرەت رەسوول چوارەمین جاریەتی سەردانی ئەمەریکا بکات هیچ جاریك گرینگییەکی سیاسیی ئەوتۆی نەبووە کە بەراورد بەم گەشتەی دوایان بکریت ئەمە جگە لە باشبونی باری تەندروستی کە ئەرکوو بەرپرسیارییەتییەکەی کۆسرەت رەسوول زیاتر

چاودیرییه وردەیان بۆ تواناو لیهاتووی سەرکردەو کەسایەتییە حکومییەکانی کوردوستان نەکردبی لەمەودوا دۆخەکە بە ئاراستەیەکی تر وەر سووراوە دەبی وینەی بەریوبردنی دەولەتیکی شارستانی نیشانی جیهان بدەن خودی کۆسرەت رەسوول علیش لەو ئەرك و پلەییەی لەمەودوا دەیگریتە دەست دەبی بە شیوەیەك بە ریوەی ببات کە رووی حکومرانی ئیدارەکانی پیشتریش سپی بکاتەوە بەتایبەتیش ئەو کابینەیەی کە خودی سەرۆکی حکومەت بوو

## یەکیتی لەبەردەم پارتیدا سەری کز کردووە

**بەقەڵەمی: نەبەز گۆران**

ئەو حیزبەی سالانیك لەسەرتاپای کوردوستاندا تاقە دەنگ بوو ئەمرۆ توشی شەلەلی بووە سالانی هەشتاکان بۆ یەکیتی سالانی لوتکە بوو تاقە حیزب بوو لەکوردوستاندا لە هەموو شوینیك دەردەکەوت کەچی پاش سالانی نەوەد کە هاتەوە ناوشار وردە وردە بەدەست حیزبە کۆنەکەوە کە پارتییە بەرەو لاوازی چوو دوای شەری ناوخۆ ئیدی بوویە پاشکۆیەکی پارتی و تا ئیستەش رۆژبەرۆژ لاوازییەکانی لەبەردەم زلی پارتیدا دەردەکەون کاتیکیش جەمسەرەکانی ناو یەکیتی توشی پیکدادان هاتن و چوونە دەرەوی لیکەوتەوە هیندەی تر باری یەکیتی لار کرد پارتیش قاچی راکیشا

چونەدەرەوەی نەوشیروان مستەفا تەنها لیکردنەوەی بالیکی یەکیتی نەبوو بەلکوو دەرهینانی رۆحیکی بەهیزی یوکیتی بوو ئەگەر یەکیتی لەسەردەمی نەوشیرواندا سی رۆحی هەبوبیت رۆحی نەوشیروان و تالەبانی و کۆسرەت ئەوا دوای نەوشیروان رۆحیکی دەرچوو ئەم چوونە دەرەوەیەی نەوشیروان یەکیتی کردە هیزیکی کەمئەندام لەبەردەم پارتیدا کردیە ئەو ریچکەیەی هەمیشە خاوەن مالەکە هەلدەکوتیتە سەری و داوای شتی زیاتری لیدەکات راستە سەرکردایەتی یەکیتی لەمیدیاکاندا باس لە هیزی خۆیان دەکەن بەرامبەر پارتی بەلام تەماشاکردنیکی پەیکەری دەسەلاتی هەریم بەسە بۆ ئەوەی بلیین یەکیتیی ئەو هیزە نییە لە میدیاکاندا باس دەکریت بەلکو ئەو میوانەیە چاوەرییە خانەخوی خواردنیکی بۆ بهینیت

بەهیز بوونی نەوشیروان مستەفا لە دەرەوەی یەکیتیدا لاوازی یەکیتییە بەرامبەر پارتی ئەو جەمسەرەی یەکیتی هەربەوە نەوەستا یەکیتی بەجیبهیلیت بەبالیکی شکاوەوە بەلکو خەیالی ئەوەی کرد بەتەنها دەست بەفرین بکات بە سەر یەکیتیدا ئەم فرینەی بوویە هۆی توورەبونی حیزبە کۆنەکە نەوشیروان جگە لەوەی لەمەکتەبی سیاسییەوە چوویە سەر گردەکەی زەرگەتە ئیدی لەویوە سەرقالی کۆکردنەوەی سەرجەم ئەوکەسە تورانەبوو ئەدای حیزبەکەیان قبوا نەدەکرد تاوای لیهات لە پال یەکیتیدا بوویە هیزیکی دی و بانگەشەی

یەکێتی هێندەش ڕخۆ کاندید کردنی بە لیستێکی سەربەخۆ گورزێکی بەهێزتر بوو کە یەکێتی ناچار دەکرد لەبەردەم بیانووەکانی پارتیدا لاواز بێت ئەگەر نیگەرانی بەشێکی یەکێتییەکان لە خودی تاڵەبانی ئەوە بووبێت لەبەردەم پارتیدا حیزبەکەی لاواز کردووە خۆکاندید کردنەکەی نەوشیروان بەلیستی جیا هێندەی تر داشی پارتی سوار کرد بەسەر یەکێتییە گومانیشیان لەوەهەیە پاش هەڵبژاردن لە ناو هۆڵی پەرلەماندا نەوشیروان و یەکێتی یەك دەگرنەوە پێکەوە دەبنە هێزێکی گەورەو بالانسی دەسەڵات بەرەو ئاراستەی خۆیان دەگۆڕن ئەم گومانەی پارتی و سووربوونەکەی نەوشیروان وایکرد لە دانیشتنەکانی هەردوولادا پارتی چەندین پێشنیازی قورس بخاتە بەردەم یەکێتی

لە یەکێك لە کۆبونەوەکانی هەردوولادا پارتی داوای کردبوو لە سەدا شەستی کورسییەکان بۆ ئەو بن لە سەدا چلیش بۆ یەکێت ی بۆ ئەوەی ئەگەر نەوشیروان چەند کورسی هێنا هیچ کاریگەری نەبێت لەسەر بالانسی پەرلەمان لە کۆبونەوەیەکی دیدا پارتی داوای کردبوو بەمەرجێك لەو لیستەی نەوشیروان ڕازی دەبن سەرۆکایەتی حکومەت و سەرۆکایەتی هەرێم بۆ پارتی بێت هەرچۆنە ئێستا لە کوردوستاندا دەسەڵاتە گرنگەکان بە دەست پارتییەوەن بۆ چوار ساڵی دیش هەمان مۆدێل دووبارە دەبێتەوە تا ئێستا خودی تاڵەبانی کە زۆربەی کێشەکان ئەو یەکلای دەکاتەوە سەرۆکایەتی هەرێمی بەرەسمی داوەتە دەست پارتی ململانێکان لە سەر سەرۆکایەتی حکومەت ماونەتەوە لە ناو یەکێتیدا بروایەك هەیە کە زیاتر کۆسرەت بەرگری لەو بیروو ڕایە دەکات ئەویش ئەوەیە کە حکومەت دەبێت بۆ یەکێت ی بێت و کاندیدی یەکێتیش ئەبێت د. بەرهەم ساڵح بێت وەك کەسێکی تەکنۆکراتی ناو یەکێتی بەڵام تاڵەبانی دەیەوێت وەك جاری پێشوو کلیلەکانی حکومەت بداتەوە دەست نێچیرڤان بارزانی زەحمەتیش نییە ئەم کارە بکات دور نییە بۆ ڕازی کردنی کۆسرەت هەوڵبدات کۆمەڵێك کاندیدی کۆسرەت قبوڵبکات بۆ پۆستی پەرلەمانتاری وەزیری تاکو ئاراستەی کێشەکان بگۆڕێت ئەو ڕێکەوتنەی کە هەشە لە نێوان پارتی و یەکێتیدا بەردەوام لە ئاڵو گۆڕدایەو هاتنی نەوشیروان لەناو یەکێتییەوە بۆ سندوقەکانی دەنگدان هێندەی تر ڕێکەوتنەکەی خستۆتە بەردەم ئاڵوگۆڕێکی زۆرەوە تاڵەبانیش بۆ ڕاگرتنی بالانسی هەموولایەك کەوتووەتە نێوان نەوشیروان و کۆسرەت و پارتییەوە دەشیەوێت ئەو دەورە ببینێت هەموولایەك ڕازی بکات خشتەکان بخاتە ئەو

شەریکە بۆ ئایندەی منداڵەکانی خۆی دەیکات شەریك نییە لە پیناوی حیزبەکەیدا چونکە تالەبانی باش دەزانیت نەوشیروان ئیدی جگە لەوەی دەبیت بە لیستی خۆیەوە بچیتە هەلبژاردنەکانەوە هیچ ریگەیەکی دی ناگریتە بەر نەوشیروان پیوایە ئەم هەلبژاردنە ویستگەیەکی گرنگە بۆ ئەو تا شانسی خۆی تاقی بکاتەوە هیزەکانی خۆی لەناو خەلکدا دەربخات ئەو ئاوەی کە رشتبوی سەرەتا تەنها یەکیتی تەر کردبوو بەلام لەگەل دروست بونی هەلبژاردنەکاندا نەك هەرپارتی تەر کرد بەلکو عارەقیشی پیکرد ئیستا پارتی تیناگات کۆتای گەمەکە بەچی دەگات بۆ یە بەر لەوادەی هەلبژاردنەکان دەیەویت قورسایی خۆی بکاتە سەر ریککەوتنەکەو دەسەلاتی خۆی بسەپینیت بە سەر یەکیتیدا ئەو دوپۆستە گرنگەی لە کوردوستاندا هەیە وەری بگریت و شەری وەزارەتە گرنگەکان بکات تالەبانیش بە هۆی لاسەنگی هەردوو باڵەکەوە دەیەویت دوو پۆست لە حیزبەکەی بیسەنیتەوەو بیداتە پارتی بۆ ئەوەی ئایندەی نەوکانی بەروونی ببینیت کۆسرەتیش چونکە باش دەزانیت دوای هەلبژاردنەکان لەلایەن بەشیکی زۆری مەکتەبی سیاسیی حیزبەکەیەوە دەست دەکریت بە لاوازکردنی دەیەویت بەر لە هەلبژاردنەکان پیگەی خۆی لەناو پەرلەمان و حکومەتدا بەهیز بکات و ئەم پیگانە ببنە دیواریك بۆی دوای هەلبژاردن هەریەکەو لە ترسی ئەوی دیکە سەرقالی بەهیزکردنی پیگەی خۆیەتی پارتی دەیەویت نەدۆریت لەبەردەم یارییەکانی یەکیتیدا تالەبانی دەیەویت هەموولایەك رازی بکات تا بەرەو بەمانەوەی خۆی بدات کۆسرەت لەترسی جەمسەرەکانی تر خەمی پیگەی خۆیەتی نەوشیروانیش لەترسی هەموولایەك هەرۆژی بەجۆریك شەق لە تۆپەکە دەدات بەلام ئەوەی تاکو ئیستە بەدی دکریت ئاستی لاوازی یەکیتی یە لەبەردەم پارتیدا یەکیتی دوای چونی تالەبانی بۆ بەغدا بە جۆریك کوتە ژیر فەرمانی پارتییەوە هەست ناکەی هیزیکی گەورەیە لەناو گۆرەپانەکەدا تاقە لاوازی یەکیتی لەبەردەم پارتیدا تالەبانی یە چونکە هەر تالەبانییە داواکارییەکانی پارتی جیبەجی دەکات هەر ئەویشە لەبەرامبەر داواکارییەکانی پارتیدا نەرمی ئەنوینیت ئەو نیگەرانییەی لە ناو سەرکردەکان ی یەکیتیدا یە دەرحەق بەم حالەی یەکیتی زۆر لەو نیگەرانییانە قورسترن کەلای نەوشیروان هەن چونکە فرە جەمسەریش لەناو یەکیتیدا دروست بووە ئیدی پارتی دەگەریت لە هەر شوینیکەوە درزیك شك ببات خۆی دەخزینیتە ئەو درزەوە کار گەیشتۆتە ئەو ئاستەی سەرۆکی پارتی ببیتە

نیوانیانە بەلام لەناخی هەموو یەکیتیدا توورە بونیك خۆی مات داوە دەر حەق بەم کارانەی تالەبانی دوورنییە لە وەختی هەلبژاردنەکاندا ئاستەکە بەرە و شوینیکی دی بگۆریت لەناخی هەموو پارتییەکدا ترسیك هەیە لە نەوشیروان و کۆسرەت کە لەنزیکی هەلبژاردنەکانە یەکتری بگرنەوە گەمە تیك و پیك بدەن پارتیش هیندە گومانا‌وییە بەرامبەر بە یەکیتی و نەوشیروان مستەفا لە هەموو کۆبونەوەیەکدا داوایەکی زیاتر دەخاتە بەردەم یەکیتی ئەگەر تەماشایەکی هەیکەلی حکومەت بکەیت راستەو خۆ بۆت روون دەبیتەوە یەکیتی شەریك نییە لەم حکومەتەدا بەلکو بەشی دراوەو وەك هیزیکی لاوازتر لە پارتی لەناو پیك هاتەکاندا بونی هەیە نەك وەك شەریکیك ئەگەر ئەم جارە پارتی سەرۆکی هەریم و سەرۆکی حکومەت و سی وەزارەتە گرنگە کە ببات هیشتا داوایەکی قورستری دەمینیت لە سەر یەکیتی ئەویش ئەوەیە دوور نییە داوابکەن کە یەکیتی بەبەیانیکی رەسمی نەوشیروان لە حیزب دوور بخەنەوە و دەبیت کۆسرەت رەسوول بەشیوەیەکی رەسمی دژایەتی نەوشیروان بکات چونکە پارتی پیوایە لە سنوری هەولیر کە بۆ پارتی زۆرگرنگە گەر کۆسرەت رەسوول بەرەسمی دژایەتی نەوشیروان نەکات مانای وایە نەوشیروان دەنگ دەهینیت کۆسرەت رەسولیش تاکو ئیستە خۆی یەکلای نەکردۆتەوە بۆ دژایەتی نەوشیروان و نەوشیروان گروپەکەشی هەولدەدەن قەناعەت بە کۆسرەت بکەن ئەگەر لە گەلیان نییە دژیان نەبیت ئەو بی سیقەیەی پارتی دەرحەق بە جەمسەرەکانی یەکیتی هیندەی تر کۆبونەوەکانی هەردوولای گەرم تر کردووە باوەریشیان وایە ئەوەندەی نەوشیروان مەترسییە بۆ پارتی هیچکات حیزبە ئیسلامیەکان ئەوەندە مەترسینین ئەم ترسەی پارتی لە نەوشیروان بەدیویکیدا ترسیکی کۆمیدییەو بەدیوەکەی تریشدا ترسیکە جیگەی هەل ویستە لەسەرکردنە بۆ دەبیت نەوشیروان مەترسیدار بیت بۆ پارتی لە ئیسلامیەکان؟یان بۆ چی یەکیتی ناتوانیت دەسبەرداری نەوشیروان مستەفا ببیت بۆ ئەوەی لەبەر نەوشیروان هیندە خۆی بەلاوازی نەبینیت لەبەردەم پارتیدا؟ یەکیتی بۆ قبول دەکات لەبەردەم پارتیدا لاوازبیت بەلام قبول **ناکات لەبەردەم نەوشیرواندا لاوازبیت؟**

ئەگەر هەنگاوەکان بەم شیوەیە بچن پارتی داوای چیتر دەکات لە یەکیتی چی تری لە **دەستدەدات تا پارتی لی نەرەنجیت؟**

**نەوشیروان گەر یەکیتی بکەویتە دەست ئەم داوایانەی پارتی قبولە؟**

**بۆچی کۆسرەت رەسول لەگەل نەوشیروان نابن بە بەرەیەك و پیکەوە هەرچی چینراوە هەلی وەشیننەوە؟**

**نیگەرانیەکانی کۆسرەت تاکو کوی دەرۆن کەی بریاردەدات ئاراستەکان لە تالە بانییەوە بگۆریت بۆ نەوشیروان؟**

**ئەگەر کۆسرەت رەسول پیش هەلبژاردن خۆی یەکلایی کردەوەو بوویە بەرەیەك لەگەل نەوشیرواندا پارتی چی دەکات؟**

**ئایا ئەم دووجەمسەرە ببن بەیەك پارتی چیتر خاوەن مالە؟**

**ئەی ئەگەر بە پیچەوانەوە کۆسرەت لەگەل تالەبانیدا قۆلیان کرد بەقۆلی یەکدیدا دژی نەوشیروان مەسیری نەوشیروان چی بەسەردیت؟**

ئەمانە هەموو ئەو پرسیارانەن کە دینە بەردەمان دەبیت بە شوین وەلامەکانیانا بگەریین تاقە فریادرەسیك بۆ ئەوەی یەکیتی بەدەست ئەو لاوازییەی خۆیەوە لەبەردەم پارتیدا رزگار بکات ئەوەیە ریکەوتنەکە تەجمید بکەن بۆ دوای هەلبژاردن هەریەك لە جیگەی خۆیەوە خۆی هەلبژیریت ئەگەر ئەم کارەی بکردایە ئەوکات نەوشیروانیش لیستی نەدەبوو بەلام لە ئیستادا هەموو گۆرانکارییەکان لە بەرژەوەندی پارتیدان ویەکیتیش تا بیت باری قورستر دەبیت بەدەست داواکانی پارتییەوە جگە لە تالەبانیش هەموو یەکیتییەکانیش نیگەرانن پارتیش بە بیانوی نەوشیروانەوە تادیت زیاتر قاچی لەسەر بەرەکە رادەکیشیت بەلام دوور نییە پاش هەلبژاردن ئەوەی پارتییەکان خەونی پیوە دەبینن راچلەکینی لەگەلدابیت و نەخەشەیەی لەبیرکردنەوەی پارتیدا هەیە کتوپر یەکیتی بیکوژینیتەوە گەمەکە کۆتای بیت لەوانەشە ئەم گەمەیە بەر لە هەلبژاردن کۆتای بیت وەلی ئەوەی بەلای پارتی و یەکیتییەوە گرنگە کەوتنی ئیسلامیەکانە بۆ ناو چالیك ئەوەی چالەکەشی بۆ ئیسلامیەکان هەل کەند نە پارتی بوو نە یەکیتی بەلکو نەوشیروان بوو نەوشیروان بەبی ئەوەی باسیان بکات بەیەك گۆرانکاری لە یەکیتییەوە بۆ سەر گردەکەی زەرگەتە بوویە هۆی کالکردنەوەی دەنگی ئیسلامیەکان لە ناو گۆرەپانەکەدا بەلام جاری روون نییە هەربەم هەنگاوە دەبیتە هۆی کالکردنەوەی پارتی یان نا.

## رۆژهەلاتییەکان

## ئاشوبەکانی نیوان تالەبانی و نەوشیروان مستەفا

**راپۆرتی: جیهان ـ تایبەت**

بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد لە رۆژهەلات میژوویەکی دریژی هەیە ئەو بزوتنەوەیە گەلیك قوربانی داوە دەستکەوتی گرنگی بە دەست هیناوە کە کورد بەردەوام شانازییان پیوە دەکات کۆماری مهاباد دیارترین ئەو دەستکەوتانە یە کە تاهەتایە کورد شانازی پیوەدەکات هەرچەندە تەمەنی ئەو کۆمارە کورت بوو بەلام بەشیکی میژووی خەباتی رزگاریخواز ئینسانی کوردی دوای راپەرینی باشوور تائیستەش خراونەتە ناو قەفەزی بیدەنگییەوە دوای کۆماری مەهابات کەسایەتی بزوتنەوە سیاسییەکانی باشور لەوکاتەدا بەتەواوی کەوتنە ژیر کاریگەری ئەو بزوتنەوە سیاسییەوە کە لە رۆژهەلات سەری هەلداو بۆ ماوەیەکی کورت حوکمی کرد بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردی باشوور و سودیان لەو ئەزموونە وەرگرت جاریکی دیکە خەباتیان دەست پیکردەوە بەلام ئیستا مەسەکان تەواو ترسناك و بیزارکەرن چونکە پارت و کەسایەتییە سیاسیەکانی باشووری کوردوستان وەرگرن ئەو هەلەو کەموو کوریانە پربکەنەوە کەبەسەریاندا هات دین هەلەکان دووبارەدەکەنەوە زۆرجاریش خۆیان تیکەل بە کیشەکانی ئەوان دەکەن تەنانەت ئیستاش وای لیی هاتووە رۆژهەلاتییەکان شەری ناو یەکیتی دەکەن و بە نوسین و لیدوان پشتگیری ریکخراوەیی هاتونەتە ناو شەری نیوان تالەبانی و نەوشیروان بەشیکیشیان پییان وایە ئەمە شەری نەتەوەیە لەکاتیکدا گەر ئەوان بۆ کاری سیاسی یان نەتەوەی هاتبنە کوردوستانی باشور دەبیت بچنە ناو حیزبەکانی دیموکرات و کۆمەلەو باقی حیزبەکانی تری کوردوستان کە خەبات دەکەن وەلی بە پیچەوانەی ئەمەوە خۆیان خزاندۆتە ناو شەریکەوە نە شەری ئەوانەوە نە پەیوەندی بەوانەوە هەیە تەنها ئەوەندە نەبیت ئەم شەرە قوتی ئەوان چەور دەکات و بە هۆی ئەو قوتە چەورەشەوە هەموو شتیك دەکەن تا لە سووچیکی ئەم شەرەدا شوینی خۆیان بکەنەوە

## حیزبەکانی رۆژهەلات دواکەوتن

رۆژ دوای رۆژ کوردی رۆژهەلات جەماوەرەکەی لەناوخۆ لە دەست دەدات ئەم کاردانەوەش بەشیکی گەورەی پەیوەندی بە پەیرەو پرۆگرامی ئەو حیزب و لایەنە کوردییانە وە هەیە کە خەریکی خەبات و کاری سیاسین هەواداران و کادیرانیان ۆرژ بە رۆژ ئومیدەکان بەرامبەریان لاواز دەبیت خەلکەکە باوەریان لە دەست دەدەن چونکە حیزبەکانی رۆژهەلات ئەوەندە خەریکی ململانی ناو خۆیی و چارەسەرکردنی کیشەی نیو خۆیان بوون نیو هیندە خەریکی خەباتی سیاسیی و بەرنامەو کاری جەماوەری نابن ئەوان ئەوەیان لەبیر چووە ئەگەر جاران لە دەرەوە چاویان بریتە ولاتەکەیان و ویستبیتیان مافەکانیان بەدەست بهینن ئیستا بەتەنها چەك هەلگرتن و شەرکردن بەس نییە سیاسییەکی رۆژ هەلات پییوایە پیویست دەکات لەگەل چەك هەلگرتن و خەباتی چەکداری خەباتی مەدەنیش بکەن لەناو ولاتەکەیان دەست بکەن بە دروست کردن و پیکهینانی گروپیی فشار و چالاکی نهینی لە شیوەی ریکخراو گروپ کە دەستیان هەبیت لە زۆر گۆران کە پەیوەندی بە ژیان و ئایندەی ئەو خەلکەوە هەیە کەچی ئەو حیزبانە نەیانتوانیوە رۆلیان هەبیت و خەلکی رابینن لە سەر ململانی لەگەل مافەکانیان و ئەو دەسەلاتەی ئەوان ىدەچەوسیننەوە ئەوان تەنانەت بوونەتە پاشکۆی و خەریکی شەروو ململانیی پارتە کوردییەکانن لە باشووری کوردوستان تەنانەت زۆرجار خۆیان بەکیشەکانی ئەوانەوە تیوە دەگلینن پارتی و یەکیتیش دەسەلاتیکی بالایان هەیە لە لەتکردنی حیزبەکانی رۆژ هەلات و کپ کردنیان بەرامبەر بەو چالاکییانەی دەیانەویت لە ئیران ئەنجامی بدەن

## گواستنەوەی شەرکردن لەناوخۆدا بۆ دەرەوە

ململانیی کەوتنە داوی پارتە کوردییەکانی رۆژهەلات بۆ ژیر سایەی یەکیتیی و پارتی زۆری خایاند سالانیکە پارتە کوردییەکانی رۆژهەلات وازیان لە خۆیان هیناوە و بۆ زۆر مەسەلە و کیشەی سیاسیی خۆیان گریدەدەنەوە بە پارتە کوردییەکانی باشوورەوە بەشیکی ئەوان لەبەر خۆ بەستەوەیان بە پارتە کوردییەکانەوە وای لیهاتووە ئەگەر کیشەو ناکۆکییەکەی نیو خۆشیان دروست بیت دەیخەنە ئەستۆی پارتە کوردییەکانی باشوور ئەم خۆ بەدەستدەوەدانە هەم بۆ ململانی و هەم بۆ دوبەرەکی و جیابونەوە بەردەوامە ئەوە

ماوەی دوو ساله زۆر رۆژنامه نوس و سیاسی ناو پارته کوردییەکان دەرەوەی ئەو پارتانه خۆیان بە کیشەکانی ناو یەکیتییەوە گری دەدەن زۆر جار چارەنوسی شەخسی و ژیانی سیاسییان وابەستەی ئەوان دەکەن

## خۆ بەستنەوە بە کیشەکانی یەکیتییەوە

زۆریك له کوردەکانی رۆژهەلات(لیرەدا مەبەستمان له رۆژهەلاتییەکان هەموو خەلکیکی رۆژ هەلاتی کوردوستان نییه بەلکو مەبەستمان ئەو نووسەرو رۆژنامەنوس و سیاسییانه دەگریتەوە که دابەش بوون به سەر تالەبانی و نەوشیروانیدا)که روودەکەنه ئەو ناوچانەی که نفوزو دەسەلاتی یەکیتی نیشتیمانی تیایدا بەهیزه یان بەشیك لەو لایەنانەی که بنکەو بارەگاکانیان له ژیر دەسەلاتی یەکیتییدایه و یەکیتی دەیانپاریزیت خۆیان دەخزیننه ناو ئەو کیشه و ناکۆکییانەوە که رووی لەو حیزبه کردووه بەشیکیان روودەکەنه نەوشیروان مستەفا و کۆمپانیاکەی بەشیکی دیکەیان روودەکەنه بالی تالەبانی له ویوه دەست دەکەن به شەری خۆیان که بەگویرەی بیروڕای هەندی له سیاسییەکانی رۆژ هەلات ئەم کارو ئەخلاقه بەشیکی نیشانەی بیکارییه و بەشیکیشی مەبەستی سیاسییان هەیه لەو کردەوانەیان ئەو کوردانه ئەوەندەی خەریکی شەری تالەبانی و نەوشیروان بوون نیو ئەوەنده کایان بۆ خاکەکەیان و خەلکی و ٠حیزبەکانیان نەکردووه هەندی چاودیری سیاسی پیان وایه ئەو کەسانەی که خۆیان هەلدەواسن به شەری تالەبانی و نەوشیروانەوە تەنها مەبەستیان سەرنجراکیشانی ئەو بەر پرسانەو بەدەستهینانی پشتگیری ماددی و سیاسییه ئەگەر نا ئەوان بۆ ناچن له ناو بزوتنەوە و حیزبه رۆژهەلاتییەکان کاربکەن شەرووناکۆکی ناو بزوتنەوە و هیزە کوردییەکان ئەزمونیکی دریژە چەند ساله حیزبەکانی هەر چوار پارچەکەی کوردوستان بەدەست دوو لەت بوون و ململانی و شەری ناوخۆی خۆیان بوونەتەوە تا وای لیهاتووە بزوتنەوەیەکی کوردی یەکانگیروو پشت ئەستوور بەبیروو راو بنەماکانی و پەیرەوەکەی دروست نەبیت رەنگه ئەم لایەنەش بەشیك بیت لەو نەهامەتیانەی که بەرۆکی کوردانی رۆژهەلاتیش بەرنادات ئەو کەسانەش که خۆیان بەشەری کەسایەتی سیاسی دیکەوە خەرج دەکەن تواناکانیان بۆ یەکلایی کردنەوەی شەری ناو حیزبەکانی رۆژهەلات بەکاربینن.

## ريفۆرم نەخۆشی رەخنە گران.

هەر وەك چۆن چەمك و مانای ريفۆرم و ريفۆرمكردن لەناو داموو دەزگاكانی كوردانی باشوور بۆ تە قسەيەكی ئاسايی بەهەمان شێوە قسەكردن لەسەر چاكسازی و ريفۆرم لای زۆر كوردی رۆژ هەلات بۆتە هۆی جيگای بايەخ و گرنگی پيدان هەمووكەسيك مافی ئەوەی هەيە كە قسە لەبارەی زۆر دۆز و كيشەی هەر كۆمەلگەيەك بكات كە شارەزايەو گرنگە بۆی بەلام نابيت كيشەی ناو مالی خۆی وازبيينيت وباسی كيشەی ناو حيزبيكی ديكە بكەيت لەوانەی باس لە ريفۆرم و چاكسازی دەكەن لەناو حيزبەكان و دەسەلاتی ئيداری هەريمی كوردوستان نيو ئەوەندە باسيان لە چاكسازی و ريفۆرم لەناو حيزبەكانی رۆژهەلات نەكردووە سياسيەكی رۆژ هەلاتی ئەم حالەتە ناو دەنيت كيشەی دەرونی راهاتن بە بەكارهينانی ئەو چەمكانە و پيی وابوو كە ئەو چەمك و شيوازە قسەكردنەی كە نوسەروو رۆژنامەوانی رۆژهەلات قسەی لە بارەوە دەكەن كۆنن و لە ئيراندا زۆر ئەم چەمكانە بەكار دەهينن كۆپی ئەو چەمك و مانايانە دەكرين بۆ نمونە قسەكانی زۆر رۆشنيرو تيۆرسينی ئيرانی دەدزن و دين شەری پيدەكەن بەرپرسەكانی يەكيتيش دەيانەويت ئەو كەسانە بەكاربهينن بۆ شەرەكانی خۆيان ئەوەی كاری ئەو نوسەروو رۆژنامەنوسانەی رۆژهەلات نييە ئەوەيە خۆيان نەخزيننە ناو ئەو شەرەوە و كاربۆ ئەوە بكەن حيزبەكانی رۆژهەلات چاك بكەن كەچی بە پيچەوانەی ئەمەوە دەستيان لە حيزبەكانی خۆيان هەلگرتووە چونكە هەژارن چونەتە ناو ئەو شەرەوە برە پارەيەكی تيدايە دەشيانويت واپيشانبدەن ئەمە كيشەی ميلەتيكە نەك كيشەی حيزبێك.

## سياسيەكانيش كوردەكانی رۆژهەلات بەكار دەهينن

چالاك وانيكی سياسی ئەوەی بۆ(جيهان)ئاشكراكرد بەشداری هەندی نوسەرو رۆژنامەوانی كوردی رۆژهەلات لە ململانيی سياسی و ئيداری باشوور بەتايبەت يەكيتی بۆ قازانجی ماددی و ناو دەركردن هەروەها دۆزينەوەی تريبۆنيكە بۆ قسەكردن ئەو چالاكوانە پيی وابو كە حيزبەكانی رۆژ هەلات و ناوەندەكانی راگەياندنيان ريگای ئەو جۆرە قسە كردنەيان پينادەن بۆيە ناچار دەبن دين لە ناوەندەكانی راگەياندنی حيزبەكانی باشور قسەكانی خۆيان دەكەن ەچونكە حيزبەكان ناخی ئەو رۆژنامەنو س و نوسەرانە دەناسن

کەبەهاو ماهیەتیان چیەو دەیانەوی چیبکەن و خەیالی چیان هەیە ئەو چالاکوانە پی وایە کە ئەو قسانە کاریگەری هەبووە لەسەر ناکۆکی و کیشەکانی ناو حیزبەکانی رۆژهەلات چونکە ئەو جۆرە ئەدەبیاتە گەورەکردن و بلاوکردنەوە لەسەر نوسینی زۆر چەمکی وەك ریفۆرم و فراکسیۆن و گروپگەری لەناو حیزبەکانی رۆژهەلات بووە هۆی هەلوەشاندنەوە و دوولەت بوونی زۆریك لە و حیزبانە ئەو ئاماژەی بەوەدا کە کۆمەلەی کۆمۆنیست و حیزبی دیموکرات لەبەرئەوە دوولەت بوون و هەلوەشانەوە چونکە لەناو ئەو دۆحیزبەدا زۆر سیاسی و رۆژنامەنوس بانگەشەی ریفۆرمیان دەکرد لەناو ئەو حیزبانەدا ئەمەش بووە هەلوەشاندنەوەو دوولەت بونیان چونکە ئەو کەس و لایەنانەی داوای ریفۆرمیان لەناو حیزبەکانی رۆژ هەلات دەکرد تەنها قسەی سەر زارەکی بوو ئەوانە هیچ بنەماو بەرنامەیەکیان نەبووبۆ ئەو بانگەشانەیان هەروەها لە رووی فیکری و تیۆریشەوە هیچیان پینەبوو تەنها دەیان گوت لە ئیراندا ریفۆرم دەستی پیکردووە و ئیمەش پیویستە ریفۆرم لە بەرنامەو کارو چالاکییەکانمان و حیزبەکانماندا بکەین کە سایەتییەکی سیاسی ئاگاداریش پیوابوو حیزبەکانی ئیران دەیانەوی لەگەل ئیراندا دانیشن و لە ئیران نزیك ببنەوە لەبەر ئەو کەسانە هیچ تریبۆنیکیان نییە بۆ نزیککردنەوەی ئەو حیزبانە لە ئیران ناچار ناوەندەکانی راگەیاندن و حیزبەکان بۆ ئەو مەبەستە بەکار دەهینن یەکیتی زۆر جار خۆیان ریگایان پیدەدەن ئەوە قسانە بکەن ئەمەش وەك مرۆڤی ریفۆرمخواز دەرکەون لەناو ناوەندەکانی راگەیاندنی باشوور ئەو کەسایەتییە سیاسییە گوتیشی ئەو قسانەی ئەو کەسانە هیچ راست نییەو هیچ دەرەنجامیکی هەم بۆ خۆیان هەم بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی رۆژهەلات تیدا نییە چونکە ریفۆرم نەك لە باشور بەلکو لە ئیرانیش ئەو حیزب و کەسایەتی و لایەنانەی بانگەشەیان بۆ ریفۆرم چاکسازی دەکرد دوای ئەو هەموو شەرو کوشتارەی بەرامبەر بە کوردەکانیان دەکرد جگە لە شەرعیەتدان بە زولم و زۆرداری هیچی دیکە نەبوو کاربەدەستانی یەکیك لە حیزبەکانی رۆژهەلاتیش کە ئامادە نەبوو ناوەکەی ئاشکرا بکات ئەوەی بە جیهان راگەیاند دەبوو ئەو بەریزانەی کە لەناو راگەیاندن و میدیاکانی باشور شەری ریفۆرم و چاکسازی دەکەن خۆیان دەخزیننە ناو ئەو ململانییەوە پەندیان لە ئەزموونی خاتەمی سەرۆکی ئیران وەرگرتایە چونکە ئەو لەئیران زۆر بانگەشەی بۆۆ ریفۆرم و چاکسازی کرد و هیچیشی نەهینا ئەو ریفۆرمە لە ئیرا ن ئیستا هاو شیوەکەی لە باشووری کوردوستان دەبینین کە هیچ دەرەنجامیکی دلخۆشکەرو

ئاسـەواریکی باشـی لی چـاوەروان ناکریـت لەبـەر ئـەوە ئـەوەی کـە خاتـەمی کـردی تـەنها مەبەسـتی داپۆشـینی زولم و سـتەم و زۆرداری دەسـەلاتی کۆمـاری ئیـسلامی بـوو ئـەوەش کەلەناو باشوردا بانگەشەی بۆ دەکریت رەنگە تەنها مەبەست لە شاردنەوە و داپۆشینی زولم و ستەمی دەسەلاتدارانی باشوور بەتایبـەتی یـەکیتی و پارتی بیت ئـەو کاربەدەسـتە تیـوە گلانیکی زۆریـك لـە نوسـەرو رۆژنامـەوانی رۆژهـەلات بەکیـشەی حیزبەکانـەوە بەمەترسـی نـاوبرد ئـەو پیوابـوو کـە ئـەو کەسـانە خۆیـان لـە بەرپرسـیاریتی ولاتەکـەیان و کیـشەی کوردەکـانی خۆیـان و حیزبـەکانی رۆژهـەلات دەدزنـەوە و لـە راسـتی کیـشەو گرفتـەکان هەلدینن کە روویان لەوانەکردووە ئەوان جایك با کیشەو ناکۆکی ناو حیزبەکانی رۆژهەلات چاك بکـەن ئـەوجا رابکـەن و بـۆ ئـەوەی شـەری نـاو یـەکیتی و کیـشەو نـاکۆکی ریفـۆرم و چاکسازی ناو یەکیتی یەکلابکەنەوە .

## بۆ یەکلاکردنەوەی باڵی ریفۆرم
## تاڵەبانی چاوەریی هەڵبژاردنە

**راپۆرتی: نیاز محمد**

لە کۆتاییەکانی مانگی رابردوودا پاش ئەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان بە سەر پەرشتی تاڵەبانی کۆبوونەوەو تیدا شەش ئەندامی سەرکردایەتی حیزبەکە(شەمال عبدولوەفا، ئاسۆ علی، عسمان بانی مارانی سەفین مەلا قەرە، جمال محمد، کردۆ قاسم)بانگیشتی کۆبونەوە نەکران لە کاردانەوەیەکی خیرایاندا و پاش دوو رۆژ لەو دووکۆبونەوەیە ئەو شەش ئەندامەی سەرکردایەتی چوار ئەندام مەکتەب سیاسییەکەی یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان کە پیشتر دەست لە کارکیشانەوەی خۆیان راگەیاندبوو کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکیتی باڵی ریفۆرمیان راگەیاند

لە راگەیاندنەکەیاندا کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکیتی باڵی ریفۆرم رایانگەیاند کە گروپی باڵا دەستی ناو یەکیتی ئەو شەرعیەتەی نییە بریار لە چارەنوسی ئەندامان و پیکهاتەی سەرکردایەتی یەکیتی بدات و هەروەها هیچ بریاریکی یەکیتی شەرعی نییە تا ئەو کاتەی کۆنگرەیەکی فراوان لە باریکی ئاسایدا بە شیوەیەکی شەفاف و دیموکراتانە لە سەر بنەماو میکانیزمی دروست بەریوە دەچیت و سەرکردایەتییەکی نو ی هەلدەبژیردریت لە بەرامبەریشدا مەکتەبی سیاسی یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان لە رونکردنەوەیەکدا رایگەیاند کە لە ریزەکانی ناو یەکیتیدا شتیك نییە پیی بوتریت باڵی ریفۆرم و ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کە لەلیستیکی تردان یان کار بۆ لیستیکی تر بکەن تا کۆنگرەی داهاتوو سر دەکرین و هەروەها تۆمەتباریشیان دەکات بەوەی کە لە پەیرەوی ناو خۆی یەکیتی لایانداوە ئەمە سەرەرای ئەوەی کە لە روونکردنەوەیەدا ئەوەش وەبیرهینراوەتەوە کە پیشتر ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی بە نامەیەك لە سرکردنیان ئاگادار کراونەتەوە کە تیدا هاتووە وەك ئەندامێکی سەرکردایەتی بفەرموون ئاگادارمان بکەن کە ئایا ئیوە بۆ هیچ لیستیکی هەڵبژاردنی داهاتووی پەرلەمانی کوردوستان جگە لە لیستی کوردوستانی(یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان - پارتی دیموکراتی کوردوستان)خۆتان کاندید کردووە؟ یان بۆ هیچ لیستیکی تر کار ئەکەن؟ تا بریاری کۆنگرەی سێیەم ئەندامێتیتان رادەگیرێت.

## کۆنگره. چارەنوسە نادیارەکە

هەرچەندە ماوەی سالیك زیاترە لە میدیاکان و لە بۆ نە جیاجیا کاندا هەندیك لە بەرپرسانی یەکیتی رایاندەگەیاند کە بەم نزیکانە وادەی بەستنی کۆنگرە دیاری دەکریت بەلام تا ئەم ساتەش دیار نییە یەکیتی کەی رووبەرووی چارەنوسی خۆی دەبیتەوە بالی ریفۆرمیش لە راگەیاندنەکەیاندا گروپی بالادەستی ناو یپەکیتی تۆمەتباردەکەن بەوەی کە ماوەی هەشت سالە ریگرن لە بەردەم بەستنی کۆنگرەدا

لەلای خۆشیەوە سەرچاوەیەکی بالا لە یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان کە بە سەر بەبالی تالەبانییە و نەیویست ناوی ئاشکرا بکریت لەبارەی بەستنی کۆنگرەوە بە جیهانی گوت کە بەدلنیاییەوە بەستنی کۆنگرە دەکەویتە پاش هەلبژاردن

ئەو سەرچاوە بالایە لە دریژەی قسەکانیدا گوتی ئەو ئەندامانەی بالی ریفۆرم تاوەکو کۆنگرەی داهاتوو سرکراون و بە دووریشی زانی لەو کۆنگرەیەدا بەشداری بکەن

لەبارەی ئەوەی کە بۆچی یەکیتی نایەویت رووبەرووی ئەم چارەنوسەی خۆی ببیتەوە بەبەردەوام وادەی بەستنی کۆنگرە بۆ کاتیکی نادیار دوا دەخات ئەو سەرچاوە بالایەی یەکیتی گوتی تالەبانی چاوەری ئەنجامەکانی هەلبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥تاوەکو قورسایی لیستی گۆران کە نەوشیروان مستەفا سەرکردایەتی دەکات و هەروەها بالی ریفۆرمی بۆ دەربکەویت چونکە بەبروای ئەو سەرچاوەیە تالەبانی بەبی بونی رووئیایەکی روون لە سەر قورسای ئەو دوولایەنە کە یەك شتن ئەستەمە پی بخاتە نیو کۆنگرەی سیی یەکیتییەوە

لەدریژەی قسەکانیدا ئەو سەرچاوە بالایەی یەکیتی ئەوەشی راگەیاند کە تالەبانی لەسەر بنەمای ژمارەی ئەو کورسیانەی کە لیستی گۆران لە هەلبژاردنەکاندا بەدەستی دینیت کار بۆ کۆنگرە دەکات و گوتیشی ئەگەر بیتو لە هەلبژاردنەکاندا لیستی گۆران لە ١٥کورسی زیاتر بینیت ئەوا تالەبانی ناچار دەبیت فرە مینبەری لە ناو یەکیتیدا قبول بکات و بەم پییەش یەکیت ی لەسەر بنەمای دووبال بالی ریفۆرم و هیلی گشتی لە کۆنگرەی ئایندەدا دەست دەکاتەوە بەکار بەبروا ی ئەو سەرچاوەیە لە کۆنگرەی داهاتوودا تالەبانی خۆی بۆ سکرتیری یەکیت ی کاندید دەکاتەوە و گوتیشی بەو شیوەیە ئەگەر لیستی گۆران دەنگیکی زۆری هینا ئەوا بالی ریفۆرم وەك بالیك لەناو یەکیتی قبول دەکریت و نەوشیروان مستەفا

سەرکردایەتی دەکات و هیلی گشتیش یان کۆسرەت رەسوول یان دکتۆر بەرهەم سەرکردایەتی دەکەن تالەبانیش وەك سکرتیری گشتی دەمینیتەوە ئەو سەرچاوەیە پیشبینی ئەوەشی کرد کە ئەوکات بودجەی یەکیتیش بە پیی بەدەستهینانی کورسیەکانی پەرلەمان لە نیوان ئەو دووبالەدا دابەش بکریت

بەلام بەبروای ئەو سەرچاوە بالایە ئەگەر بیتو نەوشیروان مستەفا ١٠کورسیش بینیت ئەوا تالەبانی لە کۆنگرەی ئایندەدا ئەو بالە لە یەکیتی بی بەری دەکات لە کۆنگرەدا بریاری بە یەکجاری دەرکردنی ئەندامانی ئەو بالە دەدریت هەرچەندە لەم حالەتەدا ئەو بالە لە ریگەی ئەو کۆمپانیا ئیعلامیەی کە هەیانە هەولدەدەن وەك خۆیان بمیننەوە و بە دووریشی زانی پەناببنە بەر دروستکردنیکی حیزبیکی نوی لەلای خۆشیەوە ئاسۆ علی ئەندامی یەکیتیی نیشتیمانی کوردوستان لەبالی ریفۆرم سەبارەت بەوەی کە ئایا ئەوان وەك بالی ریفۆرم ئامادەن بەشداری کۆنگرە بکەن ئەگەر لەلایەن بالی تالەبانییەوە قبولکران ناوبراو گوتی لەوانەیە ئەوە جیی قسە لەسەرکردن نەبیت ئیستا ئەگەر شتیکی واش هاتە پیشەوە ئەوا قسەی خۆمان دەبیت

## بۆ دابەشبوون کادیرانی خوارەوە بە حەماسترن

نزیکبونەوەی وادەی هەلبژاردن ململانیکەی توندتر کردۆتەوە بە شیوەیەك کار لە خۆساغکردنەوەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتییەوە گەیشتۆتە سەر خۆساغکردنەوەی ئەندامانی مەلبەندوو کۆمیتەوتەنانەت کەرتەکانی ریکخستنی حیزبەکە رۆژانە دەیان کادیری یەکیتی لە ئاستە جیاوازەکاندا دەست لەکار کیشانەوەیان پیشکەش دەکەن و رایدەگەیەنن کە لە بیروڕای جیاوازوو هەندیکی دیکە شیان بەنانبراوکردن ناچارکراون دەست لەکار بکیشنەوە و روودەکەنە ئەو گردەی نەوشیروان مستەفا لییەوە قسە لە گۆران دەکات ئەم دیاردەیە زیاتر زەق بۆتەوە کاتیك مەکتەبی سیاسی یەکیتی داوای لە ئەندامانی سەرکردایەتی و ریزەکانی خۆی کرد کە ئەوەی کار بۆ لیستیکی دیکە دەکات جگە لە لیستی کوردوستانی کە هاوپەیمانی پارتیی و یەکیتییە دەبی خۆی ساغ بکاتەوە ریزەکانی یەکیتی جی بهیلیت لەگەل ئەوەی ئەو کادیرانە ئاستەکانی خوارەوە بیبەش دەکرین لەموچەو نان براو دەکرین بەلام کاریگەری ململانیکە لەسەریان زیاتر دەردەکەویت و تارادەیەك بە حەماستریشەوە چونەتە ناو ململانیکەوە دەربارەی ئەگەری

تەڤینەوەو تەشەسەندنی ئەو ململانییە بۆ توندوتیژی سەرچاوەکەی نزیك لە مەکتەبی سیاسی یەکیتی گوتی بروانامکەم ئەم گرژیانەی نیوان دووبالە کە بە هیچشیوەیەك بگەنە ئاستی گرژی شەخسی نیوان تالەبانی و نەوشیروان مستەفا و تەنیالە ئاستەکانی خوارەوەدا دەمیننەوە لەبەرئەوەی ئەوان دەتوانن بەئاسانی کۆنترۆلی بارودۆخەکەبکەن کە بە ئاراستەیەکدا نەروات توندوتیژی لیبکەویتەوە سەبارەت بەوەی کە ئایا راستە مووچەی ئەوانەی کار بۆ لیستی تردەکەن دەبریت سەرچاوەیەکی نزیك لە مەکتەبی سیاسی یەکیتی کە نەیویست ناوی ئاشکرابکریت رایگەیاند ئەوەی کە ئاگادارە تاوەکو ئیستا مووچەی ژمارەیەك لە پاسەوانانی ئەمدامانی سەرکردایەتی بالی ریفۆرم براوە تەنیا مووچەی دوو پاسەوانیان دەدریتی هەروەها گوتیشی ئەو ئەندامانەی موچەی خۆشیان وەردەگرن کە حەوت ملیۆن وپینجهەزار دیناری عیراقییە بەلام ئەگەری لەسەدا هەشتا ئەوەیە کەبەم زووانە ئەو مووچانەشیان لی بسەنریتەوە لەبارەی ئەوەی کە ئایا بالی ریفۆرم کاتیك هیچ سەرچاوەیەکی دارایی یەکیتی لە بەر دەستدا نەبیت چۆن دەتوانیت کاربکات ئاسۆ علی گوتی بالی ریفۆرم راستە لە ئیستا لە هەموو ئیمکانیەتیکی مادی و ئیداری یەکیتی بیبەشە بەلام ئیمە کەسانیك بووین هەمیشە لەناو خەبات و زیندان و رۆژانی نەهامەتیدا ژیاوین ئەو کات نە ئیمکانیەت هەبوو نە زەمینەی کاری جەماوەریش بەلام ئەمرۆ زەمینەی کاری جەماوەری فراوانترە و کارکردن گەلیك ئاسانترە لەو رۆژانەی کە ئیمە کارمان دەکرد بۆیە ئەو کاریگەریەی نابیت لەسەر کارکردنی ئیمە

## ئایا بالی ریفۆرم گۆرانەکە دەباتەوە نیو یەکیتی؟

ئەوانەی لەناو یەکیتییەوە هاتونەتە دەری یان کراونەتە دەرەوە هیشتا ئەوان سورن لەسەرئەوەی کە ئەوان یەکیتین و خاوەنی یەکیتیشن بەبەراوردو ئیستاو ئایندیەوە بالی دەسەلاتداری یەکیتیش پی وایە ئەوەی پابەند نییە بە یەکریزی یەکیتییەوە دەبی ریزەکانی حیزبەکە جی بهیلیت ململانیکە بەبروای چاودیری سیاسی ململانییە لەسەر ناس نامەی یەکیتی خاوەنداریتی ئەو حیزبە نەکگ گۆرانیکی جەوهەری لە دەرەوەی یەکیتی بەبروای ئەو چاودیرە سیاسییە بالی ریفۆرم دەیەوی گۆرانەکە بباتەوە نیو یەکیتی کەلە بنەرەتدا ئەمە مەبەستە سەرەکییەکەیە نەك گۆرانیك لە دەرەوەی حیزب لە بەرامبەر ئەم بۆ چونەدا ئاسۆ علی دەلیت ئەم هەنگاوەی ئیمە لە راگەیاندنی بالی ریفۆرم

دەچیتە چوار چیوەی ئەو هەنگاوانە ی کە بۆ گۆرانکاری هەن و بەشیکە لەو میکانیزمە بەر فراوانترەی بۆ گۆران هەیە نەك بردنەوەی گۆران بۆ ناو حیزب و بە میکانیزمیکی تریش پشتیوانیکردنە لەو رەوتەی گۆرانە بەرفراوانەی ئەمرۆ قسەی لەسەر دەکریت بەلام لە گەل ئەوەشدا دەلیت راستە ئیمە لەو بالەی ناو یەکیتی بووین کە بەبالی نارازی وەسف دەکریت نارەزایەتی ئیمە ئەوەیە تاکو بتوانین یەکیتی بخەینەوە سەر بەرنامەی راستەقینەی خۆی بەلام بالی ریفۆرم سەرەرای ئەوەی خوازیاری گۆرانکاییە لەناو حیزبیدا خۆشی بەبەشیکی فراوانتر لە گۆران ناو دەنیت لەم بارەیەو ئاسۆعلی لە دریژەی قسەکانیدا دەلیت بە داخەوە بالی دەسەلاتداری یەکیتی ئەم هەنگاوە ئیمەی پی قبول نەکرا بۆیە ئیمە ناچارین لە گەل هەڤالانی ترمان کر بۆ هەلبژاردن بکەین وەك کاردانەوەیەك لە بەرامبەر ئەو هەلویستەی بالی دەسەلاتداری یەکیتیدا و بە هەموو توانایەکیشمانەوە پشتگیری لیستی گۆران دەکەین کە پیموایە ئەمە گۆرانیکە لە ئاستیکی بەر فراوانتردا نەك بە تەنیا لەناو حیزبدا لەلای خۆشیەوە چاودیریکی سیاسی پۆیی وایە لیستی گۆرانیش بەشیکە لە ململانیکانی نیو یەکیتی و لەنیو ئەو ململانییەوە لەدایکبووە بەبروای ئەو چاودیرە هەرئەمەشە وا دەکات چ کاریگەریەکانی گۆران و چ کاریگەریەکانی بالی ریفۆرم لە سنوری دەسەلاتی یەکیتی تیپەر نەبن ئەو چاودیرە دەلیت زۆر بەدەگمەن ئەو قسەو باسانە لە سنوری پاریزگای سلیمانی کە تییدا یەکیتی بالادەستە لە سنوری پاریزگای هەولیر یان دهۆك بەرگویت دەکەون ئەوەش ئەمان پی دەلیت کە ململانیکان و هەولەکانی گۆران پەیوەندییان بە یەکیتی خۆیەوە هەیە ئەو چاودیرە پی وایە ململانیکانی نیو یەکیتی تارادەیەکی زۆر بۆ دابەشکردنەوەی دەسەلاتن دوای تالەبانی پیوەرەکانی وەرگرتنی دەسەلاتیش بەبروا ی ئەو پەیوەندییانە بەبونی ریزەی جەماوەر و ئاستی خەبات و قوربانیدانەوە هەیە کەبەم پییە پاش تالەبانی لەبەردەم نەوشیروان مستەفا رەنگە تەنیا ئەم دووپیوەرە کۆسرەت رەسول وەك جەمسەریکی بەهیز بناسنەوە بەلام بۆ جیگرەکەی تری تالەبانی(د کتۆر بەرهەم)پیوەریکی تر هەیە کە میدیایەو لەمەشدا نەوشیروان مستەفا گوروتینکی گەورەتری دایە بەر خۆی کاتی بەهاتنەدەرەوەی لە یەکیتی کۆمپانیای ئیعلامییەکەی خۆی دامەزراند.

# یەکێتی لەدوای مام جەلال
# میراتیکی زۆرو حیزبیکی وەجاخ کویر

مەسعود عەبدولخالق

لەبەر ئەوەی(ی، ن، ك)وەك ریکخراویکی سیاسی بەهیزی کوردی بۆ یەکەم جار بە بنکەو سەورکردایەتییەوە بە ترازیکی عەلمانی توند هاتە مەیدان و سەرکەوتوش بوو پیویستە ئاوریك لە سەرەتای ململانی کوردایەتی باس بکەین زۆر بەکورتی کە دەلین بزوتنەوەی کوردایەتی واتە باس لە دوای سالی ١٩٠٨و خودی ئینقلابەکەی(ئیتحاد الترقی)دەکەین کە لە ١٩٠٨/٧/٢٣روویدا چونکە بەپی هەموو سەرچاوەکانی ناوەکی و دەرەکی رابونی نەتەوەیی گەلانی ژیر دەستی عسمانی لەویرا دەست پیدەکات بە کوردیشەوە هەتا رابونی تورکایەتیش بەپی بەلگەنامەکانی بەریتانی هەر راستەو خۆ یەك حەفتە دوا ی ئینقلاب(ئیبراهیم علی پاشا)لە دژی(ئیتحادو تەرەقی)راپەر ی و شۆرشیکی گەورەی بەرپا کرد و خەلکیکی ئاین پەروەریان وە دووکەوت چونکە زانیان ئیتحادیەکان دژ بە میللەتانوو دەبنە هۆی مەینەتی کورد کەچی هەریەکە لە(زیا کۆك ئەلب)و(بەنجی زادە)و کۆمەلیك سەرکردەی کوردی تری عەلمانی لەوانە(د. عەبدوللا جەودەت )(د. ئیسحاق سکوتی)لەگەل(ئیتحادالترقی)بوون هەر لەدوای ئەوانەش(شیخ سەعیدی نورسی ریکخراوی یەکیتی موحە ممەدی)لە شیخ عبدولقادر شەمزینی و لە بنەمالەی بەدرخانییەکانیش لە هەمان سالدا(ئیتحاد ئەلتەرەقی کورد)یان پیکهینا بەو شیوەیە علمانی و ئاینی لە نیو کوردایەتیدا بە جمکی سەریانهەلدا لەکاتی جەنگی جیهانی سەرەنجامەکانیشی بە هەمان شیوەی علما نی کورد بەرەی پیلانەکانی ئەتاتورك و حکومەتەکەی ئەنقەرەو ئاینیەکانیش زیاتر لایەنگری حکومەتی ئەستەمبول و خیلافەتەکەی بوون تا توانرا سیڤەری ١٩٢٠و مادده بەهیزەکانی(٦٢، ٦٣، ٦٤) لە گەل ئەستەمبول دروست بکەن کەچی عەلمانییە کوردەکان ئەو مادانەیان دۆراند ئەتاتورك و لۆزانی ١٩٢٣هاتە دی ئەوەی یەکەمی عەلمانی داوای لە ئاینەکان کرد مۆلەتیان پیبدەن کوردوستان و ناوچەکە با ماوەیەکی کەم دەکەن کۆمەلگەیەکی مەدەنی و تەکنۆلۆجییدار و مۆدیرن کەچی لە کۆتایدا کوردیان خستە مەینەت ئینجا شیخ سەعیدی پیران لەسالی ١٩٢٥با شۆرش راپەری بۆیە عەلمانیەتی کورد تا ماوەیەك کپ بووە لە جەنگی

جیهانی دووەم هەروا بەکپی مایەوە تا جاردانەوەی پارتی لە ١٩٤٦با سەرۆکایەتی مەلا مستەفا لە کوردوستانی

خواروو دیسان ململانییەکی بەهیز لە نیوان عە لمانی و ئاینی سەری هەلدا، بالی ئاینەکە بەتاقی تەنهـ مەلا مستەفابوو عەلمانیەکەش مەکتەبی ساسیی و سەرکردایەتی پارتی بە تەواوی بوو کەسانی کاراو شارەزا وەك ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تالەبانی و. ...هەتا علی عبدوللا نوری شاوەیس و لەگەل ئەو بالە بوون یکە پییان وترا(جەلالی)تالەسالی ١٩٧٠بە یەکجاری بالی عەلمانی کورد بەسەرۆکایەتی جەلال تالەبانی شکستی هیناو تەسلیمی مەلا مستەفا بونەوە

بەلام لەسالی ١٩٧٥لە ئەنجامی ریکەوتنی جەزائیر لە نیو شاو سەدام بووە بووە هۆی رووخانی شۆرشی کورد و دەوروبەری مەلامستەفا بۆ شاییەکی گەورەش لە زەمینەی بزوتنەوەی کوردایەتیدا سازبوو بۆ سەرهەلدانەوەی(یەکیتی نیشتیمانی کوردوستان )بە سەرۆکایەتی مام جەلال و زالبونی عەلمانی بەسەر ئایندا

## دروستبونی(ی، ن، ك )

یەکیتی لە بارودۆخیکی سەخت ی نیمچە مەحالی ناوەکی و ئیقلیمی و جیهانی دروست بوو کۆمەلە سەرکردەیەکی نەبەزی وەك مام جەلال و نەوشیروان مستەفا و علی عسکەری و د.خالیدو. ..هتد نەبوایە نەدەکرا لە سەرەتادا بە ریرەویکی(مارکسی ماوی)دوای(مارکسی لینینی)ی دارشتنی(ی، ن،ك)بەپیی(وحدە والصراع المتناقضات)ی یاسای سییەمی دیالیکیتیکی مارکسی هاتە کایەوە بەخیرای بەسەر لایەنەکانی تری بالی کوردیدا زالبوو بنەمایەکی گرنگی لە کوردوستان سەلماند کە تا ئیستا باس نەکراوە ئەویش ئەومیە بەرگری چەکداری نیشتمانی بەچوار قۆناغی سەرەکیدا تیپەری، یەکەم جار لەسەدەی(١٩) کە تەکنەلۆژیای داگیرکەر ئەوەندە بەهیز نەبوو بە لیبرالە نەتەوەییەکان دەکرا دووەم لە سەرەتای سەدەی بیستەم ئایدۆلۆژیای نەتەوەی کرا سییەم کە تەکنەلۆژیای داگیرکەر زیاتر پەرەیسەمد لەماوەی(١٩٥٠ـ ١٩٨٠) ئەوا(بەرگری)تەنها لە توانای خاوەن ئایدۆلۆژیە زۆر بەهیزەکان مایەوە و خودی مام جەلال ئەوەی زانی بۆیە ئەمجارە بە زەقی و بی پیچ و پەنا هاتە سەر مارکسییەت و سەرکەوتووبوو

چـوارەم هەلبەتـە لەوسـەردەمەدا یـاخود وردتـر لـە سـالی(١٩٩٠) بـە دواوە تەکنـەلۆژیا ی داگیرکەران زۆر گەشەی کردەوە ئەو(بەرگرییە)بە ئایدۆلۆژیایەکی زۆر بالای دەوی لە ئاستی ئاینی بۆیە دەبینین بـەرگری نیـشتیمانی زیـاتر زیـاتر کەوتـە دەسـت ئیـسلامییەکان رەنگـە پەکەکـە دوا بزوتنـەوەی مارکـسی بـن لـەو رووەوە کەواتـە(ی،ن،ك)کەوتـە تـەفرەی زیرینـی بـەرگی نیشتیمانی کـە دەکاتـە ١٩٧٥بـە دواوە، لیرەدا نهینییـەکی گرنگـی هیـزو سـەرکەوتنی یـەکیتیمان بـۆ دەردەکـەویت لـە هـەمان کاتـدا نهینـی پـەك کـەوتن وبـی تواناییـشمان بـۆ دەردەکـەویت لـە دوا ی راپـەرینی ١٩٩١تەمـەنی کەوتـە چ(فەترەیـەك لـەو چـوار قۆناغـەی سەرەوە )

ئـەوە بـوو بینیمـان لەبـەرگری شـاخ ئ ەوەنـدە قارەمـان بـوو داروبـەردوو رووبارەکـانی کوردوسـتان شـاهیدی بـۆ دەدەن لـە بەرامبەریـشدا هیزەکـانی بەرامبـەری بـە(تایبـەتی پـارتی)زۆر نابەرابـەربوو تارادەیـەك(پـارتی)یـش هەسـتی کـرد حیزبیکـە لـە ئاسـتی قۆنـاغی(٣)نییـە بۆیـە تەقەلایـدا خـۆی بگونجینیـت لـەکۆنگرەی(٩)لـەمادەی(٥)و(٦) جـاری مارکـسیایەتی خۆیـدا بـەلام لیـی سـەرکەوتوونەبوو چـونکە بـە وردی لـە پۆلینکردنـی ئـەو قۆناغانە نەگەیشتبوو ئەگینا ئایدۆلۆژیای بـارزانی(ئاییینەکـە)نـۆرەی بەتـەواوی هـاتبوو لـەو سـەردەمەی دەیـان توانـای هیـزی(بـەرگری)پـی دروسـت بکـەن وایـان نـەکردولەشـاخ زۆر لـە شکست بوون زیاتر بزوتنـەوەی کوردایـەتی کەوتـە دەسـت یـەکیتی و ئـەو تـەنها دانوسـتانی دەکـردوو میللـەتی کـوردی رادەپەرانـد و رینمـای پـی دەدا هـەتا گەیـشتە راپـەرینی ١٩٩١کەلە(٨٠٪) ی بە کاریگەری یەکیتی بوو وردتر لەوەش ئەو کاتەی(نەوشیروان مستەفا)بە پلەی یەکەم و(کۆسرەت رەسوول)بە پلەی دووەم پالەوانی ئەو دانوستانە بوون و بەو تـەوژم و هیزەش هاتنە ناو جەماوەرو زالبوون بەسەر کوردوستان و بوونـە کارگـەی کـادیران و بـە هەزاران کادیری عەسکەری و ئیداری و دبلۆماسی بە هیزی دروسـت کـرد کـە بـە هاوتاکـانی نەدەکرا .

## چی روویدا؟
## وەرچەرخاندنیکی مەزن لە یەکیتی

خودی نەتەوایەتی، ئایدۆلۆژیا و بیرو باوەرو هیز نییە، بەلکو ئینتیماو رەچەلەکە، بۆیـە پیویـستی بـە مەدرەسـەیەکی فیکـری هەیـە یـەکیتی بـە بلیمەتانـە تـوانی ئایـدۆلۆژیای مارکسییەت بکاتە ناوەرۆکی نەتەوایـەتی و باشـترین دینـامیکی داهینـان بـۆ شـۆرشی نـوی و

بەو هۆیەوە پیشرەوایەتی لە هەمووان سەندەوە هەربەهۆی ئەو ئایدۆلۆژیایەشەوە تاکی یەکیتی دادەرشتەوە و لەهەمانکاتیشدا دەرمانخانەیەك بوو بۆ هەر دەردووبەلایەك کە لە دوای شکستی عەسکەری توشی دەبوو بەو شیوەیە بۆ یەکەمجار(لەو جەنگە ساردوو گەرمەی لەگەل پارتی )دا هەیبوو زالبوو، لەوەتەی ململانی ی عەلمانی و ئاینی لەدوای ١٩٤٦سەریهەلدایەوە دۆراندنی پارتی بەرامبەر یەکیتی لەوەوە هات کە سەرکردایەتی بارزانی نەماو ململانییەکە لە ئاستی عەلمانی و ئاینیدا دابەزی بۆ ململانییی نیوان دووبالی عەلمانی یەکەمیان(یەکیتی)عەلمانییەکی توونـدو تۆکمـە و موجازیف، دووەمیان عەلمانییەکی کلاسیکی شلۆق و ساردو سر هەلبەتە تا ئەو مەیدانەش بەو شیوەیە زەمینەی ململانیکە بیت هەریەکیتی زالتر دەبوو لیرەدا گۆرانیکی زۆر گرنگ بەب ی دەنگ روویدا(هەلبەتە زۆر گۆرانکاری تریش هەبوو بەلام ئەوەیان کاریگەری هەبووە)ئەویش ئەوەیە یەکیتی ئەو مەیدانەی بەرە بەرە گواستەوە بۆ مە یدانی کۆمەلایەتی کلاسیکی واتە خۆ دارنی لە ئایدۆلۆژیا بووە هیزیکی کۆمەلایەتی و ئابووری لە شیوەی(کوتلە کۆمەلایەتییەکان )ی تری کوردوستان یان راشکاوانەتر بوونە هیزیکی چاکتر و فراوانتر لە عەشیرەت ئەگینا پەیوەستی تاکی یەکیتی بە سەرکردایەتی بەو یەکترەوە لە سەر نیمچەی ئایدۆلۆژیاو چالاکی فیکرو مەبادئی نەما لەو مەیدانەشدا رۆلی خیلْ و سەروەری باب و باپیران و زۆلْی بەرژەوەندی و گیرفان یەکلایکەرەوە دەبیْ.

بەو شیوەیە لەو مەیدانەشدا بەرە بەرە یەکیتی بەرامبەر پارتی لاواز بووەوە هۆیەکەشی روونە بەلام عادەتەن ئەو جۆرە پرۆسەیە دەیان سال دەخایەنی تا دەگاتە قۆناغی(الموت لبگیی) بەلام چوار هۆکاری سەرەکی وای کرد هەیبەتی عەسکەری یەکیتی بشکیت بیئەوەی بتوانی وەك(جاران)چاکی بکاتەوە.

یەکەمیان: جەنگی لەگەل بزوتنەوەی ئیسلامی لەسال ی ١٩٩٣وایکرد پارتی ترسی لە یەکیتی بشکیت.

دووەم: شکستی یەکیتی لەدوای(٣١)ی ئاب لە گۆمەسپان و دوایی لە سەرانسەری کوردوستان

سییەم: شەرەکەی دوای سالی ١٩٩٨لەگەل پەکەکە لە قرناقەو جادەی کۆفتان و شکستە یەك لە دوای یەکەکانی

چوارەم: ئەو شەرەی لە گەل(ئەنسارو لئیسلام)کردی تا ئەمەریکا نەهات پیی یەکلا نەبووەوە جگو لەوەش لە رووی سیاسیشەوە ئەو هەموو شەرو شۆرەی برا کوژی لە گەل هەموو لایەك بۆ دەسەلات دووژمنایەتییەکی زۆری بۆ خۆی پەیدا کرد بەر هەمەکەشی بۆ خۆی نەبوو لەگەل کۆمەلیك هۆکاری تری فیکری و سیاسیی کۆمەلایەتی و سەربازی هیزی ئیمکانییەتی بەردەوامی گەشەی یەکی کەوت داینەمۆکەی زۆر لاوازبوو زیاتر کەوتە سەر شەخسی مام جەلال

## مام جەلال

پیاویکی تیکۆشەری بی وینەیە ئاستیکی دبلۆماسی زۆر بالای هەیە رەنگە هەلە نەبین ئەگەر بلیین هەلگیرسانەوەی شۆرشی نوی و رەوتەکەی و تا دەگاتە ئەو واقیعەی بۆ کوردوستان سازا لە درووست بوونی پەرلەمان و حکومەت و ئەو دۆخەی ئیستا لە ئارادایە لە(٦٠٪) ی دەگەریتەوە بۆ کەسی مام جەلال لە سەر ئاستی هەموو کوردوستان جا دەبی کاریگەری چەند گەورەی ببیت لە ناو یەکیتیدا بەلام کۆمەلیك خالی لاوازیشی لە خودی خۆی میژووەکەیدا هەیە، سایکۆلۆجیەتی ئەو پیاوە زیاتر لیبرا لییەکی لە سەر رارەوی سیاسی میکافیللی دەروا بۆ یە تەنها بە فیکری و ئایدۆلۆژیا(جاران)مارکسی بووئەگینا دەرونیکی لیبرالی(بی مەبادیئی )هەبووە هەر لەوەشەوە ئەو نهینییەمان بۆ دەردەکەوی کە لە ژیانیدا دەبینین زۆربەی جار کاری زۆر لۆژکی مەزنی ئەنجامداوە ئبەلام لەناکاو لە قەیەکی لیداوە هەمووی تیکداوە لە راستیدا نهینییەکی دیکەی تایبەتیش لە سروشتی کەسیتییەکەیدا هەیە ئەویش ئەوەیە سەرکردە لیبرالییەکان(رۆژئاواییەکان بە گشتی)بە پیی مەبدەئیکی بە ناوبانگ دەرۆن کە بریتییە لە(دۆستایەتی و دووژمنایەتی هەمیشەی نییە بەلکو بەرژەوەندی هەمیشەی هەیە)کەچی مام جەلال لە پە یوەندیدا(بەرژەوەندی)هەتا لاسەرو هەمیشەی نییە ئەوەش وایکردووە دۆست و هاوپەیمانیەتی تاسەر لەگەل کەسدا نەبیت چ لە ناو خۆی یەکیت ی و چ لە دەرەوەی یەکیتی هەربۆیەش دەبینین هاوپەیمانیەتی و هاریکاری لەسەر بنەمایەکی دیکە بووە کە بریتیە لە(بە یەکگەیشتنی دوو بەر ژەوەندی لە دژی بەرژەوەندی سییەم)ئەویش ئاژاوەی بەردەوام دەخولقینی و لایەك دەکوژینیتەوە لە لایەکی ترەوە سەر هەلدەداتەوە کۆتای نایە ت هەربۆیەش میژوو تەمەنی مام جەلال بریتییە لە میژووی ململانی بە هەموو

ئاراستەیەکەوە لەگەل کۆمەلیك سیفەتی تری ئیجابی سەلبی کە(لیرەدا بوار نییە باسی بکەین)وایکردووە(ی، ن، ك) بگاتە ئەو دۆخانەی خوارەوە

یەکەم: یەکیتی پیکدیت لە کۆمەلیك کوتلەو تەیار و بال

دووەم: هاو پەیمانیەتی لەگەل هیچ هیزیکی ترلەسەر بنچینەی مەبادیئی نەبی

سییەم: هیزی چاکسازی لە ناودا درووست نەبی

چوارەم: تاگەیشتە ئەو رادەیەی خودی خۆی مام جەلال بوبیتە هۆی وەستانی یەکیتی چارەنوسی یەکیتی لەدوای مام جەلال هەلبەتە تەمەنی مام جەلال و باری تەندروستی گەیشتۆتە رادەیەك چ بە مانەوەی چ بە نەمانی ناتوانی بە ئەکتیفی یەکیتی بەریوە ببات هەلبەتە ئەو جۆرە کەسایەتییەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان پیدا هەر لە گەل نەمانیدا کاریگەریەکی راستەوخۆی دروست دەکات هەر وەك بینیمان تەنها دوور کەوتنەوەی مام جەلال بۆ سەرۆکایەتی کۆمار چەندە کاری یەکیتی کردووە و ئیستا بووەتە کەسیکی پلە دوو لە کوردوستاندا بەلام سەرکردەی تری پیچەوانەی ئەو رەوتەی مام جەلال وەك ئایەتوللاخومەینی یان مەلا مستەفا یان نیلسۆن مانیلا. .... لە دوای نەمانی خۆشیان کاریگەرییان دەمینی کەواتە لە دوای نەمانی مام جەلال بابزانین ئەو ئەگەرانەی رووبەرووی یەکیتی دەبیتەوە چین؟ لە وەلامدا زۆر روونە تا ئیستا(ی، ن، ك) لەسەر پرۆگرامیکی فیکری مەدرەسی دیاریکراو نییە لە سەرەتادا(ماووی)بوو دژ بە سۆسیالیستی دیموکراسی بوو دژبە بەهای رۆژئاواو سەرمایەداری بوو دوایی وەریچەرخان بۆ مارکسییەتی سوڤییەتی دوایی وەرچەرخان بۆ سۆسیال دیموکراسی و دوایی لیبرالی رۆژئاوای بە کورتی لە سەر ریبازیکی دیاریکراو نییە زیاتر لە سەر کەسانی نیو سەرکردایەتی و خودی مام جەلال وەستاوە

**لەناو یەکیتیش ئەم کەسانەی خوارەوە خاوەن کوتلەو نفوزن و بەوشیوەیە وەردەچەرخی**

**یەکەم: مەزنترینیان کوتلەی( کۆسرەت رەسوول )**

کە زیاتر میراتگری مام جەلال دەبیت و دەیەویت کیانی یەکیتی وەك خۆی لەریی شەخسی خۆیەوە بیپاریزیت ئەو پیاوە زۆر قارەمان بوو لەشاخ بەلام زۆر بچوکە لە چاوو ئەو هیزە گەورەی کە پیویستە بۆ پاراستنی کیانی یەکیتی و لە ناو بەشیکی زۆری

سەرکردەکانی ناو یەکیتیدا بە تایبەتی بەشی سلیمانی پابەند نابن پییەوە و زۆر بەخیرای ئەگەری چەندین(ئینشیقاق)هەیە

**دووەم: دووەم کوتلە نۆرەی دکتۆر بەرهەم دیت**

ئەو تا رادەیەکی زۆر سەرکەوتووە لە تەنزیری سیاسیی و ئیداری و کەسیکیشە کەمتر بەشداری شەری برا کوژی و تاوانەکانی کوردستانی کردووە بەلام پلان و بەرنامەی کاری لەگەل ئەو قەبارەو عەشایەرییەی یەکیتی ئیستادا ناگونجی و لە سەر ترازی رۆژواواییانە یەکیتییەکی بچوکی ریکوپیکی دەوی لە سەر بنچینەی خزمەت گوزاری و خەلکی ئۆرستۆکرات و تەکنۆکرات دەهیلیتەوە رەنگە ئەو کاتەش(ی،ن،ك) تەنها(٨/١)یەك لە سەر هەشتی ئەو قەبارەیەی ئیستای بمینیتەوە و لەویشدا چەند بالیکی تری لی جیاببیتەوە

**سییەم: چەند کوتلەیەکی تر هەن بەلام لاوازن**

لەوانە د.فوئاد مەعسوم هەروەها مەلا بەختیار، کە ئەوەی دواییان زیاتر خۆی بۆ دوای مام جەلال ئامادە کردووە لە راستیشدا مەلا بەختیاریش لە شاخ لە دووای کارەساتی هەکاری هەتا ١٩٨١زۆر قارەمان و کاریگەر بوو بەلام بە هۆی(عیراقچییەتەکەی)و دوایش دەستگیرکردن و دەرچونی حوکمی ئیعدام بۆی بە تۆمەتی پەیوەندی بە ئیستیخبارات و دوایش دەرچونی و جیابوونەوەی لە ناو یەکیتی و هاوپەیمانی لەگەل(پارتی)دوایی چوە نیو حزبی زەحمەتکیشان و دوایی تەسلیمی یەکیتی بووەوە. . هەموو ئەوانەی وایانکردووە کە سیتییەکەی بەهیز نەبیت و کوتلەی نەبیت جگەلەوەی کە زیاتر لە ریی(هاوسەریتییەوە )خۆی لە بنەمالەی مام جەلال نزیك کردۆتەوە رەنگە بتوانن کوتلەیەکی بنەمالەی بە لاوازی پیك بهینن و ببنە بەر بەست لە ریی کوتلەکانی سەرەوەدا

**چوارەم:** سەلامەترین ئەگەر ئەوەیە جاریکی تر هەتا مام جەلال ماوە سازش لەگەل(نەوشیروان مستەفا)بکریت رەنگە بە گەرانەوەی ئەو پیاوە یەکیتی بەسەلامەتی بمینیتەوە یاخود بلیین(انقاذما یمکن انقاذه ). .... چۆن؟ بۆ وەلامی ئەو پرسیارە هەلویستەیەکی خیرای دەوی لەسەر کەسیتی نەوشیروان مستەفا

هەرچەندە ئەو پیاوە هەر لەگەل مام جەلال بووە بەلام کۆمەلیك سیفاتی تایبەتی هەیە سایکۆلۆجیەتی لیبرالی میکافیللی ییە هەر ئەوەشە وایکردووە لە گەل قۆناخی نووی یەکیتیدا نەگونجیت دروشمی چاکسازی بەرز بکاتەوە ئەوەتا دواجاریش وورکەوتەوە

متمانەیەکی پیماوە نەك هەر لەناو یەکیتیدا بەلکو لەسەر ئاستی کوردوستانیش خەلکی تامەزۆری سەرکردەیەکە ئەوەندە خۆویست و بی مەبادیئی و بیوەفا نەبیت حەزیان لە سەرکردەیەکە چاکسازییەکی بنەرەتی بکاو مارەسەیەکی گەندەلی و گرانی و ئەو سەرووبەرییە بکا...... جاکیشەی هەرە گەورە کە رووبەرووی ئەو پرۆژە چاکسازییە دەبیتەوە ئەوەیە کەبەشی هەرە زۆری قەبارەی یەکیت ی و(حزبە عەلمانییەکانی تریش)لەسەر ئەو بیسەروو بەریی و گەندەلییەی ناو یەکیتی وەستاوە بۆیە(بەرەی چاکسازی)کەمایەتین بەو جۆرە دیینە سەر گیروگرفتەکانی ئەو پرۆژەیەش

**یەکەم:** باسی کەسیتی بەهیزی نەوشیروان مستەفامان کرد بەلام ئەویش میژوویەکی پرلە براکوژی و توندوتیژی هەیە و متمانە گشتییەکەی تەواو تۆکمە نییە

**دووەم:** هیشتا نەی توانیوە لەو قەبالە کلاسیکییەی سەرکردەکانی دەرچیت و نەیتوانیوە جەماوەری فراوانی کوردوستانی مزگەوت و ئاینپەروەران بۆ ئەو پرۆژەیەی خۆی بەکاربهینیت

**سێیەم:** ریفۆرمیك پیویستی بە(فۆرم )ە بنچینەییەکە هەیە کەچی(فۆرم )ی یەکیتی کە لە بەیانی(تەئسیسی ١٩٧٥) دیاریکراوە ئیستا هەمووی پیچەوانە بۆتەوە بۆیە دەتوانین بلیین هیشتا پرۆژەی ریفۆرمی نەوشیروان مستەفا فۆرم و ئەنجامەکانی روون نین

**چوارەم:** بە پیی قەبارەی ریفۆرم(وەك لەسەرەوە باسمان کرد ئەو بەرنامەیە بەشیکی زۆرلە گەندەلچی و بەرتیل خۆر و سوودمەندەکان ناگریتەوە و ئەویش دەبیتە ئینشیقاق

**کەواتە:** لەکۆتاییدا هیچ چارەیەك نییە و لە دوای مام جەلال(ی،ن، ك) چەند قات بچوك دەبیتەوە و نەخشەی سیاسی و هاوسەنگی هیز زۆر دەگۆری

## کێ سوودمەند دەبیت؟

زۆر بەکورتی ئەو دۆخە لە هەر ولاتیکی تری جیهانی ئیسلامیدا بووایە ئەو ئیسلامییەکان سوودمەند دەبوون و ئەو بۆشاییەی کە یەکیتی بە جیی دیلی پریان دەکردەوە بەلام ئیسلامییەکانی کوردوستان(ی دەتوانن بلین شکستیان هیناوە)و لە پرۆژەکانیدا سەرکەوتوو نەبوون و بگرە هەموولایەکیان زیاتر لاوازبوونوو لە هیچ هاو

کیـشەیەکی سیاسـیدا نـین بـەدیلیش نـین بـۆ هـیچ لایـەك کەواتـە بـەردەوامییان بـووە تـا سەرئیشەو ئازار بۆ ئەندام و لایەنگرانیان زۆریش لەدوای ڕووداوەکانەوەن

کەواتە لە دوای نەمان ی مام جەلال کورد بەگشتی زەرەر دەکـات ڕەنگـە بـەدیلیکی نـەبی بتـوانی بگاتـەوە سـەر کورسـی سـەرۆك بـەبروای مـن ئیـدی ئـەو ئەزمونـە دوبـارە نابیتـەوە جاریکی تـر کـورد لـە سـەرۆکایەتی کۆمـار نابینریتـەوە هـەروەها(ی، ن، ك) یـش زۆر زەرەر دەکات

ئـەوەی قـازانج دەکـات لـە کوردوسـتان(پ، د،ك )ەو زۆر زیـاتر زال دەبیـت هەرچـەندە سەرکردایەتی پارتیش لە وە گەیشتوە کە مام جەلال بۆشاییەکی زۆر گـەورەی بـۆ کـورد لـە بەغدا پر کردۆتەوە بۆیە(ئومیدەخوازنییـە مـام جـەلال بمری)بـەلام هـەر بۆمـان نامینیـت یەکیتیش دەبی خۆی ئامادەبکات وەك حیزبیکی بچوکتر بیتە ریزی خوارەوە.

## کورتە لێدوانێك لەسەر کتێبی . پە نجەکان یەکتر دەشکێنن

**پشکۆ نەجمەدین**

پەنجەکان یەکتری دەشکێنن , ناونیشانی بەشی دووەمی زنجیرە نوسینەکانی نوسەری سیاسی((نەوشیروان مستەفا ئەمین )) کەوا چاوەروان دەکرێت لە پێنج بەشدا لەدوای یەك بەردەستی خوێنەر بکەون.

پەنجەکان . قۆناغێکی دیکەی ئەو گەشتەیە کەلە کەناری دانوپەوە , لە ساڵی ١٩٧٥ دا رێچکەی گرتووە و لەکۆتای ١٩٨٣ دا , لە ئاستانەی موفاوەزاتی یەکێتی – بەعسدا پشویەکمان پێ دەدات و بوارێکمان بۆ رامان و بیر کردنەوە و بەراورد کردنی وێنە پر تراژیدیەکان بۆ دەرەخسێنێت. نوسەر هەر لەسەرەتای کتێبی یەکەمی دا , مافێکی بە خوڵقێنەری روداوەکان و بەشدارانی گەشتە خوێناویەکەی پاش نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ داوە و مافێکیشی لە هەمووان وەرگرتوەتەوە: مافی بە حەق داران و بەشدارانی روداوەکان داوە کە هەر کەس قسەی خۆی بکات و دیدە و رای خۆی لەسەر چۆنیەتی رەوت گرتنی پرۆسە رێکخراوەیی و سیاسی و چەکداریەکان دەر ببرێت چونکە نوسەر نەیتوانیوە و نەیویستووە وەکو بێلایەنێك باس لە روداوەکان بکات ,وێنەیان بکێشێت بیانخوێنێتەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات. پاساوی ئەم کارەشی ئەوەیە کە ئەو نەك هەر بێ لایەن نەبووە بگرە بەشێك بووە لە لایەنێك و بزوێنەر و بریار دەرێکی بە تەئسیر و حیساب بۆ کراوی ناو لایەنەکەی خۆی بوە. نوسەر هەمیشە کەسی ژماردو , جارو باریش ژمارەیەکی رێکخراوێکی گەورە و بەتوانای وەکو یەکێتی نیشتمانی کوردستان و یەکێتیش لە باڵێکی بالادەستی نێو بزوتنەوەی سیاسی – چەکداریی کوردستانی عێراق بووە.

دانپیانانی بێلایەن نەبوون لە پرۆسەی نوسین و گێرانەوەی مێژوو دا بۆ نوسەرێکی سیاسی بەئەزموونی وەك نوسەری(دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق)جگەلەوەی جورئەتێکی گەورەیە ئەوا کەم نوسەر هەیە وەها پرکێشیەك بکات و لە دیدی خۆی و حیزبەکەیەوە کارەسات و روداوە سیاسیەکانی قۆناغێکی لەخوێن هەڵژەنراوی پر ئەزموونی میلەتەکەی بنوسێتەوە و مێژوویەکی تاك لایەنی بۆ نەوەکانی داهاتوومان بەجێ بهێڵێت.

نەوەکانی ئاندەمان , پاشی سەد سالآنی دی کە ئەم کارەسات و تراژیدیایە نەتەوەییانە , تەنیا و تەنیا لە دووتوێ کتێبانی مێژوودا دەخوێننەوە .

هەر ئەم جورئەت و ئازایەتیەش مافێکی لەهەمووان وەر گرتوەتەوە و بەو ماف وەرگرتنەوەیەش ئەرکی سەر شانی سووکتر کردووین ئەویش: مافی تاوانبار کردنی نوسەران بە رەچاو نەکردنی بێ لایەنی و کەم مەوزوعیەت لە داوەری کردندا لەسەر کێشەکان و چۆنیەتی هەڵبژاردن و رێکخستن و نوسینەوەی خەرمانی یادەوەریەکانی. ئەم جورئەتەی نوسەر بۆخۆی پردێکی دوور و درێژی گومان لەنێوان نوسەر و خۆینەرانی بەرهەمەکەدا دروست دەکات , پردێکی جەنجاڵی داپۆشراو بەتەم و مژی پێشهات و کارەساتەکان.

ریشاژۆکردنی روداوەکان , هەڵکۆلینی رەگەز و بنەما کۆمەلایەتی و ئابووری و کەلتوری و سیاسیەکانیان , پۆلێنکردن و دووبارە تێهەڵکێشان و پێکەوە گرێدانەوەیان , هەوڵ و تێکۆشان و خۆماندوو کردنێکی زۆر لەوە گەورەتری گەرەکە کە لە دووتوێ زنجیرە کتێبێکی بێ میتۆدا بەئەنجام بگەیەندرێن. کە دەلێن بێ میتۆد , مەبەستم ئەوەیە کە کتێبەکان نە لەژێر چەتری زانستی مێژوونوسی دا ئارام دەگرن و نەلەهەواری یادوەری نوسین دا بارگەدەخەن و نە کوتومت رێپۆرتاژی رۆژنامەنوسیشن , بەلکو تێکەڵەیەکن لە هەرسێ بابەتەکە و لە زۆر شوێنیشدا , کرۆنۆلۆژیای روداوەکان رێرەوی زەمەنیان رەچاو نەکردووە و کورد گوتنی قسە قسەی هێناوە و روداویش , روداوی زیندوو کردوەتەوە , بڕوانە(بە بۆنەی مەرگی مەلا مستەفا وە. .. جەلالی و مەلایی لە تەرازوودا ل٣٥)

زمانی نوسین لە هەردوو کتێبەکەدا , زمانێکی رەوان و بێ گرێ و گوڵ و کوردیەکی سادەی ئەو تۆیە کە خوێنەر چێژی لێ وەردەگرێت. بە واتایەکی دی کە , نوسەر هیچ زۆر لە خۆکردنێکی بۆ داتاشینی وشە و زاراوەی کۆی بەخۆی رەوا نەبینیوە لە دارشتنی رستەشدا , چ گرفت و تەنگژەیەکی بۆ خوێنەر نەخولقاندووە , ئەمەش بەمانای خاڵی نەبوونی لە کلیل و کەلەپوری رێنوس و رێزمان نییە خۆینەر دەتوانێت هەڵە و پەلەی لێ هەڵبگرێتەوە , لەوشوێنانەشدا کە هاتوەتە سەر وەسف و وێنەگرتنی: لوتکە و نزار , کەپك و بنکاچ و بن رەمەن , دۆڵ و لاپاڵ و شیو و زیخەلان , هەرد و کۆسار و باخ و بێستان , تەختایی و بەردەلان , زۆزانی کوێستان و ئارانی گەرمیان , ژیانی کۆچەریان و هەڵدانەوەی وچەو بنەچەی بەرەبابی ئێڵ و عەشرەتانی کوردستان , کۆمەڵی وشە و زاراوەی فەرهەنگی

هێناوه و شوێن ڕەنگ و بنج و بنەوانی خێڵەکان و ناساندنی تۆپۆگرافیای کوردستان و پۆلێن کردنی گوڵ و گیا درەخت و دەوەنی کوێستانەکان تایبەتن , بەوحەقیقەتە دەگات کە نوسەر لەو لایەنانەی کتێبەکەدا بالاّ دەستە و سەرکەوتنیشی بەدەست هێناوە , ئەگەر چی من پێم وایە ئەو بابەتانە کەم و زۆر پەیوەندیان لەگەڵ نێوەرۆك و مەبەستی کتێبەکەدا نییە زیاتر بابەتی فیلۆلۆژیاو جوگرافیا و ئیتنۆلۆژیا و زیندەوەرناسی و شتی لەو بابەتەن کە دەشێ لە کتێب و ناملکەی جیادا چاپ و بلاو بکرێتەوە و دەرهاوێژتنیان لە نێوەرۆیەکی ئەم کتێبە هیچ لەبەهای کتێبەکە ناگۆرێت بونیان لێرەدا تا رادەیەك ناوێزە و نامۆ دەردەکەون.

کتێبی یەکەم(لەکەناری دانوپەوە بۆ خری ناو زەنگ)سەرەتای هەلتۆقینی روداوەکانە. سەرەتایەکی گرنگ و چارەنوسساز , کەلەهەناوی خۆی دا کارەساتە خوێناویەکەی سالآنی پاشتری هەلگرتووە. ئەم کتێبە قسە و باس و خوێندنەوەیەکی قولّی تیوری و سیاسی هەڵدەگرێت و شەن و کەوکردنی چۆنیەتی رێچکەگرتنی روداوە سیاسی و رێکخراوەییەکانی ئەو سەردەمە , کتێبێکی هێندەی خۆی پێدەوێت , من لەسەرەتای گەشتەکەدا لەشار بووم هاوسەفەری نوسین نەبووم. من سەرەتای سالّی ١٩٧٨ چوومە شاخ و هەر بەو پێوانەیەش لێدوان لەسەر نێوئاخنی کتێبی دووەم , واتە(پەنجەکان. ..)بەخۆم رەوا دەبینم و بەگرنگتری دەزانم , چونکە بۆخۆم لە جەنگی ململانێکاندابووم و بەقەدەر دەوری خۆشم پریشکی خوێنە بەناهەق رژاوەکانم وێدەکەوێت.

لە کتێبی(پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن)دا بابەت و روداوەکان هەندێکیان:

- قسە و رای جیاواز هەڵدەگرن.
- پەردەیان بەسەردا دراوە.
- بەهەڵەباس کراون.
- هەندێکیان زۆر گەورەکراون و هەندێکیش بچوك کراونەتەوە.
- کەسانێك بەناهەق شکێندراون.
- وەکو خۆیان باس کراون.

دیارە قسە کردن لەسەر سەرجەمی بابەتەکان بەپێ ی ئەو زنجیرەیەی نوسەر کتێبەکەی پێ رێکخستووە , کارێکی ئاسان و خۆش دەست نییە. من ناچارم لە هەر خەرمان و

شارايەك و لەهەر شارايەك , ملۆيەك و لەهەر ملۆيەكيش سوالّەيەك وەدەستەوە بگرم و سەرنجيان بهاومێ.

## قازى و مەلا. .. ل٢٣ ,تێنەگەيشتن لە مێژوو !.

نوسەر بەراوردێكى سەير و بێ بناغە لەنێوانى شوێن و پايەى قازى موحەمەد مەلا مستەفاى بارزانى بنەمالّەكانيان لەهەردوو حيزبى(حدكا)و(پدك)ى عێراق دا دەكات , بەو پێ يەى كە هەردوو سەركردە دامەزرێنەر و رێبەرى حيزبەكانيان بوونە. ئەوەي كە ميراتى پدكە پاش مەرگى مەلا مستەفا بارزانى بۆ كورەكانى ماوەتەوە و هەرچى(حدكا )يشە پاش سەركەوتنى شۆرشى ئێران , بيريان لە دانانى يەكێك لە كورەكانى قازى وەك رێبەرى حزب نە كردوەتەوە , بەلاى نوسەرەوە نيشانەى پێشكەوتنى فكرى حدكا يە لەچاو(پدك)ە عێراق دا !.

هەروەك چون كەسەكان بەكومەڵ مێژوو دروست دەكەن و كەسى دەركەوتوو بەرجەستەى گونجا و لەگەڵ رەوتى كۆمەلايەتى و فەرهەنگى و كۆمەليشدا دەورى چارەنوسسازى تێدا وازى دەكات هەر ئاواش لەرێرەوى بزوتنى مێژوويەكى كۆمەلايەتى سياسى سنور دار دا كەس و سەركردە و بنەمالّە مێژوويەكان دەخولّقێنن و دەردەكەون ئەمە بێ لەبەرچاو گرتنى ئەوەى كەداخوا ئەو سەركردە و كەس و مالّباتانا شۆرشگێر يان ناشۆرشگێر، پێشكەوتوكخواز يان كۆنەپارێزن بريخت واتەنى(مێژوو ئەوەيە كەروودەدات نەك ئەوەى كە ئێمە حەزكمان لێيەتى و دەمانەوێت بيخولّقێنين)

مەلا مستەفاى بارزانى بەپێ ى پەسن و پياهەلّدانى نوسەريش بێت(بروانە پەنجەكان. .. ل٣٦ پەرەگرافى يەكەم)تەنيا سەركردەيەكى كورد بوو كە تريژترين ماوەى زەمەنى لە تەمەنى بزوتنەوەى هاوچەرخى كورد دا رێبەرايەتى بزوتنەوەى سياسى و چەكدارى لە كوردستان دا كرد، مەلا مستەفا بارزانى سەركردەيى حزبێ كى سياسى بووە لە كوردستان دا كە لەسالانى دووره ولاتيش دا لە هەر كوێيەك بووبێت حزبەكەى وەكوو (زەعيم)و مامۆستا و رێبەر بە خەلّكيان ناساندووە، مەلا مستەفا بارزانى لە بنەمالّەيەكى خێلّەكى – مەزهەبييە كە بە درێژاى ئەم سەدەيە لەگەڵ دەسەلاتە دەولّەتيى يەك لە دواى يەكەكانى عێرلاقدا لە ململانێيەكى سەخت و خوێناوى دا بوون. كورەكانى مەلا مستەفا بارزانى لە پرۆسەى بەردەوامى بزوتنەوەكەدا فراژيبوون و دەردەكەوتن و كۆ نترۆلى بەشێك لە

دەسەڵاتی پارتیان کرد. واتە ئەوەی پارتی نەبوو کەمیراتی دەسەڵاتی سیاسی خۆی بە کورانی بارزانی بەخشی بەڵکو ئەوە خودی مەلا مستەفا بوو بە پێ گەیشتنی خۆی بە دەسەڵات و شۆرش و پارتی زەمینەی گواستنەوەی بەشێك لە دەسەڵاتی خۆی بۆ رەخساندن و پاشانیش هەمووی پی بەخشین. واتە پارتی نەچووە لە دورگەی(واق واق)ەوە مەسعود بارزانی بهێنێت و لەسەر تەختی دەسەڵاتی حزبەکەیەوە دایبنێت بەڵکو ئەوان خۆیان بەشێك بوون لە پارتی و دەسەڵاتەکەی.

لەکۆمەڵگای رۆژهەڵاتی دا دەسەڵاتی مادی و رەمزی باوك دەسەڵاتێکی نەمرە و کوراو کور دۆناو دۆن دەکات. ئیدی مەسەلەکەش هیچ پەیوەندیەکی بە دواکەوتویی و پێش کەوتوویی دوو حزبەکەوە نییە واوەتریش، قازی موحەممەد لە بنەماڵەیەکی ناسراوی موکوریان بوو بەڵام:

- تەمەنی سیاسی قازی موحەممەد لە ٤ — ٥ساڵ تێپەری نەکرد
- قازی موحەممەد وەکو سومبولی شەهید و قوربانی دان، هاتە نێو مێژووی سیاسی کوردەوە نەك وەکوپاڵەوانێکی ئەفسانەیی. واتە ئەو مەرگ کردی بە قارەمانی میلی کەچی بارزانی لە ژیان دا بوو بە باوکی رۆحی کورد.
- کورانی قازی موحەممەد لە سەردەمی کۆماری مەهاباد و دەسەڵاتی قازی دا هیچ دەور و نەخشێکیان نەبووە پاشتیریش لە دەرونی(حدکا)دا جێگایەکی ئەو تۆیان پێ نەبرا. سەرکردەکانی حدکا زۆر لەوە زۆرتر و ناکۆك تر بوون کەیەکێك لە کورانی قازی بەرێبەری خۆیان قبوڵبکەن
- پرۆسەی رەوتی(حدکا و پدك)بە دوو ئاقاری تەوا جیاواز دا بزواون من پێم وایە ئەو بۆچونەی نوسەر , خراپ تێگەشتنە لە چۆنیەتی شکلگرتن مێژوو و روداوە سیاسیەکان یاخود بە ئەنقەست شێواندنیانە

## جیابونەوەی بزوتنەوە( ل ٣٢ )

جیابوونەوەی بزوتنەوە و جیابونەوەی لەنێو ریزەکانی یەکێتی پاشی کارەساتی هەکاری، دووەمین تێشەی کوشندە بوو کە بەر تەلاری رێکخراوەیی — چەکداری یەکێتی کەوت و تاسەر ئێسقان دوو کەرتی کرد، ئەو روداوە لە هەلو مەرجێکدا رویدا کە تازە یەکێتی لەژێر گورزی هەکاری دا هەستابووەوە و تین و تاوێکی تێکەوتبو.

نوسەر لەئاست ئەو مەسەلەیەدا کۆمەڵێك هۆکار و بیانوویی تۆمار کردوون کە زۆربەیان دروستن بەڵام وەکو سۆنگە و هۆکاری راستەقینە ناوی نەبردوون و هیچ رەوایەکیان پێنادات من پێم وایە بیانووەکان راستن و هەقیقەتیان هەیە، هەردوو بیانووەکەی نوسەر پەیوەندیان لەگەڵ خەسڵەتی تاکرەوی مام جەلال و سەپاندنی راکانی خۆیەتی بەسەر ویست و ئیرادەی ئەندامانی دیکەی سەرکردایەتی دا. نوسەر لە دوو جێگادا ئاماژەی بەم خەسڵەتەی مام جەلال کردووە کەچی لەسەر(بزوتنەوە)یان(بیانوو)حسێب دەکات.(خوێنەر دەتوانێت بۆ ل ١١٩ ی کتێبی پەنجەکان. ..)بگەرێتەوە و لەم دوو خاڵە برانێت:

١- داتاشینەوەی بزوتنەوە، پاشی جیابوونەوەی بزوتنەوە.

٢- دانانی علی حەوێز وەکو نوێنەری بزوتنەوەی داتاشراو لە(م.س)ی یەکێتی دا، وێرای رازی نەبوونی هەموو نوێنەکانی کۆمەڵە(بیانوو)ی داشکاندنی مام جەلال بەلای کۆمەڵەدا کە نوسەر بەیەکێك لە هۆکارەکانی جیابونەوەی دادەنێت. دیارە بۆچونەکانی بەشێکی لە حەقیقەتەکانی لەخۆ گرتووە بەڵام هەموو حەقیقەتەکان لەوێ دانین.

٣- گورزی هەکاری بۆسەر جەستەی یەکێتی نیشتمانی قورساییەکەی بربڕەی پشتی بزوتنەوەی شکاند بەتایبەت ئەو لاباڵەی بزوتنەوە کە پێشینەیان لە نێو باڵی جەلالی دا هەبوو ئیعدام کردنی دیلەکانی یەکێتی بەدەستی قم و لەوانەش علی عەسکەری و د.خالید سەعید کە دوو سەرکردەی دیاری بزوتنەوە جەلالی بوون، پایەگای جەلالیەتی لەنێو بزوتنەوەدا لاواز کرد و لەپرۆسەی ململانێ ی نێو کۆمەڵە و بزوتنەوەدا، مام جەلال بەناچاری بۆداکوتانی ریشەی خۆی و داکوتانی ریشەی یەکێتی دەبوو لایەنی کۆمەڵە بگرێت. هۆکاری بنەرەتی جیابونەوەی بزوتنەوە و دوکەرت بوونی یەکێتی و پێکهاتەی ناتەواو و سترەکتۆری خودی بزوتنەوە بوو بەواتایەکی دی بزوتنەوە لەگەڵ دروست بوونی دا ماکی جیابوونەوەی لەناخی دا هەلگرتبوو رەگەزەکانی مینای رێکخراوەیی و فکری و بزوتنەوە لەنێو دووباڵە نەیارەکەی پارتی یەوە(جەلالی و مەلایی)دەرکەوتبوون و لێك ئالابوون کارەساتی هەکاری، تەرازووی هاوکێشەکەی لاسەنگ کرد، ئەوانەی کە لەسەرکردایەتی بزوتنەوەدا مانەوە زۆربەیان لەوانەبوون کە مێژوویان لەنێو باڵی مەلایی دا هەبوو. لەرۆژگاری نسکۆ و دامەزراندنی بزوتنەوەدا ئەمان پێیان وابوو کە: -

- پارتی و بنەماڵەی بارزانی کۆتاییان پێ هاتووە ئەگەریش هەستانەوە هەرگیز نابنەوە بەو هێزە سیاسیەی حسابیان لەسەر بکرێت. ئەم بۆ چونە تێروانینی

هەموولایەکمان بوو کە لەبەردەم بومەلەرزەی نسکۆدا هەژابووین پێمان وابوو ئەوە کۆتای مێژووی بزوتنەوەی ئەیلوله یان هەرنەبیت بەجێ هێشتنیەتی !

- مام جەلال دەبێت دەرسی لە ئەزمونەکانی رابردوو وەرگرتبێت و لە بواری سیاسی و رێکخراوەیدا، دیموکراتی تر و ماقولتر مامەڵە بکات. لەمەشیاندا هەم ئەوان و هەم خەڵکی تریش بەهەڵەدا چوبون.

- رۆژگاری نسکۆ، رۆژگاری پاکژکردنەوەی بەشێکی لێپرسراوەکانی بزتنەوەی ئەیلول بوو. ... دەبو دەنگ و رەنگێکی دی وەك پەیدا بکەین وە هەوڵ بدەین قورسایی تاوانەکانی نسکۆ، هەر هەمووی لە ئەستۆی بنەماڵەی بارزانی باربکەن !. گۆرانکارییە سیاسییەکانی ناوچەکە، لەوانە روخاندنی شای ئێران و جەنگی ئێران – ئێران، هاوکێشە و حیساباتەکانیان گۆری و دەبو ئەوانیش سەرلەنوێ لەروداوەکاندا بچنەوە و خەو و خەونەکانیان بۆ واقیعە تاڵەکە بگوێزنەوە.

- سەرکردایەتی بزوتنەوە، ئەگەرچی بەدەستی قم گورزی وێ کەوتبوو، کەچی شەری قم و یەکێتییان بەشەری خۆیان نەدەزانی، سیاسییەکانی کورد، زۆر بەئاسانی دەتوانن دەنگ و رەنگیان بگۆرین، بەلاّم گۆرینی عەقلّ و مێژوویان مەحاڵە، ئەوان هەڵوێستییان دەرهەق بە مام جەلال لەشەستەکان و حەفتاکاندا چۆن بوو، دەبوو هەر هەمان هەڵوێست وەرگرنەوە، لەمەشیاندا لەسەر حەق بوون، چونکە هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەر نییە، کەجیاوازی نێوانیان کەس و سەرکردەکانی شەستەکان و حەفتاکان و هەشتاکانمان بداتێ !.

کۆمەڵە لەدیدی مام جەلالەوە نەدەبوو وەکو تەنها سواری نێو یەکێتی بمێنێتەوە، بۆیە بەپەلە کەوتە هەوڵی راکێشانی ئەو کادر و ئەندامانەی بزوتنەوە کە پێشینەی جەلالیەتیان لە نێوشاردا هەبوو لەوانیش: عەلی حەوێز، جەمال ئاغا، حاکم عمر عزیز، مامۆستا نازم و خەڵکی دیش، بەو جۆرە مام جەلال دەیویست قەناعەت بە خۆی و بە خەلکی دیش بهێنێت کە بزوتنەوە لە یەکێتی دەرچوو باڵی لادەر و نارەسەنە و داتاشراوەکەش باڵی رەسەنی بزوتنەوەیە ئەم باڵە دروست کراوە لەنێو کادر و ئەندامانی کۆمەڵەدا بە باڵە گۆجەکە ناوی دەرکرد.

**بەبۆنەی مردنی مەلا مستەفا وە: مەلایی و جەلالی لە تەرازوودا**

نوسەر لەژێر ئەم ناو نیشانەدا سەرەوەدا بە فلاش باك بۆ سەرەتای ئەم سەدەیەمان دەگێڕێتەوە و لە دووتوێ ی هەیشتا و یەك لاپەرەی کتێبەکەی دا مێژووی پتر لە سێ چارەکە سەدەی بزوتنەوەی سیاسی — چەکداری کوردمان لە کوردستانی عێراق دا بە چڕ و پڕی بروسکە ئاسا بۆ دەگێڕێتەوە سەرەتای باسەکە لە بنچەی ماڵباتی بازانی یەوە دەست پێ دەکات شێخ مەحەمەد بارزانی پایەی ئاینی ئەو شێخ عبدالسلام شێخ ئەحمەدی بارزانی مەلا مستەفا، مەلا لەسلێمانی شۆڕشی بارزان و حزبی هیوا چوونی بارزانیان بۆ مەهاباد و یەکێتی سۆڤیەت، پارتی و کۆنگرەکانی، کورتە باسێکی مێژوویی سیاسی عێراق(قاسم و شۆڕشی ١٤ تەموز، ٨ شوبات و حوکمە یەکەمی بەعسیەکان گفتوگۆکانی بزوتنەوەی ئەیلول و دەوڵەتی عێراق دەسەڵاتی عارفەکان و هاتنەوەی بەعس. ..)و پاشان ناکۆکیەکانی دەروونی پارتی: جیابوونەوە و چونە ناو هەمەدان، ئاشت بوونەوە و چونە بەغداد و چاندنی تۆوی دووبەرەکی و حەڵاڵ کردنی خوێنی کورد بۆ کورد لەژێر پاساوی دروێنەی ئایدەلۆژیدا ئەم بەشەی کتێبەکە ئەگەر هەندێ قسەی گیرفان و گێرانەوەی سەرتەنوری بێبەلگە و فاکتاوی لێ دەرهاوین سیستەماتیکترین بەشەکانیەتی سەرجەمی باسەکە جۆرێك لە مەوزوعیەتی تێدایە بەڵام مەوزوعیەتێکی لە تەمومژ گیراو، خوێنەری زیرەك دەکرێت لەنێو دەریای ئەو مژو لێلیەدا مرواری درەوشاوەی مەبەستە تایبەتیەکانی نوسەر ببینێتەوە.

نوسەر لەسەرەتادا تاوانی جیابونەوەکە لەسەر شانی هەردولا(مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی)دادەنێت و پاشتر بەزەقکردنەوەی زەبر و زەنگ و دڵرەقی ! مەلا مستەفا بەرامبەر بە کادوران و ئەندامانی پارتی، تای تەرازوی بارزانی سەنگینتر دەبێت.

نوسەر لە رەخنەگرتن لە(م. س)و دەستنیشانکردنی هەندێ هەڵە و پەڵە، دەستی نەگێراوەتەوە و دەنوسێت: کە مەکتەبی سیاسی هەموو جارێك لەبەردەمی مەرجەکانی مەلا مستەفادا پاشەکشەیان کردبوو، کە نەدەبوو بیکەن، ئەمجارەشیان دەبو پاشەکشەیان بکردایە کە نەیانکرد ). ئەمە هەم رەخنەیەکی لۆژیکی و هەم رەخنەیەکی مەعقولە، لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی بزوتنەوەکەدا رێك دێتەوە و ئەگەر باڵی م. س کەمێك ملکەچتر بونایە بۆ سەرۆکێك کە خۆیان لە کوردیان باشتر دەناسی و هەم ئەوان و هەم کوردیش

پێویستییان پێی هەبوو، رەنگە ئێستا چارەنوسی کورد بە جێگەیەك گەشتبا جیا لەم هەوارەی کە تیایدا گلاوە !.

نوسەر لە شیکردنەوەی رەوتی روداوەکان و ئەو بەرئەنجامە سلبی و داب و نەریتە دزێوانەی کەدیاردەی جیابونەوە و هاوردنییە نێو کرۆکی بزوتنەوەی کوردەوە، مەلا مستەفا و مەلاییەکان بە سەبەبکار دەزانێ و لەوانەش:

- تیرۆری سیاسی.
- گرتن و راوەدونانی ئەندامانی پارتی و کوشتنی هەندێکیان
- سەرانە سەندن و راو و روت
- کارە چەپەڵەکانی باندی کانی ماسی.

## لەسەرکردنەوەیەك بۆ مێژوو

پێش ئەوەی هەر سەرنجێك لەمەر ئەم بۆچونەی نوسەر و روانینەکانی تریشی لەئاست کەسایەتی مەلا مستەفا و جەلالی و مەلایدا دەربڕم، دەمەوێت ئەوە بڵێم کە مەلا مستەفا وەکو سەرکردەیەکی سیاسی و دەرهاویشتەی زەمینەی کۆمەڵایەتی و کلتوری بزوتنەوەی سیاسی میللەتی ئێمەیە و یەکێکە لەرەگەزە دیارەکانی قۆناغێکی تایبەت و پڕ لەئاڵوگۆڕی سیاسی میللەتی کورد. مەلا مستەفا لەپاش روخاندنی کۆماری مەهابادەوە، هەتاوەکو نسکۆی بزوتنەوەی ئەیلول سومبلێکی بێهاوتا بوون و موقاوەمەتی خەڵکی کورد بوو وەکو باوکێکی رۆحی تاپۆی هەیبەت و گەورەیی ئەو لەماڵی هەموو کوردێکدا و لەناخی هەموو تاکێکدا. ئامادەیی هەبوو دەسەڵاتی ئەو باوکە ئەفسانەییە لە زەمینەی سایکۆلۆژی سیاسی کوردیدا هێند بەهێز بوو زریانی نسکۆش نەیتوانی هەڵیبکەنێت وەك دەبینین لەزەمان و هەل و مەرجێکی تر دا خۆی بەرهەم هێناوە ئەگەر مل بەو راستیەش بدەین کە مێژووی ئێمە هەتا ئێستا چ رەمز و پاڵەوانێکی زیندووی سەرکەوتووی بەرهەم نەهێنایەوە پاڵەوانە مردووەکانیش لەپاش مەرگیان بەهەیبەت تر و ئەفسوناوی تر دەبن ئەوا لە خوێندنەوەی مێژووی خۆمان دا روبەرووی قارەمانە مردووە هەرگیز نەمرە ئەفسانەییە مێژوویەکانمان دەبینەوە و مەلا مستەفاش تەختێکی لەو کاروان سەرای مێژوودا بۆ خۆی گرتووە، مەلا مستەفای بارزانی بە شۆرشی بارزان و چونە مەهابادی یەوە، پەرینەوەی بۆ روسیا و

گەرانەوەیەوە بە ئەیلول و ئازار و نسکۆی شۆرشەوە ئەلقەیەکی لە زنجیرەی مێژووی کورد و رەخنە لێ گرتن و هەڵدانەوەی لاپەرەکانی کارێکی ئاسایی یە و هەر مێژوو نوسێکی بەویژدانیش بەو کارەی خزمەتێك بە مێژووی میلەتی کورد دەکات بەلام سوکایەتی پێ کردنی، بێ حورمەتی پێ کردنی مێژووە من وای بۆ دەچم کە مەلامستەفا زیاتر پەیوەندی بە مێژووی کورد و رابردووی پارتیەوە هەیە نەك ئێستا مەلا مستەفا وەکو سومبولێکی دیار لە مێژووی بزوتنەوەی چەکداری و سیاسی ئێمەدا نەك هەر وەك پێویست نەخوێندراوەتەوە بگرە خۆمان لە دوژمنەکانمان زیاترمان زولم لێ کردووە. مەلا مستەفا کە سالانێکی دوور و درێژە لە لوتکەی هەرەمی بزوتنەوەی سیاسی کورد دا رۆ نیشتبوو شاکۆڵەکەی راگرتنی ئەو هەرمەش تا ئەو جێگایەی بە مەلا مستەفا و دەسەلاتەکەیەوە بەندە، تەنها پارتی دیموکراتی کوردستان نەبووە مەلا مستەفا لە پراکتیك دا لەسەرەوە یان لەدەرەوەی پارتی بووە واتە دەسەلاتی مەلا مستەفا لە پارتی دا خۆی نەبینی یەوە بەلکو ئەوە پارتی بوو کە هەموو دەسەلاتی خۆی لە بارزانی دا بەرجەستە کردبوو هەر بەو پێیەش ئێمە ئەگەر نەتوانین بە بێ مەلا مستەفا مێژووی پارتی بخوێنینەوە ئەوا دەکرێت لە دەرەوەی پارتی دا لە رەهەندەکانی کەسایەتی مەلا مستەفا رامێنن چونکە کەسایەتی مەلا مستەفا نەك لە ستراکتۆری سیاسی و کۆمەلایەتی حزب دا توایەوە نە جۆرە یەکسانیەکیشیان لە نێوانیان دا دروست بوو دەسەلاتی پارتی شێوازە روکەشەکەی دەسەلاتی مەلا مستەفا بوو لە نێو جەستەی بزوتنەوەکەدا هەر بۆیە زەوت کردنی بونیادی رێکخراوەیی پارتی و راکێشانی(بەرە)کەش لەژێر هەرەمی مەلا مستەفا لەسەر رۆنیشتوودا رەگەزە شاراوەکانی دەسەلاتی خودی مەلا مستەفا بارزانی پارسەنگی هەرەمیان دەگرت و پارتیشیان بە وجود دەهێنایەوە

دەسەلاتی مەزەبی و خێڵەکیانە و ئەندێکارەکتەر و خەسڵەتی تایبەتی کەسایەتی مەلا مستەفا و مێژووی دروست بونی ئەو کەسایەتیی لە کۆمەلگایەکی عەشیرەتی وەك کۆمەلگای ئێمە بۆ راگرتی مەلا مستەفا بەزیندووی هێشتنەوە و بەرهەم هێنانەوەی دەسەلاتی تیور و فەلسەفەی پارتی بەهێزتر بوون هەموو سەرەنج و تێبینییەکانم لەئاست ئو مەسەلەیەدا لەو روانگەیەوە سەرچاوە دەگرن کاتی ئەوەش هاتووە کە رووداوەکان و کەسەکان بەچاوی رۆژگاری خۆیان و وەك ئەوەی کی رویاندا و هەڵسوکەوتیان کرد، نەك وەك ئەوەی کە دەمانویست روبدەن و رەوتار بکەن بخوێنینەوە !.

بزوتنـەوەی چـەکداری کـورد لـە پاشـی جیابونـەوەی(٦٤ – ٦٦ )ـەوە ئـەو خەسـڵەتە دزێوانـەی بـەخۆوەگرت کـە لەسـەرەوە ئاماژەیـان پێکـراوە، مـن پێموایـە ئـەوە خـودی جیابوەوەکە بوو کە ئەو رەفتار و ئاکارە دزێوانەی خولقاند.

جیابونەوە و یاخی بوون لە کۆمەڵگای رۆژهەلأتدا، شەر و خوێنرشتنی لێدەکەوێتەوە، لە لایەنە بەگژیەکدا چووەکانیش پابەنـدی هیـچ جۆرە پرانـسپێکی ئـەخلاقی نەبونـە و نـین بـاڵی مەکتـەبی سیاسـی یـەکێتی و پـارتیش، لـە داکوتـانی بزمـاری زەبـر لەسـەر جەسـتەی میللەتی کورد بەرپرسـان و پێـشم وانـی یە کـە مەکتـەبی سیاسـی و چـەکدارەکانی، خەرقـە لەبەر و تەسـبیح بەدەسـت و موریـدی تەکیـە و خانـەقا بـوون ! دەبویـا نوسـەر تـەنیا یـەك نمونەی تیرۆر و رەشەکوژی جەلالیەکانی لە شارەکانی کوردستان تۆمار بکردایە کە کەم نین و نەك هەر دژی پارتی ئەنجام دەدران بگرە دژی حزبی شویعیش.

- ساڵی ١٩٦٧ لە هەڵبجە و لەتۆڵەی شەهید کردنی(مەجیدی مەلا عـارف)دا بەدەسـتی ژنێـك کـە گوایـە کورەکـەی چـەند شـەوێك پێـشتر بەدەسـتی ئـەو کوژرابـوو کۆکۆییـە جەلالەییـەکان پێکەوە(عوسمـانی حـاجی امـین و دوو کـوری خواجـە حـسێن)یـان لـە مـاڵ و دوکـانی خۆیـان دا بـەبێتاوان کوشـتن بـەبێ تـاوان کوشـتن ئـەم سیانە هـیچ پەوەندیـەکی بەتیرۆر کردنـی ئـەو لێپرسـراوەی جەلالیەکانـەوە نـەبوون ئەنـدامی ئـەوان تـەنیا ئەنـدامی حزبی شویعی عێراق بوون !

(مەلا مستەفا نەریتێکی دزێوی لە جولأنەوەی کورد داهێنا وەکو پەنا بدرن بۆ چەك بۆ بەلا داخستنی ململانێی دەسەلأت لەگەڵ نەیارەکانی. .. پەنجەکان ل ٨٤)

نوسەر پێمان نالێت کەنگێ لە لەمێژووی کورد و گەلانی رۆژ هـەلأت دا کێـشەی دەسـەلأت بە ئاشتی چارەسەر کراوە ئەم نەریتە کرێت و دزێـوی چـۆن وا بەئاسـانی لـە ئەسـتۆی مـەلا مستەفا ناوە لەکاتێك دا سەرپاکی مێژووی ئێمە مێژووی خوێن و یـەکتر کوشـتنی دەسـەلأت بێت؟!.

تـا ئـەو جێگایـەش کـە پەیوەنـدی بـە مێـژووی زەبـر و پاکتـاو کردنـی نـەیاری سیاسـی لەمەیان دا پێش مەلا مستەفای بارزانی کەوتبوون لەسەر و بەندی حکومی یەکەمی بەعس دا شـیوعی یـەکانی عێـراق بـە پـەلامار و کـەوتن رویـان لـە چیـا نـا، مـەلا مـستەفا دەرگـای کوردستانی بۆ کردنەوە و دالدەی دا و جێگا و رێگای بارەگا دانـانی بـۆ دیـاری کـردن. بـاڵی مەتەبی سیاسی و بەپلەی یەك علی عەسکەری لەشکرەکەی(پێش جیابونـەوەش)لەناوچـەی

سلێمانی و گوندەکانی(وەڵەسمت و چاوگی باوەکۆچەك دەربەندی بێوڵە)دا تەنگیان پێهەڵچنین , پەلاماریان دان و هەندێکیان لێ کوشتن و چەند کەسێکیشیان لێ ئەنگاوتن بارەگاکانیان پێچانەوە. لەنێو شارەکانیش دا کەوتنە ڕەدوونان و چاودێری کردنیان و هەندێکیشیان تەسلیم بە دەوڵەت کردنەوە !. ..(زۆری نەبرد لە حزبەوە هەواڵمان بۆ هات کە هێزێکی گەورەی پارتی بەسەر کردایەتی علی عەسکەری، پەلاماری بنکەی بەمۆیان داوە و پاش شەڕێکی زۆر نابەرامبەری و پاش چەند ڕۆژ بنکەکەیان گرتووە و چەند هاورێیەك شەهید بوون و چەندێك بریندار بوون و پێنج کادری پێشکەوتووی حزبەکە گیران و بەدیلی کوشتویانن. .

(نایب عبدالله — ٢١ ساڵی تێکۆشان — ١٩٩٦ — سوید — ل١٣٩ — ١٤٠ ). تیرۆر و تۆقاندن، گرتن و ئازار دان و نەیاری سیاسی ڕەدوونان، خەسلەتێکی دیاری ڕەوتاری هەردوو باڵە دووکەرت بووەکەی پارتی بوون. نوسەر بەجۆرێك باسی لەم دیاردەیە کردووە، وەك ئەوەی هەرچی لە کوردستان دا ڕووی داوە، ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی مەلا مستەفا دابێت. من پێم وایە باڵە ڕۆشنبیر و چەپڕەوەکەی پارتی، بەحکومە شێوازی فیکری توند و تیژیان لاوازی پایەگای کۆمەلایەتیان(لەچاو پایەگای ماددی و مەزهەبی و عەشایەری بارزانی و بنەماڵەی بارزانی دا )، بۆ ئەوەی بوونی خۆیان بسەلمێنن، گورزیان بەزەبرتر و دەستیان خوێناوی تر بوون !.

## ناکۆکی لە هەڵسەنگاندندا

نوسەر دەربارەی مەلا مستەفا، ئاوا دەنوسێت:

(بێگومان مەلا مستەفا بارزانی یەکێك بوو لەگەورەترین سەرکردەکانی کورد لەم قەرنەدا. لەناو خەڵکی کوردستاندا لەهەموو سەرکردەکانی دیکە زیاتر پشتیوانی لێکراوە، لەهەموویان زیاتر سەرکردایەتی جوڵانەوەکەی کردووە، لەهەموویان زیاتر لەسیاسەتی ناوەوەی عێراق و لەسیاسەتی کوردی دەوڵەتانی ناوچەی ئێران و تورکیا و دەوڵەتانی گەورە؛ بەریتانیا، یەکێتی سۆڤیەت، ئەمریکادا دەوری هەبووە... پەنجەکان ل٣٥ ).

ئەم پەسن و پێهەڵدانی نوسەر بۆ مەلا مستەفا بارزانی، ڕەنگە سەرکردایەتی پارتی و کورانی بارزانیش ئیرەیی پێبەرن. کەچی نوسەر لەزۆر شوێنی دیکەی کتێبەکەیدا نەك هەر مەلا مستەفا بەکەم خوێندەوار ناودێ دەکات بگرە بەجنێوفرۆش حسێبی دەکات. مەلا

مستەفا کە لەقۆناغێکدا(گەورەترین سەرکردە) ی میللەتی ئێمە بوبێت، چ ڕەوایە بۆ نوسەر کە بەوپێوەر و ڕبەیە مامەڵە لەگەڵدا بکات وەهەندێ چیرۆك و سەرگوزشتەی دەماودەم بنوسێتەوە، کە لەنرخی کتێبەکەی خۆی دادەبەزێنێت، سوکایەتیش بەکەسێك بکات کەساڵانێك سومبلی بزوتنەوەی نەتەوایەتی ئێمە بوو بێت و هەموو کورد، بونی خۆی لە بونی ئەودا هەست کردبێت !! نوسەر لە بۆچونانەیدا، پێش ئەوەی سوکایەتی بە مەلا مستەفا کردبێت، سوکایەتی بە کورد کردووە.

## قسە و بۆچونە بێمانا و بەڵگەکانم :

- (ناوی هیچ کام لەکورەکانی، جگە لە دڵشاد کوردی نییە. هاوسەرەکەی ئیدریس و دوو کورەکەی پێکەوە دەبێت، دەیانەوێ مەلا مستەفا ناویان لێبنێ، مەلا مستەفا داوا دەکات ناویان بنێن(زوالکفل وئیسرافیل)ئیدریس دەترسێ منداڵەکانی لە پاشەڕۆژدا ببن بەگاڵتەچی منداڵان. .. ل٨٢ ). ئەم گێرانەوەیە جگە لە گاڵتە و سوکایەتی پێکردن هیچی تر نییە. ئەمە زیاتر لە قسەی شەوچەرەی گوێ ئاگردانی زستانان دەچێت، دانا هیچ پەیوەندی بەباسەکەوە نییە.

- (خۆی وانیشاندەدات پیاوێکی خاوەن باوەری ئیسلامە، زۆر ڕێزی لە مەلا مستەفا دەگرت. .. لەهەمان کاتدا بەدزی خەڵکیشەوە(مەشروبات)یشی دەخواردەوە ل٨٢ ). هەموومان دەزانین نوسەر نەئەندامی سەرکردایەتی پارتی بووە و نە هاورێ و هاورەدیفی مەلا مستەفا و نە لەنزیکیشەوە. کەوایە کێ ئەم قسەیەی بۆ نوسەر گێراوەتەوە؟!، لەکام کتێب و گۆڤاردا خوێندویێتییەوە؟!. داخۆ نوسەر خۆی هەرگیز پێکێکی لەگەڵدا نۆش کردووە؟!. نوسەر دەزانێت مەشروباتخواردنەوە و نوێژ گرتن و ڕۆژوگرتن، لەخەسڵەتی زۆربەی سەرکردەکانی ئێستای کوردن و ئەم مەسەلەیە تەواو کارێکی شەخسییە، کردن و نەکردنی هیچ لە ماهییەتی ئینسانەکە، چ وەکو سەرکردە و چ وەکو ئینسانی ناگۆڕێت. نوسەر ویستویەتی مەلا مستەفا وەکو کەسێکی دوو ڕوو(مۆراڵ)بناسێنێت، دەنا منیش دڵنیام کۆمەڵێك سەرچاوەی باوەر پێکراویش بە نوسین هەن کە باس لەمشروبخواردنەوەی مەلا مستەفا دەکەن، وە ئەمەیش بۆ کەسێك کەساڵانێکی ژیانی لە ڕوسیا بەسەربردبێت کارێکر زۆر سادەیە و شیاوی باسکردن نییە.

نوسەر دەزانێت لە چ سەردەمێکدا دەژین وە نوسینی بێ بەڵگە و فەکتا راست بن یاوەکو ناراست، هیچ نرخێکیان نییە و تەنها دەبنە هەڵە و پەڵەی گرژ و ناپەڵە، بەروخساری کاری نوسەرەروە ئەم پەرەگرافە بێ بەلگە و سەرچاوانەی سەرەوە وەك نمونەی مشتێك لە خەلامانێك نیشانەی ئەوەن کە نوسەر لەژێر گوشاری چ گرێ و ئازارێکی دەرونی دا بابەتەکەی نوسیوە و چلۆن بۆ دامرکاندنەوەی حەز و ئارەزووەکانی خۆی میتۆدی نوسینی ئەکادیمی وەلا ناوە !.

مەلا مستەفا یەك کە لەماوەیەکی دوور و درێژدا وەکوو رێبەرێکی کورد لەناوچەکە و جیهاندا ناسرابێت و سۆڤێت و ئەمریکاش حسابیان بۆ کردبێت ناشێت مەلایەکی ساویلکە و بێ سەودا بووبێت. بەپێچەوانەوە بەپێ ی بۆچونەکانی مامۆستا(جەرجیس فتح الله)ی مێژوو نوس و مەلا مستەفا پیاوێکی خوێندەوار و دەرحەق بەو رۆژگارەی ئەوی تێدا ژیاوە بەئاوەز سیاسەت مەدار بووە. ..(من دەمەوێت ئەوە بلێم مەلا مستەفا پیاوەێك بووە هەموو پۆلیکیکی خۆرهەلاتی نێوەندی تاقی کردبووەوە لەو بارەیەشەوە کەلکی لە هەنگا و ئەزمونەکانی خۆی وەرگرتبوو لەبەر ئەوە هەندێك هەڵوێستی وەرگرت بۆ من و تۆ و هەندێك روناك بیری دیکەش وادەردەکەوت هەڵوێستێکی سەیر و ناتەواوەتی بەلام لە راستی دا هەمووی باری ئاڵوزی پر بە گرێ و گۆڵی ریالیزمانەی پۆلیتیکی خۆرهەلاتی ناوەراستەوە هەلی دەهێنجا. .. مەلا مستەفا ستراتیزی بوو، لە سەرکردە زۆر چاکەکان بوو هەروەها کاتێکیش بوو دەیزانی چۆن کەلك لە هەلْ وەربگرێت. ... ئەو پلە روناکبیریەی ئەو هەیبوو، چۆن بوو؟ یەکەم زمانی فارسی بەشێوەیەکی زۆر باش دەزانی، ماوەی یەك کاتژمێر یان دوو کاتژمێر بە عەرەبی دەدوا و چاوی بۆ نەدەنوقان. ... روسیەکی دەزانی تەنانەت هەندێك روس شەرمیان لێ دەکرد من لە دیلمان سەرمن لە ژوره تایبەتیەکەی خۆی داوە. نامەخانەیەکی زۆر گەورەم دیوە تاسەرەوە بەپەرتوکی ئاینی و عەرەبی و کوردی سیخناخ کرابوو. ... بروانە حسێن محمد عزیز —((خولانەوە لە بازنەیەکی بۆش دا)) دەقی چاو پێکەوتن و دەمەتەقێیەك لەگەڵ جەرجیس فتح الله ی پارێزەر دا - ل ٨٩، ٩٠، ٩٤، ٩٥ — چاپخانەی ئاپێك ١٩٩٧ سوید)نوسەر وێنەیەك لە دبلۆماسیەتی مەلا مستەفامان نیشان دەدات و بە خەسڵەتێکی لاوازی مەلا مستەفای لە قەڵەم دەدات. ..

(ئەگەر یارمەتیم بدەن کوردستان دەکەم بە ویلایەتی ٥٢ ی ئەمریکا بۆ ئەمریکا.

ئەگەر یارمەتیم بدەن کوردستان دەکەم بە قەلای کۆمۆنیزم — بۆ سۆڤیەت.

ئێمە هەموومان لە ڕەگەزی ئارین — بۆ شای ئێران.

من مسوڵمانم و ئامادەم پێشمەرگە ە بنێرلام بۆ شەری جو — بۆ عەرەب.

کورد و جو لەنەتەوەی ئیبراهیمین و دەبێت پێکەوە هاوکاری بکەن — بۆ ئیسرائیل. پەنجەکان ل ١١٠)

- هیچ کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەیەك وەکو سەرچاوە بۆ ئەو قسانەی مەلا مستەفا دیاری نەکراون - مەلا مستەفا ئەگەرچی بەم قسەجیاوازانەی(هیچ لایەکی بۆ تەفرە نەدرابێت. .. ل ١١٠، وەکو سەرکردەیەکی بزوتنەوەی میللەتێك کە مەسەلەکەی نەدەچووە نێو ستراتیژی زلهێزەکان لە ناوچەکەدا، جگە لەو جۆرە ڕەفتار و هەڵوێستانە دەبوو چیدیکە بکات؟!.

ئێمە سەرکردەکانی ئێستای کورد دەبینین کەلە بارودۆخێکی ناوچەیی و جیهانی تەواو جیاوازدا، زۆر هەڵوێست و ڕەفتاری ڕەنگاورەنگتر لەئاست هێزە ناوچەییەکان و سۆپەر هێزەکانی دنیاشجا دەنوێنن و دۆزی بزوتنەوەی کوردیش چ لەڕوی فکر و ستراتیژ و چ لەنێو سیاسەتی دەوڵەتاندا ڕوو لە نوشستی و گلانە !.

(مەلا مستەفا لەهەموو جێگایەك لە هەموو کۆڕوکۆمەڵێکدا، بە ئاشکرا دژی مەکتەبی سیاسی و دژی براهیم احمد قسەی دەکرد. .. زۆر باسی لەو بابەتە لە کتێبی(گەران بەناو پیاوە ئازاکان)دای ڕۆژنامەوانی ئەمریکی دانا ادم شمیت کتێبی شەری کوردەکانی ڕۆژنامەوانی کوردەکانی بەریتانی(دیڤد ادم سن )داهەیە. جنێوی ناشرینی بێ ئەوان و تۆهمەی نارەوای ئەخلاقی و بەپاڵ ئەدا)

هەقی وابوو نوسەر لە پێناوی پاراستنی ئەمانەتی نوسین و گوێزانەوەی دەقدا، چەند دەقێکی بەجنێوەکانی مەلا مستەفالەو دوو کتێبەی ناوی بردوون، وەکو خۆیان خواستبا !

## پێك هاتنی مشیر – بارزانی( گۆڕەوشاردانی مێژوو )

شەری وەستانی نێوان بزوتنەوەی ئەیلولو حکومەتی سەلام عارف لە ١٠ ڤیبری وەری ١٩٦٤ دا کە لەسەر بریاری مەلا مستەفا لە پشت مەکتەبی سیاسیەوە لەرادیۆی بەغدادەوە خوێندرایەوە و بەکردەوە تەقە وەستێندرا بەیانەکەی دەوڵەت هەندێك خاڵی تێدایە کە بەش بە حاڵی ئەو قۆناغەی بزوتنەوەکە جێگەی سەنج و تێرامانە:

١- دانپیانانی مافە نەتەواییەتیەکانی گەلی کوورد لە چوارچێوەی یەکێتی گەل و خاکی عێراق دا وە جێگیر کردنی لە دەستووری عێراق دا.

٢- بەردانی گیراوەکان و دەرکردنی لێبوردنی گشتی.

٣- گێرانەوەی بەڕێوەبەرایەتی بۆ ناوچەکانی ژوورو.

٤- گێرانەوەی فەرمانبەران و ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکانی ژوورو.

٥- دانانی ڕێگە و شوێن بۆ گێرانەوەی ئاسایش و ئارامی بۆ ناوچەکانی ژوورو. هەندێك وردەخاڵی تریش. .. لە کتێبی پەنجەکان. .. وەرگیراون.

نوسەر هەموو مەبەستەکانی ئەو ڕێکەوتنەی نێوان بارزانی و نشی لەمەسەلەی بەلاداخستنی دەسەلآت لەگەڵ م.س دا پچڕ کردوەتەوە هەمووشتەکانی دیکەی وەلاناوە، من پێم وایە مەسەلەی یەك لای کردنەوەی کێشەی م.س تەنیا یەکیك بووە لە مەبەستەکانی نەوەك مەبەستی سەرەکی. وەکوو لەبەیانەکەی حکومەت و بەیانەکەی مەلا مستەفاشدا دەردەکەوێت(ننوسەر هەردوکیانی لە کتێبەکەیدا نوسیوەتەوە)مەلا مستەفا کۆمەڵێك داوی سیاسی و ئابوری و ئەمنی هەبووە، دەوڵەتیش هەرنەبێ لەسەر کاغەز سەلماندونی، کەچی نوسەر لە پەرەگرافێکی دیکەدا لەگەڵ مێژووش دەکەوێتە ناکۆکییەوە کە ئەو دەور و زەمانەیە و پێش ٣٤ ساڵ بەر لە ئێستا(مەبەستی سەرەکی مەلا مستەفا لە گفتوگۆ ن یەکلایکردنەوەی ململانێی دەسەلآت بوو لەگەڵ سکرتێر و سەرکردایەتی حزب. مەلا مستەفا وای لە کاربەدەستانی عێراق گەیاندبوو کە ئەو: هیچی ناوێ، ئەیەوێ ئاسایش بگەڕێتەوە ولآت و ئەویش بگەڕێتەوە بارزان و خەریکی شوانی بێت. .. ل٧٤ ).

گفتوگۆکە بارزانی کردویەتی و م.س دژی بووە، ئەنجامی گفتوگۆکە(٩)خاڵ بووە و سەرجەمیان پەیوەندییان بە کوردەوە هەبووە. ئەگەر مەلا مستەفا هیچی نەویستبێت جگە لە گەڕانەوە بۆ بارزان و شوانی نەکردن نەبێت، یان ویستبێتی قسەیەکی ئاوها لەبەرژەوەندی خۆیی و پاکتاوکردنی نەیارەکانی بەسەر دەوڵەتدا تێپەڕێنێت، سیاسەتمەدارانی ئەوسای عێراقی زۆر لە مەلا مستەفا(نەخوێندەوار)تر بوون.

ساتێ دێینە سەر ناکۆکییەکانی نێو دەرونی پارتی دیموکراتی کوردستان و دوکەرتبونی دەشی لێن: پارتی لەگەڵ لەدایکبونیدا تۆوی ناکۆییەکانی لە هەناوی خۆیدا هەڵگۆتبوو، تۆوەکە لە ناوەراستی پەنجاکاندا گۆڕا و لە کۆتایی پەنجاکاندا هەڵتۆقی لەسەرەتای شەستەکاندا دوو پەلە بوو.

ئەم دو پەلە بونە گرێیەکی لە زەمینەی بیر و لێکدانەوەی ڕۆشنبیری سیاسی کورددا. دەرهەق بە مەلا مستەفا و بنەماڵەکەی دروستکرد، گرێیەك کە لەئەنجامی دەرك

نەکردنێکی پرمانا بۆ بونیادی کۆمەڵایەتی و مەزهەبی کۆمەڵگای کوردستان بەگشتی و ماڵباتی بارزانی بەتایبەتی، تا هاتووە ئاڵۆزکاوتر بووە رۆشنبیری سیاسی ورد تا ئێستا نەیتوانیوە پەی بە سەرچاوەی دەسەڵات و هێز و هەیبەتی مەلا مستەفا و بنەماڵەکەی لە بزوتنەوەکەدا ببات و وەڵامی ئەم پرسیە بداتەوە: بۆچی بەردێژایی ساڵانی ئەو ململانێیە باڵی رۆشنبیر و خوێندەواری نێو پارتی و بزوتنەوەکە جڵەوی ئەسپی دەسەڵاتی لە مەلا مستەفایەکی(خوێندەوار) ی دژە حزب و حزبایەتی وەك نەوشیروان دەڵێ پێ وەرنەگیرایەوە؟!.

من قسەم لەسەر لێوەشاوەیی و لێهاتوویی و سیاتەتزانی مەلا مستەفا نییە، دەسەڵات و بنەماکانی پەیوەندییان لەگەڵ بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵ هەیە وسیاسەتیش هەتا ئێستا وەکو زانست لە وڵاتی ئێمەدا پراکتیزە نەکراوە و تەنیا لە تەوەری سەلیقە و ئەزمونی سیاسیدا دەسورێتەوە و کۆمەڵێك فاکتەری دیکە جیا لە زانست و ئاوەزی ئەکادیمیی سیاسی رایانگرتووە. شۆرش و نوێ کردنەوەی شۆرش، باوەکو پرۆسەی نوێ خوازی لەهەموو بوارەکانی ژیاندا بەگشتی، تەنیا بە دەستەیەکی خوێندەواری هەڵبژاردە نایەتە ئەنجام. .. هەر هیچ نەبێت رەوتی بزوتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری ئێمە ئەوەی بۆ سەلماندووین.

ئەگەر شۆرش کردن کاری کۆمەڵانی خەلك بێت و ئەوان ماکی بزوێنەری پرۆسەی گۆرانکارییە جیاکان بن، ئەوا دیارە میللەتی کورد بەگشتی لەو سەروبەندەدا و تائێستاکەش، بە فەرهەنگ و فکری مەلا مستەفا ئاشناتر بوون تا بە(زانست و فەلسەفە)ی ئیبراهیم ئەحمەد و میدیاکانی ماوتسی تۆنگ !.(قسەی من لەسەر ئەقلیەتی دەرك و ئاوەزەی سیاسی زۆربەی خەلکە واتە رەشە خەلکەکە نەك ئیلیتێکی نەخوێندەوار)

دەبوو نوسەر چەند لاپەرەیەکی بۆ بونیادی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی سیاسی میلەتی کورد تەرخان کردبا نەك دوپات کردنەوەی هەندێك قسەی سوا و سادە کە زەمان ژەنگی لەسەر خستوون

## شوێنی خودی نوسەری( پەنجەکان. .. )لە تەرازووی جەلالی و مەلای دا

لەمانگی شوباتی ١٩٦٤ دا نوسەر ئەندامی کۆنگرەی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووە لە گوندی چۆخماخ لەوە بەدواوە هەتا کۆتای شەستەکان و دەرکردنی گۆڤاری رزگاری چ باسێك

لەخەبات و کاری ئاکاری خودی نوسەر لەنێو باڵی جەلالی دا نی یە. گۆڤاری رزگاری گۆڤارێکی سیاسی رۆشنبیری بوو کە لەساڵی ١٩٦٧ یان ١٩٦٨ لەسەر رەزامەندی(ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرشی عێراق)لە سلێمانی یەکەم ژمارەی دەرچوو(مام جەلال ناوەکەی هەڵبژاردوو و من خاوەنی ئیمتیاز و شازاد سائیب سەرنوسەری بوو. .. پەنجەکان ل ٩٨ ).

رزگاری، لەبڵاو کردنەوەی فیکری چەپی مائۆیستیدا دەوری بەرچاوی هەبوو. ئەو گۆڤارە مینبەری فکر و بۆچونی سیاسەتی جەلالییەکان بوو لەنێو بزوتنەوەی کورددا، روپەرەکانی رزگاری دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی دژ بە باڵی مەلاییەکان و بنەماڵەی بارزانی تێدا بوو، رزگاری مەسەلەی جیابونەوە و ەری جەلالی و مەلایی لە دەسماڵی سوری ئایدۆلۆژیا دەپێچا و یاسا و فکری سیاسی دەدا و نوسەریش هەم خاوەنی ئیمتیازی بوو، هەم خاوەنی قەڵەمێکی بەبڕشت !.

(هیچ کەس لەئێمە کادری پیشەیی و موچەخۆری مەکتەبی سیاسی نەبوو، مەکتەبی سیاسی نە بۆ ژیانی خۆمان و نە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی رزگاری هیچ یارمەتییان نەدەدایت. ...پارەی کرینی هەموو ئەمانە خۆمان دابینمان دەکرد، م.س فلسێکیان نەدا، بەڵام چونکە لە ئێمە دڵنیانەبوون. مولکیەتی رەسمی چاپخانەکەیان خستە سەرکاك عمر مستەفا. ... ل٩٨ ).

ئەوانەی لە گۆڤاری رزگاریدا کاریان دەکرد، ئەگەر موچەخۆری(م.س) یش نەبوبن ئەوا بەدڵنیاییەوە کادری پیشەیی دڵسۆزی(م.س) بون ئەوان ئەندام و کادری چالاکی ئەوباڵەبوون، لەتەلاری رێکخراوی ئەو باڵەدا شوێن جێگای دیاریان هەبوو. نوسەر لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی سلێمانی و ئەندامی لقی ئەو باڵە بوون، ئەی گوایە کادری پیشەیی یانی چی؟!.

ئەوان هەموو کات و هێز و برستی سیاسی ورۆشنبیری خۆیانیان بۆ دەرکردنی گۆڤارێك تەرخانکرد بوو کە مینبەری داکۆکی لێکردنی فکر و سیاسەتی باڵەکەی خۆیان بوو.

ئەو بابەتە تیۆری و فکریانەی کە لە گۆڤارەکەدا دەنوسران، دواتر زەمینەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی کوردستانی عێراق سازاند. کۆمەلە، پاشتر یەکێتی نیشتمانی کوردستانی بە وجود هێنا(هەر نەبێ لەناوەوەی وڵاتدا) سەرانی باڵی م.س بەدەگمەن نەبێ نەکەوتنە سەنگەری دژایەتی کۆمەڵە و یەکێتییەوە، ئیتر بۆ دەبێ م.س بروا و متمانەی بە نوسەرە دڵسۆزەکانی خۆی نەبوبێت؟!. چۆن عەقڵ دەیگرێ

کـە(م.س)ێکـی بـەتوانا و پـارەدار، یـەك فلـسی بـۆ گۆڤارێـك تـەرخان نـەکردبێت، کـە لێوەشاوەترین نوسەرانی سیاسی خودی حزبەکەی دەریان کردبێت؟!.

(ئێمـە لەوانـە بووینکـە لـە سـەرکردایەتی پارتی رازی نـەبوین، بەتایبـەتی شـەر لەگـەڵ بارزانی و هاوکارییان لەگەڵ بەعس. ... پەنجەکان ل٩٨ ).

نازانم نوسەر بەڵگەی سەلێنەری بۆ ئەم بۆچونەی خـۆی چییە؟!. هـەمو بڵاوکراوەکـانی ئەو سەردەمە و تەواوی ژمارەکانی رزگاریش بەسەر بکەیتـەوە. وتارێکت بەرچاو ناکـەوێت کە بۆنی مەیلێکی وەهای لێبێت، دەشێ لەناو باڵی جەلالیـشدا وەك هـەر رێکخراوێکـی دیکـە ناکۆکی و ململانێی سیاسی و شەخسی هەبوبێت. .. بەڵام هیچ بەڵگەیەك نییـە کـە بنـەمای ناکۆکییـەکان بگێرێتـەوە بـۆ هەڵوێـست لـە شـەری پـارتی و هاوکاریکردنی بـەعس. نوسـەر هەوڵیـداوە کـە لەمەسـەلەی جـەلالی و مەلایـدا، خۆیوەکـو بێلایـەنێك نیـشان بـدات کـە بەداخەوە سەرکەوتوو نەبووە.

## رێککەوتنی ١١ی ئازاری ٩٧٠

بەیانی ١١ی ئازار، بۆ کورد دەستکەوتێکە مێژووە بوو. لەم رێکەوتن نامەیـەدا، بـۆ یەکـەم جـار مافـە نەتەواییەتیـەکانی گـەلی کـورد لـە شـێوەی ئۆتۆنـۆمی دا لـە چوارچـێوەی خـاکی عێراق دا ناسرا. ئەم روداوە سیاسی یە، نەك هەر بۆ(پشێو دانی مەلا مستەفا و لەشکرەکەی پاکتاو کردنی نەیارەکانی پێویست بوون. .. پەنجەکان )، بەلکو بۆ پـشوو پیاهاتنـەوەی گـەلی کوردیش کە زەبر و کوشت و بری نۆساڵان جەنگ داغانی کردبوون دەرفەتێکی زێرین بـوو. بەیانی ئازار، تەکانێکی بەوژمی بە بزافی نەتەوەیی گەلی کـورد، چ لـە ئاسـتی ناوچـەکە و چ لـە جیهانـدا. چوارسـاڵان ئاشـتی لـە کوردسـتان دا، بوژانەوەیـەکی بەرچـاوی کۆمەڵایـەتی و ئابووری و فەرهەنگی خولقاند و ئاگری شەری ناوخۆشی بۆ ماوەیەك خامۆش کرد.

بـەیانی ١١ ئـازار مـەغزاو نیـوەرۆکێ کـی سیاسـی هـەبوو. هـیچ بەڵگەیـەکی وەهامـان لەبەردەسـت دا نییـە کـە(ئـەم جـارەش لـە گفتوگـۆ دا لەگـەڵ حکومـەت، چـەك کردنـی جاشـەکانی(٦٦ !)کەوتبێتـە پـێش سـەلماندنی مافـەکانی کـوردەوە. . ل ١٠٠ ). مافـەکان بـەو شێوەی کە لەسەری رێکـەوتبوون , لەسـەر کاغـەز سـەلێندران و ئیمـزا کـران , بـەڵام کـە لـە پراکتیکی دا هیچی وەهای بۆ کورد لێ نەکەوتـەوە , ئـەوە پەیوەنـدی بەهـەردوو جەمـسەری دانوستانەکەوە هەیە.

چەك كردنی چەكدارەكانی باڵی م.س یەكێك بوو لەبەندەكانی گفتوگۆكە و بە كردەوەش جێ بە جێ كرا. دیارە ئەمە هەم داوای مەلا مستەفا بووە و هەمیش لە بەرژەوەندی حكومەت. كوردیش هیچ زەرەرێكی(لەم خیانەت و غەدرە نەكرد، كە بەعس لە مام جەلالی كرد / ل١٠٠)و نوسەر ئێستەش لە دڵی دەرنەچووە. من پێم وایە ئەم(غەدر و خیانەتە)تەنیا لە شەخسی مام جەلال نەكرا بگرە لە هەموو باڵی م.س كرا و ئەوساش مام جەلال كەسی یەكەمی م.س نەبوو.

(هەموو رێكەوتنێكی راستەقینە لەگەڵ هەر حكومەتێكی عێراق بووایە، لەوئەنجام دا ئەبوو مەلا مستەفا پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی دەرەوە ببرێت و لەشكرەكەی بڵاوە پێ بكات یان بیخاتە بەر فەرمانی دەزگایەكی حكومەتەوە و , پارە لە هیچ لایەك وەرنەگرێت , زیندانی نەبێت و هیچ كەس نەگرێت و نەكوژێ و.. . لەگەڵ هیچ حكومەتێك دا رێك نەئەكەوت و , هەوڵی ئەدا بار و دۆخی نائاسای بەو جۆرەی خۆی ئەیویست بمێنێتەوە.. ل ١٠٣ ).

تێروانینی یەك لایەنە بۆ جەمسەرە دژەكانی نێو كێشەی كورد , دەرئەنجامێكی دروستمان بەدەستەوە نادات. گریمان مەلا مستەفا ئەو سەركردە پیاو چاكە بووایە كە نوسەر گەرەكی یەتی و هەموو ئەو مەسەلانەشی لەو پەرەگرافەی سەرێ راهاتوون جێبە جێ كردبا، تۆ بڵێی بەعس لە ٥٠ ٪ ی نێوەرۆكی بەیانی ١١ ی ئازاری بە كورد دابا؟ !. بەیانی ئازار پێش ئەوی لای مەلا مستەفا مەسەلەیەكی كاتی و تاكتیكی بوبێت , ئەوا لای بەعس مناوەرەیەكی سیاسی و پێویستیەكی حەیاتی رژێمی تازەوەسەر كاركەوتوە هەناو پر لە ناكۆكیەكی بوو. نوسەر، هەم لە شەر و هەم لە گفتوگۆ دا ئەزمونێكی باشی لەگەڵ بەعس دا هەیە و خۆشی پێ ی وایە كە بەیانی ئازار رێككەوتنێكی راستەقینە نەبووە.. هەر(رێككەوتنێكی راستە قینە لەگەڵ هەرحكومەتێكی عێراق ببوایە...). واتە هیچ رێك كەوتنێكی راستەقینە نەبووە، ئیتر نوسەر بە چ مافێك خەملێ بۆ رەفتار و كرداری مەلا مستەفا لەكاتی روودانی هەر رێككەوتنێكی راستەقینە لێ دەدا؟ !. حشع، رێكەوتنێكی راستەقینە و ستراتیژیان لەگەڵ بەعس مۆر كرد و ئەنجامیش نوسەر گوتەنی بوونە(ئاردی نێو درك ).

کۆمەڵـەی مارکـسی – لینینـی کوردسـتانی عێـراق، لـە سـاڵی ۱۹۷۰ دامـەزراوە وەکـو لـە گێرانەوەی مێژووی کۆمەڵەدا و لە کۆنفرانسدا دەیان گێرایەوە ئەم ڕێکخراوە لە ئـەنجامی یەکگرتنی سێ گروپی مارکسی – لینینـی نێو باڵی (م.س)ی پارتیـدا و پاش ئـەوەی پاش ئەوەی فیکر و ڕێباز و جیهانبینییەیکەی گەلاڵە بوو، دامەزرێنـدرا مـام جـەلال، نەوشیروان مستەفا، شەهید شەهابی شێخ نوری لێپرسراوی ئەو سێ گروپە بوونە ئەمـە ئـەو گێرانـەوە رەسمییەیە کە لەوێ لەسەری ڕێککەوتن و زۆر ڕای جیـاواز تـریش هەیـە کـە خاوەنـەکانیان لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا لەگەڵ بوونە و لەسەرو بەندەدا جورئـەتی رادەربرینیـان نەدەکرد. هەندێك لەو ڕایانە دەڵێن: کە نوسەری پەنجەکان لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا هیچ دەورێکی نەبووە، یان یان دامەزرێنەری کۆمەڵە(واتە ئەندامانی دوو گروپەکەی دیکە)ئامادە نەبوون و نەیان ویستووە هاوکاری ئەو بکەن و، ئەو بە جیا گروپێکی پێکەوە نـاوە و پاشـان بە هەوڵی مام جەلال، خۆی و گروپەکەی تێکەڵ بە کۆمەڵە بوون.

لـەدایك بـوونی کۆمەڵـە، بـێ هـیچ داشـکانێك، وەرچـەرخانێکی گـرنگ بـوو لـەڕەوتی بزوتنەوەی فکری چەپ، لەنێو بزوتنەوەی فیکری – سیاسی کوردستان. کۆمەڵە ڕێکخراوێك بـوو لەسـەرەتای کەوتنـە گـەر و هەڵسورانیەوە و هـەتا نیوەڕاسـتی هەشـتاکانیش جیـا لـە ڕێکخراوە مارکسیست – لینینیستەکانی دیکەی عێراق دەیویست تێروانین و ڕێبازێکی نـوێ لـە نێـوانی هـەردوو خـەتی جـەلالی و مـەلایی دا، لـە بزوتنـەوەی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی کوردستان دا بخولقێنێت.

کۆمەڵـە لـە نێـوانی سـاڵانی ۱۹۷۰ – ۱۹۷۹ دا، واتـە بـە پەرتـەوازە بـوونی مـام جـولال و نەوشیروان بـۆ ئـەوروپا(سـەرتای حـەفتاکان)گرتنـی تـەاوی کۆمیتـەی سـەرکردایەتییەکەی لەلایـەن بەعـسەوە(سـاڵی ۱۹۷۵)بۆچونایەتیەکی باش و چەندایەتیەکی زۆر کـەم دیـسپلینی ڕێکخراوەیـی زۆر بـەهێزەوە، زەمینەیـەکی لـەباری بـۆ خـەباتی فیکـری – سیاسـی ـ ڕێکخراوەیـی – چـەکداری خـۆی لەکوردسـتان دا فەراهـەم کـرد. کۆمەڵـە لـە سـاڵی ۱۹۷۵ کۆمیتەی هەرێمەکانی بۆ ڕێبەرایەتی و دەست پـێ کردنـەوەی بزوتنـەوەی چەکداریدا بـوو بە سکرتێر و ڕێبەری کۆمەڵە.

ئەگەر ئەو گۆڕانکاریە فیکری و سیاسیانەی کە لەسەردەمی ڕێبەرایـەتی شـەهید ئـارام دا بەسەر کۆمەڵەدا هاتن چۆنیەتی دابـران و دوورکەوتنـەوەی لـەڕێبازی جەلالیـەت(کـە خـۆی

لەوێرا سەرچاوەی گرتبوو)پاشان گەرانەوەی بۆ نێو هەمان بازنە و ئەوجا کفن و دفن کردنی لەسەر دەستی مام جەلال و نوسەری پەنجەکاندا، لێدوان و توێژینەوەی قوڵ و تایبەتی جیا لەم باسە هەڵدەگرێ من لە نوسینێکی دی کەدا دەگەرێمەوە سەری. ئەوەی لێرەدا جێگای سەرنج و تێرامانە: ١٩٧٧ دا کە نەوشیروان و مام جەلال گەرانەوە بۆ کوردستان و لە ساڵی ١٩٧٩ شدا کە گروپی زیندان ئازاد بوون هاتنە چیا، شتاقیان کۆمەڵەی خۆیان پێ نەدەناسرایەوە و تارادەیەکیش پێ ی نامۆ بوون !. بروانە(لە کەناری دامۆپەوە ل ١٦٧یەکەم بەیەك گەیشتنی مام جەلال و نەوشیروان لەسەر خاکە کوردستان , نەوشیروان دەڵێ: ئێمە لەگەڵ ئەم برادەرانەی ئێرە – مەبەستی سەرکردایەتی ناوەوەی کۆمەڵەیە – هەر ناوەکەمان یەکە، دەنا لەهەموو شتێك دا جیاوازین)

جیاوازیەکان زۆربوون، تێروانینەکان جیابوون کێشەکان ئالۆز بوون ناکۆکی شەخسی و تایبەتیان تێوە گلاندبوون.

کۆمەڵە تا ئەو کاتە جگە لە چەند کۆبونەوەیەکی فراوان، هیچ کۆنگرە و کۆنفرەنسێکی نەبەستبوو. لە کۆبونەوە فراوانەکەش دا(ئۆکان وشینی)خاوەن قسە و خاوە ئیشەکانی تێدا ئامادە نەبوون، کۆنفانسی یەکەم دەستە گروپە جیاکانی نێو سەرکردایەتی زۆربەی کادرو ئەندامانی کۆمەڵەی کۆکردەوە، کە هەندێکیان لەتەواوی گرفت و کێشەکانیان بێ ئاگابوون.

لە کۆنفرانسدا، جگە لە خوێندنەوەی راپۆرتەکان گێرانەوەی مێژووی کۆمەڵە هەڵسەنگاندنی باری سیاسی کوردستان و عێراق و ناوچەکە و جیهان، بازنەی پەیوەندیەکانی کۆمەڵە لە کوردستان و دەرەوەی کوردستان دا، زۆر مەسەلەی تر جێگای مشت و مڕ و لێدوان بوون کە رەگی ناکۆکیەکانی قوڵتر بە رەگی کۆمەڵەدا چەقاند.

لە بازنەی ناکۆکیەکاندا دەبێت مام جەلالی دەرهاوین. ئەو ئەگەر چی لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە بوو و تا ئەو کاتەش بەنهێنی و(قسەی خۆمان بێت)خۆی بە رێبەی کۆمەڵە دەزانی بەلأم ئەو سکرتێری گشتی هەموو یەکێتی بوو ئەو راستەوخۆ خۆی لەکێشەکان نەدەگەیاند، وەلی دەستی تێیان دا هەبوو ئەو بەشێك نەبوو لەناکۆکیەکان، بەلکو ئیدارەی ناکۆکیەکانی دەکرد .

نوسەری پەنجەکان.. پاش شەهید بوونی ئارام، بەقەولی خۆی(بەزۆر رولێنان لە کۆبونەوەی – نۆکان – دا کرابووە سکرتێری کۆمەڵە و بڕواشی بە م.ل نەمابوو !)ئەو لە لوتکەی گروپێکدا رۆنیشتبوو کە تازە سەرخەتە سیاسی و فکریەکانی دەر دەکەوتن. ئەو

خـــۆی گوتـــەنی(بـــیر و بۆچـــونەکانی لەســـەر مارکـــسیزم کاڵبوبونـــەوە)و ئـــاڵای هەلگری(گەشە)پێدانی خەسڵەت و کارەکتەرە رەسەنەکانی کۆمەڵە بوو. ئەو زیاتر بروای بە حزبێکی دیموکراتی فراوانی جەماوەری هەبوو، بەڵام بە شێنەیی کاری بۆ دەکرد زۆریش بە ئەزموون و وەستا بوو.

گروپی زیندان خۆیان بە موریدی شەهید شەهاب دەزانی. چوون ئـەوان پـێش زینـدانی کردنیان یەکەمین کۆمیتـەی سـەرکردایەتی کۆمەڵـە بـوون، لایـان وابـوو خۆیـان لـە هـەموو کـەس زیـاتر بـۆ سـەرکردایەتی رەواییـەتیان هەیـە و دیـاردەی کۆمیتـەی هەرێمـەکانیان بەجۆرێك لە کودەتا لە قەڵەم دەدا و پێیان وابوو کە سەر کردایەتیەکی ناشەرعییە.

کۆمیتەی هەرێمەکان سالار , مەلا بەختیار , ئازاد هەورامی و چەند کەسێکی دیکەشیان لە دەور بوون، خۆیان بە میراتگیری شەهید ئارام و پارێزەرانی خەسڵەت گیری رەسـەنەکانی کۆمەڵەی شەهید ئارام دەزانی.

بە پێچەوانەی ئەوەی(هیچ کامێکیان واتە ئارام و شەهاب – خەتێکی وای دانەرشتبوو کە ئەمان شەری لەسـەر بکـەن... پەنجـەکان ل ١٤١)شـەهید ئـارام کـومـەڵێك رەگ و خەسـڵەت و پرەنسپی رێکخراوەیی و فکری و سیاسی لەناو کۆمەڵەدا جێگیر کۆردبوو کە لـەنێو یـەکێتی نیشتمانی و بزوتنەوەی چەکدارییەکەدا تا دەهاتن بنکۆڵ دەبوون و هەڵدەکەنران:

- پاراستنی سەبەخۆیی و فکری کۆمەڵە چ لەناو یەکێتیدایە چ لەناو بزوتنەوەکەدا.
- پاراستنی ناسنامەی چینایەتی کۆمەڵە وەکـو رێکخراوێکـی شۆرشـگێری کرێکـاران و رەنجدەران.
- پێـداگرتن لەسـەر هاوکـاری هاوخـەباتی کرێکـارانی کوردسـتان و عێـراق کەئەمـە پاشـان دوو تـەیاری کوردسـتان – عێراقـی لـەنێو کۆمەڵـەدا دروسـتکرد، فـەزای کـۆنفرانس بەگـشتی تـەمی شـەر و هـەواری پێوەدیـار بـوو، هـەتا تـارایی تـەبایی و پێکـەوە هـەڵکردن سـەرۆکی گروپـەکان و ئەنـدامانی کۆمەڵـەیان خـراپ لـە یەکـدی هانـدا بـوون کێـشە و دەمەقاڵەییـەکان تـەنها لەسـەر هەڵبـژاردن و سـەرکردایەتی نـەبوو وەك ئـەوەی نوسـەری پەنجەکان .. دەیەوێت نیشانی بدات ئەو مەسەلانەی بابەتی مشت ومڕ بەیەکدا هەڵشاخان بوون:
- کۆمەڵە کـە لـە کۆمەڵـەی مارکسی لینینـی کوردسـتانی عێراقـەوە لـە کۆبونـەوەی شێنێدا کرابووە کۆمەڵەی رەنجدەرانی ئێستا دەبوو عێراقەکەی لـەکن بکرێتـەوە(ئـەوەی لـە

دیدەی ئێستاوە چەند راستە یان ناراست مەسەلەیەکی دیکەیەو مـن بەچاوی ئـەوەی رۆژێ لەکێـشەکان دەروانم و دەمــەوێت بڵـێم نوســەر چـۆنی پێخـۆش بــووە ئـاوا مەســەلەکانی شێواندووە ).

- پۆلێنکردنی ناکۆکییەکان:

گروپـی زینـدان پێیـان وا بـوو کـە نـاکۆکی سـەرەکی لەگـەڵ ئیمپرلیزمدایـە و نـاکۆکیش لەگەڵ بەعسدا ناسەرەکییە.

نەوشیروان و گروپی زیندان لایان وابـوو کەناکۆکی لەگـەڵ بنەماڵـەی بـارزانی و نـاکۆکی سـەرەکییە و هـەر جـۆرە سـازانێك لەگەڵیانـدا خیانەتـە لەمارکـسیزم و مەسـەلەی شـەر و ئـەوانی دیکـەش پێـچەوانەی تێدەگەیـشتن هـەر لـەو سـەر و بەنـدەدا بـوو کـە نوسـەری پەنجــــەکان. .. نامیلکەیـــــەکی لـــــەژێرناوی(قیـــــادە موقـــــەت لـــــە چ بەرەیەکــــدا وەستاوە؟)ی نوسینی.

- بازنەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵە:

هەندێ را لەنێو کۆنفرانسدا لەسەر بازنەی پەیوەندییەکانی کۆمەڵە هەبوو:

بۆچـی دەبێـت کۆمەڵـە بەتـەنیا بزوتنـەوە و خـەتی گشتی ببینێـت و و لـە چوارچێوەی یـەکێتی نیـشتیمانی کوردسـتان دا خـۆی شـەکەت بـدات لـە کاتێـك دا کۆرەپـانی بزوتنـەوە سیاسی یە – چەکداریەکە زۆر لە یەکێتی فراوانترە؟!.

داخـۆ دەبێـت کۆمەڵـە لـەدەرەوەی یـەکێتی دا هاوپـەیمانی دیکـە بـۆ خـومێ ببینێتـەوە و هـەوڵی ئـەوە بـدات کـە زەمینـەیـەك بـۆ یـەك خـستنەوەی بزوتنـەوەی نـشتمانی کوردسـتان سازبدات؟!. لە ژمارەی زستانی ئەو ساڵەی گۆڤاری کۆمەڵەدا لـەکاتێك دا نەوشیروان لـەلای هێزەکـانی حـسك گـیراوە و وتارێـك بـەناوی(بازنەیـەی پەیوەنـدیـە نیـشتیمانی یـەکان)بـڵاو کرابووەوە کە نێوەرۆکەکەی لەتەوەرەی ئەو بابەتەی سەرەوەدا دەسورایەوە. هەر لـە هـەمان ژمارەدا وتارێکی دی کە بەناوی(دژی ئۆپۆرتۆنیزم)لەلایەن(فزیل کریم)ـەوە نوسـرابوو. ئـەم دوو وتـارە , بەتایبـەتی ئـەوەی دواییـان قیامـەتیان خرۆشـاند(فازیـل)یـان خـستە قەفـەزی دادگای کردنەوە نوسەری پەنجەکان. .. پێی وابوو وتاری ئۆپۆتـۆرنیزم دژی ئـەو نوسـراوە و تاوانێکە لێبوردنی نی یە.

بەپێچەوانەی ئەوەی کە نوسەر دەڵێت بۆ ئەوەی کار و باری کۆنفرانس بە ڕێك و پێکی بڕوات من خۆم دەنگم نەدا ستایشی هیچ کەسم نەکردبوو ڕەخنەیەکیشم لە هیچ کەس نەگرت هیچ لیستێکیشم ئامادە نەکرد. .. ل ۱۹۸ ). ئەوە ڕاستە کە لە ڕێرەوی هەڵبژاردندا دەنگی بەکەس نەدا و ستایشی کەسیشی نەکرد. ئەوەی لە کۆنفرانسەکانی دواتریشدا، دەنگی نەدەدا، بەڵام هەم ستایشی خەلکی دەکرد و هەم لیستەشی هەبوو. لەم کۆنفرانسەدا ئەو لەبری دەنگ دان و ستاش کردن و ڕەخنە گرتن ئەو لەی بری دەنگدان و ستایشکردن و ڕەخنەگرتن، مەرجی بەسەر ئەندامانی کۆنفرەنسەوە بۆ هەڵبژاردن دانا !. ئەو لە جەگەی کێشەی هەڵبژاردن دا، زۆر بە ئاشکرا و بەدەنگی دلێر گوتی: من لەکۆمیتەی سەرکردایەتێك دا کارناکەم کە سالار و فازیل کریمی تێدابن.

ئەوی دەنگ بەوان دەدات بادەنگ بەمن نەدات و بەپێچەوانەشەوە !.

ئیدی دیارە کە ئەو بەشێك نەبوو لەکێشەکان، بەلکو مانکی قوڵ کردنەوەی خودی کێشەکان بوو. ئەو قسەیە لێدانی زەنگ و دانانی یەکەمین بەردی بناغەی دووکەرت کردنی کۆمەڵە بوو. ئەمە مانای وابوو کە تەنیا دوو ئەڵتەرناتیف لەبەردەم ئەندامان دا هەیە:

نەوشیروان یان سالار و فازیل ئیدی ئەوەبوو کە سالار و فازیل جارێکی تر ڕێگایان نەکەوتەوە سەرکردایەتی کۆمەڵە. فازیل کریم هەر پاش ئەوە وازی لە حزبایەتی هێناو هاتە ئەوروپا و لەبواری نوسین دا جێ دەستی بەدیار کەوت. سالار کەوتە هەوڵی تیۆر ڕێزەکردنی ناکۆکیەکانی و بوو بە دوژمنی پلە یەکی نەوشیروان و لە پێناو گەرانەوە بۆ سەرکردایەتی , ڕێگای جیابوونەوەی گرتە بەر , کە هەشت ساڵی خایاند !.

ئەو ئاژاوەیەی هەر سێ گروپە نەیارەکەی کۆمەڵە لە کۆنفرانس دا نایانەوە کارەکانی کۆنفرەنسی ڕۆژێك وەستاند و کۆبونەوەی نیاز پاکان بۆ چارەسەری کێشەکان و هێمن کردنەوەی دۆخەکە , لەدەرەوەی کۆنفرانس دا بەستران و من لە دوانیان دا بەشدار بووم. لە هەردوو کۆبونەوەکەدا کە لەژێر چادرەکەی ملازم عومەر دا لە توژەڵە بەستران نەوشیروان ئامادەیی هەر جۆرێ پێکهاتن و قەولکردنی هەر پێشنیارێکی هەبوو بەڵام لە مەسەلەی فازیل و سالار دا هیچ پاشەکشەیەکی نەکرد.

یەکێك لە کێشە سەر بەگۆبەندەگانی دیکەی کۆنفرانس مەسەلەی گرتنی نەوشیروان و هەڵوێستی باقی ئەندامانی دیکەی سەرکردایەتی بوو لەمەر مامەڵە کرد بۆ بەلاداخستنی کێشەکە و هەوڵدان بۆ ئازاد کردنی ئەو. پاش هەڵهاتنی نەوشیروان ئەندامانی گروپەکە

کۆمەڵێك زانیاری هەڵەیان لەمەر هەڵوێستی مەلا و سالار دەربارەی گرتنەکەی پێدابوو. وایان باس کردبوو کە ئەوان بەجۆرێك سەرکردایەتی ئەو هێزەی یەکێتیان کردووە و بەشێوەیەك هەڵیان سوراندووە تا حك تەنگە تاو بکەن و بیانخەنە حاڵەتێکەوە نەوشیروان لەناو ببەن. ئەمە هەرا و هەنگامەیەکی باشی لە کۆنفرانسدا نایەوە وە نەوشیروانیش هیچ هەوڵێکی بۆ کپ کردنەوەی نەدەدا ! ئێستا سالار و مەلا بەختیار لە هەڵوێستێکدان هیچ کەس ئیرەییان پێنابات وە نێوانی منیش لەگەڵ ئەوان پردێکی تێدانییە، بۆ مێژووش ئەو قسە و قسەڵۆکانە بەمەبەست دروستکرابوون، وە چ راستییان تێدانەبووە. من ئەوساش لە کۆنفرانسدا تەنها کەسێك بووم کەوتم(لە جیاتی ئەم خەڵك تاوانبار کردن و ئاژاوە نانەوەیە، بۆ کەسێك جورئەت ناکات کەروێی دەمی بکات کاك نەوشیروان وە رەخنەی ئەوەی لێبگرێت، وە چونە ئەو لەبەر خاتری کارێکی تایبەت و شەخسی خۆی ئەو کێشە و هەرایەی بۆ کۆمەڵە و یەکێتی لەگەڵ هێزەکانی حسکدا ناوەتەوە؟!.)

ئەم کێشەیە دوایی نەبێت کە تەواو شەخسی و دروستکراو بوو، تەواوی مەسەلەکانی دیکە فکری و سیاسی بوون و نوسەر بە ئارەزوو خۆی لێبواردوون.

### حدکا و پدك( چاو راو لەگواستنەوەی دەقدا )

لە لاپەرەی لە لاپەرەی ١٩٩ دا لەژێر ناونیشانی(حدکا و پدکا)باس لە داواکاری هەشت برگەیی هەیئەتی نوێنەرایەتی خەڵکی کورد لە کوردستانی ئێراندا دەکات کە رووبەرووی دەسەڵاتدارانی تازە وەسەرکارکەوتووی ئێران کرابوەوە. دیارە یەکێك لەبرگەکان داواکاری دەرکردنی(ق.م)بوو لەئێران و لە کوردستانی ئێراندا.

ئەو داواکارییە، جگە لە حدکا هەموو لایەنەکانی ئەندام لە هەیئەتەکەدا، ئیمزایان کردبوو، لەسەری سوربوون. نوسەر دەنوسێت: لەو نامیلکەیەدا کە سەبارەت بە(ق.م)دەریانکرد هەڵوێستی خۆیان بەم جۆرە ئەگێرنەوە(. ... نوسەر بۆ لێدوانێك لە نێوەرۆکی نامیلکەی تایەن یان گواستنەوەی دەقەکانی، جووت کەوانەیەکی کردوەتەوە و لە هیچ کوێیەك دایتەخستووە !!. خوێنەر ناتوانێ جیاوازی لەنێوان گوێزراوەی نێو نامیلکەکە و قسەکانی خودی نوسەردا بکات. دیارنییە کە ئەو دەقەی لەناو جوت کەوانەکەوە و دوبارە دایڕشتۆتەوە !. نووسەر ئەگەر نامیلکەکەی لەبەر دەستدابووە. دەبوو چەند دەقێکی

وەکوخۆیـان بەئامانەتـەوە لـەو دیکۆمێنتـە وەرگرتبـا و بـێ هـیچ ئالۆزییـەك لـەنێو دوو کەوانەکەی دانابان و سەری لـە خوێنـەر نـە شێواندبا و چەتری گومـانی لەسـەر بابەتەکە هەڵنەئەدا !!.

## حسك و یەکێتی – کوژرانی شێرکۆی شێخ عەلی جەمالی علی باپیر

لەساڵی ١٩٨١ کێشەکانی نێو حسك و یەکێتی ئالۆزتر و پێکدادانـەکان خوێنـاوی تـر بـوون، شەر و تێکهەڵچون و پێکدا هەڵپرژان لە سەرتاسەری کوردستاندا و بەتایبەت لەو ناوچانەدا کە هێزی هەردوو لایانی تێدابوو، پەرەیان سەند.

شـەرەکان هۆکـاری زۆریـان هـەبوو. حـسك هێزێـك بـوو لەسـکی یـەکێتی دەر پـەریبوو، ئەقلیەتی نـادیموکراتی هـیچ هێزێـك لـە کوردسـتاندا ئـەم لەدایکبونـە ناشـەرعییەی قـەبوڵ نەدەکرد، یەکێتی هەتا پێی دەکرا نەدەبو رێگەی گەشەکردن و خورتبونی ئەو هێزەبـدات و لەروی سیاسی و چەکدارییەوە نائارامی بۆ دەسەلاتی خـۆی دروسـت بکـات، حـسکیش دەبـوو هەرچۆنێك بێت لە هەمبەر یەکێتیدا پێـی خـۆی بچەقێنێت و بـون و کیـانی سـەربەخۆیی خـۆیی بـسەلمێنێت یـەکێك لـەو شـێوازانەی حـسك بـۆ سـەپاندنی بـونی چـەکداری خـۆی ناچارکردنی یەکێتی تا ئەو ناسنامەی سەربەخۆ بونەی بـداتێ بـەدیل گرتنـی نەوشیـسروان بوو، نەوشیروان لەکەش و هەوایەکی پر تەمومژی نێوان هەردوولادا کە ئەو لێـی بێئاگـابوو، بەدیل گیرا گرتنی نەوشیروان هەم بۆ کۆمەڵە و هەم بۆ یـەکێتی و هـەم بـۆ خـودی خۆیـشی سـوکایەتییەکی گـەورە بـوو، بۆیـە سـەیر نیـە کـەپاش هـەڵهاتنی نەوشـیروان پێکدادانـەکان خوێناوی تر بوون و گورزەکانی تۆڵەش بەزەبر تر !.

نوسـەری پەنجـەکان. .. لەمـەڕ روداوی کـوژرانی شـێرکۆ و جـەمال بەوشـێوەیەی بۆیـان گێراوەتەوە دەیگێڕێتەوە و خۆی وەکو سکرتێری کۆمەڵە کەسی دووەم لـە یەکێتیـدا، هیچ بۆچونێکی تایبەتی دەرنەبڕیوە، یان نایەوێت ردەی ببڕێت و راستی روداوەکانمان پێبڵێت !!.

نوسەر دەڵێ:

(- ئەوانەی حسك دەیانوت: جەمال بە فیتی مەلا بەختیار بەناوی میوانییەوە چووە بـۆ سەردانی شێرکۆ بۆ ئەوەی لە پەنای دۆستایەتیدا بەفێل بیکوژێ.

- مەلا بەختیار ئەمەی ئینکار دەکر، دەیوت: جمال چووە بۆ سەردانی شێرکۆ بۆئەوەی هەندێ کێشەی نێوانی حسك و یەکێتی بەلادا بخەن و لەوێ بووە بەشەریان و ئەو کارەساتە رویداوە. .... پەنجەکان ل ٢١٠ ).

جەمالی علی باپیر، ئەندامی کۆمەڵە و فەرماندەی هەرێمی چواری یەکێتی بوو، شێرکۆی شێخ عەلی فەرماندەی هێزی حسك بوو لەهەمان سنوری دەسەلاتەکەی جەمالدا و دۆستایەتییەکی پتەویان لە نێواندا هەبوو، لەژێر چەتری تەبایی و سروشتی دۆستانەی جمال و شێرکۆدا. هێزەکەی حسك لەو ناوچەیەدا کەمێك گەشەی کردبوو، سەرکردایەتی یەکێتی هەمیشە سەرکۆنەی جەمالیان دەکرد کە: لە ئۆدەی شێرکۆ نایەت، ناتوانێ فشاری لەسەر دابنێت، هێزەکانی(حسك)ی پێ لەمەنگەنە نادرێت. جەمال لەژێر تەرزەی گلەیی و گازندە و رەخنەدا. بەخۆدا هاتەوە و تێگەشت کە لە گۆمی خوێناوی سیاسەتی کوردیدا، ماسی دۆستایەتی ناتوانێت زۆر بژی ئەوەی ناشێ و نایەوێ بیکات، دەبێ بیکات، مەلا بەختیار ئەزمونی دیکەی لەو جۆرە لە لەناو بردنی نە یارانی یەکێتیدا هەیە و ئەرکی سەرەکیشی لە چونە ناوچەکەی جەمال و سێرکۆدا هەر ئەوە بووە ئمە جگە لەوەی کە رووداوەکە سەد ساڵ نییە رووی دابێت، هەتا تەفسیری جۆراوجۆر هەڵبگرێت و بەشدارنی شەرەکەش زۆریان شاهیدی زیندوون و بۆ چونەکەی حسك دەسەلمێنن و نوسەری پەنجەگانیش لەهەموو کەس دڵنیاترە و ناشێ کەسێکی سەرڕاستی لەشەرەکەدا بەشداربووی نزیك بەخۆی، حەقیقەتی مەسەلەکەی بۆ باس نەکردبێت !. نوسەر پێش ئەوەی مێژووی کوردی نوسیبێتەوە، مێژووی یەکێتی نیشتمانی نووسیوەتەوە. بریا بۆ جارێك و جێگایەکدا ئەو مێژووەی بە چاك و خراپەوە تۆمار کردبا.

## کەرە سیاسییەکەی بەکر پیرۆت و کۆنفرەنسی دووی کۆمەڵە !

نوسەر بە(٢٥)دێڕ باسی لە رووداوێکی سیاسی گرنگ کردووە کە کەرکەی(بەکر پیرۆت)قارەمانی بووە و بۆتە هۆی شکاندنی گەمارۆی راگەیاندن و هەواڵ و رێپۆرتاژی رۆژنامەوانان لەسەر یەکێتی نیشتمانی. .....

بروانە پەنجەکان ل١٥)

من پێموایە کە ئەم کەرە سیاسییە دەبێت شوێنێکی دیاری لە کتێبی کۆمیدیای(کەرایەتی)محمود زامداری نوسەر داهەبێت.

نوسەر هاتۆتە سەرباسی دووەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە، تەنها(٨) دێری لەسەر نوسیوە و خۆی لەناکۆکی و ململانێ فکری و سیاسیەکانی نێو دەروونی کۆمەڵە و ئەو ئاڵوگۆڕە سیاسی و رێکخراوەییانەی لە ئەنجامی کۆنفرانسدا بەسەر کۆمەڵەدا هاتن. نەداوە. نوسەر لەسەرجەمی باسەکانیدا گرنگی و بایەخێکی ئەوتۆی بە بە مێژووی کۆمەڵە و شێوازی هەڵچون و داچونی کێرڤی روداوەکانی ناو کۆمەڵە نەداوە و بەهەندی وەر نەگرتوون، لە کاتێکدا ئەگەر لە روداوە سیاسی و چەکدارییانە بەراورد بکرێت ئەمە خۆی دەشێت ئاوێنەیەك بێت بۆ نیشاندانی فکر و تێروانینی نوسەر بۆ کۆمەڵە و دەوری کۆمەڵە لە چاو فاکتەرە سیاسییەکانی دیکەدا، لەسەرجەمی پێشهاتەکانی نێو بزوتنەوەکەدا.

لەپاش کۆنفرانسی دووەم دەزگای رێکخستنی کۆمەڵە دامەزرێنرا کە لەسێ ئەندام پێکهاتابوو، ئەندامێکی ناوەندی کۆمەڵە لێپرسراوی بوو، ئەم دەزگایە لەنیچوەندەوە راستەوخۆ سەرپەرشتی کاروباری رێکخراوەی کۆمەڵەی لەکوردستاندا دەکرد. هەر لەپاش کۆنفرانسی دوو هەموو تەلاری رێکخراوەیی کۆمەڵە کرایە چوار رێکخراو و هەموو کەرتەکانی رێکخستن خرانە نێو چچوارچێوەی ئەو رێکخراوانەوە ئەز لەلایەن نێوەندەوە بە لێپرسراوی رێکخراوی سێی کۆمەڵە دانرام،(ئەوە بۆ من کە ئەندامی سەرکردایەتی نەبووم بەرزترین لێپرسراوێتی رێکخراوەیی بوو ).بەلام من رەتم کردەوە و رێکەوت عوسمان ئەو مەسولیەتەی لە ئەستۆگۆت.

لەنێوانی هەردوو کۆنفرانسی یەك و دوودا کێشە تیۆری و سیاسییەکان، بەناخی کۆمەڵەدا چ لەشار چ لە شاحدا رۆچوون.

رێکخراوی کۆمەڵە جگە لە کێشە فکرییە دەرونییەکانی خۆی، ئەوا کارتێکردنی رێکخراوە چەپەکانی شار(کار و کارکەران)کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانیشی لەسەربوو، جگە لەو ململانێیەی لەنێو سەرکردایەتی کۆمەڵەدا لەسەر پلە و دەسەلات دەکرا. کێشمەکێشێکی تیۆری لەسەر چۆنیەتی لەدایکبونی پارتی پێشرەوی چینی کرێکارانی کوردستان و نازنامەی چینایەتی کۆمەڵە و لەسەر چۆنیەتی ئەو پارتییە لەگەڵ بزوتنەوەی کرێکارانی عێراقدا، گروتینی تێکەوتبوو دەزگای لێکۆڵینەوەی زانستی کۆمەڵە لە نامیلکەیەکی چاپکرد بەناوی(پارتی پێشرەوی چینی کرێکارانی کوردستان)کە فەریدون عبدالقادری ئەندامی ناوەند نوسیبوو، سالار عزیزیش لەوەلامی(تێز)ەکانی ئەودا، نامیلکەیەکی چاپکرد بەناوی(چەند سەرەنجێکی رەخنەگرانە دەربارەی نامیلکەی پارتی

پێشرەوی کرێکارانی کوردستان)کەشێکیش لەناو شاردا و لە ڕێکخستنەکانی شارەوە نامیلکەیەکی بۆ بەرپەرچدانەوەی سالار و پشتگیری کردنی فەرەیدون نوسی.

ئەم نامیلکانە لەنێو ریزەکانی کۆمەڵەدا دوو سەنگەری فکری دژبەیەکیان هەڵکەند، جا باسەرکردەی گروپە نەیارەکانی ناو کۆمەڵەش بۆ مەبەستی تایبەتی و شەخسی خۆیان تیۆریزەی ناکۆکییەکانیان کردبێت، ئەمە هیچ لەو حەقیقەتە ناگۆڕێت کە کادیرانی ریزەکانی خوارەوە لە پیچناو مەسەلەیەکی شەریفدا کە بڕوایان پێی هەبوو ململانێیان دەکرد، مەسەلەی بەرهەق بوونی ئەم یان ئەولایەنیش، بەلای منەوە بایەخێکی ئەوتۆی نییە و هەموو لایەنەکانیش کۆمەڵێك بەلگەیان بۆ پاسادانی دید و تێڕوانینی خۆیان هەبووە.

## هێزی پشتیوان لە نێو عاتیفە و بڕیاری سیاسیدا !.

هێزی پشتیوان نازناوی ئەو هێزەی یەکێتی نیشتمانی بوو، کەلە سێپتەمبەری ١٩٨٢ دا بۆ پشتگیری هێزەکانی حدکا، دژ بە هێزەکانی پاسداران و سوپای ئیسلامی ئێران ئاودیوی کوردستانی ئێران ببوو، هێزەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران، تەنگیان بە حدکا و مەکتەبی سیاسییەکەی هەڵچنیبوو. دکتۆر قاسملۆی رەحمەتی، هانای بۆ حزبی شیوعی و یەکێتی بردبوو، بەپێی نوسەری پەنجەکان. ... حشع هیچ ئامادەییەکایان پێنەدابوو.

مام جەلال( شەهیدبوونی شۆڕشی کوردستانی عێراق)یش بەدەم بەدەم بانگەوازەکەی حدکاوە چوبوو !.

ئەمە بۆ یەکێتی بڕیارێکی سیاسی گرنگ و چارە نوسساز بوو، بڕیارەکە تەنها مام جەلال لە پلەی یەکەمدا خاوەنی بوو، زۆربەی ئەندامەکانی سەرکردایەتی لێی بێئاگا بوون !. ئەم بڕیارە ناراستە، پاشتر کارەساتی بۆ یەکێتی لێکەوتەوە.

شەرەکان چەند هەفتەیەکیان خایاند. هێزەکانی حدکا بەهێزەکانی پشتیوانیشەوە شپرزەبوون، یەکێتی خۆی لە شەڕێکی بێچ مانا هاویشتبوو کە نەیدەزانی چۆن چۆنی پاشەکشەی لێبکات، من ئەوسات لە خری نێوزەنگ بووم، لەنزیکەوە ئاگاداری وردینەی رووداوەکان بووم و سەردانێکی بنکەکانی پشتەوەی شەرەکەشم کرد. ویرای موقاوەمەتێکی جەسورانەی هێزەکەش، هەموو چاوەروانی هاتنی ژەنرال بەفرمان دەکرد، تا ئەوبێت و سنورێك بۆ پێشرەوی هێزەکانی ئێران دابنێت !.

خـوا بەهانامانــەوە هـات و چـیاکان شمـشێری سـپییان هەڵکێـشا و ئەفـسانەی هێـزی پشتیوانیش کۆتایی هات.

لەوشەرانەدا(١٧)پێشمەرگەی یەکێتی کوژران، کـە یـەکێکیان هاورێیـەکی زێـدەئازیزی مـن بوو، بەناوی(فەیسەڵی مەلا علی – کاکە شێخ)کە فەرمانـدەی یـەکێك لـە کەرتـەکانی هێـزی هـەورامان بـوو، ئـەو شـەرە نارازییـەکی فراوانـی لـە نێـو هێزەکـانی یەکێتیـدا دروسـتکرد. نارازییەکەش بەتەنیا هەر لای ئەو نارازاییانەش نەبوو(کەپاشتر – ئاش – یان دروستکرد ل ٢٦٦)بگرە لەناو خودی ئەو مەفرەزە و کەرتانەشدا کـە لەشـەرەکەدا بەشـدار بـوون، وجودی هەبوو، ئەو مەسئولانەش کەم نەبوون کە لەبارەکانی شـەرەوە، نامـەی نـارەزای و بێزارییـان بۆ سـەرکردایەتی دەنوسـی، ئەگـەر خوێنـەر بـۆ کتێبـی پەنجـەکان. .. بگەرێتـەوە و چاوێك بەلاپـەرەی ٢٦٧ دا بخـشێنێت هـەموو ئـەو پاسـاوانەی کـە نوسـەر بـۆ عاتیفـەکردنی بریـارە ناراستەکەی خۆیان هێناونی، هەرهەمان ئەو لێکدانـەوە و بۆچونە سیاسییانەی ئێمـەن کـە ئەوسات باسمان لێوە دەکردن و لەناو ریزی پێشمەرگەدا موناقەشەمان دەکردن. ئێمە پێمان وابوو کە شەرێکی بێ ئاکام و خۆ ترپێنە و کاسەکەش هەرچییەکی دیکەی جگە لەمەسـەلەی هاوکـاریکردنی(حـدکا)ی تێـدابێت ئـەنجام هــەر لەســەی یەکێتیـدا دەشــکێت بەشــێك لەســەرکردایەتی یــەکێتی، ئــەم هەڵوێــستەی ئێمــەیان بــە(دروســتکردنی گومــان لەســەر سـەرکردایەتی یـەکێتی و ساردکردنەوەی پێـشمەرگە. .... ل ٢٦٦)لـە قەڵـەم دەدا. ئێـستاکە پاشـی پـازدە سـاڵان نوسـەر مـل بەراسـتییەکان دەدات و بەشـێك لـە گونـاهی ئـەو بریـارە نادروستە ئۆباڵی دەگرێت !

## گومان لە هەڵوێست و عاتیفەی بریار !

ئەم هەڵوێستە سەرشیچتانەی یەکێتی نیشتمانی ئەگەر چەند رەگەزێکی عاتیفەشی تێدا بووبێت، ئەوا رووالەتێکی نەتەوەیی و نیشتمان پەروەریشی پێـوە بـوو. سـەرجەم پرۆسـەکە لە پراکتیکدا تەمێکی خەستی گومانی تێوە ئالأبوو:

- لەگەرمەی شەری نیچوان عێراق و ئێراندا، یەکێتی نزیکەی نیوەی هێزەکانی خۆی لە کوردستانی عێراق کێشایەوە و خسستییە گەروی شەرێکەوە کـە هـیچ مـەنتقێکی سیاسـی تێدا نەبوو.

- حدکا پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ رژێمی عێراقدا هەبوو، حدکا چەك و تەقەمەنی و پێویستییەکانی لۆجیستیکی شەرەکەی لە عیچراقەوە بۆ دەهات و ئەرکی شەرەکەش لەگەڵ یەکیچتیدا برابەش بوو !.

- د. قاسملۆ، لەمەسەلەی موفاوەزاتی ناو یەکێتی و موخابەراتی عێراقی بۆ مەسەلەی گفتوگۆ و دانوستاند یەکتریان دیتبوو، (بروانە پەنجەکان. .. ل ٢٦٩ و بەندەش لەنزیکەوە ئاگاداری هەوڵ و هاتوچۆکان بوو ).

دیارە گومانی من نە ئەوسا و نە ئێستاش، بەو ئاراستەیە نییە کەیەکێتی ئەو شەرانەی لەبەر خاتری بەعس کردبێت. یەکێتی بە مشتی خوێناوی دەرگای داخراوی موفاوەزاتی دەکوتا و بەدووی دەرەیەکدا دەگەڕا هەتا دەرویەکی لێبکرێتەوە و دەستی دەمشکاندنی(جود)ئاوەلا بێت !.

## ئاژاوەی نێوان ئەدیبان !

سەرتاپای کتێبی(پەنجەکان. ..)وەك لەناوەکەی را دیارە، تایبەتە بە هەرا و ئاژاوەی سیاسی چەکداری و لێکهەڵپێکانەوەی ئەڵقەکانی زەبر خوێنرشتن و یەکتر شکاندنی هێزە چەکدارە سیاسییەکان نوسەرانی کورد چ لەشار و چ لەشاخ، ئەگەرچی بە گشتی ئیلتزامیان بەمەسەلەی خەباتی میللەتەکەیانەوە هەبوو و بەرهەم و داهێنانەکانیان هەڵدانێك بوو بۆ بەرجەستەکردنی ئەو هەلومەرجە سەخت و دژوارانەی کە ئینسانی کوردی چ وەکو تاك چ وەکو کۆمەڵ تیچکەوتبوو و لەبار و دۆخی خوێناوی یەکتر کوشتنی حزبە چەکدارەکان بێزار و بێ هیوا بوون دیسانیش کەم تازۆر کەوتبونە ژێر کارتێکردنی هەوڵی چاو و راوی حزبەکان. هێزەکانی شاخ کە لەهەوڵی پۆلێنکردنی ئەدیبان و دەستەمۆکردنیاندا بوون و ئەوان نەك هەر خوازیاری ئەدەبێکی سیاسی مولتەزیم بوون بگرە کاریان بۆ بەوجود هێنانی ئەدیبێکی حزبی وەها دەکرد کە ریزەکان زیاتر ریز بەندی بکات و ئەدەبی کوردیش ببێتە ئاوێنەی درزتێکەوتووی واقیعە سیاسییەکە. هەر حزبەی دەیویست نوسەر و شاعیری خۆی هەبێت و تا سەروەری و سەرکەوتنەکانی بنوسێتەوە و نەمری شەهیدەکانی نەمرتر بکات، دەقە ئەدیبییەکانیش بەژەهری ئایدۆلۆژیا چەهراوی بکات. یەکێتی نو سەرانی لە شاخ لەدایك بوو. هەرگیز نەیتوانی ببێتە ساباتی کۆبونەوەی قەڵەم و بەهرە جیاوازییەکان و بەئاشکراش پەیوەندی حزب و سەرکردەی حزبەکانی لەسەر هەڵنیشتبوو،

شمشێری خوێناوی سیاسەتی حزبە نەیارەکان، جەستەی نوسەرانی شاریشی ئاژنکرد، کێشە و گرفتەکانیان قوڵتر کردەوە، گومان و دڕدۆنگی لە نێوانیاندا دروست کرد و چەندین چاوی لەنێوانیاندا چاند، نوسەر بێ قوڵبونەوە لە ماك و هۆکار و چۆنیەتی شکلگرتنی کێشەکان تەنها لە دەروازەی تەسکی فکر و سیاسەتی یەکێتییەوە لە گرفتی ئەدیبانی کوردی لەو سەر و بەندەدا روانیوە و بێ ئەوەی حسابێك بۆ ئەوە بکات کە ئەوان خۆیان(واتا نوسەر و حزبەکەی)بەدەست لە پشت دانی ئەم نو سەر و دەنە دانی ئەوی تر، غەزەب لێگرتنی ئەوانی تر تاوان لە ئەستۆ بارکردنیان چرۆڵێکیان لەو پەرتەوازەیەی لەت و پەتکردنەی ئەدیبانیان گێراوە.

نوسەر لە کتێبی ئاژاوەی زەبر و خوێندا، تەنیا باس لە ئاژاوەی نێوان ئەدیبان دەکات(بەعس و حشع)ی وەکو دوو ئەسکوێی نێو مەنجەڵی ئاژاوەکە، دەستنیشانکردووە، تۆری نوسەر لەنێو ئاوی لیڵی ئاژاوەکەدا دوو ماسییە، نوسەری راوکردووە ؛ دوو نمونەی لە(دیدی نوسەرەوە)باش و خراپی دژ بەیەك .. شێرکۆ بێکەس و حەمە سەعید حەسەن، حەمە سەعیدی لە قولاّیی(کێشە)کەدا پێوەکردووە و(شێرکۆش)لەکەناری سەوزدا پۆشراوی پاش کشانەوەی شەپۆلی ئاژاوەکە رووانـدووە.

لە هیچ شوێنێکی نوسراوی کتێبەکەی نوسەردا، باسێك لە هەوڵوماندوبوونی کۆمەڵێك نوسەرنییە کە نەك هەر وەك نوسەر و شاعیر بگرە هەندێك جاریش وەکو کادری راگەیاندنی کۆمەڵە و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لە ئێستگە و دەزگاکانی راگەیاندندا کاریان دەکرد و جێ پەنجەیان دیار بوو.

نوسەر کەپێی خۆشە(لە خانەی ئەهلی قەڵەمدا حساب بکرێت )، دەبوو سەرپێییش با ئاورێکی لەو نوسەرانە دابایەوە کە لەسەرما و شەختە بەندانی کوێستانی کوردستاندا و لەبەر تیشکی هەڵلەرزینی فوتیلەدا ڕۆمان وشعر چیرۆك و وتاری ئەدەبییان دەنوسی و وەردەگێرا !.

نوسەر لەشوێنێکدا و بێ هیچ موناسەبەیەك نوسیویەتی: (لەئەدەبی کۆنی عەرەبی و فارسیدا لە ستایشی هەندێ لە کاربەدەستەکاندا نوسیویانە صاحیب السیف و القلم، من گاڵتەم بەم ستایشە دەهات.. پەنجەکان ل ٢٩٠ ).

نوسەر پاش ئەم پەرەگرافە یەکسەر دێتەسەر شەرەسەختەکانی نێوان یەکێتی و(جود)و خۆشی بەمەهدەیی دوویی زەمان و تاقە رزگار کەری یەکێتی و کێشەی داپاچینی جەستەی بزێوی چوار برا دڵ بەردەکە لە قەڵەم داوە !.

ئەو پەرەگرافەی سەروە نەك هەر گاڵتە پێهاتنی نوسەر بەنازناوی(خاوەنی شیر و قەڵەم)دەرنابڕێ بگرە شانازی پێوە کردنیشی لێدەتکێت، دەنا پێویستی بەنوسین دەکرد. ئەوەی لە دنیای نوسیندا بژی وە بەقوڵی عاشقی نوسین بێت و لە رەهەندە ئینسانییەکانی پرۆسەی نوسین و داهێناندا بتوێتەوە تەنانەت لە نوسینی چیرۆکێکدا وەلەزەمەنی خولقاندنی پاڵەوانەکانیاندا بۆ بەوشە نەخشاندنی وێنەی دوو کەڵەبابی پۆپنە خوێناوی بەشەرهاتووش تەوژمی ژان بەهەموو دەمارەکانیاندا ڕۆ دەچوون، چ جاری کەسێك بۆخۆی ئینسانەکان بەشەر بدات فەرمانی ئیعدامکردنیان دەربکات، شاهیدی زیندووی مەرگەساتیان بێت و خۆشی وەکو عیسای کوری مەریەم نیشان بدات. زۆر ئەستەمە مرۆڤ بتوانی دوو خەسڵەتی دژ بەیەکوە دوو پیشەی یەکتر نەفی کەر لە خوێندا کۆ بکاتەوە، زۆر مەحاڵە لەیەك کاتدا هەم نوسەر بیت و هەم شمشێر بەدەست، هەم مرۆڤ ویست بیت و هەم دژە مرۆڤ.

## شەڕو شعر !

نوسەر لە باسی مەڵبەندی یەکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بازنەی گەر گرتووی شەری ئێران عێراقدا پێنج دێر شعری لە زمانی(بەهادینەوە)کەبەسەر بەکری حاجی سەفەردا هەڵیدابوو نوسیویە شعرەکەش ئەمەیە:

(ئەی هاوڕێیان من رەنجدەرم

من................ م

جاش و عەسکەر هاتە سەرم((راستییەکەی: جاش و پاسدار هاتنە سەرم — پ - )).

مەڵبەندی یەك بۆکوێ بەرم !.)

بەکری حاجی سەفەر پیاوێکی بەتەمەنی تێکۆشەرێکی جوامێر و دێرینی ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستانە ئەو زۆر جاران ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتی بوو. هەر لەسەرەتای دەستپێکردنەوەی بزوتنەوەی چەکدارییەکەدا لە ناوچەکانی پێنجوێن و شاربازێردا دەوری گرنگ و بەرچاوی بۆ رێکخستنەکانی یەکێتی هەبوو، نوسەر وەکو هیچ ستایش و پیاهەڵدانێکی بە بەکر ڕەوا نەبینیوە، هیچ رۆڵێکی پۆزەپیفی ئەوی باس

نەكردووە، ئەم شعرە پڕ سوكایەتییەشی بۆ مێژوو تۆماركردووە، كە دەبێتە شایەتی بێتوانایی و دەستەپارچەیی بەكری حاجی سەفەر، شعرەكە ئەگەرچی شێوەیەكە لە ساتیر، بەلاچم بزمار داكوتانێكی بەئازاریشە كاتی خۆیشی بەكر زۆری لێ جارز و قەڵس بوو، لە درێژایی ئەو بزوتنەوە چەكدارییەدا، گەلێك پەند و قسەی خۆشی دەم چەكدارە قۆشمەچی و نوكتەبازەكان وەسەر زاران كەوتن. هەندێك لەو نوكتە و گەپانە، گێرانەویان كەسێك برۆیندار دەكەن، ئەگەر مەبەست رق هەڵرژین و شكاندنی كەسانی دیكە نەبێت هەقی تۆماركردنیان نییە.

من دەتوانم نمونەی رەوا و نارەوای ئەم جۆرە نوكتانەی تیا تۆمار بكەم:

- جرێكیان من و كەمال شاكیر لەگەڵ كۆمەڵێك پێشمەرگەدا لەگوندی (هاوار)دانشتبوین و سەرگەرمی لێدوان و مشت ومڕی سیاسی بوین من و كەمال دوو رای جیامان لەسەر یەك مەسەلەی تایبەت هەبوو، زۆرمان هێنا و برد بە ئاكام نەگەیشتین، ئەوكات موناقەشە بۆ قەناعەت پێهێنان بوو نەك بۆ بیرورا گۆڕینەوە، پاشان كەما وتی: (وا پێدەچێ رایەكەی هەردوو لامان دروست بێت، غەفور دەرە شیشی رەحمەتی، كە پیاوێكی حازر بەدەم و قسە خۆش بوو لەولاوە هەڵیدایە و گوتی: تەلاقم كەوتبێ نابێت هەردوكتان راست بكەن لەو دوانەتان دەبێت یەكێكتان درۆبكەن !.

- نوسەری پەنجەكان ژنی هێنا و خودا كورێكی پێ بەخشی، جارێك كۆمەڵێك برادەر لەشوێنێك دانیشتبوین و باس هاتە سەر كوری تایەن و برادەرێك گوتی داخۆ چی ناوێكیان لێ ناوە؟!. دلێری سەیدمجید لەوەلامدا وتی(نما)وتیان نما مانی چییە؟، ئەویش وتی مانای نەوەی شتێك ئاراستە بكات، وەكو قیبلە نما. .. پاشتریش دەبێتە كورتكراوەی(نەوشیروان مستەفا ئەمین ). هاوڕێ جەباریش هەڵیدایە و وتی: بەخوا جوانە ! نەوشیروان بۆخۆی بەتاقی تەنیایە وا هەمو كورد بەدەست یەوە زەلالەتیەتی وەی لە خۆی و باوك و باپیری لە یەك كەسدا كۆببنەوە !.. ئەمە نوكتەیەكی نارەوایە و ئەگەر پەیوەندی بەخودی نوسەرەوە نەبوایە، من هەرگیز جورئەتی گێرانەوەیم نەدەكرد. هیچ كەسێ تاوانی ئەوەی لە ئەستۆدانییە كە كوڕی كێیە و كام باوك بە وجودی هێناوە، نما كە لە ئەوروپا گەو رە دەبێت، هیچ دور نییە ببێتە ئەكتەرێك موزیك زانێك، لێكۆڵەرەوەیەك، یاخود زانایەكی بەناوبانگ كورد و خزمەتی گەورە بە میللەتی كوردبكات، و بێزی لەم مێژووە بێزراوە خوێناویەی باوكی و سیاسەتمەدارانی دیكەی كورد ببێتەوە !.

## کوژرانی جەزای علی کاتب.. دەنکە شقارتەکەی لەتیف !

جەزای علی کاابت هەروەکو نوسەر ئاماژەی پێکردووە، بەهەڵ کوژرا ئەوی کە(مەلا بەختیار ئینکاری دەکرد داوای گرتنی عوسمانی لە ئاوات کردبێت)هەق بە ئاواتە و مەلا راست ناکات.

ئێمە(سالار، بەکری حاجی سەفەر، شێخ علی، حمە ئاوات، من و خەڵکی دیکەش)ئەوسات لە گوندی (پارەزان)ی شارباژێر دەژیاین و هیچ مەسئولیەتێکمان وەرنەگرتبوو. مەلا بەختیار لێپرسراوی مەڵبەندی یەك بوو، لە ساتی پەیدابوونی کێشە و هەرادا دەهاتە لامان و مەسەلەکەی لەگەڵ باس دەکردین. ئێوارەی رۆژێکی ئازار، ئەو هات و بۆ شەوەکەی قسە و باسمان لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو گرفتە کرد لە شارەزوور هاتبووە گۆڕێ. حسك لە سەرێکدا کە پێشتر(لەتیفی حەمەی مەلا سابیر)ئاگرەکەی نابوەوە، چەند کادر و چەکدارێکی یەکێتییان بەدیل گرتبوو. ئێمە پێشنیازمانکرد هەوڵبدرێت بەئاشتی کێشەکە بەلادا بخرێت، مەلا گوتی: (بواری گفتوگۆی تێدا نەماوەتەوە، بەڵام دەکرێت کە بێ خوێنرشتن(عوسمانی قادر منەوەر)— کە لێپرسراوی حسك بوو دەسگیر بکرێت و پاشان لەگەڵ دیلەکانی خۆمان ئاڵشتیان بکەین. ..من ئەو کارە بە(ئاوات و تیپی ٣٣ ی شارباژێر)دەسپێرم !.)شەری گەورەی نێوان یەکێتی و جود لە ئایاری ٩٨٣ دا، کە پاشان بە شەری قرناقا و پشتئاشان نێوی دەرکرد، بیانووەکە نە کوژرانی جەزا بوو، نە بەدیل گیرانی چەکدارەکانی یەکێتیش لە شارەزوور بیانووەکە لە تیف لە بناری ئەوبەری شارەزوور و لەگوندی(بێسەڵمێن)دا بوو، بویە دەستەوە، کە تەقەی لە مفەوەزێکی حسك کردبوو، یەك دوانێکی لێکوشتبون و بۆ خۆشی ئەنگێورابوو. کە لەتیف هاتەوە پارەزان، پێمان وت: تۆ چ کەتنێکت ناوەتەوە، هاکا ئاگرەکە هەموو کوردستانی گرتەوە !. ئەو لەوەڵامدا وتی: بەنزینەکە خۆی هەمیشە رژاوە هەردەنکە شقارتەیەکی دەوێ تێی هاویت. .. منیش نەمکردایە. کە سێکی دیکە دەیکرد لە تیف راستی دەگوت ئەوە بیانووەکان نەبوون کە کانییە بەهارەی خوێنەکانیان تەر دەکردەوە، بەڵکو هۆکاری راستەقینەی تەقینەوەی ناکۆکییەکان، سرینەوەی فکر و بون و جەستەی براکان، لەناخی پر لە کینە و تێروانینی خێڵەکییانەی خودی براکاندا بۆ یەکتری و بۆ دەسەلات، رەگی داکوتا بوو. من وەکو پێشتریش ئاماژەم پێکردووە، کتێبی پەنجەکان.. بەگشتی تەرخانە بۆ ئاژاوەی پر لە

کوشتن و کوشتاری خوێناوی نێوان پێنج برا باڵا لەخوێن هەڵژێنراوەکە. باسکردن لە چۆنیەتی بەرێوەچوونی میکانیزمی شەڕ و هەراکان و ریزکردنی بیانو هۆکارە ساختە و داتاشراوەکان، بێکەڵك و سادە دێنە بەرچاو، هەروەها بسکردن لەکێشەی نەبراوەی خوێناوی نێوان پێنج برا یان راستتر وایە بڵێین، (چوونکە حشع بەبرای بیلۆگی ئەوان نایەتە حساب و لەباوکێکی دیکەیە )، کەهیچ کامیان شەرعییەت بە لەدایکبوونی یەکتر نادەن، یەکدی بەزۆڵی بیلۆگی و سیاسی دەزانن، بروبیانوو و پاساوی سیاسی هەڵناگرێت، ئەوانە یەك لەپشتی یەکتر دەر پەریون و هەرکەسیش بۆ نەفی کردنەوەی ئەوی دی خولقاوە و نەفی کردنەوەش لە کۆمەڵگای ئێمەدا ز یار لەسەر پانتایی جەستەکاری خۆی دەکات، نەك لە کرۆکی فکر و ئایدۆلۆژیادا !. نوسەر، بەگشتی کاری لەسەر رووالەتی کێشەکان و دیوی دەرەوەی روداوەکان کردۆتەوە نەك دیوی ناوەوەیان وەك ئەوەی لە ناونیشانی بنچینەیی زنجیرە کتێبیەکانیدا هاتووە.

نوسەر، گەرچی وەکو فۆتۆگرافێکی کارامە(نەك وەکو لێکۆڵەرەوەیەك )، هەوڵیداوە تاوەکو وێنەی ئەڵقەی ئەڵقەی زنجیرەی روداوە خوێناوییەکان بگرێت و لە هەوڵەکەشیان ویستویەتی پەڵەی رەشی سەرجەمی ئەو تاوانانە بە توێڵی نەیارەکانی یەکێتییەوە بنێت و هەمیشە ئەوانی بە: ئاژاوەگێر، نا شۆرشگێر، ناراست و درۆزن و بێ کفت، چەکداری، شرەخۆر و راو و روتکەر، هێزی خێلەکی و بێ دیسپلین و بێ سەروبەر، زاڵم و هێرش هێنەر، داناوە. وەتۆمەتی هەلگیرسانی تەنیایەك شەریشی لە ئەستۆی یەکێتی نەناوە !!.

یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لەساڵی ٩٧٥ دا لە غیابی پارتی و بارزانیدا بۆ لەنوێ را بنیادنانەوەی سەنگەرە روخاوەکانی بزوتنەوەی ئەیلول پرکردنەوەی بۆشاییە سیاسییە – چەکدارییەکەی پاش نسکۆ دروست بوو. یەکێتی لەسەر چەند کۆڵەکەیەکی فکری – سیاسی لەنگەری گرتبوو لە ئایدیا و تێگەیشتنی کۆمەڵەوە هەڵێنجرابوو.

پارتی پێشرەو، بەرەی نیشتمانی، لەشکری گەل، سێ تەوەرە بنچینەییەکەی خەباتی شار و ساخی یەکێتی بوون. بەرەی نیشتمانی بەسەرکردایەتی پارتی خۆی رێبەرایەتی بزوتنەوەکە بکات و هەموو چینەکانی دیکە(واتا حزبەکانی دیکە)لەبن هەنگڵی خۆیدا کۆبکاتەوە و ئاراستەیان بکات. گرێی گرفتەکان لێرەدایە. ئەو پێی وایە پێشرەو و سەرکردەیە چونەکە:

- نوێنەری کرێکارانە و کرێکارانیش لە هەموو چینەکانی تر شۆڕشگێڕترن و پێناسەی ڕەوای ڕێبەری بون لای خۆیەتی.

- دەست پێشخەری لە هەستانەوەی بزوتنەوەکەدا کردووە و ئەوانەی دوای ئەو هاتوون دەبێت لە پاشەوەی ئەودا ڕێ بکەن !.

پارتی ئەساش و ئێستاشی لەگەڵدابێت یەکێتی بە خەنیمە دێرینەکەی خۆی دەزانێ، پارتی نەك هەر یەکێتی بەسەرکردە و پێشرەو قبوڵنەببوو، بگرە درکی بەوەش کردبوو کە یەکێتی و بەشێکی سەرەکی لە فکر و سیاسەتەکەی بۆ نەفیکردنەوەی جەستەی فك ری و سیاسی ئەو جێگۆڕکێی مەلا مستەفا و جەلال تاڵەبانییە، لە هەرمی دەسەڵاتی بزوتنەوەکەدا و گۆڕینی ئاوەڕۆی روباری مێژووە بەرو هەواریچکی خاڵی لە رەمز و سەروەری پارتی و سەرکردەکەی.

یەکێتی نیشتمانی بەو بۆچونە فکری و جیهانییە توندرەوەی خۆیەوە، لەگەڵ لەدایك بونیدا تۆوی زەبر و بەتۆبزی سەپاندنی پێشرەوایەتی خۆی هەڵگرتبوو.

ئێمە ئەگەر سەیرێکی چۆنیەتی ریزبەندی هاوپەیمانێتی سیاسی و جێگۆرکێی هاوپەیمانیەتییەکان بکەین، بەو دەرەنجامەدەگەین کە قاوغی سیاسی یەکێتی ز ۆر لەوە تەسکترە خەسڵەتی تاکرەوی و دیکتاتۆرییانەی مام جەلال نوسەری پەنجەکانیش زۆر لەوە بە زەبرتر بوون کە لایەن و حزبەکانی دیکە لە خۆیان بگرن و لەگەڵیاندا بسازێن.

لەساڵی(١٩٧٦)ەوە هەتاوەکو ساڵی ١٩٧٩، حسك و پاسۆك و پاشتریش تا ساڵی ١٩٨٢ حشعیش زیاتر لەتەوەری سیاسەتی یەکێتی نزیك بوون و پارتی تاڕادەیەك وەلا کەوتبوو، سەرەتا حسك دەرپەڕێنرا و پاشان پاسۆکیش سەنگەری گۆڕی و دواتریش حشع بەندی دوو بەرەی پساند و لەبەرەی(جود)دا خۆی گرتەوە و یەکێتی تاك وەستایەوە !. یەکێتی بەدرێژایی ئەو ساڵانە، تاك تاك و بەکۆمەڵ شەری هەموویانی دەکرد یان هەموویان شەری یەکێتییان دەکرد !. خۆ بە پێشرەوزانینی یەکێتی جڵەوی پێشرەوایەتی وەرگرتەوە و لەبری ئەوەی ببێتە ڕێبەری شۆڕش و میللەت بووە ڕێبەری شەری کورد کوشتن !.

تێروانینی هەڵەی یەیکێتی بۆ سەرکردایەتی شۆرشی ئەیلول و شەخسی مەلا مستەفا، ئەنجامەکەی بەزەرەری یەکێتی و بزوتنەوەکە و بە قازانجی یەکێتی شکایەوە.

## پشتێنی گەمەی موفاوەزات لە پشتی ئەندامانی کۆمەڵە دەپێچێت

یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان لەسـاڵی ١٩٨٣ دا، خزێنرابـووە کەنـدەڵانێکی سیاسـی و چەکداری دژوارەوە، تاڵە دەزویەکی پەیوەنـدی لەگـەڵ ئێرانـدا پـسێنرابوو ئـالای دژایـەتی کردنی هەڵکردبوو، ئێران لە هەر ناوچەیەکی ژێر دەستی یەکێتیـدا پێـشرەوی کردبـا، دەبـو هێزەکـانی یـەکێتی رووە و نـاوەوە پاشەکـشە بکـەن، ئەمـەش وایکـرد یـەکێتی شـوێن و بارەگاکـانی خـۆی لەدەسـت بـدات شـەرەکانی نێـوان جـود و یـەکێتی ئەگەرچـی بـەقازانجی ئەمەی دواییان بـەلادا کـەوت، بـەڵام ئـەوە دوایـن شـەر و مەترسییەکان نـەبوو، گرفتـەکانی نێوان یەکێتی تا دەهاتن خەست و ئاڵۆزتر دەبوون، یەکێتی بۆ پـشودان و خـۆ رێکخـستنەوە و خۆ پاکژکردنەوە، جگە لەدەرگای موفاوەزات دەرگایەکی دیکەی بۆخۆی نەهێشتبووەوە.

موفـاوەزات لەگەرمـەی جـەنگی عێـراق – ئێرانـدا پراکتیزەکـرا و بەهـەر ئـەنجامێکی پـۆزەتیف گەیـشتبا، لەسـەر ئاسـتی کوردسـتاندا بـە قـازانجی بـەعس تـەواو دەبـوو، ئەوسـا یەکێتی بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی موفـاوەزات دەبـو ئاسـتی پێکـدادانی هێزەکـانی خـۆی هـەم لەگـەڵ ئێـران و هـەم لەگـەڵ جوددا بەرێتـە سـەرێ. لـەنێو ریزەکـانی کۆمەڵـەدا کـەم نەبوون ئەوانەی دژی موفاوەزات بوون، لایان وابوو کـە هەڵبـژاردنی ئاشـتی لەگـەڵ جـود و ئێراندا ئابرومەندانەترە تا لەگەڵ بەعس !.

نوسەر، ئەنجامدانی موفـاوەزاتی لـە ئەسـتۆی بەشـدارانی کۆنفرانـسە ناوچـەییەکانی خـۆ ئامـادەکردن بـۆ کۆنفرەنـسی سـێی کۆمەڵـە نـاوە و چـوارەم برگـەی ئەرکـەکانی کۆنفرانـسە ناوچەییەکانی ئاوا دیاریکردووە:

((٤- وەرگرتنی بیر و رای ئەندامان لەسەر گفتوگۆ لەگەڵ بـەعس ئـاخۆ زۆرایـەتی لەگـەڵ گفتوگۆیە یان دژی گفتوگۆیە؟

دەستەی سەرپەرشتی هەرسێکیان وتیـان: هـیچ کـەس پێـی وانییـە بـەعس خواسـتەکانی کورد دەسەلمێنێ، بەڵام هـەموو ئەنـدمان – جگـە لەژمارەیـەکی زۆر کـەم بەپەنجـەی دەسـت دەژمێـردرێ گفتوگۆیـان پێباشـە. ... ل٣٤ – ٣٥) مـن قـسەم لەسـەر ئـەوە نییـە کـەداخۆ زۆرینەی ئەندامان یان کەمینەی ئەندامان گفتوگۆیان پـێ بـاش بوبێـت یـان خـراپ، ئـەوەی بەلای منەوە سەیر و نامۆ و نەبیستراوە، ئەوەیە کەمەسەلەی گفتوگۆ یەکێك لە بابەتەکانی کۆنفرەنـسە ناوچـەییەکان بوبێـت و لەوێـدا قـسە و باسـی لەسـەر کرابێـت و رای ئەنـدمانی لەسەر وەرگیرابێت !.

ساتێ مەسەلەی کۆنفرانسە ناوچەییکان هاتە پێشێ، نامەیەکم لە جەمال تاهیری ڕەحمەتییەوە پێگەیشت کەوێرای باسکردنی ز ۆر مەسەلە، لە مەسەلەی کۆنفرانسیش دوابوو، ئەو داوای کردبوو ئێمە و ئەو هاورێیانەی لە دەورمانن بەشداری لە کۆنفرانسەکەدا بکەین، یەکێك لەو کەرتە ڕێکخستنانەی کۆمەڵە لەناوچەکەدا بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژێرین.

من ئەو سات هەموو لێپرسراویەتییەکی کۆمەڵەم لەسەرشانی خۆم داگرتبوو، لە گوندی(پارەزان)لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا بارەگایەکی چکۆلەم دانابوو، کەرتەکانی ڕێکخستنی هەڵبجە، پێنجوێن، شارباژێر، لەمانگی تەموز – ئاب دا کۆنفرەنسەکانی خۆیان بەست من لەگەڵ کەرتی هەڵەبجەدا بەشداریم کرد، بەو پێیەی کەمن کەرتەکەم دامەزراندبوو، تا ساڵی پێشتریش لێپرسراوی بووم، لە کۆنفرانسەکەدا من بابەتێکی فکری دژم بەناوی(مەسەلەی کورد لەنێوان واقع و خەیاڵدا)خوێندەوە کە بووە مایەی موناقەشەیەکی چڕوپڕی فکری من لەویادا دەمویست جەواب بەو واترانە بدەمەوە کە نوسەری پەنجەکان و فەرەیدون عبد القادر ، لەسەروبەندی هەلای هێزی پشتیواندا نویسبویانن و لە ڕادیوۆی یەکێتییەوە بلاوەکرانەوە و باسیان لە یەکبونی مەسەلەی کورد دەکرد ئەوسا و ئێستاش بروام وایە ئەوان لە هەموو سەرکردەیەکی عێاقی، عێراقی ترن و بە پراکتیکیش ئەوەیان سەلماندووە، کەچی بەدەیان کادر و ئەندامی کۆمەڵەیان بە تۆمەتی عێاقچیچتی شاخ بەدەرکرد !. لە کۆنفرانسی ئەو سێ کەرتەدا کەمن لە نزیکەوە ئاگاداریان بووم باسی هەموو شتێك کرابێت باسی موفاوەزات لە ئارادا نەبووە، . من کە ئەو برگەیەی سەرەوەم خوێندەوە لە یادەوەرییەکانی خۆم کەوتمە گومانەوە، ناچار پەیوەندیم بەچەند کەسێکەوە کرد، کەشاهێدی زیندون و بەشداری ئەو کۆنفرانسە بوون، هیچ کەس لەوانە ڕاستی ئەو مەسەلەیەیاند نەسەلماند، کۆنفرانسی کەرتی قەلادزێ بۆمانگی تشرینی یەکەم یان دووەم دواکەوتبوو، ئەوسات گەرمەی دەنگی موفاوەزات بوو، ئەو مەسەلەیە لەوێدا باسکرابوو، موفاوەزات بەپێی خۆی هاتبوە ناو باسەکانی کرنفرانسی ئەو کەرتەوە، نەك بەندێکی تایبەت بوبێ لە بەندەکانی کۆنفرانس ! خویچنەر ساتێ بۆچونێکی ئاوا ئاوە ژۆدەخوێنێتەوە، ناچارە لە هەموو بۆچون و گێرانەوەکانی تری نوسەر، لەسەر ئەو مەسەلە جیاوازانەی باسی لێوەکردوون، بکەوێتە گومانەوە و بەو قەناعەتە بگات کە ڕاستییەکانی بە کۆڵی کەری شەل دەگەڕێن.

## تیرۆری سیاسی

تیرۆری سیاسی چ له شار و چ لەشاخدا، سیمایەکی دزێوی بزوتنەوه چەکدارییەکەی پاشی هەرەس بوو، له مەیداندا یەکێتی له چاو هێزەکانی تردا بەشی شێری بەردەکەوێت، ئەم بابەتە نەیتوانیوه دەرکەی کتێبەکەی نوسەری پەنەکان بکاتەوه و شوێنێکی تێدا بگرێت.

ئەگەر ئیعدام کردنی سەرکردەکانی یەکێتی پاشی شکستی هەکا ری به تیرۆری یاسایی دابنرێت(که دا نانرێت و ئەوه دەچێتە خانەی پۆخڵی دیل کوشتنەوه)ئەوا شەرەفی داهێنانی دیل کوشتن بە(ق.م) دەبرێت، که پاشان یەکێتی ئەو شەرەفەی لێوەرگرتەوه و داهێنانی نوێی تریشی خستە پاڵ ئەویش تیرۆرکردنی نەیارانی سیاسی خۆی بوو له شارەکاندا !.

ساڵی ١٩٨٣ بۆ خەڵکی کود و هێزە چەکدارەکانی ساڵێکی شوم و پر نەگبەتی بوو، شەره خوێناوییەکان به ترۆپکی خۆیان گەیشتن، سیاسەتی پەر و باڵکردن دادی هیچ لایەکی نەدا چەکوشی تۆڵه بۆ پانکردنەوەی سەرەکان بەرزکرایەوه، رەنگە لەمێژووی کوردکوشتندا هیچ ساڵێك بەقەد ئەو ساڵەهیچزه کوردییەکان بەخوێنی یەکتر تینو نەبوبێتن و خوێنی یەکتریان نەرشتبێ !.

له نیوەی دووەمی شەستەکاندا له گەرمەی شەری جەلالی و مەلایدا ، ئەوه مەلاییەکان بون که لەشارەکاندا کەسانی سەربە جەلالییەکانیان تیرۆردەکرد، بەوپێیەی کەبنکە سەرەکییەکانی جموجولی جەلالییەکان له شارەکاندا بوون، له ساڵی ١٩٨٣ دا هەردوو لایەن، واتا: هەم یەکێتی و هەم پارتیش له شاخ بوون و لایەنگرەکانیان له شاردا بوون، تیرۆرکردنی کۆمەڵێك کۆنه کادری پارتی لەلایەن مەفرەزەی تایبەتی تیرۆری یەکێتییەوه لەشاری سلێمانیدا. ئەوەمان پێدەڵێ که یەکێتی:

- هەمیشه پێی وابووه که نەیارە سیاسییەکانی خۆی له ریچگای پاکتاوکردنی جەستەوه لەناو دەبات.
- یەکێتی له تیرۆردا دوربینه و ئەوساتیش حسابی بۆ دواۆرژی ململانێکەی شاخ دەکرد دەیویست ئەو وزانەی نەیارەکەی لەناو ببات که دەشێ له دوارۆژدا و لەهەلومەرجی دیکەدا، ببنه داینەمۆی هەڵسورانی هێزی سیاسی و چەکداری دژ بەخۆی له شارەکاندا.

- یەکێتی لە ململانێکاندا پارتی و بەعس لە یەك ئاستدا دەبینێ، بۆیە شانبەشانی تیرۆرکردنی تیرۆرکردنی سیخورانی بەعس کەسانی سەربە پارتیشی دەکوشت.

ئەو کارە تیرۆرستیانەی یەکێتی ئەنجامی دان نارەزاییەکی زۆری لە شارەکان و لەنیچو ریزەکانی یەکێتیشدا پەیداکرد، یەکێتی ناچاربوو بەیانێك بۆ ریچزگرتنی ئەو کەسە بێتاوانانە لە رادیۆکەی خۆیەوە بلاْوبکاتەوە و خوێنەکانیان لە گەردنی خوێناوی بەعس بنێ !!.

ئێمە لە شارباژێر بووین زۆرمان بۆ مەلا بەختیار هێنا کە ئەوکات لێپرساوی مەلبەندی یەکی یەکێتی بوو، تا هەواڵێکی دروست لەسەر ئەو مەسەلەیە پەیدا بکات ئەو لەگەڵ مام جەلالدا بە بێ تەل قسەی کردبوو، مام وتبووی: (من بەتەواوی بێ ئاگام لەوەی ئەگەر یەکێتی کارێکی وەهای ئەنجام دابێت، هەرگیزکاریوەها لەئێمە ناوەشێتەوە !.... ئەگەر رۆژێکیش بەبەلگەوە ئەم کارانە بەسەر یەکێتیدا ساغ ببنەوە، ئەوا من وازدەهێنم و جانتاکەم هەڵدەگرم و دەچمەوە هەندەران.

نەقلی کوفر کوفر نییە، ئەمە دەقی قسەی مەلا بەختیارە من دەینوسمەوە:

زۆری نەبرد(وریای وەهاب)کە ئەو کارە تیرۆرستییانەی ئەنجامی دابوون، شاری بەجێهێشت و هاتە شاخ، من وریام لە شارباژێردیت، ئەو نکوڵی نەدەکرد و پێی وابوو وەکو کادرێکی گوێ لە مستی کۆمەڵە، فەرمانی سکرتێری کۆمەڵەی جێبەجێکردووە، تەواوی ئەو نامانەشی لایە کە بەئیمزای سکرتێری نوسراون، وریا لەنێوانی دوو بەرداشی ترس و ئازاری ویژداندا لە مەنگەنە درابوو تر لەوەی کە سکرتێری کرمەڵە داوای ئەو نامانەی لێدەکردەوە کە فەرمانی ئەو تیرۆرکراوانەی تێدا بوو، نەبادا دەست لایەنە نەیارەکان بکەون و ریسکەیان بکەنەوە بەخوری، ئەو پێی وابوو بە بەدەستدانی نامەکان ئەو کارانەی کردونی دەچنە خانەی تیرۆری شەخسی و تایبەتییەوە هیچ بەلگەیەکی سەلمێنەری بۆ داکۆکیکردن لەخۆی بەدەستەوە نامێنێت و لەناوبردنی ئاسانتر دەبێت. ئازارێکی سەختی ویژدان لەهەمبەر تیرۆرکردنی کۆمەڵێك کەسدا کە حزبەکەی حاشای لە تیرۆرکردنەکەیان دەکرد !!. ئەو دەیویست کەلەوەکێشی و کەللە رەقی لە ئاست سکرتێری کۆمەڵەبکات، بەلاْم بە لەدەستدانی گیانی و پارچە پارچە بوونی جەستەی تەواو بوو، تیرۆرکردنی وریا چ ئەوسات و چ ساڵێکیش پاشتریش لە کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەدا هەرا و هەنگامەیەکی گەورەی لێکەوتەوە. لە کۆنفرانسیشدا نوسەری پەنجەکان. لە ئەنجامی پێداگرتنی کۆمەڵێك کادر،

لەسەر چارەنوسی وریا گوتی(ئەو خیانەتی کردووە !.. ئەو نهێنییەکانی کۆمەڵەی بە دوژمنانی ئێمە وتووە، ئەگەر زیندوش بێتەوە سەدجاری تری دەتۆپێنمەوە !! ).

ئێمە لامان وابوو کە وریا هیچ خیانەتێکی نەکردبوو، هیچ نهێنیەکی بە هیچ کەس و لایەنێك نەدا بوو، ئەگەریش هەڵەیەکی کردبێت(کە نەیکردبوو)ئەوا دەبوو وەکو ئەندامێکی کۆمەڵە دادگایەکی حز بی بۆ دانرابا و بەئاشکرا لێپرسینەوەی لەگەڵکرابا، سزایەکی رەوای وەرگرتبا نەك بەنهێنی تیرۆربکرێت و جەستەی پارچە پارچە کراوی لە بن بەرددا بشارنەوە !.

دەبو نوسەری پەنجەکان لە ئاستی بەناهەق شکاندنی پەنجە بێتاوانەکانی شاردا، کەمێ ویژدانی بکزایەتەوە و بە چەند دێرێك ئەوانیشی بەسەرکردباوە.

## دیلە دیلکوژەکان !

جەنگ وەك دەڵێن عەزیایەکی برسی یە و خەریکی تێر بوونی نی یە جەنگ ئەو ئامێرە بێ دڵ و مێشکەیە کە سۆز و بەزەیی لە کرێنی ناخی دا سەوز نابن و کوێلانە هەموو شتەکان دەهارێت و هەڵی دەلوشێت جەنگ، جەنگاوەرەکان ون دەکات مرۆڤەکان دەکاتە درندە و منالەکان دەفرێنێت و ژنە شۆخەکان رەشپۆش دەکات و لە باخچەی ماڵەکانمان دا گولی رەشی رەق و تۆڵە دەچێنێت. جەنگ، کە مێژوویەکی دێرینی هەیە لەدێر زەمانەوە هەوڵی ئەوە دراوە کە سنورێك بۆ تاوانەکان دابندرێت و کەمێك سەرو سیمای رتوش بکرێت، رێکخراوە نێو دەوڵەتیەکانی پاراستنی مافی مرۆڤ کۆمەلێك یاسا و رێسایان بۆ لایەنە لە گژ یەك راچوەکانی جەنگ داناوە و واداریان بە جێبەجێ کردنیان ـ کردوون.

تەنیا پرانسیپێکی لەسەر ئەو لایەنە شەر کەرانەی کە حاڵەتی(دیفاکتۆ)تۆیان هەیە پێویستە ئیلتیزامیان پێوە بکرێت مەسەلەی پاراستنی مافەکانی دیل و بریندارەکانی شەرە.

بەدرێژای ئەو سالانەی شەری نێوان کورد و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان کەمتر وابوە کەمتر وابووە کە دەوڵەتەکان وێرای ئەوەش کە راستەو خۆ لەبەردەم جێبە جێ کردنی ئەو یاسا و پرانسیپانەدا لێپرسراو بوون و ئیمزایان کردوون لەشەری کورد فراندا رەچاویان کردبن بەپێچەوانەی دەوڵتە داگیر کەرەکانەوە حزبە کوردیەکان بە گشتی مل کەچی ئەو پرنسیپانە بوون و کەمتر سەر باز و جاشە بەدیل گیراوەکانی دەوڵەتیان ئازار داوە یان عیدامیان کردوون، زۆرجاران ئەو دیلانە بەزیادەوە حورمەتیان لێگیراوە و پاشان

بێ هیچ بەرامبەرێك یان بە چەردەیەك پارە ئازاد کراون دیلی دوژمن کوشتن تەنها لەم ساڵانەی دوایدا وەلە حاڵەتی تێکشکان و هەرەرسی هێزە کوردییەکاندا لێرە و لەوێ بەدیار کەوت دەنا پێشتر وجودی نەبوو.

حزبە کوردییەکان چەندە بە رامبەر بە دیلە دوژمنەکان دڵنەرم و میهرەبان بونە، سەد ئەوەندە بەرامبەر دیلە نەیارەکانی خۆیان دڵرەق و بێ بەزەیی بونە، ئەگەر تەمەنی شەری کورد کوشتن لە مێژووی هاوچەرخماندا وا خەریکە بۆ سی و سێ ساڵە دەچێت، بەلام ئەم دیاردە دزێو شەرمهێنەرە، لە پاش نسکۆی ئەیلولەوە برەوی پەیداکرد.

کورد وەکو تاك لەناخی خۆیدا، وەکو خێزان لەماڵی خۆیدا، وەکو میللەت لە مێژووی خۆیدا دیلێکی ونە، ونێکی بێ شوێن پێ، ونێك لە تونێلی مێژوودا، گیرخواردوو !. کورد کەنەیتوانیوە لەرێرەوی پێچاوپێچی مێژوودا خۆی بچەقێنێ وەك یەکەیەکی یەکگرتوو بەزەبر بوونی خۆی لە ئاست ئەوی تردا بسەپێنێ ئەوا هەر پارچە و خاڵێکی لە چوارچێوەی خودێکی شێواو و خۆنەگرتودا بۆ بڵندکردنەوەی بونی خۆی ، لەئاستی ئەوی تردا(کەهەر خودی خۆیەتی)چەند بڵێی بەزەبر و درندەیە، هەر دەڵێچی هەست بەکەمایەتی کردنی خۆی لە ئاست ئەوانی تردا بە دیواری خوێنی خۆی پربکاتەوە.

نوسەری پەنجەکان لێرە و لەوێ بۆ داکۆکیکرد لە خودی خۆی وەك حزبەکەی با سی دیاردەی کوشتنی کردووە وە هەوڵیداوە تەواوی ئەو تاوان و تۆمەتانەی لە گەردنی مێژوویاندا هەڵواسراون پوچەڵبکاتەوە ئەو نەهاتووە حەقیقەتی دیاردەکە بخوێنێتەوە وە توێژینەوەی لەسەر بکات، بەڵکو حەقیقەتەکانی بە خەسڵەتی عەشارییەتی و خێڵکایەتی پاساوداوە و عەقڵیەتی سیاسی توندرەوانەی خۆیانی لێ هەڵبواردووە.

ئێمە ئەو سالانەش پێمان وابوو کە یەکێتی هەرگیز ئەو رێچکەیەی ئەوان ناگرێتە بەرو پرۆسەی دیل کوشتن قوڵناکاتەوە یەکێتی تا ئەوکاتەی هێزەمانی کەم و پوخت و بەدیسپلین بوون و بیر و ئاکاری جەلالیەتی تێدا زەق و بالادەست نەبوون بەرفتاری تۆڵە و دیل کوشتنی پەیرەو نەدەکرد.

- یەکەم کەسێك کە لەسەر نەکوشتنی دیلێکی ق.م لێپرسینەوەی لەگەڵ کردم، خودی نوسەری پەنجەکان بوو !!. من کە ئەو کارەم نەکردبوو، ئەو پێی وابوو ترسنۆکم !!. من ئێستاش پەشیمان نیم. من ترسەنۆکیم لە دیل کوژی پێ سەربەرزی ترە.

- یەکەم جار کە لەنزیکەوە دیل کوشتنم لەناو هێزەکانی یەکێتی دا بینی پایزی ١٩٨١ بوو شەڕێکی خوێناوی نێوان هێزەکانی(جود)و یەکێتی، لە شارباژێر دا رووی دا. ئەو شەر یەکەمین گۆڕانی نوێ بوو لە شەری کورد کوشتن دا و نوسەر هیچ ئاماژەیەکی بۆ نەکردووە لەماوەی دوو رۆژاندا زیاتر لە چل و پێنج چەکداری جود کوژران و ژمارەیەکیان لێ بەدیل گیرا. لە مزگەوتی گوندی(رەزڵە)دا دیلەکان دانیشرابوون. چەکدارێکی هێزی گەرمیانی یەکێتی کە برایەکی لە شەرەکەدا کوژرابوو , بە بەرچاوی هەموو لایەکەوە، کوێچکەی دوو دیلی گرت و لە پەناوی دیوارەکەدا گولە بارانی کردن. یەکێك لە دیلەکان لە گیرفانی دا کارتی سەندیکای پزیشکی هەڵگرتبوو. ئەو تەنیا وەك کوردێك لە دۆزەخی شەری ئێران / عێراق هەڵهاتبوو، کە چی بلێسەی ئاگری شەری نێوان دیلەکان، کردی بە زوخاڵ.

- دوو مانگ پاشی ئەو شەرە، مام ئاراس و چەند چەکدارێکی حسك لەشەرێك دا لە شارەزوور بەدیل گیران، بەکۆبونەوەیەکی سێ دەقیقەیی سێ لێپرسراو، دەستڕێژێکم بیست و ئیتر مام ئاراس و دیلەکانی هاورێ یم نەبینی یەوە !!.

- نوسەر نکوڵی لەوە دەکات کە لە شەری(پشت ئاشان)دا هیچ دیلێك کوژرابێت، کەچی هەم خودی چەك دارەکانی یەکێتی و هەم ئەو ئافرەتانی(حشع)کە ئێستا ماون و هەندێکیان لە هەندەران دەژین، شایدی زیندووی گولەباران کردنی کۆمەڵێك چەك داری بەدیل گیراوی(جود)ن و فەرمایشتی پرمانای(باپەرێزمان پاکژ بێت !!)لەو رۆژگارەدا لەدایك بوو.

- عەبداللە سوور، جوتیارێکی ئازا و فەرماندەیەکی لێهاتووی حسك بوو ئەو جگە لەوەی وەکو ئەندامی حزبەکەی نەیارێکی سەر سەختی یەکێتی بوو، دووژمنی ئەو ئاغایانەی ناوچەکەش بوو کە چەك داری یەکێتی بون و یەکێتی لە کێشەی نێوان جوتیار و ئاغا کاندا پشتی دەگرتن. لەنیبۆ هێزە چەکدارەکاندا واباو بوو کە نوسەری پەنجەکان. .. بەدەستی خۆی یا فەرمانی خۆی عبداللە سووری بە دیلی ئعدام کردبێت. نوسەر هوڵی فەرهادی کێشاوە تا یەقینی ئەو تاوانە بکاتە گومان و گومانیش لەژێری مژی تۆڵە سەندنەوەی خێڵەکی دا ون بکات !.

- نوسەر لە دوادێرەکانی گێرانەوەی چیرۆکەکەدا دەکەوێتە غەفڵەتەوە و دەڵی: (لە ناخی دڵەوە پێم ناخۆش بوو بکوژرێ، بەڵام چۆن بۆ رزگار کردنی ژیانی مرۆڤێك لەمردن

جاری وا هەیە دوکتۆر خۆشەویست ترین ئەندامی لەشی نەخۆشەکە ئەبڕێ وەك، نەخۆشەکەش خۆی بەناچاری رازی ئەبێت، یان بۆ کوژانەی ئاژاوەی خوێناوی نێوان دوو بنەماڵە یەکێك ئەکرێت بەقوربانی، کوشتنی ئەویش ناچاریەکی لەو بابەتە بوو. ل ٢٢٤)ئەمە مانای چی؟!.

نوسەر دەڵێت من ئاگام لە کوشتنەکەی نەبووە و دوور لە دەسەڵات و ئیرادەی من کوژراوە، کەچی هەر بۆ خۆشی دەڵێت: کوشتنی عەبدالله سوور زەروورەت بووە !!. خوێنەر دەتوانێت لەم چەند دێرەی سەرەوەدا، دەریایەك حەقیقەت پەیدا بکات. ئەگەر کەسێکیش گومانی لەوە هەبێت، ئەوا دەتوانم بێژم کە نوسەر بەدەمی خۆی، ئیعدام کردنی عبدالله یووری وەکو هەرەشە لەکەسانی دیکە بەکار هێناوە و ئەمەش چیرۆکێکە و لەشوێنی دیکەی جێگەی خۆیهەیە.

دیل کوشتن لە پاش الی(١٩٨٣)وە بووە دیاردەیەکی تەشەنە سەند و. کۆمەڵێك فەرماندەی دەرکەوتن کە دیل کوشتن و خوێن رشتنیان بەشەهامەت و پیاوەتی دەزانی هەرگیز نەمدیت کەسێك لەسەر دیل کوشتن سزا بدرێت.

لە رۆژگاری ئەنفال و تێك شکانەکاندا، دیلەکانی دەوڵەت بەجەڵەب دەکوژران و دیل کوژەکانیش بە جوامێری یەوە باسیان لێوە دەکردن !. رێباز، کە کادر و فەرماندەیەکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو لە بیرەوەریەکانی خۆی دا(قەندیل بەغدای هەژاند !)وشەی(دیل کوژەکان)بوکار دێنێت و بەشەرمەوە باس لە دیل کوشتن و ئەو شەڕانە دەکات کەلە(١٩٨٥/٦/٢)دا واتە لەسەرو بەندی مفەوەزاتدا دژ بە حشع کران.

(لە / رێبازەوە

بۆ / مەڵبەندی چوار

((مام هیدایەت بەدیل گرتووە، تکایە فەرمان بدەن ! )).

لە مەڵبەنی چوارەوە بۆ / کاك رێباز

مام هیدایەت لە گوندەکەی خۆیان بکوژن !. )

مام هیدایەت چەکدارێکی حشع بوو(بروسکە)کەش لە مالی خۆیاندا کراوە(بڕوانە رێباز، قەندیل بەغدای هەژاند – بەشی دووەم)

رێباز دەڵێ: (شەری ناوخۆ هەمیشە لەلایەن ترسنۆکان و بەرژەوەندی پەرستانەوە پێشوازی لێ دەکرا ! ).

ڕێباز، باس لە بەکۆمەڵکوشتنی دەیان ژن و مداڵ و پیر و عەرەبان بەدەستی هێزەکانی یەکێتی و بەتایبەت تیپی(٢١)ی کەرکوك لەو گوندانەی ناوچەی هەولێردا، کە بەعس هەرەبی تێدا نیشتەجێ کردبون، دەکات !

ڕێباز شەرمنانە نارەزای خۆی لەئاست ئەو کارانەدا دەر دەبڕێت و بێ دەسەلاتی خۆی نیشان دەدات. من لێرەدا بۆ چونەکانی کەسێك دەنوسمەوە کە لەگەڵ بیرەوەریەکانی کۆی دا ڕاست گۆ بووە و هەتا لەشەری ناوخۆشدا کوژرا هەر فەماندەی یەکێتی بوو !.

من کە باسم لە دیار دەی دیل کوشتن کردووە هێزەکەی بەرامبەریشم لەبەر چاو گرتووە بەلام چوون یەکێتی هێزی گەورە و بالادەست بووە، دیاردەکەی لای ئەمان زەقتر بەدیار دەکەوێت و کامێرەیادەوەریەکانی نوسەری پەنجەکان زۆر بە تەلخی وێنەکەی گرتووە !.

خوێنەر کە وێنەی ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ئەو هێزانە لەشاخدا بکات، ئیدی بە لرفەی ئەو ڕوباری خوێنەی ئێستای شارەکانیش ئاشنا دەبێت و لەوەش دەگات کەم عەقلیەتانە، پێش ئەوەی دژی هەر دوژمنێکی کورد بن دژی خودی کوردن.

ڕۆژنامەوانێکی سویدی، لە فیلمێکی دیکۆمێنت تاری تایبەت بە کوردستانی باشوور دەڵێت(ئێستا ڕەش ترین دوژمنی کورد، کوردەکەی دی کەیە !. )

## با گۆڕەکان هەڵدەینەوە

کۆمەڵە ئێستا هیچ ناسراوێکی ڕێکخراوەیی و فکری نەماوە ڕەگەز سیاسی و فکریەکانی کۆمەڵە لەنێوان گۆڕدا ڕازاوەن و نوسەری پەنجەکان لە نوسینەوەی مێژووشدا جورئەتی ڕاچڵەکاندنیان نەکردووە، یاوەکو بە پیویستی نەزانییوە. نوسەر وەکو سکرتێری یەکەمی کۆمەڵە: مێژووی ئەو ڕێکخراوە ناکۆکیەکانی تەلەزم و لێ داتاشین وکارژ فرێدانەکانی بەهەند نەگرتوون و کەم و زۆر بەلایاندا نەچووە، بەمەش سووکایەتی بە کۆمەڵە و بە هەموو ئەو ئەندامانەی کۆمەڵە کردووە کە لە پێناوی ڕێباز و فکری کۆمەڵەدا((کە مارکسیزم و لینینیزم بووە و نوسەر تێوەرێزەی کردووە و برواشی پێ نەبووە ! )) چ لە شاخ و چ لەزیندانی فاشییەکانیش دا شەهید بوون.

کۆمەڵە هێشتا شەش ساڵ لەتەمەنی خۆی پرنەرکدبووەوە تووشی دوو قەیرانی فیکری و سیاسی هات و دوو گروپە لێ جیابووەوە کە کارکردنیان لەسەر ڕەوت و چارەنووسی دوارۆژی دانا.

- له ساڵی ١٩٧٢ دا. گروپێك لەو كادرانەی لە ئەلقە رۆشنبیریەكانی سەرەتای دامەزراندنی كۆمەڵەدا نەخشیان هەبوو جیابوونەوەی رێكخراوێكی بچووكی داخراویان بۆ خۆیان درووست كرد. ئەوان دەڵێن دوو بیانووی سەرەكیان بۆ رەت كردنەوەی كۆمەڵە و بەجێ هێشتنی هەبووە:

١- كۆمەڵەیان بە پردێك زانییوە لە نێوان مەرگی جەلالیەت و دووبارە زیندووبونەوەیدا واتە ئەوان وایان بینیوە كە كۆمەڵە لە هەل و مەرجی بەیانی ١١ ی ئازار و شكست خواردنی باڵی م.س دا دەبێتە دارە ئەفسووناویەكەی حەزرەتی موسا بەدەست مام جەلالەوە و بەشێنەیی و لەبار و دۆخێكی تر دا بە ئالأیەكی دی كەوە، جەلالیەتی پێ زیندوو دەكاتەوە.

٢- لایان وابووە كە لەنێو كۆمەڵەدا مەیلی گۆشە گیری نەتەوایەتی چەكەرەی كردووە و كۆمەڵە رێكخراوێكی ماركسیستی نەتەوە پەرستە بێ ئەوەی بەنامەیەكی روونیشی بۆ چارەسەرە كردنی كێشەی نەتەوەی كورد هەبێت و وتارەكانی مام جەلال لەمەر(كوردایەتی خاس و عام كە لەیەكێك لە ژمارەكانی رۆژنامەی برایەتی ئەو ساڵەدا بلاّو كرابووە و هەڵەیەكی لەنێوان كۆمەڵەدا نابووەوە)سەرچاوەی ئیلهامی فیكری كۆمەڵەیە.

ئەم باڵە بلاوكراوەیەكی نهێنیان بەناوی(كۆمەنیست)دەردەكرد و وەكو گروپێكی بچوكی نهێنی تا ساڵی(١٩٧٦)یش مابوون و چەند جارێك لەقەرەداخ لەگەڵ شەهید ئارام دا گفتوگۆ و دانوستاندیان كردبوون. شەهید ئارام هەوڵی دابوو كە قەناعەتی ئەومیان پێ بكات كە كۆمەڵە زۆر گۆرانی بەسەردا هاتووە و ئیتر كۆمەڵەی(عەحدی بايد !!)نییە. ئەو گروپە لەگەڵ ئارام دا پێك نەهاتبوون و پاشان(قیادەی مەركەزی حشع — وەحدەت القاعدە)قوتی دابوون.

٣- لە كۆتای ساڵی ١٩٧٥ و سەرەتای ١٩٧٦ دا، گروپێكی تر لەكادر و ئەندامانی كۆمەڵە بەشێك لەتەلاری رێكخراوەیان بۆ خۆیان بردا و رێكخراوێكی نوێیان بەناوی(رێكخراوی رەنجدەران)ەوە دامەزراند و بەشێكی بەرچاوی كادر و ئەندامنی كۆمەڵەیان جیاكردەوە. رەنجدەران بە پێچەوانەی گروپی كۆمەنیستەوە، بەخێرای گەشەیان كردن و هەر بەخێرایش ئاش بەتاڵیان كرد یان پێیان كرا !!

رەنج دەران لایان وابوو.

١- کۆمەڵە دەبێت قەوارەی ڕێکخراوەی سەربەخۆی بپارێزێت و چوارچێوەی سیاسەت و تەلاری(یەکێتی نیشتمانی کوردستان)قبوڵ نەکات و وەلای بنێت.

٢- کۆمەڵـە دەبێـت بەرنامەیـەکی ئاشـکرایی لەسـەر مەسـەلەی عێـراق و چـۆنیەتی هاوکاری نێوانی خۆی و هێزە چەپەکانی دیکەی عێراق هەبێت.

رەنج دەران بروایان بە خەباتی شاخ هـەبوو لـە چـیادا مـەفرەزەی چـەك داریـان دروست کرد , سالێکی نەخایاند لێپرسراوێکی سەرکردایەتیان بەناوی(ابراهیم حسن)لەرێگەی نێوان هەڵبجـە و سـلێمانی دا، پێـشمەرگەیەکی تەسـلیم بـوەوەی کۆمەڵـەی بـەگرتی دا و ئـەویش هەموو ڕێکخراوەکەی خۆی و بەشێك لە ئەندامانی کۆمەڵەی بـەگرتن و ئیعـدام کـردن دا و بۆ خۆشی پاشان بەر لێبوردن کەوت و ئێستا لە هەندەران دەژی چـەك دارەکـانی شـاخیان و بەتایبەتی مەسئولی یەکەمیان لە هەل و مەجێکی ئالۆزدا تیاچـوون و بەیـەك جـاری کۆتـای پێ هات !!.

ئەم روداوانە ئەڵقە ژەنگرتووە لە گۆران کراوەکانی مێژووی کۆمەڵەن کە تاو تـو کـردن و لێکۆلینەوەیان دەشێ کۆمەلیك دەرز و پەندمان بـدەنێ جگـە لـەم دوو روداوە گرنگـەی نێـو مێژووی کۆمەڵە، زۆر دیاردە و دەرکەوتنی دی کە هەن کە نوسەر بازی بەسەردا داون و مـن لە دەرفەتێکی تر دا هەوڵ دەدەم باسیان بکـەم یـان هـیچ نـەبێت وەبیر خوێنـەری ئێـستا و ئەندامانی ئەوسایی کۆمەڵەیان بهێنمەوە

پشکۆ نەجمەالدین

# سوپاس و پیزانین

سوپاس و پیزانین بۆ سەرنوسەری ئەو گۆڤارانەی کە بابەت و نوسینمان لیوەرگرتوون.

١- گۆڤاری جیهان، بەریز و خۆشەویست / نەبەز گۆران

٢- گۆڤاری لڤین ، بەریز و خۆشەویست / هەردوو بەریزان( احمد میره و هیمن باقر )

٣- گۆڤاری ریگا، زۆر بەرز / سۆران عمر

٤- گۆڤاری بزاو، بەریز / بۆتان تەحسین

٥- گوڤاری ستاندارد و تەواوی ستافە بەریزەکەیان.

٦- گۆڤاری هەلبون و ستافە خۆشەویستەکەیان.

٧- گۆڤاری شەن و ستافە ئازیزەکەیان.

٨- گۆرڤاری خەلك، بەریز سەردەشت حمە صالح

*- هەروەها سوپاس و پیزانینی تایبەتیمان بۆ هەرسێ جەریدە فرۆشی بەریز و خۆشەویست:

کاك دارای گۆرا نخواز لە بازاری دەبووەکە.

کاك نەوشیروان لە بەردەرکی سەرا.

کاك سیروان بەرامبەر تەلاری کاوە.

لە کۆکردنەوەی گۆڤارەکاندا یارمەتییان داین و هیوامان وایە کە نمونەیان زیاتر بیت.